بیتی مەحمودی

# بەبێ کچەکەم هەرگیز نا





وەرگێرانی لەئینگلیزییەوە

نوری کەریم

# بەبێ کچەکەم، هەرگیز نـــا

## بیتی مەحمودی

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: نوری کەریم

گرافیکی بەرگ: هونەرمەند سەردار عەبدوڵا

# بەبێ کچەکەم، هەرگیز نـــا

نووسینی: بیتی مەحمودی

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: نوری کەریم

چاپی یەکەم 2008

Translator: Nouri Karim
nourikarim52@yahoo.com

**Not without my daughter**
Betty Mahmoody
First published 1988

ISBN- 9163194937

چاپ

چاپخانەی تەوار

تیراژ 2000 دانە

ژمارەی سپاردن 254 ی ساڵی 2008 ی پێنسپێردراوە

لەزنجیرە بڵاوکراوەکانی

یەکێتی ژنانی کوردستان

زنجیرە 26

پێشکەشە

بە یادی باوکم، هارۆلد لۆفەر

نوسەر

# چەند سەرنجێك

بیتی مەحمودی و کچەکەی لەگەڵ مودی هاوسەری، کە بە ڕەگەز ئێرانییە، بۆ دوو هەفتە پشوو لە ئەمریکاوە دەچن بۆ ئێران بۆ سەردان. پاش تەواوبوونی ئەم دوو هەفتەیە، مودی دەرگای گەڕانەوە بەڕووی بیتی و کچەکەیدا دادەخات و دیوارێك لە یاسا و دامودەزگای سەرکوتکەری دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی دەکێشێت بە دەوریاندا، تا هاواری یارمەتیان بە گوێی کەسدا نەگات. بەڵام لە دەرەوەی ئەم دیوارە دەیان ملوێن خەڵك هاودەردی بیتی مەحمودی بوون و ئازادکردنی خۆی و کچەکەی بە ئاواتی خۆیانیان دەزانین.
(بەبێ کچەکەم هەرگیز نا) بەسەرهاتی ڕاستەقینەی هەوڵ و تێکۆشانی ژنێکە، کە بە هەر نرخێك بووبێت، نەیویستووە ملبدات بە هەلومەرجێك کە ژنان تیایدا کۆیلەیە.
(بەبێ کچەکەم هەرگیز نا) خەڵاتی پۆلیتزەری وەرگرتووە، وەك پرفرۆشترین کتێبی ساڵ، وە بە هەمان ناونیشانەوە کراوە بە فلیم و تا ئێستا لە ساڵۆنەکانی سینەمادا پیشاندەرێت.
لە ساڵی ١٩٩٥ دا، لەلایەن زانکۆی ئۆکلاندەوە ڕێز لە بیتی مەحمودی گیراوە، وەك هەڵکەوتووترین ژنی ساڵ. لە ئەڵمانیا، وەك ئازاترین ژن و ژنی ساڵ ناسراوە. هەروەها لە لایەن کۆلێژی ئەلما لە مەشیگان پلەی شەرەفی پێدراوە.
لەو کاتەوەی بیتی مەحمودی گەڕاوەتەوە بۆ ئەمریکا، خۆی تەرخانکردووە بۆ یارمەتیدانی ئەو کەسانەی کە کەوتوونەتە ئەو هەلومەرجەوە کە خۆی بەسەری هاتووە، وە لەم پەیوەندەدا ڕێکخراوێکی دروستکردووە بە ناوی یەك جیهان: بۆ منداڵان.
(بەبێ کچەکەم هەرگیز نا) لە زمانی ئینگلیزییەوە وەرگێڕدراوە، کە دەبێت بە (Not without my daughter -Betty Mahmoody). یەکەم چاپی ئەم کتێبە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٨٨.

وەرگێڕ
کانوونی یەکەمی ٢٠٠٧

# 1

کچەکەم وەنەوزیدەدا لەسەر کورسی تەنیشت پەنجەرەی فڕۆکەی خەتی هەوایی بەریتانیا، قژە لوولە قاوەییە سووربەوەکەی دەوری دەموچاوی دابوو، بەسەر شانیدا هاتبووە خوارەوە. ئەم قژە هێشتا مەقەستی بەرنەکەوتبوو.

بەرواری سێی ئابی هەزار و نۆ سەد و هەشتا و چوار بوو.

منداڵە خۆشەویستەکەم، بەهۆی سەفەری دوورودرێژەوە، تەواو هیلاك بووبوو. بەیانی ڕۆژی چوار شەممە لە دیترۆیتەوە دەرچووبووین و گەیشتبووینە دواقۆناغی سەفەرەکەمان، کە خۆری ڕۆژی هەینی لە هەڵهاتندا بوو.

مودی هاوسەرم، سەری لەسەر کتێبەکەی، کە لەسەر ورگی دانابوو، بەرزکردەوە و تەماشایەکی کردم. چاویلکەکەی بەرزکردەوە بۆ سەر ناوچەوانە ڕووتاوەکەی و وتی: "باشتر وایە، خۆت ئامادەبکەیت."

پشتێنی کورسییەکەمم کردەوە، دەستم دایە جانتاکەم و ڕێڕەوی تەنگەبەرم گرت بۆ تواڵێت لە دواوەی فڕۆکەکە. یاوەران کەوتبوونە پاکردنەوەی ناو فڕۆکەکە و ئەوانی تریش خەریکی خۆ ئامادەکردن بوون بۆ یەکەم هەنگاوی نیشتنەوە.

ئەمە هەڵەیە، ئەگەر لەم فڕۆکەیە بێمە خوارەوە، لە دڵی خۆمدا وتم. دەرگای تواڵێتەکەم داخست و سەیرێکی خۆمم کرد لە ئاوێنەکەدا، ژنێکم بینی، خەریکبوو ترس دایدەگرت. تازە تەمەنم بووبوو بە سی و نۆ، ژن لەو تەمەنەدا دەبێت ڕێڕەوی ژیانی خۆی بەدەست خۆی بێت. بۆم پرسیار بوو، چۆن ئەم ڕێڕەوەم لەدەست دەرچووە؟

ئارایشتەکەمم تازەکردەوە و هەوڵمدا جوان بنوێنم و خەیاڵات لە مێشکی خۆم دەرکەم. ئەدەبوو لێرە بوومایە، بەڵام کە هاتووم دەبێت بە کەمترین دەردیسەر لێیدەرچم. دەشێت ئەم دوو هەفتەیە زوو تێپەڕبێت. بگەڕێینەوە بۆ دیترۆیت، مەهتاب بچێتە پۆلی باخچەی منداڵان لە قوتابخانەی مۆنتیسۆری لە دەرەوەی شار. مودیش تەواو خەریکی کاری خۆی بێت. هەروەها دەستبکەین بە دروستکردنی ئەو خانووەی کە خەوی پێوە دەبینین. هەر ئەم دوو هەفتەیە تێپەڕێت، لە دڵی خۆمدا وتم.

دەستم کرد بەناو جانتاکەمدا، کۆلۆنێکی ئەستور، کە مودی پێی وتبووم بیکڕم، دەرهێنا و لەپێمکرد و کراسەکەمم بەسەریدا هێنایە خوارەوە.

جارێکی تریش تەماشایەکی ئاوێنەکەم کردەوە، ئەو خەیاڵەم لە مێشکی خۆم دەرکرد، کە شانەیەك بە قژە قاوەییەکەمدا بهێنم. بـــۆ وا بێزارم؟ لەخۆمم پرسی. سەرپۆشێکی سەوزی قورسم دا بەسەرمدا، مودی وتبووی، کە هەرکاتێك لەماڵ بچمە دەرەوە، دەبێت خۆم داپۆشم. سەرپۆشەکەم لەژێر چەناگەمدا گرێدا، بەم سەرپۆشەوە تەواو لە پیرێژنێکی لادێیی دەچووم.

## 2

تۆزێك لە چاویلکەکەم وردبوومەوە، هەستمکرد بەبێ چاویلکە جوانترم. گرنگ ئەوە بوو، کە چۆن جێگای خۆم بکەمەوە لەناو دڵی کەسوکاری مودیدا یان چۆن دەمەوێت هەڵسوکەوت بکەم لەگەڵ کێشەکانی ئەم وڵاتەدا. وازیشم لە چاویلکەکەم هێنا، چونکو دەمزانی، ئەو سەرپۆشەی سەرم وا ناشرینی کردبووم بە هیچ شتێك قەرەبوو نەدەکرایەوە.

لە کۆتاییدا گەڕامەوە لای کورسییەکەی خۆم.

"بیرمدەکردەوە،" مودی وتی. "دەبێت پاسپۆرتە ئەمریکاییەکانمان بشارینەوە. ئەگەر پێمانبگرن، دەستی بەسەردا دەگرن."

"چی بکەین؟" پرسیارملێکرد.

مودی دوودڵ بوو. "جانتاکەی تۆ دەگەڕێن، چونکو تۆ ئەمریکیت،" مودی وتی. "با من هەڵیانبگرم. ئەگەری کەمترە من بگەڕێن."

دەشێت ئەمە ڕاست بێت، چونکو هاوسەرەکەم سەر بە بنەماڵەیەکی بەناوبانگی وڵاتەکەی بوو، هەتا ئەمە لە ناوەکەیەوە ئاشکرا بوو. ناوی فارسی واتای خۆی هەیە و هەر ئێرانییەك دەتوانێت زۆر شتی بۆ دەرکەوێت لە ناوی تەواوی مودی، کە دەبێت بە سەید بزورگ مەحمودی. "سەید" ناونیشانێکی دینییە، هێمایەکە بۆ نەوەکانی پێغەمبەر مەحمەد ج لە دایکەوە یان لە باوکەوە. مودی شەجەرەیەکی خێزانی ئاڵۆزی هەبوو، کە لە فارسیدا دەنووسرێت بۆ پیشاندانی ئەم خزمایەتییە. دایك و باوکی نازناوی "بزورگ"یان بە مودی بەخشیبوو، بەو هیوایەی کەسێك دەرچێت شایەنی مەزنی، شکۆیی و ڕێز بێت. لە بنەچەدا ناوی دووەمی خێزانەکە، حەکیم بووە، بەڵام مودی لە کاتێکدا لەدایکبووە کە شا یاسایەکی دەرکردووە، قەدەغەی ناوی ئیسلامی لەم جۆرەی کردووە، باوکی مودیش ناوی خێزانەکەی کردووە بە مەحمودی، کە زیاتر فارسییە تا ئیسلامی. مەحمود بە واتای "ستایشکراو" دێت.

لەگەڵ باری کۆمەڵایەتی ئەم ناوانەی مودی، پلە و پایەی خوێندنیشی هاتەسەر. لەگەڵ ئەوەی هاونیشتیمانانی مودی ڕەسمەن ڕقیان لە ئەمریکا بوو، بەڵام سستمی خوێندنی ئەمریکایان دەنرخاند. مودی وەك ئەوەی دکتۆرێك بوو، لە ئەمریکا پراکتیکی کردبوو، گومانی تیادا نەبوو، کە دەبوو بە یەکێك لە دەستەی هەرە باڵای کۆمەڵگای ڕەسەنی خۆی.

دەستم بۆ ناو جانتاکەم برد، پاسپۆرتەکانم دەرهێنا و دامە دەست مودی. ئەویش خستیە گیرفانی ناوەوەی قاتەکەی.

فڕۆکەکە لە نیشتنەوە نزیکبووەوە. دەنگی مەکینەکانی وردوردە کەمدەبووەوە و لەپڕ پێشی فڕۆکەکە نائاساییانە دابەزی. "دەبێت بە خێرایی بنیشینەوە، چونکو دەوری شار هەمووی شاخە،" مودی وتی. فڕۆکەکە تەکانێکی بەهێزی دا. مەهتاب لە خەو ڕاچڵەکی و بە نیگەرانییەوە دەستی گرتم. بۆ دڵنیابوون تەماشایەکی کردم.

"هیچ نییە،" پێم وت، "دەنیشینەوە."

باشه ژنێکی ئەمریکایی بۆچی دەچێتە وڵاتێکەوە، کە ئاشکرا لە هەر وڵاتێکی تر، ئەو پەڕی هەڵوێستی دوژمنکارانە دەنوێنێت بەرامبەر بە ئەمریکا ؟ بۆچی کچەکەمم هێناوە بۆ وڵاتێك، کە لە جەنگێکی سەروماڵی دایە لەگەڵ عێراق؟

نەمدەتوانی ئەم مۆتەکەیە لە مێشکی خۆم دەرکەم، لەو کاتەوەی مامل فوسی، خوشکەزای مودی، پێشنیاری ئەم سەفەرەی کردبوو. دوو هەفتە پشوو لە هەر کوێیەك بێت، خۆت ڕادەگریت ئەگەر هیوای ژیانێکی ئاسایی و ئاسایش لە ئێمڕۆ و سبەینێدا بێت. بەڵام نەمدەتوانی ئەو بیرۆکەیە لە مێشکی خۆم دەرکەم، هەرچەند هاوڕێکانم پیان وابوو ئاژیربێژانەیە - بیرۆکەی ئەوەی کە مودی هەر ئەوەندەی من و مەهتابی هێنایە ناو ئێرانەوە، ئیتر بۆ هەتاهەتایە نەهێڵێت بگەڕێینەوە.

هەرگیز ئەوە ناکات، هاوڕێکانم دڵنیایاندەکردم. مودی تەواو بووە بە ئەمریکی. بۆ دوو دەیە دەچوو مودی لە وڵاتە یەکگرتووکانی ئەمریکا دەژیا. تەواوی داراییەکەی، پراکتیکی دەرمانی - هەرچی هەبوونەبووی ئێستا و داهاتووی بوو - لە ئەمریکادا بوو. بۆچی وا چاوی لێبکرێت، کە دەیەوێت ژیانی ڕابوردووی دەستپێبکاتەوە؟

ئەم قسەوباسانە ئەگەر ژیربێژانە چاوی لێبکرێت، مرۆڤ دەهێنێتە سەربار، بەڵام هیچ کەسێك وەك من، کەسایەتی ئاتەبای مودی نەدەناسی. مودی هاوسەرێك و باوکێکی خۆشەویست بوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك جار بە دڵڕەقانەترین شێوە پێویستی و ئارەزووەکانی خێزانەکەی خۆیی دەخستەپشتگوێ. مێشکی تێکەڵەیەك بوو لە لێهاتوویەکی ڕوون و سەرلێشێواییەکی تاریك. لەباری کەلتورییەوە تێکەڵەیەك بوو لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، هەتا بۆ خۆشی نەیدەزانی، لە ژیانیدا کاریگەری کامیان بەسەریدا زاڵە.

مودی زۆر هۆی هەبوو پاش دوو هەفتە، ئێمە بەرێتەوە بۆ ئەمریکا. هەروەها زۆر هۆی تری هەبوو، زۆرمانلێبکات لەناو ئێراندا بمانهێڵێتەوە.

هەتا ئەگەر ئەم ئەگەرە ترسانەکە لە ئارادا بوو، بۆچی، لە پای چی ڕازیبووم هەتم؟

***مەهتاب***

لەماوەی ئەو چوار ساڵەی ژیانیدا منداڵێکی زۆردو، دڵخۆش و پڕ لە هیوا بوو بۆ ژیان. پەیوەندییەکی گەرمی لەگەڵ من و باوکیدا هەبوو، هەروەها لەگەڵ کەرویشکەکەی، کە بوکەشوشەیەکی نەرمی هەرزانی ڕەنگ سەوزی خاڵ سپی، نزیکەی یەك مەتر درێژ بوو. بە قاچەکانیەوە پەتی پێوەبوو، تا مەهتاب بتوانێت بە قاچەکانی خۆیەوە بیبەستێت و سەمای لەگەڵدا بکات.

***مەهتاب***

بە فارسی، زمانی ڕەسمی کۆماری ئیسلامی ئێران، بە واتای "تریفەی مانگ" دێت. بەڵام بۆ من، مەهتاب بە واتای تیشکی ڕۆژ دەهات.

که تایەی فڕۆکەکە کەوتە سەر ڕێگای نیشتنەوە، سەیرێکی مەهتابم کرد، ئینجا مودی و زانیم، هۆی هاتنم بۆ ئێران چی بوو.

هەرکە لە فڕۆکەکە سەرمان هێنایە دەرەوە، کەوتینە ناو گەرمای تاقەتپڕوکێنی تارانەوە - گەرمایەك وەك ئەوەی بییەوێت تەختی زەوییەکەم بکات، کاتێك لە فڕۆکەکە هاتینە خوارەوە و بەرەو پاسێك دەچووین، بۆئەوەی بمانبات بۆ وێستگای فڕۆکەخانەکە. ئەمە هێشتا کاتژمێری حەوتی بەیانی بوو.

مەهتاب قایم دەستی گرتبووم، چاوە گەورە قاوەییەکانی زەقکردبۆوە بە ڕووی دنیایەکی نائاشنادا.

"مامی[1]،" بە گوێمدا چرپاندی، "دەبێت بچم بۆ تواڵێت."

"باشە، تواڵێتێك دەدۆزینەوە." کە گەیشتینە وێستگای فڕۆکەخانە، چووینە ناو هۆڵی پێشوازییەوە، هەستێکی ناهەموار تر خێرا دایگرتین - بە هۆی گەرماوە، بۆنی عەرەقی ئەو خەڵکە لە هۆڵەکەدا پەنگی خواردبووەوە. ئومێدەواربووم بتوانم زوو لەو ناوە دەربچم، بەڵام ئەمە ئاسان نەبوو، هۆڵەکە جمەی دەهات لەبەر ڕێبواران لە شوێنی جوارۆجۆرەوە و هەموو پاڵیان بە یەکتریەوە دەنا بەرەو تەنیا مێزی کۆنترۆڵی پاسپۆرت، کە تەنیا ڕێگای چوونە دەرەوە بوو.

ناچاربووین بچینە ڕیزەوە، وەك ئەو خەڵکە ڕێگای خۆمان بەرەو پێشەوە بکەینەوە. مەهتابم دابووە پێش خۆم و ئەم لا و ئەو لایم گرتبوو، تا لەو خەڵکە بیپارێزم. تەواوی دەوروپشتمان بە دەنگی بەرز و هاتوهاوار قسەیاندەکرد. من و مەهتاب نوقمی عارەق بووبووین.

دەمزانی ژنان لە ئێراندا دەبێت قۆڵ، لاق و ناوچەوانیان داپۆشن، بەڵام سەرسامبووم، کاتێك بینیم هەموو فەرمانبەرانی ژنی فڕۆکەخانەکە، وەك زۆربەی هەرە زۆری ڕێبوارە ژنەکان، سەرتاپای خۆیان لە قوماشێکەوە پێچاوە، کە مودی پێی وتبووم ئەوە *عەبایە*. عەبا جلێکی گەورەی شێوە نیوە بازنەییە، کە بە دەوری سەر و شان و ناوچەوان و ژێر چەناگەدا دێت، تەنیا چاو، دەم و لووت داناپۆشێت. ژنێك بە عەباوە، لە ڕاهیبەی زەمانی کۆن دەچێت. ئەو ژنانەی زۆر دینین، تەنیا یەك چاویان دەهێڵنەوە بۆ بینین. ئەو ژنانەی بەو ناوەدا تێپەڕدەبوون، چەند جانتای قورسیان بە یەك دەست هەڵگرتبوو، دەسەکەی تریشیان بە عەباکەیانەوە گرتبوو، تا ڕێك لە ژێر چەناگەیاندا ڕایگرن. ئەم عەبا ڕەشە درێژە، لە خواردکەیەوە پاندەبۆوە. ئەوەی منی زۆر سەرسامکرد، ئەوە بوو کە عەبا ناردزوومەندانە بوو. جلی تر هەبوو کە وەڵامدەرەوەی داوای سەختی یاسای جلوبەرگ بوو، بەڵام ئەم ژنە موسڵمانانە عەبایان هەڵبژاردبوو، بەسەر باقی جلەکانی دیکەدا لەبەریدەکەن، سەرەڕای ئەو گەرما تاقەتپڕوکێنە. سەرم سوڕما لە هێزی کۆمەڵگا و ئایین بەسەر ئەو خەڵکەوە. نیو کاژێری برد، تا توانیمان بەناو ئەو قەرەباڵغییەدا تێپەڕین و بگەینە بەردەم

# 5

مێزی کۆنترۆڵی پاسپۆرت. فەرمانبەرێکی مۆن تەماشایەکی پاسپۆرتەکەمانی کرد، کە بەناوی هەر سێکمانەوە بوو، مۆریکرد و هێمای بۆ کردین بڕۆین. مەهتاب و من لە پێشەوە و مودی لە دواوە، چووینە سەر قادرمەیەك بۆ سەرەوە بۆ مەیدانی وەرگرتنی جانتاکان، کە هۆڵێکی گەورەتر بوو، پڕبوو لە ڕێبوار.

"مامی، دەبێت بچم بۆ توالێت،" مەهتاب دووبارەیکردەوە، لە ناڕەحەتیدا خۆی بە پێوە نەدەگرت.

مودی بە فارسی لە ژنێکی عەبابەسەری پرسی. ژنەکە هێمای بۆ کۆتایی هۆڵەکە کرد و خێرا بۆیدەرچوو. مودیمان جێهێشت چاودڕوانی جانتاکان بکات، من و مەهتاب چووین بەرەو تواڵێت، بەڵام هەرکە دەرگاکەیمان کردەوە دوودڵبووین، بۆگەنێکی پیس دەهات. بە نابەدڵییەوە چووینە ژوورەوە. لەبەر ڕۆشنایی کزی ژوورەکەدا، وردبووینەوە بۆ تواڵێت، بەڵام تەنیا کونێکمان دۆزییەوە لە زەوییە کۆنکرێتییەکەدا، کە دەور درابوو بە چینییەکی شێوە هێلکەیی. ئەملا و ئەولای تواڵێتەکە هەر پیسی بوو، مێشولە تێیدابوو، ئەو خەڵکەی کە هاتبووە ئەوێ، کونەکەیان پشتگوێخستبوو یان لە دەستیان دەرچووبوو. "بۆنێکی زۆر پیس دێت!" مەهتاب هاواریکرد و ڕایکێشام بۆ دەرەوە. بە خێرایی گەڕاینەوە بۆ لای مودی.

سەغڵەتی مەهتاب دیار بوو، بەڵام نەیدەویست بچێت بۆ تواڵێتێکی تر. پێیباشبوو خۆی ڕاگرێت تا دەگەینە ماڵی پوری، خوشکی باوکی، سارا مەحمودی قودسی، کە مودی بەڕێزەوە باسیدەکرد. ئەم ژنە دایەگەورەی خێزانەکە بوو، هەموو یەکێك بە ڕێزێکی زۆرەوە بە عەمە بزورگ "پوردەگەورە" ناوی دەبرد. هەموو شتێك باشتر دەبێت، کە دەگەینە ماڵی عەمە بزورگ، لە دڵی خۆمدا وتم.

مەهتاب تەواو هیلاك بووبوو، بەڵام شوێنێك نەبوو دانیشێت، لەبەرئەوە عەرەبانەیەکی منداڵمان بۆی دامەزراند، کە مودی بە دیاری بۆ یەکێك لە منداڵە ساواکانی خزمەکانی هێنابووی. مەهتاب لەناویدا ئاسودە دانیشت.

کاتێك چاوەڕوانی جانتاکانمان دەکرد، کە هیچ هێمایەك نەبوو لەوەی بەم زووانە دەرردەکەوێت، گوێمان لە هاوارێکی قایم بوو بەرەو ڕووی ئێمە. "داییجی جون!" کەسێك بوو هاواریدەکرد. "داییجی جون!!"

بە فارسی بە واتای "خاڵە گیان" دێت. مودی ئاوڕیدایەوە و بەخۆشییەوە باوەشی بۆ پیاوێك کردەوە، کە بەرەو ڕووی ئێمە ڕایدەکرد. هەر دووکیان بۆ ماوەیەك باوەشیانکرد بە یەکتریدا، کە مودیم بینی فرمێسك بەچاویدا دێتەخوارەوە، هەستم بە تاوانباری کرد، بەوەی کە بەنابەدڵییەوە هاتووم بۆ ئەم سەفەرە. ئەمە کەسوکارییەتی. ئەمە بنەچەیەتی. بێگومان دەیەوێت و پێویستی پێیەتی بیانبینێت. دوو هەفتە بەخۆشی لەگەڵیاندا دەباتەسەر و پاشان دەگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە.

"ئەمە زیایە،" مودی ناساندی.

زیا حەکیم بە گەرمییەوە تەوقەی لەگەڵدا کردم.

زیا یەکێك بوو لەو کوڕە گەنجە بێشومارانەی خزمی مودی، کە مودی هەموویانی بە "خوشکەزا[2]" ناودەبرد. خوشکی زیا شوویکردبوو بە موستەفا، کوڕی سێیەمی خوشکە بەتەمەنەکەی مودی. دایکی زیا خوشکی دایکی مودی بوو، باوکیشی برای باوکی مودی بوو، یان بە پێچەوانەوە، ئەم پەیوەندییە خێزانیانە هیچ کات بۆم ڕۆشننەبووەوە. "خوشکەزا" ئاسانترین زاراوە بوو بۆ ناوبردنیان.

زیا هەر لە یەکەم چاوپێکەوتنەوە، زۆر خۆشحاڵبوو بە بینینی ژنی ئەمریکایی مودی. بە ئینگلیزییەکی ڕەوان، بەخێرهاتنیکردم بۆ ئێران. "زۆر خۆشحاڵبووم بە هاتنت،" زیا وتی. "دەمێکە چاوەڕوانی ئەم ساتە دەکەین!" پاشان مەهتابی بەرزکردەوە، باوەشی پیاکرد و ماچبارانی کرد.

زیا کوڕێکی قۆز بوو، شێوە ئیگای عەرەبی و زەردەخەنەیەکی سەرنجڕاکێشی پێوەبوو. لە هەموو ئەو پیاوە ئێرانیانەی کە لە دەوروپشتمان بوون، باڵا بەرزتر بوو، یەکسەر هەستت بە دڵشادی و کارامەیی دەکرد. ئاواتم ئەوە بوو، هەموو کەسوکاری مودی وەك ئەو بێت. قژە قاوەیییە سووربباوەکەی بەپێی مۆدێل تاشرابوو. قاتێکی جوان و کراسێکی تازە شۆڕاوی لەبەردابوو، کە لەسەروە قۆپچەکانی کرابۆوە. لە هەمووی واوەتر زۆر پاکوتەمیز بوو.

"کەسوکارێکی زۆر لەدەرەوە چاوەڕوانی بینینی ئێوە دەکەن،" زیا بەخۆشییەوە وتی. "بۆ چەند کاژێر دەچێت، ڕاوەستاون."

"چۆن لە خاڵی پشکنین هاتیتە ئەم دیوەوە؟" مودی پرسیاریلێکرد.

"هاوڕێیەکم لەوێ کاردەکات."

مودی گەشکە گرتی. بە دزییەوە پاسپۆرتەکانی لە گیرفانی دەرهێنا. "چی لەمانە بکەم؟" پرسیاریکرد. "نامانەوێت دەستی بەسەردا بگرن."

"بیدەرە دەست خۆم،" زیا وتی. "هیچ پارەیەکت پێیە؟"

"بەڵێ." مودی چەند پارچە پارەی کاغەزی جیاکردەوە و لەگەڵ پاسپۆرتە ئەمریکاییەکاندا دایە دەست زیا.

"لەدەرەوە دەتبینم،" زیا وتی، ڕۆشت و لەناو خەڵکەکەدا دیارنەما.

زیا سەرنجێکی باشی لا دروستکردم، باوەڕم بەو شتانە هێنا، کە مودی لەبارەی کەسوکارەکەیەوە بۆی باسکردبووم. زۆربەیان خوێندنی باڵایان هەبوو، هەندێکیان زانکۆیان تەواوکردبوو، هەندێکیان وەك مودی دکتۆر بوون یان خەریکی کاروباری بوون لەگەڵ دەرەوەی وڵات. چەند کەس لە "خوشکەزاکانیم" بینیبوو، کە سەردانی ئێمەیان کردبوو لە وڵاتە یەکگرتووەکان، هەموویان لەوەدەچوو، بەجۆرێك پلەوپایەیەکی کۆمەڵایەتیان هەبێت لەنێو خەڵکی خۆیاندا.

# 7

نە زیا و نە هیچ کەسێکی تر نەیتوانی کارێك بکات، زوو جانتاکانمان دەستکەوێتەوە. هەموو دەهاتن و دەچوون، بێبڕانەوە قسەیاندەکرد، بەڵام دەرکەوت هیچ ئاکامێکی وەهای نەبوو. سەرئەنجام ماوەی زیاتر لە سێ کاژێر لەو گەرمایەدا وەستاین، لە پێشدا بۆ جانتاکانمان و پاشان لە ڕیزی بێکۆتایی بەردەم پشکێنەرانی گومرگدا. مەهتاب هەروا بێدەنگ و خۆڕاگر مایەوە، بەڵام دەمزانی دەبێت لە چ سەغڵەتییەکدا بێت. لە کۆتاییدا چووینە پێشەوە و نۆبە هاتەسەر ئێمە، مودی لە پێشەوە و من و مەهتاب بە عەرەبانەکەوە لە دوایەوە.

پشکێنەرەکە بەناو هەموو جانتاکاندا بەوردی گەڕا، کە گەیشتە سەر ئەو جانتایەی هەمووی دەرمان بوو، ڕاوەستا. لەگەڵ مودیدا بە فارسی کەوتە قسەوباسێکی گەرم. مودی بە ئینگلیز بۆ منی باسکرد، کە بە پشکێنەرەکەی وتووە، دکتۆرە و ئەو دەرمانانەی هێناوە تا بیانبەخشێت بە هاوکارە ئێرانییەکانی.

پشکێنەرەکە گومانیکرد و کەوتە پرسیاری زیاتر. مودی دیارییەکی زۆری هێنابوو بۆ خزمەکانی، دەبوو هەموو ئەمانە بکرێنەوە و بپشکێنرێن. پشکێنەرەکە کەوتە گەڕانی جانتای جلوبەرگەکانمان و کەروێشکەکەی مەهتابی دۆزییەوە، کە دوا شت بوو لەگەڵ خۆمان هێنابوومان. کەرویشکەکەمان هاوسەفەرێکی باش بوو، لەگەڵماندا بوو بۆ تاکساس، مەکسیك و کەنەدا. لە دیترۆیت خەریکبوو ماڵەوەمان جێدەهێشت، کە مەهتاب بڕیاریدا، بەبێ هاوڕێ خۆشەویستەکەی سەفەری ئێران نەکات.

پشکێنەرەکە ڕێگایدا، جانتای جلوبەرگەکانمان و - بۆ ئاسوودەیی مەهتاب کەروێشکەکە بەرین لەگەڵ خۆمان. باقی جانتاکان، پشکێنەرەکە وتی، دوایی بۆمان دەنێرنەوە، پاش پشکنینێکی تەواو.

ئیتر ئەوەش تەواوبوو، پاش نزیکەی چوار کاژێر لە هاتنە خوارەوەمان لە فڕۆکەکە، چووینە دەرەوە.

لەپڕ کۆمەڵێك عەبابەسەری جلوبەرگ درێژ تا قولەپێ، دەوری مودیان دا، هەموو هەوڵیاندەدا پێیبگەن یان هیچ نەبێت چمکێك لە قاتەکەی بگرن. زیاتر لە سەد کەس لە کەسوکاری بە دەوریدا کۆبوونەوە، هاواریاندەکرد، دەگریان، تەوقەیان لەگەڵدا دەکرد، باوەشیان پیادا دەکرد، ماچیاندەکرد، ماچی من و مەهتابیان دەکرد. لەوە دەچوو، هەموو گوڵیان لەگەڵ خۆیان هێنابێت و دایان بە من و مەهتاب. زۆری نەبرد هەردوو باوەشمان پڕبوو.

مودی لە خۆشییاندا فرمێسك بە چاویدا هاتە خوارەوە، کاتێك کە عەمە بزورگ خۆیی تێوەئاڵاند. عەمە بزورگ، وەك باقی ژنەکانی تر، خۆی لە عەبایەکی ڕەشی قورسەوە ئاڵاندبوو، بەڵام بەهۆی وێنەکانییەوە یەکسەر ناسیمەوە. لووتە قولاپییەکەی نیشانە بوو. ژنێکی شان پانی ئێسقان گەورە بوو، دیاربوو چەند ساڵ لە تەمەنی چل و حەوت ساڵەی

مودی گەورەتر بوو. باوەشێکی قایمی بە مودیدا کرد، دەستی بەسەر شانەکانیدا دەهێنا، قاچی دەدا بە زەویدا و لاقی تێوەدەناڵاند، وەك ئەوەی هەرگیز نەهێڵێت بڕوات.

بۆچی من ئەم لەچکە قۆڕەم بەستووە؟ بۆم جێی پرسیار بوو. قژم بە پێستی سەرمەوە نووسا. عارەقم دەڕژا، بیرم دەکردەوە: ئێستا منیش دەبێت وەك ئەو خەڵکە، بۆنم لێبێت.

لە ئەمریکا مودی دکتۆر بوو، کارشناسی نەخۆشی ئێسقان و کەمکردنەوەی ئازار بوو، کارێکی بەڕێز، بە دەستکەوتی ساڵانەی نزیك سەد هەزار دولاردوە. لێرە دەبێت بە کوڕە بچوکەکەی جارانی عەمە بزورگ. دایك و باوکی مودی هەر دووکیان دکتۆر بوون، مودی تەمەنی شەش ساڵ بووە کاتێك ئەوان مردوون، پاشان خوشکەکەی وەك کوڕی خۆی بەخێویکردووە. گەڕانەوەی پاش نزیك بە دە ساڵ، عەمە بزورگی ئەوەندە گەشکەیار کردبوو، کە سەرئەنجام کەسوکاردەکە ناچاربوون مودی لە ژێر چنگی دەربهێنن.

مودی ئێمەی بە عەمە بزورگ ناساند، ئێنجا هاتە وێزی ئێمە، قایم باوەشییپیاکردم، ئەوەندە ماچیکردم هەناسەم لێبڕا، هاوکات بە فارسی قسەیدەکرد. لووتی ئەوەندە گەورە بوو، نەمدەتوانی باوەڕ بە خۆم بهێنم، کە لووتی خۆیەتی. لەژێر چاوە قاوەییە سەوزباوەکانیدا، کە بەهۆی فرمێسکەوە بریسکەیان دەهات، پانبووبۆوە. دەمی پڕبوو لە ددانی کەلوکۆمی کرمۆڵ.

پاشان مودی بابەحاجی، هاوسەری خوشکەکەی، پێناساندم. مودی وتی، ناوەکەی بە واتای "باوکێك کە چووبێت بۆ مەککە،" دێت. پیاوێکی باڵا کورتی مۆنی گرژ بوو، قاتێکی ڕەنگ خۆڵەمێشی لەبەردابوو، پانتۆڵەکەی ئەوەندە درێژ بوو پێڵاوە قوماشییەکەی شاردبۆوە، ورتەی لە دەم نەهاتە دەردەوە. سەیری زەوییەکەی پێش خۆی دەکرد، چاوانی نووقمی دەموچاوی چرچی بووبوو، تەماشاینەدەکردم. ڕیشە سپییە درێژ و تیژەکەی، دروست وەك ڕیشەکەی ئایەتوڵا خومەینی وابوو.

هەموو بە جارێك ملوانکەیەکیان لەملکردم، کە بە گوڵ چنرابوو، لە خۆم درێژتر بوو، شان و ملمی گرتەوە. ئەمە لە هێمایەك دەچوو، هەموو بە یەکجار بەرەو شوێنی پارکی ئوتومبیل چووین. پێشبڕکێ بوو بۆ کۆمەڵێك ئوتومبیلی سندوقی سپی وەك یەك، شەش و هەشت و هەتا دوانزە کەس دەچوونە ئوتومبیلێکەوە. قاچ و دەست لە هەموو لایەکەوە لە ئوتومبیلەکان هاتبوونە دەرەوە.

وەك ڕێزلێنانێك، من، مودی و مەهتاب براین بۆ ئوتومبیلێکی شۆفرلێتی پانی شینی تۆخ، کە مۆدێلی سەرەتای حەفتاکان بوو. هەرسێکمان چووینە کورسییەکانی دواوە، عەمە بزورگ لە پێشەوە، حوسەین، کوڕە هەرە گەورەکەی، ئەو شانازییەی پێبەخشرابوو کە ئوتومبیلەکە لێخوڕێت و زوهرە، کە گەورەترین کچی شوونەکردووی عەمە بزورگ بوو، لە نێوان دایك و براکەیدا دانیشت.

ئوتومبیلەکەمان، بە گوڵ ڕازێنرابووەوە، بوو بە سەرقافڵەی ئەم کاروانە و بە هاتوهاوارەوە فڕۆکەخانەمان بەجێهێشت. پاشان یەکسەر دەورمان دایەوە بە دەوری قوللەی

# 9

شەهیددا، کە بەسەر چوار پای کەوانەیی جوانەوەیە. ڕەنگی خۆڵەمێشییە و بە مۆزایکی شینی تۆخ ڕازێنراوەتەوە، لەبەر تیشکی ڕۆژی نیوەڕۆدا دەبریسکایەوە. ئەم قوللەیە لە کاتی ڕژێمی شادا دروستکراوە، وەك نمونەیکی خوازراوی تەلارسازی فارسی. مودی پێیوتبووم، تاران بەم قولله سەرنجڕاکێشەوە بەناوبانگە، کە وەك قوللەیەکی پاسەوانی وایە لە قەراغی شار.

قوللەکەمان تێپەڕاند و چووینە ناو *مۆتۆڕوەی* وە و حوسەین پێی نا بە بەنزیندا و خێرایی کۆنە شۆفرلێتی گەیاندە سەد و سی کیلۆمەتر لە کاژێرێکدا، نزیك ئەو سنووردەی کە ئوتومبیلەکە هەیبوو.

کاتێك بە ڕێگاوە بووین، عەمە بزورگ ئاوڕیدایەوە و پاکەتێکی دامێ، کە بە کاغەزی دیاری پێچرابووەوە. قورس بوو.

بۆ ڕاوەرگرتن، سەیرێکی مودیم کرد. "بیکەرەوە" مودی وتی.

کردمەوە، پاڵتۆیەکی گەورە بوو، کە دەگەیشتە قولەپێم. زۆر دەرزیوەرووەمانی تیادا کرابوو و بێناوقەد بوو. مودی پێیوتم، قوماشەکەی جۆرێکی گرانبەهای خوری تێکەڵە، بەڵام وا هەستی پێدەکرێت، کە نایلۆن بێت یان هەتا پلاستیك. قوماشێکی قورس بوو، زۆر سفت ڕێسرابوو، کە گەرمای هاوینی لێدەکردی بەحەمام. ڕەنگەکەی سەوزی زەیتونی کاڵ بوو، ڕقم لە ڕەنگەکەی دەبووەوە. هەروەها سەرپۆشێکی سەوزی قورسی درێژی لەگەڵ بوو، کە زۆر ئەستورتر بوو لەوەی سەری خۆم.

بۆ بەخشندەییەکەی خۆی، عەمە بزورگ زەردەخەنەیەکی کرد و شتێکی وت، مودیش وەریگێڕا: "پاڵتۆکە *مانتۆیە*. ئەوەیە کە ئێمە لەبەریدەکەین. سەرپۆشەکەش پێی دەڵێن *ڕووسەری*. لە ئێراندا دەبێت ئەمانەت لەبەردابێت، کاتێك دەچیتە دەرەوە."

ئەمەیان بە من نەوتبوو. کاتێك مامل، چواردەمین کوڕی بابەحاجی و عەمە بزورگ، لە سەردانەکەیدا بۆ لای ئێمە لە میشیگان، پێشنیاری ئەم سەرفەردی کرد، وتی، "کاتێك لە ماڵ دەچیتە دەرەوە، کراسی قۆڵدرێژ و سەرپۆش لەگەڵ گۆرەوی ڕەنگ تۆخ دەپۆشیت." بەڵام هیچ شتێکی نەوت لەبارەی پاڵتۆی درێژی خنکێنەر، لە گەرمای چلەی هاویندا.

"نیگەران مەبە،" مودی وتی. "وەك دیارییەك پێشکەشیکردووە بە تۆ. تەنیا کە چوویتە دەرەوە، لەبەریبکە."

نیگەران بووم، کاتێك حوسەین لە مۆتۆڕوەیەکە هاتە خوارەوە، چاوم بەو ژنانە کەوت، کە بەسەر شۆستەی قەراغ شەقامەکانی تاراندا دەڕۆیشتن. تەواو خۆیان داپۆشیبوو، لە تەوقی سەریانەوە تا بنی پێیان، زۆربەی هەرە زۆریان عەبایان پۆشیبوو بەسەر پاڵتۆ و سەرپۆشەکانیاندا، هەر وەك ئەو *مۆنتۆ* و *ڕووسەری*یەی کە بە منیان دابوو. هەموو ڕەنگەکان دڵتەنگ بوون.

چیم لێدەکەن، ئەگەر لەبەریانەکەم؟ پرسیارمکرد. دەمگرن؟

پرسیارەکەم ڕوو بە مودی دووبارەکردەوە و بە وشەیەك وەڵامیدامەوە، "بەڵــــێ."

نیگەرانیم سەبارەت بە یاسای جلوبەرگ خێرا لەبیرچۆوە، کاتێك حوسەین چووە ناو ترافیکەوە. جادەی تەسکی پڕ ئوتومبیل، کە زۆربەی کات گیریاندەکرد. هەر شۆفێرێك بەدوای بۆشاییەکەوە بوو، هەرکە دەیبینی، گێرِی دەگۆڕی و بێوەستان هۆڕنی لێدەدا. کاتێك حوسەین هیلاکبوو بەدەست چاوەڕوانی زۆرەوە، لە ناو جادەی یەك سایەیدا، بەو پەڕی خێراییەوە، بە بەگ گەڕایەوە. هەر لەوێدا ئاکامی ئەو جۆرە لە یاسای ترافیکەم بەچاوی خۆم بینی، شۆفێر و ئەو خەلکەی لەو ناوەدا بوون، بە یەکتریدا هەڵەشاخان، هەندێك جار ئەمە دەبوو بە شەڕە بۆکس.

لە ڕێی وەرگێڕانی مودییەوە، عەمە بزورگ ڕوونیکردەوە، کە ڕۆژانی هەینی ئاسایی ترافیك کەمترە. لە ڕۆژی هەینیدا، ڕۆژی پشووی هەفتانەی موسڵمانان، خێزانەکان لە ماڵی یەکێك لە خزمە بەتەمەنەکانیاندا کۆدەبنەوە، تا کاتێکی زیاتر پێکەوە بن و بە کۆمەڵ نوێژبکەن. بەڵام کات ئەوەندەی نەمابوو بۆ خوتبەی نوێژی هەینی، کە لە لایەن یەکێك لە پیاوە هەرە پیرۆزەکانی ئیسلامەوە بەڕێوەدەبرا لە ناوەڕاستی شار. ئەم ئەرکە زۆرجار لەلایەن سەرەك کۆمار حوجەتئیسلام سەید عەلی خامەنییەوە ئەنجام دەدرا (ئەمە نابێت تێکەڵ بکرێت لەگەڵ ئایەتوڵا ڕۆحوڵا خومەینی، کە وەك ڕابەرێکی دینی، هەتا لە سەروو سەرەك کۆمارەوەیە)، بە یارمەتی حوجەتئیسلام عەلی ئەکبەر هاشمی ڕەفسەنجانی، کە سەرۆکی پەرلەمان بوو. ملوێنەها کەس  نەك هەزارەها، عەمە بزورگ دوپاتیدەکردەوە - ئامادەی نوێژی هەینی دەبوون.

مەهتاب بە بێدەنگییەوە تەماشایدەکرد، باوەشیکردبوو بە کەروێشکەکەیدا، بەسەرسامییەوە دەیڕوانی، گوێیدەگرت و هەوای ئەم جیهانە ناناشنایەی هەڵدەمژی. دەمزانی، ئازار دەکێشێت، دەبێت خۆی بگەیەنێتە توالێت.

پاش ئەوەی بۆ ماوەی کاژێرێك گیانی خۆمان خستبووە دەستی لەرزۆکی حوسەینەوە، گەیشتینە بەردەرگای ماڵی خانەخوێکەمان، ماڵی بابەحاجی و عەمە بزورگ. مودی شانازیدەکرد، کە ماڵەکەیان دەکەوێتە ناوچەیەکی خۆشی باکووری تارانەوە، چەند کۆڵان لەولای سەفارەتی چینەوە، ماڵەکە خانوویەکی گەورەی کۆنکرێتی سەربان تەخت بوو. پەرژینێکی شیش قایمی نزیك بە یەکی لەحیمکراوی بەرزی ڕەنگ سەوز ماڵەکەی جیاکرابۆوە لە شەقامەکە. بەناو دەرگایەکی دووتاکی ئاسنیندا چووینە حەوشەیەکی کۆنکرێتییەوە.

من و مەهتاب هەر زوو زانیمان، کە بە پێڵاوەوە نابێت بچینە ژوورەوە، دوای مودی کەوتین و پێڵاوەکانمان لە حەوشەکەدا جێهێشت. میوانێکی زۆر هاتبوون، پێڵاو و نەعلێکی زۆر لە سوچێکی حەوشەکەدا بڵاوبووبۆوە. لە لایەکی حەوشەکەدا سێ مەقەڵی ئەوتی دانرابوو، پیاوانی چێشتکەر خەریکیان بوون، ئەمانە بۆ ئەم بۆنەیە بەکرێگیرابوون.

بە گۆڕدوییەوە پێمان نایە ناو هۆڵێکی گەورەوە، کە قەبارەکەی بەلایەنی کەمەوە دوو ئەوەندەی ژووری دانیشتنی ئەمریکایی دەبوو. دیوارەکانی بە داری ساج داپۆشرابوون و

دەرگاکانی تەختەی دارگوێزی ئیسپرتۆکرا بوون. بە سێ چوار فەرشی ئێرانی زۆربەی ناوفەرشی هۆڵەکە داپۆشرابوو. بەسەر فەرشەکاندا سفرەیەکی نایلۆنی گولگوڵی ڕاخرابوو. لە هۆڵەکەدا هیچ مۆبیلەیەك نەبوو، جگە تەلەفیزیۆنێکی بچوك نەبێت لە سوچێکدا.

لە پەنجەرەی دواوەی هۆڵەکەوە، لە حەوشەکەدا حەوزێکی مەلەم لێدیاربوو، تیایدا ئاوی ڕوونی شین بریسکەی دەهات. لەگەڵ ئەوەی لە ڕۆژێکی وادا، کەس ناتوانێت ڕوو لە ئاوێکی وا فێنك وەرگێڕێت، کەچی حەزم بەلای مەلەدا نەدەچوو.

لەگەڵ ئێمەدا، کۆمەڵە خزمانێکی دڵشاد، بەدەم قسەکردنەوە، لە ئوتومبیلەکان هاتنە خوارەوە و خۆیان کرد بە ماڵدا. مودی دیاربوو، زۆر شانازی بە ژنە ئەمریکاییەکەیەوە دەکرد. گەشکە دەیگرت، کاتێك خزمەکانی بایەخێکی زۆریان دەدا بە مەهتاب.

عەمە بزورگ ژوورەکەی ئێمەی پیشاندام، کە دەکەوتە ئەو پەڕی داڵانەکەوە، لەلای چەپی هۆڵەکەوە. ژوورێکی بچوکی چوارگۆشە بوو، بێجگە لە دوو قەرەوێڵەی پێکەوە نوسێنراو و کەنتۆرێکی تەختە، هیچی تری تێدا نەبوو.

خێرا بەدوای توالێتدا گەڕام بۆ مەهتاب، کە دەکەوتە خوار ژوورەکەمانەوە. کاتێك دەرگاکەیمان کردەوە، یەکسەر هەردووکمان سڵەمینەوە لە بینینی گەورەترین شەوگەرت، کە تا ئێستا بینیبێتم. ئاژەڵەکە بەسەر زەوییە مەڕمەڕەکەدا بۆیدەرچوو. مەهتاب نەیدەویست بچێتە ژوورەوە، بەڵام ئیتر ئێستا نەچوونە ژوورەوە مەحاڵ بوو. منیشی لەگەڵ خۆیدا ڕاکێشایە ژوورەوە. بەڵام باش بوو، سیفۆنێکی ڕۆژئاواییان هەبوو. لە جیاتی کاغەزی توالێت، سۆندەیەکی ئاو بە دیوارەکەوە هەڵواسرابوو.

توالێتەکە بۆنی کەڕوی لێدەهات و لە پەنجەرەیەکەوە، کە بە ڕووی گەرماوێکی شێوازی فارسیدا دەکرایەوە، بۆنێکی ناخۆش دەهاتە توالێتەکەوە، بەڵام ئەم ئاسانکارییە زۆر باشتر بوو لەوەی فڕۆکەخانەکە. لەتەنیشت مەهتاب ڕاوەستام، تا لە کۆتاییدا ئاسوودە بوو.

گەڕاینەوە بۆ هۆڵەکە و بینیمان مودی، چاوەڕوانمانــە. "لەگەڵم وەرن" مودی وتی. "دەمەوێت شتێکتان پیشانبدەم."

من و مەهتاب دوایکەوتین بۆ دەرگای سەرەکی و پاشان بۆ دەرگای حەوشە.

مەهتاب قیژاني. خوێنێکی تازەی گەش لە بەردەرگای حەوشە ڕژابوو. مەهتاب چاوانی خۆی گرت.

مودی بەئارامی باسیکرد، کە خێزانەکە مەڕێکیان لە پیاوێکی فرۆشیاری گەڕۆك کڕیوە. بۆ ڕێزگرتن لە ئێمە، داوایان لە پیاوەکە کردووە، مەڕەکە سەرببڕێت. ئەمە دەبوو پێش گەیشتنی ئێمە بکرایە، تا بۆ یەکەم جار ئێمە بەناو خوێنەکەدا بهاتینایەتە ماڵەوە. ئینجا مودی داوایدەکرد، ئێستا بەناو خوێنەکەدا دووبارە بێینەوە ژوورەوە.

"نـــا، وازبێنە، خۆت بیکە،" پێموت. "من نامەوێت ئەم شتە گەمژانەیە بکەم."

مودی لەسەرخۆ و بەڕەقییەوە وتی، "دەبێت بیکـــەیت. دەبێت ڕێزی خۆت پیشانبدەیت. گۆشتی ئەو مەڕە، دەدرێت بە خەڵکی هەژار."

ئەو کاردم بە نەریتێکی شێتانە دەزانی، بەڵام نەمویست، دڵی کەس بشکێنم و بە نابەدڵییەوە ڕازیبووم. کە مەهتابم لە باوەشگرت، توند دەموچاوی نووساند بە سنگمەوە. بە دوای مودیدا، دەوری خوێنەکەمان دەیەوە بۆ سەر شەقامەکە، ئینجا بەناو خوێنەکەدا هاتینە ژوورەوە، لە کاتێکدا کەسوکار لەژێر لێوەوە دوعایان دەخوێند. ئینجا ئێستا هاتنمان ڕەسمییەتی پەیداکرد.

دیارییەکان دابەشکران. لەناو ئێرانییەکاندا وا باوە، کە بوک خشڵ و ئاڵتون بەدیاری وەربدەگرێت لە خێزانی هاوسەرەکەی. لەوەدا نەمابووم بوک بم، بەڵام ئەوەندە ئاگاداری پەیوەندی کۆمەڵایەتی ئەو خەڵکە بووبووم، کە چاوەڕوانی دیارییەکی وا بکەم، لە یەکەم دیدارمدا. بەڵام عەمە بزورگ ئەم نەریتەی پیشتگوێخست. دوو تاك بازنگی ئاڵتونی دا بە مەهتاب، بەڵام هیچ خشڵێك بۆ من نەبوو. ئەمە سەرزەنشتێکی ئاشکرا بوو. دەمزانی، عەمە بزورگ پێیخۆشنەبووە، مودی ژنێکی ئەمریکایی هێناوە. بەڵام بە من و مەهتاب سەروو عەبای ڕەنگی بۆ ناوماڵ پێداین. عەباکەی من، تەخت شیرییەکی کاڵی گوڵ مێخەکی بوو، ئەوەکەی مەهتاب تەخت سپییەکی گوڵ پەمەیی بوو.

لەژێر لێوەوە سوپاسمکرد بۆ دیارییەکان.

کچەکانی عەمە بزورگ، زوهرە و فریشتە، کەوتنە هێنانی سینیە جگەرە بۆ میوانە گرنگەکان و چا بۆ هەموو کەسێك. منداڵانیش، کە لەلایەن گەورەکانیانەوە پشتگوێخراوبوون، هەروا بەناودا ڕاکەڕاکەیان بوو.

دەمەو عەسر بوو. میوانەکان هێشتا لە هۆڵە گەورەکەدا دانیشتبوون، کە ژنان نانیان هێنا و لەسەر ئەو سفرەیەی کە بەسەر فەرشەکاندا ڕاخرابوو، دایاننا. دەوری لەدوای دەوری توور دادەنرا، کە بەشێوەیەکی جوان قاشبوو، وەك گوڵ ڕازاندبوویانەوە، لەگەڵ گێزەر بەشێوەی درەخت چنیبوویان. هەروەها ماست لە قاپی بچوك بچوکدا، نانی تەنکی پان، پارچە پەنیری سوێر و سینییەکی پڕ قەڵابەچن میوەی تازە. *سەبزی*[3] (چەند سینی سەوزەی تازەی نەعنا، ڕێحانە و کەوەر) باقی ڕەنگەکانی تری تەواودەکرد.

ئینجا چێشتکەرەکان، بە کەڵکوەرگرتن لە قاپ و دەوری ماڵەکە، خواردنەکەیان لە حەوشەکەدا ئامادەدەکرد و دەیانهێنایە ژوورەوە. چەند دەرزەن خواردنی جۆراوجۆر بوو. دوو مەنجەڵی گەورەی برنج بوو - یەکێکیان برنجی سپی ئاسایی و ئەوی تریان بە سەوزە و لۆبیاوە - کە بە شێوازی ئێرانی لێنرابوو، مودی ئەمەی زۆر لەمێژ بوو فێرکردبووم. لە پێشدا برنجەکە دەکوڵێنرێت، پاشان تێکەڵی ڕۆن دەکرێت و دادەنرێت تا دەمبکێشێت، چینێك بنکڕیش لە بنی منجەڵەکەدا دروستدەبێت. ئەمە خواردنێکی سەرەکی ئێرانییەکانە، لەگەڵ شلەی جۆراوجۆردا دادەنرێت، کە پێیدەڵێن *خۆرشت*، کە لە سەوزە، داودەرمان و زۆرجار پارچە گۆشتی بچوکبچوك دروستدەکرێت.

چێشتکەرەکان برنجەکەیان بە چەند بەلەمی گەورە دانا، بەلەمی برنجە سپییەکان زرشکی بەسەردا کرابوو یان بە زەعفەران خەتێکی پانی تیادا کێشرابوو. بەم بۆنەیەوە،

دوو جۆر خۆرشتیان دروستکردبوو، یەکێکیان کە ئێمە لە ماڵی خۆماندا زۆر لامان پەسەند بوو، لە باینجان، تەماتە و گۆشتی مەڕ دروستدەکرێت، ئەوی تریان لە پارچە گۆشتی مەڕ، تەماتە، پیاز و لەتکەنۆک. مریشک خواردنێکی خۆشی بەتامی ئێرانییەکانە، کە لە پێشدا بە پیازەوە دەیکوڵێنن و پاشان لە ڕۆندا سووریدەکەنەوە.

ئەو خەڵکە بە دانیشتنەوە لەسەر فەرشەکە، چوارمشقی یان لەسەر یەک ئەژنۆ، وەک گەلە ئاژەڵی لەبرسا مردوو، پەلاماری خواردنەکەیان دا. تەنیا شتێک کە هەبوو خواردنی پێبخورێت، کەوچکی گەورە بوو، کە زیاتر لە کەوگیر دەچوو. هەندێکیان لەگەڵ کەوچکدا پارچەیەک نانی بەکاردەهێنا، کە وەک پاروی لێدەکردا، هەندێکی تریان دەستی بۆ کەوچک نەدەبرد. لە خولەکێکدا ئەو ناوە هەمووی بوو بە خواردن. بەدەم قسەوە، چۆن بۆیان بلوایە خواردنیان دەبرد بۆ دەمیان، کە بەسەر سفرە و فەرش و دەورییەکاندا هەڵدەوەری و هەتا پارچە دەکەوتە خوارەوە. ئەم دیمەنە ناشیرینەی هەڵپەی خواردنە، یاوەربوو لەگەڵ قسەکردندا. لەوەدەچوو هەموو ڕستەیەک بە "ئینشائەڵا" تەواوبێت. وا دیاربوو بە بێڕێزی دانانێن، لە کاتێکدا ناوی خوا دەبەن، بێمەبەست خواردن بەو ناوەدا بڵاودەکەنەوە.

کەس لەگەڵ من بە ئینگلیزی نەدەدوا. کەس سەرنجی بۆ لای من و مەهتاب نەدەچوو.

هەوڵمدا نان بخۆم، بەڵام سەختبوو بنوشتێمەوە و دەورییەکەم تێکەم، هاوکات هاوسەنگی خۆم ڕاگرم و تەنورەکەی بەرم بەرزنەبێتەوە. تەنورەکەم تەسک بوو، بۆئەوە نەدەووورابوو، کە لەسەر فەرش پێوەی دانیشم. هەرچی چۆنێک بوو، توانیم دەورییەک پڕبکەم.

مودی هەندێ خواردنی ئێرانی فێرکردبووم، چۆن دروستدەکرێت. من و مەهتاب، نەک هەر خواردنی ئێرانی بەڵکو کۆمەڵێکی زۆر لە خواردنی وڵاتانی ئیسلامیمان پێخۆش بوو. بەڵام کە دەمم بۆ ئەم خواردنە برد، بینیم بەشێوەیەکی باوەڕنەکراو چەورە. لە ئێراندا، چەوری نیشانەی دەوڵەمەندییە  هەتا ڕۆنی خواردن. چونکو ئەمە بۆنەیەکی تایبەت بوو، خواردنەکە نوقمی چەوری بوو. نە من و نە مەهتاب نەمانتوانی زۆر بخۆین. بەسەر زەڵاتەکەوە نیشتینەوە، بەڵام ئارەزووی خواردنمان نەمابوو.

بێزەوقیمان لەگەڵ خواردنەکە، ئاسان بوو بیشارینەوە، چونکو سەرنج و هۆشی هەموو خێزانەکە بەلای مودییەوە بوو. لەمە تێدەگەیشتم و قبووڵمبوو، بەڵام بۆ خۆم هەستم بە تەنیایی و بەتاککەوتنەوە دەکرد.

هەرچی چۆنێک بوو، ڕووداوە نائاشناکانی ئەو ڕۆژە بێکۆتاییە، ترسی دڵمی کەمکردەوە، کە مودی ناکەوێتە هەوڵی درێژکردنەوەی ماوەی ئەو دوو هەفتەیەی، کە بڕیارمان لەسەر دابوو. مودی بە بینینی خێزانەکەی گەشکەیار بووبوو، بەڵام ئەمە شێوازی ژیانی ئەو نەبوو. ئەو دکتۆر بوو، دەیزانی گرنگی پاکوتەمیزی لەچی دایە و سودمەندی خۆراکی بە هەند دەگرت. کەسایەتی زۆر جیاواز بوو، لەوەی ئەم کۆیە پیشانی دەدا. باوەڕێکی تەواوی هەبوو بە ئاسودەیی، خۆشی لە گفتگۆ دەبینی، یان سەرخەوی پاشنیوەڕوان، کاتێک لەسەر

کورسییە پەسەندکراوەکەی دادەنیشت و خۆی ڕادەژاند. بە زەحمەتم دەزانی، ڕابێت لەسەر فەرش بە چوارمشقی دانیشێت. دەمزانی هیچ هۆیەکی نییە بتوانێت، ئێرانی لا پەسەندتر بکات لە ئەمریکا.

من و مەهتاب سەیری یەکتریمان دەکرد و مێشکی یەکتریمان دەخوێندەوە. ئەم پشووە، دابڕانێکی کورت دەبێت لە ژیانە ئاساییەکەی ترمان لە ئەمریکا. دەتوانین بەئارامی تێیپەڕێنین، بەڵام مەرج نییە حەزی لێبکەین. هەر لەو ساتانەی سەرەتاوە، کەوتینە ژماردنی ئەو ڕۆژەی کە دەگەینەماڵەوە.

نانخواردن درێژەی کێشا. لەکاتێکدا گەورەکان خەریکی کێشکردنی خواردن بوون بۆ دەمیان، منداڵەکان تا دەهات بێئارامییان زیاتر دەبوو، کەوتنە شەڕکردن. خواردنیان دەگرتە یەکتری و قاوقریشکیان بەرزبۆوە، بەناو سفرەکەدا ڕایاندەکرد و هەندێک جار قاچە پیسەکانیان دەکەوتە ناو دەورییەکانەوە. سەرنجم بۆ لای هەندێک منداڵ چوو، کە بە جۆرێک بە ناتەواوی لەدایکبووبوون. هەندێکی تریان دەموچاو و نیگایەکی سەیریان پێوە بوو. بۆم پرسیار بوو، کە ئەمە ناکامی شوکردن و ژنهێنانی نێوان خزمانە. مودی هەوڵیدەدا تێمبگەیەنێت، کە لە ئێراندا پەیوەندییەکی وەها ناکامێکی خراپی نییە، بەڵام دەمزانی، کە هەر لەو ژوورەدا، هەندێک لە ژن و مێردەکان ئامۆزای یەکتر بوون. سەرئەنجامەکەشی ئاشکرا دیاربوو لەنێو هەندێک لە منداڵەکاندا.

پاش ماوەیەک ڕەزا، پێنجەمین کوڕی بابەحاجی و عەمە بزورگ، ئەسیای هاوسەری پێناساندم. ڕەزام باش دەناسی. لە کروپس کریستی لە تەکساس بۆ ماوەیەک لەگەڵماندا ژیا. بوونی لەگەڵماندا، بارێک بوو بەسەرمەوە، تا لە کۆتاییدا داوام لە مودی کرد، بیکاتە دەرەوە، هەرچەند ئەمە شێوەی هەڵسوکەوتی من نەبوو لەگەڵ هیچ کەسێکدا. کەچی لێرە و لەم کاتەدا، ڕوویەکی خۆشی تێکردم و یەکێک بوو لەو چەند کەسەی، کە بە ئینگلیزی قسەی لەگەڵدا دەکردم. ئەسیا لە بەریتانیا خوێندبووی و ئینگلیزییەکی ڕەوان دەدوا. منداڵێکی کوڕی بەبەرەوە بوو.

"ڕەزا زۆر لەبارەی تۆ و مودییەوە قسەی بۆ کردووم،" ئەسیا وتی. "زۆر مەمنونی ئەو هەموو شتەیە، کە ئێوە بۆتان کردووە."

لەبارەی منداڵەکەیەوە پرسیم، کەچی قورگی پڕبوو لە گریان. مەهدی بە قاچی گێڕەوە لەدایکبووبوو، هەر دووکیان بۆ دواوە خواربووبوونەوە. سەری زۆر سەرنجڕاکیش بوو، ناوچەوانی لەچاو دەموچاویدا گەورە دیاربوو. ئەسیا هەم هاوسەری ڕەزا بوو، هەم ئامۆزای. تەنیا چەند خولەکێک گفتگۆمان درێژەی کێشا، کە ڕەزا ئەسیای دوورخستەوە لێم بۆ ئەوسەری ژوورەکە.

مەهتاب بێهودە مێشولەیەکی لە خۆی دووردەخستەوە، کە تلۆقێکی سووری گەورەی بە ناوچەوانییەوە دروستکردبوو. گەرمای ئێوارانی مانگی ئاب بوو، ئینسانی دەبرژاند. وەک ئاواتەخوازبووم، خانووەکە هەواخۆشکەری تیادا بوو، بەڵام لەبەر چەند

هۆیەك، عەمە بزورگ دەرگا و پەنجەرەی بێتەلی خستبووە سەرپشت - هەوای گەرما و مێشولە دەهاتنە ژوورەوە.

دەمبینی، مەهتاب وەك من بێئارامە. بۆ ڕۆژئاواییەك، گفتوگۆیەکی ئاسایی نێوان ئێرانییەکان، لە شەڕی نێوان کەسانێکی تووڕە دەچێت، پڕیەتی لە هاتوهاوار و دەست ڕاوەشاندن و ئینشائەڵا ئینشائەڵا. هاتوهاواریان گوێی کەڕدەکرد.

سەرم کەوتە ئێش، سەرئەنجامی سەفەری دووروودرێژ و ئەو هەموو چاوەڕوانییە، بۆنی خواردنی چەور و ئەو خەڵکە، هەروەها دەنگی بەرزی قسەکردنی بێبڕانەوە.

"من و مەهتاب دەمانەوێت بچینە جێگاوە،" بە هاوسەرکەمم وت. دەمەو ئێوارێ بوو، زۆربەی هەرە زۆری کەسوکار هێشتا نەڕۆشتبوون، مودی خۆشی دەیزانی، دانیشتون بۆئەوەی قسە لەگەڵ ئەودا بکەن، نەك من.

"باشە،" مودی وتی.

"سەرئێشەیەکی زۆر خراپم هەیە،" پێم وت. "شتێکت هەیە، پێم بدەیت؟"

مودی بۆ چەند ساتێك داوای لێبوردنی کرد، من و مەهتابی برد بۆ ژوورەکەمان و پاکەتێك دەرمانی ئازاری هێنا، کە فەرمانبەری گومرگ نەیدۆزیبووەوە. سێ حەبی پێدام و گەڕایەوە لای میوانەکان.

من و مەهتاب خۆمان خزاندە جێگاوە، ئەوەندە هیلاك بووین، کە فەرەوێڵەی داکەوتوو، بەتانی شێدار و سەرینی گرۆگرۆ، نەیانتوانی بەری خەومان پێبگرن. دەمزانی مەهتاب بەدەم باوێشکەوە ئەو دوعایەی لە مێشکدایە، کە من لە دڵی خۆمدا دەموت. خوایە ئەم دوو هەفتەیەمان زوو لێبڕوات.

*

تێبینییەکان:

1. mommy: دایە.

2. nephew: بە واتای خوشکەزا یان برازا دێت. بەپێی گێڕانەوەی نووسەر، زیا هەم ئامۆزای مودیە هەم پورزا، نەك خوشکەزا یان برازا.

3. سەبزی، وشەیەکی فارسییە بە واتای سەوزە دێت.

4 . motorway: مۆتۆڕوەی، ڕێگای خێرا

# 2

کاتژمێری چواری بەیانی ڕۆژی دوایی بوو، کە بابەحاجی لە دەرگای ژووری نوستنەکەمانی دا. بە فارسی هاواری شتێکی کرد.

لەدەرەوە لە بڵنگۆی مزگەوتەوە دەنگی *ئەزان*، بانگ، دەهات، دەنگێکی غەمناکی پاڕانەوە بوو، ئەمەکدارانی بانگدەکرد بۆ ئەنجامدانی ئەرکێکی پیرۆز.

"کاتی نوێژکردنە،" مودی لەبەرخۆیەوە وتی. بە باوێشکدان و خۆکێشانەوەوە خۆی بەرزکردەوە و لە جێگاکە چووە دەرەوە بۆ حەمامەکە بۆ دەستنوێژگرتن. لەوێ هەردوو قۆڵی لە ئانیشك بەرەو خوار، دەموچاوی و قاچی دەشت.

لەشم ژانیدەکرد، بەهۆی داچوونی قەرەوێڵەکە و تەنکی دۆشەکەکەوە، کە هیچ نیسپرینگێکی تیادا نەبوو. مەهتاب لە نێوانی من و مودیدا نوستبوو، بەهۆی ئەوەی دوو قەرەوێڵەیان نابوو بە یەکەوە، نێوانمان هەر چوارچێوە ڕەقەکان بوو، مەهتاب نەیدەتوانی لەم نێوانەدا خۆی ڕاگرێت و دەخزایە لای منەوە. وا قووڵ خەوی لێکەوتبوو، کە نەمدەتوانی بەرزیبکەمەوە. پێکەوە نوستبووین، لەو گەرمایەدا بەیەکەوە نووسابووین، کاتێك مودی چوو بۆ هۆڵەکە بۆ نوێژکردن.

پاش خولەکێك گوێم لە دەنگی مودی بوو، لە نێو دەنگی بابەحاجی، عەمە بزورگ، کچەکانیان زوهرە و فریشتە و مەجید، کوڕە تەمەن سی ساڵە هەرە گەنجەکەیان. باقی پێنج کوڕەکە و فەرحی کەچەیان، لە ماڵی خۆیاندا بوون.

ئەمزانی نوێژەکەیان چەند درێژدەکێشا، چونکو خەوملێدەکەوت و خەبەرمدەبۆوە، تەنانەت ئاگادارنەبووم، کەی مودی گەڕایەوە ناو جێگاکە. پاش ئەوەش زیکروفکری خوا هەر تەواونەبوو. بابەحاجی مابۆوە، پڕ بەدەنگ بە ئاوازاوە کەوتبووە خوێندنەوەی قورئان. گوێشم لە عەمە بزورگ بوو، لەو سەری ماڵەکە لە ژووری نوستنەکەی خۆیان، کەوتبووە قورئان خوێندن. ئەمە بۆ چەند کاژێر درێژدەکێشا، دەنگیان ئاوازێکی خەولێهێنەری پێوە بوو.

بابەحاجی کاری خوانانسی خۆی تەواو کردبوو، ڕۆیشتبوو بۆ نووسینگەکەی - کۆمپانیایەکی ناردن و هێنانی هەبوو، بە ناوی هـ. س. سەلام قودسی و کوڕەکانی - پێش ئەوەی من لە خەو هەڵسم.

یەکەم شت کە بە مێشکمدا هات، خۆشتن بوو، ئەو عارەق و هیلاکییەی ڕۆژی پێشوو لە خۆم بکەمەوە. گەرماوەکە خاولی تیادا نەبوو. مودی وتی، لەوانەیە عەمە بزورگ چەند دانەیەکی نەبێت، لەبەرئەوە چەرچەفێکی جێگام هێنا و وەك خاولی بەکارمان هێنا. دەوری دوشەکە پەردەی پێوە نەبوو، ئاو بەو ناوەدا، بەسەر خشتە کاشییەکاندا بڵاودەبۆوە. سەرباری ئەم کەموکورتیانە، ئاوەکە مایەی بووژانەوە بوو.

مەهتاب پاش من خۆی شت، ئینجا مودی. تەنوورەیەکی ئاسایی و بلوزێکم لەبەرکرد، لەگەڵ ئارایشتێکی تەنك و تۆزێکیش خەریکی قژم بووم. لەناو ماڵدا، وەك مودی پێیوتبووم، پێویستی نەدەکرد خۆم داپۆشم.

عەمە بزورگ بەناو چێشتخانەکەدا جرتوفرتی بوو، عەبایەکی ڕەنگی ناوماڵی بەسەرەوە بوو. بۆ ئازادکردنی هەر دوو دەستی بۆ کارکردن، جارێکی تر عەباکەی پێچابوو بە خۆیەوە و چمکەکانی خستبوونە بنباخەڵییەوە، بۆئەوەی لە جێگای خۆیان ڕایگرێت توند هەردوو قۆڵی نوساندبوو بە لەشیەوە.

لە ژوورێکدا کاریدەکرد، کە ڕۆژێك لە ڕۆژان وەك باقی ماڵەکە تازە بووە، بەڵام ئێستا داڕووخابوو. دیوارەکانی بە چەوری چەند دەیە سواخدرابوو. دۆڵابێکی ئاسنی گەورەی چێشتخانە، وەك ئەوەی لە چێشتخانەی ڕێستورانەکانی ئەمریکادا هەیە، ژەنگ خواردبووی. سینکێکی پۆڵای دژی ژەنگی هەبوو، کە قاپ و دەوری پیسی لەسەر کەڵەکە کرابوو. قابلەمە و تاوە بە جۆرێك لەسەر کاونتەر و مێزێکی چوارگۆشە کەڵەکە کرابوون، کە هیچ شوێنێکی بەتاڵی بۆ کارکردن نەهێشتبۆوە. عەمە بزورگ ئاسایی ناوفەرشی چێشتخانەکەی کردبوو بە شوێنی کار. ناوفەرشەکە کاشی مۆزایکی قاوەیی بوو، بە بەرەیەکی سوور و ڕەش بەشێکی داپۆشیبوو. پاشماوەی خواردن، پەڵەی ڕۆن و ڕژانی سەیری شەکر، ئەو ناوەی داپۆشیبوو. سەرسامبووم، لە بینینی یەخچاڵ و فرێزەری جەنەراڵ ئەلەکتریك[1] . کە دەرگاکەیم کردەوە، بینیم پڕیەتی لە قابلەمە و قاپە خواردن، سەرەکانیان دانەپۆشرابوو و هێشتا کەوچکەکانی تیادا مابوو. هەروەها لە چێشتخانەکەدا جلشۆرێکی ئیتالی تیادا بوو، لەگەڵ تەنیا تەلەفونی ماڵەکە.

زۆر بەوە سەرسامبووم، کە مودی شانازی بەوەوە دەکرد، کە عەمە بزورگ بۆ ڕێزگرتن لە هاتنی ئێمە، تەواوی ماڵەکەی پاککردۆتەوە. بۆم پرسیاربوو، کە ئەگەر ماڵەکە پیس بێت، دەبێت چۆن بێت.

پیرێژنێکی ڕەقەڵەی دڵتەنگ، کە ڕەنگی ددانە کرمیاوییەکانی وەك عەبا شینە ئاسمانییەکەی وابوو، کاردەکەری عەمە بزورگ بوو. لەسەر ناوفەرشی چێشتخانەکە سینیەك چا، پەنیر و نانی ئامادەکردبوو، لە هۆڵەکە بۆی دانایین.

چاکەی کردە *ئیستیکانە*کانەوە[2]، کە پەرداخێکی بچوکن، یەك لەسەر چواری کوپێك دەگرن، دروست بەپێی نەریت، بۆی دانایین: یەکەم پیاڵە چای دانا بۆ مودی، کە لەو کاتەدا تەنیا نێرینە بوو لە ژوورەکەدا، ئینجا عەمە بزورگ، ژنی پایەبەرز، پاشان بۆ من و لە دوای هەمووومان بۆ مەهتاب.

عەمە بزورگ چاکەی پڕکرد لە شەکر، چەند کەوچکی لە قوتووی شەکردانەکە پڕکرد و کردییە ناو پیاڵەکەوە. لە قوتووەکەوە تا پیاڵەکە شەکر لە کەوچکەکە هەڵدەوەرییە خوارەوە بۆ سەر فەرشەکە، بەو شێوەیە سیسرکی بانگدەکرد بۆ نانخواردنی بەیانی.

بینیم چاکە خەست، داخ و بێئەندازە خۆشە. هەرکە قومێکم لێدا، عەمە بزورگ شتێکی بە مودی وت.

"شەکرت نەکردە چاکەتەوە،" مودی وتی.

سەرنجمدا، مودی بە شێوازێکی تازەی ناناشنا دەدوێت. لە ماڵی خۆماندا بووینایە، دەیوت، "شەکرت ناوێت بۆ چاکەت؟" ئێستا دوورکەوتۆتەوە لەودی خۆی بە بچوك بزانێت، بە شێوازی ئەوانە دەدوێت کە ئینگلیزی زمانی دووهەمیانە. زۆر لەمێژ بوو، مودی زمانە ئینگلیزییەکەی ئەمریکایی کردبوو. بۆچی گۆڕاوە؟ بۆم جێگای پرسیار بوو. ئایا گەڕاوەتەوە، بە فاسی بیردەکاتەوە و وەریدەگێڕێت بۆ ئینگلیزی؟ بە دەنگی بەرز وەڵامی پرسیارەکەیم دایەوە.

"نامەوێت شەکری تێکەم، هەر ئاوا خۆشە."

"عەمە بزورگ لە تۆ بێزارە،" مودی وتی. "بەڵام من پێموت، کە تۆ ئەوەندە شیرینیت، پێویستت بە شەکر نییە."

عەمە بزورگ چاوەکانی قووڵکردەوە، دیاربوو کە نوکتەکەی پێخۆش نییە. خواردنەوەی چای تاڵ بە بێزەوشتییەکی ئاشکرا لێکدەدایەوە، بەڵام من گوێی خۆمم لێناخنی. نیگایەکم گرتە دشەکەم، قومێکم لە چاکە دا و زەردەخەنەیەکم بۆ کرد.

ئەو نانەی بۆیان دانابن، هەویرەکەی هەڵنەهاتبوو، بێتام، تەنك و وشك بوو، لە کارتۆنی شێدار دەچوو. پەنیرەکە پەنیری دانیمارکی سوێر بوو. من و مەهتاب حەزمان لە پەنیری دانیمارکی بوو، بەڵام عەمە بزورگ نەیدەزانی دەبێت بکرێتە ناو، تا تازەییەکەی خۆی بەدەستبهێنێتەوە. ئەم جۆرە پەنیرە بۆنی گۆرەوی پیسی لێدێت. من و مەهتاب چەندمان توانی لێمانخوارد.

هەر ئەو ڕۆژە، پێش نیوەڕۆ مەجید، کوڕە هەرە گەنجەکەیان، بۆ ماوەیەکی زۆر سەردانیکردین. کوڕێکی دڵسۆز و باش بوو، ئینگلیزییەکی ڕەوان قسەیدەکرد. زۆر شوێن هەبوو، دەویست ئێمە سەردانیبکەین. دەیوت، دەبێت کۆشکی شا ببینین. هەروەها *پارکی میللەت*، کە بێهاوتایی تاران پیشانئەدات. هەروەها دەیویست ئێمە بەرێت بۆ شتکڕین.

دەبوو بۆ هەموو ئەمانە چاوەڕوانبکەین. ئەو چەند ڕۆژەی سەرەتا دەبوو، بۆ میوانداری تەرخانبکرێت. هاوڕێ و خزمانی دوور و نزیك دەیانویست مودی و خێزانەکەی ببینن.

ئەو بەیانییە، مودی پێیداگرت لەسەرئەوەی تەلەفۆنبکەم بۆ دایك و باوکم لە مەشیگان، ئەمەش کێشەی بۆ دروستدەکردم. کوڕەکانم، جۆی و جۆن، کە لە لای باوکیان لە مەشیگان مابوونەوە، دەیانزانی بۆ کوێ سەفەرمکردووە، بەڵێنم لێوەرگرتبوون، کە بە کەس نەڵێن. نەمدەویست دایك و باوکم ئەمە بزانن، چونکو نیگەران دەبوون، بەتایبەت لەو کاتەدا کە لە نیگەرانی کەمیان نەبوو. باوکم دەست و پەنجەی نەرمدەکرد لەگەڵ نەخۆشییەکەی، کە دەستنیشانکرابوو بە نەخۆشی شێرپەنجەی ڕیخۆڵە نەستورە. نەمدەویست، منیش ببم بە بارێکی زیاتر بەسەریانەوە، لەبەرئەوە تەنیا پێموتبوون کە سەفەری ئەورووپا دەکەم.

"نامەوێت پێیانبڵێم، ئێمە لە ئێرانین،" بە مودیم وت.

"دەیانزانی، ئێمە دێین بۆ ئێرە،" مودی وتی.

"نــــا، نازانن. من پێموتون، دەچین بۆ لەندەن."

"دوا جار کە ئێمە ئەوانمان بینی،" مودی وتی. "لە کاتی هاتنەدەرەوەدا، من پێموتن، کە دەچین بۆ ئێران."

سەرئەنجام تەلەفونمکرد. لە دوورترین شوێنی دنیاوە، گوێم لە دەنگی دایکم بوو. پاش چاکوچۆنی، هەواڵی باوکمم پرسی. "زۆر باشە،" دایکم وتی. "بەڵام کیمۆسێراپییەکەی[4] هەراسانیکردووە."

لەکۆتاییدا پێموت، کە لە تارانەوە تەلەفونەدەکەم.

"هاوار بە ماڵم!" دایکم وتی. "زۆر دەترسم."

"نیگەران مەبە. کاتێکی خۆش دەبەینەسەر،" درۆم لەگەڵدا کرد. "هەموو شتێك باشە. حەفتەی مانگ لە ماڵەوە دەبین."

تەلەفونەکەم دایە دەست مەهتاب و بینیم چاوەکانی گەشایەوە، هەرکە گوێی لە دەنگی ئاشنای نەنکی بوو.

پاش تەواوبوونی تەلەفونەکە، ڕووم لە مودی کرد. "تۆ درۆت لەگەڵ مندا کرد!" تاوانبارمکرد. "تۆ بە منت وت، ئەوان ئاگادارن ئێمە بۆ کوێ سەفەردەکەین، بەڵام وا نەبوو."

"چاکە، بەڵام من پێموتون،" مودی وتی و هەردوو شانی بەرزکردەوە.

ترس دایگرتم. ئایا دایك و باوکم قسەکەیان نەبیستبوو؟ یان من مودیم لە قافدا گرت؟

کەسوکاری مودی بە کۆمەڵ دەهاتن و لە هۆڵەکەدا بۆ نانی نیوەڕۆ یان ئێوارە دەمانەوە. پیاوەکان هەر لە دەرگاوە بیجامەیان دەدرایە دەستیان، خێرا دەچوون بۆ ژوورێکی تر بۆ خۆگۆڕین و پاشان دەهاتنە هۆڵەکە و بە ئێمەوە پەیوەستدەبوون. عەمە بزورگیش عەبای فرەڕەنگ و ئامادەی زۆری هەبوو بۆ میوانانی ژن. جێگای سەرسامیبوو، کە ژنان عەبای ڕەشی دەرەوەی ماڵیان بە وریاییەوە لە خۆیان دەکردەوە و عەبای ڕەنگ کراوەیان بەسەردا دەدا، بەبێئەوەی سانتیمەترێك لە پێستی قەدەغەکراوی دەموچاویان دەرکەوێت.

میوانداری دەبوو بە گفتوگۆ و شتخواردن.

لەگەڵ قسەکردندا، پیاوەکان لە وێردوتن نەدەکەوتن. هەر یەکەیان تەسبیحێکی - کە بریتی بوو لە هۆنینەوەی سی و سێ مورووی پلاستیکی یان بەردی بەدەستەوە بوو، بەکاریاندەهێنا بۆ وتنی یەك لەسەر یەکی *"ئەڵاهو ئەکبر،"* "خوا گەورەیە."

ئەگەر میوانەکان لە بەیانیدا بهاتنایە، ئەوا لە دەوری نیوەڕۆدا پرۆسەی بێتامی ماڵئاوایی دەستپێدەکرد. جلی دەرەوەیان لەبەردەکرد، یەکتریان ماچدەکرد، بە هێواشی بەرەو دەرگای دەرەوە دەجوڵان، قسەیاندەکرد، دووبارە یەکتریان ماچدەکردەوە، تۆزێکی تر

دەجولان، هاوارياندەكرد، دەگريان و باوەشيان بە يەكتردا دەكرد. ئەمە بۆ سێ خولەك، سێ چارەك يان كاژێرێك بەردەوامدەبوو. كات شتێك بوو، كە كەس نيگەرانی نەبوو.

هەرچی چۆنێك بوو، لە پاشنيوەڕۆدا لە دەرگای ماڵ دەترازانە ئەو ديودوە، پێش ئەوەی دروست كاتی نوێژكردن و سەرخەوشكاند دەستپێبكات، كە گەرما كردبووی بە شتێكی پێويست.

ئەگەر ميوانەكان بۆ نانخواردنی نێوارە بهاتنايە، ئەوا زۆر دەمانەوە، چونكو هەميشە دەبوو چاوەڕوانی گەڕانەوەی بابەحاجيان بكردايە - هيچ كات بەرلە كاتژمێری دەی شەو نەدەهاتەوە - تا پەيوەستبێت بە ژووری پڕ پياوانی بيجامەلەبەر و ژنانی عەبابەسەر بۆ نانخواردنی نێوارە.

ئاسايی لەناو ماڵدا خۆم نازارنەدەدا، سەرپۆش بە سەردا بدەم، بەڵام دياربوو، هەندێك لە ميوانەكان زۆر دينی بوون لەوانی تر. ناوبەناو زۆريان بۆ دەهێنام، خۆم دادەپۆشم. نێوارێيەكيان بەشێوەيەكی چاوەڕواننەكراو ميوان هات، عەمە بزورگ بە هەڵەداوان خۆی كرد بە ژووری نوستنەكەماندا، عەبايەكی ڕەشی بۆ فڕێدام و هاوارێكی لە مودی كرد.

"خێرا بيدە بەسەرتدا،" مودی فەرمانيدا. "ميوانمان هاتووە. پياوێكی مێزەربەسەريان لەگەڵ دايە." مێزەربەسەر ئيمامی مەسجيدە - مزگەوت. كە دەبێت بە قەشە لە دينی مەسيحيدا. ئەمانە سەڵتە لەبەردەكەن و نازناوەكانيان لە مێزەرەكەيانەوە سەرچاوەدەگرێت، بە هۆی ئەم جلوبەرگانەوە لە پياوانی ديكە جيادەكرێنەوە، كە ئاسايی قات يان جلوبەرگی وەرزشيان لەبەردايە و سەريان ڕووتە. مێزەربەسەر ڕێزێكی زۆری لێدەگيرێت.

بۆيە دەرفەتێك نەما، دژی داوای عەبا بەسەرداني مودی بوەستمەوە، بەڵام كە لەم جلە قێزهێنەرە وردبوومەوە، بۆمدەركەت، زۆر پيسە. ئەو بەشەی كە دەموچاوەوە دادەپۆشی، چڵم و پيسی پێوە وشكبووبۆوە. هيچ كات دەستەسڕ يان كلينێكسم لەناو ماڵدا نەديبوو. ئەوەی لە ژنەكانم بينيبوو، تەنيا بەكارهێنانی عەباكانيان بوو. بۆنێكی ناخۆشی لێدەهات.

مێزەربەسەر ئاغای مەراشی بوو. ژنەكەی خوشكی بابەحاجی و خزمی دووری مودی بوو. مێزەربەسەر بە گۆچانێكی دار حەيزەرانەوە، بەزەحمەت بەرەو هۆڵەكە هەنگاوی بۆدەنرا ، زياتر لە سێ سەد پاوەند گۆشت و غەزوبەزی پێوە بوو. بە نكەنك و هێواشی لەسەر فەرشەكە پانبۆوە. دانيشتنی چوارمشقی بۆ ئەو نەهاتبوو، وەك V لاقەكانی بۆ پێشەوە بڵاوكردەوە، لەژێر كراسە درێژە ڕەشەكەيەوە وزگی ڕاژيە سەر فەرشەكە. زوهرە بە هەڵەداوان سينييە جگەرەی بۆ ئەم ميوانە پايەبەرزە هێنا.

"چـــام بۆ بێنن، چا،" بە قايم نەڕاندی، جگەرەيەكی بە جگەرەكەی دەمی داگيرساند. خێزەی سنگی ڕۆژە ڕێيەك دەڕۆيشت، كە دەكۆكی، پێيناخۆشبوو دەمی خۆی بگرێت.

بە پەلە چايان بۆ هێنا. ئاغای مەراشی كەوچكە چايەكی پڕ شەكری كردە ئيستيكانەكەيەوە، مژێكی لە جگەرەكەی دا، كۆكی، كەوچكە چايەكی پڕی تری شەكری

کردە ناو چاکەیەوە. "دەبم بە نەخۆشی تۆ،" بە مودی وت. "پێویستم پێت دەبێت، کە چارەسەری نەخۆشی شەکرەم بۆ بکەیت."

سەرم لێتێکچووبوو نەمدەزانی، ئەم عەبا پیسە کە توند بە دەموچاوی خۆمەوە نوساندوومە، زیاتر قێزهێنەرە یان ئەم ئاغا مێزدربەسەرە، کە بۆ ڕێزگرتن لێی بەزۆر دەموچاویان پێشاردومەتەوە.

بەدیار میوانەوە دانیشتم، هەولمدا هێلنجنەدەم و نەرشێمەوە. هەرکە میوانەکان ڕۆیشتن، عەباکەم فڕێدا و بە مودیم وت، کە ئەمە ئەوەندە پیسە قێزمدێتەوە. "ئەم ژنانە هەر بە عەباکانیان لووتیان دەسڕن،" گلەییمکرد.

"ئەمە ڕاست نییە،" مودی دەمیلێکردمەوە. "ئەمە درۆیە."

"باشە، تەماشاکە."

پاش ئەوەی کە بە چاوی خۆی تەماشای عەباکەی کرد، ئینجا دانیپیادانا، کە ڕاستم وتووە. بۆم پرسیاربوو، ئەم شتە نامۆیانە چییە بە مێشکی مودیدا هاتوچۆیانە. هەروا سوك و ئاسان بۆ دەورانی منداڵی بگەڕێتەوە، کە هەموو شتێك بەلایەوە ئاسایی بێت، تا من ئامادەییپێنەکەم؟

لەماوەی ئەو چەند ڕۆژەی سەرەتاوە، من و مەهتاب زۆربەی کاتمان لە ژووری نوستنەکە بردەسەر، تەنیا کاتێك دەهاتینە دەرەوە، کە مودی پێیدەوتین، میوانی زۆر هاتووە و بچین بیانبینین. لە ژوورەکەماندا هیچ نەبێت فەردوێلەیەك هەبوو لەسەری دانیشین، بەلام لە هۆلەکە هەر فەرشەکە بوو. مەهتاب لەگەل من یان لەگەل کەروێشکەکەی یاریدەکرد. زۆربەی کات بێزار، خەمبار و گەرمامانبوو.

هەموو پاشنیوەڕوانێکی دەرەنگ، تەلەفیزیۆنی ئێران هەوالەکانی بە ئینگلیزی پەخشدەکرد. مودی سەرنجی بۆ ئەمە ڕادەکێشا و منیش دەچووم بۆ تەماشاکردنی، نەك لەبەر ئەوەی چی تیادایە، بەلکو بۆئەوەی گوێم لە زمانەکەی خۆم بێت. هەوالەکان چوار و نیو دەستیپێدەکرد و بۆ پانزە یان بیست خولەك بەردەوامدەبوو، بەلام پەخشەکە هەرگیز لە کاتی خۆیدا بلاونەدەبۆوە.

یەکەم هەوال بێگومان لەبارەی جەنگی هەنوکەیی ئێران - عێراقەوە بوو. هەموو ڕۆژێك پیشاندانی شکۆمەندانەی دیمەنی لاشەی سەربازانی عێراقی بوو، بەلام هەرگیز ئامارەی بە زەرەری گیانی ئێران نەدەکرد. هەمیشە کلیپێکی لە کۆمەلێك پیاوان و ژنانی گەشکەگرتوو پیشاندەدا، کە بەرەو مەیدانی جەنگی پیرۆز دەچوون (پیاوان بۆ شەڕ و ژنان بۆ چێشتلێنان و هەتا دەستدانە کاری پیاوانە، وەك دروستکردنی نان)، ئینجا وتاری نیشتمانپەروەرانە، بۆ کۆکردنەوەی خۆبخشکەرانی زۆرتر. پاشان بابەتێکی پێنج خولەکی سەبارەت بە هەوالەکانی لوبنان - چونکو موسلمانانی شیعەی لوبنان گروپێکی بەهێز و توندڕەوو بوون، لەلایەن ئێرانەوە پشتیوانیانلێدەکرا، ئەمەکداری ئایەتولا خومەینی بوون. ئینجا سێ خولەکێك بۆ هەوالەکانی جیهانی، کە بریتیبوو لە هەندێك ڕاپۆرتی نێگەتیڤانە

لەبارەی ئەمریکاوە. ئەمریکییەکان بەهۆی ئایدزەوە، وەك مێشولە بەلادا دەکەون. لە ئەمریکادا ڕێژەی جیابوونەوەی ژن و مێرد چووە بە ئاسماندا. ئەگەر فڕۆکە جەنگییەکانی عێراق لە کەنداوی فارس بۆمبارانی کەشتییەکی نەوت دەکەن، ئەوە لەسەر داوای ئەمریکایە.

زۆر زوو هیلاکبووم بەدەست ئەم ڕوانبێژیانەوە. ئەگەر ئەمە ئەو هەواڵانە بێت کە بە گوێگرانی زمان ئینگلیزی دەڵێن، بۆم پرسیاربوو، دەبێت چی بە خەڵکی ئێران بڵێن؟

سەید سەلام قودسی، کە بە بابەحاجی ناوی دەبرا، بۆ خۆی مەتەڵ بوو. بەدەگمەن دەکەوتە ماڵەوە و بەئاستەم لەگەڵ خێزانەکەی وشەیەك یان دووانی لەدەم دەهاتە دەرەوە، بێجگە لە بانگکردنیان ئەبێت بۆ نوێژکردن یان قورئان خوێندن، کـــەچی کاریگەری بە هەموو هەڵسوکەوتی ماڵەکەوە دیاربوو. بەیانیان، پاش چەند کاژێر لە زکروفکری خوا، زوو ماڵەکەی جێدەهێشت، هەمیشە هەمان قاتی جلی خاکی پەڵە عارەقاوی لەبەردابوو، لەژێر لێوەوە وێردی دەخوێند و دەنکە تەسبیحی دەژمارد، بێگومان لەدوای خۆیەوە دەرگای ئاسنی حەوشێی دادەخست. تەواوی ڕۆژ، کە خەریکی هەڵسوڕانی کاروباری خۆی و بە ڕێی هاتوچۆی *مەسجیدەوە* بوو، خەرمانەی بوونی خەمناکی لە ناو ماڵەکەدا دەبینرا. باوکی مێژەربەسەر بووە. براکەی لەو دواییانەدا، لە بەرەکانی جەنگی عێراق گیانی خۆی بەختکردبوو. هەرچەند ئاگاداری ئەوە بوو ج جێگایەکی بەرزی پێدراوە لەناو ماڵەکەدا، وەك کەسێکی ئاشنا بە خەسڵەتە باشەکانی خۆی، هەمیشە وا خۆی پیشاندەدا کە وشیارە بەوەی بۆ کاری ڕابەری پێشڕەو دانراوە.

پاش تەواوبوونی ڕۆژی درێژی پڕکار و نوێژکردن، بابەحاجی گەڕانەوەی ماڵەوەی دەکرد بە هەرایەك ئەو سەری دیارنەبوو. لە دەوری کاتژمێری دەی شەودا، هەر ئەوەندەی شەقەی داخستنی دەرگای حەوشێ دەهات، زەنگی ئاگادارکردنەوە لێیدەدا. "بـــابەحاجییی!" یەکێك هاواری لێهەڵدەستا و ئەم ئاگادارکردنەوەیە بەرقئاسا لەناو ماڵەکەدا دەنگی دەدایەوە. زوهرە و خوشکە بچوکەکەی، کە تەواوی ڕۆژ ڕووسەریان بەسەرەوە بوو، گەڕانەوەی باوکیان زەنگێك بوو، کە خێرا عەباکانیان لەخۆیانەوە بپێچن.

نزیکەی پێنج ڕۆژ بوو بابەحاجی میوانداری لێدەکردین، کە مودی پێی وتم، "دەبێت لەم ماڵەدا دەستبکەیت بە عەبا بەسەردا دان یان هیچ نەبێت ڕووسەری."

"نـــا،" وەڵامم دایەوە. "تۆ و مامل هەر دووکتان، پێش ئەوەی بێم، وتتان لەناو ماڵدا پێویست ناکات خۆم داپۆشم. هەتا وتت، ئەوان تێدەگەن، کە من ئەمریکیم."

مودی درێژەی پێدا. "بابەحاجی زۆر توڕەیە، لەسەر ئەوەی خۆت داناپۆشیت. ئێرە ماڵی ئەوە." شێوەی قسەکردنی مودی، تەنیا ڕووکەشەکەی پاساودانەوە بوو، لەژێرەوە داسەپاندنی دەسەڵاتی خۆیی مەبەستبوو. بەم ڕووەی کەسایەتی مودی چاك ئاشنابووم و لە ڕابوردوودا لەگەڵی دەستەویەخەبووبووم. بەڵام ئێرە وڵاتی خۆی بوو، خەڵکی خۆی

بوو. ڕۆشن بوو لەم کێشمیەدا ڕێگایەکی ترم نەبوو، بەڵام هەرجارەی لە بوونی بابەحاجیدا، ئەم سەرپۆشە نەعلەتییەم دەدا بەسەردا، بەوە دڵخۆشی خۆمم دەدایەوە، کە ئێمە بەم زووانە دەگەڕێینەوە بۆ مەشیگان، بۆ وڵاتی خۆم و خەڵکی خۆم.

تا دەهات عەمە بزورگ دڵگەرمی کەمتر دەبووەوە. لای مودی کەوتبووە گلەییکردن، لەسەر خوی دەستبڵاوی ئەمریکاییمان، کە هەموو ڕۆژێك خۆمان دەشۆین. بە مەبەستی پێشوازیکردنی ئێمە، عەمە بزورگ چووبوو بۆ *حەمام*، گەرماوی گشتی - ڕۆژێکی تەواو لە گەرماودا خەریکی خۆی بووبوو. ئیتر لەو ڕۆژەوە گەرماوی لە خۆی حەرامکردبوو، بێگومان مەبەستی نەبوو، لە داهاتوویەکی نزیکیشدا توخنی گەرماو بکەوێت. خۆی و خێڵەکەی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هەر هەمان جلی جڵکنیان لەبەردا بوو، سەرەڕای گەرمای تاقەتپڕوکێنی هاوین.

"نابێت هەموو ڕۆژێك خۆت بشۆیت،" عەمە بزورگ فەرمووی.

"دەبێت هەموو ڕۆژێك خۆمان بشۆین،" مودی وەڵامی دایەوە.

"نــــا،" عەمە بزورگ وتی. "بە خۆشتن خانەکانی پێستت دەڕوا و سکت سەرمای دەبێت و نەخۆشدەکەویت."

گفتوگۆکە بێسەرئەنجام کۆتایی هات. ئێمە بەردەوامبووین لەسەر خۆشتنی هەموو ڕۆژەی خۆمان و عەمە بزورگ و خێزانەکەشی لەسەر بۆگنکردنی زیاتری خۆیان بەردەوامبوون.

لەگەڵ ئەوەی مودی پاکوتەمیزی خۆی ڕادەگرت، بەڵام لەوەدەچوو ئەو هەموو پیسییە لەدەوروپشتی خۆی نەبینێت، تا من بەزۆر سەرنجیم بۆ لای ڕاکێشا.

"مێشولە لەناو برنجەکەدایە،" گلەییمکرد.

"ئەوە ڕاست نییە،" مودی وتی. "بڕیارتداوە، هیچ شتێکی ئێرەت پێخۆش نەبێت."

هەر لە خواردنەکەی ئەو ئێوارێیەدا بە دزییەوە، بە کەوچکەکە چەند مێشولەی ڕەشم لەناو برنجەکەدا دۆزییەوە و خستمە سەر لایەکی دەورییەکەی مودی. بێڕەوشتی بوو هەروا خواردنەکە جێبهێڵم، مودیش نەیدەویست دڵی کەس بڕەنجێنێت، مێشولەکانی خوارد و بەمە گلەییەکەی منیشی بۆ قووتچوو.

مودی سەرنجی بۆ ئەو بۆنە ناخۆشە نەدەچوو لەناو ماڵەکەدا، کاتێك عەمە بزورگ دەکەوتە 'ڕاونانی چاوی شەیتان'. ئەم بۆن ناخۆشەی بە سوتاندنی تۆویەکی ڕەش لەسەر پارچەیەك پلێتی کونکونی وەك سوزگی، دروستدەکرد. ئەم پلێتە بەمەبستی دەمکێشانی برنج بەکار دەهێنرێت لە شێوازی ئێرانیدا، کە گەرمی بە شێوەیەکی یەکسانی دەگەیەنێت بە بنی قابلەمەکە بۆ دروستکردنی بنکڕ. بەڵام بە دەست عەمە بزورگەوە دەبوو بە ئامرازی ئەشکەنجە، بە سوتاندنی ئەو تۆوە ڕەشە و بڵاوکردنەوەی بۆنی ناخۆش بەناو هەموو کون و قوژبنێکی ماڵەکەدا. مودیش وەك من قێزی دەهاتەوە لەو بۆنە.

هەندێک جار مەهتاب دەکەوتە یاریکردن لەگەڵ ئەو منداڵانەی کە لەگەڵ دایک و باوکیان دەهاتن بە میوانی، چەند وشەی فارسی فێربووبوو، بەڵام ئەوەندە کەشەکە نائاشنا بوو بۆی، هەرگیز لە من و کەروێشکەکەی دوورنەدەکەوتەوە. جارێکیان بۆ کات بەسەربردن، مەهتاب کەوتە ژماردنی جێگای پێوەدانی مێشولە بە لەشییەوە. بیست و سێ دانەی پێوە بوو. لە ڕاستیدا ئەوەندە مێشولە پێوەیدابوو، هەموو لەشی سوور هەڵگەڕابوو.

تا ڕۆژ زیاتر تێپەڕدەبوو، وا دەردەکەوت مودی زیاتر من و مەهتاب لەبیردەچێتەوە کە لە ماڵەکەداین. لەسەرەتاوە، هەموو گفتوگۆیەک، هەر قسەیەک شایەنی ئەوە بووایە، بۆی وەردەگێڕام بۆ ئینگلیزی. بەڵام وردەوردە ئەو ئەرکەی لە کۆڵ خۆی کردەوە. من و مەهتابیان لەبەردەمی میوانەکاندا دادەنا، لەگەڵ ئەوەی هیچ تێنەدەگەیشتین، بۆ چەند کاژێر دادەنیشتین و خۆمان وا پیشاندەدا، کە خۆشمان لێدەگوزەرێت. چەند ڕۆژ تێپەڕی، کە من و مەهتاب تەنیا بۆ یەکتری قسەماندەکرد.

پێکەوە چاوەڕوانبووین - دەژیاین - بۆ ئەو ساتەی دەمانتوانی بگەڕێینەوە بۆ ئەمریکا.

هەردەم قابلەمەیەک خواردن بە کەوگیرەوە لەسەر تەباخەکە بوو، بۆ ئەو کەسانەی کە برسیان دەبوو. چەند جار بینیبووم، کەسێک کەوگیرێک خواردنی دەبرد بۆ دەمی و پاشماوەکەی دەکردەوە ناو قابلەمەکە یان بەسەر زەوییەکەدا ئاسایی بڵاوەدەبۆوە. سەر کاونتەر و ناوفەرشی چێشتخانەکە هەروا شەکر بوو، کە بەهۆی چاخۆڕانی کەمتەرخەمەوە بەناوەدا دەڕژا. لێرەش، وەک گەرماوەکە، مارمێلکە ڕاکەڕاکەی بوو.

شتێکی وەهام نەدەخوارد. عەمە بزورگ بەزۆری لە گۆشتی بەرخ *خۆرشت*[5]ی دروستدەکرد بۆ نانی ئێواران. بۆ چێشتلێنان شتێکی وەک ناو بەکاردەهێنا، کە پێیاندەوت *دومبە*[6]. دومبە دوگ - ئەو پارچە چەورییەیە کە بە کلکی مەڕەوەیە، لەکاتی ڕۆشتنیدا دەلەرێتەوە. لە چێشتی ئێرانیدا تامی گەنیو دەدات و لەبەر هەرزانی لەجیاتی ڕۆن بەکاری دەهێنن.

عەمە بزورگ دومبەیەکی زۆری لە فرێزەردا هەڵگرتبوو، هەر خواردنێکی دروست بکردایە، پارچەیەکی لێدەکردەوە و لە تاوەدا دەیتواندەوە. لەوانە بوو چەند پیازێک بجنێتە ناوی، پاشان چەند پلە گۆشت و فاسۆلیا و هەر سەوزەیەک کە لە ماڵەکەدا ببووایە. ئەمە هەموو پاشنیوەڕۆ و ئێوارەیەک دەکولێنرا، بۆنی دومبە بەرزدەبۆوە و ماڵەکەی پڕدەکرد. بۆ نانخواردنی ئێوارێ نە من و نە مودی، نەماندەتوانی ڕوو لە خواردنەکەی عەمە بزورگ بکەین. هەتا مودی حەزی لێنەدەکرد.

وردەوردە مودی بەئاگا هاتەوە، پیشەی پزیشکی و ژیری، زاڵبوو بەسەر ڕێزیدا بۆ خێزانەکەی. بەردەوام قڕەم لێوەدەهات، لەسەر پیس و پۆخڵی ناوماڵەکە، تا مودی تێگەیشت و لەسەر ئەمە هاتەگۆ.

"من دکتۆرم و لەم پەیوەندەدا، دەبێت گوێ بۆ ئامۆژگارییەکانم بگریت،" بە خوشکەکەی وت. "تۆ چڵکنیت. دەبێت خۆت بشۆیت. پێویستە منداڵەکانت فێربکەیت، خۆیان بشۆن. بەڕاستی نیگەرانم کە ئاوا دەتانبینم، ئاوا ژیان بەسەردەبەن."

عەمە بزورگ قسەی برا بچوکەکەی، پشتگوێخست. هەر ئەوەندەی لە چاوی مودی بەدووردەبوو، بەرەو ڕووی من دەموچاوی گرژدەکرد، بۆئەوەی تێمبگەیەنێت، کە ئاگری بن کاکە منم.

گەرماوی ڕۆژانە تەنیا کارێکی باوی ڕۆژئاواییانە نەبوو، کە دڵی ئەشەکەمی ڕەنجاندبوو. ڕۆژێکیان، کاتێك مودی خۆی ئامادەدەکرد بچێتەدەرەوە، بۆ ماڵئاوایی بەهێواشی ماچێکی ڕوومەتی کردم. عەمە بزورگ ئەمەی بینی و وەك فیشەکەشێتە چوو بە ئاسماندا. "لەم ماڵەدا ناتوانی ئەمە بکەیت،" سەرزەنشتی مودی کرد. "منداڵمان لە ماڵەکەدا هەیە." لە ڕاستیشدا بچوکترین 'منداڵ' فریشتە بوو، کە خۆی ئامادەدەکرد بچێتە پۆلی یەکەمی زانکۆ، بەڵام لەوەدەچوو ئەمە بە هەند نەگیرێت.

پاش چەند ڕۆژ قەتیسمان لەناو ماڵی دڵتەنگی عەمە بزورگدا، سەرئەنجام چووینە دەرەوە بۆ بازاڕ. مودی، مەهتاب و من، ئەمێك بوو چاوەڕوانی ئەم دەرفەتەمان دەکرد، بچین دیاری بیانی بکڕین بۆ هاوڕێ و خزمەکانمان لە ئەمریکا. هەروەها دەمانویست کەڵك لە ڕێژەی نرخی هەرزانی تاران بکەین و خشڵ و فەرش بکڕین بۆ خۆمان.

چەند بەیانی لەسەریەك، زوهرە یان مەجید بە ئوتومبیل ئێمەیان دەگەیاندە ناوشار. هەر چوونە ناو شارێك بۆ خۆی سەرکێشییەك بوو، شارێك کە دانیشتوانەکەی لەماوەی چوار ساڵ لە دوای شۆرشەوە[7]، لە پێنج ملیۆنەوە بووبوو بە چواردە ملیۆن. سەخت بوو بزانرێت، دروست ئێستا دانیشتوانی چەندە. بەهۆی داتەپانی باری ئابورییەوە، لادێیەك بەسەر پێوە نەمابوو، دانیشتوانی ئەم لادێیانە بۆ پاروو نانێك، پەنایان بۆ تاران بردبوو. هەزارەها - لەوانەیە ملیۆنەها پەنابەرانی ئەفغانی لەتاو جەنگ پەنایان بۆ ئەم شارە هێنابوو.

بۆ هەر شوێنێك دەچووین، توشی کۆمەڵێك خەڵك دەبووین، بە دەموچاوێکی غەمناکەوە ڕاکەڕاکەیان بوو بەدوای کاروباری خۆیانەوە. هیچ زەردەخەنەیەکت نەدەبینی. کاتێك زوهرە یان مەجید ئوتومبیلەکەیان بەناو شەقامەکاندا لێدەخوڕی، زۆر جار بەشێوەیەکی باوەڕنەکراوانە دەکەوتنە جامی ترافیکەوە، بەهۆی پیادەڕەوان و منداڵانێکەوە، کە گیانی هەرزانی خۆیان دەخستە مەترسییەوە و بەهەر نرخێك بوو، دەیانویست لە شەقامی قەرەباڵغ بپەڕنەوە. جۆگەلەی ئاو، کە لە شاخەکانەوە بەخوڕی دەهاتەخوارەوە، بە قەراخی شەقامەکاندا دەڕۆیشت. خەڵکەکە ئەم ئاوەیان بۆ مەبەستی جۆراوجۆر بەکاردەهێنا. کەسانێك زبڵیان فڕێدەدایە ئاوی و خۆیان لەدەستی ڕزگاردەکرد. دوکاندارەکان شتی پیس و بێکەڵکی خۆیانیان پێدەووردەخستەوە. هەندێ خەڵك میزی دەکردە ئاوی و هەندێکی تر

دەستی تیادا دەشت. لە هەموو پەڕاینەوەیەکی ئەم شەقامانەدا، دەبوو بەسەر ئەم جۆگەلە پیسانەدا بازبدەیت.

لە هەموو لایەکی شاروە خانوو دروستکردن بەردەوامبوو، هەمووی بە دەست بە شێوەیەکی هەڕەمەکی دروستدەکرا. لەجیاتی بەکارهێنانی دوو - بە - چوار، چوارچێوەیان لە دار دروستدەکرد، کە تیرەکەی چوار ئینچ بوو، توێکڵەکەیان لێکردبۆوە، بەلام هێشتا تەڕ بوو، زۆر جاریش خوار. بەبێ لەبەرچاوگرتنی هیچ ڕێسایەك، کرێکارانی بینا ئەم دارانەیان بە قەبارەی جیاوازەوە پێکەوە دەنا بۆ دروستکردنی خانوو، کە لە ڕووی چۆنێتی و قایمییەوە جێگای گومان بوو.

شارەکە لەژێر گەمارۆدا بوو، هەموو هەڵسوڕانێك لەلایەن سەربازانی تا ددان چاکدار و پۆلیسی ڕەزاقورسەوە، لەژێر چاودێریدا بوو. ترسناك بوو، بە بەردەمی ئەم هەموو چەکە لەسەرپێیانە بە ڕێگادا بڕۆیت. پیاوان لە بەرگی یونیفۆرمی شینی تۆخی پۆلیسی، هەموو کون و قوژبنێکیان گرتبوو، لوولەی تفەنگەکانیان کردبووە ئەو خەڵکانەی کە شۆستەی شەقامەکانیان پڕکردبوو - ڕوویان لە ئێمە بوو.

سەربازانی شەڕکەر، بە بەرگی سەوزی بەڵکەبەڵکەوە، لە هەموو شوێنێکدا هەبوون. هەڕەمەکی ئوتومبیلیان ڕادەگرت و بەدوای شتی قاچاغەوە بوون وەك موادی بێهۆشکەر، نوسراوەی ڕەخنەگرانە لە کۆماری ئیسلامی یان کاسێتی مۆزیکی ئەمریکایی. بچوکترین پێشێلکاریی، لەوانەبوو سزاکەی شەش مانگ بەندیخانەی بەدواوە بێت.

لەپاڵ ئەمانەدا *پاسداری* تۆقێنەر هەبوو، کە هێزێکی سەربازی تایبەت بوون، بە پیکاپی سپی بچوکەوە هاتوچۆیان بوو. لەوە دەچوو هەموو کەسێك بەسەرهاتێکی ترسناکی تایبەتی خۆیی هەبێت لەبارەی پاسدارەوە. ئەمانە لەسەر داوای ئایەتوڵا ڕێکخرابوون لەبەرامبەر ساواکی شادا، کە هێزێکی پۆلیسی نهێنی بوون. بەسەرهاتی ڕەشی ترسناکی پاسدار لەپڕ لەنێو خەڵکدا زۆربوو. کە زیاتر لە دەستەیەکی خوێنڕێژی سەرجادە دەچوون و لەپڕ دەسەڵاتی ڕەسمیان پێدرابێت.

یەکێك لە ئەرکەکانی پاسدار کۆنترۆڵی ژنان بوو، کە خۆیان داپۆشن. سەرمەدەرنەددکرد، ئەم هەموو پێداگرتنە لەسەر جلوبەرگ بۆ. هەر لەنێو ئەو خەڵکدا، ژنانێك بوون، مەمکیان بە منداڵەکانیان دەدا، بەبێ ئەوەی بۆیان گرنگ بێت، چەند سەر، سنگ، قۆڵ و قولەپێیان دەردەکەوێت.

وەك مودی دەیوتی، ئێمە لە نێو ئەم کۆمەڵگا نامۆیەدا سەر بە توێژی باڵا و دەوڵەمەند بووین. ئێمە سەر بە خێزانێکی بەڕێزی پایەبەرز بووین، کە لەچاو خەڵکی ئاساییدا، لە ڕووی شارەزایی و ڕۆشنبیرییەوە زۆر لە پێش بووین. هەتا عەمە بزورگ نمونەیەکی بێهاوتا بوو لە ژیری و پاکوتەمیزی لەچاو ئەو خەڵکەی سەر شەقامەکانی تاران.

مودی پێی وتبووم، کە دوو هەزار دۆلار بە شێوەی چەك لەگەڵ خۆی دەهێنێت، بەلام دیاربوو زۆر زیاتری هێنابوو، دەیویست بێباکانە خەرجیانبکات. هەروەها مامل

پێیخۆشبوو، پیشانمانبدات کە لەسەر پارە نوستووە، خاوەنی شکۆ و دەسەڵاتە و دەیەوێت هەقیکاتەوە لەبەرامبەر ئەوەی، کە لە ئەمریکا بۆمان کردووە.

سەختبوو لە گۆڕینەوەی دۆلار بە ڕیاڵ، تێبگەیت. بانك نزیکەی سەد ڕیاڵی لەبەرامبەر یەك دۆلاردا دەدا، بەڵام مودی دەیوت، لە بازاڕی ڕەشدا باشترە. گومانم لێدەکرد لەبەر ئەم هۆیە بووبێت، بۆ هەندێك کار بەبێ من دەچووە دەرەوە. مودی پارەیەکی زۆری هەبوو، کە مەحاڵ بوو بتوانێت لەگەڵ خۆی هەڵیگرێت. بەشێکی زۆری لەناو گیرفانی ئەو جلانەیدا بوو، کە لە دۆڵابی ژووری نوستنەکەمان هەڵیواسیبوون.

ئینجا تێگەیشتم ئەو خەڵکە ئەو سەفتە پارانە چییە بە دەستیانەوە، کە هەر یەکەی پێنج شەش ئینج ئەستور بوون. سەفتە ڕیاڵیت پێویستبوو، هەرچی شتێکت بکڕیایە. کارتی متمانە[8] نەبوو لە ئێراندا و کەسیش چەکی بەکار نەدەهێنا بۆ شتکڕین.

من و مودی ئەماندەتوانی بیخەملێنین، ئەو پارەیەی پێمانە، لە بازاڕدا چەند دەکات. هەستماندەکرد پارەدارین، بۆیە کەوتینە شتکڕین. بەرگی سەرینی بەدەست چنراو، چوارچێوەی دەستکردی ئەڵتونی بیست و دوو عەیاری وێنە و تابلۆی مینیاتوری زۆر جوان. مودی گوارەی ئاڵتونی لەگەڵ ئەڵماسی بۆ مەهتاب کڕی. هەروەها دیارییەکی تایبەتی - ملوانکەیەکی ئاڵتونی - بۆ من کڕی، کە نرخەکەی دەبوو بە سێ هەزار دۆلار. دەمزانی، کە لە ئەمریکادا نرخەکەی زۆر لەوە زیاترە.

من و مەهتاب زۆرمان حەز لەو کراسە ڕەنگیینە درێژانە بوو، کە ژنانی پاکستانی لەبەریاندەکرد، مودی بۆ هەر دووکمانی کڕی.

کەلوپەلی تەواوی ناوماڵمان بۆ ژووری نانخواردن و دانیشتن هەڵبژارد، کە لە داری قایمی وارنیشکراو بە نەخشییەکی جوانی ڕازدوە بە ئاڵتون و بەرگێکی قوماشی جوانی بیانی دروستکرابوون. مەجید بەڵێنیدا، دوای ئەوە بکەوێت، کە چۆن ئەمانە بە کەشتی بنێرێتەوە بۆ ئەمریکا. پەرۆشی مودی بۆ کڕینی ئەم شتانە، ترسی منی کەمکردەوە. مودی خەریکی پلانداناناندبوو بۆ گەڕانەوە بۆ ماڵەوە.

بەیانییەکیان زوهرە خۆی ئامادەکرد من و مەهتاب لەگەڵ کۆمەڵێك لە ژنانی کەسوکار بەرێت بۆ بازاڕ. مودی بە دڵفراوانییەوە سەفتەیەك پارەی ڕیاڵی بێشماری دایە دەستم. ئەو ڕۆژە باشترین شتم کڕی، کە تابلۆیەکی قوماشی بەدەست چنراوی ئیتالی بە ڕووبەری پێنج بە هەشت پێ بوو، کە دەمزانی بۆ هەڵواسین لەسەر دیوار زۆر جوان دەبێت. بایی نزیکەی بیست هەزار ڕیاڵ بوو، کە نزیکەی دوو سەد دۆلاری دەکرد. لە کۆتایی ڕۆژەکەدا زۆربەی زۆری پارەکەم پێمابوو، هەڵمگرت بۆ بازاڕێکی تر. مودی بەدڵفراوانییەکی زۆرەوە پارەی خەرجدەکرد، دەمزانی بۆی گرنگ نییە، تەنانەت گوێپێنادات.

زۆربەی هەرە زۆری ئێوارەکان، لە ماڵی یەکێك لە گەلە خزمەکانی مودی دەعوەتبووین. هەمیشە من و مەهتاب دەکەوتینە دەرەوەی کۆمەڵەکە و کۆمەڵەکە دەبوو بە جێگای

تەماشاکردنی ئێمە. ئەو ئێوارانە بۆ ئێمە مایەی بێزاری بوو، بەڵام هەلێك بوو بۆ دوورکەوتنەوە لە ماڵە دڵتەنگەکەی عەمە بزورگ.

هەر زوو دەرکەوت، کە خزمەکانی مودی دەکرێت بکەونە دوو خانەی جیاوازەوە. نیوەی خێڵەکەیان وەك عەمە بزورگ دەژیان، بێئاگا لە پاکوخاوێنی، بەسوك تەماشاکردنی نەریت و دەستکەوتەکانی ڕۆژئاوا و دەستیان بە جبەی کەسانێکی وەك ئایەتوڵا خومەینی توندڕەوی تایەفەی شیعەی ئیسلامەوە گرتبوو. نیوەکەی تریان وا دەردەکەوت، ڕوویان لە ڕۆژئاوا بێت، کراوەبوون بەرامبەر گۆڕانکارییەکان، زۆرتر ڕۆشنبیر و دۆستانە و بەبێ هیچ دوودڵییەك زۆر پاکوتەمیزتر بوون. پێیانخۆشبوو بە ئینگلیزی بدوێن و بێئەندازە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ من و مەهتاب بەڕێزانە بوو.

پێمان خۆشبوو سەردانی ڕەزا و ئیسا بکەین. ئەم خوشکەزایەی مودی لە ماڵی خۆیدا لەگەڵم زۆر دۆستانە و میهرەبان بوو. لەوەدەچوو ئیسای ژنشی منی زۆر بەدڵ بێت. لەهەر هەلێك کەڵکی وەردەگرت بۆ قسەکردن بەو زمانە ئینگلیزیە کەمەی کە دەیزانی. ئیسا و چەند خزمی تر یارمەتیاندام، تۆزێك باری بێزای و دارمانم سوکبکەن.

بەڵام بە دەگمەن ڕێگایاندەدا، بەو چاوەوە تەماشام نەکەن، کە من وەك ئەمریکاییەك دوژمنی ئەوانم. بۆ نمونە، ئێوارێیەکیان بانگکراین بۆ ماڵی ئامۆزایەکی مودی، بەناوی فاتیمە حەکیم. هەندێك لە ئێرانییەکان کە شوودەکەن، ناوی دووەمی هاوسەرەکانیان هەڵدەگرن، بەڵام زۆربەیان ناوی دووەمی خۆیان دەپارێزن. بەڵام لە حاڵەتەکەی فاتیمەدا، کێشەیەك نەبوو، چونکو خزمی یەکتر بوون، ناوی دووەمی خۆی و هاوسەرەکەی هەر حەکیم بوو. فاتیمە ژنێکی دڵسۆز بوو، تەمەنی لە کۆتایی چلەکان و سەرەتایی پەنجاکاندا بوو، دەیویڕا ناوبەناو زەردەخەنەیەك بکات بۆ من و مەهتاب. ئینگلیزی نەدەزانی، بەڵام لەکاتی نانخواردنی ئێوارەدا لەسەر فەرشەکە، لەوەدەچوو زۆر بەسۆز و پەرۆش بێت بۆمان. هاوسەرەکەی، لەچاو ئێرانییەکاندا، بێئەندازە درێژ بوو، زۆربەی ئێوارەکەی بە قورئان خوێندن بەدەنگی بەرز و نوێژکردنەوە بردەسەر، لەکاتێکدا خزمانی دەوروپشتمان بە هەمان دەنگی بەرزی گوێچکە کەڕکەر قسەیاندەکرد، کە بۆمان ئاسایی بووبۆوە.

کوڕەکەی فاتیمە زۆر سەیر دەینواڕی. تەمەنی لەوەدەچوو نزیکی سی و پێنج ساڵ بێت، بەڵام بیچمێکی هەرزەکارانەی هەبوو، بەناستەم باڵای دەگەیشتە سەد و بیست سانتیمەتر. بۆم پرسیار بوو، کە ئایا ئەمەش ئاکامی هێندێك تێکچوونی بۆ ماوەزانییە[9]، کە لەنێو هاوسەرایەتی نێوان خزمەکانی مودیدا بەدیدەکرا.

لە ماوەی نانخواردنەکەدا، ئەم جانەوەرە چەند وشە ئینگلیزی لەگەڵدا وتم، ئینگلیزییەکی تەواوی بەریتانی بوو. لەگەڵ ئەوەی پێمخۆشبوو بە ئینگلیزی دوا، بەڵام هەڵسوکەوتی نامۆ بوو. پیاوێکی دینی بوو، هەرگیز تەماشاینەدەکردم، کە قسەیدەکرد.

پاش نانخواردن، لەکاتێکدا ڕووی لە شوێنێکی تر بوو، بە منی وت، "پێمان خۆشە بچینە ڤاتی سەرەوە."

من، مودی و مەهتاب دوایکەوتین بۆ سەرەوە، کە سەرمان بە ژوورەکەیدا کرد، سەرمان سوڕما، تەواوی ژوورەکە پڕیبوو لە مۆبیلەی ئەمریکایی. کتێبی ئینگلیزی لەناو کتێبخانەکەیدا بەڕیز دانرابوو. کوڕەکەی فاتیمە داوایلێکردم لەناوەڕاستی قەنەفەیەکی نەرمدا دانیشم. مودی و مەهتاب کەوتنە ئەم لا و ئەو لامەوە.

چاوم بەم دیکۆرە ئاشنا و خۆشەکەی ناو ژوورەکەدا دەگێڕا، کە باقی ئەندامانی خێزانەکە هاتنە ژوورەوە. بەپێی دەستەهەڵاتی هەر یەکەیان جێگای خۆی گرت، بەرزترین شوێن لە ژوورەکەدا تەرخانکرا بۆ مێردەکەی فاتیمە.

سەیرێکی مودیم کرد، بۆئەوەی بزانم باس چییە. شانی هەڵتەکاند، ئەویش وەك من، نەیدەزانی چی لە ئارادایە.

مێردەکەی فاتیمە شتێکی وت بە فارسی و کوڕەکەی وەریگێڕا، ڕوو بە من پرسیاری لێکردم: "سەرۆك ڕێگنت پێباشە؟"

سەرسامبووم، هەوڵمدا بەڕێزبم، زمانم تەتەڵەیکرد، "باشە، بەڵێ."

یەك لەدوای یەك بەردەو ڕووی پرسیار بوومەوە. "سەرۆك کارتەرت پێباشە؟ بۆچوونت چییە لەسەر پەیوەندی کارتەر بە ئێرانەوە؟"

ئیتر ئێستا بێویستی خۆم، لە سەنگەرێکدا دەوریاندام، کە پارێزگاری لە وڵاتەکەم بکەم، لەکاتێکدا خۆم لە داڵانی پێشوازی ئێرانییەکاندا گیرمخواردبوو. "من نامەوێت گفتگۆ لەسەر ئەم شتانە بکەم. هەرگیز حەزم لە سیاسەت نەبووە."

وازیاننەهێنـــا. "باشە،" کوڕەکە وتی، "دڵنیام پێش ئەوەی بێیت، زۆر شتت بیستووە لەبارەی ئەوەی، ژنان لە ئێراندا سەرکوت دەکرێن. ئێستا تۆ لێرەیت و بەچاوی خۆت دەیبینی، کە ئەمە ڕاست نییە، ئایا ئەوانە هەمووی درۆ نەبوون؟"

ئەو پرسیارە ئەوەند پوچ بوو، شایەنی پشتگوێخستن بوو. "هەمووی ئەوەی من دەیبینم، ئەو شتە نییە،" وەڵامدایەوە. ئامادەبووم ڕەخنەیەکی زۆر بگرم لەدژی چەوساندنەوەی ژنان لە ئێراندا، بەڵام دەورم پیاوانی لووتبەرزی بێشەرمی بەدگومان بوون، کە تەسبیحاتیان دەکرد و لە ژێر لێوەوە ئەلاهو ئەکبەر ئەلاهو ئەکبەریان بوو، لەکاتێکدا ژنان خۆیان لە عەباوە پێچابوو، بێدەنگ و ملکەچ دانیشتبوون. "من نامەوێت لەسەر ئەو جۆرە شتانە گفتگۆبکەم،" لەپڕ وتم. "من ئیتر وەڵامی هیچ پرسیارێك نادەمەوە." ڕووم لە مودی کرد و لەژێر لێوەوە پێم وت، "باشترێکە بمبەیتە دەرەوە. حەزناکەم دەوری شایەت ببینم."

مودی نیگەران بوو، گیریکردبوو لە نێوان مەراقی ژنەکەی و ئەرکی ڕێزگرتن لە خزمەکانی. هیچ شتێکی لەدەست نەهات بیکات و قسەوباس چووە سەر ئایین.

کوڕەکە کتێبێکی لە کتێبخانەکەی دەرهێنا، شتێکی لەسەر نووسی و پێشکەشی کردم: "بۆ بیتی. ئەمە دیارییەکە لە دڵی منەوە بۆ تۆ."

کتێبێك بوو قسەکانی ئیمام عەلی، دامەزرێنەر تایەفەی شیعە، تێدابوو. بۆیان باسکردم، کە محەممەد خۆی ئیمام عەلی هەڵبژاردووە ببێت بە جێنشینی، بەڵام لەپاش مردنی پێغەمبەر، تایەفەی سوننە بەزۆر دەسەڵاتی بەدەستەوە گرتوە و زۆربەی جیهانی ئیسلامدا خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. ئەمە تائێستا کێشمەکە لە نێوان سوننە و شیعەدا، وەك ئەوان لێدەدرێتەوە.

هەوڵمدا دیارییەکە بە سوپاسەوە وەرگرم، بەڵام باری گرژی هەر بەردەوامبوو. چاکەمان خواردەوە و هاتینە دەرەوە.

تا چووشینە ژووری نوستنەکەمان لە ماڵی عەمە بزورگ، قسەوباسی من و مودی هەر تەواونەبوو. "تۆ ڕێزت نەنواند،" مودی وتی. "دەبوو هەرچی ئەوان دەیانوت، سەرت بۆ بلەقاندایە."

"بەڵام ئەوە ڕاست نییە."

"بەڵێ ڕاستە،" مودی وتی. مایەی سەرسامیم بوو، مێردەکەی خۆم کەوتە سەنگەری ئەوانەوە. لەو باوەڕەدا بوو، کە لە ئێراندا ژنان ماف زیاتریان لە پیاوان هەیە. "تۆ پێشداوەری دەکەیت،" مودی وتی. "سەرکوتکردنی ژنان لە ئێراندا نییە."

نەمدەتوانی باوەڕبکەم بەوەی، کە مودی وا دەڵێت. ئەو بەچاوی خۆی دەیبینی، کە چۆن ژنانی ئێرانی کۆیلەی مێردەکانیانن، چۆن دینەکەیان لەپاڵ حکومەتەکەیاندا هەموو هەڵسوکەوتێکی ژنان کۆنترۆڵدەکات. ئەمە لە داسەپاندنی بێشەرمانەی یاسای جلوبەرگی کۆنی هەزار ساڵەی ناتەندروستیدا، تەواو دیار بوو. ئەو شەوە هەردووکمان بە زویرییەوە چووینە ناو جێگاوە.

هەندێك لە ئەندامی خێزانەکە، پێیانداگرت لەسەر ئەوەی سەردانی کۆشکی شای ڕژێمی پێشوو بکەین. کە گەیشتینە ئەوێ، بەپێی زایەندە، کراین بە دوو بەشەوە. دوای ژنەکانی تر کەوتم بۆ ژوورێکی بچوکی چاودێری، لەوێ گیانمان گەڕان بۆ شتی قاچاخ و کۆنترۆڵی جلوبەرگ. من ڕووسەری و مانتۆم لەبەردابوو، کە عەمە بزورگ پێیدابووم، لەگەڵ جوتێ گۆرەوی ڕەشی ئەستور. ملیمەترێك لاقم دیارنەبوو، بەڵام لەو پشکنینەدا بە ساغی دەرنەچووم. لە ڕێگای وەرگێڕەوە، بەرپرسەکە پێیڕاگەیاندم، کە دەبێت پانتۆڵێکی ئەستوری درێژم لەبەردا بێت.

کاتێك مودی هات بزانێت هۆی دواکەتنمان چییە، لەگەڵ بەرپرسەکە کەوتە گفتگۆ. بۆی ڕوونکردەوە، کە من بیانیم و پانتۆڵم لەگەڵ خۆم نەهێناوە. بەڵام ئەم ڕوونکردنەوەیە دادینەدا، تەواوی کۆمەڵەکەمان ناچاربوون چاوەڕوانبن، تا نەسرینی هاوسەری مامل، چوو بۆ ماڵی باوکی لەو نزیکانە و پانتۆڵێکی بۆ هێنام.

مودی هەر سووربوو لەسەر قسەی خۆی، کە ئەمە سەرکوت نییە. "ئەمە تەنیا کەسێکە و دەیەوێت دەستبالایی خۆی بنوێنێت،" لەژێر لێوەوە وتی. "لەڕاستیدا ئەو شتانە وا نیین."

لە کۆتاییدا کە کۆشکەکەمان بینی، شتێکی وەها نەبوو. زۆربەی ئەو شتە بەنرخە نەفساناوییانە، لەلایەن پاسدارانی تالانکەری خومینییەوە برابوون، وە ئەو هەندە شتەی مابۆوە شکێنرابوون. هیچ ئاساوارێك لە بوونی شا نەمابوو، بەلام فارمانبەری چاوساغ باسی ئەم دەوڵەمەندە خراپ و دەستبلاوەی شای بۆ کردین و داوای لێکردین، کە سەیرێکی ئەو گەردەکە هەژارنشینانە بکەین لەو ئاوە و پرسیاری لێکردین، کە چۆن شا توانیویەتی ئاوا شاهانە بژی، لەکاتێکدا ئاهاماتی زۆربەی زۆری ئەو خەڵکەی بەچاوی خۆی بینیوە. بەناو ساڵۆنە بەتاڵەکاندا دەڕۆیشتین و تەماشای ئەو مۆبیلانەمان دەکرد کە مابوونەوە، لە کاتێکدا منداڵانی هاری بێسەرپەرست بەو ئاوەدا ڕاکەڕاکەیان بوو، دەستیان لە هیچ شتێك نەدەپاراست. شوێنێك کە زۆرترین جێگای سەرنج بوو، لەوەدەچوو ئەو دوکانە بچوکە بێت، کە بلاوکراوەی ئیسلامی دەفرۆشت.

هەرچەند ئەو چوونە دەردەوەیەمان هیچ بوو، بەلام بۆ من و مەهتاب باش بوو، ڕۆژێکمان لە ئێراندا پێبردەسەر.

کات زۆر بەهێواش تێدەپەڕی. من و مەهتاب ژانمان کردبوو، بۆئەوەی بگەڕێینەوە بۆ ئەمریکا، بۆ ژیانی ئاسایی و پاکوخاوێنی.

لەناوەڕاستی دووەم هەفتەی مانەوەماندا، ڕەزا و ئیسا پێشنیاریانکرد شتێك بکەین، کە بیرەوەرییەکی ماڵەوە بێت. یەکێك لەو بیرەوەرییە خۆشانەی ئەو سەردەمی کە ڕەزا لەلای ئێمە بوو، لە کۆرپوس کریستی، جەژنی سوپاس[10] بوو. ڕەزا داوایلێکردم، کە ئەگەر دەتوانم، ئێوارە خوانێکی قەلەمون ئامادەبکەم.

پێمخۆشبوو. لیستێکی شتومەك کڕینم پێدا و تەواوی ڕۆژەکەی برد تا هەمووی کۆکردەوە.

قەلەمونەکە لەڕ بوو، بە تەواوی پاکنەکرابوو، سەر، قاچ، زۆربەی زۆری پەڕەکەی و ئاوسکەکەیەوە هەروا پێوەبوو. ئەمەش کارێکی زۆری دەویست و ڕۆژێکی تەواوی ئیشکردنی بردم. چێشتخانەکەی ئیسا پاك نەبوو، بەلام شایەنی بەراوردکردن نەبوو لەگەڵ ئەوەی عەمە بزورگدا، وە بەو پەڕی خۆشییەوە هەوڵمدا خوانێکی ئەمریکایی دروستبکەم.

ئیسا قاپی چێشتلێنانی ئاو فڕنی نەبوو. لە ڕاستیدا هەرگیز فڕنی تەباخە گازییەکەی بەکارنەهێنابوو. دەبوو قەلەمونەکە بکەم بە چەند پارچەی گەورە و لە چەند قابلەمەدا بیانکوڵێنم. مودی و ڕەزام خستەکار، بەپێی داواکارییەکانم لە نێوان چێشتخانەی ئیسا و عەمە بزورگدا هاتوچۆیان دەکرد.

چەند شت نەبوو، دەبوو جێگایان بگرمەوە. مریەمی[11] نەبوو بۆنەوەی بیکەیت بە هەلەمونەکەدا، لەبەرئەوە مریەمی گلیم[12] بەکارهێنا لەگەڵ کەردوسی تازەدا، کە ڕەزا بە چەند کلۆێر لە بازاڕدا دۆزییەوە. نانێکم دروستکرد وەك نانی فەرەنسی[13]، بۆنەوەی ناوەکەی پڕبکەم لە شت. پاش کوڵاندنی پەتاتە، بە فشاری کوتکە دارێك بەناو سوزگییەکدا بردم و پاش چەند هەوڵێکی تر پەتاتەیەکی خوساوی[14] لێدەرچوو، کە خواردنێکی دەگمەنە.

بەهۆی جیاوازی کەلتورییەوە، هەموو کارێك زەحمەتی خۆی هەبوو. خاولی قاپگرتن یان دەستکێشی هەلگرتن نەبوو: ئێرانییەکان ئاگاداری بوونی ئەم شتانە نەبوون. کاغەزی مۆمی[15] نەبوو، لەجیاتی ئەوە، کاغەزی ڕۆژنامەیان بەکاردەهێنا. لەبەر نەبوونی قاڵبی بۆرەك، نەمتوانی بۆرەکی سێو[16] دروستبکەم، لەجیاتی ئەوە کێکی سێوم[17] دروستکرد. دەبوو پلەی گەرمای فڕنەکە بخەمڵێنم، چونکو لە ژمارەی میترێ بۆردی ژمێریاری تەباخەکە سەرمەدەرنەکرد و نیساش هەرگیز بەکارینەهێنابوو، لەبەرئەوە ئەویش هیچی لە دەستنەدەهات یارمەتیم بدات.

هەموو ڕۆژەکە کارمکرد تا چێشتی هەلەمون ئامادەبوو، خواردنێکی وشکی لیقنی تا ئاستێك بێتامی لێدەرچوو. بەڵام ڕەزا، نیسا و باقی میوانەکان زۆریان پێ بەلەزەت بوو. بەڵام دەبێت ئەوەش بڵێم، لەچاو خواردنێکی کەمپاکی چەوری ئەوەی لە ئێراندا هەبوو، ئەمە بەڕاستی خواردنێکی خۆش بوو.

مودی زۆر شانازی پێوە کردم.

لە کۆتاییدا گەیشتینە دواڕۆژی سەردانەکەمان. مەجید پێیداگرت لەسەرئەوەی، بەیانی ئەو ڕۆژە لە پارکی میللەت بەرینەسەر.

منیش پێمخۆشبوو. بەڕاستی مەجید یەکێك بوو لەوانەی لەناو خێزانی عەمە بزورگدا خوشەویست بوو.، تەنیا کەسێك بوو، کە بریسکەی ژیان لە چاوانیدا دیاربوو. مەجید و زیا - ئەوەی کە لە فرۆکەخانە جێگای سەرنجم بوو - هەر دووکیان خاوەنی کۆمپانیایەکی کەرەستەی ئارایشت دروستکردن بوون. سەرەکیترین کاڵایان سپرای دژی بۆن بوو، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کات لە ماڵی عەمە بزورگدا سپرایم نەمبینی.

لەوە دەچوو هەلومەرجی کارەکەی مەجید، ئەوەندە لەبارێت، تا کاتی دەستبەتاڵی زۆری بۆ بهێڵێتەوە بۆ یاریکردن لەگەڵ منداڵانی خێڵەکە. لە ڕاستیدا لەوە دەچوو، ئەو تەنیا کەسی گەورەی خێزانەکە بێت، کە کاتی بۆ منداڵان تەرخانکردبێت. من و مەهتاب پێمان دەوت "جۆکەر."

بۆ پارکی میللەت تەنیا هەر چوارمان چووین - مەجید، مودی، مەهتاب و من. خۆشترین چالاکی بوو، کە دەمتوانی بیهێنمە بەرچاوی خۆم بۆ دواڕۆژی ئەو دوو هەفتەیە، کە وا

دههاته بەرچاو كۆتايى نايەت. من و مەهتاب كەوتبووینە ژماردنی ئەو کاژێرانەی که مابوومان بۆ گەڕانەوە.

پاركەكە مێرگێك بوو لە چیمەنی سەوز و ڕازاوە بە گوڵ. مەهتاب شاگەشکەبووبوو، بەوەی شوێنێكی دۆزیوەتەوە یاری تیادا دەكات. ئەو و مەجید بەخۆشییەوە یاریاندەکرد و لە پێشمانەوە ڕایاندەکرد. من و مودیش بەدوایانەوە بەهێواشی دەڕۆیشتین.

لە دڵی خۆمدا دەموت، ئەمە چەند خۆشدەبوو، ئەگەر بمتوانیایە ئەم مانتۆ بەلایە و سەرپۆشەم لەخۆم بكردایەتەوە. چەند بێزاربووم لەو گەرمایە و لە بۆنی عەرەقی ئەم خەڵکە خۆنەشۆرە، كە هەتا لەو پاركە خۆشەشدا هەستی پێدەكرا. چەند لە ئێران بێزاربــــــووم!

لەپڕ هەستمکرد، مودی دەستی گرتم، كە پێشێلکردنێكی بچوكی داب و نەریتی شیعەیە. مودی غەمناك و لە خەیاڵدا بوو.

"پێش ئەوەی لە ئەمریكاوە بكەوینەڕێ، شتێك ڕوویدا،" مودی وتی. "تۆ ئاگاداری نەبووی."

"چی بوو؟"

"لە ئیش دەرکرام."

دەستم لە دەستی ڕاپسكاند، گومانی فێڵێكم كرد، هەستم بە مەترسی کرد و ترس لەشمی داگرتەوە. "بۆچی؟" پرسیارملێکرد.

"تیمارگەكە كەسێكی دەوێت لە جێگای من كاربكات بە پارەیەكی كەمتر."

"درۆ دەكەیت،" بەرەقییەوە وتم. "ئەمە ڕاست نییە."

"بەڵێ، ئەمە ڕاستە."

لەسەر چیمەنەکە دانیشتین و كەوتینە قسەكردن. بەڵگەی خەمۆکییەكی قووڵ لە دەموچاویدا بەدیدەکرا، كە لە ماوەی دوو ساڵی ڕابوردوودا تیایدا دەركەوتووبوو. كاتێك كە گەنج بوو، وڵاتەكەی خۆیی جێهێشتبوو، وە بەدوای داهاتوودا ڕووی لە ڕۆژئاوا كردبوو. هەوڵێكی زۆری دابوو، قوتابخانەی تەواوكردبوو تا لە كۆتاییدا مۆڵەتی دكتۆری ئێسقانی وەرگرتبوو، پاشان خوێندنی لە كەمكردنەوەی ئازار تەواوكردبوو. یارمەتیمدا كاری دۆزییەوە، لە پێشدا لە كۆرپوس كریستی و پاشان لە ئەلپێنا، كە شارێكی بچوكە لە بەشی باكووری مەشیگان لە خواردوەی پێنینسولا. ژیانێكی خۆشمان هەبوو، پێش ئەوەی گرفت سەرهەڵبدات. زۆربەی سوچی مودی خۆی بوو، هەرچەند نەیدەویست دانیپیادابنێت. هەندێك لە گرفتەكان ئاكامی پێشداوەری ڕەگەزی بوو، هەندێكی تریان ئەگبەتی. هۆكان هەرچییەك بووبن، داهاتی مودی خراپ دابەزی و شانازی پیشەیی خراپ بریندار‌بوو. ناچاربووین ئەلپێنا جێبهێڵین، كە شارێك بوو زۆر حەزمان لێی بوو.

زیاتر لە ساڵێك بوو لە تیمارگەی شەقامی چواردە کاریدەکرد، كارێك كە بە زۆری من وەریگرت. بەڵام ئێستا لەوە دەچوو نەیمابێت.

بەڵام داهاتوو زۆر لەوەوە دووربوو، کە ڕەش بنوێنێت. لە پارکەکەدا بەچاوی فرمێسکاوییەوە، هەوڵمدا دڵنەواییبکەم.

"گرنگ نییە،" پێموت. "دەتوانی کارێکی تر بدۆزیتەوە و منیش دەستدەکەمەوە بە کارکردن."

مودی دڵنەوایی هەڵنەدەگرت. چاوانی تروسکایی تیادا بەدینەدەکرا، وەك زۆربەی زۆری هاووڵاتییەکانی.

پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ، من و مەهتاب کەوتینە سەرکێشییەکی خۆش: کەوتینە کۆکردنەوەی جانتاکانمان! گەڕانەوە بۆ ماڵەوە، کارێك بوو، لە پێش هەموو کارێکی تردوە بوو لە جیهاندا، دەمانویست بیکەین. هەرگیز لە ژیانمدا ئەوەندە پەرۆشی جێهێشتنی جێگایەك نەبووم. تەنیا یەك نانخوارنی ئێوارێم ماوە! لە دڵی خۆمدا دەموت. تەنیا یەك شەوم ماوە لە نێو خەڵکانێکدا، کە لە زمان و نەریتەکەیان نەمتوانی تێبگەم.

هەرچی چۆنێك بوو، ئەو هەموو شتانەی کە لە خۆمانمان کۆکردبۆوە، دەبوو لەناو جانتاکاندا جێگایان بکەمەوە، بەڵام زەحمەتێکی خۆش بوو. چاوانی مەهتاب لە خۆشیدا دەدرەوشایەوە. دەیزانی، سبەینێ خۆی و کەروێشکەکەی لەسەر کورسی فڕۆکە دادەنیشن بەرەو ماڵەوە.

لە لایەکی تردوە، دڵنەوایی مودیم دەکرد. دەمزانی لە خێزانەکەی و وڵاتەکەی بێزارم و هیچ هۆیەکیشم نەدەبینییەوە، کە خۆشی خۆمی بۆ باسنەکەم، سەبارەت بە تەواوبوونی سەردانەکەمان. زیاتر لەوەش، دەمویست ئەویش خۆی ئامادەبکات. بەناو شتومەکی ژووری نوستنە بچوکەکەماندا چاوم دەگێڕا، ئەوەکو شتێکمان لە بیرچووبێت، سەرنجمدا مودی هەروا لەسەر جێگاکە دانیشتووە، هێشتا هەر لە خەیاڵدایە. "دەی وەرە،" پێموت، "با پێکەوە شتەکانمان کۆکەینەوە."

سەیری جانتاکانم کرد، پڕیبوو لەو دەرمانانەی کە مودی هێنابووی لەگەڵ خۆی، تا بیانبەخشێت بە دەرمانگەی گەڕەك. "بە نیازیت چی لەمانە بکەیت؟" پرسیارملێکرد.

"نازانم." وەڵامیدامەوە.

"بۆچی نایاندەیت بە حوسەین؟" پێشنیارمکرد. بە تەمەنترین کوڕی بابەحاجی و عەمە بزورگ، کە دەرمانخانەیەکی سەرکەوتووی هەبوو.

لە دوورەوە زەنگی تەلەفون لێیدا، بەڵام بەناستەم گوێم لە دەنگی بوو. دەمویست کۆکردنەوەی جانتاکان تەواوبکەم.

"بڕیارمنەداوە، چیان لێبکەم." مودی دەنگێکی هێواشی لێوە هات. بە ڕووخساریدا دیاربوو، هۆشی لای خۆی نییە.

پێش ئەوەی گفتوگۆکەمان تەواوبێت، مودی بانگکرا بۆ سەر تەلەفون، منیش بەدوایدا چووم بۆ چێشتخانەکە. مەجید بوو لەسەر خەت، چووبوو بۆ فڕۆکەخانە بۆ ئۆکەی[18]

کردنی بلیتی گەڕانەوەکانمان. هەردووکیان بۆ چەند خولەکێك بە فارسی قسەیانکرد، پێش ئەوەی مودی بە ئینگلیزی بڵێت، "چاکە، باشترێکە لەگەڵ بیتی خۆیدا قسەبکەیت."

کە تەلەفونەکەم لە هاوسەرەکەم وەرگرت، هەستم بە ترسێك کرد، کە لەشمی هێنایە لەرزە. لەپڕ دیمەنێکی ترسناك هاتە بەرچاوم کە زۆر شتی لە خۆگرتبوو. شوروشەوقی مودی بۆ سەردانی خێزانەکەی، سۆز و خۆشەویستی بۆ شۆڕشی ئیسلامی و ئەو پەڕی دەستبڵاوی مودی لە پارە خەرجکردنندا، هەموو ئەمانە هاتەوە بیرم. ئەو مۆبیلانەی کڕیبوومان چی؟ پاشان ئەوەم بیرکەوتەوە، کە مەجید هێشتا هەڵنەساوە بە ناردنەوەیان بۆ ئەمریکا بە کەشتی. ئایا ئەمە ڕێکەوتبوو، کە مەجید و مەهتاب ئەم بەیانییە لە پارکی میللەت لە ئێمە دوورکەوتنەوە، تا من و مودی تەنیا پێکەوە قسەبکەین؟ گەڕامەوە بۆ ئەو هەموو قسەوباسە درێژەی کە بە فارسی لە نێوان مودی و مامل دەکرا، کاتێك مامل لە مەشیگان لەگەڵ ئێمەدا دەژیا. پاشان گومانمکرد، کە ئەمە تەڵەیە و بۆ منی دەنێنەوە.

ئینجا زانیم، کە شتێکی ترسناك لە گۆڕێدایە، هەتا پێش ئەوەی لە تەلەفونەکەدا لە مەجیدی ببیستم، "تۆ ناتوانیت بۆ سبەینێ سەفەربکەیت."

هەوڵمدا دان بەخۆمدا بگرم و تۆقاندن بە دەنگمەوە دیارنەبێت، پرسیارملێکرد، "مەبەستت چییە، ناتوانین سبەینێ سەفەربکەین."

"دەبوو سێ ڕۆژ پێشتر، پاسپۆرتەکانتان بهێنایە بۆ فڕۆکەخانە و تۆکەیتان بکردایە، ئینجا ئەوسا دەتانتوانی وڵات جێبهێڵن. ئێوە پاسپۆرتەکانتان لە کاتی خۆیدا تۆکەینەکردووە."

"من ئەوەم نەزانیوە. من بەرپرسی ئەوە نییم."

"کەواتە سبەینێ ناتوانی بگەڕێیتەوە."

لە شێوەی گفتوگۆی مەجیددا، نیشانەیەك بە سوك تەماشاکردنی پێوە دیاربوو، وەك ئەوەی بڵێت، ئێوەی ژنان - بەتایبەتی ئێوەی ژنانی ڕۆژئاوایی  هەرگیز تێناگەن، کە دنیا چۆن دەڕوات بە ڕێوە. هەروەها فورس و فایمییەکیش هەبوو لە قسەکانیدا، کە وایکرد لە گوێمدا بزرنگێتەوە. ئیتر لەو ساتەوە مەجیدم لەبەرچاوکەوت.

لە تەلەفونەکەدا قیژاندم. "یەکەم فڕۆکە کەیە، کە ئێمە بتوانین پێی بڕۆین؟"

"نازانم. دەبێت تەماشابکەم."

کە تەلەفونەکەم داخست، هەستمکرد خوێن لە لەشمدا نەماوە. هەرچی هێز بوو پێم نەمابوو. پێشبینیمکرد، شتێك لە ئارادایە، زۆر زیاترە لە کێشەیەکی بیرۆکراتی سەبارەت بە پاسپۆرتەکانمان.

مودیم کێشکرد بۆ ژووری نوستنەکەمان.

"چی لە ئارادایە؟" داوام لێکرد.

"هیچ، هیچ شتێك. فڕۆکەی داهاتوو دەگرین و دەڕۆین."

"بۆچی پاسپۆرتەکانت تۆکەینەکردووە؟"

"هەڵمیەك بوو. هیچ کەس بیری بۆ ئەوە نەچووە."

خەریکبوو دەتۆقیم. ئەمدەویست کۆنترۆڵی خۆم لە دەستبدەم، بەڵام هەستمکرد، گیانم کەوتە لەرزین. دەنگم تا دەهات بەرزدەبووە و زمانم تەتەڵەیدەکرد. "باوەڕت پێناکەم،" هاوارمکرد. "درۆم لەگەڵ دەکەیت. پاسپۆرتەکان بهێنە. شتەکانت کۆکەرەوە. دەچین بۆ فڕۆکەخانە. پێیاندەڵێین، کە ئێمە ئاگاداری ئەم سێ ڕۆژە نەبووین و لەوانەیە ڕێگامان بدەن سواری فڕۆکەکە ببین. ئەگەر نەشیانهێشت، ئەوا لەوێ دەمێنینەوە تا فڕۆکەیەکی تر دەگرین."

مودی بۆ ساتێك بێدەنگبوو. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا. زۆر جار لەماوەی ئەو حەوت ساڵ ژیانی هاوسەرێتیماندا هەوڵماندابوو، لە بەرەو ڕووبوونەوەی یەکتر دوورکەوینەوە. هەر دووکمان کارامە بووین لە خستنەلاوەی کێشە، بەتایبەتی کێشەیەك کە بەرەو ڕووی ژیانی هاوبەشمان ببوایەتەوە.

بەڵام ئێستا ئیتر مودی دەیزانی، ناتوانێت ئەمە بخاتەلاوە و پێش ئەوەی دەمبکاتەوە، دەمزانی، چ مشتێك لە هەمانەکەیدایە.

بەرەو ڕووم لەسەر جێگاکە دانیشت و هەوڵیدا دەست بگرێت بە ناوقەدمەوە، بەڵام من چوومە دواوە. بە هێواشی و ڕەقییەکەوە دەستی بە قسەکرد، هەستی بەهێزبوون لە دەنگیدا لە برودابوو. "بەڕاستی نازانم چۆن ئەمەت پێبڵێم،" مودی وتی. "ئێمـــە ناگەڕێینەوە بۆماڵەوە. ئێمە لێرە دەمێنینەوە."

لەگەڵ ئەوەی لە چەند خولەکدا پێشبینیمدەکرد، دروست چیم پێدەڵێت، نەمتوانی ڕق و قینی خۆم بەتاڵنەکەمەوە، هەرکە وشەکانی لەدەم هاتەدەرەوە.

لەسەر جێگاکە بازمدایە خوارەوە. "درۆزن! درۆزن! درۆزن!" قیژاندم. "چۆن دەتوانی، ئەوە لەگەڵ من بکەیت؟ تۆ دەزانیت، لەبەر چ هۆیەك من هاتووم بۆ ئێرە. دەبێت ڕێگام بدەیت، بگەڕێمەوە!"

لە ڕاستیدا مودی دەیزانی، بەڵام لەوەدەچوو بۆی گرنگ نەبێت.

مەهتاب تەماشایدەکرد، لە واتای گۆڕانی لەپڕی هەڵسوکەوتی باوکی تێنەدەگەیشت. مودی بە دەنگێکی نزم و توڕەوە وتی، "بە هیچ جۆرێك نابێت ڕێگات بدەم بگەڕێیتەوە. هەرچی من دەیڵێم، دەبێت ئەوە بکەیت و تۆ لـێــرە دەمێنیتەوە." هەردوو شانی ڕاکێشام بۆ سەر جێگاکە. دەنگی قسەکردنی شێوازێکی بێشەرمانەی بەخۆیەوە گرت، لە پێکەنینەوە نزیك بوو، وەك ئەوەی پەرۆشی پیرۆزی بێت لە جەنگێکی بەردەوامی ناڕاگەیاندراودا. "تۆ بۆ باقی ژیانت لێرە دەمێنیتەوە. تێدەگەیت؟ تۆ ئێران جێناهێڵیت. تۆ تا دەمریت هەر لێرە دەبیت."

وڕ و بێدەنگ لەسەر جێگاکە پاڵکەوتم، فرمێسك لە چاوانمەوە خوڕمیکرد، گوێم لە وشەکانی مودی بوو، وەك ئەوەی لەو سەری تونێلێکی درێژەوە قسەم بۆ بکات.

مەهتاب باوەشی کردبوو بە کەروێشکەکەیدا و کەوتبووە هەنسکدان. ڕاستییەکی تاڵی ترسناک قوتبۆوە. ئەمە ڕاستییە؟ من و مەهتاب بەندین؟ بووینەتە بارمتە؟ گیرودەی دەستی درندەیەکی نامۆ بووین، کە ڕۆژێك لە ڕۆژان هاوسەرێکی خۆشەویست و باوکێك بوو؟

بە دڵنیاییەوە، دەبێت ڕێگایەکی دەرچوون هەبێت لەم شێتێتییە. بەوەی کە تووڕە بوونەکەم دروستە و لە سەر هەقم، وا بۆچووم، کە ئەمە ئاسان بۆم دەچێتەسەر.

بە چاوانی پڕ فرمێسکی ڕق و نائومێدییەوە، لە ژووری نوستنەکە ڕامکرد و چووم یەخەی عەمە بزورگ و ئەوانی ترم گرت، کە ئاسایی لەماڵەوە بوون.

"ئێوە هەر هەمووتان کۆمەڵێکی درۆزنن!" قیژاندم.

لەوەندەچوو کەس لێم تێگەیشتبێت، یان بۆیان گرنگبێت، کە چی ژنە ئەمریکاییەکەی مودی پەرێشانکردووە. لەوێ لەبەردەمی چاوانی پڕ دوژمنانەیان ڕاوەستام و هەستی بێدەسەڵاتی و بێبایەخی دایگرتم.

ئاو بە لووتمەوە نەدەوەستا. فرمێسك بە ڕوومەتمەوە دەهاتەخواردەوە. نە دەستەسڕم پێبوو نە کلینێکس، منیش وەك هەر یەکێك لە خێزانی مودی، دەم و لووتی خۆمم بە سەرپۆشەکەم سڕی. قیژاندم، "دەمەوێت هەر ئێستا لەگەڵ تەواوی خێزانەکە قسەبکەم!"

هەرچی چۆنێك بوو، پەیامەکەم گەیشت و هەموو خزمەکان ئاگادارکرانەوە بۆ کۆبوونەوە.

چەند کاژێر لەگەڵ مەهتاب لە ژووری نوستنەکە مامەوە، هەوڵمدا نەڕشێمەوە، دەمێك تووڕەدەبووم و دەمێك ئیفلیج.

کاتێك مودی داوای دەفتەری چەکەکەی کرد، بەسەری شۆڕدوە دامەدەستی.

"ئەوانی تر لە کوێن؟" پرسیاریکرد. چونکو ئێمە سێ حسابی بانکیمان هەبوو.

"یەك دانەیانم لەگەڵ خۆم هێناوە." وەڵامەدایەوە. ڕوونکردنەوەکەمی قبوولکرد و زەحمەتی خۆی نەدا، جانتاکەم بگەڕێت.

تەنیا جێیهێشتم، پاشان هێزمدایە خۆم، کە چۆن بەرگری لە خۆم بکەم.

لەدوا کاژێرەکانی شەودا، پاش ئەوەی بابەحاجی لە کار گەڕایەوە و نانی ئێوارەی خوراد، پاش ئەوەی کە هەموو خێزانەکە لەسەر داوای من کۆبوونەوە، پاش ئەوەی کە دڵنیابووم، بەشێوەیەك خۆم گۆڕیوە، کە لەلای ئەوان بەڕێز خۆم بنوێنم، چووم بۆ لایان بۆ ناو هۆڵەکە. پلانی خۆمم دارشتبوو. پشتم بەستبوو بەو ڕەوشتە دینییەی کە بابەحاجی نمونەی بوو. ئەو دەیتوانی هەق و ناهەق لەیەکتری جیاکاتەوە.

"ڕەزا،" وتم، هەوڵمدا دەنگم نارام ڕاگرم، "ئەوەی دەیڵێم بۆ بابەحاجی، وەرگێڕە."

ئەم پیاوە پیرە، کە گوێی لە ناوی خۆی بوو، بۆ ساتێك تەماشایکردم، پاشان وەك هەمیشە سەری داخستەوە، وەك کەسێکی خواناس ڕەتی ئەوەی دەکردەوە، بەرەوڕوو تەماشامبکات.

بەو هیوایەی قسەکانم بە دروستی وەربگێڕدرێت بۆ فارسی، کەوتمە بەرگرییەکی بێئومێدانە لە خۆم. بۆ بابەحاجیم ڕوونکردەوە، کە من نەمویستووە بێم بۆ ئێران، چونکو ئاگاداری ئەوە بووم، کە هاتمە ناو ئێرانەوە، ئەو مافە سەرەتاییانەی کە ژنێکی ئەمریکایی هەیەتی نایمێنێت. هەر لە سەرەتاوە ترسی ئەوەم هەبوو، دەمزانی، تا لە ئێراندا بم هەموو بڕیارێك بەدەست مودییە.

کەواتە بۆچی هاتم بۆ ئێرە؟ ڕەوانبێژانە پرسیارمکرد.

هاتم خێزانەکەی مودی ببینم و ئەوانیش مەهتاب ببینن. هەروەها هۆیەکی تر هەیە، هۆیەکی زۆر قووڵتر و ترسناکتر هەیە، کە من هاتم بۆ ئێرە، بەڵام نەمتوانی - نەموێرا - ئەم هۆیە بۆ خێزانەکەی مودی باسبکەم. ئینجا کەوتمە باسی بەسەرهاتی سوێندەکەی مودی.

کاتێك لە دیترۆیت بووین، ترس و نیگەرانی دڵی خۆمم بۆ مودی کردەوە، کە لەوانەیە ئەگەر لەگەڵی بچم بۆ ئێران نەهێڵێت بگەڕێمەوە، مودی بە شێوەیەك وەڵامیدامەوە کە بێمە سەر ئەو باوەڕەی، هیچ نیازێکی خراپ لە ئارادا نییە.

"مودی دەستی نا بە قورئاندا، کە دوور لە ویستی خۆم، هیچ هەوڵێك نادات بۆ هێشتنەوەی من،" ئەمەم وت و پرسیارمکرد، کە بابەحاجی تا چ ئاستێك ئەمەی بیستووە و تێیگەیشتووە. "تۆ پیاوی خوایت. چۆن دەتوانی ڕێگابدەیت بە مودی ئەمە بە من بکات، پاش ئەوەی کە سوێندی بە قورئان خواردووە؟"

مودی بۆ ماوەیەکی کورت هاتە قسە. ڕاستی ئەو بەسەرهاتەی قبووڵکرد، کە بە قورئان سوێندی خواردووە. "بەڵام من بەهانەم هەیە،" مودی وتی. "خــوا لێمخۆشدەبێت، چونکو ئەگەر ئەوەم نەکردایە، بیتی نەدەهات بۆ ئێرە."

بڕیاری بابەحاجی تیشکناسا بوو، ڕێگای بۆ هیچ شتێك نەهێشتەوە. ڕەزا وەریگێڕا: "هەرچی *دایــی جــان* پێیخۆش بێت، ئێمە لەگەڵیداین."

هەستم بە گومانێکی خراپی تەواو ئاشکرا کرد، فزەی لێبڕیم، هەرچەند لێم ڕۆشن بوو، ئەم هۆ هێنانەوەیە پووچە.

"ئێوە هەر هەمووتان کۆمەڵێك درۆزنن!" قیژاندم. "ئێوە هەموو ئەمەتان زانیوە. ئەمە داوێك بوو، لە چەند مانگ لەوەو پێشەوە چنیوتانە. ڕقم لە هەمووتان دەبێتەوە." بە ئاشکرا دامە پرمەی گریان، بە قیژ و گریانەوە قسەکانم کرد. "ڕۆژێك دێت تۆڵەتان لێدەکەمەوە. بە هێزی ئیسلام ئێوە ئەمە بە من دەکەن، چونکو دەزانن من ڕێزی لێدەگرم. ڕۆژێك دێت نرخی ئەمە بدەن!"

لەوەدەچوو تەواوی خێزانەکە گوێ بە هەڕەشی من نەدەن. وەك پیلانگێڕەکان تەماشای یەکتریان دەکرد، دیاربوو پێیان خۆش بوو، دەسەڵاتی دایی جان ببینن بەسەر ژنە ئەمریکاییەکەوە.

تێبینییەکان:

1. General Electric

2. ئیستیکانە: وشەیەکی فارسییە، بە واتای پیاڵەی چا دێت.

3. Americanize : بە ئەمریکایی کردن، وەك وشەی تعریب، تکرید لە زمانی عەرەبیدا.

4. Chemotherapy: چارەسەری کیمیایی.

5. خۆرشت، وشەیەکی فارسییە، بە واتای شلەی چێشت دێت.

6. دومبە، وشەیەکی فارسییە، بە واتای دوگی مەڕ دێت.

7. مەبەست، هاتنە سەر کاری کۆماری ئیسلامی ئێرانە لە ساڵی 1978دا.

8. credit card کارتی متمانە: کارتێکی بانکییە، کە لە زۆربەی وڵاتانی ڕۆژئاواییدا بەکاردەهێنرێت، ئەگەر کڕیار پارەی لە بانکدا هەبێت، دەتوانیت بەو کارتە هەرچی شتێکی بیەوێت بیکڕێت.

9. Genetic aberration: تێکچوونی بۆ ماوەزانی.

10. جەژنی سوپاس: Thanksgiving.

11. مریەمی: sage. ڕووەکێکی ناوچە گەرمەسێرەکانە بەهۆی تۆ و قەڵەمەوە زیاددەکات. بۆن خۆش و بەنرخە بە شێوەی بەهارات.

12. مریمی گلی: وشەیەکی فارسیە، جۆرێکە لە بەهارات.

13. جۆرێکە لە نان بە شێوەی سەمون کە ناوەکەی دەکرێت هەڵکۆڕێت.

14. mashed potatoes.

15. کاغەزی مۆمی: wax paper. جۆرێکە لە کاغەز کە لە فڕندا بەکاردێت و بە ئاسانی قابیلی سوتاندن و خوسانەوە نییە.

16. بۆرەکی سێو یان کەلانەی سێو: apple pie.

17. کێکی سێو: apple crisp. من دڵنیا نییم لەوەی هەموو خوێنەرێکی زمان کوردی جیوازی نێوان بۆرەکی سێو و کێکی سێو بکاتە هەروەها بۆ خۆشم دڵنیا نییم لەوەی تەواوی ئەم وشە کوردییانە تا چ ئاستێك دێتەوە لەگەڵ ئینگلیزییەکەیدا، تەنیا سەرچاوەیەك کە لەبەر دەستمدا بوو بۆ وەرگێڕانی ئەم وشانە، کەمالنامەی بەڕێز کەمال جەلال غەریب بوو. وەرگێڕ

18. ok: ئۆکەی کردن: دووپاتکردنەوە.

# 3

من و مەهتاب بۆ چەند کاژێر گریاین، تا مەهتاب تەواو هیلاکبوو خەوی لێکەوت. تەواوی ئەو شەوە خەو نەچووە چاوم. سەرم ئازاری هەبوو. ڕقم لەو پیاوە دەبۆوە، کە لەسەر هەمان جێگا لە تەنیشتم نوستبوو، هاوکات لێشیدەترسام.

لە نێوانماندا مەهتاب بەدەم خەووەوە هەنسکیدەدا، کە ئەمە زیاتر ئازاریدەدام. پێم سەیربوو، چۆن مودی دەتوانێت، وا پرخەپرخ بنوێت لە تەنیشت کچە بچکۆلە گرفتاربووەکەیەوە؟ چۆن دەتوانێت ئەمەی لەگەڵدا بکات؟

من بۆ خۆم ڕێگایەکە و هەڵمبژاردووە، مەهتابی بەسزمان چی، خۆ هیچ قسەیەکی نەبووە. منداڵێکی چوارساڵانی بێتاوان کەوتۆتە کێشمەیەکی بێبەزەیی هاوسەرایەتییەکی نامۆی نادیارەوە، کە بە هەر بارێکدا بێت، بووە بە - کە هەتا بۆ خۆشم بەتەواوەتی ڕۆشن نەبوو، چۆن - میلەدرامەیەک[1]، بووە بە جێگای ڕەنگدانەوەی ڕووداوە سیاسیە ئاڵۆزەکانی جیهان.

تەواوی ئەو شەوە سەرکۆنەی خۆمم کرد. چۆن مەهتابم هێنا بۆ ئێرە؟

وەڵامەکەیم دەزانی. بەڵام چۆن نەمتوانی بەری پێبگرم؟

زۆر سەیر دەهاتە بەرچاو، تەنیا ڕێگایەک کە بە خەیاڵمدا هات، بۆ دوورخستنەوەی هەتاهەتایی مەهتاب لە ئێران، هێنانی بوو بۆ ئێرە بۆ ماوەیەکی کاتی. ئێستا ئیتر ئەو ڕێگا ناچارییەش هەرەسی هێنا.

هەرگیز مەراقی سیاسەت و کێشمەکێشی نێودەوڵەتیم نەبووە. هەموو ئەوەی مەبەستم بوو، خۆشی و هەماهەنگی ناو خێزانەکەم بوو. بەڵام ئەو شەوە، کە هەزارەها بیرەوەری لە مێشکمدا هاتوچۆیان بوو، لەوە دەچوو ئەو تۆزە خۆشییەی کە بە خۆمانەوە دیبووم، بەردەوام تێکەڵی ئازار بوو.

لە ڕاستیدا هەر ئازار بوو، من و مودی بە یەکتر گەیاند، زیاتر لە یەک دەیە لەمەوپێش، کاتێک کە ئازار لە لای چەپی سەرمەوە دەستیپێکرد و خێرا بەناو لەشمدا بڵاوبۆوە. لە شباتی 1974 میگرین[2] لەسەری دام، گێژی و ڕشانەوەی لەگەڵ خۆی هێنا و هێزی لێبڕیم. تەنیا چاوکردنەوەیەک، ئەشکەنجەیەک بوو بۆم. هەتا بچوکترین دەنگ، مایەی تەوژمێک ئازار بوو لە پشتملمەوە بۆ پشتم. بە دەرمانێکی زۆر خەوم لێدەکەوت.

ئەم دەردە مایەی ئازارێکی تایبەت بوو، چونکو لەو باوەڕەدا بووم، لە تەمەنی بیست و هەشت ساڵیدا، هەرچی چۆنێک بێت دەتوانم ژیانێکی کەسێکی کامڵ بۆ خۆم پێکەوە بنێم. زۆر زوو شوومکردبوو، لەپاش تەواوکردنی قوتابخانەی ئامادەیی، کاتێکم زانی کەوتوومەتە پەیوەندییەکەوە کە هیچ خۆشەویستییەکی تیادا نییە و کۆتایی هات بە جیابوونەوەیەکی

درێژخایەن و ئازاراوی. پاشان دەورانێکی ئارام و خۆش دەستیپکرد، کە ئاکامی ڕاستەوخۆی هەوڵ و کۆششی خۆم بوو. کارەکەم لە ئایتیتی هانکوك لە شاری بچوکی ئلیسیا لە ناوەڕاستی مەشیگان، پیشەیەك بوو داهاتوویەکی باشی هەبوو. لە سەرەتاوە وەك فەرمانبەری ژمێریار بۆ کاتی شەو دەست بەکاربووم، بە شێوەیەك کارمکرد تا بووم بە بەرپرسی تەواوی فەرمانبەران و پلانی تەواوی کاردکە کەوتە دەستی منەوە. موچەیەکی مامناوەندیم هەبوو، کە بەشی ژیانێکی ئاسودەی بۆ خۆم و دوو کوڕەکەم، جۆی و جۆن، دەستەبەردەکرد.

بەشێك لە کاتی ئازادی خۆمم تەرخانکردبوو بۆ بەشی ناوچەیی ڕێکخراوی سستبووانی ماسولکە، بە یارمەتیدانیان بۆ ڕێکخستنی چالاکی ساڵانەیان، کە بەرنامەی تەلەفیزیونی جێری لویس بوو، کە بەوە هەنگاوێکی گەورەی نا بۆ پێشەوە. ساڵێك لەوەوبەر لە یەکی ئایاریدا لە تەلەفیزیوندا لە لانسینگ دەرکەوتم. هەستم بە خۆشییەك کرد و بەو توانا تازەیەی کە لە خۆمدا دۆزییەوە، دەمتوانی ژیانێکی سەربەخۆی پێدروستبکەم.

هەموو شتێك وا دەردەکەوت، کە داهاتوویەکی ڕۆشن چاوەڕوانمە، هەرچەند نادیاربوو، بەڵام ئەو ئارەزوانەی کە لە تەمەنی دەیەکاندا هەمبوو، دەکرا بێتەدی. کۆمەڵێك ژن و پیاوی کرێکار بە دەورمەوە بوون، کە ڕازیبوون بەو شتە ساکارانەی من بە دوایەوە بووم. شتێکم دەویست کە تا ئێستا بەخۆمەوە نەمدیبوو، بڕوانامەیەکی کۆلێژ، یان پیشەیەکی وەك پەیامنێری هۆڵی دادگا، یان خۆم کارێك بەگەڕبخەم، یان هەرچی شتێکی تر - کێ دەیزانی؟ شتێکی زیاترم دەویست لەو ژیانە یەك ڕەنگییەی کە تیایدا دەژیام.

بەڵام ئازار ڕێگای پێگرتم. بۆ چەندەها ڕۆژ هەموو ئارەزوم هاتبووە سەر ئەوەی، کە چۆن لەو ئازارە سەختە لەپەلوپۆخەرە ڕزگارم بێت. بەناچاری هانام بۆ دکتۆر ڕۆجەر مۆریس برد، کە لەمێژ بوو دکتۆری خێزانیمان بوو. پاش پشکنین، هەر ئەو پاشنیوەڕۆیە ڕوانەی خەستەخانەی ستی کارسۆنیان کردم، خەستەخانەیەك بۆ چارەسەری نەخۆشی ئێسقان، کە دەکەوتە ڕۆژئاوای ئلسیەوە، بەدووری نیو کاژێر ماشێن لێخوڕین.

لە ژوورێکی تایبەتدا جێگایان بۆ کردمەوە، پەردەیان بە دەورمدا کێشا و گڵۆپیان لێکوژانمەوە، وەك منداڵ لەناو سکی دایکیدا، لە جێگاکەدا خۆم گرمۆڵە کرد، ئاباوەڕانە گوێم لە دکتۆر بوو، ئەگەری بوونی برینی پیسی لە دەماخمدا دەهێنایە کایەوە.

دایك و باوکم بە ئوتومبیل لە بانیستەرەوە هاتن بۆ سەردانم، جۆی و جۆنە بچکۆلەکەشیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو بۆ ناو ژوورەکەم. تەمەنی هەر دووکیان ئەوەندە منداڵ بوون، بۆیان نەبوو بیانهێننە ژوورەکەوە. زۆرم پێخۆش بوو کوڕەکانم بینی، بەڵام ئەم پێشێلکردنەی یاسای سەردانی نەخۆشخانەیە ترساندمی. بۆ ڕۆژی دوایی کە بەرپرسی ڕێکخراوی دینی سەردانیکردم، داواملێکرد کە دەمەوێت وەسییەتنامەکەم بنووسم.

دەردەکەم جێگای تێڕامان بوو. پزیشکەکان ڕۆژانە چارەسەری جەستەییان بۆ دیاریکردبووم، پاش ئەمە چارەسەرێکی تر بەدوایدا دەهات بەناوی چارەسەری مانیپولیشن،

که بریتی بوو له راستکردنەوەی ئێسقان وجومگەکان، ئینجا دەیان ناردمەوە بۆ ژوورە بێدەنگ و تاریکەکەم. چارەسەری مانیپولیشن، بە واتای راستکردنەوەی ئیسقان و جومگەکان، جیاوازیەکی گەورەی هەیە لەگەڵ پزیشکی ئۆستیوباثی و پزیشکی کلاسیکی ناوی ناو خەڵکی. پزیشکە ئۆستیوباثیەکان، کە هەردوو پیتی دی و ئۆ دەبنە پاشگری ناودکانیان، هەمان راهێنان و یاسا دەیانگرێتەوە کە زاڵە بەسەر پزیشکەکانی تردا و لە هەر پەنجا ولایەتەکە رێگای کارکردنیان پێدراوە. ئەوانیش وەك پزیشکەکانی تر هەمان شێوە و رێبازی هاوچەرخی چارەسەر بەکاردەهێنن. بەڵام پزیشکی ئۆستیوباثی دەروانێتە سەرجەم گیانی نەخۆش و وەك یەکەیەك، نەك وەك ئەندامێك یان چەند ئەندامێك، ئەم رێبازە لە تیمارکردن پێیدەڵێن رێبازی هۆلیستی .

سراپی شێلان بەدوای کەمکردنەوەی سروشتی ئازارەوەیە، لە رێگای بزواندنی خاڵە ئازاراوییەکانی دەمار و خاوکردنەوەی ماسولکە ئازارە گرژبووەکان. لە رابوردوودا لە پەیوەند بە ئازاری جۆراوجۆرەوە کەڵکم لەم جۆرە چارسەرە وەرگرتبوو، بە هیوابووم بۆ ئەم جارەیان کارایی هەبێت، چونکو ئازار تەواو پەریشانی کردبووم.

ئازارێکی هێندە زۆرم بوو، ئاگام لەو دکتۆرە نەبوو، کە هات یەکەم سراپیم بۆ بکات. لەسەر دەم، لەسەر مێزێکی داپۆشراو بە دۆشەکێکی تەنك پاڵکەوتم و هەستمدەکرد، کە چۆن دەست بە ماسولکەکانی پشتمدا دەهێنێت. دەستی نەرم و هەڵسوکەوتی بەرێزانە بوو.

یارمەتیدام بکەومە سەر پشت، تا ئەوەی کردبووی دووبارەیبکاتەوە لەسەر ماسولکەکانی شان و ملم، دوا شتی سراپییەکە مل بادانێکی خێرا و بەدیقەت بوو، کە دەبووە هۆی تەقاندنی و یەکسەر هەستێکی ئاسودەیی دایدەگرتم.

کاتێك لەسەر پشت پاڵدەکەوتم، دەمتوانی وردتر دکتۆرەکە ببینم. وا دیاربوو، تەمەنی بە پێنج شەش ساڵ لە من گەورەتر بێت  ئەمەش وای لێدەکرد، کە لەناو تەواوی دکتۆرەکانی تردا، ئەو بە تەمەنتر بێت. سەری تازە کەوتبووە رووتانەوە. بە تەمەنبوونی جۆرێك لە شکۆیی پێدابوو. قۆزێکی وەها نەبوو، بەڵام لەشی بەهێزی و تێکسمراوی سەرنجراکێش بوو. چاویلکەکەی کەسایەتییەکی رۆشنبیری پێدەبەخشی و دەموچاوێکی عەرەبییانەی پێوە بوو. پێستی لە من تاریکتر بوو. بێجگە لە شێوەی زمانەکەی، هەڵسوکەوت و کەسایەتی ئەمریکایی بوو.

ناوی دکتۆر سەید بزورگ مەحمودی بوو، بەڵام دکتۆرەکانی تر بە مودی ناویاندەبرد.

کاتێك لە خەستەخانە کەوتبووم، سراپی دکتۆر مەحمودی مایەی دڵخۆشی بوو. لەو کاتەدا ئازارم کەمبووبۆوە و سراپییەکە کاریی خۆی دانابوو. هیچ کات لەوەوپێش دکتۆری وا بە موشوورم نەبینیبوو. رۆژانە بۆ چارەسەرکردن دەمبینی، لەگەڵ ئەوەشدا ناوبەناو دەهات و ئەحواڵی دەپرسیم و ئێواران درەنگێك شەوشادی لێدەکردم.

تەواوی ئەو تاقیکردنەوانەی بۆیان کردم، ئەگەری ئەوەی برینێك لە دەماخمدا هەبێت، خستەلاوە و دکتۆرەکان بەو سەرئەنجامە گەیشتن، کە توشی میگرینێکی سەخت بووم و بە

تێپەڕبوونی کات خۆی نامێنێت. دەستنیشانکردنەکە زۆر ڕۆشن نەبوو، بەڵام وا دەردەکەوت کە ڕاست بێت و پاش چەند هەفتە ئازارەکە بەرەو نەمان ڕۆیشت. ئەوەی ڕوویدا لێم، کاریگەرییەکی جەستەیی نەبوو، بەڵام ڕێڕەوی ژیانمی ژێرەوژوور کرد.

دواهەمین ڕۆژی مانەوەم بوو لە خەستەخانە، کە دکتۆر مەهمودی لە نیوەی دواهەمین سراپییەکەیدا وتی، "حەزم لە بۆنەکەتە. ئەو بۆنە خۆشە، تۆم بیردەخاتەوە." ئاماژەی بە بۆنی *چارلی* دەکرد، کە بەردەوام لە خۆمم دەدا. "شەو کە دەچمەماڵەوە، هێشتا بۆنی عەترەکەی تۆ لە دەستم دێت."

داوای لێکردم، کە ئایا بۆی هەیە بۆ ئەحواڵپرسین پەیوەندیم پێوە بکات، کاتێك دەگەڕێمە ماڵەوە. "بێگومان،" وەڵاممدایەوە. بە وردییەوە ناونیشانی ماڵەوە و ژمارەی تەلەفونەکەمی لای خۆی نووسی.

ئینجا پاشان، کە سراپییەکە تەواوبوو، هێواش و لەسەرخۆ دانەوییەوە و ماچێکی لێوانی کردم. بێئاگا لەوەی ئەم ماچە ئاساییە بەرەو کوێم دەبات.

مودی پێیخۆش نەبوو لەبارەی ئێرانەوە بدوێت. "هەرگیز نامەوێت بگەڕێمەوە بۆ ئەوێ،" مودی وتی. "من گۆڕاوم. خێزانەکەمان ئیتر لە من ناگەن. منیش لەگەڵ ئەوان هەڵناکەم."

هەرچەند مودی حەزی لە شێوەی ژیانی ئەمریکا بوو، بەڵام ڕقی لە شا دەبۆوە، چونکو ئێرانی ئەمریکاییکردووە. ڕەخنەیەك کە زووزوو دووبارەیدەکردەوە، ئەوە بوو کە ئینسان ناتوانێت لە سوچی هەر شەقامێکدا چلوکەبابی بکڕێت - خواردنێکی تایبەتی ئێرانییە، کە لە شلەی گۆشت مەڕ و برنج پێکهاتووە. لە جیاتی ئەوە مەکدۆناڵد و خواردنی خێرای تری ڕۆژئاوایی لە هەموو شوێنێکدا سەوز دەبێت. ئەو وڵاتە ئەماوە کە تیایدا گەورەبووە.

مودی لە شوشتەر لە خوارووی ڕۆژئاوای ئێران لەدایکبووە، بەڵام پاش مردنی دایك و باوکی دەچێتە لای خوشکەکەی لە خورەمشەهر، لە هەمان هەرێم. ئێران نموونەیەکە لە وڵاتانی جیهانی سێهەم، کە دوورییەکی گەورە هەیە لە نێوان چینی باڵا و خوارەوی کۆمەڵگا. ئەگەر مودی لە خێزانێکی هەژاردا لەدایکببوایە، لەوانەبوو هەموو ژیانی وەك ئەو خەڵکە هەژارە بێشومارەی تاران بەسەربردایە، لە کەپرێك کە لە شرە و شاتاڵی زبڵدانەکان دەروستدەکرێت، شەوی ڕۆژبکردایەتەوە، بەناچاری بۆ کارێکی کاتی لەم و لەو بپاڕایەتەوە. بەڵام خێزانەکەیان لە پارە و دەسەڵات کەمیان نەبوو. لەبەرئەوە پاش تەواوکردنی خوێندنی ئامادەیی، ئەو پشتیوانە دارایی هەبووە، کە ئەو خوێندنەی پێی باشبووە، دوای بکەوێت. خۆشی مەبەستی بووە، بەدوای شتێکی باشترەوە بێت.

لەو کاتانەدا گەنجێکی ئێرانی زۆر سەفەریانکردووە بۆ دەرەوەی وڵات. حکومەتی شا هاندەری خوێندن بووە لە دەرەوەی وڵات، بەو هیوایەی کە هەنگاوێك بێت بەرەو ڕۆژئاواییکردنی وڵاتەکە. بەڵام لە کۆتایدا پێچەوانەکەی دەرچوو. ئێرانییەکان پیشانیاندا،

کە چەند کەللەڕەقن، سەبارەت بە تێکەڵبوونیان لەگەڵ کەلتوری ڕۆژئاوایی. هەتا ئەوانەی کە زیاتر لە بیست سی ساڵ بوو لە ئەمریکادا دەژیان، زیاتر بە گۆشەگیری مانەوە، زیاتر لەگەڵ هاووڵاتییەکانی خۆیان پەیوەندیان هەبوو. باوەڕی ئیسلامی و ئەریتە فارسییەکەی خۆیان پاراست. هەتا جارێکیان ژنێکی ئێرانیم بینی، بیست ساڵ بوو لە ئەمریکادا دەژیا، کەچی نەیدەزانی خەولی قاپوقاچاخ گرتن چییە. کاتێك پێشانمدا، پێی وابوو، ئەمە داهێنانێکی زۆر گرنگە.

ئەو شتەی کە قوتابییە ئێرانییەکان لە دەرەوەی وڵات پەلاماریاندا و خستیانە مێشکی خۆیانەوە، ئەو ڕاستییە بوو، کە بڕیار دەبێت بە دەستی خەڵك بێت بۆ دیاریکردنی فۆرمی حکومەتەکەیان، کە ئەمەش بووە هەڵوێستێکی سیاسی ڕوو لەبەرەو و ڕوخاندنی شا ناکامەکەی بوو.

ڕابوردووی مودی شتێکی نمونەیی نەبوو. بۆ نزیکەی بیست ساڵ، زۆر شتی کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی قبوولکردبوو، بەپێچەوانی زۆربەی هاونیشتیمانەکانیەوە، خۆی لە سیاست دوورخستبۆوە. جیهانێکی دۆزیبۆوە کە زۆر جیاواز بوو لە جیهانی منداڵی، جیهانێك کە خۆشگوزەرانی و مافە سەرەتاییەکانی ئینسانی دەستەبەردەکرد، ئەو شتانەی کە لە کۆمەڵگای ئێراندا لە ئاستێکی نزمدا بوو. مودی بە ڕاستی ویستبووی، ببێت بە ڕۆژئاوایی.

لەپێشدا سەفەریکردووە بۆ لەندەن، بۆ دوو ساڵ لەوێ ئینگلیزی خوێندووە. لە پانزەی حەوتی هەزار و نۆ سەد و شەشت و یەك، بە ڤیزای قوتابی گەیشتۆتە ئەمریکا و لەوێ لە زانکۆی دەوڵەتی نۆرسنیست میسۆری[3] بڕوانامەی بەکالۆریۆسی تەواوکردووە، وە بۆ چەند ساڵ لە قوتابخانەی ئامادەیی وانەی ماتماتیکی وتۆتەوە. کەسێکی زرنگ بووە، بەئاسانی فێری هەموو شتێك بووە، حەزی جۆراوجۆری هەبووە، کە ئەمەش وای لێکردووە نەتوانێت قاچ بخاتە ژێر خۆی و هەر لە هەوڵدا بێت. شوروشەوقی بۆ ئەندازیاری پەرەپێداوە، گەڕاوەتەوە بۆ خوێندن و پاشان کاریکردووە بۆ کۆمپانیایەك، کە لەلایەن خاوەنکارێکی تورکییەوە بەڕێوەبراوە. کۆمپانیاکە بەڵێندەری پلە دووی ناسا[4] بووە، کە خەریکی ئامادەکردنی سەفەری ئاسمانی ئەپۆلۆ[5] بووە. "بەشداریم کردووە لە ناردنی پیاوێك بۆ سەر ڕووی مانگ،" مودی زۆر جار بە شانازییەوە دەیوت.

کە تەمەنی دەچێتە سییەکانەوە، جارێکی تر کێچ دەکەوێتەوە کەوڵی. خولیای کارێك دەکەوێتە سەری، کارێك کە دایك و باوکیشی هەمان کاریان هەبووە و لەلای هاووڵاتییەکانی وەك پیشەیەکی پایەبەرز چاوی لێدەکرا. بڕیاردەدات، ببێت بە دکتۆر. لەگەڵ ئەوەی ئەو بڕوانامە ئەکادیمانەی کە هەیبووە لە کاتێکی کورتدا بەدەستی هێنابوون، کەچی بەهۆی تەمەنەوە زۆرێك لە خوێندنگا دەرمانییەکان قبووڵیاننەکردووە. لەکۆتاییدا لە کۆلێژی کانساس سیتی بۆ چارەسەری سروشتی[6] وەرگیراوە.

ئەو کاتەی ئێمە یەکتریمان دەبینی، ئەو خەریکبوو پراکتیکی لە کارسۆن سیتی تەواودەکرد و بە نیازبوو بۆ سێ ساڵ لە خەستەخانەی چارەسەری سروشتی[7] دیترۆیت جێنشینبێت، کە لەوێ پلانی وا دانبوو، ببێت بە دکتۆری بێهۆشکردن.

"لەحیاتی ئەوە دەبوو پراکتێکی گشتی بکەیت،" پێموت. "تۆ باش هەڵسوکەوت لەگەڵ نەخۆشدا دەکەیت."

"پارە لە کاری پزیشکی بێهۆشیدایە،" وەڵامیدامەوە، کە وەڵامی کەسێکی ئەمریکایی بوو. کارتی سەوزی بەدەستهێنا، کە مافی ئەوەی پێدەدا کاری پزیشکی بکات لە وڵاتە یەکگرتووەکان، هەروەها ڕێگای خۆشدەکرد بۆ بوون بە هاووڵاتی ئەمریکی.

وا دەردەکەوت، کە دەیەوێت بەتەواوەتی پەیوەندی خێزانی بپچڕێنێت. بەدەگمەن بۆ کەسوکاری لە ئێران نامەی دەنووسی، هەتا بۆ عەمە بزورگی خوشکی، کە لە خورەمشەهرەوە ماڵی گواستبۆوە بۆ تاران، وە ئەم نەبوونی پەیوەندی خێزانییە تۆزێك منی غەمناك کردبوو. هەتا بۆ خۆشم کێشەی ئەم پەیوەندی خێزانییەم هەبوو، بەڵام هەر باوەڕی تەواوم بە گرنگی ئەم پەیوەندییە سروشتییە هەبوو.

"هیچ نەبێت دەبێت تەلەفونیان بۆ بکەیت،" پێموت. "تۆ دکتۆری و توانای ئەوەت هەیە، مانگی جارێك تەلەفونیان بۆ بکەیت."

هەر من بووم هانمدا، سەردانی وڵاتەکەی بکات. پاش ئەوەی پراکتیکی لە کارسۆن سیتی لە مانگی حەوتدا تەواوکرد، بە نابەدڵییەوە بۆ دوو هەفتە سەردانی عەمە بزورگی کرد. کاتێك لەوێ بوو، هەموو ڕۆژێك نامەی بۆ دەنووسیم کە چەند بیری من دەکات. وە بۆ خۆشم جێگای سەرسامیم بوو، کە چەند بیریدەکەم. ئیتر ئەو کاتە بۆم دەرکەوت، کە خەریکە دەکەومە داوی خۆشەویستییەوە.

تەواوی ئەو سێ ساڵەی کە لە خەستەخانەی دیترۆیت جێنشینبوو، بەردەوام یەکتریمان دەبینی و بەدوای هەڵێکەوە بوو خۆشەویستی خۆی بۆ من پیشانبدات. هەمیشە شیرینی پێبوو بۆ جۆی و جۆن، گوڵ، خشڵ و بۆنیش بۆ من.

دیارییەکانی بەدەستی خۆی دەڕازاندەوە. مێردی پێشووم هەرگیز بۆنە جیاوازەکانی نەدەنرخاند، بەڵام مودی هەتا بچوکترین بۆنەی بیردەخستمەوە. زۆرجار بە دروستکردنی کارتی پیرۆزبایی بەدەستی خۆی. بەبۆنەی ڕۆژی لەدایکبوونمەوە قوتویەکی پێشکەشکردم، کە پێکهاتبوو لە دەزگایەکی مۆزیکی و پەیکەری منداڵێکی ساوا لە باوەشی دایکیدا، وە لەسەر کارتێك نووسیبووی، "بۆ تۆ کە ئەوەندە دایکێکی باشی." شەوان ئەو مۆزیکەم لێدەدا، کە ئاوازی "لایلایەی" براهام بوو، بۆ خەواندنی جۆن. ژیانم بوو بە باخچەیەك، پڕیبوو لە گوڵەباخ[8].

بەڵام من ڕۆشنمکردبۆوە، کە نامەوێت شووبکەمەوە. "دەمەوێت ئازادبم،" بە مودیم وت. "نامەوێت خۆم بە هیچ کەسێکەوە ببەستمەوە." لەو کاتەدا ئەویش هەمان بۆچوونی هەبوو.

مودی لەگەڵ کاری لە خەستەخانەی چارەسەری سروشتی لە دیترۆیت، کاری پزیشکی گشتیشی دەکرد لە تیمارگەی شەقامی چواردە[9]. منیش لە ئلسیە بە شوروشەوقێکی زیاترەوە خەریکی کاری ناوماڵ بووم. هەروەها کەوتمە پیادەکردنی ئەو خولیایەی کە بۆ ساڵانێکی زۆر لە مێشکمدا بوو، دەستمکرد بە خوێندن لە بەشی ئۆسۆی کۆلێژی کۆمەڵەی لانسینگ. بەڕێوەبەرایەتی پیشەسازیم هەڵبژارد و بە پلەیەکی بەرزیش تەواومکرد.

هەر پشوویەکی هەفتە مودی لەسەر کار نەبوایە، سێ کاژێر و نیو ئوتومبیلی لێدەخوڕی بۆ بینینی من و کوڕەکان، هەردەم بە بارێك دیارییەوە دەهات. هەر پشوویەکی هەفتەش ئەو لەسەر کار بوایە، من دەچووم بۆ دیترۆیت و لە ماڵەکەی دەمامەوە.

ماچەکانی مودی هەموو شتێکی لەبیربردمەوە. خۆشەویستێکی بەڕێز بوو، حەز و خۆشی خۆی چەند بۆ گرنگ بوو، بۆ منیش هەر ئەوەندە. هەرگیز لە ژیانمدا کاریگەری وام بە خۆمەوە نەدیبوو. نەماندەتوانی تێربخۆین لە یەکتری. شەو تا بەیانی دەستلەملانی یەکتر بووین.

ژیانمان پڕبوو لە جموجۆڵ و خۆشی. ئەوەندەی کاتی هەبوو، باوکێکی باش بوو بۆ منداڵەکان. پێکەوە جۆی و جۆنمان دەبردە دەرەوە بۆ باخی گیانلەبەران یان بۆ سەیران، زۆر جاریش بۆ ئاهەنگی نەتەوە جیاجیاکان، کە تیایدا ئاشنادەبووین بە کەلتوری ڕۆژهەڵاتی.

مودی فێری چێشت دروستکردنی ئیسلامی کردم، کە پێکهاتووە لە گۆشت مەڕ و برنج بە شلەی جۆراوجۆرەوە، لەگەڵ سەوزە و میوە. کوڕەکانم، خۆم و هاوڕێکانم بەڕاستی خۆشیمان لەو خواردنانە دەبینی.

بەبێ ئەوەی ئاگام لە خۆم بێت، بۆ خۆشی مودی کەوتبوومە خزمەتییەوە. پێمخۆشبوو جێگاکەی بۆ چاکبکەم، چێشتی بۆ لێبنێم و بازاڕی بۆ بکەم. بێگومان ئەو ماڵە یەك کەسییەی، پێویستی بە دەستپیاهێنانی ژن هەبوو.

مودی چەند هاوڕێی هەبوو، بەڵام ئەوانەی منیش، یەکسەر بوون بە هاوڕێی ئەویش. مودی کۆمەڵێك کتێبی نوکتە و یاری جادوگەری هەبوو، بە کەڵکوەرگرتن لەمانە بە شێوەیەکی ئاسایی و خشکەیی دەبووە چەقی سەرنجی هەموو دانیشتنێك.

لە بۆنەی جیاوازدا، مودی چەند بنەمای سەرەکی دینی ئیسلامی بۆ باسکردم، کاریگەری زۆری هەبوو لەسەرم کاتێك زانیم، کە هەندێك لە ڕێسا فەلسەفەییەکانی ئاینی ئیسلام لەگەڵ نەریتی جولەکە مەسیحی یەکێکە. ئەڵا[10] ی موسڵمانان هەمان بوونەوەری گەورەیە، کە من و ئەندامەکانی تری مەسیحی میسۆدیستی ئازاد[11]، وەك گود[12] دەیپەرستین. موسڵمانان لەو باوەڕەدان، کە موسا پەیامبەری خوایە و تەوراتیش یاسایەکە

و خوا بۆ جولەکەی ناردووە. عیساش پەیامبەری خوایە و ڕاسپێری نوێ[13] بە کتێبێکی پیرۆز چاوی لێدەکرێت. هەروەها لەو باوەڕەدان، محەمەد گەورەترین و دوا پەیامبەرە کە لەلایەن خواوە ڕاستەوخۆ هەڵبژێردراوە، قورئانەکەشی دوا کتێبی پیرۆزە و جێگای ڕاسپێری کۆن و نوێ دەگرێتەوە.

مودی بۆی باسکردم، کە دینی ئیسلام دابەش بووە بە چەند تایەفەی دینییەوە، هەروەك دینی مەسیحی چۆن دابەشبووە بە چەند تایەفەی دینی وەك معمدانی[14]، کاسۆلیکی[15] و لۆسەری[16]. دەکرێت یەکێك لە تایەفەکانی دینی ئیسلام جیاواز بێت لەوانی تر. خێزانی مودی سەر بە موسڵمانانی شیعە بوون، کە لە ڕۆژئاوادا زانیارییەکی کەم لەبارەیانەوە هەیە. موسڵمانانێکی ئوسوڵی توندڕەون، مودی باسیکرد. هەرچەند تایەفەیەکی دینی باڵادەست بوون لە ئێراندا، بەڵام کاریگەریان نەبوو لەسەر حکومەتی ڕۆژئاوایی شا. مودی ئەو ئەرکە ئاینییە توندڕەوانەی ئەنجامنەدەدا، کە لەگەڵیاندا گەورەببووبوو.

هەرچەند گۆشتی بەرازی نەدەخوارد، بەڵام خۆشی لە پەرداخە کحولەکەی دەبینی. تەنیا جاروبار بەرماڵەکەی دەهێنایە دەرەوە و ئەرکە ئاینییەکانی ئەنجامدەدا.

جارێکیان لە کۆتایی هەفتەدا لە دیترۆیت بووم، لە ماڵی مودی کە تەلەفون لێیدا. مودی بۆ ماوەیەکی کورت لە تەلەفوندا قسەیکرد و پاشان پێی وتم، "کارێکی ناکاوە، چەند زوو بتوانم دەگەڕێمەوە."

هەرئەوەندەی ئەو ڕۆیشت، دەرپەڕیمە دەرەوە بۆ لای ئوتومبیلەکەم، ئەو شتانەی لێمبارکردبوو کێشمکردە ژوورەوە، لە کورسی قەدکراو، چەند کارتۆن قاپوقاچاخ و پەرداخی شەراب و چەند سینی خواردنی ئێرانی، کە لە ئلسیە لە ماڵەوە ئامادەمکردبوو.

پاش تۆزێك دکتۆر جێراڵد وایت و هاوسەرەکەی گەیشتن، لەگەڵ خۆیان چەند جۆر خواردنی تریان هێنابوو، کە من لە ماڵەکەیان جێمهێشتبوو، هەروەها کێکێك، کە بە ڕەنگی سوور، سپی و شینی ئاڵای ئێرانی ڕازاندبوومەوە و بە فارسی لە سەری نووسیبووم، "جەژنی لەدایکبوونت پیرۆزبێت."

ئەو کاتەی مودی لەوێ نەبوو، باقی میوانەکان هاتن، بووین بە نزیکەی سی کەس. هەموو ئامادەی دەستپێکردنی ئاهەنگەکە بوون، کە مودی گەڕایەوە.

"بە خۆشی تۆوەدا" هەموو هاواریانکرد. مودی زەردەخەنە گرتی، ئینجا زەردەخەنەیەکی پانتر، کاتێك یەکدەنگ هەموومان گۆرانی، "هەموو ساڵێك بە خۆشی،"مان بۆ وت.

تەمەنی بووبوو بە سی و نۆ ساڵ، بەڵام کاردانەوەکەی شوروشەوقێکی قوتابییانە بوو. "ئەم هەموو شتەت چۆن ڕێکخست؟" مودی پرسیاریکرد. "من تێناگەم، ئەم هەموو شتەت چۆن هێناوە."

هەستم بە خۆشییەکی زۆر کرد، کە کارەکەم ئەنجامداوە و مودیم خۆشحاڵکردووە.

ئەمە ئیتر بوو بە مەبەست لە ژیانمدا و زووزوو دووبارەمدەکردەوە. پاش دوو ساڵ یەکتر بینین، ئیتر خولیای مودی جێگایەکی داگیرکرد لە مێشکمدا. جیهانی کاری ڕۆژانە ئەو دڵگەرمییەی جارانی نەما. لەوەدەچوو تەنیا کۆتایی هەفتەکان جێگای دڵخۆشی بێت.

هەتا پیشەکەشم ڕوو لە ناوابوون بوو. پلەم بەرزبۆوە و کارێکیان پێسپاردم، کە لەوەوپێش لەلایەن پیاوەوە ئەنجامدەدرا، بەڵام بۆ هەمان کار کرێیەکی کەمتریان دەدا بە من. تا دەهات زیاتر بێزاردەبووم لە وەڵامی ڕەتی بەڕێوەبەری کۆمپانییەکە، کە پێیوابوو، چونکو ژنێکی تەنیام، دەبێت لە خزمەتیدا بم. تا لەکۆتاییدا ئاشکرا بەیانیکرد، کە تا لەگەڵیدا نەچمە جێگاوە، هیچ بەرزبوونەوەیەکی تر لە پلەوپایە بەخۆمەوە نابینم.

تا دەهات هەلومەرجەکە سەختر دەبۆوە، منیش پێویستیم بە کۆتایی هەفتەکان بوو لەگەڵ مودیدا بۆ سوککردنی ئەم تەنگەژنیە. ئەمە خۆشییەکی تایبەتی هەبوو، کە ئەك هەر بۆ مودی بەڵکو بۆ خۆشم مایەی سەرسامی بوو. شانازیم بەوەوە دەکردA کە ئەو تواناییەم هەیە، لەدووره ئەم پەیوەندییە ڕاگرم. خانەخوێیەکی لێهاتوودم لە کۆکردنەوەی ئەم پزیشکانە و هاوسەرەکانیان. ئەمانە کۆمەڵێکیان پێکەوە نابوو کە تەواو جیاواز بوو، لە جیهانی شارە بچوکەکەی من.

ئاهەنگ درێژەیکێشا بۆ دوانیوەشەو. کە دوامیوان پێی نایە ئەو دیو دەرگاکەوە، مودی باوەشی پیاکردم و وتی، "بۆ ئەمە تۆم خۆشدەوێت."

لە کانونی دووەمی 1977دا خوازبێنیکردم.

سێ ساڵ لەوەوپێش دەستم نابوو بە ڕووی مودی - یان هەر کەسێکی ترەوە. بەڵام بینیم، ئێستا گۆڕام. سێ ساڵ بێهاوسەریم بەخۆمەوە بینی و بڕیارمدا، ئەو هەنگاوە بنێم، چاودێری خۆم و خێزانەکەم بکەم. لەوە زیاتر پێمخۆش نەبوو ژیانێکی تەنیا بەسەربەرم. ڕقم لە لەکەی تەلاق دەبۆوە.

مودیم خۆشدەویست و دەمزانی ئەویش منی خۆشدەوێت. لەو سێ ساڵەدا هەرگیز شەڕە دەنوکێکمان نەبوو. ڕێگای خۆمم هەڵبژاد و کەوتمە هەوڵی ژیانێکی تازەوە، وەك هاوسەر و دایکی تەواو وەخت. بە هیوای ئەوەی لە تەواوی ئەو میواندارییانەدا ئەو خانەخوێیە ڕێکوپێکە بم، کە وەك دکتۆر و خانمی مەحمودی تیایدا دەردەکەوتین. هەروەها هەلی ئەوەش هەبێت، زانکۆ تەواوبکەم یان منداڵێك پێکەوە دروستبکەین.

حەوت ساڵ دواتر ڕۆژم لێنەدەبۆوە، لە جێگاکەدا نازارمدەکێشا و خەونەدەچووە چاوانم لە تەنیشت کچەکەم و هاوسەرکەمەوە، کە ڕۆژێك لە ڕۆژان خۆشویستم بوو. ئاوڕدانەوە لە ڕابوردوو و تێگەیشتنی ڕووداوەکانی مایەی ناسوودەییم بوو. زۆر هێمام تیایدا دۆزییەوە، کە لەکاتی خۆیدا پشتگوێمخستبوو.

بەڵام ئێمە ژیانناکەین، بەپێی ئەوەی چۆن ڕابوردووی خۆمان لێکدەدەینەوە. بیرکردنەوە لە ڕابوردوو بە دەردی ئیمڕۆی منی نەدەخوارد. ئێمە - من و مەهتاب - لێرە، لە وڵاتێکی نامۆدا، بارمتە بووین. لەو ساتەدا ئەوەی هۆکاری ئەو تەنگوچەڵەمەیەی ئێمە چی بوو، ئەو گرنگییەی نەبوو، لەچاو ئەو ڕاستییەی تیایدا دەژیان و چەند دەخایەنێت.

چەند ڕۆژ؟

چەند هەفتە؟

چەند مانگ؟

تاکەی دەبێت بەدەست ئەم گرفتەوە ئازار بچێژین؟ ئەمدەویرا وشەی ساڵ بێنمە سەر زمانم. مودی نایەوێت - ناتوانێت - ئەمە بە ئێمە بکات. ئەو پێسیە لە دەوروبەری خۆی دەبینێت و ئەخۆشیدەکات. تێدەگات، داهاتووی پیشەکەی لە ئەمریکادایە، نەك لە وڵاتێکی دواکەوتوو، کە جارێ دەبێت وانەی پاکوتەمیزی سەرەتایی و دابەروەری کۆمەڵایەتییان بۆ دابنرێت. بیروبۆچوونی خۆی دەگۆڕێت. دەمانباتەوە بۆ ئەمریکا، بەبێ ئەوەی پێشبینی ئەوە بکات، هەر ئەوەندەی قاچم نایە سەر خاکی ئەمریکا، پەلی مەهتاب دەگرم و خۆمان دەکەین بە نزیکترین نووسینگەی پارێزەر بۆ جیابوونەوە.

ئەی ئەگەر بیروبۆچوونی خۆی نەگۆڕی؟ بێگومان هەر کەسێك پەیدادەبێت، بێت بە هانامانەوە. دایك و باوکم؟ هاوڕێکانم لە مەشیگان؟ پۆلیس؟ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا؟ من و مەهتاب هاووڵاتی ئەمریکین، هەتا ئەگەر مودی نەبێت. مافی خۆمان هەیە. تەنیا ئەوەیە ڕێگایەك بدۆزینەوە، ئەم مافانە پیادەبکەین.

بەڵام چۆن؟

وە ئەمە چەند دەخایەنێت؟

تێبینییەکان:

1. melodrama : چیرۆکێك یان شانۆگەرییەك کە ڕووداوەکانی ناوی بۆ خۆی تراجیدایەکە، کەچی خەڵك زۆر بە گەورەتر تەماشایدەکەن.

2. migraine : جۆرێکی سەختە لە سەرئێشە، شەقیقە.

3. Northeast Missouri State University

4. NASA

5. Apollo

6. Kansas City College of Osteopathic Medicine

7. Detroit Osteopathic Hospital

8. نیشانەیەکە بۆ ئەوین

9. Fourteenth Street Clinic

10. الله
11. Free Metodist Church. Metodist: له دینی مەسیحیدا بەو کەسانە دەوترێت، کە لەسەر ڕێبازی جۆن وێسلی دەڕۆن و کەنیسە و خوای تایبەتی خۆیان هەیە.
12. God: بە واتای خوا دێت
13. New Testament
14. Baptist
15. Catholic
16. Lutheran

# 4

پاش ئەوەی کە مودی پێیڕاگەیاندین، کە ئێمە ئیتر لە ئێران دەمێنینەوە، چەند ڕۆژێکی تاریك و پڕ مۆتەکەمان بردەسەر.

هەرچی چۆنێك بوو هۆشم لای خۆم بوو، لە یەکەم شەوەوە کەوتمە تاوتوێکردنی ئەو پارەیەی کە لەبەردەستمدا بوو. مودی داوای دەفتەری بانکییەکەمی کرد، بەڵام خەیاڵی بەلای ئەوەدا نەچوو، پرسیاری ئەو پارەیە بکات کە لەبەردەستمدا بوو. جانتاکەمم هەڵڕشت، تۆزێك پارەی دڵخۆشکەرم دۆزییەوە، کە هەر دووکمان لە شتکڕیندا لەبیرمانچووبۆوە. نزیکەی دوو سەد هەزار ڕیاڵ و سەد دۆلاری ئەمریکیم کۆکردەوە. پارە ڕیاڵەکە، نزکەی دوو هەزار دۆلاری دەکرد و دۆلارەکەش لە بازاڕی ڕەشدا شەش بەرابەری بەهای ڕەسمی بوو. سامانەکەمم لەژێر دۆشەکە تەنکەکەی جێگاکەمدا شاردەوە. هەموو بەیانییەك، کاتێك مودی و خێزانەکە نوێژیاندەکرد، یەکسەر پارەکەم دەردەهێنا و لە ناو دووتوێی جلەکانمدا دەمشاردەوە، تا ئەگەر لە ڕۆژدا هەلێکی چاوەڕواننەکراو هاتەپێشەوە، لەبەردەستمدا بێت. ئەو پارەیە تەواوی توانای من بوو، بڕبڕەی پشتم بوو. هیچ بیرێکم لە مێشکدا نەبوو، چۆن ئەم پارەیە بەکاربهێنم، بەڵام پێم وابوو، لەوانەیە پارمەتیمبدات ئازادی خۆمی پێبکڕم. هەرچی چۆنێك بێت، ڕۆژێك هەر دێت من و مەهتاب لەم بەندیخانەیە ڕزگارمان ببێت، لە دڵی خۆمدا دەموت.

لەڕاستیدا لە بەندیخانەدا بووین. مودی دەستیگرتبوو بەسەر پێناسنامە و پاسپۆرتە ئەمریکی و ئێرانییەکانماندا. بەبێ ئەو بڕوانامە گرنگانە نەماندەتوانی لە تارانەوە سەفەربکەین، هەتا ئەگەر بشمانتوانیایە هەڵبێین لە ماڵەکە.

بۆ چەند ڕۆژ من و مەهتاب بە دەگمەن  پێمان خستە ئەودیو دەرگای ژووری نوستنەکەمانەوە. هەموو لەشم ژانیدەکرد، بەئاستەم تۆزێك برنجم بۆ دەخورا. هەرچەند تەواو بێهێز بووبووم، بەڵام نەمدەتوانی بنوم. مودی حەبی پێدەدام.

زۆربەی کات مودی بەتەنیا جێیدەهێشتین، بەهیوای ئەوەی بە تێپەڕبوونی کات چارەنووسی خۆمان قبووڵبکەین، خۆمان بدەین بەدەستەوە و باقی ژیانمان لە ئێراندا بەرینەسەر. مێردەکەمم لێبوو بە پاسەوان، بە سوکی هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکردم، بەڵام ئازیربێژی دەکرد، کە مەهتاب خەریکبوو تەمەنی دەبوو بە پێنج ساڵ، هەروا بتوانێت بەئاسانی خۆی بگونجێنێت لەگەڵ ئەم تێکچوونەی ژیانی. هەوڵیدا سۆزی مەهتاب بەلای خۆیدا ڕاکێشێت، بەڵام ئەو دەسڵەمییەوە و دەچووەوە دواوە. هەرکاتێك دەستی بگرتایە، دەستی ڕادەپسکاند و دەستی منی دەگرت. بەچاوە قاوەییەکانی هەوڵیدەدا لەو دیمەنە ناڕۆشنە بگات، کە باوکی لەپڕ بوو بە دوژمنمان.

هەموو شەوێك مەهتاب لە خەودا دەگریا. هێشتا بەتەنیا نەیدەوێرا بچێت بۆ توالێت. هەر دووكمان سكمان دەچوو و سكمان ئازاری هەبوو، شەو و ڕۆژ كاتێكی زۆرمان لەو گەرماوە سیسركاوییە دەبردەسەر، كە بووبوو بە پەناگامان. لەوێدا، شوێنێكی ئاسایش بوو، پێكەوە ویردمان دەخوێند: "خوایە گیان، وەرە بە هانامانەوە و لەم گرفتە ڕزگارمانبكە، یارمەتیمانبدە ڕێگایەكی بێمەترسی بدۆزینەوە، هەردووكمان بگەڕێنینەوە بۆ ئەمریكا و پەیوەستبین بە خێزانەكەمانەوە."

زووزوو لە مەهتابم دووبارە دەكردەوە، كە دەبێت هەردووكمان هەمیشە پێكەوە بین. گەورەترین ترسم ئەوە بوو، مودی هەوڵبدات مەهتابم لێبسێنێت.

تەنیا شتێك كە مێشكی پڕ جەنجاڵمی تۆزێك ئارامدەكردەوە، كتێبێكی قورئان بوو، وەرگێڕاوی ئینگلیزی ڕەشید خەلیفە، پی ئێچ، دی. ئیمامی مزگەوتی توكسۆن، ئەریزۆنا. بۆ ڕۆشنبیركردنەوەی خۆم، پێیاندابووم. لە ناچاریدا بەدوای شتێكەوە بووم خۆمی پێوە خەریكبكەم، چاوەڕوانیم، دەكێشا بۆ یەكەم دەركەوتنی تیشكی ڕۆژی بەرەبەیان لە پەنجەرەكەوە بێتە ناو ژوورە بێگڵۆپەكەمانەوە، تا بتوانم دەستبكەم بە خوێندنەوە. دەنگی قورئان خوێندنی بابەحاجی لە هۆڵەكەدا ئاوەدانی بوو بۆ من، بۆ خوێندنەوەی ئایەتە قورئانییەكان بە وردی. بەدوای ئایەتێكەوە بووم كە پێناسەی پەیوەندی ژن و مێرد بكات.

هەركاتێك شتێكم لە قورئاندا بدۆزییایەوە، كە وا دەردەكەوت پەیوەندی بە هەلومەرجەكەی منەوە هەیە و مافەكانی ژن و منداڵ بەیاندەكات، پیشانی مودی و باقی ئەندامانی خێزانەكەم دەدا.

لە سورەتی النساء، ئایەتی سی و چواردا، ئەم ئامۆژگارییە پڕ غەم و پەژارەیەی محەممەدم دۆزییەوە:

*"پیاوان ماف سەرپەرشتییان هەیە بەسەر ژناندا، ئەمەش بڕیاری خوایە كە فەزڵ و ڕێزی هەندێك دەدات بەسەر هەندێكی تردا (سەرەڕای ئەوەی كە) پیاوان ماڵ و سامانیان دەبەخشن (لە پێناوی ئاسودەیی و خۆشگوزەرانی ئافرەتاندا). لەولاشەوە ئافرەتانی (ژیر) چاك و پاكن، لە خواترسن، نهێنی نێوان خۆیان و مێردەكانیان دەپارێزن كە (ئەمەش خۆی لە خۆیدا بەجێهێنانی فەرمانی خوایە)، ئەگەر ترسان لە سەركشیی و سەرپێچی هاوسەرتان، سەرەتا ئامۆژگارییان بكەن، (ئەگەر سوودی نەبوو) لەناو جێدا گوێیان پێمەدەن، (ئەگەر ئەوەش سوودی نەبوو) لێیان بدەن (بەمەرجێك لێدانەكە لە دەموچاو نەبێت و ئاسەوار بەجێنەهێڵێت)، ئەگەر بەم هۆیانە لە لادان و یاخی بوون وازیان هێنا، ئەوە ئیتر ستەمیان لێمەكەن و ڕێگەی تر مەگرنەبەر (بۆ ئازاردانیان) بێگومان خوا بەرز و بڵند و گەورەیە. (ئەگەر ستەمیان لێبكەن تۆڵەتان لێ دەسێنێت)."*

لە ئایەتی دوای ئەوەدا، هەرچی چۆنێك بوو شتێكم دۆزییەوە، كە هیوایەكی تیادا بێت.

*"خۆ ئەگەر ترسان لەوەی کە نێوان ژن و مێرد بشێوێ و (کێشەیان چارەسەر نەکرێت)، دادوەرێك لە خزمی پیاوەکە و دادوەرێك لە خزمی ژنەکە بنێرن (بۆ ڕێکخستنیان) ئەگەر ئەو دوو کەسە مەبەستیان ڕێکخستنیان بێت، خوا پێکهاتن فەراهەم دێنێت لە نێوان ژن و مێردەکەدا، بێگومان خوا هەمیشە و بەردەوام زانا و ئاگایە."* [1]

"خێزانی هەردوو لامان یارمەتیماندەدەن لە پەیوەند بەم کێشەیە،" بە مودیم وت و ئایەتەکەم پیشاندا.

"خێزانی ئێوە موسڵمان نیین. لەبەرئەوە لەبەرچاوناگیرێن." مودی وەڵامیدامەوە. "ئەوە گرفتی تۆیە، نەك ئێمە."

•

ئەمانە موسڵمانانی شیعە بوون، لەخۆڕازی و توندڕەو بوون، بە جبەکانیانەوە هێشتا سەرمەستی سەرکەوتنی شۆڕشەکەیان بوون. من چۆن دەمتوانی - منێکی مەسیحی، ئەمریکی و ژن - بوێرم لێکدانەوەیەك بدەم لەسەر ئایەتێکی قورئانی لەبەرامبەر ئیمام ڕەزا، ئایەتوڵا خومەینی، بابەحاجی و بەتایبەتی لەبەرامبەر هاوسەرەکەی خۆمدا؟ لەچاوی یەك بە یەکیاندا، من وەك ژنی مودی، شمەکی ئەو بووم. هەرچی پێی خۆشبوو، دەیتوانی پێمبکات.

لە سێیەم ڕۆژی بەندێتیمدا، ئەو ڕۆژەی کە بڕیار بوو بگەینە ماڵەوە لە مەشیگان، مودی زۆریلێکردم، تەلەفونبکەم بۆ دایك و باوکم. ئەوەی دەبوو بیڵێم، پێیوتم و بەوردی گوێی بۆ گفتوگۆکەمان ڕاگرت. ڕەفتاری ئەوەندە دڕندانە بوو، نەمتوانی سەرپێچیبکەم.

"مودی بڕیاریداوە، تۆزێك زیاتر بمێنینەوە،" بە کەسوکارەکەمم وت. "ئێستا ئێمە بەنیاز نیین بگەڕێینەوە."

دایك و باوکم نیگەرانبوون.

"نیگەران مەبن،" هەوڵمدا بەخۆشییەوە ئەمە بڵێم. "زۆر نابات دەگەڕێینەوە. هەتا ئەگەر بۆ ماوەیەکیش بمێنینەوە، هەر دێینەوە."

ئەمە دڵنیاییکردن. ڕقم لە خۆم دەبۆوە، درۆم لەگەڵدا کردن، بەڵام چی بکەم، مودی بەسەرمەوە ڕاوەستابوو، ڕێگایەکی ترم نەبوو. دڵم ژانیدەکرد بۆیان، بۆ لە ئامێزگرتنی جۆی و جۆن. ئایا هەرگیز دەیانبینمەوە؟

مودی وای لێهات، هەر ساتەی جۆرێك بێت. بەڵام زیاتر ڕووتاڵ و شەڕانی بوو، نەك تەنیا بەرامبەر بە من، بەڵکو بەرامبەر بە مەهتابیش. هەندێك جاریش هەوڵیدەدا نەرم و میهرەبان بێت. لەو باوەڕەدا بووم، ئەویش وەك من، نەیدەزانی چی بکات و سەری لێشێوابوو. جاروبار هەوڵیدەدا یارمەتیمبدات، بمخاتەسەر ڕێگای ڕاست. "بۆ ئەم ئێوارەیە بیتی خواردن بۆ هەمووومان ئامادەدەکات،" ڕۆژێکیان مودی بە عەمە بزورگی ڕاگەیاند.

منی برد بۆ بازاڕ. هەرچەند لەسەرەتاوە گەرمی تیشکی ڕۆژەکەم پێخۆش بوو، بەڵام دیمەن، دەنگەدەنگ و بۆنی شار لە هەموو کاتێکی تر زیاتر بۆم نامۆ و قێزەون بوو. چەند شەقاممان کرد تەنیا بەدوای دوکانی قەسابدا، تەنیا بۆئەوەی پێمان بڵێن، "گۆشتمان تەواوبووە تا کاتژمێری چواری دوانیوەڕۆ. ئەو کاتە وەرنەوە." چەند دوکانی تریش، هەر هەمان وەڵام بوو. لە دوانیوەڕۆدا کەوتینە گەڕان، تا لە کۆتاییدا، لە دووری دوو میل لەماڵەکەمانەوە، پاچەیەك گۆشتی گامان دەستکەوت.

دەستبەکاربووم لە چێشتخانە پیسەکەی عەمە بزورگ، ئەو پەڕی هەوڵمدا، بەبێ لەبەرچاوگرتنی ڕووگرژی دشەکەم، قاپوقاچاخەکان پاککەمەوە و ژەمە خواردنێکی ناسراوی ئەمریکایی ئامادەبکەم.

ئەو شەوە، پاش نانخواردنی ئێوارە، عەمە بزورگ دایکسالاری خۆی نواند بەسەر براکەیدا. "سکمان بەرگەی گۆشتی گا ناگرێت،" بە مودی وت. "گۆشتی گا ئیتر بەم ماڵەدا نایەت."

گۆشتی گا لە ئێراندا وا چاولێدەکرێت، کە گۆشتی چینە هەژارەکانی کۆمەڵگایە. عەمە بزورگ مەبەستی بوو بڵێت، کە گۆشتی گا لە شانی ئەودا نییە.

مودی نەیتوانی لەبەرامبەر خوشکەکەیدا بووەستێتەوە و بابەتەکەی گۆڕی. ئاشکرا بوو، عەمە بزورگ قبووڵینەبوو، من لە کاروباری ڕۆژانەی ناوماڵدا قسەیەك بکەم. لە ڕاستیدا تەواوی خێزانەکە منیان پشتگوێخستبوو، هەرکە توشیانەدەبووم، پشتیانتێدەکردم یان ڕووی گرژیان پیشانەدەدام. لەوەدەچوو ئەمریکایی بوونی من، زۆر زیاتر بوو لەوەی ژنی مودی بم.

لە یەکەم هەفتەی بەندێتیمدا، تەنیا ئیسا میهرەبانانە قسەی لەگەڵدا دەکردم. ڕۆژێکیان کە ئیسا و ڕەزا هاتن بۆ سەردانمان، ئیسا بۆ ساتێك هاتە تەنیشتمەوە. "بەڕاستی بەداخم بۆت،" ئیسا وتی. "تۆم خۆشدەوێت، بەڵام بە هەمووومان وتراوە، خۆمان دووربگرین لە تۆ. ڕێگامان پێنادەن، لەگەڵت دانیشین یان قسەبکەین. زۆرم پێناخۆشە، کەوتویتە ئەم هەلومەرجەوە، بەڵام نامەوێت کێشە بۆ خۆم دروستبکەم، لەبەرامبەر هەموو خێزانەکەدا ڕاوەستمەوە."

ئایا عەمە بزورگ وا چاوەڕوانبوو، هەروا بێزێزانە و بەتاککەوتوو بژیم؟ بۆم جێگای پرسیاربوو. ئەم ماڵە شێتووێتە چۆن دەڕوا بە ڕێوە؟

لەوە دەچوو مودی ڕازیبێت، لەسەر ورگی کەسوکاری بژی. هەندێك جار شتێکی دەوت، کە گوایە دەبێت بەدوای کاردوە بێت، بەڵام لەوە زیاتر بڕینەدەکرد، کە یەکێك لە خوشکەزاکانی بنێرێت، بۆئەوەی بزانێت تا چ ئاستێك بڕوانامە پزیشکییەکەی لە ئێراندا دەخوا. دڵنیابوو لەوەی ئەو ئەزمونەی هەیەتی، وەك پزیشکێکی ئەمریکایی، یەکسەر جێگایەکی بۆ دەکاتەوە لە ڕیزی پزیشکەکاندا. بە نیازبوو کار بە پیشەکەی بکات لێرە.

لەوە دەچوو، کات بۆ زۆربەی زۆری ئێرانییەکان گرنگ نەبێت، مودیش ئەم بۆچوونەی زوو لە خۆیدا زیندوکردەوە. ڕۆژانی دەبردەسەر بە گوێگرتن لە ڕادیۆ، خوێندنەوەی ڕۆژنامە و بۆ چەندەها کاژێر گفتوگۆی دوورودرێژ لەگەڵ عەمە بزورگدا. لە چەند بۆنەدا من و مەهتابی برد بۆ پیاسەی کورت، بەڵام هەمیشە چاوێکی لەسەر ئێمە بوو. هەندێك جار لە دوانێوەڕواندا یان لە ئێواراندا، پاش ئەوەی دڵنیادەبوو، کە خێزانەکەی چاودێریم دەکەن، لەگەڵ خوشکەزاکانیدا سەردانی خزمانیان دەکرد. هەتا جارێکیان چووبوو بۆ بەشداریکردن لە خۆپیشاندانی دژی ئەمریکا و بە قسەی قۆڕی دژی وڵاتە یەکگرتووکانەوە گەڕایەوە.

ڕۆژ هات و ڕۆژ تێپەڕی، ڕۆژانی لە ژمارە نەهاتووی خەمباری، پڕوکاندن، نەخۆشی، وەڕسی و ترس. ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر نوقمی ڕەشبینی خۆم دەبووم. وەك ئەوەی لە گیانەڵەدا بم. خواردنی کەمم بۆدەخورا و نوستنم پچڕپچڕ بوو، لەگەڵ ئەوەی مودی بە بەردەوامی حەبی ئارامکەرەوەی پێدەدام. بۆچی کەس بە هانامەوە نایەت؟

ئێوارێیەکیان لە ناوەڕاستی هەفتەی دووەمی بەندێتیمدا، بە ڕێکەوت لە تەنیشت تەلەفونەکەوە ڕاوەستابووم، کە لێیدا. لەخۆوە دەستم دایە تەلەفونەکە و ڕاچڵەکیم، کە گوێم لە دەنگی دایکم بوو، لە ئەمریکاوە قسەیدەکرد. وتی، لەوەوپێش چەند جار تەلەفونیکردووە و منی دەستنەکەوتووە، بەڵام بە چاکی و چۆنی کاتەکەی ئەبردەسەر. بەخێرایی ژمارە تەلەفون و ناونیشانی بەشی بەرژەوەندی وڵاتە یەکگرتووەکانی لە باڵوێزخانەی سویسرا لە تاران پێدام. گوێم لە دەنگی ترپەی دڵی خۆم بوو، یەکسەر ژمارە و ناونیشانەکەم لەبەرکرد. بەچەند چرکەیەك مودی گەیشتە سەرم، بە توڕەییەوە تەلەفونەکەی لێوەرگرتم و گفتوگۆکەی بڕی.

"تۆ بۆت نییە تەلەفونیان بۆ بکەیت، تا خۆم لەگەڵتدا نەبم" مودی فەرمانیدا.

ئەو شەوە لە ژووری نوستنەکەمان، ئەخشەیەکی سوکی پەرلەم دروستکرد بۆ شاردنەوەی ژمارە و ناونیشانی باڵوێزخانە، هەروەها ئەو زانیاریانەم لەناو دەفتەری ناونیشانەکەمدا نووسی و لەگەڵ پارەکاندا خستمە ژێر دۆشەکەکەمەوە. بۆ دڵنیایی زیاتر، ئەو شەوە تا درەنگانێك، لەدڵی خۆمدا دووبارەمدەکردەوە. سەرئەنجام ئەو زانیارییەم دەستکەوت، بچم بۆ کوێ بۆ یارمەتی. من هاووڵاتییەکی ئەمریکی بووم، بە دڵنیاییەوە باڵوێزخانە دەتوانێت من و مەهتاب لێرە دەرکات - تەنیا هەر ئەوەندە بتوانم پەیوەندییکەم بە فەرمانبەرێکی دڵسۆزی باڵوێزخانەوە.

هەر بۆ سبەینێ دوای نیوەڕۆ هەلێکم بۆ ڕەخسا. مودی ڕۆیشتە دەرەوە، بەبێ ئەوەی زەحمەتی خۆی بدات، پێمبڵێت بۆ کوێ دەچێت. عەمە بزورگ و باقی خێزانەکە سەرخەوی نیوەڕۆیان دەشکاند. دڵـــم ترپەترپیبوو، کاتێك بەدزییەوە چووم بۆ چێشتخانەکە، تەلەفونەکەم بەرزکردەوە و ئەو ژمارەیەی لەبەرمـکردبوو، لێمـدا. چرکەم

لێبوو بە کاژێر تا پەیوەندییەکە گرتی. تەلەفون لێیدا یەك جار، دوو جار، سێ جار کاتێك دەپاڕامەوە یەکێك خێرا وەڵامبداتەوە. فریشتە، کچەکەی عەمە بزورگ، هاتە ژوورەوە. هەوڵمـدا ئاسایی بنوێنم. هەرگیز بە ئینگلیزی قسەی لەگەڵدا نەکردبووم و دڵنیابووم لە گفتگۆکەم تێناگات.

"هەلاو!" بە چرپە وتم.

"دەبێت بە دەنگی بەرزتر قسەبکەیت،" ژنێك لە تەلەفونەکەدا وتی.

"ناتوانم. تکات لێدەکەم یارمەتیمـبدە. من بارمتەم."

"دەبێت بە دەنگی بەرزتر قسەبکەیت. من دەنگت نابیستم."

هەوڵمدا لە بێئومێدیدا فرمێسك بە چاومدا نەیەتەخوارەوە. تۆزێك دەنگم بەرزکردەوە. "یارمەتیمبدە! من بارمتەم!" وتم.

"دەبێت بە دەنگی بەرز قسەبکەیت،" ژنەکە وای وت. پاشان تەلەفونەکەی داخست.

دە خولەکی نەبرد، مودی هاتەماڵەوە، بە هەڵەداوان خۆی کرد بە ژوورەکەماندا، لەسەر جێگاکە ڕایکێشامە خوارەوە، هەر دوو شانمی گرت و بەقایم ڕایوەشاندم. "لەگەڵ کێدا قسەتـکرد؟" هاواریکرد.

غافڵ گیربووم. دەمزانی تەواوی خێزانەکە لەبەرامبەر مندا یەکیانگرتووە، بەڵام پێشبینیمنەدەکرد، هەر ئەو ساتەی مودی دەگاتە ماڵەوە، فریشتە هەموو شتێکی بۆ بگێڕێتەوە. هەوڵمدا خێرا درۆیەك هەڵبەستم.

"لەگەڵ هیـچ کەس،" سەرکزانە وتم، کە تا ئاستێك ڕاست بوو.

"بـــا، کردوتە. ئیمڕۆ لەگەڵ یەکێکدا قسەتکردووە لەسەر تەلەفون."

"نـــا. هەوڵمدا تەلەفون بۆ ئیسا بکەم، بەڵام نەمتوانی. ژمارەکە هەڵە بوو."

مودی پەنجەکانی لە شانەکانم چەقاند. مەهتاب لە تەنیشتمەوە قیژاندی.

"تۆ درۆم لەگەڵ دەکەیت!" مودی هاواریکرد. بەتوندی فڕێیدامە سەر جێگاکە و بۆ چەند خولەك شاتەشاتیکرد، پێش ئەوەی لە ژوورەکە بچێتە دەرەوە، لە دەرگاکەوە ئاوڕیدایەوە و هاواریکرد: "هەرگیز دەست بۆ ئەو تەلەفونە نابەیت."

مودی سەری لێتێکدابووم، نەمدەزانی چی بکەم. چونکو نەمدەتوانی پێشبینی هەڵوێستی بکەم لە ڕۆژێکەوە بۆ ڕۆژێکی تر، سەخت بوو پلانی هیـچ هەوڵێك بچنم. کاتێك دەکەوتە هەڕەشە، تەواو بڕیارمدەدا، هەرچی چۆنێك بێت، پەیوەندی بە باڵوێزخانەوە بکەم. کاتێکیش نیگەران و غەمباردەبوو، هیوام تیادا دروستدەبوو، کە بۆچوونی خۆی دەگۆڕێت و دەمانباتەوە بۆ ئەمریکا. لەگەڵمدا کەوتە بگرەوبەردەیەکەوە، کە هەر هەوڵێکی ڕاستەقینەی مەحاڵ دەکرد. هەموو شەوێك پەنام دەبردەبەر حەبی ئارامکەرەوە، کە مودی پێیدابووم. بۆ سبەینێ بەیانی لەبەرامبەر مودیدا لە خۆم دەکەوتمە گومانەوە.

بەيانييەكيان لە كۆتايى مانگى ئابدا - كە نزيكەى مانگێك دەبوو هاتبووينە ئێرانەوە - مودى پرسيارێلێكردم، "دەتەوێت لە هەمينيدا، ئاهەنگى لەدايكبوون بگێڕيت بۆ مەهتاب؟"

بەلامەوە شتێكى نامۆ بوو. مەهتاب لە چوارى ئەيلولدا، ڕۆژى پێنج شەممە نەك هەينى، پێنج سالى تەواودەكرد. "دەمەوێت لە ڕۆژى لەدايكبوونيدا بۆى بگێڕم،" وەلاممدايەوە.

مودى پێى تێكچوو. كەوتە ڕوونكردنەوەى ئەوەى، كە گوايە ئاهەنگى لەدايكبوون بۆنەيەكى كۆمەلايەتييە لە ئێراندا، هەميشە لە ڕۆژانى هەينيدا دەگێڕدرێت، كاتێك خەلك لەسەر كار نييە.

لەسەر قسەى خۆم پێمداگرت. ئەگەر نەمدەتوانى لەبەرامبەر موديدا لە مافى خۆم بەرگريبكەم، ئەوا ئامادەى شەڕ بووم بۆ هەر خۆشييەك كە بۆ مەهتاب بێت. نەريتى ئێرانييەكان چييە، بۆم گرنگ نەبوو. مودى ڕازيبوو بۆ ڕۆژى پێنج شەممە بۆ دوانيوەڕۆكەى، كە جێگاى سەرسامى من و نابەدلى خێزانەكەى بوو.

"دەمەوێت بوكەشوشەيەكى بۆ بكڕم،" بە موديم وت، بۆ زياتر پاشەكشێ پێكردنى.

مودى بۆ ئەمەش هاتە سەربار و داواى لە مەجيد كرد، بمانبات بۆ بازاڕ. چەند دوكان گەڕاين و بوكەشوشەى ئێرانى زۆرمان بينى، كە هەموويان پەڕپووت بوون، تا بوكەشوشەيەكى ياپانيمان بەرچاوكەوت، بيجامەيەكى سوور و سپى لەبەردابوو، مەمكەمژيەكى لەدەمدا بوو، كە دەرت دەهێنا دەگريا يان پێدەكەنى. نرخەكەى دەبوو بە سى دۆلارى ئەمريكى.

"زۆر گرانە،" مودى وتى. "ناتوانين ئەو هەموو پارەيە بدەين بە بوكەشوشەيەك."

"با، دەتوانين،" لەبەرامبەريدا وتم. "هيچ بوكەشوشەيەكى ترى لێرە نييە و هەر ئەوە دەكڕين."

كڕيمـــان.

هيواداربووم ئاهەنگەكە مايەى خۆشى بێت بۆ مەهتاب - ئەوە يەكەم خۆشى بوو لە ماوەى ئەو مانگەدا. خۆشى بە شوروشەوقێكى زۆرەوە بەرەو پيريدەچوو. زۆر خۆشدەبوو دەم بە خەندە و پێكەنين بيبينيت!

دوو ڕۆژ پێش ئەم بۆنە گەورەيە، ڕووداوێكى بەسەرهات، كە لە زەوقى دا. كاتێك لە چێشتخانەكە ياريدەكرد، كورسييەكى بچوك لە ژێريدا شكا و كەوت، تەلزمەى قاچێكى كورسييەكە چوو بە قۆليدا. بەقايم ڕامكرد، كاتێك گوێم لە قيژەى بوو، پەشۆكام كە بينيم، لە زامێكى سەر ڕەگى خوێنبەرەوە خوێن فيچقەدەكات.

مودى خێرا زامەكەى بەست، هاوكات مەجيد چوو ئوتومبيلەكەى ئامادەبكات. مندالەكەم، كە لە هەنسكدان نەدەكەوت، خستمە باوەشمەوە و گوێم لە مودى بوو، پێيدەوتم نيگەران نەبم، چونكو چەند كۆلان ئەولاتر خەستەخانەيەك هەيە.

بەلام دەستيانـــنا بە ڕوومانەوە. "ئێمە كار لەگەل حالەتى ناكاو ناكەين،" فەرمانبەرێك پێيراگەياندين، بەبێ ئەوەى ئازارى مەهتاب لەبەرچاو بگرێت.

مەجید شێتانە ئوتومبیلەکەی لێخوڕی بۆ خەستەخانەیەك، کە حاڵەتی کوتوپڕی وەردەگرت. خۆمان کرد بە خەستەخانەکەدا، لەگەڵ دیمەنی پیسی و پرژوبڵاوی بەرەوڕووبووین، بەڵام شوێنێکی تر نەبوو بۆی بچین. ژووری چاوەڕوانی یەك نەخۆشی تری نەدەگرت.

مودی دکتۆرێکی گرت و بە فارسی بۆی باسکرد، کە خۆشی دکتۆرە لە ئەمریکا، بەسەردان هاتۆتەوە و کچەکەی پێویستی بە دورینەوە هەیە. پزیشکە ئێرانییەکە یەکسەر ئێمەی برد بۆ ژووری چارەسەرکردن و وەك هاوکارێکی پیشەیی، ئامادەیی خۆی دەربڕی، کە چارەسەرەکەی بە خۆڕایی بۆ بکات. مەهتاب لە سڵەمینەوەی خۆی باوەشی پیاکردم، کە دکتۆرەکە تەماشای زامەکەی کرد و کەرەستەکانی هێنایەپێشەوە.

"هیچ دەرمانێکی بێهۆشکەریان نییە؟" بەگومانەوە پرسیارمــکرد.

"نەء،" مودی وتی.

دڵم داخورپا. "مەهتاب، دەبێت ئازا بیت،" وتم.

قیژاندی، کاتێك دەرزی دورینەوەکەی بینی. مودی بۆ بێدەنگکردنی، پیایدا هەڵشاخی. بە بازوە بەهێزەکانی توند مەهتابی گرت بەسەر مێزەکەوە. ئەویش بە چنگە بچوکەکانی دەستی منی گرت. لەژێر چنگی باوکیدا گیریکردبوو، لەگەڵ ئەوەش بە گریان و هاوارێکی زۆرەوە دەویست دەرچێت. ڕووم وەرگێڕا کە دەرزییەکەیان کرد بە پێستەکەیدا. هەموو قیژەیەك کە لەو ژوورە بچوکەدا دەنگیدەدایەوە، لە جەرگی من کاریدەکرد. بێزاری گیانمی داگرت. ئەمە هەڵەی مودی بوو، ئێمەی هێنایە ناو ئەم ئاگرەوە.

هەموو کارەکە چەند خولەکی خایەند. فرمێسك بە ڕوومەتمدا جۆگەلەی بەست. لەوە بە ئازارتر نییە بۆ دایك، کە لەتەنیشت منداڵەکەیدا بێدەسەڵاتانە ڕاوەستێت، لەکاتێکدا ئەو ئازاردەکێشێت. دەمویست من لەجیاتی کچەکەم ئازاربکێشم، بەڵام هیچم لەدەستنەدەهات. پێچ بە سکمدا هات و گیانم بوو بە ئاو، بەڵام ئەوە مەهتاب بوو ئازاریدەکێشا. نەمدەتوانی هیچ شتێکی تری بۆ بکەم، تەنیا ئەوە نەبێت، دەستی بگرم و یارمەتیبدەم، خۆی ڕاگرێت.

پاش تەواوبوونی تەقەڵەکان، دکتۆرە ئێرانییەکە دەرزی کزازی[2] بۆ نووسی، دایە دەست مودی و ڕێنماییەکانی بۆ باسکرد.

چووینەوە ناو ئوتومبیلەکە، مەهتاب بە هەنسکدانەوە خۆی نوساندبوو بە سنگمەوە، کاتێك مودی بۆی ڕوونکردینەوە دەبێت چی بکەین. دەبوو دەرمانخانەیەك بدۆزینەوە، کە دەرزییەکەی لا هەبێت و پاشان تیمارگەیەك، کە مۆڵەتی دەرزی لێدانی هەبێت.

نەمدەتوانی تێبگەم، بۆچی مودی ئێرانی لەجیاتی ئەمریکا هەڵبژاردووە، کاری پزیشکی تیادا بکات. ڕەخنەی لە کاری دکتۆرە ئێرانییەکە دەگرت. وەك خۆی دەیوت، ئەگەر ئەو کەرەسانەی خۆی پێبوایە، زامەکەی مەهتابی زۆر باشتر دەدورییەوە

کە گەیشتینەوە ماڵی عەمە بزورگ، مەهتاب تەواو هیلاکبووبوو، یەکسەر خەویلێکەوت، خەوێکی ناخۆش. زۆرم بەزەیی پیادا دەهاتەوە. بڕیارمــدا، لە دوو ڕۆژی تردا، لە ئاهەنگە تایبەتییەکەیدا، ڕوویەکی خۆشی پیشانبدەم.

دوو ڕۆژی تر، ئەو بەیانییەی مەهتاب پێنجەمین ڕۆژی لەدایکبوونی بوو، من و مودی چووین بۆ دوکانی شیرینی و داوای کێکێکی گەورەمان کرد، بە درێژی نزیك چوار پێ، بە شێوەی گیتار. بە ڕەنگ و پێکهاتەکەیدا لە کێکی زەردی ئەمریکی دەچوو، بەڵام زۆر بەتام نەبوو.

"بۆچی تۆ خۆت نایڕازێنیتەوە؟" مودی پێشنیاریکرد. ئەوە کارێك بوو کە باشم لێدەزانی.

"نـــا، هیچ شتێکم نییە کاری پێبکەم."

مودی، وەك ئەوەی نە بای دیبێت نە باران، لەبەردەمی کابرای دوکانداردا کەوتە شانازیکردن، "کێك دەڕازێنێتەوە."

یەکسەر کابراکە بە ئینگلیزی وتی، "حەزدەکەیت لێرە کاربکەیت؟"

"نەء،" کورت وەڵاممدایەوە. نەمدەویست هیچ کارێکی وەها بکەم لە ئێراندا.

گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ ئاهەنگەکە. زیاتر لە سەد خزم و کەسوکار کۆبووبوونەوە، لەگەڵ ئەوەی کە دەبوو مۆڵەت وەرگرن لە کار، چونکو ئاهەنگەکە هەینی نەبوو. عەمە بزورگ لە چێشتخانە خەریکی دروستکردنی جۆرێك لە سەڵاتەی مریشك بوو لەگەڵ مایۆنیس تێکەڵیکردبوو. لە سەردەکەی بە نۆکی سەوز ناوی مەهتابی بە فارسی نووسیبوو. کچەکەی سینییەکی بەشێوەیەکی زۆر جوان بە کەباب، گۆشتی قاشقاشکراو، پارچە پەنیری سپی و سەوزە بە ڕەنگی جۆراوجۆرەوە ڕازاندبۆوە.

مورتەزا، دووەم کوڕی بابەحاجی و عەمە بزورگ، هاتبوو بۆ یارمەتیمان و ناستەرانی ژنی و نیلوفەری کچە یەك ساڵە جوانەکەی هێنابوو، کە بە چاوە بریسکاوییەکانی دەچووە دڵی هەموو کەسێکەوە. مەهتاب لەگەڵیدا یاریدەکرد، لە کاتێکدا مورتەزا و ناستەران هۆڵەکەیان بە میزەڵان و ئاڵای سێگۆشە دەڕازاندەوە. مەهتاب ئەو یەك دوو ڕۆژە چی بەسەرهاتبوو، لەبیری چووبۆوە و بێ ئەوەی دەم بدات بەیەکدا، لەبارەی دیارییەکانییەوە قسەیدەکرد.

میوان بە پاکەتی پێچراوەی ڕەنگاوڕەنگەوە ڕژانە ناو ماڵەکەوە. مەهتاب چاوی زەقکردەوە، لە بینینی کەڵەکەبوونی ئەو هەموو دیارییە.

مورتەزا، ناستەران و نیلوفەر چوونە دەرەوە و بە کێکێکی سەرسوڕهێنەرەوە گەڕانەوە، کێکێك دروست وەك ئەوەی ئێمە وابوو، کە داوامان کردبوو. هەر لەو کاتەدا مەجید کێکەکەی ئێمەی هێنایە ماڵەوە. لەوە دەچوو ئەمە خۆشییەکەی دوو بەرابەر کردبێت. هەر مەجید بە کێکەکەمانەوە پێی نایە ئەم دیو ژوورەکەوە، نیلوفەر بە خۆشیەوە دەستی

بۆ برد و ڕایکێشا. کێکەکە کەوتە سەر زەوییەکە، کە مایەی ناخۆشی بوو بۆ مەجید و نیلوفەر.

بەڵام باش بوو هەر کێکێکی ترمان هەبوو.

مامل ئاهەنگەکەی دەست پێکرد، بە چەپڵە لێدان کەوتە بێژینی چەند گۆرانییەکی منداڵانە، کە بەلامەوە نامۆ بوو. لەو ساتەدا بەو ئاکامە گەیشتم، ئەمە دەبێت پێشێلکردنی یاسا بێت لە ئێراندا، زەردەخەنە بتگرێت. هیچ کەسێك لەوەنەدەچوو دڵشاد بێت. بەڵام هەرچی چۆنێك بوو، ئەو ڕۆژە کەسوکار بەڕاستی بەشداری خۆشی ئاهەنگی لەدایکبوونی کچەکەیان کردین.

گۆرانی بێژین نزیکەی سێ چارەك درێژەی کێشا. مامل و ڕەزا زەوقیان هەبوو، بەخۆشییەوە یاریان لەگەڵ منداڵەکاندا دەکرد. پاشان، وەك ئەوەی هێمایان بۆ کرابێت، ئەم دوو پیاوە زلە هێرشیانکردە سەر مۆڵی دیارییەکان و کوتنە لێکردنەوەی کاغەزی دیارییەکان.

مەهتاب نەیدەتوانی بەچاوی خۆی باوەڕبکات. فرمێسك بەسەر ڕوومەتەکانییەوە جۆگەلەی بەست. "مــامی، ئەوە خۆ دیارییەکانی من دەکەنەوە!" دەستیکرد بە گریان.

مودی قسەی بۆ مامل و ڕەزا کرد. ئەوانیش نابەدڵانە ڕێگەیان دا مەهتاب چەند دیارییەك بکاتەوە، بەڵام ڕوونیشی کردەوە، کە لە ئێراندا هەمیشە پیاوان دیاری بۆ منداڵان دەکانەوە، هاوکات مامل و ڕەزا بەردەوامبوون لەسەر لێکردنەوەی کاغەزە ڕەنگاوڕەنگەکانی دیارییەکان.

ناڕەزایەتی مەهتاب نیشتەوە بە وەرگرتنی یەك لە دوای یەکی دیارییەکانی. دیارییەکی ئێرانی زۆر وەرگرت، کە لە نێویاندا بوکەشوشەیەکی فریشتەی سوور و سپی بوو، بە پەتێکەوە خۆی هەڵواسی بوو، جولانەیدەکرد، تۆپێك، هێلەکێکی ژیان[3]، ئەڵقەی پلاستیکی بۆ یاری ناو حەوزی مەلە، لامپایەکی جوان بە باڵۆنێکەوە، مۆڵێکی زۆری جلوبەرگ - و بوکەشوشەی تر.

ئەوەندە شتی یاری لەبەردەستدا بوو، نەیدەتوانی بە یەکەوە یاری بە هەموویان بکات. مەهتاب قایم بوکەشوشەکەی لە باوەشگرتبوو، بەڵام ئەو هەموو منداڵە لەوێ بوون پەلاماری دیارییەکانیان دا، لەسەری شەڕیاندەکرد و دەیانگرتە یەکتری. مەهتاب جارێکی تر فرمێسك بەچاویدا هاتەخوارەوە، بەڵام هیچ ڕێگایەك نەبوو بۆ کۆنترۆڵی ئەو هەموو منداڵە هارە. هەتا گەورەکانیش لەوەدەچوو، ئاگاداری هەڵسوکەوتی خۆیان نەبن.

مەهتاب بۆ دڵنیایی بوکەشوشەکەی لە باوەشگرتبوو، لەکاتی نانخواردنی ئێواریدا غەمبار دیاربوو، بەڵام کە کێکەکەیان هێنا گەشایەوە. بە ئازارێکی زۆر تەماشامدەکرد کێکەکەی دەخوارد، دەمزانی ئەو دیارییەی کە ئەو لە هەموو شتێك زیاتر دەیەوێت، ناتوانم بیدەمێ.

پاش ناهەنگی لەدایکبوونی مەهتاب زیاتر نوقمی ڕەشبینی خۆم بووم. پێمانئابووە مانگی ئەیلولەوە، دەبوو لە سێ هەفتە لەوەدو پێشەوە لەماڵەوە بووینایە لە مەشیگان.

لەدایکبوونێکی تریش بەڕێوە بوو، مایەی خەمۆکییەکی زیاتر بوو بۆم. ئەویش لەدایکبوونی ئیمام ڕەزا بوو، دامەزرێنەری تایەفەی شیعە. لە ڕۆژێکی وادا، وا چاوەڕوان لە شیعییەکی بە باوەڕ دەکرێت، کە سەردانی ئارامگای ئیمام بکات، بەڵام چونکو لە وڵاتێکی دوژمنی وەك عێراقدا نێژراوە، دەبێت سەردانی ئارامگای خوشکەکەی بکات لە ڕەی، پایتەختی پێشووی ئێران، کە نزیکەی یەك کاژێر ئوتومبیل لێخوڕین بوو بەرەو باشوور.

گەرمای ئەو بەیانییە، گەرمای تاقەتپڕوکێنی هاوین بوو. لەخۆم دڵنیابووم، گەرماکەی لەسەرو سەد[4] پلەوەیە. هێزم لەبەربڕا، کاتێك کەوتمە بیرکردنەوەی ئەوەی، چۆن بەرگەی ئەو هەموو جلە قورسە دەگرم، لەو گەرما زۆرەدا لە ناو ئوتومبیلێکی پڕ خەڵکدا، ئەویش بۆ سەردانی گۆڕێك، کە بۆ من واتایەکی نەبوو.

"بەنیاز نییم بێم،" بە مودیم وت.

"نا، دەبێت بێیت،" مودی وتی. بوارێك نەما بۆ گفتوگۆ.

ئەو کەسانەی لەماڵی عەمە بزورگ کۆبووبوونەوە، ژماردمن، بیست کەس بوون، خۆیان ئامادەدەکرد لەناو دوو ئوتومبیلدا جێگای خۆیان بکەنەوە.

مەهتابیش وەك من، نیگەران و غەمبار بوو. پێش ئەوەی بکەوینەڕێ، چووینە توالێتەکە و بۆ جارێکی تر ویردی خۆمان خوێند: "خوایە، ڕێگایەکی بێمەترسیمان بۆ بدۆزەوە، هەردووکمان بگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە."

مودی زۆری لێکردم، بۆ ئەم بۆنەیە عەبایەکی ڕەشی قورسی ئەستور بدەم بەسەردا. لەو ئوتومبیلە قەرەباڵغەدا دەبوو لە باوەشی مودیدا دانیشم و مەهتابیش لەسەر من. پاش یەك کاژێری پڕ پەرێشانی ئوتومبیل لێخوڕین، گەیشتینە ڕەی، بۆ ناو ڕەشەبای پڕ تەپوتۆز و گەلە ژنانی عەباڕەشی پڕ ڤاوقریشك، کە لە پێشبڕکێی چوونە ژوورەوەدا بوون. گەلە ژنان لەگەڵ خۆیاندا من و مەهتابیان ڕاپێچکرد بەرەو دەرگای چوونە ژوورەوە.

"مەهتاب با لەگەڵ من بێت،" مودی وتی. "من هەڵیدەگرم."

"نەء،" مەهتاب قیژاندی.

هەوڵیدا دەستی بگرێت، بەڵام ئەو خۆی ڕاپسکاند. خەڵك لایانکردەوە بۆئەوەی بزانن، چ ڕوودەدا.

"نـــــا!" مەهتاب زریکاندی.

لە خۆ ڕاپسکاندنی مەهتاب کەللەیی بوو، دەستی گرت و بەقایم لە منی کردەوە. هاوکات زرمەی لە پشتی هەڵساند.

"ئەکەی!" هاوارمـــلێکرد. ڕامکرد بە دوای کچەکەمدا، بەڵام عەبا قورسەکەم بەری پێگرتم.

ئینجا مودی داخی خۆی بە من ڕشت، بەوپەڕی تواناوە کەوتە شاتەشات، هەرچی جنێوێکی ئینگلیزی بە بیردا هات، لە دەمی هاتە دەرەوە. هەر من دەستمکرد بە گریان، ئەو بە ڕوومدا تەقییەوە.

ئینجا مەهتاب کەوتە ڕزگارکردنی من، هەوڵیدەدا هەردووکمان جیاکاتەوە. مودی تەماشایەکی مەهتابی کرد، وەك ئەوەی هەرگیز لەوەو پێش نەیبینیبێت. بە پشتی دەستی یەك زللەی قایمی لێدا. خوێن لە لێوی سەرەوەی لای ڕاستی فیچقەیکرد، تکایەوە سەر زەوییەکە.

"ناجس،[5]" خەڵك لە دەوروپشتمان بۆڵەیان لێوە هات. لە ئێراندا خوێن بە پیس چاوی لێدەکرێت و دەبێت یەکسەر پاککرێتەوە. بەڵام کەس خۆیی تێهەڵنەقورتاند، چونکو وەك کێشەیەکی ناو خێزان چاوی لێدەکرێت. نە عەمە بزورگ هەوڵیدا و نە هیچ کام لە ئەندامانی خێزانەکە، تورەیی مودی لغاو بکات. چاویان لە زەوییەکە بڕیبوو یان لە ئاسمان.

مەهتاب لەتاو ئازار دەگریا. هەڵمگرتەوە و هەوڵمدا بە چمکی عەباکەم، خوێنەکەی بگیرسێنمەوە، لە کاتێکدا مودی لەسەر جنێودانی خۆی بەردەوامبوو، کۆمەڵە وشەیەکی ناشرین لە دەمی دەهاتە دەرەوە، کە لەوەو پێش هەرگیز لێمنەبیستبوو. بە چاوانی پڕ فرمێسکەوە لە دەموچاوی پڕ ڕق و تورەی ورددەبوومەوە، خوێنی لێدەباری.

"دەبێت سەهۆڵ پەیدابکەین و بیخەینە سەر لێوی،" هاوارمکرد.

دەموچاوی خوێناوی مەهتاب تۆزێك ئاگری کەللەیی مودی دامرکاندەوە، هەرچەند پەشیمانی تیادا دیارنەبوو. مودی هاتەوە سەرخۆی و پێکەوە چووین بۆ لای فرۆشیارێك، کە ئامادەبوو، چەند کلۆیەکمان لە تاشە سەهۆڵێك بۆ بکاتەوە و پێمان بفرۆشێت.

مەهتاب هەنسکەهەنسکی بوو. مودی گرژ و ئاسایی بوو، وەك ئەوەی هیچی نەکردبێت. منیش هەوڵمدا خوێنێکی زیاتر بە مێشکمدا بڕوات و لە دەروپشتم زیاتر وردبمەوە و ببینم، کە شوومکردووە بە پیاوێکی شێت و لە وڵاتێکدا کەوتومەتە داوەوە، کە یاساکانی وا حکومەدکات، پیاوەکەم ئاغای تەواوی من بێت.

نزیکەی مانگێك بەسەر کەوتنە داوی مودییەوە، تێپەڕی و تا زیاتر دەمایەنەوە لە ئێراندا، مودی زیاتر دەخزایە ناو کەلتوری نامۆی وڵاتەکەی خۆیەوە. شتێکی ترسناك لە کەسایەتی مودیدا پەرەیدەگرت. دەبوو من و مەهتاب لەم دێوەزمەیە خۆمان دەربازبکەین، پێش ئەوەی هەردووکمان لەناوبەرێت.

چەند ڕۆژ دواتر، لە کاژێرە کەم جموجۆڵەکانی پاشنیوەڕۆدا، کاتێك مودی چووە دەرەوە، بڕیارمدا ئەم هەوڵە ترسناکەی هەڵهاتن بدەم. بڕێکی باشی ڕیاڵەکانم لەژێر دۆشەکەکە دەرهێنا، دەستی مەهتابم گرت و بە ئەسپایی ماڵمان جێهێشت. ئەگەر نەمتوانی لە ڕێگای تەلەفونەوە پەیوەندی بە باڵوێزخانەوە بکەم، دەبێت هەرچی چۆنێك بێت خۆمی بگەیەنمێ. بە مانتۆ و ڕووسەرییەکەم خۆم پێچایەوە، بەو هیوایەی کەس هەستنەکات

بیانیم. ئارەزووی ئەوەم نەبوو، نیازی خۆم بۆ هیچ کەسێك باسبکەم. بە ڕووسەرییەکەم تەواو دەموچاوەم داپۆشی، بۆئەوەی سەرنجی پاسداری ئامادە لە هەموو شوێنێکدا و پۆلیسی نهێنی، بۆ لای خۆم ڕانەکێشم.

"مامی بۆ کوێ دەچین؟" مەهتاب پرسیاریکرد.

"تۆزێکی تر پێتدەڵێم. خێراکە." نەمدەویست توشی گەشکەی بکەم، تا دەگەیشتینە شوێنێکی بێمەترسی.

بەخێرایی دەڕۆیشتین، قەرەباڵغی و هاتوچۆی خەڵکەکە دەیترساندم، نەمدەزانی چ ئاراستەیەك بگرم. لە ترساندا دەنگی دڵم دەهاتە گوێم. بەزەمان ئابۆوە. نەمدەتوانی پێوانەی شێتگیری مودی بکەم، کاتێك کە بە هەڵهاتنی ئێمە دەزانێت، بەلام من خەیاڵی گەڕانەوەم لەسەردا نەبوو. دڵنەوایی خۆمم بەوە دەدایەوە، کە هەرگیز ئیتر نایبینینەوە.

لەکۆتاییدا نووسینگەیەکمان دۆزییەوە، کە تابلۆیەکی هەڵواسیبوو، بە ئینگلیزی لەسەری نووسرابوو تەکسی. چووینە ژوورەوە، داوای تەکسیمان کرد و لە پێنج خولەکدا ئێمە بەڕێوە بووین بۆ سەرفەرازی.

هەوڵمدا بە شوفێرەکە بڵێم، بمانگەیەنێتە بەشی بەرژەوەندی یو.ئێس.[6] لە باڵوێزخانەی سویسرا، بەلام تێنەگەیشت. ئەو ناونیشانەی دایکم بە تەلەفون پێیدابووم، بۆم وت: "پارکی ئەفین، شەقامی حەفدە." شوفێرکە کە گوێی لە "پارکی ئەفین" بوو، گەشایەوە و بەناو ترافیکی پڕجەنجاڵدا تێیتەقاند.

"مامی بۆکوێ دەچین؟" دووبارە وتییەوە.

"دەچین بۆ باڵوێزخانە،" وەلامەدایەوە، کەوتبووینە سەر ڕێگای خۆمان، هەناسەیەکم بەبەردا هاتەبۆوە. "لەوێ بێمەترسی دەبین. هەر لەوێوە دەتوانین بگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە."

مەهتاب لە خۆشیاندا قیژەیەکی لێهەڵسا.

پاش نزیکەی نیو کاژێر تەپەتەپ ئوتومبیل لێخوڕین بەناو شەقامەکانی تاراندا، شوفێرەکە لەلای باڵوێزخانەی ئوسترالیا لە پارکی ئەفین وەستا. لەگەڵ پاسەوانێکدا قسەیکرد، کە ئاراستەیکرد بە دەوری سوچەکەدا. چەند ساتێکی نەبرد لەبەردەمی پەناگاکەماندا هاتینە خوارەوە، خانوویەکی کونکرێتی نوێی گەورە بە تابلۆیەکەوە، کە لێینووسرابوو، بەشی بەرژەوەندی یو.ئێس. لە باڵوێزخانەی سویسرا. دەروازەیەکی شیشی ئاسنی هەبوو، چەند پۆلیسی ئێرانی پاسەوانیان دەکرد.

پارەی تەکسییەکەم دا و دەستم نا بە زەنگی تەلەفونی دەروازەکەدا. جززیەك هات، دەروازەکە کرایەوە و من و مەهتاب پێمان نایە خاکی سویسراوە - نەك ئێرانەوە.

ئێرانییەکی زمان ئینگلیزی پێشوازی لێکردین و داوای پاسپۆرتی لێکردین. "پاسپۆرتمان پێنییە،" وەلامەدایەوە. لێمانوربۆوە و هاتەسەر ئەو باوەڕەی کە ئەمریکیین، لەبەرئەوە هێشتی بچینە ژوورەوە. ئینجا ڕێگەماندا بمانپشکنن. هەر ساتێك تێدەپەڕی زیاتر گەشکە دەیگرتم، لە خۆشی ئەوەی ڕزگارمان دەبێت.

لەکۆتاییدا ڕێگەیان داین بچینە ناوچەی نووسینگەوە، لەوێ لەلایەن ژنێکی ئێرانی - ئەمریکی میهرەبان بەڵام سانا، بەناوی هێلین بالاسانیان پێشوازیکراین، بێدەنگ گوێیگرت بۆ بەسەرهاتی یەك مانگی ڕەبەق بارمتە بوونمان. ژنێکی باریکەلەی باڵا بەرز، لەوەدەچوو لە تەمەنی چلەکانیدا بێت، کراسێکی ڕۆژئاوایی تا سەرئەژنۆ درێژی لەبەردابوو. گوناهکارانە سەرڕووت بوو. بەچاوێکی بەزەییانە تەماشایدەکردین.

"لێرە پەنامانـــبدە،" داواملێکرد. "پاشان ڕێگەیەکمان بۆ بدۆزەرەوە و دەرمانبکە بۆ ماڵەوە."

"ئەوە دەڵێی چی؟" هێلین وەڵامیدایەوە. "لێرە تۆ ناتوانیت بمێنیتەوە!"

"ئێمە ناتوانین بگەڕێینەوە بۆ ماڵی مێردەکەم."

"ئێوە هاووڵاتییەکی ئێرانین،" هێلین بە نەرمی وتی.

"نەء، من هاووڵاتی ئەمریکیم."

"ئێوە ئێرانین،" دووبارەیکردەوە، "هەروەها دەبێت پابەندی یاساکانی ئێران بن."

نامیهرەبانانە نا، بەڵام زۆر ڕاشکاوانە ڕوونیکردەوە، کە لەو ساتەوەی شوودەکەم بە ئێرانییەك بەپێی یاسا دەبمە هاووڵاتی ئەو وڵاتە. لە ڕاستیدا لە ڕووی یاساییەوە، من و مەهتاب هەردووکمان ئێرانی بووین.

تەزوویەکی سارد بە گیانمدا هات. "نامەوێت ئێرانی بم،" وتم. "بە ئەمریکایی لەدایکبووم. دەمەوێت بە ئەمریکایی بمێنمەوە."

هێلین سەری بادا. "نــــا،" بەنارامی وتی. "تۆ دەبێت بگەڕێیتەوە بۆ لای هاوسەرەکەت."

"ئاخر لێمدەدا،" دەستمکرد بەگریان. هێمایەکم بۆ مەهتاب کرد. "لە هەردووکمان دەدا!" هێلین هاودەردی خۆی دەربڕی، بەڵام هیچی لەدەستنەدەهات، یارمەتیمانبدات. "لێـــرە دەستبەسەرکراوین،" دیسانەوە کەوتمە پەلەقاژێ، لەکاتێکدا فرمێسك بە ڕوومەتمدا دەهاتە خوارەوە. "لەبەرئەوەی هەموویان نوستبوون، توانیمان لە دەرگای حەوشێوە هەڵبێین. ناتوانین بگەڕێینەوە. دەرگامان لەسەر دادەخات. بەڕاستی ترسی ئەوەم هەیە، نازانم چیمان بەسەر دێت."

"من تێناگەم، ژنێکی ئەمریکایی بۆ ئەم بەزمە بەسەر خۆی دەهێنێت." هێلین لەبەرخۆیەوە وتی. "من دەتوانم جلوبەرگت بۆ بەدەستبهێنم. نامەت بۆ پۆستبکەم. دەتوانم پەیوەندی بە خێزانەکەتانەوە بکەم و پێیان بڵێم، ئێوە باشن. من دەتوانم لەو جۆرە کارانەت بۆ بکەم، هیچ شتێکی ترم لەدەستنایەت."

ئەو ڕاستییە سادە و دڵتەزێنە هەر ئەوە بوو، کە من و مەهتاب تەواو لەژێر ڕەحمەتی یاسایەکی پیاوسالاری توندڕەو داین.

ئەو کاژێرەی دواییم لە باڵوێزخانەدا بە پەشۆکاوی بردەسەر. ئەوەی لە تواناماندا بوو کردمان. تەلەفونمان بۆ ئەمریکا کرد. "هەوڵدەدەم ڕێگایەك بدۆزمەوە و بگەڕێمەوە،" لە

دووری هەزاران کیلۆمەتردوە، بە گریانەوە بە دایکمم وت. "لەوێ هەرچیتان لەدەستدێت بیکەن."

"پەیوەندیم بە وەزارەتی دەرەوە کردووە،" دایکم بەدەنگێکی لەرزۆکەوە وتی. "چیمان لەدەستبێت، دەیکەین."

هێلین یارمەتیدام نامەیەك بنووسم بۆ وەزارەتی دەرەوەی یو.ئێس.، کە لە ڕێگای سویسراوە دەگەیشتە ئەوێ، کە تیایدا نووسیبووم، بەبێ ویستی خۆم منیان لە ئێراندا گلداوەتەوە، وە من نامەوێت ڕێگا بدرێت بە هاوسەرەکەم ئەو سامانەی هەمانە لە وڵاتە یەکگرتووەکان بیباتە دەرەوە.

هێلین چەند فۆرمی پڕکردەوە، پرسیاری وردی لەسەر مودی لێکردم، بەتایبەتی لەسەر دۆخی هاووڵاتی چڕبۆوە. مودی پاش تێوەگلاندنی لە خرۆشاندنی شۆڕشی ئێراندا، هەرگیز داوای هاووڵاتی یو. ئێسی نەکرد. هێلین سەبارەت بە کارتە سەوزەکەی[7] پرسیاریکرد - مۆڵەتی ڕەسمی ژیان و کارکردن لە یو.ئێس. لەو کاتەدا دەیتوانی بگەڕێتەوە بۆ کارکردن لە ئەمریکا، بەڵام ئەگەر زیاتر بمایاتەوە، کارتە سەوزەکەی بەسەردەچوو، ئیتر ڕێگایان پێنەدەدا کاری پزیشکی بکات لە ئەمریکا.

"زۆر لەوە دەترسم، کار لێرە وەرگرێت،" وتم. "ئەگەر ڕێگای پێبدرێت لێرە کاری پزیشکی بکات، ئێمە تەواو گیردەکەین. بەڵام ئەگەر کاری دەستنەکەوێت، لەوانەیە بڕیاری گەڕانەوە بدات بۆ ئەمریکا."

ئەوەی لە تواناداا بوو، هێلین بۆی کردم، ئینجا لە کۆتاییدا دواناگاداری ترسناکی خۆی ڕاگەیاند. "ئێستا ئیتر دەبێت بگەڕێیتەوە،" لەسەرخۆ وتی. "ئەوەی لە تواناماندا بوو، کردمان. نارامــبگرە."

تەلەفونی بۆ تەکسی کرد، کاتێك گەیشت، لەگەڵمان هاتە دەرەوە بۆ سەر جادەکە و لەگەڵ شۆفێرەکەی قسەیکرد. ناونیشانی شوێنێکی پێدا، نزیك ماڵی عەمە بزورگ. چەند کۆڵانی کۆتایی بەپێ ڕۆیشتین، تا مودی ئەمان بینێت بە تەکسی دێینەوە.

سکم تێکچوو، کاتێك من و مەهتاب کەوتینەوە سەر جادەکانی تاران، شوێنێك نەبوو بۆی بچین، بێجگە لە ماڵی مێرد و باوك نەبێت، کە دەوری پاسەوانی بەدەسەڵاتی بەندیخانەکەمانی دەبینی.

هەوڵمــدا ژیربێژانە بیرکەمەوە، هەرچەند سەرم لە ئازاردا هاڕەی دەهات، بەوردی کەوتمە قسە لەگەڵ مەهتاب. "ئێمە نە بە باوکت و نە بە هیچ کەسێکی تر، ناتوانین بڵێین لە کوێ بووین. من خۆم پێیدەڵێم، چووین بۆ پیاسە و ونبووین. ئەگەر پرسیاریکرد، لەوە زیاتر مەڵێ."

مەهتاب سەری بۆ لەقاندم. کچەکەم لەو هەلومەرجەدا ناچارکرابوو، زوو گەورەبێت.
مودی چاوەڕوانیدەکردین، کە گەیشتینە ماڵەوە. "لە کوێ بوویت؟" نەڕاندی.

"چووین بۆ پیاسە،"وەڵامەدایەوە. "ونبووین. زیاتر پیاسەمانکرد، وەك لەوەی مەبەستمان بوو. زۆر شت هەبوو تەماشامانکرد."

مودی بۆ ساتێك بیری لە قسەکانم کردەوە و پاشان باوەڕی پێنەکردم. دەیزانی هەستی ناڕاستەم بەهێزە. چاوی تێبڕیم، بەو چاوە ڕقاوییانەی پیاوێکی موسڵمان کە هەڵخڵەتاوە لەلایەن ژنێکەوە. بە دەستێك توند قۆڵی گرتم، بە دەستەکەی تری قژم. ڕایکێشام بۆ بەردەمی خێزاکە، کە ژمارەیان نزیکەی دە کەس بوو، لە هۆڵەکە دەحەوانەوە. "بۆی نییە لەم ماڵە دوو پێی بچێتە دەرەوە!" فەرمانیدا. وە ڕوو بە من وتی، "ئەگەر لەم ماڵە بچیتە دەرەوە، دەتکوژم!"

گەڕامەوە بۆ ژووری تەنیایی، بۆ ڕۆژانی بەتاڵی، بۆ تێکچوون و ڕشانەوە، بۆ قوڵایی خەمۆکی. هەرکاتێك پێم دەنایە ئەودیو دەرگای ژوورەکەمەوە، عەمە بزورگ یان یەکێك لە کچەکانی چاوی لێنەدەتروکاندم. هەستمکرد ورەم بێهێز دەبێت. دەمزانی بەو نزیکانە ئاسایی ملدەدەم بە چارەنووسی خۆم و بۆ هەتاهەتایە لە کەسوکار و وڵاتەکەم بەدووردەبــم.

دابڕاو لە جیهانی دەرەوە، کەوتمە بیرکردنەوە لە هەندێك شت، کە مایەی نیگەرانیم بوو. دوامــانگی وەرزی یاری بەیسبۆڵ بوو، هیچ شتێکم نەدەزانی تەیگەر لە پێشبڕکێدا گەیشتۆتە کوێ. لە گروپەکەی خۆیدا لە پێشەوە بوو، کە ئێمە سەفەرمانکرد بۆ ئێران. لە ڕاستیدا وامان دانابوو، پاش گەڕانەوە باوکم بەرم بۆ یەکێك لە یارییەکان، چونکو دەمزانی، ئەگەری ئەوە هەیە، ئەوە دوایاری بێت کە دەیبینێت.

ئێوارێیەکیان کە خولیای ماڵەوە تەنگی پێهەڵچنیــــبووم، ویستم نامەیەك بۆ دایك و باوکم بنووسم، هەرچەند دڵنیانەبووم لەوەی چۆن پۆستیدەکەم. لە خۆم سڵەمیمەوە، کە بینیم دەستم ئەوەندە بێهێزە، هەتا نەمدەتوانی ناوی خۆم بنووسم.

بۆ چەند کاژێرێك کەوتمە بیری ئەوەی، ئەمە بە واتای چی دێت لەو هەلومەرجەدا کە منی تێکەوتووم. نەخۆش کەوتووم، توڕەم، تووشی خەمۆکی بووم، بەرپێی خۆم نابینم. لەوە دەچوو، مودی ڕازیبێت بەوەی نوقمی نیگەرانی خۆم بم، لەو باوەڕەدا بوو، کە ئیتر ناتوانم پشت ڕاستکەمەوە و شەڕی ڕزگاری خۆم بکەم. سەیرێکی منداڵەکەمم کرد. پێستی جوانی مەهتاب تەواو بووبوو بە پەڵەپەڵەی سوور، جێگەی پێوەدانی مێشوولە. هاوینمان تێپەڕاند و زستان بەڕێوە بوو. پێش ئەوەی بزانم، وەرزەکان - هەتا کات خۆی - هەر لەخۆیەوە دەڕوات. چەند زیاتر دەمایینەوە، ئەوەندە خۆ بەدەستەوەدان و ملکەچی ئاسانتر دەبوو.

پەندەکەی سەر زاری باوکمم بیرکەوتەوە، کە دەیوت: "لە هەرکوێیەك ورەت هەبێت، ڕێگای دەرچوونت هەیە."[8] بەڵام هەتا ئەگەر ورەشم هەبێت، کێ ڕێگامان پیشانــدەدات؟ لە خۆم کەوتمە پرسیار. ئایا کەسێك هەیە بتوانێت من و منداڵەکەم لەم دێوەزمەیە

ڕزگاربکات؟ سەرەڕای ئەو تەمومژەی تێیکەوتبووم، کە لە نەخۆشی خۆم و ئەو دەرمانەکانی مودی پێیدابوو، سەرچاوەیــدەگرت. وردەوردە وەڵامــی خۆمم وەرگرتـــەوە.

هیچ کەسێك ناتوانێت دەست بە باڵمانەوە بگرێت.

تەنیا خۆم دەتوانم، خۆم و کچەکەم لەم هەلومەرجە ڕزگاربـــکەم.

تێبینییەکان:

1. بۆ هەریەك لە ئایەتەکانی قورئان دەکرێت لێکدانەوەی جیاواز هەبێت، بەو پێیە وەرگێڕانی جیاوازیش بێتەکایەوە. بۆ دوورکەوتنەوە لەم کێشەیە، بۆ وەرگێڕانی ئایەتەکان گەڕاومەتەوە بۆ وەرگێڕانەکەی (تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان. نووسینی بورهان محەمەد ئەمین و عبدول کەریم). تەواوی وەرگێڕانی ئایەتەکانی ئەم کتێبە لەو سەرچاوەیەوە وەرمگرتووە. وەرگێڕ

2. tetanus

3. a life vest : هێلەکێکە لە پەڕۆی تایبەت، ناوەکەی تەپەتۆڕی تیادایە، لەبەردەکرێت و دەبەسترێت و یارمەتیدەری ئەو کەسەیە کە نوقمی ئاو نەبێت.

4. مەبەست پلەی گەرمای فێهرنایەتییە، کە دەکاتە نزیکەی سی و هەشت پلەی گەرمای سەدی.

5. بە واتای پیس دێت.

6. U.S. Unite State : وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

7. green card.

8. "Where there is a will there is a way." ئەم پەندە لە کتێبەکەدا وا هاتووە: "لە کوێیەك ورە هەبێت، ڕێگای دەرچوون هەیە."

# 5

نێوارێیەکیان پاش تاریکبوون، لە هۆڵەکەی ماڵی عەمە بزورگ دانیشتبووم، وڕەی فرۆکە هات، کە بە نرمی بەرەو لای گەرەکی ئێمەوە دەهات. بریسکەی تەقینەوەی فیشەکی تۆپی فرۆکەشکێن ئاسمانی ڕۆشنەدەکردەوە، پاش ئەوە گرمەیەکی گەورەی تەقینەوە دەنگیدایەوە.

ئەی هاوار! جەنگ گەیشتە تاران، لە دڵی خۆمدا وتم.

چاوم گێڕا بۆ مەهتاب، بۆئەوەی لەگەڵ خۆمدا بیرفێنمە شوێنێکی بێمەترسییەوە، بەڵام مەجید کە ترسی لە دەموچاومدا بینی، هەوڵیدا ئارامەکاتەوە. "ئەمە بۆ خۆپیشاندانە،" پێیوتم، "بۆ ئاهەنگی هەفتەی جەنگە."

مودی بۆی باسکردبووم، کە هەفتەی جەنگ مەراسیمێکی ساڵانەیە بۆ شکۆداری جەنگی ئیسلام، کە ئێستا بەبۆنەی جەنگەوەیە لەگەڵ عێراق و لە درێژەی خۆشیدا لەگەڵ ئەمریکا، چونکو هەموو پروپاگەندەکان ئەوە بە ئێرانییەکان دەڵێن، کە عێراق هیچ نییە جگە لە بوکلەیەک، کە لەلایەن وڵاتە یەکگرتووەکانەوە جەکداردەکرێت.

"ئێمە بەردەوپیری جەنگ دەچین لەگەڵ ئەمریکا،" مودی بەخۆشییەکەوە پێیوتم، کە بۆی نەدەشاردرایەوە. "شتێکی ڕەوایە. باوکت باوکمی کوشتووە."

"مەبەستت چییە؟"

مودی بۆی ڕوونکردەمەوە، کە لە جەنگی جیهانی دووەمدا، کاتێک باوکم خزمەتی سەربازی هێزەکانی ئەمریکای کردووە لە عەبادان لە باشووری ئێران، باوکی وەک پزیشکی کاتی جەنگ کاریکردووە، لەو کاتەدا چارەسەری چەند سەربازی ئەمریکایی کردووە کە تووشی مەلاریا بوون، وە بەو هۆیەوە خۆشی تووشبووە و مردووە. "ئێنجا ئێستا تۆ قەرزارباری ئەوەی،" مودی وتی. "جۆیی کورت لە جەنگی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دەکوژرێت. لەوە دڵنیابە."

دەمزانی دەیەوێت ئازارمبدات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەمدەتوانی، خەیاڵاتی سادی مودی لە ڕاستی جیابکەمەوە. ساف و سادە ئەوە ئەو پیاوە نەبوو، من شوومپێکرد. باشە من چۆن بزانم کامە ڕاستییە و کامە خەیاڵاتە؟

"وەرە،" مودی وتی، "دەچینە سەربان."

"بۆچی؟"

"خۆپیشاندانە."

ئەمەش زیاتر خۆپیشاندانێکی دژی ئەمریکایی بوو.

"نـــا،" وەڵامدایەوە. "من نایەم."

بەبێ ئەوەی وشەیەك بڵێت، دەستی دایە مەهتاب، هەڵیگرت و لەگەڵ خۆی بردی. مەهتاب لە سەرسامیدا قیژاندی و هەوڵیدا خۆی لەدەستی باوکی ڕزگاربکات، بەڵام توند گرتی و دوای خێزانەکە کەوت بۆ سەربان.

پاش تۆزێك هاتوهاوارێکم بیست، کە لە پەنجەرەی کراوەی ماڵەکەوە دەهاتە ژوورێ.

*"مەرگ بەر ئەمریکا!"* یەکدەنگ دەنگی شیعاردان دەهات لە سەربانەکانەوە. لەو کاتەدا چاك لەو ڕستەیە تێدەگەیشتم، بەردەوام دەمبیست لە ڕاپۆرتی هەواڵەکانی ئێراندا. بە واتای "بمرێ ئەمریکا!" دێت.

*"مەرگ بەر ئەمریکا!"* دەنگەکە تا دەهات زیاتردەبوو. بەدەست هەر دوو گوێی خۆمم گرت، بەڵام هاتوهاواری دەمارگیرانە هەر دەبیسترا.

*"مەرگ بەر ئەمریکا!"*

دڵم پڕبوو بۆ مەهتاب، لە سەربان بوو لەگەڵ باقی خێزانەکە، گیریکردبوو لە باوەشی باوکە شێتەکەیدا، کە داواکاربوو منداڵەکە پشت لە وڵاتەکەی خۆی بکات.

*"مەرگ بەر ئەمریکا!"*

ئەو شەوە لە تاراندا، وەك ئەوە وابوو چواردە ملوێن کەس بە یەکدەنگ بیڵێنەوە. هاتوهاوار لە سەربانێکەوە دەچوو بۆ سەربانێکی تر، دەنگێکی مۆسیقی بەردەوامی بەخۆیەوە گرتبوو، دانیشتوانی هەزاری دەخستەژێر کاریگەری خولێهێنەری خۆیەوە، ناهەنگێکی ڕوخێنەر، لە پەلوپۆخەر و ترسناك بوو، جەرگمی دەبڕی.

*"مەرگ بەر ئەمریکا! مەرگ بەر ئەمریکا! مەرگ بەر ئەمریکا!"*

"سبەینێ دەچین بۆ قوم،" مودی ڕایگەیاند.

"قوم چییە؟"

"قوم ناوەندێکی دینی ئێرانە. شارێکی پیرۆزە. سبەینێ یەکەم هەینی موحەرەمە، مانگی پرسە. ئارامگەیەك لەوێیە. عەبای ڕەش بپۆشە."

سەردانە ناخۆشەکەی ڕەیـــم وەبیرهاتەوە، کە بە لێدانی مەهتاب بەدەستی باوکی کۆتاییهات. بۆچی خێزانەکە من و مەهتاب کێشدەکەن بۆ زیارەتی شێتانەی خۆیان؟

"بەنیاز نییم بێم،" وتم

"دەچین."

ئەوەندە لە شەرعی ئیسلام شارەزابووبووم، کە نارەزایییەتێکی یاساییانە دەربڕم.

"من ناتوانم بچمە سەر ئارامگە،" وتم. "کاتی سوڕی مانگانەمە."

مودی ناوچەوانی دا بەیەکدا. هەرکاتێك سوڕی مانگانەم دەستپێکردبێت، وەبیرهێنەرەوەی ئەوە بووە، کە من لەپاش پێنج ساڵ لەدایکبوونی مەهتاب، نەمتوانیوە منداڵێکی تری بۆ دروستبکەم، کوڕێك.

"هـــەر دەچین." وتیەوە.

من و مەهتاب بۆ بەیانی ئەو ڕۆژە بە خەمۆکییەکی زیاترەوە لە خەوهەڵسایین. مەهتاب سکیدەچوو، دیاردەیەك بوو بۆ گرژی دەروونی، کە لەگەڵی ڕاهاتبووم.

"مەهتاب نەخۆشە،" بە مودیم وت. "باشترێکە لەماڵەوە بمێنێتەوە."

"دەچین." کەللەڕەقانە دووبارەیکردەوە.

تەواو بێئومێدانە هەستام جلوبەرگی یەکگرتووم پۆشی، کە بریتیبوون لە پانتۆڵێکی ڕەش، گۆرەوی ڕەشی درێژ، مانتۆیەکی ڕەشی قۆڵدرێژ و سەرپۆشێکی ڕەش. بەسەر ئەم هەموو شتانەدا عەبای ڕەشی ڕەزاقورسیشم دا بەسەردا.

بەر ئوتومبیلەکەی مورتەزای خوشکەزای مودی کەوتین، جگە لە مورتەزا خۆی، نەستەرانی ژنی، نیلوفەری بچکۆلەی دڵشادی کچیان، عەمە بزورگ و فریشتەی کچی لە ئوتومبیلەکەدا بوون. چەند کاژێری برد تا گەیشتینە سەر شەقامی خێرا و پاشان زیاتر لە دوو کاژێری تر بەڕێوە بووین لە ڕیزی یەك لە دوای یەکی ئوتومبیلی زیارەتکەرانی تردا، بەناو ناوچەیە لادێنشینەکاندا دەڕۆیشتین، کە وەك گیانۆکەی من غەمبار بوون.

قوم شارێکی پڕ تەپوتۆزی قاوەیی سووربااوی کاڵ بوو. هیچ یەك لە شەقامەکانی قیرتاونەکرابوون، هاتنی ئەو هەموو ئوتومبیلەی زیارەتکەران هەورێك لە تەپوتۆزی خنکێنەری دروستکردبوو. هەرکە لە ئوتومبیلەکە هاتینەخوارەوە، جلوبەرگە لە عارەق هەڵکێشراوەکانمان چینێك لە تەپوتۆزی گرتەخۆی.

لەناوەڕاستی مەیدانەکەدا، ئاوگەیەك بە ڕووبەری ئاوگەی مەلەی ئۆڵمپی تیادا بوو، کە زیارەتکەرانی هاتوهاوارکەر لێیکۆبووبوونەوە، لە کێشەی ئەوەدا بوون، چۆن خۆیان بگەیەننە ئاوەکە و بۆ نوێژکردن دەستنوێژ بگرن. هیچ هێمایەکی خۆشەویستی لەنێوان ئەم خەڵکە زیارەتکەرانەدا نەبوو. بۆ گەیشتن بە قەراخی ئاوگەکە هەندێك دیندار کەوتبوونە ئانیشك هاویشتنی کوێرانە و شەق تێهەڵدان. لێرە و لەوێ لەبەر شڵپە هەڵدەستا و هاتوهاوارێکی بە دوادا دەهات، بە هۆی ئەوەی یەکێك کاتێکی زانیوە پاڵیان پێوە ناوە بۆ ناو ئاوگەکە.

چونکو من و مەهتاب خەیاڵی نوێژکردنمان لە سەردا نەبوو، پێویستنەبوو خۆمان تووشی ئەم هەراوبەزمە بکەین و لەو ناوە پیسە دەستنوێژ بگرین. چاوەڕوانی ئەوانی ترمان کرد.

پاشان بەپێی زایەندە جیایانکردینەوە. من و مەهاب دوای عەمە بزورگ، فریشتە، نەستەران و نیلوفر کەوتین بۆ بەشی ژنانی ئارامگەکە. جێگا ئەوەندە نەبوو بنوشتێینەوە و پێڵاوەکانمان دابکەنین، هەروا بە لنگەفرتێ پێڵاوەکانمان داکەن و فڕێماندایە سەر خەرمانەیێك پێڵاوی تر، کە لەوناوەدا هەڵداربۆوە.

لەهەموو لایەکەوە بە منداڵەکەمیاندا دەکێشا، کە لەترساندا دەستی گرتبووم کاتێك چووینە هۆبەیەکی گەورەوە، دیوارەکانی بە ئاوێنە ڕازێنرابوونەوە. موسیقای ئیسلامی لە بڵندگۆوە بەدەنگی بەرز لێدەدرا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیدەتوانی زاڵ بێت بەسەر

هاتوهاواری هەزارەها ژنی عەبارەش، کە لەسەر ناوفەرشەکە دانیشتبوون، سنگی خۆیان دەکوتا و نزایاندەکرد. فرمێسکی پرسە بەسەر ڕوومەتیانەوە جۆگەلەی بەستبوو.

ئاوێنەیەکی زەبەلاح، کە چوارچێوەکەی لە ئاڵتون و زیو گیرابوو، پرشنگی ئەم کانزایانەی پەرچەدەدایەوە بۆ ئاوێنەیەکی تر و بەسەر عابای ڕەشی خواپەرستەکاندا نەخشیدەبەست. دیمەن و دەنگەکان خەولێخەر بوون.

"*بشین*،" عەمە بزورگ وتی، "دانیشن."

من و مەهتاب دانیشتین و نەستەران و نیلوفەر لەتەنیشتمان بە چیچکانەوە دانیشتن.

"*بشین*،" عەمە بزورگ دووبارەیکردەوە. بە جوڵاندنی دەست و چەند وشە زمانی فارسی پێیوتم، کە تەماشای ئاوێنەکان بکەم. خۆیی و فریشتە چونە سەر گۆڕێکی ڕازاوەی گەورە لە هۆبەکەی تەنیشتمان.

تەماشای ئاوێنەکانم کرد. لە چەند ساتێکدا هەستی خاوبوونەوە و نیوە لەهۆشخۆچوون دایگرتم. پەرچدانەوەی یەک لە دوا یەکی ئاوێنەکان، جۆرێك لە خەیاڵاتی بێکۆتایی بەباردەهێنا. موسیقای ئیسلامی و ئاوازی سنگ کوتاندنی ژنەکان لەگەڵ دەنگی لاواندنەوەیان، بەدژی ویستی خۆم کەوتمە ژێر کاریگەرییانەوە. دەبێت ئەم ئەزمونە بۆ ئیمانداران مایەی گەشکەگرتنێکی تەواو بێت.

نازانم چەند بەم شێوەیە ماینەوە. کاتێکم زانی، عەمە بزورگ و فریشتە گەڕاونەتەوە بۆ ئەو هۆبەیەی کە من و مەهتاب لەگەڵ نەستەران و نیلوفەر لێی دانیشتبووین. ئەم جنۆکە پیرە هاتە وێزەی من، پڕ بەدەنگی بە فارسی کەوتە شاتەشات بەسەرمدا و خەریکبوو پەنجەی ڕەقەڵەی بکات بە چاومدا.

ئێستا من چی بکەم؟ لەبەرخۆمەوە وتـــم.

هیچ شتێك لە عەمە بزورگ تێنەدەگەیشتم، بێجگە لە وشەی "ئەمریکا" نەبێت.

لە تووڕەییدا فرمێسك بە چاویدا هاتەخوارەوە. لە ژێر عەباکەیەوە دەستێکی بۆ سەری برد و خەریکبوو، تیتك بەسەری خۆیەوە نەهێڵێت. بە دەستەکەی تری کەوتە کوتانی سنگی و ئینجا سەری.

بە تووڕەییەوە ئاماژەی بۆ کردین، بڕۆین و ئێمەش دوای کەوتین بۆ دەرەوەی *مەسجید*[1] و گەڕاینەوە بۆ حەوشەکە و لەوێ چووین بۆ دۆزینەوەی پێڵاوەکانمان.

مودی و مورتەزا لەوێ بوون، زیارەتیان تەواوکردبوو، چاوەڕوانی ئێمەیان دەکرد. عەمە بزورگ بە هەڵەداوان خۆی گەیاندە مودی، هاواریدەکرد و سنگی خۆی دەکوتا.

"ئەم هەرایە چییە؟" لە مودیم پرسی.

ئاوڕی لێدامەوە، ئاگر لە ناوچەوانی دەباری. "بۆچی ڕازینەبوویت، بچیت بۆ حەرەم؟" پرسیاریلێکردم.

"من بە هیچ شتێك نارازینەبووم،" وتـــم. "حەرەم چییە؟"

"گۆڕەکە، حەرەم گۆڕەکەیە. تۆ نەچوویت."

"ئەو پێیوتم، دانیشم و تەماشای ئاوێنەکان بکەم."

لەوەدەچوو ئەمەش دووبارەکردنەوەی بەزمەکەی ڕەی بێت. مودی وا کەللەیی بووبوو، دەترسام بکەوێتە تێهەڵدانــم. مەهتابم ڕاکێشایە شوێنێکی کەم مەترسییەوە لە پشتی خۆمەوە. دەمزانی، ئەم ژنە پیرە چرچە داوی بۆ ناومەتەوە. دەمویست هەرا لە نێوان من و مودیدا بنێتەوە.

چاوەڕوانمکرد، تا مودی قڕەقڕەکەی بڕی و وچانێکی دا. چەند توانیم بە نەرمی، بەڵام ڕێکوڕەوان پێم وت، "باشترێکە ڕاوەستیت و تۆزێك بیربکەیتەوە، بزانە چی دەڵێیت. ئەو ژنە بە منی وت، دانیشم و تەماشای ئاوێنەکان بکەم."

مودی ڕووی لە خوشکەکەی کرد، کە هێشتا لە توڕەییدا بەرپێ خۆی نەدەبینی. چەند وشەیان لەگەڵ یەکتر وت، پاشان مودی پێیوتم، "پێیوتویت دانیشیت و سەیری ئاوێنەکان بکەیت، بەڵام مەبەستی ئەوە نەبووە هەروا لەوێ بمێنیتەوە."

چەند ڕقم دەبۆوە لەو ژنە بەدکارە! "ئەستەرانیش نەچوو،" هێمام بۆ کرد. "بۆچی لەو شێت نابێت؟"

ئەم پرسیارەی لە عەمە بزورگ کرد. مودی ئەوەندە لە من توڕەبوو، پێش ئەوەی لە واتای قسەکانی خوشکەکەی بگات وەریدەگێڕان. "ئەستەران سوڕی مانگانەی هەیە،" مودی وتی. "ناتوانێت ..." ئینجا بیریکەوتەوە، منیش هەمان شتم هەیە.

هەژ ئەم ژیربێژییە ئاوی کرد بە ئاگری توڕەیی مودی دا. یەکسەر هەڵسوکەوتی بەرامبەرم نەرمبوو، ئینجا ڕووی لە خوشکەکەی کرد. بۆ چەند خولەك کەوتنە حەنەحەپەشێکردن و پاشان قسە بەردەوامبوو تا تێکتڕنجاینە ناو ئوتومبیلەکەوە بۆماڵەوە.

"پێموت، کە ناڕەوا بوویت،" بەنەرمی و لایەنگرانە مودی پێیوتم. "تۆ لە زمانەکە تێناگەیت. هەروەها پێموت، کە ئەوەندە نارامنەبووە لەگەڵت."

جارێکی تر بە پیاڵەیەك ئاوی مودی، کەوتمە مەلەکردن. ئێستا ئەقڵی هاتەوە سەرخۆی. سبەینێ چۆن دەبێت؟

ساڵی تازەی قوتابخانە دەستیپێکرد. لە یەکەم ڕۆژی کردنەوەی قوتابخانەدا، مامۆستایانی سەرتاسەری تاران منداڵان دەهێننە سەر شەقامەکان بۆ خۆپیشاندان. سەدان قوتابی لە قوتابخانەیەکی نزیکمانەوە، بە بەردەمی ماڵی عەمە بزورگدا ڕۆیشتن و یەکدەنگ دروشمە ناشرینەکەیان دەوتەوە، *"مەرگ بەر ئەمریکا!"* و ئەم جارەیان دوژمنێکی تریشی خرابووەسەر، *"مەرگ بەر ئیسرائیل!"*

مەهتاب لە ژووری نوستنەکەماندا گوێی خۆی گرت، بەڵام کەڵکی نەبوو.

له هەموو شتێك خراپتر ئەوە بوو، مودی ئەم ڕۆڵەی قوتابخانەی لە ژیانی منداڵانی ئێراندا لا پەسەندبوو. بڕیاریدابوو، مەهتاب بکات بە کچێکی ئێرانی ملکەچ. پاش چەند ڕۆژی تر لەپڕ ڕایگەیاند، "مەهتاب سبەینێ دەچێت بۆ قوتابخانە."

"نــا، تۆ ناتوانی ئەوەی لەگەڵدا بکەیت!" دەنگم لێبەرزکردەوە. مەهتاب توند قۆڵمی گرت. دەمزانی، دەترسێت لە منی دوورخەنەوە. هەر دووکیشمان دەمانزانی، واژەی "قوتابخانە" لایەنی هەمیشەیی هەیە.

بەڵام مودی لەسەر قسەی خۆی هەر سووربوو. من و مەهتاب بۆ چەند خولەك گفتوگۆمان لەگەڵ کرد، بەڵام هیچ ئاکامێکی نەبوو.

لەکۆتاییدا وتم، "باشە، لە پێشدا دەمەوێت قوتابخانەکە ببینم،" و مودی ڕازیبوو.

هەر دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژە، چووین بۆ بینینی قوتابخانەکە. دەمم داچەقی، کە چاوم بە خانووبەرەیەکی پاکوتەمیزی مۆدێرن کەوت، بە باخێکی جوان، ئاوگەیەکی مەلە و توالێتی شێوازی ئەمریکاییەوە. مودی بۆی باسکردم، کە ئەمە باخچەی منداڵانە[2] و تایبەتییە. هەرکە منداڵ تەمەنی پۆلی یەکەمی سەرەتایی هەبوو، دەبێت بچێتە قوتابخانەی دەوڵەتی. ئەوە دوا ساڵی مەهتاب دەبوو لەو قوتابخانە تایبەتیە و باوکی دەیویست لێرەوە دەستپێبکات، پێش ئەوەی بچێتە ناو هەلومەرجی زۆر سەختتری قوتابخانەی دەوڵەتییەوە.

وام بڕیاردابوو، مەهتاب پۆلی یەکەمی سەرەتایی لە ئەمریکا دەستپێبکات، بەڵام زمانی خۆمم گرت، لەکاتێکدا مودی گفتگۆیدەکرد لەگەڵ بەڕێوەبەری قوتابخانەکە، پرسیارەکانی منی وەردەگێڕا.

"هیچ کەسێك لێرە ئینگلیزی قسەدەکات؟" پرسیارمکرد. "فارسییەکەی مەهتاب زۆر باش نییە."

"بەڵێ،" یەکێك وەڵامیدایەوە. "بەڵام ئێستا لێرە نییە."

مودی ڕوونیکردەوە، کە هەر سبەینێ دەیەوێت مەهتاب بێت بۆ قوتابخانە، بەڵام بەڕێوەبەرەکە وتی، کە شەش مانگ دەبێت لەسەرەدا ڕابوەستێت.

مەهتاب کە گوێی لەمە بوو، لە خۆشی ئەوەی لەم دەردیسەرییە هەنوکەییە ڕزگاریبووە، ئاهێکی هەڵکێشا. بەڵام کە بە پیاسە گەڕاینەوە بۆ ماڵی عەمە بزورگ، مێشکم تەواو لە کاردا بوو. ئەگەر مودی بتوانێت پلانی خۆی بەرێتەپێشەوە، ئەوا سەرەتایەکە بۆ تێکشاندنی من. ئەمە دەبووە هەنگاوێکی گرنگ بەرەو جێخستنی ژیانمان لە ئێراندا. بەڵام لەوانەشە بەردەبازێك بێت بەرەو ڕزگاربوونمان. لەوانەیە هەوڵێکی باش بێت، ڕووکەشێکی ئاساییبوونەوە دروستبکەم. مودی بووبوو بە چاودێریکەرێکی تەواوکاتی هەر هەنگاوێکی من. هیچ هەلێك لە هەلومەرجێکی وادا نەدەهاتەپێشەوە، کە بتوانم هەنگاوێکی پێویست بنێم بەرەو ڕزگاربوونی من و مەهتاب. وردەوردە بۆمدەرکەوت، کە

تەنیا ڕێگای کەمکردنەوەی پاسەوانی مودی بەسەرمانەوە ئەوەیە، بیخەمەسەر ئەو باوەڕەی، کە ڕازیم بەوەی ژیانی ئێرە هەڵبژێرم.

تەواوی ئەو دوانیوەڕۆیە و شەو لە ناو ژووری نوستنەکەدا، کە بووبوو بە ژوورۆچکەی بەندێتیم، کەوتمە تاوتوێکردنی دانانی کۆمەڵە هەوڵێك. مێشکم تەواو پڕ جەنجاڵ بوو، بەڵام هەوڵمدا ژیربێژی خۆم لەدەستنەدەم. دەمزانی لەپێش هەموو شتێکدا دەبێت ئاگاداری تەندروستی خۆم بم. بەهۆی نەخۆشی، خەمۆکی، کەمخۆری و کەمخەوییەوە تاڵاوم دەکێشا و پەنام بۆ دەرمانەکانی مودی دەبرد. ئەمـــــە دەبوو کۆتایی پێبێت.

هەرچی چۆنێك بوو، دەبوو مودی ڕازیبکەم، لە ماڵەکەی عەمە بزورگ دوورمانخاتەوە. تەواوی خێزانەکە لێم بووبوون بە پاسەوان. شەش هەفتە بوو لەوێ دەژییاین، چ عەمە بزورگ چ بابەحاجی هەر دووکیان ڕۆژبەڕۆژ بە چاوێکی سوکتر تەماشایاندەکردم. بابەحاجی وای لێهاتبوو داوای ئەوەی دەکرد، بەشداری نوێژکردنی ڕۆژانەیان بکەم. ئەمە بووبووە مەیدانی کێشەی لەگەڵ مودیدا. مودی باسیکردبوو، کە خەریکی خوێندنەوەی قورئانم و خۆم ئاشنادەکەم بە دینی ئیسلام بە ویستی خۆم. بەڵام نەیدەویست زۆرم بۆ بێنێت بۆ نوێژکردن. کە بیرم لەوە دەکردەوە، دەمبینی مودی بەڕاستی ئاواتەخوازە لە ئێراندا خۆم بگونجێنم.

بێگومان نەیدەویست خێزانەکەی بۆ هەتاهەتایە بەو شێوەیە بژی. بۆ شەش هەفتە دەچوو سێکسمان پێکەوە نەکردبوو. مەهتاب نەیدەتوانی کینەی خۆی بەرامبەری بشارێتەوە. مودی لە مێشکی شێواوی خۆیدا وا خەیاڵیدەکردەوە، کە ڕۆژێك لە ڕۆژان لە ئێراندا، دەتوانین ژیانێکی ئاسایی پێکەوە بنێین. تەنیا ڕێگایەك کە وردەوردە دەستبەرداری ئێشکگرتنی ئێمە بێت، ئەوە بوو بگاتە ئەو باوەڕەی، کە منیش ئەو خولیایەم کەوتۆتە سەردەوە و بڕیارمکەیم قبوولکردووە، کە لە ئێراندا بژیـــــم.

کاتێك کە بیرمدەکردەوە دەبێت چی بکەم، دوودڵییەکی زۆرم تیادا دروستدەبوو. ڕێگای ڕزگاربوون وای دەخوازی، کە ببم بە ئەکتەرێکی بێوێنە. دەبوایە کڵاوێکم بۆ مودی بچنیایە کە بکەوتایەتە ئەو باوەڕەوە، هێشتا خۆشمدەوێت، لەگەڵ ئەوەی ویردی سەر زمانم مردنی ئەو بوو.

هەر لە سبەینێی ئەو ڕۆژەوە، هەوڵەکانی خۆمم خستەگەڕ. بۆ یەکەم جار لەو چەند هەفتەیەدا، دەستێکم هێنا بە قژمدا و مکیاجم بۆ کرد. جلوبەرگێکی جوانم بۆ لەبەرکرد، کراسێکی شینی لۆکەیی پاکستانی قۆڵدرێژ کە دامەنەکەی لۆچلۆچ بوو. مودی یەکسەر سەرنجی ئەم گۆڕانکارییەی دا، کە داوامـلێکرد دەمەوێت قسەت لەگەڵ بکەم، ڕازیبوو. تەنیا پێکەوە چووینە حەوشەکەی پشتەوە نزیکی ئاوگەکە.

"لەو دوایانەدا هەستم بە ئائارامییەکی زۆر کردووە،" دەستمپێکرد. "بێهێزدەبـــم، هەتا وام لێهاتووە ناتوانم ناوی خۆشم بنووسم."

مودی سەری بۆ دەلەقاندم، لەوە دەچوو هاودەردیم بکات.

"ئیتر لەمەودوا دەست بۆ دەرمان نابەم."

مودی پێیباشبوو. وەك ئستیپاتێك[4] لە ڕووی ژیرزانییەوە لەگەڵ ئەوەدا نەبوو دەرمانی زۆر بەکاربهێنرێت. هەروەها خۆی ڕوونیکردەوە، کە لەوەوپێش هەوڵیداوە، لەو هەلومەرجە سەختانەدا یارمەتیمبدات. بەڵام لەوانەیە ئێستا کاتی ئەوە هاتبێت، دەست لە دەرمانخواردن هەڵگرم.

پشت ئەستور بە وەڵامەکانی، پێموت، "هاتومەتە سەر ئەو باوەڕەی، کە ژیانمان لە تاراندا دەبێت و دەمەوێت ژیانی خۆمان دەستپێبکەین. دەمەوێت ژیانی تایبەتی خۆمان لێرە پێکەوە بنێین."

سڵەمینەوەیەك لە ڕووخساری مودیدا دەرکەوت، بەڵام من بەردەوامبووم.

"دەمەوێت ژیانێك بۆ خۆمان پێکەوە بنێم، بەڵام یارمەتی تۆم پێویستە. بەتەنیا ناتوانم بیکەم و لەم ماڵەشدا ناکرێت."

"پێویستە لەسەرت،" مودی دەنگی تۆزێك لێبەرزکردەوە. "عەمە بزورگ خوشکمە. پێویستە ڕێزیلێبگرم."

"ناتوانم بەرگەیبگرم،" وتم. فرمێسك بە ڕوومەتمدا هاتەخوارەوە و لەپڕ ڕق و توڕەیی کەوتە قسەکانمەوە. "ڕقم لێیەتی. پیس و پۆخڵە. هەر جارێك دەچێتە چێشتخانەکە، یەکێك بەسەر مەنجەڵە چێشتەکانەوەیە لەسەر تەباخەکە، دەیخوات و پاشماوەی دەمی دەکاتەوە ناوی. چا دەهێنن، بەبێ ئەوەی پیاڵەکانیان شتبێت، خواردنەکە مێشولەی تیادایە، برنجەکە پڕیەتی لە کرم و ماڵەکە بۆگەنی لێدێت. ئایا دەتەوێت ئاوا بژین؟"

لەگەڵ ئەوەی پلانەکەم باش چنیبوو، بەڵام هەڵەمکرد، بوومە هۆی توڕەکردنی مودی. "دەبێت لێرە بژین،" بە توڕەییەوە وتی.

تا نزیکی نیوەڕۆ شەڕەدەنوکمان بوو. هەوڵمـــدا دان بە کەموکوڕییەکانی ماڵەکەی عەمە بزورگدا بنێت، بەڵام کەللەشەقانە پشتی خوشکەکەی بەرنەدا.

لەکۆتاییدا، کە بینیم پلانەکەم ناچێتەپێشەوە، هەوڵمدا بێمەوە سەرخۆم و بە بینینی دەوری هاوسەرێکی ملکەچ، دەستمدایەوە پێشڕەوی. دامێنی کراسەکەمم بۆ بەرزکردەوە و فرمێسکەکانمم پێسڕی. "تـکاتــلێدەکەم،" دەستبەدامێنیــبووم، "دەمەوێت دڵخۆشتــبکەم. دەمەوێت مەهتاب دڵشادبکەم. تکاتــلێدەکەم شتێك بکە بۆ یارمەتیدانی من. دەبێت لەم ماڵە بمبەیتە دەرەوە، ئەگەر دەتەوێت ژیانێکی تازە دەستپێبکەین و لە تاراندا بتوانین بژین."

وەڵامی مودی نەرمتر بوو. دەیزانی من ڕاست دەڵێم، بەڵام نەیدەزانی چۆن دڵی من و خوشکەکەی ڕاگرێت. "ئێمە هیچ شوێنێکمان نییە بۆی بچین،" مودی وتی.

خۆم بۆ ئەم وەڵامە ئامادەکردبوو. "لە ڕەزا بپرسە، بزانە ئێمە دەتوانین بچینە ماڵەکەی ئەوانەوە."

"تۆ حەز لە چارەی ڕەزا ناکەیت."

"نا، وا نییـــە. لەوەتەی هاتوومەتە ئێران، لەگەڵم ڕووی خۆشە. هەروەها ئیساش."

"چاکە،" مودی وتی، "بەڵام دڵنیا نییم، ئەمە دەبێت."

"بەڵام ئەو تائێستا چەند جار داوایلێکردوین، سەردانیبکەین،" ئاماژەمـــپێکرد.

"ئەوە *تەعاروفە*. لە ڕاستیدا مەبەستی نییە." *تەعاروف*، وشەیەکە لە گفتوگۆی ئێرانییەکاندا دێت بۆ ڕێزنواندن، نەك بە مەبەستی ئەنجامدانی کردەوەیەك.

"باشە، تۆش ئەم *تەعاروفە* بکە بە ماڵ بەسەریەوە." وتم.

بۆ چەند ڕۆژ ئەم بابەتەم لە مودیم دووبارەکردەوە. هاوکات مودی دەیبینی، هەوڵدەدەم زیاتر دۆستانە بم لەگەڵ خێزانەکە. لە ڕاستیدا باری دەروونیم زۆر بوژابۆوە، لەوەتەی دەستم لە دەرمانەکانی مودی هەڵگرتبوو، هەروەها گوڕم دابووە خۆم، کە بچمە ژێر باری ئەم ئەرکە ترسناکەوە. تا ڕۆژێکیان مودی پێیوتم، ڕەزا ئەم ئێوارێیە سەردەدات و ڕێگایدام، کە ئەم بابەتەی لەگەڵ بکەمەوە.

"بەدڵنیاییەوە دەتوانن بێـن،" ڕەزا وتی. "بەڵام ئەم ئێوارێیە نـا. ئیمشەو ئێمە بۆ شوێنێکی تر دەچین." *تەعاروف*.

"ئەی باشە سبەینێ؟" وازملێنەدەهێنا.

"بێگومان. ئوتومبێلێك قەرزدەکەم، دێم و هەڵتاندەگرم." *تەعاروف*.

مودی ڕێگایدام، تۆزێك شت کۆکەمەوە لەو کەمە جلوبەرگەی هەمان بوو. لەگەڵ ئەوەی ڕەزام فورس بوو لەلای عەمە بزورگ، بەڵام تەواو بریندارببوو، کە بینی بەنیازین بڕۆین. بە بەجێهێشتنی زۆربەی زۆری شتومەکەکانمان لە ماڵەکەدا، مودی دەویست پیشانیبدات، کە چوونمان بۆ ماڵی ڕەزا و ئیسا بۆ ماوەیەکی کورت دەبێت. بەڵام تەواوی ئەو ڕۆژە مودی هەوڵیدا، ڕووگرژی خوشکەکەی بەسەرخۆی نەهێنێت.

تا کاژێری دەی ئەو شەوە، ڕەزا نەهات بمانبات بۆ ماڵی خۆیان، لەبەرئەوە پێمداگرت لەسەرئەوەی مودی ڕێگامبدات، تەلەفونی بۆ بکەم. بەسەر سەرمەوە ڕاوەستابوو کە ژمارەکەم لێدەدا. "ئێمە چاوەڕوانی تۆ دەکەین،" بە ڕەزام وت. "نایەیت بمانـــبەیت."

"ئۆی، باشە، کارم بۆ هاتەپێشەوە،" ڕەزا وتی. "سبەینێ دێم." *تەعاروف*.

"نـــا، ناتوانم چاوەڕێبم تا سبەینێ. تکاتلێدەکەم، ئایا دەتوانین ئیمشەو بێین؟"

لەکۆتاییدا ڕەزا بۆیدەرکەوت، کە تەعاروفەکانی بووە بە ڕاست. "چاکە، ئێستا وا دێم،" وتی.

وام دانابوو، هەرکە ڕەزا گەیشت دەرپەڕمە دەرەوە، بەڵام ئەو سووربوو لەسەرئەوەی وچانێکـــبدات. جلەکانی داکەن و بیجامەی لەبەرکرد، چای خواردەوە، میوەی خوارد و لەگەڵ عەمە بزورگی دایکیدا سەری قسەی دامەزراند ئەوسەری دیارنەبوو. ئینجا بەزموڕەزمی ماڵئاوایی، ماچکردن، باوەش بەیەکتریدا کردن و ئینجا قسەکردن، کاژێرێکی تەواوی خایەند.

نیوەشەومان تێپەڕاندبوو، کە ماڵمان جێهێشت و بە چەند خولەك ئوتومبیل لێخوڕین بەرەو باشوور، گەیشتینە خانوویەکی دوو نهۆمی لە کۆڵانێکی بچوکدا، کە خانووی ڕەزا و ماملی برای بوو. ڕەزا و نیسا لەگەڵ مریەم، کچە تەمەن سێ ساڵەکەیان و مەهدی، کوڕە تەمەن چوار مانگەکەیان لە نهۆمی خوارەوە دەژیان. مامل و نەسرینی ژنی لەگەڵ ئەمیری کوڕیان لە نهۆمی سەرەوە.

کە گەیشتین، نیسا لە گەرمەی ماڵپاککردنەوەدا بوو. ئینجا تێگەیشتم، کە بۆچی ڕەزا زۆر لەماڵی دایکی مایەوە، چونکو ئەومیان لەبەرچاو نەگرتبوو کە میوانیان دێت، هەموو فەرمووەکانیان بە *تەعاروف* لەقەڵەمدابوو. لەگەڵ ئەوەشدا، نیسا پێشوازییەکی گەرمی لێکردین.

شەو زۆر درەنگ بوو، یەکسەر چووم بۆ ژووری نوستنەکەمان و جلی شەوم لەبەرکرد. پارە و دەفتەری ئەدرێسەکەمم لەژێر جێگاکەدا شاردەوە. پاش ئەوەی کە مەهتابم لە باوەشگرت و نواندم، خۆم ئامادەکرد بۆ هەنگاوی دووەمی پلانەکەم.

مودیم بانگکرد بۆ ژووری نوستنەکە و بەهێواشی دەستم هێنا بە قژڵیدا. "تۆم خۆشدەوێت، لەبەرئەوەی ئێمەت هێنا بۆ ئێرە،" پێموت.

بەئارامی باوەشیپیاکردم، بەهیوای هاندانی من. شەش هەفتە تێپەڕیبوو سێکسمان نەکردبوو. خۆم خزاندە باوەشییەوە و سەرم بەرزکردەوە بۆ ماچ.

لەو چەند خولەکەدا، هەموو هێزمدایە خۆم بۆئەوەی نەڕشێمەوە، بەڵام هەرچی چۆنێك بوو، توانیم خۆم وا پیشانبدەم، کە خۆشیم بینیوە. لە ماوەی ئەو کارە قێزهێنەرەدا، لە دڵی خۆمدا هاواردەکرد، قێزم لێت دەبێتەوە! قێزم لێت دەبێتەوە! قێزم لێت دەبێتەوە!

بەڵام کە تەواوبوو، بە گوێیدا چرپاندم، "تۆم خۆشدەوێت."

*تەعاروف!!!*

تێبینییەکان:

1. مەسجید، وشەیەکی فارسی و عەرەبییە، بە واتای مزگەوت دێت.
2. باخچەی منداڵان: preschool.
3. تەعاروف: وشەیەکی فارسییە بە واتای 'مجاملە'ی عەرەبی دێت.
4. osteopath: ئەو کەسەیە، کە لە ڕێگای شێلانەوە چارەسەری ئازاری ئەخۆش دەکات، نەك بە دانی دەرمان.

# 6

سبەینێ بەیانی زوو مودی لە خەو هەڵسا و چووە حەمامەکە و ناوی کرد بەخۆیدا، بەپێی یاسای ئیسلامی، ئینسان دەبێت پێش نوێژکردن وسڵی خۆی دەرکات. شڵپوهوڕی ئاو، نیشانەیەك بوو بۆ ڕەزا و ئیسا لە نهۆمی خوارەوە و مامل و نەسرین لە نهۆمی سەرەوە، کە من و مودی ئیمشەو خۆشمان بردۆتەسەر.

بێگومان ئەوە لە ڕاستییەوە دووربوو. سێکسکردن لەگەڵ مودی، یەکێك بوو لەو ئەزمونە ناخۆشانەی کە دەبوو تێیپەڕێنم لەپێناوی ڕزگاریدا.

هەر یەکەم بەیانی لە ماڵی ڕەزا و ئیسا، مەهتاب کەوتە یاریکردن لەگەڵ مریەمی تەمەن سێ ساڵە و ئەو کۆمەڵە بوکەشوشە جوانانەی، کە خاڵی لە بەریتانیاوە بۆی ناردبوو. مریەم هەتا لە حەوشەکەی پشتیانەوە جۆلانەیەکی هەبوو. حەوشەکە دوورگەیەی بچوکی ئارام بوو، لە ناوەڕاستی شارێکی پڕ غەڵبەغەڵبی قەرەباڵغدا، بە دیوارێکی خشتی سێ مەتری بەرز چواردەوری گیرابوو. ئەم دیوارە نەك هەر جۆلانەکە، بەڵکو دارکاژ و هەنار و چەند بنە گوڵەباخیشی دەوردابوو. دارمێوێك بە دیوارەکەدا سەرکەوتبوو.

خانووەکە لە ناوەڕاستی یەك ڕیزە خانووی وەك خۆی دڵتەنگدا بوو، دیوارێك دەوری هەموویانی پێکەوە دابوو. هەموو خانووەکان وەك یەك ڕوبەر و شێوە و حەوشەی سەربەخۆی خۆی هەبوو. لەپشت ئەم ڕیزە خانووەوە ڕیزێکی تر بە هەمان شێوە دروستکرابوو.

لە زۆر ڕووەوە ماڵدارییەکەی ئیسا زۆر باشتر بوو لەوەی عەمە بزورگ، بەڵام تەنیا وەك بەراوردێك. هەرچەند ئیسا شەوی پێشووی تەرخانکردبوو بۆ ماڵ پاککردنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا لەچاو پێوانەی ئەمریکادا هێشتا هەر پیس بوو. سیسرك بەناو ماڵەکەدا فرکەفرکیان بوو. هەرکاتێك بمانویستایە بچینە دەرەوە، لەپێشدا پێڵاوەکانمان دەتەکاند، نەوەکو مێشولە یان شتێکی تری تیادا بێت، ئینجا لەپێماندەکرد. ئەم شێواوییە لە ناوماڵدا، بۆگەنی میزیشی هاتبووەسەر، چونکو ئیسا مەهدی کوڕە منداڵەکەی هەروا بێدایبی بەو ناوەدا بەرەڵاکردبوو، ئەویش لە هەر شوێنێك پێیخۆشبوایە خۆی بەتاڵدەکردەوە. ئیساش دەستوبرد پیساییەکەی پاکدەکردەوە، بەڵام میزەکەی هەروا بە فەرشەکەدا دەچووە خوارەوە.

لەوەدەچوو هەر ئەم بۆگەنە مودیشی کاسکردبێت، هەرچەند دانی پیادا نەدەنا. مودی ئەو یەکەم بەیانییە مریەم، مەهتاب و منی برد بۆ پیاسە بۆ پارکێکی نزیك، کە لەولا چەند ڕیز خانووی تردەوە بوو. توڕە و لە حاڵەتی ئامادەباشدا بوو، کاتێك کە پێمان نایە ئەودیو دەرگای حەوشێوە، بۆ سەر لاکۆڵانێکی تەسك، کە دەچووەوە سەر کۆڵانێ نێوان دوو

ڕیزە خانووەکانەوە. مودی سەیرێکی دەوروپشتی خۆیی کرد، بۆئەوەی دڵنیابێت لە ژێرچاودێریدا نیین.

هەوڵمدا پشتگوێیبخەم و خەریکی پشکنینی دەوروبەری هەوارگەی تازەی خۆم بم. ئەم دوو ڕیزە خانووە سەربان تەختانە کە پشتی باخەکانیان پێکەوە نوسابوون، بە باری درێژیدا دووبارە دەبوونەوە هەتا چاو بڕکات. سەدەها و بگرە هەزارەها کەس تێکدەترنجانە ناو ئەم کۆمەڵە ڕیزە خانووانەوە، کۆڵانە بچوکەکانیان پڕدەکرد لە چالاکی و دەنگەدەنگ.

ڕۆژانی هەتاو و ڕووناکی کۆتایی مانگی ئەیلول، هەواڵی وەرزی پایزی پێبوو. کە گەیشتینە پارکەکە هەستمان بە ئاسودەییەکی خۆش کرد، لەچاو ئەو دڵتەنگییەی ناو ڕیزە خانووەکاندا. پارکێکی پڕ چیمەن، کە ڕووبەرەکەی سێ بەرابەری ڕیزە خانوویەك دەبوو، گوڵی جوانی تیادا چێنرابوو، دارەکانی خزمەتکرابوون. چەند فوارەی ئاوی تیادا بوو، بەڵام لەکارخرابوون، چونکو کارەبا بەشی ماڵەکانی نەدەکرد و دەوڵەتیش وزەی بەفیڕۆنەدەدا بۆ پەمپی ئاوێك کە بۆ خواردنەوە نابێت.

مەهتاب و مریەم بەخۆشییەوە خلیسکێنەیاندەکرد و سواری جۆلانە دەبوون، بەڵام ماوەیەکی کەمی خایاند، کە مودی بێئارامانە وتی، دەبێت بگەڕێینەوە.

"بۆچی؟" پرسیارملێکرد. "ئێرە زۆر خۆشترە."

"دەبێت بگەڕێینەوە،" بەڕەقییەوە وەڵامیدامەوە.

لەبەرئەوەی شتێکی ترم لەسەردا بوو، بێدەنگانە ملمـدا. دەمویست بە هەموو نرخێك تەنگەژە دروستنەبێت.

بە چەند ڕۆژ خۆم سازاند لەگەڵ بۆگەنی ناوماڵ و دەنگ و هەرای دەرەوەی ماڵ. هەموو ڕۆژێك هاواری فرۆشیارانی گەڕۆك لە پەنجەرە کراوەکانەوە خۆیان دەکرد بە ژووردا.

"*ئەشغال! ئەشغال! ئەشغال!*" پاشەڕۆ کۆکەرەوەیەك هاواریدەکرد، کاتێك بەخۆیی و گالیسکە دوو تاییە جیکەجیککەرەکەیەوە نزیکدەبۆوە و بەناو جادەی پڕ کەستەکدا، بە جوتێ پێڵاوی شڕی بندڕاوەوە هەنگاوی دەنا. ژنانی گەڕەك بەهەڵەداوان پاشەڕۆکانیان لەسەر شۆستەکە دادەنا. هەندێك جار، پاش بردنی پاشەڕۆکان، پیاوەکە بە خۆیی و گسکێکەوە، کە خۆی دروستیکردبوو لە کۆمەڵە شووڵێك، توند بەستبووی بە دارێکەوە، دەگەڕایەوە و دەکەوتە گسکدانی ئەو پاشەڕۆیانەی کە مشك و پشیلە لە پاشەڕۆی ماڵەکانەوە دەریان هێنابوو. بەڵام لەجیاتی ئەوەی ئەم پاشەڕۆ بۆگەنکردووانە کۆکاتەوە و بیبات، ڕێك گسکیدەدا بۆ ناو جۆگەلەی قەراخ شەقامەکە، کە لەوەدەچوو کەس پاکی نەکاتەوە.

"*نەمەکی!*" خوێ فرۆشێك هاواریدەکرد و پاڵیدەنا بە گالیسکەکەیەوە، کە باریکرابوو لە خوێی تەڕی کلۆکلۆ. ژنانی ماڵەکان کە گوێیان لە دەنگی دەبوو، بە خۆیان

وردەنانەکەیانەوە لێیکۆدەبوونەوە و دەیانگۆڕییەوە بە خوێ، ئەویش لە لایەن خۆیەوە وەك خواردنی مەڕومالآت دەیفرۆشتەوە.

"*سەبزی*" سەوزە فرۆشێك هاواریدەکرد، بە خۆیی و پیکاپێکی بچوکەوە بەهێواشی بەناو کۆڵانەکاندا دەڕۆیشت. پیکاپەکەی پڕکردبوو لە سەوزەی وەك سپێناخ، کەرەوز، پاقلە و لەگەڵ سەوزەی تری ئەو وەرزە. هەندێك جار بڵندگۆی بەکاردەهێنا بۆ ئاگاردارکردنەوەی ماڵەکان. ئەگەر لە پڕێکدا بهاتایە، ئیسا پێش ئەوەی دەرپەڕێتە دەرەوە، دەبوو عەباکەی لەخۆیەوە بپێچێت و ئینجا بچێت بۆ کڕینی سەوزە، کە بە تەرازو دەکێشرا.

بە دەنگی شەقەی قایشدا، دەمانزانی جامبازە هاتووە، کە بەکاری دەهێنا بۆ ترساندنی مەڕەکانی. هەموو جارێك ئەم پیاوە بە ناو شەقامەکەدا دە دوانزە مەڕی دەدایە پێش خۆی، کە دوگە شۆڕەکانیان وەك کلکی مانگا ئەملاو ئەولای دەکرد. زۆر جار ئەم مەڕانە بە ڕەنگێك نیشانەکرابوون بۆئەوەی دیاربن بۆ خاوەنەکەی. ئەم پیاوە زیاتر فرۆشیار بوو.

ناوبەناو پیاوێکی جلوبەرگ دڕاوی پاسکیلسوار دەردەکەوت، بۆ تیژکردنەوەی چەقۆ.

ئیسا بۆی باسکردم، کە هەموو ئەم پیاوانە تەواو هەژارن، پێدەچوو لە خانووچکەیەکدا بژین کە بەدەستی خۆیان دروستیانکردبێت. ژنەکانیشیان ئەو سواڵکەرە ئەگبەتانەن، کە لە دەرگای ماڵان دەدەن و دەپاڕێنەوە بۆ ڕیاڵێك یان خواردنێك کە ماوەتەوە. ئەم ژنانە عەبا شڕەکانیان توند لە خۆیانەوە دەپێچا، تەنیا چاوێکیان دەهێشتەوە و دەپاڕانەوە بۆ یارمەتی. ئیسا بێبەشی نەدەکردن، هەمیشە شتێکی هەڵگرتبوو کە بیانداتێ. بەڵام ئەسرینی ژنی مامل، تەنانەت وەڵامی بێچارەترین سواڵکەری نەدەدایەوە.

ناکامی هەموو ئەمانە، سیمفۆنیایەکی نامۆ بوو لە بێدەرەتانانی کۆمەڵگا، کە تیایدا ژنان و پیاوان هەموو هەوڵ و کۆششیان بووبوو بەوە کە لە برساندا نەمرن.

من و ئیسا یەکتریمان بەدڵ بوو، هەر وەك دوو کەس کە لە هەلومەرجێکی نامۆدا توشی یەکتر دەبن. لێرە هیچ نەبێت، دەمتوانی لەگەڵ هەموو کەس قسەبکەم. مایەی ناسودەیییە لە ماڵێکدا بیت، هەموو بتوانن بە ئینگلیز بدوێن. بەپێچەوانەی عەمە بزورگەوە، ئیسا ئەوەی بە هەند وەردەگرت، کە لە کاری ناوماڵدا یارمەتیبدەم.

ئیسا لە ماڵداریدا چەند دەستبڵاو بوو، ئەوەندەش لە خواردن دروستکردندا لێهاتوو. هەر جارێك یارمەتیمدابێت بۆ دروستکردنی نانی ئێوارە، کەوتوومەتە ژێر کاریگەری ڕێکوپێکی وردی ناو فریزەرەکەیەوە، کە لەوەوپێش شتی وام نەبینیبوو. گۆشت و سەوزەی پاکراو، وردکراو و ئامادە بۆ بەکارهێنان، لە ناو زەرفی پلاستیکی خۆیاندا بوون و بەجیا هەڵدەگیرێن. لیستی خواردنی ڕۆژانەی خۆی هەبوو، کە لە سەرەتای هەر مانگێکەوە پێویستییەکانی ئامادەدەکرا. بەلانسێك لە ژەمەخواردنەکاندا هەبوو، وە لە ئامادەکردنیدا تەواو چاودێری بنەمای پاکوتەمیزی دەکرد. کاژێرها پێکەوە دادەنیشتین و بەوردی برنجمان لە مێشولە بژاردەکرد، پێش ئەوەی بیکەین بە چێشت.

شتێکی چەند نامۆ بوو، بە پاککردنەوەی خواردنەکەم لە مێشولە، گەشە دەبووم! لە ماوەی دوو مانگدا پێشترێنتییەکانم بە تەواوەتی گۆڕا. بۆم دەرکەوت، کە چۆن شێوەی ژیانی ئەمریکایی دڵی ئاسککردووم، کە هەتا شتی زۆر بچوکش نیگەرانمبکات. لێرە هەموو شتێك جیاواز بوو. خۆم فێری ئەوە کرد، کە دەبێت ڕێگەنەدەم وردەکاری ڕۆژانە سایە بخاتەسەر ئەرکە گەورەکانم. ئەگەر منداڵ میزدەکات بەخۆیدا لەسەر فەرشەکە، بیسڕە. ئەگەر مێردەکەت دەیەوێت زوو پارکەکە جێبهێڵێت، تۆش زوو جێیـــبهێڵە.

زوهرە عەمە بزورگی بە ئوتومبیل هێنا بۆ سەردانمان. لەگەڵ خۆیدا سەرینێکی بە دیاری هێنا، کە مودی نیگەرانکرد. مودی بۆی ڕوونکردمەوە، کە دیاری دان بە میوان کاتێك ماڵی خانەخوێکەی جێدەهێڵێت، نەریتێکە واتای خۆی هەیە. واتاکـــە ڕۆشن بوو. عەمە بزورگ سەردانی ئێمەی بۆ ماڵی ڕەزا و ئیسا بەکاتی لێکنەدەدایەوە، پێیوابوو بێڕێزی پێکراوە، کە گوایە میوانداریەکەیمان ڕەتکردۆتەوە.

بواری گفتوگۆ لەسەر ئەم بابەتە نەبوو. زوهرە ئامادە نەبوو چاش بخواتەوە، بەوەی کە، "بەپەلەمین دەبێت بڕۆین، چونکو دایکم دەبەم بۆ حەمام."

"کاتی هاتووە،" مودی منگەی لێوەهات. "پاش هەشت هەفتە لە هاتنی ئێمە، ئەوە یەکەمین جاریەتی دەچێت بۆ حەمام."

هەر ئەو ئێوارێیە زوهرە تەلەفونیکرد. "*دایی جون* تکاتـــلێدەکەم وەرە، دایکم نەخۆشە،" بە مودی وت.

ڕەزا چەند ڕیزخانوو ڕۆیشت، تا ئوتومبیلەکەی فەرەحی خۆشکی قەرزبکات و ئەوسا گەڕایەوە و مودی هەڵگرت، کە شانازی بەخۆیەوە دەکرد وەك پزیشکێك سەردانیدەکات.

بەڵام شەو درەنگ بە کۆڵێك گلەییەوە گەڕایەوە لەسەر خوشکەکەی. گەروگرفتی حەمام عەمە بزورگی تەواو هیلاك و ماندوو کردبوو، گەڕابۆوە ماڵەوە یەکسەر بۆ ناو جێگا و لەبەر ئازاری ئێسقانەکانی خۆی لەسەرڤنگ پێڕانەدەگەڕا. داوای لە زوهرە کردبوو، کە خەنەی بۆ بگرێتەوە و وەك دەرمان لە ناوچەوان و دەستوپلی هەڵسوێت.

کە مودی دەگاتە ئەوێ، دەبینێت عەمە بزورگ لە جێگادا کەوتووە، چەند دەست جلی لەبەرکردووە و هەرچی بەتانی ماڵەکە هەیە، داوییەتی بە خۆیدا تا عارەقبکاتەوە و لافاوی ئەم عارەقە شەیتان ڕامالێت لە لەشیدا. ئازارەکەی بۆ مودی جێگەی گومان بوو.

"لەڕاستیدا نەخۆش نەبوو،" مودی منگەی لێوەهات. "دەیەوێت ئەو حەشاماتە تێبگەیەنێت، کە عەمە بزورگ حەمامی کردووە."

هاوڕێیەتی ڕەزا بەرامبەر بە من، جێگای سەرسامی بوو. کاتێك لە کۆڕپوس کریستی لە ماڵەکەمان کردمە دەرەوە، جۆرەها ناوناتۆرەی لێنام. بەڵام لەوەدەچوو، ئەو گرژییەی

نێوانمانی بیرچۆبێتەوە و تەنیا یادگارییە خۆشەکانی ئەمریکای لە خەیاڵدا مابێت، هەرچەند لایەنگری شۆڕشی ئێران بوو.

ئێوارنیەکیان ڕەزا هەوڵیدا بەیادی ژیانی ڕابوردوومان لە ئەمریکا، بمانبات بۆ خواردنی پیزا. من و مەهتاب تامەزرۆی بووین و برسیشمان بوو، بەڵام ئەو ئارەزووەمان نەما، کە پیزاکەیان لەبەردەماندا دانا. نانەکەی *لەواش* بوو، کە نانێکی تەنکی وشکە لە ئێراندا زۆر دەخورێت. چەند کەوچکێک دۆشاوی تەماتە و هەندێک قاشە گۆشتی مەڕیان بەسەریدا بڵاوکردبۆوە. هەواڵێك لە پەنیر نەبوو. زۆر بێتام بوو، بەڵام چەندمان توانی خواردمان و زۆر سوپاسی ڕەزاشم کرد بۆ دەعوەتەکەی.

خوشکەزاکەی مودی خۆشی دەبینی لە بەخشندەیی خۆی و شانازی بەوەوە دەکرد، کە کەلتوری ڕۆژئاوایی بۆ گرنگە. لەپاش نانی ئێوارە پێشنیارێکی کرد، کە کۆمەك بوو بە پلانەکەم. "حەزدەکەم نیسا فێری دروستکردنی خواردنی ئەمریکایی بکەیت،" ڕەزا وتی.

بۆئەوەی نیسا فێری لێنانی کوتکە گۆشتی گەورە و پەتاتەی شێلراو بکرێت، هاتوچۆیەکی زۆری ناو بازاڕی پێویستبوو، بەدوای کڕینی پێکهێنەرەکانی ئەو جۆرە خواردنانەدا. بەخۆشییەوە ئامادەیی خۆمم دەربڕی، پێش ئەوەی مودی فریابکەوێت بەرهەڵستی بکات. بۆ چەند ڕۆژ مودی ناچاربوو، لەو هاتوچۆ دوورودرێژانە بۆ بازاڕی جۆراوجۆر، پاسەوانی من و نیسا بێت. بەردەوام ئاگاداری خۆم بووم، کە بە ڕێگاوبانی شارەکە شارەزابــم. فێربووم چۆن تەکسی "پرتەقاڵی" بگرم، کە زۆر زیاتر لە تەکسی تەلەفون هەرزانتر و ئاسانتر بەدەستدەهات. شۆفێری تەکسی پرتەقاڵی کەسێك بوو، کە ئوتومبیلی خۆی هەبوو، لەبەرامبەر چەند ڕیاڵێکدا، لە شەقامە سەرەکییەکاندا، بە دەرزەن یان ئوتوبیلەکەی چەندی بگرتایە، خەڵکی دەگەیاند. تەکسی پرتەقاڵی هەر وەکو پاس، کەم تا زۆر شەقامی تایبەتی خۆیی هەبوو.

لەم هاتوچۆیانەدا، بوونی مودی بار بوو بەسەرمانەوە. هیواداربـــووم، سەرئەنجام کۆڵبدات و وازمان لێبێنێت، من و نیسا خۆمان بڕۆین. تا ئەو ئاستەی ڕێگابدات، من و مەهتاب خۆمان بڕۆین. ئەمە دەبووە ئەوەی هەلێکم بۆ بڕەخسێت، پەیوەندیبکەم بە باڵوێزخانەوە و ببینم هێلین هیچ نامەیەکی منی بۆ هاتووە، یان بزانم وەزارەتی دەرەوە توانیوێتی شتێك بکات بۆ یارمەتیدانم.

مودی خۆی هەر تەمەڵ بوو. دەمزانی، ئەگەر وردەوردە بیهێنمە سەر ئەو باوەڕەی، کە خەریکە لەگەڵ ژیانی تاران خۆم ڕادەهێنم، ئیتر بۆی دەردەکەوێت، کە پێویست ناکات زۆر لە خۆی بکات، بۆ کاری "ژنانە" دوامان بکەوێت.

لەکۆتایی هەفتەی دووەمی پاش هاتنمان بۆ ماڵی ڕەزا و نیسا، سەیرمکرد کات بۆ خۆم ئەماوەتەوە. ڕۆژبەڕۆژ لە ڕەفتاری خانەخوێکەماندا دەردەکەوت، کە بەدەستمانەوە هیلاکن. مریەم منداڵێکی خۆپەرست بوو، حەزینەدەکرد مەهتاب بە بوکەشوشەکانی یاریبکات. نیسا هەوڵیدەدا هەروا گەرم بێت لەگەڵمان، بەڵام دەمبینی مانەوەمان لە

خانوویەکی وا بچوکدا خۆش نەبوو. ڕەزاش هەوڵیدەدا هەر دۆستانە بێت، بەڵام کە دەگەڕایەوە، پاش ڕۆژێکی درێژی کارکردن وەك ژمێریاری بابەحاجی بۆ کاری هێنان ناردن، دەمبینی چەند بێزارە لە تەمەڵی مودی. هەلومەرجەکە پێچەوانە بووبۆوە. لە ئەمریکا خۆشنوودبوو لەسەر ورگی مودی بژی. بەڵام لێرە، پێیخۆش نەبوو یارمەتی *دایی جون* بدات. هەموو فەرمو فەرمودکانیان لە کۆتاییدا بوو بە *تەعاروف*.

مودیش توڕەبوو لە ڕەزا کە شتی بیرچۆتەوە، بەڵام دەیویست لەناو خێزانەکەدا شکۆیی خۆی ڕاگرێت و ئامادەنەبوو بەهەر نرخێك بێت بمێنێتەوە، لەبەرئەوە بڕیاریدا پاشەکشێ بکات. "ئێمە ناتوانین لێرە بمێنینەوە،" پێیوتم. "تەنیا بۆ ماوەیەکی کورت هاتین بۆ ئێرە، تا تۆ باشبیتەوە. دەبێت بگەڕێینەوە. نامەوێت هەستی خوشکەکەم بریندار بکەم."

ترس هەموو گیانمی داگرت. لە مودی پاڕامەوە، نەمباتەوە بۆ بەندیخانە ترسناکەکەی عەمە بزورگ، ماڵە ناخۆشەکەی. بەڵام مودی لەسەر قسەی خۆی سووربوو. مەهتابیش وەك من، بەم هەواڵە تێکچوو. سەرەڕای ئەوەی لەگەڵ مریەم ناکۆك بوو، بەڵام ئەم ماڵەی زۆر پێباشتر بوو. ئەو ئێوارێیە پێکەوە لە حەمامەکە ویردمان خوێند، کە خوا بەهانامانەوە بێت.

بۆم ڕوونەبۆوە، کە مودی پەرێشانی بە دەموچاوی ئێمەوە بینیوە و لەو پەیوەندەدا گفتگۆی بووە، وا مامل و نەسرین لە نهۆمی سەرەوە هاتنەخوارەوە بۆ پێشنیاری سازانێکی تازە لەگەڵ ئێمە. سەرسامبووم، کە بینیم نەسرین بە ئینگلیزییەکی ڕەوان دەدوێت - شتێك کە تا ئەو ساتە شاراوە بوو بۆ من.

"مامل تەواوی ڕۆژ لەسەر کارە و من لە پاش نیوەڕوان دەچم بۆ زانکۆ،" نەسرین باسیکرد. "پێویستمان بە یەکێکە چاودێری منداڵەکەمان بکات."

مەهتاب لە خۆشیاندا قیژاندی. ئەمیری کوڕە یەك ساڵەکەیان، منداڵێکی دڵشادی زیرەك بوو، مەهتاب پێی خۆشبوو یاری لەگەڵدا بکات. لەوەش واوەتر، دایبییان پێهەڵدەگرت.

لە ئەمریکا ڕقم زیاتر لە مامل بوو تا ڕەزا، نەسرینیش تەواوی ئەو ماوەیەی کە هاتبوومە ئێرانەوە، منی پشتگوێخستبوو. لەگەڵ ئەوانەشدا، مانەوەمان لە ماڵەکەیان لە نهۆمی سەرەوە، زۆر لام پەسەندتر بوو لەوەی بگەڕێینەوە بۆ ماڵی عەمە بزورگ، هەروەها ئەم پێشنیارە *تەعاروف* نەبوو. دەیانویست و پێویستییان بە ئێمە بوو، لەگەڵیاندا بژین. مودی ڕازیبوو، بەڵام بۆ جارێکی تر ئاگاداریکردینەوە، کە مانەوەکەمان کاتییە و ڕۆژێك هەر دەگەڕێینەوە بۆ ماڵی خوشکەکەی.

کەلوپەلێکی کەممان لەگەڵ خۆمان هێنابوو، بارمان سوك بوو، یەکسەر چووینە سەرەوە.

که خۆمان دامەزراند لەسەرەوە، نەسرینم بینی، قوتولکەیەکی بەدەستەوەیە و دوکەڵی سوتاندنی تۆوی ڕەشی لێبەرزدەبێتەوە و بەدەوری سەری کوڕەکەیدا دەیگێڕێت، بە مەبەستی بەدوورگرتنی منداڵەکەی لەچاوی شەیتان و خەو بچێتەچاوی. لەو بڕوایەدابووم، چیرۆکێکی کاتی نوستن و پەرداخێك شیری گەرم زۆر پەسەندتر دەبوو، بەڵام زمانی خۆمم گرت و ورتەم لە دەم نەهاتەدەردەوە.

خانەخوێی تازەمان ژووری نوستنەکەیان تەرخانکرد بۆ ئێمە، چونکو خۆیان پێیانخۆشبوو لەسەر ناوفەرشی ژوورێکی تر بنون تا لەسەر سیسەمێکی دوونەفەری. لەڕاستیدا وا دەردەکەوت، کە مۆبیلەی ناوماڵەکەیان بۆ گرنگ نەبێت. لە ژووری نانخواردنەکەیان مێزێکی گەورە و دەرزەنێك کورسی دانرابوو، لە ژووری دانیشتنەکەیان تاقمێك مۆبیلەی مۆدێرنی قوماشی شین هەبوو. بەڵام ئەم ئەریتەیان، کە پاشماوەی کاریگەری ڕۆژئاواییانەی شا بوو، تەواو پشتگوێخستبوو، دەرگای ئەو ژوورانەیان داخستبوو، پێیان پەسەندتر بوو لەسەر ناوفەرشی هۆڵەکەیان نان بخۆن و گفتوگۆبکەن، کە بە فەرشی ئێرانی ڕازابۆوە، هەروەها لە هۆڵەکەدا تەلەفونێك و تەلەفیزیۆنێکی ڕەنگی جۆری ئەڵمانی تیدا بوو.

نەسرین ماڵەکەی پاکتر لە ئیسا ڕاگرتبوو، بەڵام زوو تێگەیشتم، کە زۆر دەستەپاچەیە لە خواردن دروستکردندا، نە دەیزانی و نە گرنگی دەدا بە پاکوتەمیزی، جۆری خۆراك یان هەتا خواردنێکی بەتام. هەرکاتێك پارچەیەك گۆشتی بکڕیایە یان بەخت یاوەری بوایە و مریشکێکی چنگبکەوتایە هەروا بە پەڕ و ناوسکەکەیەوە لە ڕۆژنامەوەی دەپێچا و دەیخستنە ناو فرێزەردەوە. هەر هەمان گۆشت، بۆ چوار پێنج جار خاودەکرایەوە، پارچەیەکی لێدەکراوەیە و دەخرایەوە ناو فرێزەر تا هەمووی تەواودەبوو. پیسترین برنجم لە گەنجینەکەیدا بینی، نە تەنیا مێشولەی ڕەشی بچوکی تیدا بوو، بەڵکو کرمی سپیش. زەحمەتی خۆیی نەدەدا، پێش لێنانی ئاوێکی پیادا بکات.

خۆشبەختانە کاری چێشتلێنان کەوتە سەرشانی من. هەرچەند مامل داوای خواردنی ئێرانی دەکرد، بەڵام دڵنیابووم هەرچی شتێك دروستبکەم، پاك دەبێت.

لەکۆتاییدا، ئەوەندە کاری ڕۆژانە کەڵەکەبوو بەسەرمەوە، فریای سەرخوراندنی خۆم نەدەکەوتم. کاتێك نەسرین دەچوو بۆ زانکۆ، من خەریکی کاری ناوماڵ دەبووم: گسکمدەدا، تۆزم دەتەکاند و ناوفەرشی ماڵەکەم دەسڕی. مامل ئەندامی بەڕێوەبەرایەتی کارخانەیەکی دەرمانی ئێرانی بوو، سەیرمکرد، ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کۆمەڵە کاڵایەکی دەستکەوێت، کە زۆر دەگمەن بوون. گەنجینەکەی نەسرین پڕیبووم لەم جۆرە کاڵا نایابانەی وەك: دەرمانی ناوماڵ سڕین، دەیان شوشەی شامپۆ و زیاتر لە سەد پاکەتی تایدی جلشتن، کە لەناو بازاڕی کراوەدا زۆر مەحاڵ بوون دەستکەوێت.

نەسرین سەری سوڕما، کە زانی دیوار دەشۆرێت و حەپەسا بەوەی، کە بۆیەی دیواری ماڵەکەی سپییە نەك خۆڵەمێشی. زۆر کەیفی بەوە دەهات، کارەکەرێکی لە ماڵەکەدا

هەبێت، بۆئەوەی کاتی ئازادی زۆر هەبێت، نەك تەنیا بۆ خوێندن بەڵکو چەند کاژێرێکیش بۆ نوێژکردن و قورئان خوێندن. زۆر لە ئیسا بەدینتر بوو، هەتا لەناو چواردیواری ماڵەکەی خۆیدا، تەواو عەباکەی لەخۆیەوە دەپێچا.

چەند ڕۆژی سەرەتا، مەهتاب بەخۆشییەوە یاری لەگەڵ ئەمیردا دەکرد، لەکاتێکدا من خەریکی چێشتلێنان و ماڵ پاککردنەوە بووم و مودیش کاتی دەبردەسەر بەبێ ئەوەی هیچ شتێك بکات. تا ئاستێك خۆشنود بووین. مودی باسی گەڕانەوەی نەدەکرد بۆ ماڵی عەمە بزورگ.

ئێرانییەکان هەر بەدوای ئەوەوە بوون، بە چ ڕێگایەك ژیان ئاڵۆزبــکەن. بۆ نمونە، ڕۆژێکیان مودی منی برد بۆ شەکر کڕین، کارێکی وەها ئاسان، بوو بە ئەرکی ڕۆژێکی تەواو. ئێرانییەکان بەپێی ئەوەی چ جۆرە شەکرێك بەکاربهێنن لەگەڵ چاکەیاندا، دەبن بە دوو بەشەوە. عەمە بزورگ حەزی لە شەکری وردە بوو، کە بەبێ ئەوەی دەست بپارێزێت، بەسەر فەرشەکەدا بڵاویدەکردەوە. مامل پێیخۆشبوو، کڵۆ شەکرێك بخاتەسەر زمانی و لە نێوان ددانەکانیدا ڕایگرێت و چاکەی بکات بەسەردا.

مامل کۆپونی دا بە مودی بۆ کڕینی شەکری چەند مانگێك، بە هەردوو جۆرەکەیەوە. دوکاندارەکە کۆپونەکانی پشکنی و بەپێی ئەوە چەند کیلۆ شەکری وردەی کێشا، کە لەسەر زەوییەکە هەڵیدابۆوە و دەعوەتی لە هەموو جۆرە گیانەوەرێك کردبوو. پاشان بە چەکوش چەند پارچە شەکری کەللەی لە بلۆکێکی گەورە کردەوە بۆمان.

لە ماڵەوە خەریکی دروستکردنی "شەکری کڵۆ" دەبووم. لە پێشدا پارچە شەکرە گەورەکانم دەکرد بە پارچەپارچەی بچوکتر و پاشان بە گاز دەمکرد بە شەکری کڵۆ، ئەم کارە هەموو دەستمی کردبوو بە تلۆق.

ئەم جۆرە کارانە، ڕۆژانی غەمناکی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی 1984می پڕکردبۆوە، لەگەڵ ئەوەشدا چەند هەنگاوێکم بۆ پێشەوە نابوو. وردەوردە مودی چاودێریکردنی منی کەمکردبۆوە. ئەوەندەی پەیوەندی بەوەوە هەبوو، من چێشتی ئێرانیم باشتر لە ئێرانییەك لێدەنا، دەشیزانی کە دەبێت هەر ڕۆژە وریابم لە شتکڕیندا لە بازاڕی ناوچەکەماندا، بۆ ئەوەی باشترین گۆشت، میوە، سەوزە و نانم دەستبکەوێت. بەو هەوا ساردەی پایزە، هەموو بەیانییەك مەهتاب و ئەمیرم دەدایە پێش خۆم، بۆ ناو بازاڕ بۆ کڕینی شتی جۆراوجۆر.

دوکانێکی پیزا و هەمبەرگرم دۆزیبۆوە، لەبەرئەوەی ئەمریکایی بووم، ئامادەبوو دوو کیلۆ پەنیری ئێرانیم پێبفرۆشێت، کە لە بازاڕدا بەدەگمەن دەستدەکەوت و وەك پەنیری مۆزیرەڵا وابوو. بەوە توانیم تا ئاستێك پیزایەکی وەك پیزای جۆری ئەمریکایی دروستبکەم. خاوەنی ئەم دووکانە پێیوتم، هەرکاتێك پەنیرم پێویستبێت، دەتوانێت پێمبفرۆشێت - بەڵام تەنیا هەر بە من. ئەوە یەکەمین جارم بوو لە ئێراندا ناشونالییەتییەکەم بەکەڵکم بێت.

لەسەرەتای ئەم هاتوچۆیانەدا مودی لەگەڵم دەهات، بەوردی چاودێریدەکردم، بەڵام من خۆشحاڵبووم، کە لە هەڵسوکەوتیدا دەمبینی، بووم بە بار بەسەرییەوە.

جارێکیان مودی ڕێگەیدا، نەسرین من بەرێت بۆ بازاڕ بۆ کڕینی خوری، تا بلوزێك بۆ مەهتاب بچنم. هەموو ئەو بەیانییە گەڕاین بەدوای شیشی چنیندا، دەستماننەکەوت. "دەبێت بەخت یاوەرت بێت، ئینجا دەستتدەکەوێت،" نەسرین وتی. "ئەوانەی من بەکاربهێنــە."

هێواش و لەسەرخۆ تەنگم بە مودی هەڵچنی، بۆئەوەی وەرسبێت لەوەی دوامبکەوێت بۆ ئیشی ژنانە. پێمدادەگرت لەسەر ئەوەی، کە هەرئێستا ئەو پێکهاتە یان ئەو دەستگایەم پێویستە بۆ دروستکردنی نانی ئێوارێ. "هەرئێستا پێویستم بە نۆکە،" دەموت. یان پەنیر، یان نان، یان هەتا کەچوپ کە ئێرانییەکان زۆر حەزی لێدەکەن.

لەبەر چەند هۆی نادیار، بۆ چەند ڕۆژ مودی تا دەهات ڕووتاڵتر دەبوو، ئاسایی نەبوو، بەڵام دەبێت وا تەماشای منی کردبێت، کە منی کردۆتە کونەوە. ڕۆژێکیان، کە وا دیاربوو سەرقاڵی کاری خۆیەتی، گلەییکرد کە کاتی نییە لەگەڵمدا بێت بۆ بازاڕ. "خۆت کارەکانی خۆت بکــە،" پێیوتم. ئەمە بابەتێکی تری هێنایە کایەوە، مودی حەزینەدەکرد پارەی خۆمم پێببێت، چونکو پارە دەستی ناوەڵاتر دەکردم (هێشتا ناگادارنەبوو، کە من پارەی خۆمم شاردۆتەوە). مودی بڕیاریدا: "لەهێشدا بڕۆ، بزانە نرخی ئەو شتانەی دەمانەوێت چەندە. پاشان وەردەوە، پارەت دەدەمێ و ئینجا بچۆ بیانکڕە."

ئەرکێکی قورس بوو، بەڵام بڕیارمــدا بەسەریدا سەرکەوم. شتومەکەکان بە کیلۆ و چەند پێوانەیەکی تر دەفرۆشران، کە وەك زمانە فارسییەکە سەرم لێنەدەرنەدەکرد. لەسەرەتاوە پێنووس و کاغەزم دەبرد و نرخەکانم یاداشتدەکرد. وردەوردە فێربووم، چۆن ژمارەی فارسی بخوێنمەوە.

ئەم شێوە بازاڕکردنە قورسە، لە خزمەتی پلانەکەی مندا بوو، چونکو بۆ هەر ڕاسپاردەیەك، دەبوو دوو جار لە مودی دووركەومەوە، هەتا ئەگەر بۆ ماوەیەکی کورتیش بوایە.

لە سەرەتاوە، بۆ چەند هاتوچۆی ناوبازاڕ بەبێ مودی، هەوڵمدا ئەوەی ئەو بڕیاری لەسەر دەدا، بە مو لێیلانەدەم، نەمدەویست توڕەبێت یان گومان پەیدابکات. هەروەها ئەوەم لەبەرچاوگرتبوو، کە لەوانەیە بەدزییەوە دوامبکەوێت. هەر ئەوەندەی ئەم هاتوچۆیانەم کرد بە ڕۆتین، وردەوردە کەوتمە درێژکردنەوەی مانەوەم لەناو بازاڕ، بە بیانوی ئەوەی گوایە، شەقامەکان قەرەباڵغن و خزمەتگوزارییەکی وەها نییە. لە شارێکی پڕ دانیشتوانی وەك تاراندا، ئەم جۆرە بەهانانە دەیخوارد. لە کۆتاییــدا، لە چوارەمین یان پێنجەمین چوونە بازاڕمدا، بڕیارمدا سەرکێشیبکەم و تەلەفون بۆ باڵوێزخانەی سویسرا بکەم. چەند ڕیاڵم لەناو جلەکانمدا شاردبۆوە، خێرا مەهتاب و ئەمیرم لەگەڵ خۆمدا کێشکرد بەدوای تەلەفونی پارەدا، بەو هیوایەی بتوانم و بزانم چۆن تەلەفونکە لێبدەم.

خێرا تەلەفونێکم دۆزییەوە، بینیم پارەی کاغەز ناخوات. تەنیا *تۆزاری* دەخوارد، دوو ڕیاڵی پارەی کانزا، کە دەیکردە نیو سێنت[1]، ئەم جۆرە پارەیەش لەناو بازاڕدا کەم دەستدەکەوت. پارەکەم گرت بەدەستمەوە و چووم بۆ چەند دوکان و دەموت، *"تۆزاری."* دوکاندارەکان یان زۆر سەرقاڵی کاری خۆیان بوون یان پشتگوێیاندەخستم، تا خۆم گرد بە دوکانێکی فرۆشتنی جلوبەرگی پیاوانەدا.

"*تۆزاری*؟" داواملێکرد.

پیاوێکی باڵابەرزی قژ ڕەش، لەپشتی مێزەکەیەوە بۆ ساتێك تەماشایکردم، ئینجا پرسیارلێکردم، "ئینگلیزی دەدوێیت؟"

"بەڵێ. بێزەحمەت، دەمەوێت پارە بگۆڕمەوە بۆ تەلەفون؟"

"دەتوانی تەلەفونەکەی من بەکاربهێنیت،" وەڵامیدامەوە.

ئەم پیاوە ناوی حەمید بوو، بەشانازییەوە باسی ئەوەی کرد، کە بۆ چەند جار سەردانی ئەمریکای کردووە. لەکاتێکدا حەمید خەریکی کاری خۆی بوو، تەلەفونم بۆ سەفارەت کرد و یەکسەر هێلینم گرت.

"پەیامەکەی ئێمەت وەرگرت،" بەخۆشییەوە وتی.

"پەیامی چی؟"

"ئایا مێردەکەت پێینەوتووی، تەلەفونبکەیت؟"

"نـــا."

"ئۆی" - هێلین بە سەرسامییەوە وەڵامیدایەوە - "دەی باشە، هەوڵماندا وە پەیوەندی بە تۆوە بکەین. دایك و باوکت پەیوەندییان بە وەزارەتی دەرەوە کردووە و داوایان لە ئێمە کردووە بۆ پاسادانی ناونیشانت و بۆ هەواڵ زانینی تۆ و کچەکەت. چەند جار تەلەفونمان بۆ دەشەکەت کردووە، بەڵام ئەو دەیوت، تۆ چوویت بۆ دەریای خەزەر."

"هیچ کاتێك لە دەریای خەزەر نەبووم."

"چاکە، ئەوە قسەی دەشەکەت بوو، هەروەها دەیوت، نازانم کەی دێتەوە. ئاگادارمکردەوە، کە دەمەوێت دەستبەجێ قسەت لەگەڵدا بکەم." هێلین ڕوونیکردەوە، کە ئەو چەند کاری حکومەتی ئێران ڕێگەدەدا بە بەشی بەرژەوەندی یو.ئێس. بۆ منی بکات ئەوە بوو، کە خێزانەکەم لە ئەمریکا بزانن من و مەهتاب لە کوێ دەژین و هەروەها ئاگاداری ئەوە بن ئێمە چۆن دەژین. هێلین باسیکرد، کە دوو نامەی بۆ مودی نووسیوە و داوایلێکردووە، کە ئێمە بهێنێت بۆ باڵوێزخانە. مودی یەکەم نامەی پشتگوێخستووە، بەڵام ئەو بەیانییە لە پەیوەند بە نامەی دووەمدا تەلەفونیکردووە. "زۆر هاوکاری نەکردین،" هێلین وتی.

لەپڕ ترس دایگرتم. ئیتر بۆ مودی ڕۆشن بوو، کە دایك و باوکم لە کەناڵی ڕەسمییەوە چیان لەدەستبێت، دەیکەن. ئایا دەکرێت ئەم هۆیە بووبێت، وا ئەو چەند ڕۆژەی پێشوو باری دەرونی تێکچووبوو؟

ئەمویرا، خۆم لەوە زیاتر دوابخەم لەناو بازاڕ و هێشتا دەبوو نانیش بکڕم. بەڵام کە تەلەفونەکەم داخست، حەمید هەر ویستی بۆ چەند خولەکێك قسەم لەگەڵ بکات.

"ئایا گرفت هەیە؟" حەمید پرسی.

تا ئەو کاتە متمانەم بە هیچ کەسێك نەکردبوو لە دەردوەی باڵویزخانە، تا بەسەرهاتی خۆمی بۆ باسبکەم. تەنیا پەیوەندیم بە ئێرانییەکانەوە لە ڕێگای کەسوکاری مودییەوە بوو، تەنیا نمونەم بۆ هەڵسەنگاندنی بۆچوونی کەسێکی ئێرانی بەرامبەر بە ئەمریکا، هەڵسوکەوتی خزمەکانی مودی بوو بەرامبەر بە من، کە تەواو دوژمنکارانە و سوکایەتی بوو. ئایا هەموو ئێرانییەکان وەها بوون؟ خاوەنی دوکانی پیزاکە وا نەبوو. بەڵام تا چ ئاستێك، دەمتوانی متمانە بە ئێرانییەك بکەم؟

وا خۆم پیشاندا کە ناترسم، چونکو دەمزانی ئێستا بێت یان دواتر، دەبێت کەسێك لەدەرەوەی خێزانی مودی بدۆزمەوە تا یارمەتیمبدات. بەسەرهاتی خۆمم بۆ ئەم ئەناسە هەڵڕشت.

"هەرکاتێك شتێکم لەدەستبێت، یارمەتیتدەدەم،" حەمید بەڵێنیدا. "هەموو ئێرانییەك وەك هاوسەرەکەی تۆ نییە. هەرکاتێك پێویستت بە تەلەفون بوو، وەرە بۆ ئێرە." پاشان وتی، "ماوەیەك ڕاوەستە با بزانم. لە نووسینەگەی پاسپۆرت چەند هاوڕێم هەیە."

سوپاسی حەمیدم کرد، بە مەهتاب و منداڵەکەوە خۆم گەیاندە *نانی*، نانەواخانە. دەبوو بۆ نانی ئێوارێ نانی *لەواش* بکڕم، بەو مەبەستەوە هاتبوومە دەردوە. ئاسایی کە لەسەرەی خاوی نانگرتندا دەوەستام، تەماشای ئەو گروپە چوار کەسییەم دەکرد کە نانیان دەکرد. کارەکە لەوسەری دوکانەکەوە دەستیپێدەکرد، کە تەشتێکی گەورەی مسی تیایدا بوو، بە تیرەی دوو مەتر و بەرزی زیاتر لە یەك مەتر، پڕی بوو لە هەویر.

کرێکارێك، کە بەهۆی گەرمی تەنورەکەوە عەرقی دەردابوو، لەوسەری دوکانەکەوە کێشدارانە کاریدەکرد، پڕیدەکرد بە هەویرەکەدا و پارچەیەکی لێدەکردەوە دەیخستە سەر تەرازوویەك، ئینجا بە چەقۆیەکی تیژ، بە قەبارەی نزیك بە یەك پارچەپارچەی دەکرد. پاشان ئەم پارچە هەویرانەی فڕێدەدایە سەر زەوییە کۆنکرێتکراوەکە، کە دوو پیاوی پێپەتی لە سەر زەوییە ئارداوییەکە کاریاندەکرد.

دووەم کرێکار لەسەر زەوییەکە چوارمشقی دانیشتبوو، بەدەم قورئان خوێندن و خۆڕاژەنینەوە، پارچە هەویرەکانی ئارداویدەکرد، دەیکردن بە گونك و لەسەر زەوییە کۆنکرێتییەکە ڕیزیدەکردن.

سێیەم کرێکار گونکێکی هەڵدەگرت و دەیکێشا بە پەنیەکی تەختەدا و بە تەرۆك پانیدەکردەوە و بۆ چەند جار حەوایدەدا و بە تەرۆکەکەی دەیگرتەوە و دەیخستە سەر تەختەیەك کە بە پەرۆ پێچرابوو، دەسکە درێژەکەی بەدەستی کرێکاری چوارەمەوە بوو.

ئەمەیان لە چاڵێکدا کاریدەکرد، کە تەنیا سەری و شانی و قۆڵی دەبینرا. سەر زەوییەکە و پێشی تەنورەکە بە پارچە پەڕۆ داپۆشرابوو، تا کرێکارەکە بپارێزێت لە گەرمی تەنورەکە. بە هەمان جوڵەیەکی چالاکانە، کە هەویرە کراوەکەی دەخستە ناو تەنورەکەوە، نانی برژاوی لەواشیشی دەهێنایە دەردوە.

ئەو ڕۆژە زۆر زیاتر لە کاتی ئاسایی، چاوەڕوانی سەرەی نانمان کرد و نیگەرانی کاردانەوەی مودی دایگرتم.

کاتێك سەرە گەیشتە سەر ئێمە، پارەکەم دانا و نانی *لەواشی* تازەم هەلگرت، بەبێ ئەوەی بیپێچمەوە بردم بۆ ماڵەوە.

کاتێك بەرێوەبووین بۆ ماڵەوە، بۆ مەهتابم باسکرد، کە دەبێت چوونە لای حەمید و تەلەفونەکە لە باوکی بشارێتەوە. بەڵام وانەدانەکەم پێویست نەبوو. کچە بچکۆلە پێنج ساڵەکەم، دەمێك بوو دۆست و دوژمنی خۆی دەناسی.

مودی گومانی پەیداکردبوو، کە بۆ کارێکی وەها ئاسان، ئەوەندەمان پێچووە. بەڵام درۆی خۆمم بۆ کێشەیەکی وا هەڵبەستبوو. پێموت، کە لە سەرەیەکی درێژدا لەبەردەمی نانەواخەنەیەکدا وەستابووین و هەرکە نۆبە هاتەسەر ئێمە، نان تەواوبوو. ناچاربووین، بە دوای نانەواخانەیەکی تردا بگەڕێین.

ئیتر نازانم، گومانی لە قسەکانم کرد یان نامەکانی باڵوێزخانە بوو، مودی وریاکردەوە. بۆ چەند ڕۆژ تا دەهات تەواو تورە و شەڕانی بوو. گرفتێکی تریشی بۆ پەیدا بوو، نامەیەکمان بۆ هات، کە دایکە پەرێشانەکەم ناردبووی. تا ئەو کاتە مودی دەستی بەسەر تەواوی ئەو نامانەدا گرتبوو، کە کەسوکارە نیگەرانەکەم و هاوڕێکانم بۆیان ناردبووم. بەڵام ئێستا لەبەر چەند هۆیەك، نامەیەکی سەرهەڵنەپچڕاوی بۆ هێنام، کە بە دەستوخەتی دایکم نووسرابوو. لەوەتەی هاتبوومە ئێرانەوە، ئەوە یەکەم جارم بوو نامەیم بەدەستبگات. مودی لەسەر زەوییەکە، لە تەنیشتم دانیشت و لە نامەکە وردەبۆوە، کاتێك دەمخوێندەوە.

*خۆشەویستانم بیتی و مەهتاب*

*زۆر نیگەرانی ئێوەین. پێش ئەوەی بڕۆن، خەوێکی ناخۆشم بینی، کە ئەمە ڕوودەدا، کە لەوێ گلتانئەدەنەوە و ناهێڵێت بگەڕێنەوە. بەڵام هەرگیز ئەمەم بۆ باسنەکردی، چونکو نەمدەویست لە کاروبارتاندا خۆم هەڵقورتێنم.*

*هەروەها خەوێکی ناخۆشی ترم بینی، کە مەهتاب لە تەقینەوەی بۆمێکدا قاچێکی پەڕیوە. ئەگەر هەرچی شتێك لە هەردووکتان ڕوویدات، ئەوا ئەو تاوانبارە. هەمووی هەڵەی ...*

مودی نامەکەی لەدەست فڕاندم. "ئەم قسە توڕەهاتانە چییە!" قیڕاندی بەسەرمدا. "لەمەودوا هیچ نامەیەکی ئەوانت پێنادەم، هەتا ڕێگەت پێنادەم لەگەڵیاندا قسەبکەیت."

بۆ چەند ڕۆژ بەدوای ئەوەدا، مودی دەهات لەگەڵماندا بۆ بازاڕ، هەرچەند بە بەردەمی دوکانەکەی حەمیددا دەڕۆیشتین، لە ترساندا لەرز دەیگرتم.

تا ئەو ساتە وا دەردەکەوت، مودی بیریچووبێتەوە، کە لە دەرەوەی ئێران جیهانێکی تر هەیە، کەمتەرخەمییەکانی خۆی، هەتا لەوپەڕی جیهانەوە، ڕۆژێك ڕێگای پێدەگرن.

پێش ئەوەی ئەمریکا جێبهێڵین، مودی پارەیەکی زۆری بۆ خۆی لادابوو. بەبێ ئاگاداری من، بە کارتی قەرز، بایی زیاتر لە چوار هەزار دۆلار دیاری بەلێشاو بۆ کەسوکاری کڕیبوو. خانووەکەی دیترۆیتمان بە کرێ تیدا بووین، بەڵام هیچ کەسێك نەبوو، لە جێگەی ئێمە، کرێکەی بدات، کە مانگانەکەی شەش سەد دۆلار بوو. هەروەها کەس نەبوو خەرجییەکانی تری ماڵەکە بدات. وە تا ئێستا باجێکی زۆریشمان لەسەر کەڵەکەبووبوو، کە دەبوو بماندایە.

هێشتا سامانمان بەدەستەوە مابوو، کە لەو ساڵانەی مودی کاری باشی کردبوو، کۆمانکردبۆوە. پێش ئەوەی بکەوینەڕێ بۆ ئێران، مودی بۆ چەند جار پارەی زۆری لە حسابی بانکییەکەمان دەرهێنابوو، بەڵام نەیویستبوو ئەو سامانەی هەمان بوو بیکات بە پارە. چونکو ئەگەر ئەوەی بکردایە، بێگومان بۆ ئەوە دەچووم، کە مودی شتێکی لەژێر سەردایە. ناوماڵێکی گران و دوو ئوتومبیلمان لە ماڵەکەدا هەبوو. هەروەها خانوویەکی بەکرێدراومان لە کۆرپوس کریستی هەبوو. دەیان هەزار دۆلار بە سامانەکەمانەوە بەسترابوو، مودی بڕیاریدابوو هەموو ئەم گەنجینانە بگوێزێتەوە بۆ ئێران.

هیچ ئاگای لەوە نەبوو، کە من کاغەزم پڕکردۆتەوە و ناردومە بۆ وەزارەتی دەرەوە و داوامکردووە، ئەو سامانەی بۆ هەردووکمان دەگەڕێتەوە، ڕێگەنەدرێت بکرێت بە پارە. مودی هەتا بە نیازنەبوو، ئەو قەرزە دەوڵەتییانەی هەیبوو بیداتەوە. لە ڕاستیدا چاوی بەرایی نەدەهات، ببینێت یەك سێنت لە پارەکەی دەچێت بۆ دەوڵەت. "ئامەوێت یەك پێنی[2] چییە، بیدەم بە ئەمریکا،" سوێندیدەخوارد. "نایدەم. هیچ پارەیەك لەدەستی من وەرناگرن."

سەرەڕای ئەوەش مودی دەیزانی، ئێستا قەرزێکی زۆرمان لەسەر کۆبۆتەوە و خاوەنەکانیان بەردەرگایان گرتووە، نەك هەر داوای قەرزەکانیان دەکەن، بەڵکو داوای ئەوەش دەکەن، کە دواکەوتنی قەرزەکانیان بۆ قەرەبوو بکەینەوە. لە ڕاستیدا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە سامانەکەمان کەمدەبۆوە.

"دەبووایە دایك و باوکت هەموو شتەکانیان بفرۆشتایە و پارەکەیان بناردایە بۆ ئێمە!" مودی لەبەرخۆیەوە دەیوت، وەك ئەوەی هەڵەی من بێت، گرفتی ئابوریمان بۆ هاتۆتەپێشەوە و دایك و باوکی من بەرپرسی ڕاستکردنەوەی هەڵەکەن.

مودی نمونەی دەستەپاچەیی بوو، هەر ڕۆژێك تێپەڕدەبوو، ئاسۆی گەڕانەوەمان بۆ ئەمریکا لێڵتر دەبوو. قوڕێکی گرتبۆوە بۆ خۆی - بۆ ئێمەش - دەرچوون تیایدا مەحاڵ بوو.

به گەڕانەوەی بۆ ئەمریکا دەستبەجێ خاوەن قەرزەکان یەخەیان دەگرت - دەبێت ئەوەشی لەبەرچاوگرتبێت - کە لەلایەن منەوە تەڵاقـــدەدرێت.

هێشتا لە ئێراندا بڕوانامە پزیشکییەکەی نرخێکی نەبوو. فشار لە هەموو لایەکەوە تەنگی پێهەڵچنیبوو، تا دەهات کەللەشەقتر دەبوو بەرامبەر بە دەوروپشتەکەی. من و مەهتاب ئەوەندەی دەمانتوانی لێیدووردەکەوتینەوە، هەوڵماندەدا بچوکترین شتمان لەگەڵی نەبێت. لە چاوانی مودیدا شتێکی ترسناك خۆی مەڵاســـدابوو.

کرێکار خەریکی چاککردنی زێرابی دراوسێکەمان بوون. بۆ دوو ڕۆژ دەچوو ئاو بە ماڵماندا نەهاتبوو. قاپوقاچاخی پیس لەسەریەك کەڵەکەبووبوون. لەوەش خراپتر، ئاو نەبوو شتی خۆراکی بەتەواوەتی پێپاکەمەوە. مامل گوێی لە گلەیی من بوو، بەڵێنیدا بۆ سبەینێ ئێوارێ بمانبات بۆ ڕێستوران. کەسوکاری مودی بەدەگمەن دەچوون بۆ دەرەوە بۆ نانخواردن، لەبەرئەوە بەپەرۆشەوە دەمانڕوانییە ئەم بۆنەیە. بۆ ڕۆژی دوایی، لەجیاتی ئەوەی خەریکی دروستکردنی نانی ئێوارێ بم، بەپێی ئەو هەلومەرجە خەریکی ڕازاندنەوەی خۆم و مەهتاب بووم.

خۆمان ئامادەکردبوو، کاتێك مامل گەڕایەوە، بەڵام هیلاك و پەست دیاربوو. "نـــا، ناچینە دەرەوە،" لەژێر لێوەوە وتی. *تەعاروف* لە کۆڵمان نەدەبۆوە.

من و مەهتاب زۆرمان پێناخۆش بوو، شتێکی وەهامان نەبوو دڵی پێخۆشبکەین. "با تەکسییەك بگرین و خۆمان بڕۆینە دەردوە،" پێشنیارمکرد بۆ مودی، کاتێك من، مەهتاب و مودی لە هۆڵەکە پێکەوە دانیشتبووین.

"نـــا، ناچینە دەردوە،" وەڵامیدامەوە.

"تکاتلێدەکەم، ناتوانین خۆمان دچین؟"

"نـــا، ئێمە لە ماڵی ئەوان داین. ناتوانین بێ ئەوان بچینە دەرەوە. نایانەوێت بچنە دەرەوە، لەبەرئەوە شتێك دروستبکە."

لەو ساتە نائومێدییەمدا، ئاگام لەخۆم نەبوو. قین و توڕەیی لەناو گیانمدا پەنگیخواردبۆوە، لەبیرمچووبۆوە، کە هەلومەرجەکەم چەند لەرزۆکە، بە ڕەقی وەڵامدایەوە، "دوێنێ قسەوباس ئەوە بوو، کە ئەم ئێوارێیە دەچینە دەرەوە. ئێستا مامل نایەوێت بچێتە دەرەوە."

مامل لە مێشکی مندا، سەرچاوەی سەرەکی هەموو گرفتەکانم بوو. ئەو بوو یەکەم جار دەعوەتیکردین بۆ ئێران. زەردەخەنەکەیم هاتەوە بەرچاو، کاتێك لە دیترۆیت

دڵنیاییکردم، که خێزانەکەیان هەرگیز ڕێگە بە مودی نادات، بەبێ ویستی خۆم لە نێراندا گلمبداتەوە.

هەستامە سەرپێ، سەیری مودیم کرد و بەسەریدا قیژاندم، "مامل درۆزنە. درۆزنێکی هیچوپوچە!"

مودی بەرزبۆوە، ئاگر لە دەموچاوی دەباری. "تۆ بە مامل دەڵێیت درۆزن؟" هاواریکرد.

"بەڵێ! پێیدەڵێم درۆزن،" قیژاندم. "بەڵێ، تۆش درۆزنی. ئێوە هەردووکتان هەمیشە شت دەڵێن -"

هەڵچوونەکەم بۆ ساتێك دامرکایەوە بەهۆی بۆکزێکی قایمی مودی، کە لای ڕاستی سەرمی گرت. بەلادا کەوتم، شۆك بۆ ساتێك ئەوەندە گرتمی، هەستم بە ئازار نەکرد. ئاگادار بووم، مامل و نەسرین هاتنە ژوورەوە، بۆئەوەی بزانن چی بووە. مەهتاب لە ترساندا زریکەی لێهەستا و مودی جنێوی دەدا. هۆڵەکە لەبەرچاوم ژێرەوژووردەبوو.

هەوڵمدا پەناببەم بۆ ژووری نوستنەکە، بەهیوای ئەوەی دەرگاکەی لەسەر خۆم داخەم، تا مودی توڕەییەکەی دادەمرکێتەوە. مەهتاب بە زریکەزریك دوامکەوت.

کە گەیشتمە ناو دەرگای ژوورەکە مەهتاب لەناو قاچمدا بوو، بەڵام مودی دروست لە پشتمەوە بوو. مەهتاب هەوڵیدا بێتە نێوان هەردووکمانەوە، بەڵام مودی بەقایم پاڵی پێوەنا بۆ ئەولاوە. لەشی بچکۆلەی دای بە دیوارەکەدا و لەتاو ئازار زریکەی لێهەڵسا. کە هەڵگەڕامەوە بچم بۆ لای، مودی فڕێیدامە سەر جێگاکە.

"فریامــبکەون!" هاوارمکرد. "مامل، فریامکەوە."

مودی بەدەستی چەپی قژی گرتم و بە دەستکەی تری کەوتە لێدانم و دووبارە کێشایەوە بە سەرمدا.

مەهتاب هات بە هانامەوە و دووبارە پاڵی پێوەنا بۆ دواوە.

هەوڵمدا لەژێر چنگی دەرچم، بەڵام ئەو زۆر لە من بەهێزتر بوو. بە زللە کێشای بە ڕوومەتمدا.

"دەتکوژم،" هاواریــکرد.

لەقەیەکم لێدا و توانیم لەژێر چنگی بێمە دەرەوە و هەوڵمدا هەڵسم و ڕاکەم، بەڵام شەقێکی لە سێبەندم هەڵدا، ئەوەندە قایم بوو کە ئازار سەروخواری کرد و لە پەلوپۆی خستم.

مەهتاب لە سوچێکدا هەنسکەهەنسکی بوو، منیش لە جێگای خۆم جوڵەم لێبڕا. ئینجا مودی بە کەیفی خۆی کەوتە لێدانم، دەیکێشا بە قۆڵمدا، قژی ڕادەکێشام، بە زللە دەیکێشا بە دەموچاومدا و بەردەوام جنێوی پێدەدام. یەك لەسەر یەك هاواریدەکرد، "هەر دەتکوژم! هەر دەتکوژم!"

"فریامکەون!" بۆ چەند جار هاوارمکرد. "تــکایە، کەسێك بێت بە هانامەوە."

بەڵام نە مامل و نە نەسرین هەوڵیانندا خۆیانی تێهەڵقورتێنن. نە ڕەزا و نە نیسا، کە بێگومان گوێیان لەم زرموکوتە بوو.

نازانم چەند خولەك تێپەڕی، ئاوا مودی لێیددام. چاودڕوانی لە هۆشخۆچوون و ئەو مردنەم دەکرد، کە مودی بەڵێنیدابوو.

وردەوردە هێزی پیاکێشانەکانی کەمبۆوە. تۆزێك ڕاوەستا تا هەناسەیەکی بەبەردا بێتەوە. بەڵام هێشتا هەر قایم لەژێر چنگیدا بووم لەسەر جێگاکە. لە تەنیشتیشمەوە مەهتاب بەشێوەیەکی هیستیری هەنسکەهەنسکی بوو.

*"دایی جون"* دەنگێکی هێواش لە دەرگاکەوە هات. *"دایی جون."* مامل بوو. لە کۆتاییدا دەرکەوت.

مودی سەری بەرزکردەوە و لەوەدەچوو ئەقڵی هاتبێتەوە سەرخۆی، بە بیستنی ئەو دەنگە هێواشە. *"دایی جون"* مامل دووبارەیکردەوە. بەهێواشی مودی لە من جیاکردەوە و لەگەڵ خۆیدا بردی بۆ هۆڵەکە.

مەهتاب ڕایکرد بۆ لام و سەری خستە ناو باوەشمەوە. هەردووکمان بەشداری ئازاری یەکتریمان کرد، نەك تەنیا ئازاری جەستەیی، بەڵکو ئازارێکی قووڵتر، کە بەناخدا چووە خوارەوە. دەگریاین و هەناسەبڕکێمان بوو، بۆ چەند خولەك هیچمان نەماندەتوانی قسەبکەین.

لەشم وەك پەڵەیەکی گەورەی شین وابوو. سەرم لە دوو لاوە هەڵتۆقیبوو، ئەوەندە گەورە بوون، ترسی ئەوەم هەبوو زیانی ترسناکی پێگەیاندبم. قۆڵ و پشتم ئازاری هەبوو. لاقێکم خراپ ئازاری پێگەیشتبوو، کە دەمزانی بۆ چەند ڕۆژ شەلم دەکات. بیرم لە دەموچاوم دەکردەوە، دەبێت چی بەسەرهاتبێت.

پاش چەند خولەکێك نەسرین لەسەر نوکی پێ هاتە ژوورەوە، دیمەنی ژنێکی ئێرانی ملکەچ بوو، بەدەستی چەپی توند عەباکەی بەسەریەوە گرتبوو. هێشتا من و مەهتاب هەنسکەهەنسکمان بوو. لەسەر جێگاکە دانیشت و دەستی هێنا بە شانمدا. "نیگەران مەبە،" نەسرین وتی. "باش دەبێت."

"باش دەبێت؟" بێباوەڕانە وەڵامەدایەوە. "ئەوە باشە، ئاوا لێمبدات؟ ئەوە باشە، پێمدەڵێت دەتکوژم؟"

"نــا، ناتکوژێت،" نەسرین وتی.

"بــا، وتی. بۆچی نەهاتی بۆ یارمەتیم؟ بۆچی هیچ شتێکت نەکرد؟"

نەسرین ئەو پەڕی دڵنەواییکردم، هەوڵیدا بەپێی یاسای ئەو وڵاتە ناجۆرە ڕامەبکات. "ئێمە ناتوانین خۆمانی تێهەڵقورتێنین،" بۆمی ڕوونکردەوە. "ئێمە ناتوانین لەدژی *دایی جون* بووەستینەوە."

مەهتاب بە دیقەت گوێیدەگرت، لەکاتێکدا دەمبینی، بەچاوانی منداڵی پڕ فرمێسکەوە هەوڵیدەدا تێبگات. لەپڕ تەزویەکی ترسناکی بیرێکی تازە، گیانی پڕئازارمی داگرت. چی

دەبێت، ئەگەر مودی بەڕاستی بمکوژێت؟ چی بەسەر مەهتاب دێت؟ ئایا ئەویش دەکوژێت؟ یان منداڵە و ئەوەندە شکانندنەوەی لە باردایە کە گەورەبوو، ئەم شێتێتییە بە ئاسایی وەرگرێت؟ ئایا ژنێکی وەك نەسرین یان ئیسای لێدەردەچێت، بە عەباکەی جوانی، شوروشەوق و گیانۆکەی خۆی دەشارێتەوە؟ ئایا مودی لە خشوکەزا یان برازاکەی خۆی ماردیندەکات، ئەویش لێی بدات و سکی پڕکات و منداڵی سەر و چاو تێکچوو بەباربهێنێت؟

"ئێمە ناتوانین لەدژی *دایی* جون بووەستینەوە،" نەسرین دووبارەیکردەوە، "بەڵام باش دەبێت. هەموو پیاوان وەك یەکن."

"نـــا،" بە ڕقییەوە وەڵاممدایەوە. "هەموو پیاوان وەك ئەم نیین."

"بـــا،" دڵسۆزانە دڵنیایکردم. "مامل هەمان شت دەکات لەگەڵ من. ڕەزاش هەمان شت دەکات لەگەڵ ئیسا. هەموو پیاوان وەك ئەمن."

قوڕم بەسەر! لە دڵی خۆمدا وتم. ئەم جارە بێتەوە، چیم لێدەکات؟

تێبینییەکان:

1. سێنت: cent: یەك دۆلاری ئەمریکی سەد سێنتە.
2. Penny: پارەی وردەی بەریتانییە.

# 7

بۆ چەند ڕۆژ دەشەلیم و نازارم دەکێشا، ئەوەندە هەستم بریندارببووبوو، هەتا نەمدەتوانی بۆ بازاڕێکی نزیك بچم. هەروەها حەزمنەدەکرد، کەس بمبینێت. لەگەڵ ئەوەی *ڕووسەری*م دەدا بەسەردا، بەڵام دەموچاوم ئەوەندە شین هەڵگەڕابوو، هەراسانیکردبووم.

مەهتاب زیاتر لە باوکی دوورکەوتەوە. هەموو شەوێك بەدەم خەوەوە دەگریا.

چەند ڕۆژ بە گرژی تێپەڕی، مودی هەر توڕە و تۆقێنەر بوو، من و مەهتاب ترس تەنگی پێهەڵچنیبووین، بێدەسەڵاتی و بێهیوایی هەلومەرجەکە لە توانایی ئێمە بەدەربوو. ئەو لێدانە سەختە پیشاندەری ئەوە بوو، لەگەڵ چ مەترسییەکدا بەرەوڕووم، جێگابرینەکانم ئەوەی دەسەلماند، کە بەڕاستی مودی ئەوەندە شێتە کە بمکوژێت - بمانکوژێت - ئەگەر شتێك توڕەی بکات. بۆ پیادەکردنی پلانی نادیاری ڕزگاریمان، دەبوو هەمیشە کەوتنە مەترسی ئاسایشی خۆمان لەبەرچاوبێت. ژیانمان بە هەوەسی کاتی مودییەوە گرێداربوو.

هەرکاتێك و بەهەر شێوەیەك پێویستبوایە، لەگەڵ مودیدا هەڵسوکەوتم بکردایە، گفتگۆم لەگەڵدا ببوایە، تەماشامبکردایە یان هەتا بیرملێبکردایەوە، زیاترلەسەر بڕیارەکەی خۆم سوورتر دەبووم. ئەو پیاوەم زۆر باش دەناسی. بۆ چەند ساڵ دەچوو بینیبووم، چۆن سایەی شێتێتی باڵدەکێشێت بەسەریدا. هەوڵمنەدەدا ئاوڕبدەمەوە لەو شتانەی ڕوویاندەدا و تێیانبگەم، چونکو ئەم سەرکزییەم بە باش دەزانی بۆ خۆم، بەڵام گومانی تیادا نەبوو، هەندێك جار ئەو شتانەی ڕوویاندابوو، دەمهێنانەوە بەرچاوی خۆم. پێش ئەوەی سواری فڕۆکە بین بۆ تاران، تۆزێك بە نیگەرانییەکانی خۆمدا چوومەوە. هەرکات بیر لەوە دەکەمەوە - کە زۆرجار - هەستدەکەم، زیاتر داوی دەست و پێم توندتر دەبێتەوە لە هەرکاتێکی تر.

دەمتوانی زۆر هۆ بهێنمەوە، کە بۆچی ئێمە هاتین   ئابووری، یاسایی، سۆزی و هەتا پزیشکی. بەڵام ئەمانە هەمووی بە جێگای خۆی. من مەهتابم لەگەڵ خۆم هێنا بۆ ئێران، وەك دوا هەوڵێکی بێچارانە بۆ دەستبەرکردنی ئازادی، کەچی ئێستا دەرکەوت گاڵتەپێکردن بوو بە ئازادی.

ئایا دەمتوانی ملکەچی ژیانی ئێران بم، لە پێناو ڕزگارکردنی مەهتاب لە مەترسی؟ مەحال بوو. زۆر بۆم گرنگ نەبوو، ڕۆژێك لە ڕۆژان مودی چەند دۆست و بەڕێزی لێدەردەچێت. دەمزانی شێتێتی لەودا بورکانێکە، ئێمرۆ بێت یان سبەینێ دووبارە سەرهەڵدەداتەوە. بۆ پاراستنی ژیانی مەهتاب دەبوو بیخەمەوە مەترسییەوە، هەرچەند ئەم مەترسیانەی تازەیی بەچاوی خۆی بینی.

لێنانی مودی زۆر دووربوو لەوەی بتوانێت ملکەچم بکات، بەڵکو بە بەهێزکردنی وردی من شکایەوە. سەرەڕای باری سروشتی بێزیانی کاری ڕۆژانە، تەواوی بیر و هەوڵەکانم لەخزمەتی بەردەوامبوونی یەك مەبەستدا بوو.

مەهتاب هێزی پێدام، تا لەسەر بڕیارەکەم سوورتر بم.

لە حەمامەکە پێکەوە بووین، بەهێواشی دەگریا و دەپاڕایەوە لێم، کە لە باوکی دووریخەمەوە و بیبەمەوە بۆ ئەمریکا. "دەزانم، چۆن بچینەوە بۆ ئەمریکا،" مەهتاب ڕۆژێکیان وتی. "کاتێك باوکم خەوی لێدەکەوێت، دەتوانین خۆمان بدزینەوە، بچین بۆ فرۆکەخانە و سواری فرۆکە ببین."

دەگرێت ژیان بۆ منداڵێکی پێنج ساڵانە وا سادە بێت، لە هەمان کاتیشدا پڕ کێشە.

ویردی سەر زمانمان تا دەهات درێژتر دەبۆوە. لەگەڵ ئەوەی چەند ساڵ بوو چوونە کەنیسەم پشتگوێخستبوو، بەڵام باوەڕی بەهێزم بە خوا لەقنەبوو. بەڵام نەمدەتوانی سەردەربهێنم لەوەی، کە بۆچی ئەم خوایە ئەم بارەی لە ئێمە ناوە، هەرچەند دەمزانی، بەبێ یارمەتی هەرخۆی ناتوانین لەژێر ئەم بارە دەرچین.

هەندێك یارمەتیمان لە حەمیدی دوکانداری جلوبەرگی پیاوانە، وەرگرت. کاتێك، یەکەم جار پاش لێدانەکە، خۆم کرد بە دوکانەکەیدا، لێیپرسیم، "ئەوە چیت بەسەرهاتووە؟" بۆمـــگێڕایەوە.

"دەبێت پیاوێکی شێت بێت." ڕاشکاوانە و هێواش کەوتە قسەکردن. "لەکوێ دەژیت؟ کەسێك دەنێرم تەمێیبکات."

ئەوە ڕێگایەك بوو، ئەوەی دەهێنا لەبەرچاوبگیرێت، بەڵام هەردووکمان ئەو کاردانەوەیەمان لەبەرچاوگرت، کە لەوانەیە مودی لەو ڕاستییە ئاگاداربێتەوە کە بە نهێنی هاوڕێم هەیە.

کاتێك چاکبوومەوە و کەوتمەوە بازاڕکردن، هەر هەلێکم بۆ هەڵکەوتایە، سەردانی هاوڕێ تازەکەم، حەمید دەکرد و لەگەڵیدا گفتگۆم لەسەر هەلومەرجەکەمم دەکرد، هەروەها تەلەفونیشم بۆ هێلین دەکرد لە باڵوێزخانە.

حەمید کۆنە ئەفسەری پێشووی سوپای شا بوو، بەڵام بە پێناسەیەکی تەواو جیاوازەوە دەژیا. "خەڵکی ئێران شۆڕشیان دەویست،" حەمید بەنارامی ئەمەی لا درکاندم. "بەڵام ئەمە" - هێمای بۆ کۆمەڵێك خەڵکی غەمبار کرد لەبەردەمی دوکانەکەیدا، کە شەقامەکانی کۆماری ئیسلامی ئایەتوڵایان پڕکردبوو "ئەمە ئەوە بوو کە ئەمانـدەویست."

حەمیدیش لە هەوڵدابوو، ڕێگایەك بۆ خۆی و خێزانەکەی بدۆزێتەوە تا لە ئێران دەرچێت. زۆر ئامادەکاری هەبوو، کە دەبوو لەپێشدا بیکات. دەبوو دوکانەکەی بفرۆشێت، سامانەکەی بکات بە پارە و لە ئامادەکاری پێویست بۆ پاراستنی خۆی دڵنیابێت، بەڵام بڕیاریدابوو هەڵبێت، پێش ئەوەی ڕابوردووی ئاشکرابێت.

"کۆمەڵێك هاوڕێی بەتوانام هەیە لە وڵاتە یەکگرتووەکان،" پێیوتم. "چیان لەدەستبێت، بۆم دەکەن."

خێزان و هاوڕێکانی منیش لە ئەمریکا، چیان لەدەستبێت بۆم دەکەن، بە حەمیدم وت. بەڵام وا دەردەکەوت، کە لە ڕێگای ڕەسمییەوە شتێکی وەهایان لەدەستنەیەت.

بەکارهێنانی تەلەفونەکەی حەمید، یارمەتیدەر بوو بۆ من. هەرچەند ئەو زانیارییانەی لە باڵوێزخانە وەرمدەگرت - یان نەبوونی زانیاری لەبارەی ئەم یان ئەوەوە - سستیدەکردم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەنیا ڕێگای پەیوەندیم بوو بە ماڵەوە. لە لایەکی تریشەوە هاوڕێیەتی حەمید بەسود بوو بۆم. حەمید یەکەم کەس بوو پیشانیدام، کە ئێرانییەکی زۆر هەیە، شێوازی ژیانی ڕۆژئاوایی بە هەند دەگرن و لەگەڵ هەڵوێستی ڕەسمی حکومەتی ئێستای ئێراندا نیین سەبارەت بە ئەمریکا.

بەمانەوەی زیاترمان بۆم دەرکەوت، مودی ئەو کەسە لێهاتووە نییە، کە خۆی پێی وابوو. تەنیا چەند هەنگاوی بچوکی نا، بۆئەوەی مۆڵەتی کاری پزیشکی پێبدەن لە ئێراندا. هەرچی چۆنێك بوو، خوێندنە ئەمریکاییەکەی جۆرێك لە شکۆیی پێدەبەخشی، بەڵام لە سایەی حکومەتی ئایەتوڵاکاندا لەگەڵ بەربەرەکانی و پێشداوەری ڕووبەڕوودەبۆوە.

هەروەها مودی لەنێو پەیوەندی ئاڵۆزی خێزانی کەسوکاریدا، سەر بە توێژی سەرەوە نەبوو. ئەو لەژێردەوەی کەسوکاری بەتەمەنتری خۆیدا بوو، وەك چۆن ئەوانەی کەم تەمەنتر بوون لە خۆی، لەخوار خۆیەوە بوون، بۆیــە نەیدەتوانی لەژێر باری ئەرکی کەسوکاریدا دەرچێت، وە ئەمە بە قازانجی من شکایەوە. کەسوکارەکەی بۆیان پرسیاربوو، کە چی بەسەر من و مەهتاب هات. لە دوو هەفتەی سەرەتای هاتنماندا بۆ ئێران، مودی ئێمەی ناساند بە تەواوی کەسوکارەکەی. زۆرێك لەو کەسوکارەی، دەیانویست ئێمە زیاتر ببینن و مودیش نەیدەتوانی بۆ هەتاهەتایە بمانشارێتەوە.

بەنابەدڵییەوە، مودی بەعوەتی نانی ئێوارەی قبوولکرد لەلایەن ئاغا حەکیمەوە، کە ڕێزێکی زۆری لێدەگرت. لەگەڵ یەکتریدا ئامۆزا[1] (پورزا یان خاڵۆزا - وەرگێڕ) بوون و لە پەیوەندی خێزانی پڕ ئاڵۆزیشدا، زۆر شت پێکێوە دەیبەستنەوە. بۆ نمونە، کوڕی خوشکی ئاغا حەکیم، خوشکی ئیسا ژنی بوو، هەروەها کچی خوشکی، ژنی برای ئیسا بوو. زیا حەکیم، کە لە فرۆکەخانەکە پێشوازی لێکردین، بەچەند شێوە خوشکەزای (یان برازا - و) ئاغا حەکیم بوو. خانم حەکیم، ژنی ئاغا حەکیم، ئامۆزای (پورزا یان خاڵۆزا - و) مودی بوو. ئەم زنجیرە پەیوەندییانە کۆتایی نەدەهات.

هەموو ئەم پەیوەندییە خێزانیانە، جۆرێك لە ڕێزی دادەسەپاند، بەڵام سەرەکیترین هۆی ڕێزگرتنی ئاغا حەکیم لەلایەن مودییەوە ئەوە بوو، کە ئاغا حەکیم مێزەربەسەر بوو، ئیمامی مەسجیدی، مزگەوتی، نیاوەران بوو، لە نزیکی کۆشکی شا. هەروەها لە زانکۆی ئایینزانی تاران، وانەیدەوتەوە و نووسەرێکی بەناوبانگی کتێبی ئیسلامی بوو. چەند کتێبی

له عەرببیەوە وەرگێڕابوو بۆ فارسی، کە لەلایەن *ئاگەتی حەکیم*ەوە نووسرابوون، کە باوەگەورەی مودی و ئاغا حەکیم بوو. لە کاتی شۆڕشدا، داگیرکردنی سەرکەوتوانەی کۆشکی شا لەلایەن ئەوەوە ڕابەریکرابوو، کە لەو پەیوەندەدا وێنەیەکی لە گۆڤاری *نیوزویك*[2] دا بڵاوبووبۆوە. لەوەش زیاتر، خانم حەکیم نازناوەکەی بابەحاجی هەڵدەگرت، کە بە واتای ئەوە بوو، "ژنێکە و چووە بۆ حەج بۆ مەککە."

مودی نەیدەتوانی، دەعوەتی ئاغا حەکیم ڕەتکاتەوە. "دەبێت عەبایەکی ڕەش بخەیت بەسەرتدا،" مودی پێیوتم. "بەبێ ئەوە، ناتوانی بچیت بۆ ماڵیان."

ماڵەکەیان دەکەوتە نیاوەران، ناوچەیەکی خۆشی باکوری تاران بوو، خانووەکەیان مۆدێرن و گەورە بوو، بەڵام هیچی وای ناوماڵی تیادا نەبوو. ئەو هاتنەدەرەوەیەم پێخۆش بوو، بەڵام جلوبەرگەکەم سەغڵەتی کردبووم و چاوەڕوانی ئێوارێیەکی بێزارکەرم دەکرد لەگەڵ مێزەربەسەردا.

ئاغا حەکیم باریکەلە و دوو ئینچ لە مودی درێژتر بوو. هەردەم زەردەخەنەیەك بەسەر لێوییەوە بوو، ڕیشێکی ئەستوری قاوەیی ماشوبرنجی پێوە بوو. مێزەر و تەواوی جلەکانی ڕەش بوون. ئەمە نیشانەی گرنگی بوو. زۆربەی زۆری مێزەربەسەرەکان جلوبەرگی سپییان لەبەردابوو. مێزەری ڕەشی ئاغا حەکیم، نیشانەی ئەوە بوو کە لە نەوەی محەمەدە.

مایەی سەرسامیم بوو، ئەوەندە دینی دیارنەبوو، کاتێك کە قسەی لەگەڵدا دەکردم، چاوی لە چاوم دەبڕی.

"بۆچی عەبات داوە بەسەرتدا؟" لە ڕێگای وەرگێڕانی مودییەوە پرسیارێلێکردم.

"پێموا بوو، دەبێت بیدەم بەسەرمدا."

دەکرێت ئەم پرسیارە ئاغا حەکیم مودی هەراسانکردبێت، بەڵام هەرچی چۆنێك بوو وەریگێڕا. "ئاسودە نیت بە عەباوە. عەبا ئیسلامی نییە، فارسییە. لە ماڵی مندا، پێویستناکات عەبا بدەیت بەسەرتدا."

ئاغـــا حەکیمم لا خۆشەویستبوو.

لەبارەی کەسوکارمەوە لە ئەمریکا پرسیارێلێکردم، ئەمە یەکەم ئێرانی بوو ئەو پرسیارەم لێبکات. بۆم باسکرد، کە باوکم نەخۆشی شێرپەنجەی هەیە و گیانەدات، لەو بارەیەوە زۆر نیگەرانم، هەروەها نیگەرانی دایکم و کوڕەکانمم.

سەری بۆ لەقاندم و هاودەردی خۆی پیشاندا. تێگەیشت، کە پەیوەندیم بە کەسوکارمەوە چەند بەهێزە.

مودی شتێکی لەژێر سەردا بوو بۆ مەهتاب و بەشێوەیەکی بێهەستانە پێیڕاگەیاند. بەبێ هیچ ئامادەکارییەك، بەیانییەکیان پێیوت، "چاکە مەهتاب، ئیمڕۆ دەچین بۆ قوتابخانە."

من و مەهتاب یەکسەر فرمێسك بە چاوماندا هاتە خوارەوە، دەترساین هەتا بۆ ساتێك لەیەکتری دوورکەوینەوە. "وازیلێبهێنە با نەچێت!" لێیپاڕامەوە.

بەڵام مودی هەر لەسەر قسەی خۆی سووربوو. کەوتە ناخاوتن، کە مەهتاب دەبێت فێربێت خۆی بگونجێنێت و قوتابخانە یەکەم هەنگاوە بۆ ئەم مەبەستە. مەهتاب تا ئاستێك فارسی فێربووبوو، کە بتوانێت لەگەڵ منداڵانی تردا پەیوەندی ببەستێت. هەروەها کاتی قوتابخانەی هاتبوو.

مودی نەیدەتوانی لەوە زیاتر چاوەڕوانی کردنەوەی باخچەی تایبەتی منداڵان بێت، کە لەوەوپێش سەردانمانکردبوو. فەرەحی خوشکەزای، کە مامۆستا بوو، مەهتابی لە قوتابخانەیەکی دەوڵەتی ناونووسکردبوو. مودی باسیکرد، کە سەخت بووە لە باخچەی منداڵان جێگایەك بدۆزێتەوە، بەڵام بەهۆی دەسەڵاتی فەرەحی خوشکەزایەوە ئەمە بەدەستهاتووە.

"تکاتلێدەکەم، با لەگەڵتاندا بێم،" بە مودیم وت، ئەویش بۆ ئەمە ملیدا.

لە بەرامبەر بای ساردی پاییزی شاخەکانی باکوردەوە خۆمان لەبەرکرد، چەند کۆڵان ئەو لای ماڵی مامل چووین بەرەو شەقامی شەریعەتی، کە شەقامێکی سەرەکی بوو، هەرلەوێ مودی تەکسییەکی پرتەقاڵی ڕاوەستاند. خۆمان کرد بەناو تەکسییەکەدا کە نیو دەرزن خەڵکی تیادا بوو، بە دە خولەك گەیشتینە جێگای مەبەست.

*مەدرەسەی* (قوتابخانەی) زەینەب، خانووبەرەیەکی کۆنکرێتی بلۆکی نەزم بوو، بە ڕەنگێکی ناشرینی سەوزی تۆخ بۆیەکرابوو، لە دەرەوە لە قەڵا دەچوو. کچان بە تەمەنی جیاوازەوە، کە جلی ڕەش و سەوزی تۆخیان لەبەردابوو، سەر و دەموچاویان بە ڕووسەری داپۆشرابوو، دەچوونە ژوورەوە. بەدوودڵییەوە من و مەهتاب دوای مودی کەوتین بۆ ناو ڕاڕەوێکی تاریك. هەرکە مودی دەرکەوت، ژنە پاسەوانێك بە هەڵەداوان هات. ئەمە قوتابخانەی کچان بوو. پاسەوانەکە بە خێرایی لە دەرگای ژووری مامۆستاکانی دا، تۆزێکی کردەوە و بەوانەی کە لە ناو ژوورەکەدا بوون، ڕایگەیاند کە پیاوێك خەریکە دێتە ژوورەوە.

من و مەهتاب بەترسەوە وەستاین، کاتێك مودی قسەیدەکرد لەگەڵ بەڕێوەبەری قوتابخانە، کە ژنێك بوو بە هەردوو دەستی توند عابەکەی بەدەوری دەموچاوییەوە گرتبوو. کاتێك مودی دەدووا، ئەو چاوانی لە زەوییەکە بڕیبوو، جاروبار تەماشایەکی منی دەکرد، بەڵام نەك لەو پیاوەی بەردەمی. پاش چەند خولەك مودی ڕووی لەمن کرد و بەتوڕەییەوە وتی، "دەڵێت، ژنەکەم ڕازی دیار نییە." چاوی فەرمانی هاوکاری پێدەدام، بەڵام جارێکی تر  چونکو خۆشی مەهتاب لە پێش هەموو شتێکەوە بوو - هێزمدایە خۆم و لە بەرامبەریدا وەستامەوە.

"ئەم قوتابخانەیەم پێخۆش نییە،" وتم. "دەمەوێت ئەو پۆلە ببینم، کە مەهتاب تیایدا دەخوێنێت."

مودی تۆزێکی تریش لەگەڵ بەڕێوەبەرکەدا دووا. "خانم شەهێن - بەڕێوەبەر - دێت لەگەڵت و پیشانتدەدا،" مودی پێیوتم.

خانم شەهێن ژنێکی گەنج بوو لە تەمەنی ناوەڕاستی بیستەکاندا، لەژێر عەباکەیەوە سەرنجڕاکێش و چاوانی دۆستانە دیاربوو، کە تەماشای نیگای پڕ بێزاری منی دەکرد. یەکێك بوو لەو چەند ژنە ئێرانییەی کە بە چاویلکەوە بینیبووم. ئەوەندەی توانیمان بە هێما و چەند وشەی فارسی سادە قسەمانکرد.

ناسانکارییەکانی ناو قوتابخانە و چالاکییەك کە لە کاردا بوو، کەللەییيانکردم. بەناو ڕاڕەوێکی تاریکی دڵتەنگدا ڕۆیشتین، وێنەیەکی گەورەی ئایەتوڵای مرۆموچ و کۆمەڵێك پۆستەری لەژمارەنەهاتوو، کە شکۆمەندی جەنگی دەنرخاند، تێپەڕین. لەوە دەچوو، پۆستەری کوڕێکی بەجەرگی تفەنگ بەدەست و پارچەیەك پەڕۆی لە خوێن هەڵکێشراو بە ناوچەوانەوە بەستراو، پەسەنترین پۆستەر بێت.

قوتابییەکان لەپاڵیەکەوە لەسەر کورسی دانیشتبوون، لەگەڵ ئەوەی کەمێك فارسیم دەزانی، تەکنیکی وانەوتنەوە ئەوەندە سادە بوو کە تێیدەگەیشتم. تەکنیکەکە تەواو لەبەرکردنبوو، مامۆستا ڕستەیەکی دەوت، قوتابییەکانیش بەدوایدا یەکدەنگ دەیانوتەوە.

لەو باوەڕەدا بووم، تا ئەو ساتە پیسوپۆخەڵترین هەلومەرجم لە ئێراندا بینیوە، بەڵام کە چاوم بە تواڵێتی قوتابخانەکە کەوت، تێگەیشتم هێشتا زۆرم ماوە. تەنیا یەك تواڵێت هەبوو بۆ پێنج سەد قوتابی، کە ژوورێکی بچوکی چوار گۆشە بوو، بە پەنجەری بەرزی درێژی کراوەوە تا با، باران، بەفر، مێش و مێشولە لێوەی بێتە ژوورەوە. تواڵێتەکە تەنیا کونێك بوو لە زەوییەکەدا، کە ئەوانەی هاتبوونە ژوورێ زۆر بە خراپی بەکاریانهێنابوو. لە جیاتی کاغەزی تواڵێت، سۆندەیەك بوو کە بەفراوی پیادا دەهات.

کە گەڕاینەوە بۆ ژوورەکە، بە مودیم وت، "ئێرە جێناهێڵم، تا بەچاوی خۆت قوتابخانەکە نەبینی. لەو باوەڕەدا نییم، بتەوێت کچەکەت بچێت بۆ قوتابخانەیەکی وەها."

مودی پرسیاریکرد، کە دەتوانێت سەیرێکی قوتابخانەکە بکات.

"نەء،" خانم شەهێن بە فارسی وەڵامیدایەوە. "پیاوان نەء "

لەسەر داواکەی خۆم دەنگم لێبەرزکردەوە، دەنگی دایکێکی کۆڵنەدەر بوو. "ئێمە ئێرە جێناهێڵین، تا تۆ قوتابخانەکە دەبینی!" لێم دووبارەکردەوە.

لە کۆتاییدا بەڕێوەبەر نەرمبوو. لەپێشدا پاسەوانەکەی نارد تا مامۆستاکان و قوتابیان ئاگاداربکاتەوە، کە پیاوێك دێت هەندێك شوێن دەبینێت. پاشان مودی برد بۆ بینین، لە کاتێکدا من و مەهتاب لە ژوورەکە چاوەڕوانماندەکرد.

"وایە، تۆ ڕاست دەکەیت،" مودی دانیپیانا کە گەڕایەوە. "منیش پێم خۆش نییە. زۆر پیسە. بەڵام هەر ئەم قوتابخانەیە لێرە هەیە و دەبێت هەر بۆ ئێرە بێت. لەو قوتابخانەیە باشترە کە من کاتی خۆی تێدا خوێندومە."

مەهتاب بە نیگەرانییەوە گوێیدەگرت و ورتەی لەدەم نەدەهاتە دەرەوە. فرمێسکەکانی ئامادەبوون بێنەخوارەوە. ئاهێکی ئاسودەیی هەڵکێشا، کە مودی وتی، "ئیمڕۆ ناتوانن وەریبگرن. لە سبەینێوە دەستپێدەکات."

لەکاتی گەڕانەوەدا بە تەکسی بۆماڵەوە، مەهتاب لە باوکی پاڕایەوە کە وازیلێبهێنێت نەچێت بۆ قوتابخانە، بەڵام مودی هەر وازینەهێنا. تەواوی ئەو پاشنیوەڕۆیە بەسەر شانمەوە گریا. "خوایە گیان،" مەهتاب لە حەمامەکە دەستیکرد بە پاڕانەوە، "با شتێك ڕوویدات، بەشکم پێویستنەکات بچم بۆ ئەو قوتابخانەیە."

کە گوێم لە ویردی سەرزمانی منداڵەکەم بوو، ڕێکەوتبوو یان سروش، شتێك هات بە خەیاڵمدا. یەکێك لە وانە بنەڕەتییەکانی ویردم هاتەوە یاد و بۆ مەهتابم باسکرد. "دەزانم خوا وەڵامی ویردەکانمان دەداتەوە، بەڵام مەرج نییە هەردەم بەو شێوەیەی کە ئێمە دەمانەوێت، وەڵامانبداتەوە. مەهتاب تۆ دەبێت بچیت بۆ ئەو قوتابخانەیە و لەوانەیە خوا بەو شێوەیە بیەوێت. لەوانەیە لە چوونی تۆ بۆ ئەو قوتابخانەیە، شتێکی باش دەرکەوێت."

مەهتاب هەر ئۆقرەی نەدەگرت، بەڵام تۆزێك ئارامبۆوە. لەڕاستیدا لەوانەیە شتێکی باش لەمە سەوزبێت. من و مەهتاب هەردووکمان ڕقماندەبۆوە لە هەڕەشەی مانەوەی هەمیشەیی لە ئێراندا، کە قوتابخانە ئەوەی دەگەیاند. بەڵام دەمزانی چوونی مەهتاب بۆ قوتابخانە هەفتەی شەش ڕۆژ، لە کاتژمێری هەشتی بەیانییەوە بۆ دوانزە نیوەڕۆ، سەرقاڵیدەکات. بێجگە لە هەینی، هەموو ڕۆژێك هۆیەکمان بەدەستەوە هەیە ماڵ جێبهێڵین و لەم هاتوچۆیەدا، کێ دەزانێت، چ ئەگەرێك دێتەپێشەوە؟

بۆ سبەینێ بەیانی زوو، هەر سێکمان پێکەوە لەخەو هەڵساین و ئەمە بۆخۆی هیوایەکی زیاتری پێبەخشیم. لەو کاتەدا مودی دەوری گۆڕابوو، لە *دایی جون*ەوە بووبوو بە مەلای ماڵەوە، پێش تاریکوڕوونی بەیانیان لەخەو هەڵدەستا بۆئەوەی دڵنیابێت، هەموو (بێجگە لە من و مەهتاب) بەشداری لە نوێژکردندا دەکەن. ئەمە بۆ کەسانێکی دینی وەك نەسرین و مامل پێویستنەبوو، چونکو خۆیان زۆر بەئاگابوون. بەڵام مودی هەر بەمان ڕازینەدەبوو، دەچووە خوارەوە بۆ سەروگوێلاکی ڕەزا و ئیسا، کە ئەوان دینەکەیان ئەوەندە بەقورس نەگرتبوو. بەتایبەتی ئەمە سەخت بوو بۆ ڕەزا، کە ڕۆژی کارێکی دوورودرێژ لەبەربوو، لەکاتێکدا مودی دەگەڕایەوە بۆ ناو جێگا.

بێجگە لە هیلاکی نوێژکردن، مودی نوستنی کردبوو بە خوو، هەموو ڕۆژێك تا کاتژمێری دە یان یانزە لەناو جێگادا دەمایەوە. بۆم ڕۆشن بوو، کە زوو هیلاك دەبێت لە هاتوچۆی تازەی مەهتاب بۆ قوتابخانە و لەوانەیە زۆر درێژە نەکێشێت، ڕێگەمبدات خۆم مەهتابم بەرم بۆ قوتابخانە، ئەمەش هەلێکی زۆری بۆ دەرەخساندم، کە ئازادبم.

سەردەرای ئەو هیوایەش، گرژی باڵی کێشابوو بەسەرماندا. مەهتاب بێدەنگ بوو، کاتێك جلم بۆ قوتابخانە لەبەرکرد و *رووسەری*م دا بەسەریدا، وەك باقی قوتابییەکانی تر. مەهتاب بێدەنگ مایەوە، تا گەیشتینە قوتابخانە و یاریدەدەری مامۆستا دەستی بۆ برد، بۆئەوەی بیبات بۆ پۆلەکەی. مەهتاب دایە پرمەی گریان، ئەو فرمێسکانەی کە لە چاویدا قەتیس مابوو، جۆگەلەی بەست. توند چمکی پاڵتۆکەمی گرت.

سەیرێکی مودیم کرد، بێجگە لە توڕەیی، سۆز و خۆشەویستییەك لە نیگایدا بەدینەدەکرا.

"مەهتاب دەبێت بچیت،" پێموت و هەوڵمدا ئارامی خۆم ڕاگرم. "باش دەبێت. ئێمە دێینەوە هەڵتدەگرین. نیگەرانی ئەوە مەبە."

یاریدەدەرەکە بەهێواشی مەهتابی برد. مەهتاب هەوڵیدا دانبەخۆیدا بگرێت، بەڵام هەرە ئەوەندی من و مودی ڕۆیشتین، دەنگی گریانی ئەو ناوەی پڕکرد. ئازار بە جەرگم گەیشت، بەڵام دەمزانی کاتی ئەوە نییە، لەبەرامبەر ئەم شێتەدا ڕاوەستمەوە، کە قایم قۆڵی گرتبووم و کێشیدەکردم بۆ دەرەوە بۆ سەر شەقامەکە.

بەبێ دەنگ سواری تەکسی پرتەقاڵی بووین بۆ ماڵەوە، بینیمان نەسرین چاوەڕوانی ئێمەیە و پەیامێکی پێیە. "قوتابخانە تەلەفونیانکرد،" نەسرین وتی. "مەهتاب زۆر دەگری. دەبێت بچن بیهێننەوە."

"ئەمە هەمووی سووچی تۆیە!" مودی بە مندا تەقییەوە. "تۆ وات لەو منداڵە کردووە. منداڵێکی ئاسایی نەماوە. هەرچی تۆ پێینەڵێت، نایکات."

ئەم مامەڵە خراپەیم بە بێدەنگی وەرگرت، نەمدەویست جارێکی تر خۆم بخەمە مەترسییەوە. سووچی منە؟ دەمویست پڕبەدەنگ هاواربکەم و پێیبڵێم، تۆ ئەو کەسەی کە ژیانت لێیتاڵکردووە! بەڵام زمانی خۆمم گرت، چونکو دەمزانی ئەوەی ئەو دەیڵێت، تا ئاستێك ڕاست دەکات. من بووبوومە پارێزەری. دەترسام ڕێگەیبدەم، لێم دووربکەوێتەوە، چونکو ترسی ئەوەم هەبوو، مودی و خێزانەکەی لە هەوڵی چنینی پلانێکدا بن بۆ دابڕاندنی مەهتاب لە من. ئایا ئەمە سووچی منە؟ هەتا ئەگەر هەلومەرجێکی وەها هەبێت، کە پێویستبکات دایك ببێت بە پارێزەری منداڵەکەی، بەڵێ ئەوە سووچی منە.

مودی بەتەنیا دەرپەڕییە دەرەوە و پاش ماوەیەکی کورت مەهتابی سەرکزی بە ڕاکێشان هێنایەوە. "سبەینێ دەچیتەوە بۆ قوتابخانە!" هاواریکرد بەسەریدا. "خۆت تەنیا لەوێ دەمێنیتەوە. باشترێکە نەگریت."

پاش نیوەڕ و ئەو ئێوارێیە هەر هەڵێك هەڵبکەوتایە، مەهتابم دەبردە سوچێکەوە و قسەم لەگەڵدا دەکرد. "دەبێت ئەمە بکەیت،" ئامۆژگاریمکرد. "بەهێزبـــە. کچێکی گەورە بە. دەزانی، خوا لەپشتی تۆیە."

"ویردمکرد، کە خوا شتێکم بۆ بدۆزێتەوە، بۆئەوەی نەچم بۆ قوتابخانە،" مەهتاب گریا. "بەڵام خوا وەڵامی ویردەکەی نەداماوە."

"لەوانەیە وەلامتبداتەوە،" بیرمخستەوە چیم پێوتووە. "لەوانەیە هۆیەك هەبێت، كە دەبێت بچیت بۆ ئەو قوتابخانەیە. مەهتاب هەتا وا بیرمەكەرەوە، كە تۆ تەنیای. خوا هەمیشە لەگەڵتدایە. چاوی لە تۆیە. لە یادتنەچێت، كە بەڕاستی هەستت بە ترس كرد و تەنیا بوویت و نەتزانی چی بكەیت، تەنیا ویرد بخوێنە. گوێمەدەرێ كەسانی تر دەڵێن چی، تەنیا ویرد بخوێنە. هەموو شتێك باش دەبێت."

سەرەڕای ئامۆژگارییەكانم، بۆ سبەینێ بەیانی مەهتاب بەترسەوە لەخەو هەڵسا و گریا. دڵم ئازاری پێگەیشت، كە مودی بەڕەقی جلەكانی سەردەوەی پێلەبەركرد، بردی لەگەڵ خۆی بۆ قوتابخانە و نەیهێشت منیش لەگەڵیدا بچم. پاش ڕۆشتنیان بۆ ماوەیەكی زۆر، دەنگی گریانی ترسی هەر لە گوێمدا دەزرنگایەوە. لەتوڕەییدا كەوتمە هاتوچۆ، گریانێك كە لە قوڕگمدا بوو قوتمدایەوە و چاوەڕوانی مودی بووم تا بە هەواڵەوە بۆم بێتەوە.

هەركە گەڕایەوە بەتەنیا، ئیسا لەبەردەم پێپلیكانەكاندا وەستاندی و پێیوت، كەجارێكی تر قوتابخانە تەلەفونیكردووە بۆ بردنەماڵەوەی مەهتاب. مەهتاب هاوكاری ناكات و گریانی هەموو قوتابخانەكەی تێكداوە.

"دەچم دەیهێنمەوە،" بەتوڕەییەوە بە منی وت. "بە تێهەڵدان دەیهێنمەوە، تا جارێكی تر دووبارەینەكاتەوە."

"تكاتـلێدەكەم لێینەدەیت،" هەركە لەماڵ چووە دەرەوە دەستمكرد بەگریان. "تكات لێدەكەم. قسەی لەگەڵ دەكەم."

لێینەدابوو. بەڵام كە گەڕایەوە، زیاتر توڕەییەكەی ڕوو بە من بوو تا مەهتاب، چونكو بەڕێوەبەردەكە مەرجێكی دانابوو، كە مودی نەیویستبوو بچێتە ژێر باری.

"دەیانەوێت تۆ بچیت لەگەڵیدا بۆ قوتابخانە،" مودی وتی، "و لەوێ بمێنیتەوە، تا ئەو لە پۆلەكەدا ئۆقرەدەگرێت. بەلایەنی كەمەوە بۆ چەند ڕۆژ دەبێت، ئەمە بكەیت. تەنیا بەو مەرجە مەهتاب قبوولدەكەن.".

شتێك كەوتە كار! لەدڵی خۆمدا وتم. نیگەران و غەمی ئەوەم بوو، مودی زۆری لە مەهتاب دەكرد بچێت بۆ قوتابخانەی ئێرانی، بەڵام لەپڕ بوارێكم بۆ كرایەوە بۆئەوەی ئاسایی لەماڵ بچمە دەرەوە.

مودی وریایی ئەم ڕێكەوتنە بوو لەگەڵ قوتابخانەدا، كە بە واتای چی دێت، بەڵام ڕێگایەكی تری نەدەبینییەوە. كۆمەڵێك ڕێسای تونلوتیژی بۆ دانام. "لە ژووری بەڕێوەبەری قوتابخانە دەمێنیتەوە، بۆ هیچ شوێنێك ناچیت تا دێم و تۆ و مەهتاب هەڵدەگرم،" وتی. "بۆت نییە، دەست بۆ تەلەفون بەریت."

"بـــەڵێ باشە، بەسەرچاو" پەیمانم پێدا. ئیتر منیش فێری *تەعاروف* بووبووم.

بۆ ڕۆژی دوایی هەر سێکمان تەکسیمان گرت بۆ قوتابخانە. مەهتاب نیگەران بوو، بەڵام دیاربوو نارامتر بوو لەو دوو ڕۆژەی پێشوتر. "دایکت لێرە دەمێنێتەوە،" بە مەهتابی وت و هێمایەکی بۆ کورسییەك کرد، کە لەدەرەوەی ژووری بەڕێوەبەر دانرابوو. "لێرانەدا دادەنیشێت، تەواوی ئەو کاتەی تۆ لە قوتابخانە دەبیت."

مەهتاب سەری بۆ لەقاند و ڕێگەیدا بە یاریدەدەرەکە، بیبات بۆ پۆلەکەی. لە نیوەی ڕێگا لە ڕاڕەوەکەدا، ڕاوەستا و ئاوڕێکی دایەوە. کە منی بینی لەسەر کورسییەکە دانیشتووم، ئینجا بەردەوامبۆوە. "لێرانەدا دادەنیشیت تا دێمەوە بەدواتا،" مودی لێیدووبارەکردەمەوە و ئینجا ڕۆیشت.

ئەو بەیانییەم لێنەدەڕۆیشت. هیچ شتێکم لەگەڵ خۆم نەهێنابوو، کاتی پێببەمەسەر. ڕاڕەوەکە چۆڵ بوو، قوتابییەکان چوونە پۆلەکانیانەوە بۆ وانەخوێندن و یەکسەر ئاگاداربوومەوە، وانەکانیان بەچی دەستپێدەکات. "مەرگ بەر ئەمریکا!" هوتافکێشان لە هەموو پۆلەکانەوە بەرزبۆوە. "مەرگ بەر ئەمریکا! مەرگ بەر ئەمریکا!" "بمرێ ئەمریکا!" سیاسەتی ڕەسمی کۆماری ئیسلامی ئێران بوو، یەك لەسەر یەك دووبارەیاندەکردەوە، دەیانخستە مێشکی بێگەردی قوتابییەکانەوە، دەیانکرد بە گوێی کچە بێتاوانەکەی مندا.

هەرکە مێشکشتنی سیاسی تەواوبوو، گیزەگیزێکی نەرم کەوتە ڕاڕەوەکەوە، کاتێك قوتابییەکان چوونە سەر وانە ئاساییەکانی خۆیان. لەهەر پۆلێکدا، هەتا پۆلی قوتابییە بەتەمەنترەکان، مامۆستا پرسیارێکی دەکرد و قوتابییەکان پێکەوە وەڵامیاندەدایەوە، هەمان وشەگەلێکیان دووبارە دەکردەوە. نە ژوورێك هەبوو، بۆ قوتابییانێك کە پێویستیان زیاتر بە یارمەتی هەبوو، نە بۆ دانیشتنێکی ئارام و پرسیارکردنێك، هەتا بۆ ڕاهێنانی دەنگ. ئەمە ئەو جۆرە قوتابخانەیە بوو، کە مودی کاتی خۆی تیایدا خوێندبووی. کاتێك بەوردی سەرنجی ئەمەم دا، باشتر تێگەیشتم کە بۆچی زۆربەی زۆری ئێرانییەکان ئاوا سوك و ئاسان پەیڕەوی دەسەڵات دەکەن. لەوەدەچوو هەموویان بۆیان سەخت بێت بڕیاری خۆیان بدەن.

ئینسان کە بەو شێوەیە پەروەردەبێت، ئاساییە کە خۆی لە دەستهەڵاتییەکدا ببینێتەوە، کە تیایدا فەرمانی سەخت بۆ ژێردەستەکان دێتەخواردەوە و ژێردەستەکانیش کوێرانە گوێڕایەڵی فەرمانی سەردەستەکان بن. سستمێکی قوتابخانەی ئاواهی بووە مودی بەبارهێناوە، کە داوادەکات و وا چاوەڕوانە کۆنترۆڵێکی تەواوی بەسەر خێزانەکەیدا هەبێت، وەك ئەسرینێك کە تەواو ملکەچی دەسەڵاتی پیاوی سەردەست بوو. سستمێکی قوتابخانەی واهی دەتوانێت گەلێك بەباربهێنێت، کە بەبێ هیچ دوودڵییەك پەیڕەوی فەرمان بکات، هەتا فەرمانی مردنێك ئەگەر لە ئایەتوڵایەکەوە دەربچێت، کە دەوری ڕووناکبیری و ویژدانی ئەو گەلە دەبینێت. بۆم پرسیاربوو، ئەگەر ئەمەیان لەدەستبێت، ئایا دەبێت چی بکەن بە کچێکی تەمەن پێنج ساڵی بچوك؟

پاش ماوەیەك خانم شەهێن هاتە ناو ڕاڕەوەکەوە و هێمایەکی بۆ کردم، بچمە ژوورەکەیانەوە. منیش هەر بەشێوەی خۆیان هێمام بۆ کرد، کەمێك سەرم بۆ بەرزکردەوە و بەزمان چەند کرتەیەکم کرد، کە نایەم. لەو ساتەدا ڕقمدەبۆوە لە هەموو ئیمەنێکی ئێرانی، بەتایبەتی ژنی ملکەچی عەبابەسەر. بەڵام بەڕێوەبەرەکە کۆڵینەدا و بەقسەی خۆش بانگیکردمەوە.

هەستام و چوومە ژوورەوە. بەچەند هێمای تر کورسییەکی دانیشتنی خۆشتری بۆ هێنام و دەعوەتی چای کردم. قبووڵمکرد و کەوتمە قوملێدانی چاکەم و تەماشاکردنی ئیشکردنی ئەو ژنانەی کە لەوێ بوون. سەرەڕای هاتوهاواری دڕندانەی دژی ئەمریکایی، کە دەبوو فێری قوتابییەکانیان بکەن، لەوەدەچوو بەسۆزەوە ڕێزم لێبگرن. چەند هەوڵماندا لەیەکتری بگەین، بەڵام باش بۆمان نەچووەسەر.

بۆ تەلەفونکە سوێم بووبۆوە، کە لەبەر دەستمدا بوو، بۆئەوەی تەلەفونێکی پێبکەم بۆ باڵوێزخانە، بەڵام نەمدەوێرا لەو یەکەم ڕۆژەدا دەستبەرم بۆ هەموو شتێك.

سێ مێز و پێنج فەرمانبەر بوون لە ژووری بچوکی بەڕێوەبەرەکەدا. بەڕێوەبەرکە لە سوچێکی ژوورەکەدا کاریدەکرد، کە کارێکی وەها نەبوو. مێزەکانی تریش، یەکی چەند فەرمانبەری بەسەرەوە بوو، کە بە دەستێکیان چەند کاغەزیان ئەمدیواو ئەودیوو دەکرد و بە دەسەکە تریان لەژێر چەناگەیانەوە عەباکانیان گرتبوو. یەکێکیان هەستا و چوو زەنگی قوتابخانەی لێدا. چەند جارێکیش خەریکی تەلەفونکردن بوون. بەڵام زۆربەی کاتەکەیان بە قسەوباس دەبردەسەر، هەرچەند لە ناوەڕۆکەکەی تێنەدەگەیشتم، بەڵام ڕۆشن بوو هەر قسەلۆك بوو.

لەپێش نیوەڕۆدا گوێم لە دەنگەدەنگێك بوو، لە ڕاڕەوەکەوە دەهات. مامۆستایەك پەلی قوتابییەکی کێشکرد بۆ ناو ژوورەکە، قوتابییەکە لە تەریقیدا سەری داخستبوو. مامۆستاکە کۆمەڵێك تاوانی دایە پاڵی و یەك لەسەر یەك وشەی "*بەدا*"ی "خراپ"ی دووبارەدەکردەوە، کە دروست بە واتای "باد"[3]ی ئینگلیزی دێت. خانم شەهێن و باقی فەرمانبەرانی ناو ژوورەکە کەوتنە پەلاماردانی قوتابییەکە. یەکدەنگ هەموو سوکایەتییان بە کچەکە کرد تا خستیانە گریان. کاتێك کە ئەمە بەردەوامبوو، یەکێك لە کارمەندەکان هەستا و تەلەفونیکرد. لە چەند خولەکدا ژنێك بە پەشۆکاوییەوە خۆی کرد بە ژوورەکەدا، دیاربوو دایکی کچەکە بوو. دەستیکرد بە هاوارهاوار و پەنجەی تاوانی بۆ کچەکەی خۆی ڕاکێشا و هەرچی داخی خۆی بوو بە منداڵە بێدەسەڵاتەکەی ڕشت.

"بەد، بەدا" دایکەکە هاواریدەکرد. کچەکەش بە نوکەنوك وەڵامیدایەوە.

بۆ چەند خولەك ئەم شانۆی بێرێزیکردنە بەردەوامبوو، تا دایکەکە پەلی کچەکەی گرت و بە ڕاکێشان لە ژوورەکە بردییە دەرەوە.

لەپڕ خانم شەهێن و باقی ژنەکانی تر توڕەبوونەکەیان لەبیرچۆوە. زەردەخەنە کەوتەوە سەر لێوانیان و پیرۆزباییان لە یەکتری کرد بەبۆنەی ئەنجامدانی سەرکەوتوانەی

کارەکەیانەوە، دیاربوو کارەکەشیان هەر ئەوە بوو، کە کچەکە هەستبکات بەدە. نەمزانی تاوانی ئەم منداڵە هەژارە چی بوو، نەمدەتوانی یارمەتیبدەم، بەڵام زۆر بەزەییم پیایدا هاتەوە. ویردم خوێند، کە مەهتاب هەرگیز توشی شتێکی وەها نەبێت.

مەهتاب ئەو بەیانییە لە قوتابخانەدا مایەوە، چونکو دەیزانی لە نزیکیم. لە نیوەڕۆدا کاتێك قوتابخانە تەواوبوو، مودی هات بۆئەوەی بە تەکسی بمانباتەوە بۆ ماڵەوە.

بۆ ڕۆژی دوایی، کاتێك لە ژوورەکە دانیشتبووم، خانم شەهێن مامۆستایەکی پێناساندم. "ناوم ئازدەرە" ژنەکە وتی. "هەندێك ئینگلیزی دەزانم. پێکەوە قسەدەکەین." لەتەنیشتم دانیشت و سەرنجیدا، کە گومانم هەیە. "ئێمە دەزانین تۆ ئێمەت بەدڵ نییە،" ژنەکە بەردەوامبوو. "ئێمە حەزناکەین، تۆ بە خەڵکانێکی بەدمان بزانیت. تۆ قوتابخانەکەت پێباش نییە؟"

"قوتابخانەکە پیسە،" وەڵامەدایەوە. "پێمخۆش نییە، مەهتاب لێرەیە."

"زۆر بەداخین،" خانم ئازدر وتی. "هەست بە بەد ی دەکەین، چونکو تۆ بیانیت لە وڵاتەکەماندا. پێمانخۆشە شتێك بۆ تۆ بکەین."

خانم شەهێن بەسەرمانەوە ڕاوەستابوو. بۆم پرسیاربوو، چەند لە ئێمە تێدەگات. شتێکی بە فارسی وت و خانم ئازەر وەریگێڕا. "بەڕێوەبەر دەڵێت، کە هەموو کەس بەڕاستی دەیەوێت فێری ئینگلیزی بێت. دەڵێت، تۆ هەموو ڕۆژێك دێیت بۆ ئێرە، کاتێك چاوەڕوانی مەهتاب دەکەیت، ئایا دەتوانی فێری ئینگلیزیان بکەیت؟ ئەوانیش دەتوانن تۆ فێری فارسی بکەن."

ئەمە وەڵامی ویردەکانمە، لە دڵی خۆمدا وتم. بوارێك هاتەپێشەوە بۆ یەکتری ناسین. "بەڵـــێ،" ڕازیبووم.

دەستمانپێکرد. ژنەکان لە ژووری بەڕێوەبەردا کارێکی وەهایان نەبوو، کاتی پێبەرنەسەر، ناوبەناو نەبێت بەکۆمەڵ دەکەوتنە تەمێ و شەرمەزاریکردنی قوتابییەك، لەبەرئەوە تەواوی پێش نیوەڕوان، خەریکی فێربوونی زمانی جیاوازی یەکتر دەبووین. کە ماوەیەکمان بردەسەر، تا ئاستێك بەم ژنانە ئاشنابووم. دوو جیهانی جیاواز بووین لە داب و نەریت و مەبەست لە ژیان، لەگەڵ ئەوەشدا ئەمانە ژن بوون، چاودێری منداڵانیان دەکرد و بەو شێوەیەی کە خۆیان دەیانزانی، ئەوپەڕی هەوڵیاندەدا. لە سستمێکی خوێندندا گیریانکردبوو، کە بەسەریاندا سەپێنرابوو، دروست چی دەبێت بکەن و دروست چۆنی دەکەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێمایەك لە کەسایەتییان دەبینرا. تێگەیشتن لەیەکتری سەخت بوو، بەڵام بەو باوەڕە گەیشتم، کە لێرە لەگەڵ ئێرانییەکی زۆرتر بەرەوڕووم، کە ئەو خۆشخەیاڵییان بە هەلومەرجی وڵاتەکەیان نەماوە.

ئەوەندەی دەگەڕایەوە بە هەڵسوکەوتیان بەرامبەرمان، ئەم هاوڕێ تازانەم دیاربوون، کە بەڕاستی گرنگییان بە من و مەهتاب دەدا. هەموو بەیانییەك لەگەڵ مەهتابدا دەیانکرد بە قریوەقریوو، یەکێك یان چەند کەسێکیان بەرزیاندەکردەوە و ماچیاندەکرد. خانم

شەمێن زووزوو پێیدەوت، حەزم لە "بۆنەکەتە،" مەبەستی بۆنێکی قەدەغەکرابوو، کە هەموو بەیانییەك مەهتاب لە خۆیی دەدا. هەموو ئەم ژنانە ڕقیان لە مودی بوو، کە بەردەوام بەیانیان ئێمەی دادەنا و نیوەڕوان دەهاتەوە بەدوامانیدا، دەوری زیندانەوانی ئێمەی دەبینی. زۆر وریای ئەوە بوون، هەستی خۆیان دەرنەخەن، لەگەڵ ئەوەی کە دژی ڕفتاری ناغایانەی مودی بوون بەرامبەر بە هاوسەر و کچەکەی.

خانم ئازەر خەریکی وانەوتنەوە بوو، سەری زۆر نەدەپرژایە سەر ئێمە، بەڵام هەرئەوەندەی بیتوانیایە دەهات بۆ ژوورەکە بۆ لامان.

سەرسامبووم لەوەی کە زانیم، خانم ئازەر لە پێش شۆڕشدا بەڕێوەبەری قوتابخانە بووە. لە سایەی حکومەتی تازەدا پیشەگەرێکی کارامەی وەك ئەم، بە خوێندنێکی بەرز و چەند ساڵ ئەزموونەوە، دەهێنرایەخوارەوە و جێگاکەی لەلایەن بەڕێوەبەرێکی زیاتر سیاسی لایەنگرەوە پڕدەکرایەوە. ئەم جۆرە بەڕێوەبەرانە، کە بۆ حکومەت پێشتریتیان هەبوو، تەمەنیان کەمتر بوو، کەمتریان خوێندبوو، بەڵام بۆچوونێکی دینی توندڕەویان هەبوو.

"خانم شەمێن لەبەر ئەو هۆیە دانراوە،" خانم ئازەر پێیوتم. "خۆی و خێزانەکەی زۆر دینین. دەبێت سەر بە خێزانێکی توندڕەوی دینی بیت. لە ڕابوردووت دەکۆڵنەوە. ناتوانیت لەسەرکار، هەروا خۆت وا پیشانبدەیت کە دینیت."

ڕۆشن بوو خانم شەمێن وەك بیروبۆچوون، دژی ئەمریکا بوو. بەڵام کە پێکەوەبوونی بەزۆر درێژمیکێشا، منی چوو بەدڵدا، سەرەڕای ئەمریکایی بوونم.

ڕۆژێکیان پاش تەواوبوونی گفتوگۆیەك لەگەڵ خانم شەمێن، خانم ئازەر پێیوتم، "بەڕاستی پێمانخۆشە، خزمەتێك بە تۆ بکەین."

"زۆر چاکە،" ئەمەم بە هەڵێك زانی و وتم، "تەنیا ڕێگەمبدەن ئەو تەلەفونە بەکاربهێنم."

خانم ئازەر داواکەی منی بە خانم شەمێندا وت. بەڕێوەبەر سەری بەرزکردەوە و بە کرتەکرتکردن نـــەی بەیانکرد. چەند وشەیەکی لەژێر لێوەوە وت، کە خانم ئازەر وەریگێڕا: "ئێمە بەڵێنمانداوە بە مێردەکەت، کە هەرگیز ڕێگەتنەدەین لە قوتابخانە بچیتە دەرەوە یان تەلەفون بەکاربهێنیت."

دیسانەوە بۆم دەرکەوت، کە ئەم ژنانەش وەك من، بەبێ هیچ گومانێك، کەوتوونەتە داوەوە، داوی یاسای جیهانی پیاوەوە، نارازین بەڵام ملکەچن. سەیرێکی چاوانی یەك بە یەکی ئەو ژنانەم کرد کە لە ژوورەکەدا بوون، بێجگە لە هاودەردی شتێکی تری تیادا بەدەینەدەکرا.

تێبینییەکان:

1. cousin: بە واتای ئامۆزا، پورزا یان خاڵۆزا دێت، لە زمانی ئینگلیزیدا وشەی جیاواز بۆ ئەمانە نییە، هەر بۆیە نووسەر سەر لەو پەیوەندییە خێزانییە دەرناکات و بە ئاڵۆز ناوی لێدەبات، ئاساییشە لە باسکردنی ئەم پەیوەندییانەدا سەر لە خوێنەریش تێکبدات - وەرگێڕ.

2. Newsweek magazine.

3. "بەد"ی فارسی و "باد - bad"ی ئینگلیزی بە واتای "خراپ" دێت.

4. خانم ئازەر بە ئینگلیزییەکی خراپ دەدووێ و نووسەر وەکو خۆی دەیگێڕێتەوە. لەجیاتی (bad) ی ئینگلیزی (بەد)ی فارسی بەکاردەهێنێت و نووسەریش هەر ئەوەی داناوەتەوە.

# 8

ڕۆژێکی گەرم و هەتاوی نائاسایی دوانیوەڕۆی پایز بوو، کە مودی بە بێزارییەوە داوای مەهتابی قبوولکرد، کە بمانبات بۆ پارك. پارکەکە چەند کۆڵان ئەولاتر بوو، کەچی مودی بۆڵەبۆڵیبوو لەسەرئەوەی دوورە. "تەنیا دەتوانین چەند خولەکێك بمێنینەوە،" مودی وتی. دەمزانی، کاری زۆرە و دەبێت بیکات. ڕۆژنامە بخوێنێتەوە، گوێ بۆ قسەی پوچی رادیۆ بگرێت و سەرخەوێك بشکێنێت.

کە نزیکی جۆلانە و خلیسکێنەکە بووینەوە لە کۆتایی پارکەکەدا، مەهتاب بە بینینی کچێکی بچکۆلەی قژکاڵ، لە خۆشیاندا قیژەیەکی کرد، تەمەنی نزیکەی چوار ساڵ دەبوو، شۆرتێك و کراسێکی سەردەی لەبەردابوو لەگەڵ جۆتێ کالەی تێنس، لەوانەی کە مەهتاب لە ئەمریکاوە لەگەڵ خۆی هێنابووی.

ژن و پیاوێك لە تەنیشت خلیسکێنەکەوە ڕاوەستابوون و چاودێریاندەکرد. دایکەکە ژنێکی گەنجی جوان بوو، قژە کاڵەکەی لەژێر ڕووسەرییەکەیەوە هاتبووە دەرەوە. پاڵتۆیەکی قاوەیی کاڵی بە پشتێنەوە لەبەردابوو ، کە مۆدێلەکەی ئێرانی نەبوو.

"ئەمریکاییە،" بە مودیم وت.

"نـــا،" بەتوڕەییەوە وتی، "ئەڵمانی قسەدەکات."

کە مەهتاب ڕایکرد بۆ لای کچەکە بۆ یاریکردن، من زوو خۆم گەیاندە لای ژنەکە، سەرەڕای نارەزایەتی مودی. لەگەڵ پیاوێکی ئێرانیدا گفتوگۆی بوو، بەڵام لە ڕاستیدا بە ئینگلیزی قسەیدەکرد!

خۆمم ناساند، لەکاتێکدا مودی لە تەنیشتمەوە بە گومانەوە ڕاوەستابوو.

ناوی جودی بوو. هاوسەرەکەی لەدایکبووی ئێران بوو، بەڵێندەری بینا دروستکردن بوو لە نیۆرك ستی، خۆی لەوێ مابۆوە و جودی هەردوو منداڵەکەی هێنابوو ئێران، بۆ بینینی دایك و باوکی هاوسەرەکەی. لە ناوەڕاستی مۆڵەتی دوو هەفتەییاندا بوون. ئیرەییم بە بلیتی فڕۆکەکەی دەبرد، بە پاسپۆرتەکەی، بە ڤیزەی گەڕانەوەی! بەڵام باسی هیچ یەك لەمانەم نەکرد، چونکو مودی نزیکم بوو.

جودی ئێمەی ناساند بە عەلی، برای هاوسەرەکەی. هەرکە عەلی زانی مودی دکتۆرە، ئاماژەی بۆ ئەوە کرد، کە لە هەوڵی دەرهێنانی ڤیزەی پزیشکیدایە بۆ سەردانی ولاتە یەکگرتووەکان بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی دڵی. جودیش وتی، کە هەفتەی داهاتوو دەچێت بۆ فرانکفۆرت، بۆ باڵوێزخانەی ئەمریکا، بۆ دەرهێنانی ڤیزە بۆ عەلی. دەیانویست بزانن، مودی وەك دکتۆرێکی ئەمریکایی ئێرانی، ئامۆژگاری چییە. لەپڕ مودی گەشایەوە، سەرنجی چوو بۆلای خۆی و منی لەبیرچۆوە.

کچەکان لە خلیسکێنەکە بازیاندایە خواردوە و ڕایانکرد بۆ لای جۆلانەکە، من و جودیش دوایانکەوتین. هەر ئەوەندەی مودی نەیدەتوانی گوێبیستی گفوگۆکەمان بێت، کاتم لەدەستنەدا. "من لێرە بارمەتەم،" بە ئەسپایی پێموت. "دەبێت یارمەتیمبدەیت. تکاتلێدەکەم بچۆ بۆ باڵوێزخانەی ئەمریکا لە فرانکفۆرت و پێیانبڵێ من لێردم. دەبێت شتێکم بۆ بکەن، یارمەتیمبدەن."

مودی و عەلی بەدەم قسەکردنەوە، بەهێواشی بەرەو لای ئێمە هاتن. جودی تەماشایەکی کردم و پێکەوە بەهەمان ناڕاستە جولاین لەپێشی ئەوانەوە. "ڕێگەم پێنادات لەگەڵ خەڵك بدوێم،" پێموت. "لێرە بەندیانکردووم و پەیوەندیم بە کەسوکارمەوە پچڕاوە."

"چۆن دەتوانم یارمەتیتبدەم؟" جودی پرسیاریکرد.

بۆ چەند ساتێك بیرمکردەوە. "با لەبارەی کاروباری پزیشکییەوە قسەبکەین،" پێشنیارمکرد. "ئەگەر وا لە مودی بکەیت لەسەر بابەتی پزیشکی بدوێت، متمانەی بەخۆی بەهێز دەبێت."

"زۆر چاکە،" جودی وتی. "هەرچی چۆنێك بێت، دەبێت ڤیزەی پزیشکی بۆ عەلی بەدەستبهێنین. با بزانین، هاوسەرکەت لەم پەیوەندەدا دەتوانێت چی بکات."

گەڕاینەوە بۆ لای پیاوەکان. "دەتوانیت یارمەتیبدەیت؟" لە مودیم پرسی.

"بەڵێ. پێشمخۆشە." بینیم مودی زیاتر لە دکتۆر دەچوو وەك لەو چەند مانگەی پێشوو. "دەتوانم نامەیەك بنووسم،" پێشنیاریکرد. "دەزانم، دەبێت بە کێوە پەیوەندیبکرێت. بۆ خۆم چەند کاغەزی نامەنووسینی ئەمریکیم هەیە." بۆ چەند ساتێك بیریکردەوە و ئینجا وتی. "بەڵام پێویستیم بە دەزگایەکی تیپنووسە."

"دەتوانم بۆت ئامادەبکەم،" جودی وتی.

تەلەفونی یەکتریمان یاداشتکرد و بڕیارماندا، بەم زووانە لە پارکەکە یەکتری ببینینەوە. ئەو تۆزە پیاسەیەی ماڵەوە گورجکەرەوە بوو. مودی لە هەوای خۆیدا بوو. متمانە بەخۆی ئەوەندە تیایدا بەهێزبووبوو، چاوی ئەوەی نەبینی کە من و ئەو ژنە ئەمریکییە دووبەدوو قسەمانکرد.

جودی زوو کەوتەخۆی. پاش دوو ڕۆژ تەلەفونیکرد و داوای من و مەهتابی کرد، کە لە پارکەکە بمانبینێت. هیوایەکی زۆرم نەبوو، کە مودی ڕێگەمانبدات خۆمان بڕۆین، بەڵام وا دیدارەکەی دانا کە خۆشی لەگەڵمان بێت. گومانی هیچ تەڵەنانەوەیەکی نەدەکرد، بەڵام بڕیاریدابوو چاوی لێمانەوە بێت.

ئەم جارەیان لە پارکەکە، پیاوێکی ئێرانی ڕیشداری کورتی تەمەن نزیك سی ساڵە لەگەڵ جودیدا بوو. جودی وەك ڕەشید، بەڕێوەبەری نوسینگەی کلینیکی گەورەی دەرمان، ناساندی. مودی پێیخۆشبوو قسەوباسێکی تری پزیشکی دامەزرێنێت و دەستیکرد بە

پرسیارکردن، لەسەر چۆنییەتی وەرگرتنی مۆڵەت لە ئێراندا. لەو کاتەدا من و جودی جولاین بۆ قسەوباسی تایبەت.

"نیگەران مەبە،" جودی وتی. "ڕەشید هەموو شتێك لەباردی تۆوە دەزانێت. دەزانێت چی بە هاوسەرکەت بڵێت. ئومێدەوار بووین بە تەنیا لەگەڵ تۆ بدوێین، بەڵام دەزانێت چۆن سەرگەرمی بکات، تا من و تۆ بتوانین پێکەوە قسەبکەین." چەند پولی دامێ. "دەتوانی نامەی پێبنێریت، کە دەستت بە سندوقی پۆستی گەیشت." جودی وتی.

پاشان باسی هەنگاوی دووەمی پلانەکەی کرد، کە چەند شەوی تر خەسووەکەی ئێوارە خوانێك ڕێکدەخات بۆ ماڵئاوایی جودی و منداڵەکانی و جودی وای دانبوو، کە ئێمەش دەعوەتبکات. هەروەها تیپنووسێکی ئامادەکردبوو، کە نامەکەی مودی بۆ عەلی پێ تایپبکەم. وە بە نیاز بوو، لەو هەراوبەزمەی ئاهەنگ و نانخواردنەدا من بتوانم بەتەنیا لەگەڵ ڕەشیددا قسەبکەم، چونکو، جودی وتی، "کەسانێك دەناسێت کە خەڵك دەبەنە دەرەوە بۆ تورکیا."

ئەو دوو ڕۆژەم زۆر بە سەختی لێڕۆیشت، کاتێك چاوەڕوانی ئاهەنگی ماڵئاوایی و ئەو هەلەم دەکرد، بزانم چۆن لە ئێران بچمە دەرەوە. ئایا خەڵك بە فڕۆکە دەبەن؟ بە ئوتومبیل؟ چ شتێك پاڵیان پێوەدەنێت ئەم کارە بکەن؟ بۆچی خۆیان دەخەنە مەترسی سزایەکی گەورەوە لەلایەن ئایەتوڵایەکەوە لەسەر پێشێلکرنی هەر یاسایەکی ئیسلامی؟ ئەمە زۆری تێدەچێت؟ من و مەهتاب پێویستمان بە پاسپۆرتەکانمان دەبێت؟

خوایە گیان، پاڕامەوە، هەلێکم بۆ ڕێکخە تا بتوانم لە ئاهەنگەکەدا بەتەنیا لەگەڵ ڕەشیددا قسەبکەم.

هاوکات بڕیارمدا، جودی وەك نامەهەڵگرێك بەکاربهێنم. نامەم بۆ دایك و باوکم و جۆی و جۆن نووسی و ئاگادارمکردنەوە، کە چەندم خۆشدەوێن و بیریاندەکەم، هەروەها بەوردی باسی هەلومەرجی تازەی خۆمم بۆ کردن. کە نامەکانم خوێندەوە، بینیم زۆر خەمناوەرن و نائومێدیان زۆر تیادایە. خەریکبوو هەموویان بدڕێنم، بەڵام بڕیارمدا هەر بیاننێرم، چونکو هەرچی چۆنێك بوون، باری دەروونی منیان پیشاندەدا.

نامەیەکی تریشم بۆ جیمی برام و ڕۆبینی هاوسەری نووسی، تیایدا پێشنیاری پلانێکم کرد. بۆ باسکردن، کە مودی گرفتی پارەی هەیە. پارەیەکی زۆرمان لێرە خەرجکردووە و هێشتا مودی هیچ کارێکی دەستنەکەوتووە. هەموو سامانەکەمان لە ئەمریکایە. لەوانەیە مودی تەنیا پێویستی بە بەهانەیەك بێت بۆ گەڕانەوە. پێشنیارمکرد، کە جیم تەلەفونمان بۆ بکات و هەواڵی خراپبوونی وەزعییەتی باوکمان پێبدات، کە پێویست بکات ئێمە "سەردانێکی" ماڵەوە بکەین. جیم بڵێت، کە خێزانەکە پارەیەکیان کۆکردۆتەوە بۆ کڕینی بلیتی فڕۆکە. ئەمە یارمەتییەك دەبێت بۆ مودی - کە سەفەرێکی خۆڕایی بکات.

ئاهەنگی ماڵی خەسووەکەی جودی شادیهێنەر بوو. هەر پێمانئنایە ناو ماڵەکەوە، تووشی دیمەنێکی سەرسوڕهێنەر بووین، مۆسیقای ئەمریکی دەنگیدەدایەوە و موسڵمانانی

شیعە بە ئاوازی رۆك - و رۆل[1] سەمایاندەکرد. ژنەکان جلوبەرگی ڕۆژئاواییان لەبەردابوو، هیچ کامێکیان بە ڕووسەری و عەباوە خۆیان شەتەکنەدابوو. میوانەکان بەبێ ئەوەی بەخۆیان بزانن، لەگەڵمدا بووبوون بە پیلانگێڕ. بە شکۆییان دەزانی دکتۆرێکی ئەمریکی لە ئاهەنگەکەیاندا بێت و یەکسەر دەوری مودییان دا و گوێبیستی قسەکانی بوون. مودی بێخەیاڵ چووبووە هەوای خۆیەوە، کاتێك جودی بە ئاگاداری مودی خۆی، پەلی منی گرت بۆ ژووری نوستنێك بۆ تایپکردنی نامەکە. ڕەشید لەوێ چاوەڕوانمبوو.

"هاوڕێیەکەم خەڵك دەبات بۆ تورکیا،" ڕەشید وتی. "سێ هەزار دۆلاری تێدەچێت."

"پارەم بۆ گرنگ نییە،" وەڵاممدایەوە. "تەنیا دەمەوێت لەگەڵ کچەکەم لێرە دەرچم." دەمزانی خێزانەکەم و هاوڕێکانم هەرچی جۆرێك بێت، ئەو پارەیەم بۆ ئامادەدەکەن. "کەی دەتوانین بڕۆین؟" بە پەرۆشەوە پرسیارمکرد.

"ئێستا ئەو هاوڕێیەم لە تورکیایە و کەش هەتا دێت، بەرەو خراپتر دەڕوات. نازانم دەتوانن بە زستان بڕۆن، پێش ئەوەی بەفر بتوێتەوە. لە دوو هەفتەدا تەلەفونم بۆ بکە. لێیدەکۆڵمەوە."

لەناو دەفتەری ناونیشانەکانمدا تەلەفونەکەی ڕەشیدم بە شێوەی پەرلە یاداشتکرد.

ڕەشید ڕۆیشت، بەڵام من و جودی لەپاش تایپکردنی نامەکە زیاتر ماینەوە. بەردەوام وریای خۆم بووم، ئەوەکو مودی بەدوای مندا خۆی بکات بە ژوورەکەدا، بەڵام نەهات.

ئەو نامانەی نووسیبووم دام بە جودی، کە ڕازیبوو لە فرانکفۆرتەوە پۆستیانبکات. ئەو ماوەیە بێوچان لەسەر ئەمریکا دواین و هاوکات خەریکی کارێکی پڕمەزە بووین، خۆئامادەکردنی جودی بۆ سەفەری سبەینێی. نە من و نە جودی نەماندەزانی، جودی چی لەدەستدێت یان هاوڕێکەی ڕەشید، چۆن دەتوانێت من و مەهتاب بەرێت بۆ تورکیا، بەڵام جودی بڕیاریدابوو ئەوپەڕی هەوڵبدات. "من هاوڕێی تریشم هەیە، پەیوەندییان پێوە دەکەم،" وتی.

کۆتایی ئاهەنگەکە بوو، مودی بسکەی سمێڵی دەهات. "ڕەشید کارێکی بۆ دۆزیومەتەوە لە کلینیك،" لەخۆشیاندا گەشکە گرتبووی. "دەبێت بڕوانامەکەم ئامادەبکەم."

شەو درەنگ بوو، کە ماڵئاواییمانکرد. من و جودی بەچاوانی پڕ فرمێسکەوە لەیەکتری جیابووینەوە، هەتا نەماندەزانی، کە ئایا یەکتری دەبینینەوە.

عەمە بزورگ کردبووی بە خوو، کە بۆ ڕۆژانی هەینی، هەموو کەسوکار لە ماڵەکەی خۆیدا کۆکاتەوە بۆ گێڕانی ئاهەنگی ڕۆژی پشوو[2]. بەڵام مودی وردەوردە ئەو حەزەی جارانی بەرامبەر بە خوشکەکەی نەما، تا ڕۆژێکیان پێیوت، کە ئێمە لە هەینیدا پلانێکی ترمان هەیە.

وەك ڕوویدا، شەوێکی سێ شەممە عەمە بزورگ خراپ نەخۆشکەوت. "دایکم گیانەدەدا،" زوهرە لەسەر تەلەفون بە مودی وت. "دەبێت بێیت و بۆ دواخولەکانی ژیانی لەگەڵیدا بیت."

سەرەڕای گومانی لە پێچوپەنای خوشکەکەی، مودی نیگەرانبوو، بەپەلە تەکسی گرت و چووین بۆ ماڵی خوشکەکەی. زوهرە و فریشتە یەکسەر ئێمەیان برد بۆ ژووری نوستنەکەی دایکیان، کە لەوێ یەکتەختە لەناوەڕاستی ژوورەکەدا لەسەر فەرشێك پاڵکەوتبوو، مێزەرناسا سەری بە پەڕۆ پێچابوو، هەشت ئینج باتانی بەخۆیدا دابوو. ناوچەوانی عارەقی دەرددەدا و پەیتاپەیتا بەدەستی دەیسڕی. لەتاو ئازار ناڵەناڵی بوو، بەردەوام لەبەرخۆیەوە بە فارسی دەیوت، "دەمـرم، دەمـرم."

مەجید و ڕەزا لەوێ بوون، خزمەکانی تریش بەڕێگاوە بوون.

مودی بە وردی خوشکەکەی پشکنی، بەڵام هیچی نەدۆزییەوە. بە ئەسپایی بە منی وت، کە لەو باوەڕەدایە عارەقکردنەوەکەی زیاتر بەهۆی ئەو هەموو بەتانییانەوەیە کە پیایدا دراوە، نەك تا. بەڵام لەتاو ئازار دەیلوراند. هەموو گیانی ژانیدەکرد. بە ئاوازەوە دەیوت، "دەمـــرم، دەمـــرم."

زوهرە و فریشتە شۆربای مریشکیان دروستکردبوو. لە قاپێکدا هێنایان بۆ دایکە گیانەڵەکەیان و یەك بە یەکی خێزانەکە لەگەڵ عەمە بزورگدا کول و کافربوون، هەر بۆنەوەی کەوچەکێك شۆربا بە قورگیدا بچێتەخواردەوە. مەجیدی کوڕە هەرە گەنجەکەی توانی کەچکێك نزیکی لێوی بکاتەوە، بەڵام عەمە بزورگ دەمی خستە کلیلەوە و نەیهێشت دڵۆپێك بچێتەخواردەوە.

سەرئەنجام مودی توانی کەوچکێکی پڕ لە شۆربا بکات بە دەمی عەمە بزورگدا. هەر کە هەڵیقوڕاند، ژووری پڕ تەماشاکەر لە خۆشیاندا هاواریان لێهەڵسا.

شەونخونی و دانیشتن بەدیار عەمە بزورگەوە شەو و ڕۆژێکی خایاند، ناوبەناو بابەحاجی سەرێکی دەکێشایە ناو ژوورەکەوە، بەڵام زۆربەی کاتەکەی هەر بە نوێژکردن و قورئان خوێندن دەبردەسەر.

من، مودی و مەهتاب ئاددەهات وەڕستر دەبووین لەم شانۆگەرییەی عەمە بزورگ. من و مەهتاب دەمانویست بڕۆین، بەڵام مودی بۆ جارێکی تریش گەریکردەوە لە نێوان ئەم شانۆگەرییە و ڕێزی بۆ کەسوکاری. عەمە بزورگ تا ئێوارێی ڕۆژی هەینی لە جێگای مردندا مایەوە - کە بڕیاربوو ئێمە لە شوێنێکی تر بین.

عەمە بزورگ پشتی بە خوا بەست و لەناو جێگاکەیدا ڕاستبۆوە و ڕایگەیاند، دەستبەجێ دەچێت بۆ زیارەت بۆ شاری مەشهەد لە بەشی باکووری ڕۆژهەڵاتی وڵات، کە لەوێ مەسجیدێکی لێیە، ناسراوە بەوەی نەخۆشی لەژێر دەست دەرناچێت تا چاکینەکاتەوە. لە ڕۆژی شەممەدا هەموو خێڵەکە یاودری عەمە بزورگی تەواو چست و

چالاکیان کرد بۆ فرۆکەخانە، تا بیخەنە ناو فرۆکەیەکی دروستەوە. ژنەکان چاو بە هەزار فرمێسك، پیاودکان کەوتنە تەسبیحات و ویرد خوێندن بۆ موعجیزەیەك.

مودی دەوری خۆیی بینی و ئەرکی سەرشانی ئەنجامدا، بەڵام هەر ئەوەندەی لێیاندووركەوتینەوە، لەبەرخۆیەوە بە منی وت، "ئەمە هەمووی شانۆگەری بوو."

مانگی تشرینی یەکەم بوو بە تشرینی دووەم. بەیانیانی ساردی ناو ماڵی کەم گەرمکراو، بەیانگەری ئەوە بوو، کە زستانەکەی بە شێوەی هاوینە سوتێنەرەکەی، سەخت دەبێت. بێگومان ئێمە کە هاتین بۆ ئێران، خۆمان بۆ زستان ئامادەنەکردبوو، وە بەتایبەتی مەهتاب پێویستی بە پاڵتۆی گەرم هەبوو. سەرم سوڕما، کە بینیم مودی بیانو دەهێنێتەوە بۆ نەکڕینی و تێگەیشتم کە بێپاردیی تەنگی پێهەڵچنیوە.

هەوڵەکەم لەگەڵ جیمی برام بێناکام دەرچوو. پاش دوو هەفتە لە نامە دانەکانی من بە جودی، جیم تەلەفونیکرد بۆ ماڵی مامل، بەو پێیەی کە من بۆم نووسیبوو. بۆ مودی باسکرد، کە باوکم زۆر نەخۆشە و خێزانەکە پارەی سەفەری فرۆکەیان کۆکردۆتەوە بۆ ئێمە بۆ سەردانی ماڵەوە. "ئایا دەتەوێت بلیتان بۆ ببڕم؟" پرسیاریلێکرد. "بۆ چ ڕۆژێك جێگاتان بۆ بگرم؟"

"ئەمە تەڵەکەبازییە!" مودی لە تەلەفونەکەدا هاواریکرد. "بیتی نایەتەوە بۆ ماڵەوە. ڕێگەی پێنادەم بگەڕێتەوە."

تەلەفونەکەی بەتوڕەییەوە داخست و ڤینی خۆیی لە مندا بەتاڵکردەوە.

شەڕەدەنوکێکی زۆرمان بوو لەسەر پارە. بەڵێنی کار دۆزینەوەی ڕەشید لە کلینك، هەرگیز ڕۆشنایی بەخۆیەوە نەبینی. گومانمکرد، کە ئەو بەڵێنەش هەر *تەعارف*ە.

هەرچی چۆنێك بوو، مۆڵەتە پزیشکییەکەی مودی نەکەوتە کار، لەگەڵ ئەوەشدا منی تاوانباردەکرد، کە ناتوانێت کاربکات.

"دەبێت هەر لەماڵەوە بم بۆ چاودێری تۆ،" مودی وتی، تا دەهات سکاڵاکانی کەمتر ژێربێژیان پێوە دیاربوو. "دایەنم پێویستە بۆ تۆ. بەهۆی تۆوە، هیچ ئازادییەکم نییە بەم لاو ئەو لادا بچم. سیئایەنەی بەدوای منەوەیە، چونکو تۆ شتێکت کردووە تا کەسوکارت بەدوای تۆ و مەهتابدا بگەڕێن."

"چی وای لە تۆ کردووە، وا بیربکەیتەوە کە کەسوکارم بەدوای ئێمەدا دەگەڕێن؟" پرسیارم لێکرد.

سەیرێکی کردم و هیچی نەوت، واتاکەی بۆ من لە هەزار وشە بەهێزتر بوو. چەند ئاگادارە؟ کەوتمە گومانەوە. دەمزانی، باڵویزخانە لەبارەی منەوە پەیوەندییان پێوە کردووە، بەڵام ئەو ئاگادار نەبوو کە من دەزانم. یان ئایا ئاگاداری ئەوەیە کە من دەزانم؟

دەمزانی، کۆمەڵێك پرسیاری ڤورس مێشکی جەنجاڵکردووە.

چەند دەتوانێت متمانە بە من بکات؟ لە گوماندا بوو. کەی یان هەتا دەتوانێت باوەڕبکات، کە من بەجۆرێك دەست لە هەڵهاتن هەڵدەگرم؟ کەی دەبێت بۆ ملکەچکردنـــم، دەستبەرێت بۆ تێهەڵـــدان ؟

مودی هەڕەشەی لێکردم و پاشقولی لێگرتم، تا کێشمبکات بۆ ئێران. ئێستا ئیتر نەمدەزانی، چیم لەگەڵ بکات.

"دەمەوێت نامەیەك بۆ ئەمریکا بنووسیت،" پێیڕاگەیاندم. "بۆ دایك و باوکت. هەموو شتەکانی خۆمانمان بە کەشتیدا بۆ بنێرن."

ئەمە نامەیەکی قورس بوو بنووسرێت، بەتایبەتی کە مودی بەسەرتەوە ڕاوەستێت و هەموو وشەیەکی بخوێنێتەوە. بەڵام ملمـدا بە فەرمانەکەی، چونکو دڵنیابووم، دایك و باوکم ناچنە ژێرباری داوای مودییەوە.

کە ئەمە کرا، مودی ڕازیبوو پاڵتۆکەی مەهتاب بکڕین. مودی بڕیاریدا خۆی لە ماڵەوە بمێنێتەوە و نەسرین و ئەمیر لەگەڵماندا بنێرێت بۆ بازاڕ، چونکو دەیزانی نەسرین پاسەوان و چاودێرێکی لێهاتووە بەسەرمەوە. خۆشی چوو بۆ ژووری نوستنەکە بۆ سەرخەوشکاندنی نیوەڕوان. خەریکبووین خۆمان ئامادەدەکرد بڕۆین، زەنگی تەلەفون لێیدا.

"بۆ تۆیە،" نەسرین بە وریاییەوە وتی. "ژنێکە بە ئینگلیزی دەدوێت." تەلەفونەکەی دایە دەستم و بەسەرمەوە وەستا.

"هەلۆ؟"

"هێلینم،" دەنگێك هات. سەرسامبووم و شۆك گرتمی، کە کەسێك لە باڵوێزخانەوە بۆ ئێرە تەلەفونم بۆ دەکات، بەڵام زۆرم لەخۆم کرد، ترسەکەم بۆ نەسرین ئاشکرا نەبێت.

"دەبێت قسەت لەگەڵدا بکەم،" هێلین وتی.

"ژمارەکەت بە هەڵە لێداوە،" وەڵامدایەوە.

هێلین تێبینییەکەی منی پشتگوێخست، ئاگاداری هەلومەرجەکەم بوو. "حەزمنەدەکرد تەلەفونت بۆ ماڵەوە بۆ بکەم،" داوای لێبوردنی کرد. "بەڵام کەسێك پەیوەندی بە ئێمەوە کردووە سەبارەت بە تۆ و دەبێت قسەت لەگەڵدا بکەم. تەلەفونم بۆ بکە یان وەرە بۆ لام بەزووترین کات."

"تێناگەم دەڵێیت چی،" درۆمکرد. "دەبێت ژمارەیەکی هەڵەت لێدابێت."

هەر تەلەفونەکەم دانایەوە، نەسرین لە هەتاو نەیخستە سێبەر، خۆی کرد بە ژووری نوستنەکەماندا و مودی لە خەو هەڵسان. کەللەییبووم لە نەسرین، بەڵام لەو ساتەدا هیچ بوارێك نەبوو لەگەڵی بکەومە گفتوگۆ، چونکو مودی لێم شێت بوو.

"کێ تەلەفونی بۆ کردی؟" داوایکرد.

"نازانم،" زمانم تەتەڵەیکرد. "ژنێك بوو. نازانم کێ بوو."

مودی تەواو شپرزەبوو. "تۆ دەزانیت کێ بوو!" هاواریکرد. "من دەمەوێت بزانم کێ بوو."

"نازانم،" وەڵاممدایەوە، هەوڵمدا ئارامی خۆم بپارێزم، خۆمم خستە نێوانی مودی و مەهتابەوە، بۆ پاراستنی مەهتاب ئەگەر مودی بۆ جارێکی تر دەستبداتەوە تونلوتیژی. نەسرینی سیخوری ئیسلامی گوێڕایەڵ، ئەمیری ڕاکێشایە سوچێکەوە.

"دەمەوێت هەرچی شتێکی وتووە، بزانم،" مودی داوایکرد.

"ژنێك بوو، وتی 'تۆ بیتی؟' منیش وتم، 'بەڵێ' و وتی، 'تۆ و مەهتاب باشن؟' وەڵاممدایەوە، 'بەڵێ ئێمە باشین' و ئەوە کۆتایی گفتوگۆکەمان بوو. خەتەکە ئەما."

"تۆ دەزانی کێ بوو،" مودی تاوانباریکردم.

"نا، نازانم."

هێشتا خەواڵوو بوو، نەهاتبووە سەرخۆی، بەڵام هەوڵیدەدا ژیربێژانە بیر لە گرفتەکە بکاتەوە. دەیزانی باڵوێزخانە لە هەوڵدایە، پەیوەندی بە منەوە بکات، بەڵام نەیدەزانی کە منیش ئاگادارم. بڕیاریدا، کە باوەڕ بە قسەکانم بکات، بەڵام تەواو شپرزەی ئەوە بوو، کە یەکێك - کە زۆر پێدەچێت یەکێك لە باڵوێزخانەوە - جێپێی هەڵگرتووم بۆماڵی مامل.

"وریـــــایبـــــە،" بە نەسرینی وت و پاشان ئەو شەوە ماملی لە تەلەفونەکە ئاگادارکردەوە. "کەسێك بەدواوەیەتی. لەسەر شەقام دەیفڕێنن."

تەلەفونەکە بۆ چەند ڕۆژ نیگەران و مێشکمی جەنجاڵکرد. چ شتێکی گرنگ ڕوویداوە، وا هێلینی ناچارکردووە تەلەفونم بۆ بکات بۆ ماڵەوە؟ دەیزانی توڕەیی مودی چ مەترسییەکم بۆ دروستدەکات و دەبێت شتێك بووبێت وا ئەم سەرکێشییەی کردووە. هیچم لەدەستنەدەهات، بێجگە لە پێشبینیکردن بۆ ماوەی هەفتەیەك، چونکو تەلەفونەکە وای لە مودی کردبوو، کە پاسەوانییەکی زۆرمان بکات. چاوەڕوانی مایەی ئازارێکی زۆر بوو. لەوانەیە شتێك ڕوویدابێت، کە ڕزگاربوونم نزیککاتەوە، بەڵام هیچ بوارێك نەبوو چۆن ئەمە بزانم.

سەرئەنجام لە دوانیوەڕۆیەکی خۆشدا نەسرین لە زانکۆ بوو، مودیش ئەوەندە گرفتی هەبوو، کە نەیدەتوانی دوای من و مەهتاب بکەوێت بۆ بازاڕ و بڕیاریدا خۆمان بە تەنیا بڕۆین.

خێرا خۆم گەیاندە دوکانەکەی حەمید و تەلەفونمکرد بۆ هێلین. "تکاتلێدەکەم، ئاگات لە خۆت بێت،" هێلین ئاگاداریکردمەوە. دوو کچ بەدوای تۆدا هاتن بۆ ئێرە. لەگەڵ کەسوکارت قسەیانکردووە و دەیانەوێت، لە ئێران بتبەنە دەرەوە. بەڵام ئاگات لە خۆت بێت، چونکو ئەوانە نازانن لەبارەی چییەوە قسەدەکەن." پاشان وتی، "تکاتلێدەکەم بەزووترین کات سەردانمبکە. زۆر شت هەیە، دەبێت لەبارەیانەوە گفتوگۆبکەین."

پەیوەندییەکە زیاتر نیگەرانیکردم. ئەم دوو کچە نامۆیە دەبێت کێ بن؟ ئایا دەکرێت جودی پلانێکی نهێنی دانابێت بۆ دەرکردنی من و مەهتاب؟ دەتوانم متمانە بەو کەسانە

بکەم؟ ئایا لەڕاستیدا ئەوەندە زانیاری و / یان دەسەڵاتیان هەیە یارمەتیمبدەن؟ هێلین لەو باوەڕەدا نەبوو، هەر لەبەرئەوە منی خستبووە مەترسی تورڕەیی مودییەوە و تەلەفونی بۆ کردبووم بۆ ئاگادارکردنەوەم لەو کچانە، بەڵام من دڵنیانەبووم. لەوەدەچوو شتێك کە لە باوەڕدا نەبێت، ڕوویدات. بەرەو کوێم دەبات، ئەگەر من کەوتبێتمە ناو ئەم پلانە نهێنییەوە؟

بەیانییەکی زستانی تەواو ساردی مانگی کانونی یەکەم بوو، چەند ڕۆژ بوو لەگەڵ هێلین قسەمکردبوو، کە زەنگی دەرگا لێدرا. لە نهۆمی خوارەوە ئیسا دەرگاکەی کردەوە، بینیم کچێکی باڵابەرزی باریکەلەی عەبابەسەرە و داوای بینینی دکتۆر مەحمودی دەکات. ئیسا ناردییە سەرەوە و من و مودی لەبەردەمی دەرگای نهۆمی ماملدا ڕووبەڕوویبووینەوە. لەگەڵ ئەوەی عەبای بەسەرەوە بوو، زانیم ئێرانی نییە، بەڵام نەمدەتوانی پێشبینی ڕەگەزەکەی بکەم.

"دەمەوێت لەگەڵ دکتۆر مەحمودی قسەبکەم،" ژنەکە وتی.

مودی منی گەڕاندەوە بۆ دواوە بۆ ناوی هۆڵەکە و دەرگاکەی لەسەر داخستم. گوێم نوساند بە دەرگاکەوە تا بەڵکو شتێکم گوێلێبێت.

"من ئەمریکیم،" ژنەکە بە ئینگلیزییەکی تەواو ڕەوان وتی. "بەهۆی نەخۆشی شەکرەوە، توشی گرفت بووم. تکاتلێدەکەم، دەتوانی تاقیکردنەوەیەکی خوێنم بۆ بکەیت؟"

باسیکرد، کە شووی کردووە بە پیاوێکی ئێرانی لە مەشهەد، ئەو شارەی کە عەمە بزورگ بۆی چووبوو بۆ زیارەت. هاوسەرەکەی چووە بۆ بەرەکانی جەنگ لەدژی عێراق، لەبەرئەوە بۆ ماوەیەك لە تاران لای خێزانی هاوسەرەکەی دەمێنێتەوە.

"بەڕاستی نەخۆشم،" ژنەکە وتی. "خێزانی هاوسەرەکەم تێناگەن لە نەخۆشی شەکرە. دەبێت یارمەتیمبدەیت."

"هەرئێستا ناتوانم تاقیکردنەوەی خوێنت بۆ بکەم،" مودی وەڵامیدایەوە. بەدەنگیدا دەمزانی، مودی لەچەند ڕاپانێکدایە و نازانێت کامیان بگرێت. هێشتا مۆڵەتی پزیشکی لە ئێراندا وەرنەگرتووە، کەچی نەخۆشێك هاتووە و داوای یارمەتی لێدەکات. دەستبەکار نەبووە و خواخوای پارەی نەخۆشێکە. هەفتەی پێشوو، ژنێکی نەناس هەوڵیدا پەیوەندی بە منەوە بکات، ئێستاش ژنێکی نەناس هاتۆتە بەردەمی دەرگاکە. "دەبێت سبەینێ بەیانی کاتژمێری نۆ بێیتەوە،" مودی لەکۆتاییدا وتی. "ئیمشەو دەبێت هیچ نەخۆیت."

"ناتوانم بێمەوە، چونکو وانەی قورئان خوێندنم هەیە،" ژنەکە وتی.

بۆ من لەم دیو دەرگاکەوە دیاربوو، کە ئەم بەسەرهاتە تەواو درۆیە. ئەگەر بۆ ماوەیەکی کاتی لە تاراندا دەمێنێتەوە - وەك خۆی وتی، یەك مانگ - بۆچی لێرە دەچێت بۆ قوتابخانەی قورئان خوێندن؟ ئەگەر بەڕاستی نەخۆش بوو، بۆچی بەقسەی دکتۆر ناکات؟

"ژمارەی تەلەفونەکەتم بدەرێ،" مودی پێشنیاریکرد. "تەلەفونت بۆ دەکەم و لەسەر کاتێك ڕێکدەکەوین."

"ناتوانم بتدەمێ،" ژنەکە وەڵامیدایەوە. "خێزانی مێردەکەم نازانن، من هاتووم بۆ لای دکتۆرێکی ئەمریکی. بەڕاستی دەکەومە کێشەوە."

"بەچی هاتی بۆ ئێرە؟" مودی بەرهقییەوە پرسیارێلێکرد.

"بە تەکسی تەلەفونی. لە دەرەوە چاوەڕوانم دەکات."

لە ترساندا چوومەوە ڤاوغەکەی خۆم. نەمدەویست مودی ئەوە بزانێت، کە ژنێکی ئەمریکی دەتوانێت لە ناو تاراندا ڕێگای خۆی بدۆزێتەوە.

پاش ئەوەی ژنەکە ڕۆیشت، مودی تەواوی ئەو دوانیوەڕۆیە کەوتە خەیاڵاتەوە. تەلەفونی بۆ عەمە بزورگ کرد بۆ هوتێلەکەی لە مەشهەد، بۆئەوەی بزانێت، ئایا بە هیچ کەسێکی وتووە، کە برایەکی هەیە لێرە و بڕوانامەی دکتۆری ئەمریکی هەیە. دەرکەوت، کە بە هیچ کەسێکی نەوتووە.

ئەو ئێوارێیە، مودی بۆی گرنگ نەبوو من گوێم لێیە، بەسەرهاتەکەی بۆ مامل و نەسرین گێڕایەوە و باسیکرد، کە بۆچی گومانی هەیە. "دەزانم مایکروفۆنێکی لەژێر جلەکانیدا شاردبۆوە،" مودی وتی. "دەزانم سیناینەی بوو."

دەشێت وا بووبێت؟ دەکرێت ئەو ژنە کار بۆ سیناینەی بکات؟

منیش وەك ئاژەڵی تەڵەگرتوو، خولیام تەنیا لای ڕزگاری بوو، ڕزگاری خۆم و کچەکەم. شەوڕۆژ بێرانەوە هەر ڕووداو و هەر گفتوگۆیەك لە مێشکمدا جێگای لێکدانەوە بوو. پاش بیرکردنەوەیەکی زۆر بەو ئاکامە گەیشتم، کە مودی بە هەڵەدا چووە. ئەو ژنەی هاتبووە ناو دەرگاکەوە کەسێکی کارکردە نەبوو، جگە لەوەش سیناینەی دەبێت چ بەرژەوەندییەکی هەبێت لە ڕزگارکردنی من و مەهتاب؟ ئایا سیناینەی ئەوەندە بەربڵاو و ئەوەندە بەهێز بوو داستان بنێتەوە؟ بۆ من ڕۆشن بوو، بکەرانی ئەمریکا لە ئێراندا هیچ شتێکیان لەدەستنەدەهات. بکەر، سەرباز، پۆلیس و پاسداری ئایەتوڵا لە هەموو شوێنێکدا هەبوون. وەك زۆربەی ئەمریکاییە پارێزراوەکان، هێزی حکومەتەکەی خۆمم کردبوو بە فیل لەبەرامبەر هێزە بیانییە توندڕەوەکاندا.

زیاتر بۆ ئەوە دەچووم، کە ئەو ژنە بەهۆی جودی یان حەمیدی دوکاندارەوە، بە هەلومەرجی منی زانیبێت. شوێنێك نەبوو ڕووی تێبکەم، تا بزانم ئەمە چییە، بێجگە لە چاوەڕوانی و ببینم کە چیتر ڕوودەدات، شتێکی ترم لەدەستنەدەهات.

چاوەڕوانی ئارامی لێهەڵگرتبووم، بەڵام مایەی خۆشیش بوو. بۆ یەکەم جار هەستم کرد، ستراتیجییە درێژخایەنەکەم کەوتۆتە کار. هەرچیم لەدەستبهاتایە دەمکرد، متمانەم بە هەرکەسێك بکردایە، دەکەوتمە گفتگۆ لەگەڵی، بەهیوای ئەوەی ئیمڕۆ و سبەینێ

کەسێکی کردە بلۆزمەوە تا دەست بداتە باڵم. دەمزانی، دەبێت تەواوی کات گونجاندنی هەوڵەکانی خۆم هەڵسەنگێنم لەبەرامبەر تۆڕی کونترۆڵی مودیدا.

جارێکیان کە چووم بۆ ئیشی بازاڕ، خۆم کرد بە دوکانەکەی حەمیددا بۆ تەلەفونکردن بۆ ڕەشیدی هاوڕێی جودی، کە بەڵێنیدابوو پەیوەندیبکات بەو پیاوەی کە خەڵکی بە قاچاغ دەبرد بۆ تورکیا.

"ناتوانێت منداڵ بەرێت،" ڕەشید وتی.

"تکاتلێدەکەم، با خۆم قسەی لەگەڵدا بکەم!" لێیپاڕامەوە. "من خۆم مەهتاب هەڵدەگرم. گرفت نییە."

"نـــا. دەڵێت، هەتا تۆش، وەك ژنێك، بەتەنیا ناتبات. بەڕاستی هەتا بۆ پیاویش قورسە. ڕێگەکە چوار ڕۆژە ڕێیە بەناو شاخوداخدا. هیچ ڕێگایەك نییە بتوانیت بە منداڵەوە پیایدا بڕۆیت."

"بەڕاستی کەسێکی بەهێزم،" تا ئاستێك باوەڕم بە درۆکەی خۆم کرد. "کەسێکی بەخۆوەدم. گرفت نییە، دەتوانم تەواوی ڕێگاکە کچەکەم هەڵگرم. ڕێگەمەبدە، هیچ نەبێت با خۆم لەگەڵیدا بدوێم."

"ئێستا کەڵکی نییە. بەفرێکی زۆر ڕێگای شاخەکانی گرتووە. ناتوانی لە زستاندا پیایاندا بڕۆیت بۆ تورکیا."

ناوەڕاستی مانگی کانونی یەکەم بوو، مودی پێیوتم، هاتنی جەژنی مەسیح پشتگوێبخەم. ڕێگەمینەدام دیاری بۆ مەهتاب بکڕم، یان هەتا ئاهەنگێك بگێڕم. ئەو کەسانەی من دەمناسین لە ئێراندا، دانیان بە جەژنی مەسیحدا نەدەنا.

زستان لە شاخەکانی دەوری تارانەوە هاتەخوارەوە. بای سارد بەفری لەگەڵ خۆی دەهێنا. سەهۆڵبەندانی شەقامەکان ڕووداوی ئوتومبیلی زۆرکرد، کە زیاتر دەبووە وەستاندنی ترافیك، بەڵام شۆفێرەکان لە خێرایی خۆیانیان کەمنەدەکردەوە.

مودی سەرمایبوو. بەیانییەکیان لە کاتی خۆیدا هەستا بمانبات بۆ قوتابخانە، بەڵام نکەنکیبوو، بەزەحمەت لە جێگاکەی هاتە دەرەوە.

"تات لێهاتووە،" دەستم بەسەریەوە گرت و وتم.

"ئەم سەرمایە ..." بۆڵەی لێوە هات. "دەبوایە پاڵتۆی زستانەمان هەبوایە. دەبوایە دایك و باوکت ئەوەندە بە هەست بوونایە، ئەو شتانەیان بناردایە."

ئەم گلەییە خۆویست و پوچەم پشتگوێخست، نەمدەویست بەم بەیانییە بکەومە شەڕەدەنوك، لەکاتێکدا هەلێکم دەبینییەوە بۆ باشترکردنی هەلومەرجەکەم. کاتێك خەریکی شانەکردنی قژی مەهتاب بووم، وەك ئەوەی باسی شتێکی ئاسایی بکەم، وتم، "چاکە، خۆمان دەتوانین بچین بۆ قوتابخانە."

مودی ئەوەندە پەرێشان بوو، نەدەچووە سەر ئەوەی گومانێك بكات، بەڵام لەو باوەڕەدا نەبوو، دەتوانم خۆم كارەكە ئەنجامبدەم. "تۆ نازانی چۆن تەكسی دەگیرێت،" وتی.

"بـــا، دەتوانـــم. هەموو ڕۆژێك سەرنجی تۆم داوە، چیت كردووە." بۆم باسكرد، كە دەچم بۆ شەقامی شەریعەتی و لەوێ هاواری "*جادەی زەفەر*" دەكەم، ئەوەش بەواتای ئەوە دێت، كە من تەكسییەكم دەوێت بەرەو شەقامی زەفەر.

"دەبێت هەر ئەوە بڵێیت،" مودی وتی.

"ئـــا، هەر ئەوە دەڵێم، *جادەی زەفەر*."

"چاكە،" ڕازیبوو، ئەم دیواو ئەو دیوی كرد بۆئەوەی بنوێتەوە.

ئەو بەیانییە داروبەرد زوقم بوو، بەڵام گوێمـپێنەدا. كاتێكی زۆری برد، تا تەكسییەك ڕاوەستا. لەكۆتاییدا خۆمم خستە مەترسییەوە و چوومە پێشی ئوتومبیلێكەوە، بەڵام هەستم بە سەركەوتنێك كرد. ئـــا، دەتوانم ڕێبكەم لەناو تاراندا، هەنگاوێكە بەرەو چوونە دەرەوە لە شارەكە و هەتا لە وڵاتەكە.

تەكسییەكە پڕیبوو لە خەڵك، لەناو ترافیكدا پێچاوپێچی بوو، گێڕی دەگۆڕی و پێی لە بەنزین قایمدەكرد و ئیستۆپیدەگرت و بەسەر قیرتاوی سەهۆڵبەستوودا شیڕەی دەهات، لەكاتێكدا دەستی دەنا بە هۆڕندا و بە برادەرە موسڵمانە شۆفێرەكانی تری دەوت "*سگ*"، كە جنوێكە بە واتای "سەگ" دێت.

بە سەلامەتی لەكاتی خۆیدا گەیشتینە قوتابخانە. بەڵام چوار كاژێر دواتر دیسانەوە كەوتینەوە چاوەڕوانكردن بۆ ماڵەوە. لەبەردەمی قوتابخانەكەدا بووم، هەوڵمدەدا تەكسییەكی پرتەقاڵی ڕاگرم، كە بینیم پەیكانێكی سپی (ئوتومبیلێكی باوە و بەرهەمی پیشەسازی ئێرانە) بە چوار عەبابەسەرەوە بە بەردەماندا بە هێواشی تێپەڕین. سەرسامبووم لەوەی كە ڕێبوارەكەی پێشەوە جامی ئوتومبیلەكەی هێنایە خوارەوە و بە فارسی هاواری شتێكی كرد.

ئایا پرسیاری شوێنێكی كرد؟ كەوتمە گومانەوە.

پاش فرسەخێكی كورت، ئوتومبیلەكە لایدایە قەراغی شەقامەكە. هەر چوار ژنەكەی ناوی هاتنەدەرەوە و بە هەڵەداوان گەڕانەوە بۆمان. توند عەباكانیان لە چەناگەیان قایمكردبوو، هەموویان پێكەوە هاواریان لێدەكردم.

نەمدەتوانی بیهێنمە بەرچاوی خۆم، چیم كردووە وا ئەم ژنانە لێم شێت بوون، تا مەهتاب ئاگاداریكردمەوە.

"ڕووسەرییەكەی سەرت چاك بكە،" مەهتاب وتی.

دەستم بۆ ڕووسەرییەكەم برد، هەستمكرد چەند ئەگریجەی قاچاغ لەژێر ڕووسەرییەكەمەوە دزەیانكردۆتە دەرەوە، یەكسەر ڕووسەرییەكەم ڕاكێشایە سەر ناوچەوانم. چۆن لەپڕ ئەو چوار ژنە نامۆیە نیشتنە سەرمان، هەرئاوایی گەڕانەوە ناو ئوتومبیلەكەیان و ڕۆیشتن. پاشان تەكسییەكی پرتەقاڵیمان وەستاند و من و مەهتاب

گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە. مودی شات[redacted]ازیدەکرد، بەوەی توانیمە ئەو هاتوچۆیە بەدروستی ئەنجامبدەم، منیش خۆشحاڵبووم بەبێ ئەوەی دەریببڕم، چونکو دەمزانی هەنگاوێکی گەورەم ناوە، بەڵام هەردووکمان سەرمان دەرنەدەکرد لەو چوار ژنەی ناو پەیکانە سپییەکە.

بۆ ڕۆژی دوایی خانم ئازەر بۆی ڕوونکردمەوە. "دوێنێ تۆم بینی، توشی کێشە بووبوویت،" پێیوتم. "بینیم، کاتێ[redacted] دەتویست تەکسی بگریت، ئەو ژنانە گەیشتنە سەرت. بە ڕێوە بووم فریاتبکەوم، بەڵام ڕۆ[redacted]شتن."

"ئەوانە کێ بوون؟" پرسیم.

"پاسدار بوون، ژنانی پاسدار."

هیچ نەبێت لەوێدا یەکسانی هەبوو. ئەوەندەی دەگەڕایەوە بە دامەپاندنی یاسای جلوبەرگی ژنان، پۆلیس تایبەتی ژن[redacted]ـنە وەك پیاوان بەدەسەڵات بوون.

بیست و پێنجی کانونی یەکەم[redacted] ساڵی هەزار و نۆ سەد و هەشتا و چوار، ناخۆشترین ڕۆژی ژیانم بوو. هیچ شتێکی نا[redacted]اسایی نەبوو کە شایەنی باسکردن بێت، وە ئەمە سەرچاوەی ئازارم بوو. نەمدەتوانی [redacted]یچ خۆشییەکی جەژنی مەسیح بدەم بە مەهتاب، لەو هەلومەرجەشدا نەمدەویست هیچ ش[redacted]ێکی بۆ بکەم، هەر ئەمەش وای لێکرد، دەردی دووری زیاتر بچێژێت. تەواوی ئەو ڕۆژە خ[redacted]یاڵم لە مەشیگان بوو، لەگەڵ جۆی و جۆن و دایك و باوکم. مودی ڕێگەینەدا، تەلەفونبکە[redacted] و پیرۆزبایی جەژنیان لێبکەم. هەفتەیەك تێپەڕیبوو بەسەر ئەو پەیوەندییە تەلەفونییەم بە هێڵینەوە، کە ئاگاداریکردمەوە لەو کچە نامۆیانەی بە دوامدا دەگەڕێن. هیچ هەواڵێکی ب[redacted]وکمم نەدەزانی، ئاگاداری کوڕەکانم نەبووم.

تاران هیچ شتێکی ڕەسمی لەبا[redacted]ڕەی ئەو ڕۆژەوە نەبوو، کە بە واتای ئەوە دەهات، مەهتاب دەبێت بچێت بۆ قوتابخانە. [redacted]ودی هێشتا مشەمشی دەهات و نەخۆش بوو، پێیوتم، من ژنێکی خراپم، چونکو لە قوتا[redacted]خانە دەمێنمەوە لەگەڵ مەهتاب. "دەبوو بهاتبایتە ماڵەوە و شۆربای مریشکت بۆ دروست[redacted]کردبایە،" گلەییکرد.

"خۆی بەتەنیا لە قوتابخانە ئامێتێتەوە،" وەڵامدایەوە. "خۆت ئەوە دەزانی. نەسرین دەتوانێت شۆربای مریشکت ب[redacted]ۆ دروستبکات."

مودی چاوێکی هێنا و چاوێکی برد ـ هەردووکمان دەمانزانی، نەسرین فێری بەسەر چێشتلێنانەوە نییە.

ئاواتەخوازبووم تاکەی یان شۆرب[redacted]اکەی نەسرین بیکوژێت، لە دڵی خۆمدا دەموت. لە ڕاستیدا ویردم دەخوێند، کە لە ڕوودا[redacted]وێکدا تیابچێت. بەهۆی گوللە تۆپێکەوە پارچەپارچە ببێت. دەردەدڵ لێیبدات و دەم بەیک[redacted]دا نەدات. دەمزانی بەدفەڕییە بیر لە شتێکی وەها بکەیتەوە، بەڵام نەمیاندەتوانی بەخەیاڵ[redacted]مدا هەیەن.

ئەو ڕۆژە لە قوتابخانە، مامۆستاکان و ستاف قوتابخانە ئەو پەڕی هەوڵیاندا، تۆزێك خۆشیم پێبدەن. "جەژنی مەسیحت لێپیرۆزبێت،" خانم ئازەر وتی و پاکەتێکی دایەدەستم. کردمەوە، بینیم کتێبێکی جوانی چوارینەکانی خیامە، کە بە ئینگلیز، فەرەنسی و فارسی نووسراوە.

خانم شەهێن ئەوەندە موسڵمانێکی توندڕەو بوو، باوەڕمنەدەکرد شتێکی لەگەڵ جەژنی مەسیحدا هەبێت. بەڵام کۆمەڵێك کتێبی ڕێنوێنی ئیسلامی پێشکەشکردم، سەبارەت بە ڕێسا و یاسای نوێژ، ڕۆژە پیرۆزەکان ئیسلام و سوننەتەکان. ئەو کتێبەی کە زۆر جێگای سەرنجم بوو، وەرگێڕاوی ئینگلیزی یاسای ئێران بوو. ئەو بەیانییە و چەند ڕۆژ پاش ئەوە، زۆر بەوردی خوێندمەوە، بەتایبەتی بەدوای ئەو بەندانەدا دەگەڕام کە پەیوەندیان بە ماف ژنانەوە هەبوو.

بەشێکی تیادا بوو، تایبەتکرابوو بە گرفتی هاوسەرێتی. وا دەردەکەوت، ئەو ژنە ئێرانییەی کە گرفتی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا هەیە، دەتوانێت کێشەکەی بەرێتە لای نووسینگەیەکی تایبەت لە وەزارەتێکی تایبەتدا. لە شتوەمەکی ناوماڵ دەکۆڵرێتەوە و لەگەڵ ژن و مێردەکەدا قسەدەکرێت. پاشان هەردوو لایەن، دەبێت گوێڕایەڵی بڕیاری قازی بن، کە بێگومان پیاوێکی ئێرانییە. ئەم جۆرە ڕێگایەم ڕەتکردەوە.

ئەو بەشەی پەیوەندی بە پارە و کەلوپەلەوە بوو، ڕۆشن بوو. هەموو شتێك بەر مێرد دەکەوێت و ژنیش هیچ. هەروەها منداڵانیش دەکەونە خانەی کەلوپەلەوە. لە جیابوونەوەدا، باوك دەبێت بە خاوەنی منداڵ.

لە ژیانی تایبەتی کەسەکان یاسا قوتدەبێتەوە، هەتا لە هەلومەرجی تایبەتی کەسی ژندا. بۆ نمونە، بۆ ژن بە تاوان چاوپلێدەکرێت، بەبێ ڕەزامەندی مێردەکەی، بەر بە سکپڕبوونی خۆی بگرێت. لەوەوپێش لەوە ناگاداربووم. لە ڕاستیدا مودی پێیوتبووم، کە ئەوە بە تاوانێکی گەورە چاوپلێدەکرێت و ئاکامەکەی ئیعدامە. بەخوێندنەوەی ئەو بەندە، هەموو گیانم لە ترساندا کەوتە لەرزین. دەمزانی، تا ئێستا کۆمەڵێك یاسای ئێرانیم لە ژێرپێناوە و دڵنیاشبووم هەروا بەردەوامدەبم. بەڵام مایەی پەرێشانیم بوو، کە بە دزی مودییەوە شتێکم خستۆتە گیانمەوە، ئەییودی[3] یەك، کە ژیانی دەخستمە مەترسییەوە. ئایا بە ڕاستی ژنێك ئیعدامدەکەن، لەسەرئەوەی بەری بە سکپڕبوونی خۆی گرتووە؟ دەمزانی وەڵامی ئەوە چییە. لەم وڵاتەدا پیاوان چییان پێخۆش بووە بە ژنانیان کردووە و لە ئێستاش بەدواوە هەر دەیکەن.

بەشێکی تر لەو بەندە یاساییانە مایەی ترسێکی زیاتر بوو بۆم. لە کاتی مردنی پیاودا، منداڵەکەی نادرێت بە بێوەژنی پیاوەکە، بەڵکو کەسوکاری دەبن بە خاوەنی. ئەگەر مودی بمرێت، مەهتاب نادەن بە من. بەڵکو نزیکترین کەسوکاری دەبن بە چاودێریکەری، عـــەمـــە بزورگـا ئیتر بێرایبڕای نەچوومەوە بەلای ویردی مردنی مودیدا.

لە هیچ کونوکەلەبەرێکی دەستوری ئێراندا، هیچ تروسکاییەک لە بەندێکی یاسایی، پلانێک، یان پرۆگرامێکی کۆمەڵایەتی نەبوو، کە هیوای پێببەستم. دەستوردکە دانپیانانی هەر ئەوە بوو کە دەمزانی. بەبێ مۆڵەتی مودی، هیچ ڕێگایەکی یاسایی نەبوو بۆ من و مەهتاب، کە پێکەوە وڵاتەکە جێبهێڵین. کۆمەڵێک ئەگەری تر هەبوون سەبارەت بە جیابوونەوە و مردنی مودی، کە ئاکامەکەی دەکرا ببێت بە دیپۆرتکردنی من لە وڵاتەکە، بەڵام مەهتابم بۆ هەتاهەتایە لەدەستدەدا.

دەبێت بەسەر لاشەکەمدا بــــڕۆن، ئینجا ئەوەم پێبکــەن. هاتبووم بۆ ئێران، تەنیا بۆ ڕێگرتن لەو ئەگەرە تۆقێنەرە. بەبێدەنگی پەیمانــی خۆمم چەند بارەکردەوە. هەر ڕۆژێک بێت. هەرچی چۆنێک بێت. لەم وڵاتە دەچمە دەرەوە. هەردووکمان پێکەوە.

وەرەم تۆزێک چووە سەرەوە، کە سەری ساڵی تازە نزیکبۆوە. لەناو ماڵی ماملدا تەواوی ڕۆژ گێرمنەکردبوو، لەناو قوتابخانە هاوڕێم بۆ خۆم پەیداکردبوو. مەمنونبوون و دەشیانویست زمانی ئینگلیزی فێرببن، لە لایەن خۆشمەوە، لە فێربوونی هەر وشەیەکی فارسی، یارمەتیم دەبینییەوە بۆ دۆزینەوەی ڕێگایەک بۆ ناو - بۆ چوونە دەرەوە لە - تاران. لە ساڵی هەزار و نۆ سەد و هەشتا و پێنجدا، ساڵی گەڕانەوەی خۆم و مەهتابم دەبینی بۆ ماڵەوە. بێجگە لەوە بەرگەی هیچ بیرێکی ترم نەدەگرت.

مودی وەک خۆی مایەوە، هەر ساتەی لەسەر هەواوهەوەسێک بوو، هەندێک جار دڵگەرم و خۆشحاڵ بوو، هەندێک جار ناحەز و ترسێنەر، بەڵام ئەوەی باشبوو، کە بەگشتی بەو شێوە ژیانەمان ڕازیبوو و باسی گەڕانەوەمان بۆ ماڵی عەمە بزورگی نەدەکرد. وەک ئاواتەخوازبووم، تا دەهات تەمەڵتر دەبوو. وای لێهاتبوو، کە بە بەردەوامی ڕێگەمان پێبدات خۆمان بچین بۆ قوتابخانە و وردەوردە ئەو زەحمەتەشی لە کۆڵ خۆی کردەوە، کە لە نیوەڕواندا بێت بە شوێنماندا. هەر ئەوەندە لە کاتی خۆیدا بگەشتینایەتە ماڵەوە، ئیتر گلەییەکی نەبوو. هیوایەکی تایبەتیم دەبینییەوە لە زۆربوونی جموجوڵـــدا.

خانم شەهێنیش ئەم گۆڕانکارییەی تێبینیکرد، ئەو ڕاستییەی لەبەرچاوگرت، کە مودی بە دەگمەن دێت بۆ قوتابخانە. ڕۆژێکیان لە ڕێگای خانم ئازەرەوە، گفتوگۆیەکی پەندیارانەی لەگەڵمدا دامەزراند.

"ئێمە بەڵێنمانــداوە بە مێردەکەت، کە ڕێگەتــپێنەدەین، تەلەفون بەکاربهێنیت یان لەم بینایە بچیتەدەرەوە،" خانم شەهێن وتی. "وە ئێمە دەبێت، ئەم بەڵێنە بەرینەسەر."

"بــەڵام،" لەسەر قسەکەی بەردەوامبوو، "بەڵێنی ئەوەمان نەداوە، ئەگەر تۆ درەنگ هاتی بۆ قوتابخانە، پێیڕابگەیەنین. ئەگەر تۆ درەنگ هاتی، پێویستناکات ئێمە ئاگاداریبکەینەوە. تۆش پێویستناکات پێمانــبڵێیت کە لە کوێ بوویت، چونکو ئەگەر پرسیارمان لێبکات، دەبێت پێیــبڵێین. بەڵام ئەگەر ئێمە نەزانین، ئەوا ناتوانین هیچ شتێکی پێیــبڵێین."

تێبینییەکان:

1. rock and roll:

2. Sabbath: السبت، ڕۆژی شەممە، ڕۆژی پشوو بەپێی دینی یەهودی.

3. IUD، کورتکراوەی intra-uterine device، بە واتای پارچەیەك پلاستیك یان کانزا دێت، کە لە منداڵدانی ژندا دادەنرێت بۆ بەرگری لە سکپڕبوون. لە عێراق پێدەوترێت لەولەب و لە ئێران، دەزگا.

# 9

مودی هێشتا هەر نەخۆش بوو، ڕۆژ بە ڕۆژ تەمەڵتر دەبوو، جارێ دەستی لە کۆنتڕۆڵی ئێمە هەڵگرتبوو. لەوە دەچوو هەر بەوەندە ڕازیبێت، مامۆستاکانی قوتابخانە بەپێی حەزی ئەو چاودێریمانـدەکەن، کە لەمەدا گومانێکی نەبوو.

ڕۆژێکیان بۆ چەند خولەك، درەنگ هاتم بۆ قوتابخانە، بۆ تاقیکردنەوەی کاردانەوەی مامۆستاکان. هیچ شتێك نەبوو، خانم شەهێن لەسەر بەڵێنی خۆی بوو. ئەو کاتەم بەکارهێنا بۆ تەلەفۆنکردن بۆ هێلین لە باڵوێزخانە. هێلین بۆ جارێکی تر ئاگاداری کردمەوە لەو کچە نامۆیانە، کە وا دەردەکەوت لەسەر یارمەتیدانی من سووربن. پێیوتم، کە دەبێت ڕووبەڕوو بمبینێت، بەڵام دوودڵبووم ئەو هاتوچۆ درێژ و مەترسیدارە بکەم. جامکردنێکی چاوەڕواننەکراوی ترافیك، لەوانەبوو دواکەوتنێکی زۆری بەدوادا بێت.

بەڵام پێوستی دەستبەکاربوون، تا دەهات بەرچاوتر خۆی دەنواند. ڕۆژێکیان ماڵەباجێنەی مەهتاب لەگەڵ مریەم، ڕایچڵەکاندم. ئەم دوو کچە بچکۆلەیە، پیانخۆشبوو لاسایی دایکان و منداڵان بکەنەوە لەگەڵ بوکەشوشە و قاپوقاچاغی چێشتخانەکەیان. لەپڕ مریەم بەفارسی دەیوت، "ئەوە پیاوێك هات!" هەردوو کچەکە پەلاماری عەبایان دەدا و خۆیان دادەپۆشی.

بەیانییەکیان دەستبەکاربووم. من و مەهتاب کەوتینەڕێ بۆ قوتابخانە، بەردو شەقامی شەریعەتی، کە لەوێ ئاسایی تەکسی پرتەقاڵیمان دەگرت. چەند جار ئاوڕمـدایەوە بۆ دواوە بۆئەوەی دڵنیابم، کە مودی یان کەسێکی تر لە خێزانەکەی چاودێریمانـناکەن.

"مـــەهتاب،" وتم، "ئەم بەیانییە دەچین بۆ باڵوێزخانە. دەبێت بە باوکت نەڵێیت."

"چەشم!" مەهتاب وەڵامیدایەوە، بەبێ ئەوەی بەخۆی بزانێت، وشەی فارسی بەکارهێنا بۆ 'بەڵێ' و ئەمەش بۆخۆی پێوستی دەستبەکاربوونی دووپاتدەکردەوە. مەهتاب زیاتر لە جاران پێیخۆشبوو لە ئێران بچێتە دەرەوە، بەڵام هەر ڕۆژە شتێکی لە کەلتوری ئێرانی وەردەگرت.

دەمزانی، بەمانەوەی زۆرترمان مەهتاب خۆی زیاتر دەگونجێنێت، هەتا بەدەر لە ویستی خۆی.

نووسینگەیەکی تەکسی تەلەفۆنمان دۆزییەوە و بەهۆی یارمەتی مەهتابەوە بۆ وەرگێڕان، ناونیشانی بەشی بەرژەوەندی یونێس. لە باڵوێزخانەی سویسرام پێدان. پاش ڕێگابڕینێکی ناخۆش بەناو شاردا و چەند کاری ئیداری و پشکنین، گەیشتینە لای هێلین.

خێرا چاوێکم خشاند بە نامەکانی جۆی، جۆن، دایك و باوکم. نامەکەی جۆن بەتایبەتی هەژاندمی. "تکاتـلێدەکەم، ئاگاداری مەهتاب بە و هەردەم دەستت بە دەستیەوە بێت،" بۆی نووسیبووم.

تێبینییەکان:

1. rock and roll:

2. Sabbath: السبت، ڕۆژی شەممە، ڕۆژی پشوو بەپێی دینی یەهودی.

3. IUD، کورتکراوەی intra-uterine device، بە واتای پارچەیەک پلاستیک یان کانزا دێت، کە لە منداڵدانی ژندا دادەنرێت بۆ بەرگری لە سکپڕبوون. لە عێراق پێدەوترێت لەولەب و لە ئێران، دەزگا.

# 9

مودی هێشتا هەر نەخۆش بوو، ڕۆژ بە ڕۆژ تەمەڵتر دەبوو، جارێ دەستی لە کۆنترۆڵی ئێمە هەلگرتبوو. لەوە دەچوو هەر بەوەندە ڕازیبێت، مامۆستاکانی قوتابخانە بەپێی حەزی ئەو چاودێریمانـدەکەن، کە لەمەدا گومانێکی نەبوو.

ڕۆژێکیان بۆ چەند خولەك، درەنگ هاتم بۆ قوتابخانە، بۆ تاقیکردنەوەی کاردانەوەی مامۆستاکان. هیچ شتێك نەبوو، خانم شەهێن لەسەر بەڵێنی خۆی بوو. ئەو کاتەم بەکارهێنا بۆ تەلەفونکردن بۆ هێلین لە باڵوێزخانە. هێلین بۆ جارێکی تر ئاگاداری کردمەوە لەو کچە نامۆیانە، کە وا دەردەکەوت لەسەر یارمەتیدانی من سووربن. پێیوتم، کە دەبێت ڕووبەڕوو بمبینێت، بەڵام دوودڵبووم ئەو هاتوچۆ درێژ و مەترسیدارە بکەم. جامکردنێکی چاودڕواننەکراوی ترافیك، لەوانەبوو دواکەوتنێکی زۆری بەدوادا بێت.

بەڵام پێوستی دەستبەکاربوون، تا دەهات بەرچاوتر خۆی دەنواند. ڕۆژێکیان ماڵەباجێنەی مەهتاب لەگەڵ مریەم، ڕایچڵەکاندم. ئەم دوو کچە بچکۆلەیە، پیانخۆشبوو لاسایی دایکان و منداڵان بکەنەوە لەگەڵ بوکەشوشە و قاپوقاچاغی چێشتخانەکەیان. لەپڕ مریەم بەفارسی دەیوت، "ئەوە پیاوێك هات!" هەردوو کچەکە پەلاماری عەبایان دەدا و خۆیان دادەپۆشی.

بەیانییەکیان دەستبەکاربووم. من و مەهتاب کەوتینەڕێ بۆ قوتابخانە، بەردو شەقامی شەریعەتی، کە لەوێ تاکسی پرتەقاڵیمان دەگرت. چەند جار ئاوڕمـدایەوە بۆ دواوە بۆئەوەی دڵنیابم، کە مودی یان کەسێکی تر لە خێزانەکەی چاودێریمانـاکەن.

"مـــەهتاب،" وتم، "ئەم بەیانییە دەچین بۆ باڵوێزخانە. دەبێت بە باوکت نەڵێیت."

"چەشم!" مەهتاب وەڵامیدایەوە، بەبێ ئەوەی بەخۆی بزانێت، وشەی فارسی بەکارهێنا بۆ 'بەڵێ' و ئەمەش بۆخۆی پێوستی دەستبەکاربوونی دووپاتدەکردەوە. مەهتاب زیاتر لە جاران پێیخۆشبوو لە ئێران بچێتە دەرەوە، بەڵام هەر ڕۆژە شتێکی لە کەلتوری ئێرانی وەردەگرت.

دەمزانی، بەمانەوەی زۆرترمان مەهتاب خۆی زیاتر دەگونجێنێت، هەتا بەدەر لە ویستی خۆی.

نووسینگەیەکی تەکسی تەلەفونمان دۆزیبەوە و بەهۆی یارمەتی مەهتابەوە بۆ وەرگێڕان، ناونیشانی بەشی بەرژەوەندی یو.ئێس. لە باڵوێزخانەی سویسرام پێدان. پاش ڕێگابڕینێکی ناخۆش بەناو شاردا و چەند کاری ئیداری و پشکنین، گەیشتینە لای هێلین.

خێرا چاوێکم خشاند بە نامەکانی جۆی، جۆن، دایك و باوکم. نامەکەی جۆن بەتایبەتی هەژاندمی. "تکاتـلێدەکەم، ئاگاداری مەهتاب بە و هەردەم دەستت بە دەستێوە بێت،" بۆی نووسیبووم.

"شت لە ڕوودانەدایە،" هێلین وتی. "هەر شتێك بێت، بەهەر شێوەیەك بێت. وەزارەتی دەرەوە دەزانێت تو لە کوێیت و هەرچی لەدەستی بێت، دەیکات."

شتێکی وەها نییە، لە دڵی خۆمدا وتم.

"ژنێکی ئەمریکایی سەبارەت بە تۆ پەیوەند بە باڵوێزخانەی ئەمریکاوە کردووە لە فرانکفۆرت،" هێلین بەردەوامبوو.

جودی!

"چەندیان لەدەستبێت، کەمتەرخەمی ناکەن."

کەواتە بۆچی من و مەهتاب هێشتا لێرەین؟ دەمویست بقیژێنم.

"شتێك کە ئێمە دەتوانین بیکەین، دەرهێنانی پاسپۆرتی تازەی ئەمریکییە بۆ ئێوە،" هێلین وتی. "لە ڕێگای باڵوێزخانەی ئەمریکاوە لە سویسرا دەریدەکەن. بێگومان ڤیزەی لەسەر نابێت، بەڵام لەوانەیە ڕۆژێك لە ڕۆژان بەکەڵکتان بێت. لێرە بۆتان هەڵئەگرین."

نیو کاژێری برد، تا فۆرمی دەرکردنی پەسپۆرتی تازەمان پڕکردەوە.

"ئێستا دەبێت بچینە سەر باسی ئەو دوو کچە، کە هاتبوون بۆ ئێرە بە دوای تۆدا،" هێلین وتی. "لەگەڵ کەسوکارت لە ئەمریکا قسەیانکردووە. بەڵام وریایی خۆت بە، تکاتلێدەکەم. ئەو کچانە نازانن لەبارەی چییەوە قسەدەکەن. هەرچی ئەوان دەیڵێن بەقسەیان مەکە، ئەگینا توشی گرفتی زۆر دەبیت." هەردووکیان ئەمریکایی بوون، شوویانکردبوو بە ئێرانی. ئەوەیان کە ناوی 'تریش' بوو، شوویکردبوو بە فڕۆکەوانی هێڵی هەوایی. ئەوی تریان بە ناوی 'سوزانە'، شوویکردبوو بە کاربەدەستێکی پایەبەرز لە حکومەتدا. هەردووکیان لێرە ئازادبوون و هەرکاتێك حەزیان لێبوایە، دەیانـتوانی ئێران جێبهێڵن. بەڵام هاودەردییان لەگەڵ هەلومەرجەکەی مندا دەکرد و دەیانویست یارمەتیمـبدەن.

"چۆن دەتوانم پەیوەندییان پێوە بکەم؟" پرسیارمکرد.

هێلین دەموچاوی دا بەیەکدا، پێیخۆش نەبوو ئەو هەڵە تاقیبکەمەوە، بەڵام تا دەهات زیاتر بێهیوا دەبووم، لە نەبوونی هیچ هەوڵێکی ڕەسمی و هێلین ئەم پەرێشانی و ناچارییەی لە دەموچاومدا بەدیدەکرد.

"تکایە وەرە لەگەڵم،" وتی.

پێش من و مەهتاب کەوت بۆ لای بەڕێوەبەر، میستەر ڤینکوپ یاریدەدەری باڵوێز.

"تکاتـلێدەکەم، خۆت لەگەڵ ئەو کچانە تێوە مەگلێنە،" ئامۆژگاریکردم. "ئەوانە شێتن. ئەوانە بۆ خۆشیان نازانن، چی دەکەن. پێیانـوتین، کە یەکێك لە پلانەکانیان ئەوەیە، لەسەر شەقام بتفرێنن و لە وڵات دەرتکەنە دەرەوە، بەڵام نازانن چۆن. لەوە دەچێت ئەمە لە سینەمادا ڕووبدات. ناکرێت بەو شێوەیە بکرێت."

ژیانم زۆر ئاڵۆزتر بوو لە سەرکێشییەکی ناو فلیم. هەموو شتێك دەکرا، لێم ڕووبدات. باشە بۆچی هیچ نەبێت قسە لەگەڵ ئەم کچانە نەکەم؟ پاشان شتێك هات بە خەیاڵمدا.

"باشه چۆنه برۆم بەرەو تورکیا،" پرسیارمکرد، بیرم لە هاورێکەی ڕەشید کردەوە، کە بەناو شاوخوداخدا خەڵکی بە قاچاخ دەبرد.

"نــــا!" میستەر ڤینکوپ یەکسەر وتی. "ئەوە زۆر ترسناکە. خەڵك هەیە، دەڵێن بە قاچاخی دەتبەین. پارەت لێدەسێنن، دەتبەن بۆ سنوور، لاقەتـدەکەن و دەتکوژن یان دەتدەنەوە دەست کاربەدەستان. ناتوانی ئەوە بکەیت، چونکو ژیانی کچەکەت دەخەیتە مەترسییەوە. ئەوە زۆر مەترسیدارە."

دڵم کەوتە پەلەپەل و مەهتاب لە ترساندا، چاوی زەقکردەوە. تائێستا مەهتاب نەیدەزانی لە گەڕانەوەماندا بۆ ئەمریکا، لەوانەیە توشی مەترسی فیزیکی ببین. لە باوەشمدا زیاتر خۆی گرمۆڵەکرد.

هێلین بەسەرهاتێکی گێڕایەوە. ماوەیەك لەوەوپێش، ژنێکی ئێرانی لەگەڵ کچەکەیدا هەوڵیاندابوو بەو ڕێگایەدا دەرچن، پارەیان بە قاچاخچی دابوو، بۆئەوەی لە سنوور بیانــپەڕێنێتەوە. قاچاخچییەکان بردبوویانە نزیك تورکیا و لەوێ هەروا ئاسان لەو شاخانە جێیانـهێشتبوون. کچەکە لە برسا و لە هیلاکیدا مردبوو. ژنە لە کۆتاییدا بە سەرلێشێواوی و نیوە مردوو خۆی کردبوو بە دێیەکدا.

"لە هەمۆو ئەو ڕێگایانەی کە بەرەو دەرەوەی وڵات دەڕۆن،" هێلین وتی، "ئەوەی تورکیا مەترسیدارترینیانە." پێشنیاریـکرد، "دەکرێت لە هاوسەرەکەت جیابیتەوە. دەتوانم بتبەم بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان و لەوێ داوای جیابوونەوە بکەیت و وەك کێشەیەکی ئینسانی، مۆڵەتت پێدەدەن وڵات جێبهێڵیت. ئەوسا ڕێگا دەدرێت بگەڕێیتەوە بۆ ئەمریکا."

"بەبــێ کچەکەم، هەرگیز نــــا!" بەقایم وتم.

"تــــۆ شێتی،"هێلین وتی. لەبەرچاوی مەهتاب ئیدامەی بە قسەکەی دا، "باشە بۆچی ناڕۆیت و ئەو لێرە جێناهێڵیت؟ لەم وڵاتە بچۆرە دەرەوە. مەهتاب لەبیر خۆت بەرەوە."

نەمدەتوانی باوەڕبکەم، هێلین ئەوەندە دڵڕق بێت، لەبەرچاوی مەهتاب وا بڵێت. لەوەدەچوو، لە قووڵی پەیوەندی نێوان منداڵ و دایك تێنەگات.

"مــــامی، تۆ نابێت بەبێ من بچیت بۆ ئەمریکا!" مەهتاب دەستیـکرد بە گریان.

توند نوساندم بە سنگمەوە و دڵنیامـکرد، کە هەرگیزاوهەرگیز لێرە جێیناهێڵم. لەو ساتەدا، لە سەر پەیمانی خۆم سوورتربووم بۆ دەستبەکاربوون - هەرئێستا!

"دەمەوێت پەیوەندی بەو کچانەوە بکەم،" ڕاشکاوانە وتم.

هێلین چاوێکی هێنا و چاوێکی برد و مستەر ڤینکوپ لە توڕەییدا کەوتە کۆکەکۆك. نەمدەتوانی باوەڕ بە قسەکانی خۆم بکەم، یان باوەڕبکەم، کە بە تەواوی لەم پیلانەدا تێوەگلاوم.

بۆ چەند ساتێك كەس ورتەی لێوە نەهات. كە ڤینكۆپ بینی ئەوەندە سوورم، ئاهێكی هەڵكێشا و وتی، "ئەركی سەرشانمانە زانیاری بدەین بە تۆ، بەڵام بەڕاستی من لەگەڵ ئەوەدا نیم، پەیوەندیان پێوە بكەیت."

"هەر بوارێكم بۆ بێتەپێشەوە و بتوانم، خۆمی لێدەدەم،" پێمـوتن. "هەر هەلێكم دەستكەوێت، كەڵكی لێوەردەگرم."

ژمارەی تەلەفونی تریشی پێدام و هەر لەوێوە یەكسەر تەلەفونم بۆ كرد.

"لە نووسینگەی یاریدەدەری باڵوێزەوە تەلەفونت بۆ دەكەم،" پێم وت.

تریش بە بیستنی دەنگی من، لە خۆشیاندا گەشكە گرتی. "دوێنێ شەو لەگەڵ دایكت قسەمكرد!" وتی. "هەموو ڕۆژێك قسەمان لەگەڵدا كردووە. هەموو جارێك دەگری و تەواو نیگەرانە. لە ئێمە دەخوازێت شتێك بكەین و ئێمەش پێمانـوتووە، هەرچیمان لەدەستبێت دەیكەین. چاوەڕوانـبووین، هەوڵمانـدا پەیوەندیت پێوە بكەین. چۆن یەكتری ببینین؟"

لەسەر پلانێك ڕێككەوتین. بۆ ڕۆژی دوایی شتێك دەدۆزمەوە، تا لەپاش قوتابخانە بچم بۆ بازاڕ، بۆئەوەی تۆزێك لە كاتی ئاسایی درەنگتر بگەڕێمەماڵەوە. ئەگەر دەركەوت، كە مودی گومانی هیچ شتێك ناكات، ئەوا تەلەفون بۆ تریش دەكەم بۆ دووپاتكردنەوەی بینینەكە. من و مەهتاب لە كاتژمێری دوانزە و پەنجا خولەكدا لە دەرگای دواوەی پاركی كۆروش دەبین. تریش و سوزانە بە پەیكانێكی سپییەوە دێن.

"زۆر چاكە!" تریش وتی. "ئێمە لەوێ دەبین."

لە گەشكەیاربوونی تریش، هەم خۆشحاڵبووم هەم سڵەمیمەوە. ئەمە بۆ ئەو چی تیادایە؟ پارەی دەوێت یان زیاتر خۆشی لێدەبینێت؟ دڵنیابووم، هۆكارەكەی شایەنی تێگەیشتن بوو بۆم، بەڵام لەبارەی توانایییەوە چی؟ لە لایەكی ترەوە، تریش گەشبینی لێدەباری، دروست منیش لەو كاتەدا پێویستم بەوە بوو. بەخۆشییەوە چاوەڕوانی بینینی بووم و بۆم پرسیاربوو، چ ئاكامێكی دەبێت.

كە تەلەفونەكەم دانایەوە، هێلین دەستی خۆی هەڵدەگلۆڤی.

"بۆ سبەینێ ئێوارە پیزا چـــۆنە؟" پرسیارمكرد.

"چاكـــــە!" مودی، مامل و نەسرین هەموو پێیان باش بوو، كەسیان گومانی ئەوەیان نەكرد، كە پلانێكم چنیوە.

ئەو شەوە ئارامم لەبەرهەڵگیرا. پرسیار مێشكمی كونكردبوو، خەوی لێتاڵكردبووم. ئایا هەوڵەكەم ژیرانەیە؟ ئایا گوێڕایەڵی ئامۆژگارییەكانی فەرمانبەرانی باڵوێزخانەبم یان بۆ ڕزگاری خۆم دەستبدەمە هەرچی شتێك دێتەپێشەوە؟ ئایا مەهتاب دەخەمە مەترسییەوە؟ ئایا ئەو مافەم هەیە؟ چی ئەگەر گیراین؟ دەمگەڕێننەوە بۆ لای مودی - یان لەوە خراپتر - دیپۆرتمـدەكەن و مەهتاب دەدەن بەو كەسەی، كە لە ڕووی یاسایییەوە

بەرپرسێتی، بە باوکی؟ هەرچی چۆنێك بوو، ڕێگای گەڕانەوەم، بە تاقیتەنیا بۆ ئەمریکا، لە مێشکی خۆم دەرکردبوو. ئەو شەوە، ناخۆشترین شەوم بوو.

ئەمدەویرا پێشبینی ئەو مەترسیانە بکەم، کە لەم ڕێگایەدا دەهات پێشمان. بەرەبەیان کە مودی هەڵسا بۆ نوێژکردن، هێشتا خەو نەچووبووە چاوم، هێشتا بڕیارمـنەدابوو. کە گەڕایەوە ناو جێگاکە، لەتاو ساردی بەرەبەیانی زستان خۆی نوساند پێمەوە. خۆم کرد بە نوستوو، خێرا بڕیاری خۆمم دا. دەبێت خۆم لەدەست ئەم پیاوە کینەدارە ڕزگاربکەم!

دوو کاژێر دواتر مودی هەروا لە جێگادا بوو، کە من و مەهتاب خۆمان ئامادەدەکرد، بیچین بۆ قوتابخانە. "ئیمڕۆ تۆزێك دوادەکەوم،" لابەلایانە وتم. "دەبێت بچم بۆ لای دوکانی پیزاکە بۆ پەنیر."

"ئەمم،" مودی ورتەیەکی لێوەهات. ئەوەم وەك ڕازیبوونێك وەرگرت.

کە لە نیوەڕۆدا قوتابخانە تەواوبوو، مەهتاب ئامادەبوو، وەك من بە کەیف بوو، بەڵام لەوەدەچوو، لەمن باشتر ئەمە بشارێتەوە. تەکسییەکمان گرت و چووین بۆ پارکی کۆروش، لەوێ تەلەفونێکی پارەمان دۆزییەوە.

"ئێمە لێرەین،" بە تریشم وت.

"لە پێنـج خولەکدا، دەگەینە لاتان."

پەیکانێکی سپی لەکاتی خۆیدا هات، دوو کچی تیادا بوو لەگەڵ چەند منداڵی زیقاوی. کچێکیان لە دەرگای ڕێبوارەوە هاتەدەرەوە، قۆڵی گرتم و ڕایکێشام بەرەو ئوتومبیلەکە. "دەی وەرە،" وتی، "با پێکەوە بڕۆین."

قۆڵم ڕاکێشایە دواوە. "با قسەبکەین،" وتم. "ئەمە چییە؟"

"چەند هەفتەیە بەدوای تۆدا دەگەڕێین،" کچەکە وتی. "ئیستا ئێمە تەنیا ئێوە دەبەین." دیسانەوە قۆڵی گرتمەوە و دەستەکەی تری برد بۆ مەهتاب.

مەهتاب خۆی لادا و زریکەیەکی کرد.

"دەبێت هەرئێستا لەگەڵماندا بێن!" کچەکە وتی. "هیچ ڕێگایەکی ترت لەبەردەمدا نییە. یان هەرئێستا دێیت لەگەڵمان یان ئێمە یارمەتیت نادەین."

"گوێبگرە، من هەتا تۆ ناناسم،" پێموت. "شتێکم پێبڵێ، سەبارەت بەوەی چۆن بە منت زانیوە؟ پلانتان چییە؟"

کچەکە بە خێرایی قسەیـدەکرد، هەوڵیدەدا مەهتاب ئارامکاتەوە. کە قسەیـدەکرد، بە نیگەرانییەوە سەیری دەوروپشتی خۆیی دەکرد، بەو هیوایە ئەم دیمەنە سەرنجی پۆلیس یان پاسدار ڕانەکێشێت. "من تریشم. جودی لەبارە تۆوە بۆ ئێمە دوواوە. هەموو ڕۆژێك قسەی لەگەڵ دەکەین. وە ئێمە دەزانین، چۆن لە وڵات بتـبەینە دەرەوە."

"چـۆن؟" داوامکرد.

"دەتبەین بۆ ماڵێك. لەوێ دەتشارینەوە بۆ مانگێك، بۆ چەند ڕۆژێك، بۆ چەند کاژێرێك، نازانین. بەڵام پاشان لە وڵات دەرتـدەکەین."

شۆفێری ئوتومبیلەکە هاتەدەرەوە، بۆئەوەی بزانێت هۆی ئەم دواکەوتنە چییە. ناسیمەوە، ئەو کچە بوو کە "ئەخۆشی شەکرەی" هەبوو، هاتبوو بۆ لای مودی. تریش وەك سۆزانە ناساندی.

"باشە، پێمبڵێ پلانت چییە،" دووبارەمکردەوەی لێی. "دێم لەگەڵتان."

"ئێمە پلانەکەمان داناوە،" تریش دڵنیایکردم. "بەڵام نامانەوێت باسیبکەین."

چەند پرسیارم لا دروستبوو، بڕیارمدا لەگەڵ ئەم کچە نامۆ گەمشکەیارانە نەچمە ئوتومبیلەکەوە، تا هەندێ وەڵام وەردەگرمەوە. "بچنە ماڵەوە و لەسەر پلانەکەتان کاربکەن،" پێموتن. "دووبارە دەتانبینمەوە و هەرکاتێك پلانەکە ئامادەبوو، من دێم لەگەڵتان."

"ئێمە هیچ شتێکمان نەکردووە، تەنیا بەدوای تۆوەوە بووین و شەوڕۆژ بەسەر شەقامەکاندا گەڕاوین، هەوڵمانداوە تۆ بهێنینە ئێرە، وە ئێستا ئەمە بوارێکە لەبەر دەمتدا. ئێستا وەرە یان لەبیر خۆتی بەرەوە."

"تکاتانلێدەکەم! بیست و چوار کاژێر ماوەم پێبدەن، لەسەر پلانەکەتان کاربکەن."

"نــــــا. ئێستا یان هەرگیز نــــــا."

بۆ چەند خولەکێکی تریش، لەسەر ئەو شەقامە گفتوگۆمانکرد، بەڵام من نەمدەتوانی خۆم ناچاربکەم بە هەنگاوێکی وا لەپڕ بەرەو ڕزگاری. ئەگەر خۆمان لە ماڵێکدا بشارینەوە و ئەو کچانە نەتوانن پلانێك دابنێن، ئەوسا چی بەسەر من و مەهتاب دێت؟ تا چەند ژنێکی ئەمریکی و کچەکەی دەتوانن خۆیان بشارنەوە لە وڵاتێکدا، کە ڤینیان لە ئەمریکا دەبۆوە؟

لە کۆتاییدا وتم، "چاکە. بەخێر بچــن!"

تریش تەواو تووڕەبوو لە من، پشتی تێکردم و دەرگای ئوتومبیلەکەی کردەوە. "تۆ ناتەوێت هاوسەرەکەت جێبهێڵیت،" پێیوتم. "هەرگیز جێیناهێڵیت. تەنیا قسەدەکەیت، بۆئەوەی خەڵك باوەڕتپێبکات، کە دەتەوێت بڕۆیت. ئێمە باوەڕتپێناکەین. لە ڕاستیدا دەتەوێت لێرە بمێنیتەوە."

ئوتومبیلەکە ڕۆیشت و نوقمی ناو ترافیکی تاران بوو.

من و مەهتاب تاك و تەنیا، لە نێو کۆمەڵانی پیادەڕەودا ماینەوە. قسەی گازندەی تریش لە گوێمدا دەزرنگایەوە. بۆچی کەڵکم لەو هەلە وەرنەگرت؟ ناکرێت تۆزێك ڕاستی لە تاوانبارکردنەکانی تریشدا نەبێت؟ ئایا خۆم هەڵناخڵەتێنم بەو باوەڕەی، کە گوایە دەتوانم یان دەبێت لەگەڵ مەهتابدا هەڵبێم؟

ئەو پرسیارانە ترسناك بوون. من و مەهتاب دەمانــتوانی، بە پەیکانێکی سپی بەسەر شەقامەکانی تاراندا بڕۆین بۆ شوێنێکی نادیار و داهاتوویەکی ناڕۆشن و هەتا پڕمەترسی. لە جیاتی ئەوە، گوڕماندایە خۆمان بەرەو دوکانی پیزا بۆ کڕینی پەنیر، تا ژەمێك خواردنی تایبەتی دروستبکەم بۆ مێردەکەم.

تێبینییەکان:

1. چەشم: وشەیەکی فارسییە بە واتای "بەسەرچاو" دێت

# 10

کەوتینە هاتوچۆیەکی بەردەوام لەگەڵ ماڵی *ئاغا* و *خانم* حەکیمدا. ئەو مێزەربەسەردەم زۆر چووبوو بەدڵدا، چونکو بۆچوونی تایبەتی خۆی هەبوو لەسەر دینەکەی. مودیش بەدڵی بوو. بەهۆی تۆڕی پەیوەندییەکانییەوە، مێزەربەسەر هەوڵیدەدا کارێك بۆ مودی بدۆزێتەوە، کاری پزیشکی بێت یان وانەوتنەوە. ئاغا حەکیم هانی مودی دا، هەر لەماڵەوە دەستبەکاری پرۆژەیەك بێت، پرۆژەی وەرگێڕانی نووسراوەکانی باپیریان بۆ زمانی ئینگلیز، کە ئاغا حەکیم لە عەرەبییەوە وەریگێڕابوون بۆ فارسی.

مودی دەستگایەکی تیپنووسی کڕی و منی ئاگادارکردەوە، کە دەبم بە سکرتێری خۆشی دەستبەکاری وەرگێڕانی باسێك بوو بەناوی (*باوك و منداڵ*)، کە بۆچوونی تەریقەتی حەکیمی لەسەر ئەو بابەتە پیشاندەدا.

زۆری نەبرد، مێزی نانخواردنی کەمبەکارهاتووی نەسرین و مامل، پڕبوو لە کاغەزی دەستنووس. مودی لە سەرێکی مێزکە دادەنیشت و وەریدەگێڕا و دەیدا بە من بۆ تایپکردنی.

بەهۆی ئەم کارەوە، باشتر لە بۆچوونی مودی تێگەیشتم. لە بۆچوونی تەریقەتی حەکیمەوە، باوك بەرپرسی تەواوی منداڵە، کە لە ڕووخساریدا ڕێکوپێك بێت، لە هەڵسوکەوتیدا بەڕێز بێت، بە شێوەیەکی "دروست" بیربکاتەوە و بەپێی سوننەتەکانی ئیسلام ژیانبکات. دایك لەم پرۆسەیەدا دەورێك نابینێت.

لە چەند هەفتەدا، ئەرکێکی پڕزەحمەتمان ئەنجامدا. نووسینەکانی باپیری مودی، شێوەیەکی پەخشانی کەمناوەڕۆکی گازندەی ئامۆژگارییانەی بەخۆیەوە گرتبوو. هەموو دوانیوەڕوانێك، کە مەهتابم لە قوتابخانە دەهێنایەوە، کۆمەڵێك دەستنووسی تازە ئامادەکرابوون و مودی وا چاوەڕوانبوو، یەکسەر دەستبکەم بەکار، چونکو پرۆژەکەی بەکارێکی زۆر گرنگ دەزانی.

جارێکیان وشەکانی تەریقەتی حەکیم لە ناخی دڵمی دا. باسی ئەرکی منداڵی دەکرد بەرامبەر بە باوکی، چیرۆکێکی وەك نمونە هێنابۆوە، کە چۆن باوکێك لەکاتی گیانەڵەدا بەهیوا بووە، بۆ دواجار کوڕەکەی ببینێت. فرمێسك بەسەر ڕوومەتمدا هاتەخوارەوە. وشەکانی ناو نووسراوەکە لەبەرچاوم لێڵبوون. باوکم گیانیدەدا و دەبوو من لەلای بم.

مودی فرمێسکەکانمی بینی. "چی بووە؟" پرسیاریکرد.

"ئەم چیرۆکە لەبارەی باوکێکی گیانەڵەوەیە ..." گریام. "تۆ چۆن ناهێڵیت باوکم ببینم، لەکاتێکدا ئەو لە گیانەڵەدایە؟ هەتا تۆ گوێڕایەڵی قسەکانی باپیری خۆت ناکەیت."

"ئینجا باوکی تۆ کەی موسڵمان بووە؟" گاڵتەجاڕانە پرسیاریکرد.

"نەء، بێگومان موسڵمان نەبووە."

"ئەی ئیتر کێشە چییە،" مودی وتی. "باوکت ناگرێتەوە."

ڕامکرد بۆ ژووری نوستنەکە، تا بەئارامی گریانی خۆم بکەم. ئەوەندە هەستم بە تەنایی دەکرد، کە بەزەحمەت هەناسەم بۆ دەدرا. دەموچاوی باوکمم هاتە بەرچاو و گوێمـلێبوو، پەندەکەی خۆیی دووبارەدەکردەوە. "لە هەرکوێیەك ورت هەبێت، ڕێگای دەرچوونت هەیە."

هەر دەبێت ڕێگایەك هەبێت، لەدڵی خۆمدا وتم. هەرچی چۆنێك بێت، ڕێگایەك هەر پەیدادەبێت.

لە سەردانێکدا ئاغا و خانم حەکیم پێشنیاریانـکرد، من و مەهتاب بچین بۆ پۆلی قورئان خوێندن، کە دوانیوەڕوانی پێنج شەممان، لە حوسەینییەی ئەرشد، بۆ ژنانی ئینگلیزی زمان بەڕێوەدەبرا. بەم پێشنیارەیان، بۆچوونی باشی خۆیان بەرامبەر بە من دووپاتکردەوە. بێگومان پێیانـخۆشبوو بێمە سەر دینی ئیسلام، چونکو لە دینی ئێسلامدا خۆشی و بەختەوەریان دەبینی. پێشنیارەکەیان هەڵگری پەیامێك بوو بۆ مودی، کە دەبێت ڕێگەمبدات، زیاتر لە ماڵ بچمە دەرەوە و لەگەڵ ژنانی ئینگلیزی زمان، پەیوەندی دروستبکەم. حەکیمەکان خۆشحاڵدەبوون، ئەگەر ژنێکی موسڵمانی گوێڕایەڵم لێدەرچێت، بەڵام بە ویستی خۆم.

پێشنیارەکە یەکسەر ورەمی بەرزکردەوە. ئارەزووی خوێندنی قورئانم نەبوو، بەڵام هەرئەوەی کە بە بەردەوامی کۆمەڵێك ژنانی ئینگلیزی زمان دەبینم، مایەی خۆشحاڵیم بوو.

مودی دوودڵ بوو، چونکو بۆ من، هەلێك بوو بۆ دوورکەوتنەوە لە کۆنترۆڵی ئەو. بەڵام دەمزانی، دەبێت ملبدات. چونکو هەر "پێشنیارێك" لە ئاغا حەکیمەوە بۆ مودی بهاتایەتە خوارەوە، وەك فەرمانێکی ڕاستەوخۆ کاریگەری هەبوو.

پێنج شەممەی دوای ئەوە، مودی بەنابەدڵییەوە من و مەهتابی بە تەکسی برد بۆ حوسەینییەکە. بۆ نواندنی دەسەڵاتی خۆی، هەوڵیدا بێتە پۆلەکەوە و تەماشایەکی شوێنەکە بکات، پێش ئەوەی ڕێگەی ئێمە بدات بچینە ژوورەوە، بەڵام ژنێکی ئینگلیزی کەللەڕەق ڕێگای پێگرت.

"تەنیا دەمەوێت بچمە ژوورەوە و تەماشایەك بکەم."

"نـــەء،" وەڵامیدایەوە. "ئێرە تەنیا بۆ ژنانە. ڕێگە بە هیچ پیاوێك نادەین، بێتە ژوورەوە."

ترسام مودی توڕەبێت و هەتا بۆ جارێکیش بێت، داواکەی ئاغا حەکیم نەباتەسەر. چاوی هێنایەوە یەك، کە ژنەکانی تری بینی خۆیان دەکرد بە پۆلەکەدا. هەموویان گوێڕایەڵانە خۆیان داپۆشیبوو، زۆربەیان عەبایان بەسەردەوە بوو. لەوە دەچوون ژنانێکی

موسڵمانی باش بن، هەتا ئەگەر بە ئنگلیزیش بدوێن. هیچیان لە سیخوری سینایئەی نەدەچوون.

پاش چەند ساتێك دوودڵی، دەبێت مودی بۆی دەرکەوتبێت، ئاغا حەکیم ڕاست دەڵێت، کە ئەمە یارمەتیدەر دەبێت بۆ گونجاندنی من لەگەڵ ژیانی ئێرە. شانی هەڵتەکاند و ڕۆیشت و من و مەهتابی لای ژنە ئینگلیزەکە جێهێشت.

ژنەکە ڕێسای پۆلی ڕاگەیاند: "قسە و قسەلۆك لە پۆلدا قەدەغەیە. ئێمە لێرەین تەنیا بۆ خوێندنی قورئان."

خوێندن دەستپێکرد. بە یەکدەنگ دەستمانکرد بە قورئان خوێندن، بەشداریمان لە پرسیار و وەڵامدا کرد، کە بەرز نرخاندنی ئیسلام و سوکایەتی بە مەسیحی بوو، پاشان پێکەوە نوێژمانکرد. بۆ خۆی چالاکییەکی خۆش نەبوو، بەڵام من کونجکاو بووم بۆ خوێندنەوەی دەموچاوی ژنەکان. دەمویست بزانم ئەمانە کێن. لێرە چی دەکەن؟ ئایا بە ویستی خۆیان هاتوون بۆ ئێرە؟ یان هەندێکیان وەك من زنجیرکراون؟

وام دانابوو، کە وانە تەواوبێت، مودی لەدەرەوەی حوسەینییەکە چاوەڕوانمان دەکات، بەڵام سەروکەللەیم نەبینی لە ناو ئەو خەڵکەدا، کە لەسەر شۆستەکە بوون. نەمدەوێرا هەر لە یەکەم ڕۆژی پۆلەوە گومانی لا دروستبکەم، تەکسییەکی پرتەقاڵیم گرت و یەکسەر لەگەڵ مەهتاب چووین بۆ ماڵەوە. هەر ئەو ساتەی پێمان نایە دەرگای ماڵەوە، مودی تەماشای کاتژمێرەکەی کرد و ڕازیبوو بەوەی، کە ئێمە کەڵکمان لەو هەلە وەرنەگرتووە.

"بەڕاستی پۆلەکە کاری تێکردم!" بە مودیم وت. "پێویستە هەموو کەس بیخوێنێت. وازت لێناهێنن ئەگەر نەخوێنیت. لەو باوەڕەدام، زۆر شت لەوێ فێردەبم."

"چاکە،" مودی وتی، بە ترسێکەوە خۆشحاڵبوو، کە ژنەکەی هەنگاوێکی گەورەی ناوە بەرەو خەملاندنی دەوری خۆی لەناو کۆماری ئیسلامی ئێراندا.

منیش خۆشحاڵبووم، بەڵام بە پێچەوانەی هۆکەی ئەودەوە. تەنیا یەك هەنگاوی بچوك بوو، بەرەو هەڵهاتن لەدەست کۆماری ئیسلامی ئێران. وانەی خوێندنی قورئان، بە ماوەیەکی کەم، پاش تەواوبوونی قوتابخانەی مەهتاب دەستپێدەکرد. هەتا ئەگەر مودی بە پێویستی بزانێت، بۆ چەند جارێك خۆی بمانبات بۆ حوسەینییە، دەمزانی زۆر ناخایەنێت، وازمان لێدەهێنێت خۆمان بڕۆین، بەمەش تەواوی ئەو ڕۆژە ئازاد دەبووین.

سەرەڕای یاسای قەدەغەی قسە و قسەلۆك، ئاسایی لەپێش و پاشی وانەکە، تۆزێك قسە هەر دەکرا. پاش دووەمین وانە بوو، کە یەکێك لە ژنەکان لێیپرسیم، لەکوێوە هاتووم. کە وەڵامدایەوە، "مەشیگان" ئەو وتی، "ئۆی، باشترە ئلین بناسیت. ئەویش لە مەشیگانەوە هاتووە."

بە یەکتریان ناساندین. ئلین ڕافاعی، ژنێکی باڵا بەرزی ئێسك ئەستور، نزیك سی ساڵ تەمەنی بوو، بەڵام پێستی وشك و بە تەمەنتر دیاربوو. ڕووسەرییەکەی وا قایم بە دەموچاوییەوە پێچابوو، نەمدەتوانی ڕەنگی قژی بزانم.

" لە مەشیگان، لە کوێ دەژیایت؟" پرسیارملێکرد.

"نزیکی لانسنگ."

"لە کوێ؟"

"ئۆی، هیچ کەسێك ناوەکەی نەبیستووە،" ئلین وەڵامیدایەوە.

"چاکە، پێمبڵێ، چونکو من نزیك لانسنگ ژیاوم."

"ئۆسۆ."

"گاڵتەم لەگەڵ دەکەیت!" پێموت. "کەسوکارم لە بانیستەر دەژین. لە ئلسیە کارمکردووە. لە ئۆسۆ چوومەتە قوتابخانە!"

وەك کچە قوتابخانەییەکان، گەشاینەوە لەم ڕێکەوتە چاوەڕواننەکراوە و زانیمان، کە زۆر شتمان هەیە پێکەوە باسیبکەین.

"دەتوانن خۆت و خێزانەکەت، دوانیوەڕۆی ڕۆژی هەینی سەردانمانبکەن؟" ئلین دەعوەتیکردین.

"بڵێم چی، نازانم. مێردەکەم ڕێگەمنادات، لەگەڵ خەڵك بدوێم یان بچمە دەرەوە. لەو باوەڕەدا نیم، ڕازیبێت، بەڵام پرسیاریلێدەکەم."

ئەم جارەیان مودی لە بەردەمی حوسەینییەکە چاوەڕوانی من و مەهتابی دەکرد، منیش بە زەردەخەنەیەکی ڕاستەقینەوە سەرسامەکرد. "هەڵیبهێنە چی بووە؟" پرسیارملێکرد. " هەرگیز هەڵیناهێنیت. بە ژنێك ئاشنابووم لە ئۆسۆوە."

مودی لە خۆشی من دڵشادبوو. بە ئلینم ناساند و چەند خولەکی برد تا بە یەکتری ئاشنابوون، ئینجا وتم، "ئلین بۆ دوانیوەڕۆی ڕۆژی هەینی دەعوەتیکردوین،" لە دڵی خۆمدا دەمزانی، مودی ڕەتیدەکاتەوە.

بەڵام وتی، "باشە. بەڵێ."

ئلین لە دواساڵی قوتابخانەی ئامادەیی بووە، کە شوویکردووە بە هورموز ڕافاعی و بەمە، وەك ژنێکی ماڵەوە خێزانی پێکەوەناوە. هورموز وەك ئەندازیارێکی ئەلەکترۆنیك، کە لە ئەمریکا خوێندنی تەواوکردووە، چ لە ڕووی دارایی و چ لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە دەستباڵا بووە لەبەرامبەر ئلیندا و ئاسایی بووە خۆی وا ببینێتەوە - هەتا پێیخۆشبێت - دەوری پارێزەر/ بەخێوکەر بگێڕێت. وەك مودی، هورموز ڕۆژێك لە ڕۆژان خۆی بە ئەمریکی زانیوە. لە ئێراندا ناوی لەگەڵ ئەوانەدا بووە کە دژی ڕژێمی شا بوون. گەڕانەوە لەو ساڵانەدا بۆ وڵاتی لەدایکبووی خۆی، بە واتای بەندکردن و ئەگەری ئەشکەنجە و ئیعدامکردن دەهات لەلایەن *ساڤاك*ەوە[1]. هورموزیش هەر وەکو مودی، ڕووداوە سیاسییەکان لەو پەڕی جیهانەوە، کاریگەرییەکی قووڵی بووە لەسەر هەلومەرجی ژیانی.

هورموز لە مینەسۆتا کار دۆزێتەوە و لەگەڵ ئلین کەم تا زۆر ژیانێکی نموونەیی ئەمریکاییان پێکەوە ناوە. کچێکیان دەبێت و ناوی دەنێن جەسیکا. کاتێك ئلین خەریکە

منداڵی دووەمی دەبێت، دەگەڕێتەوە بۆ ئۆسۆ. لە بیست و هەشتی شباتی 1979دا ئێلین کوڕێکی دەبێت. پاشان هەر ئەو ڕۆژە، ئێلین تەلەفوندەکات بۆ هورموز، بۆئەوەی ئەم مژدەیەی پێبگەیەنێت. "ئێستا ناتوانم قسەت لەگەڵ بکەم،" هورموز وەڵامیدەداتەوە. "چونکو گوێبیستی هەواڵەکانم."

هەواڵەکانی ئەو ڕۆژە، چوونەدەرەوەی شا بووە لە ئێران.

بۆم پرسیاربوو، ئاخۆ چەندەهای تری وەك هورموز و مودی هەیە، کە ژیانی مەنفا و ڕق و کینە لە شا، بانگەوازێك بوو بۆیان بۆ گێڕاننەوەی ڕابوردوو؟

کاتێك هورموز کاتی بۆ مایەوە تا ناوڕێك لە کوڕە ساواکەی بداتەوە، ناوێکی ئێرانی بۆ هەڵبژاد بەناوی عەلی. ژیانی هورموز، بە ئێلینیشەوە گۆڕانکارییەکی کوتوپڕی بەسەردا هات.

مودی بۆ پێنج ساڵ خۆی ڕاگرت، بەڵام هورموز زۆر زوو بڕیاریدەدا، بگەڕێتەوە ژێر سایەی حکومەتی ئایەتوڵا خومەینی.

ئێلین ئەمریکییەکی بە ئەمەك بوو، گەڕانەوەکەی پێخۆش نەبوو. بەڵام هەم هاوسەر بوو و هەم دایك. هورموز ڕۆشن قسەی خۆی کردبوو، کە هەر دەگەڕێتەوە بۆ ئێران، جا بەبێ یان لەگەڵ خێزانەکەی. ئەمە وای لە ئێلین کردبوو، کە ڕازیبێت بۆ ماوەیەکی کاتی بێت بۆ ئێران. هورموز دڵنیایکردبوو، کە ئەگەر تارانی پێخۆش نەبێت، دەتوانێت هەرکاتێ بییەوێت لەگەڵ منداڵەکان بگەڕێتەوە بۆ ئەمریکا.

سەردەمانێك ئێلین، وەك من، لە تاراندا بارمتە بووە. هورموز پێیوتووە، کە نابێت هەرگیز بگەڕێتەوە بۆ ئەمریکا. هاووڵاتییەکی ئێرانییە و دەکەوێتە ژێر سایەی یاسای وڵاتەکە و ویستی خۆیەوە. بۆ ماوەیەك دەرگای لەسەر داخستووە و دارکاریکردووە.

چەند نامۆ بوو، بە گوێی خۆت، گوێبیستی بەسەرهاتێکی وا بیت! هورموز و ئێلین پێکەوە ئەم بەسەرهاتەیان بۆ گێڕاینەوە، کاتێك دوانیوەڕۆی ڕۆژی پێنج شەممە، لە هۆڵی ماڵە پاکنەکراوەکەیاندا دانیشتبووین. لە سەرەتاوە بۆم پرسیاربوو، کە ئایا مودی دلگران نابێت لەم باسە، بەڵام بۆم دەرکەوت کە دەبێت پێیخۆشبێت. کۆتایی بەسەرهاتەکەی دەزانی، بۆ شەش ساڵ دەچوو ئێلین هێشتا لە تاراندا بوو، دیاربوو لەگەڵ وڵاتی مێردەکەی، خۆی گونجاندبوو. دروست هەر ئەو شتە بوو، کە مودی دەیویست، من بە چاوی خۆم ببینم و بە گوێی خۆم ببیستم!

"بەڕاستی یەکەم ساڵ سامناك بوو،" هورموز پێیوتین. "بەڵام وردەوردە باشبوو."

پاش یەك ساڵ لەو ڕۆژەوەی ئێلین گەیشتبووە ئێران، هورموز پێیوتبوو، "چاکە، بگەڕێرەوە بۆ ماڵی خۆتان. ویستم بۆ یەك ساڵ تۆ لێرە بهێڵمەوە تا بەچاوی خۆت ببینی و بڕیار بدەیت لێرە دەمێنیتەوە یان دەگەڕێیتەوە. ئێستا دەتوانی بگەڕێیتەوە."

ئەوە ئەو شتە بوو، کە دەمویست مودی بیبینێ و بیبیستێ! ئـــای کە چەند ویردم خوێند، بەباشی گوێیلێبێت، بەتەواوی ئەقڵێ بێتەوە سەرخۆی و مۆڵەتی ئەو هەڵبژاردنەم پێبداتـ!

چەند بەسەرهاتەکە درێژیـدەکێشا، ئەوەندە ئارامیم لەبەرهەڵدەگیرا. ئلین لەگەڵ جەسیکا و عەلی گەڕاونەتەوە بۆ ئەمریکا، کەچی پاش شەش هەفتە تەلەفونی بۆ هورموز کردووە و پێیوتووە، "وەرە بۆ ئێرە و لەگەڵ خۆت بمبەرەوە." جێگای باوەڕنەبوو، ئەمە دوو جار ڕوویدابوو. لە هەردوو جارەکەدا، ئلین بە مۆڵەتی هورموز ئێران جێدەهێڵێت و هەردوو جارەکە دەگەڕێتەوە. زۆر مەحاڵ بوو باوەڕ بکەم - لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا لێرە بوو، ژنێکی موسڵمانی گوێڕایەڵی لێدەرچووبوو. سەرنووسەری *موحەجەبە* بوو، کە گۆڤارێکی ئینگلیزی زمان بوو بۆ ژنانی موسڵمان و بە تەواوی جیهاندا بڵاودەکرایەوە. هەرچی نووسراوەیەك ئلین ئامادەیدەکرد بۆ چاپ، دەبوو ڕەزامەندی ئەنجوومەنی ڕێنوێنی ئیسلامی بۆ وەرگیرێت، ڕەوالی کارێك کە ئلین ئاسودە بوو پێی.

سەرچڵانە دەمویست بەتەنیا قسە لەگەڵ ئلیندا بکەم، بزانم هۆی ئەم هەڵبژاردنەی چی بووە، بەڵام ئەو دوانیوەڕۆیە هەلـم بۆ ڕێکنەکەوت.

بەسەرهاتی ئلین مایەی ئەرەیی و سەرسامیم بوو. چۆن ژنێکی ئەمریکایی - یان هەر کەسێکی تر - دەتوانێت ئێران لەبەرامبەر ئەمریکادا هەڵبژێرێت؟ دەمویست هەر دوو شانی ئلین بگرم و ڕایوەشێنم و هاواربکەم "بـــــۆچی؟!!!"

باسەکە لقێکی ناخۆشی لێبۆوە. هورموز پێیوتین، کە لەم دواییانەدا لە باوکێوە پارەیان بۆ ماوەتەوە و ئیستا خەریکی دروستکردنی خانووی خۆیانن، کە بەم زوانە تەواودەبێت.

"ئێمەش بەنیاز بووین خانوو دروستبکەین،" مودی بەخۆشییەوە وتی. "نیازمان بوو لە دیترۆیت، بەڵام ئێستا دەمانەوێت لێرە دروستیبکەین، هەرکە پارەکانمان گواستەوە بۆ ئێران."

ئەو خەیاڵە تەزاندمـــی.

هاوڕێیەتی من و مودی لەگەڵ ئلین و هورموز خێرا چووەپێشەوە، بە بەردەوامی هاتوچۆی یەکتریمان دەکرد. بۆ من مایەی خۆش و ناخۆشی بوو. مایەی خۆشی بوو، هاوڕێیەکی ئینگلیزی زمانم هەبێت، بەتایبەتی لەو شوێنەی کە تیایدا گەورەبووبووم. ئەمە تەواو جیاواز بوو لەوەی لەگەڵ ئێرانییەکدا بە ئینگلیزی بدوێیت، کە بۆ خۆم هەرگیز دڵنیانەدەبووم لەوەی چەند بەتەواوەتی تێیگەیشتووم. لەگەڵ ئلیندا بێهیچ دوودڵییەك دەمدایە بەری و دەمزانی تێیدەگات. بەڵام زۆر سەخت بوو، چاوم بە ئلین و هورموز هەڵبێت، وەك ئەوە وابوو وێنەیەکی سامناکی داهاتووی خۆمان ببینم. ئۆقرەم لێبڕابوو بۆ هەلێك، بەتەنیا بکەومە قسە لەگەڵ ئلیندا. مودی دەسڵەمییەوە، ئاشکرا بوو

دەویست زیاتر ئلین بناسێت، پێش ئەوەی ڕێگەمان پێبدات پەیوەندییەکی نزیك دامەزرێنین.

ئلین و هورموز تەلەفونیان نەبوو. ئەمە پێویستی بە مۆڵەتێکی تایبەتی هەبوو، کە زۆرجار چەندەها ساڵی دەخایەند تا وەردەگیرا. وەك زۆربەی ئەو خەڵکە، لەگەڵ دوکانی سەر کۆڵانەکەیان ڕێککەوتبوون، کە لە کاتی پێویستدا تەلەفونەکەی بەکاربهێنن.

ڕۆژێکیان ئلین لەوێوە تەلەفونیکرد و بە مودی وت، کە دەیەوێت، من و مەهتاب بۆ دوانیوەڕۆ دەعوەتبکات بۆ چاخواردنەوە. مودی بەنابەدڵییەوە ڕێگەمیدام لەگەڵی قسەبکەم، چونکو نەیدەویست ئلین بزانێت، تا چ ئاستێك بەندیکردووم. "کێکێکم بە وردە شوکولاتەوە دروستکردووە!" ئلین وتی.

بەدەست دەمی تەلەفونەکەم گرت و داوای ڕەزامەندی مودیم کرد.

"ئەی من چی؟" بەگومانەوە پرسیاریکرد. "ئایا منیش دەعوەتکراوم؟"

"لەو باوەڕەدا نیم، هورموز لەو کاتەدا لە ماڵەوە بێت،" وەڵامـــدایەوە.

"نـــا. نابێت بچیت." دەبێت لەو ساتەدا، دەموچاوم ئەو پەڕی بێهیوایی ئاشکرا کردبێت. لەو کاتەشدا نەمدەویست لە پەیوەند بە کێکێکدا، لەگەڵ مودیدا بیکەم بە هەرا. بە هەر هۆیەك بوو، ئەو ڕۆژە مودی لە مەزاجێکی باشدا بوو، هەروەها دەبێت کەڵکی هاوڕێیەتی ئلینی بەراوەدکردبێت لەگەڵ مەترسی شلکردنی لغاوی دەمی من بۆ ئەو سەردانە. پاش چەند ساتێك وتی، "دەی باشە، بڕۆ."

بەدەم خواردنی کێکی بەلەزەتەوە، دووبەدوو لەگەڵ ئلیندا دانیشتین و ئازادانە کەوتینە قسە. مەهتاب بە خۆشییەوە لەگەڵ مریەمی نۆ ساڵە (ناوی موسڵمانکراوی جەسیکا) و عەلی شەش ساڵە، دەستکرد بە یاری. لە هەمووی خۆشتر، مریەم و عەلی بوکەشوشەی ئەمریکاییان هەبوو. کتێب و یاری تر و بوکەشوشەی باربیان هەبوو.

کاتێك منداڵەکان پێکەوە یاریانـــدەکرد، من و ئلین سەرگەرمی گفتوگۆیەکی توند بووین.

ئەو پرسیارەی مێشکمی کونکردبوو، لێمـــکرد.

"بـــۆچـــی؟"

"لەوانەیە ئەگەر هەلومەرجی تۆم هەبوایە، لە ئەمریکادا بمامایەوە،" پاش چەند ساتێك بیرکردنەوەی قووڵ، وەڵامیدایەوە. "بەڵام ئەوەی من هەمە، لێرەیە. دایك و باوکم خانەنشینن و پارەیان نییە یارمەتیمبدەن. بۆ خۆشم نە پارەم هەیە، نە خوێندنی بەرز، نە زیرەکی. هەروەها دوو منداڵم هەیە."

لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، هێشتا هەر بۆم سەخت بوو تێبگەم. لە هەمووی ناخۆشتر، ئلین بە ڕق و قینەوە لەبارەی هورموزەوە دەدووا. "لێـــمدەدات،" دەستیکرد بە گریان. "لە منداڵەکان دەدات. لەگەڵ ئەوشدا ئەم کارە بە هەڵە نازانێت." (قسەکەی ئەسرینم هاتەوە یاد: "هەموو پیاوان وەك یەکن.")

ئلین لە ترسەوە ئەو ڕێگایەی گرتبوو، نەك لە عشقەوە. پاڵپێوەنەرەکە زیاتر ئابوری بوو تا سۆز و خۆشەویستی. ئلین نەیتوانیبوو، لەبەرامبەر ئەو ئاهێمنی و پشێوییەی وڵاتەکەی خۆی، لەسەر پێی خۆی ڕاوەستێت، ئەمە بە لەدەستدانی سەربەستی خۆی تەواوبووبوو. لەوەش زیاتر ژیانێکی هەڵبژاردبوو کە هەر ساتێکی ئەشکەنجەیەك بوو، بەڵام هەر شتێکی بەدەستهێنابوو، ئەوەی بە ئاسودە و دڵنیایی، ئاومان لێدەبرد.

هەرچی چۆنێك بوو، لەناو گریان و فرمێسکڕشتندا، لە کۆتاییدا وەڵامی "بۆچی"یەکەی خۆمم وەرگرت. "چونکو ئەگەر بگەڕێمەوە بۆ ئەمریکا، دەترسم نەتوانم ژیانێکی ئاسایی هـــەبێت."

لەگـــەڵیدا دەستمـــکرد بەگریان.

ماوەیـــەکی برد تا ئلین هاتەوە سەرخۆی و منیش هێزم تێکەڕا، بۆ ئەوەی بچمە سەر باسی دووەمم. "لە ڕاستیدا حەزدەکەم شتێکت لەگەڵ باسبکەم،" پێم وت. "بەڵام نازانم تۆ دەڵێت چی، ئەگەر ئەمە لە مێردەکەت بشاریتەوە. ئەگەر شتێکی تیادا نابینی، ئەگەر ئەمە وەك نهێنییەك لای خوت دەیهێڵیتەوە و بە مێردەکەت ناڵێت، ئەوا پێت دەڵێم. ئەگەر نـــا، ئەوا نامەوێت، ئەم بارە لە تۆ بنێم."

ئلین کەوتە بیرکردنەوەیەکی قووڵ و ئینجا هاتە قسە، کە جاری دووەم گەڕاوەتەوە بۆ ئێران، بڕیاریداوە، ئەو پەڕی هەوڵبدات، ببێت بە هاوسەرێکی موسڵمانی تەواو بە باوەڕ. بووبوو بە موسڵمانی شیعە، عەبا و لەچك و کراسی درێژی کردبوو بە جلوبەرگی خۆی، هەتا بەتەنیاش لە چواردیواری ماڵەکەی خۆیدا (ئێستا کە قسەمان دەکرد خۆی داپۆشیبوو)، لەکاتی خۆیدا نوێژیدەکرد، ڕێزی لە هەموو پیاوانی ئاینی دەگرت، قورئانی دەخوێند و ئاسایی ئەمانەی وەك ویستێکی ئەڵا قبوولکردبوو.

هاوسەرێکی موسڵمانی گوێڕایەڵی لێدەرچووبوو، بەڵام ژنێکی ئەمریکایی کونجکاویش بوو. "نـــا، پێـــناڵێم،" لە کۆتاییدا بەڵێنیپێدام.

"مەبەستم ئەوەیە و بۆم گرنگە، کە تەنیا لە نێوانی خۆماندا بێت، بەهیچ شێوەیەك بە کەسی تر نەڵێیت."

"بەڵێنـــبێت."

هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا و کەوتمە قسە. "ئەمە بە تۆ دەڵێم، چونکو ئەمریکیت و پێویستم بە یارمەتی تۆ هەیە. من دەمەوێت لێرە بڕۆم."

"باشە، بەڵام ناتوانیت. ئەگەر ئەو ڕێگات پێنەدات، هیچ ڕێگایەکی ترت نییە."

"نـــا، ڕێگای تر هەیە،" وەڵاممدایەوە. "دەمەوێت هەڵبێم."

"تـــۆ شێتیت. تۆ ناتوانیت ئەوە بکەیت."

"داواتلێناکەم هیچ شتێکم بۆ بکەیت،" پێموت. "هەموو ئەوەی من لە تۆم دەوێت، ئەوەیە کە هەندێك جار بەهۆی تۆوە لە ماڵەوە بێمە دەردوە، وەك ئیمڕۆ، تا بتوانم بچم

بۆ باڵویزخانەی سویسرا." باسی پەیوەندییەکانی خۆمم کرد لەگەڵ باڵویزخانە، چۆن نامەم بۆ دەهێنن و بۆم ڕەوانەدەکەن و چۆن ئەو یارمەتییەی لە دەستیانێت بۆم دەکەن.

"ئایا یارمەتیت دەدەن لە وڵات بچیتە دەرەوە؟" پرسیاریکرد.

"نــا. تەنیا ئەگەر زانیارییەك هەبێت، پێمیدەگەیەنن، ئەوە هەموویەتی. ئەگەر کەسێك بییەوێت پەیوەندیم پێوە بکات، دەتوانێت لە ڕێگای ئەوانەوە، ئەو کارە بکات."

"چاکە، بەڵام من نامەوێت بچم بۆ باڵوێزخانە،" ئلین وتی. "هەرگیز لەوێ نەبووم. مێردەکەم هەر یەکەم جار پێیوتووم، کە بۆم نییە بچم بۆ باڵوێزخانە، لەبەرئەوە هەتا بەچاویش نەمبینیوە."

"پێویستناکات بچیت بۆ ئەوێ" دڵنیامکرد. "کات دەبات، پێش ئەوەی مودی ڕێگەمبدات زۆر شت پێکەوە بکەین، بەڵام لەو باوەڕەدام، لە ئێستادا ڕێگەمپێدەدات لەگەڵ تۆدا بم، چونکو بە کەسێکی باشت دەزانێت. تەنیا تۆ هەڵیکەم بۆ دەرەخسێنی لەماڵەوە بێمە دەرەوە. دەتوانیت بڵێیت، دەچین بۆ بازاڕ یان هەرچی شتێکی تر و من کەڵك لەو کاتە وەردەگرم، کە گوایە لەگەڵ تۆدام."

ئلین بۆ چەند خولەکێك، لەسەر داواکەم بیریکردەوە و ئینجا بەسەر لەقاندن، ڕەزامەندی خۆیی ڕاگەیاند. باقی کاتەکەمان کەوتینە پلان دانان، بەبێ ئەوەی بزانین کەی دەیخەینە کارەوە.

مەهتاب کاتێکی خۆشی دەبردەسەر لەگەڵ مریەم و عەلی، نەیدەویست لەگەڵم بێتەوە بۆ ماڵەوە، بەڵام منداڵەکانی ئلین، بە قەرزدانی چەند کتێب بە مەهتاب، نەرمیانکرد. هەروەها ئلین ئینجیلی ڕاسپێری نوێی هەبوو، کە پێیوتم، بۆ ماوەیەك دەتوانم لێی قەرزبکەم.

مودی هەر ساتەی جۆرێك بوو، هەندێك جار ماسولکەکانی خۆیی پیشاندەدام، هەندێك جاری تریش هەوڵیدەدا سۆزی من بەدەستبهێنێت.

"بـــا سبەینێ لە دەرەوە نان بخۆین،" بۆ ڕۆژی سیانزەی شبات پێشنیاریکرد. "سبەینێ ڕۆژی خۆشەویستییە."

"چاکە،" وتم، "بە دڵنیاییەوە."

بڕیاریـدا بمانبات بۆ ڕێستورانی هوتێلی خەیام، کە گوایە ستافەکەیان بە ئینگلیزی قسەدەکات. من و مەهتاب پێمانخۆشبوو. چەند کاژێری دوانیوەڕۆی ڕۆژی خۆشەویستیمان بە خۆئامادەکردنەوە خەریکبووین. قاتێکی دوو پارچەیی سووری خوریم لەبەرکرد، کە بۆ ڕۆژێکی وەها دەستیدەدا، بەڵام لە ئێراندا بەزمی بەدواوە بوو. بێگومان ئەمانە دەبوو بە ڕووسەری و مانتۆ بشارمەوە، بەڵام بە هیوابووم، ڕێستورانەکە ئەوەندە ئەمریکاییکرابێتەوە، کە بتوانم بە قاتەکەی خۆمەوە دانیشم. بە جوانی قژم چاککرد و

کۆنتاکتم[2] کردە چاوم لەجیاتی چاویلکە. مەهتاب کراسێکی درێژ، تەختەکەی سپی و خونچەی سووری تیایدا بوو، لەبەرکرد لەگەڵ جوتی پێڵاوی چەرمی سپی.

هەر سێکمان بەرەو شەقامی شەریعەتی چووین و سواری یەکەمین تەکسی پرتەقاڵی بووین لە کۆی چوار تەکسی، کە بە هەموویان ئینجا دەگەیشتینە شوێنی مەبەست. هوتێلەکە دەکەوتە سەر شەقامێکی گشتی، کە هەندێك خەڵك هێشتا بە *ئەوینی پەهلەوی*، بەناوی شاوە، ناویانــدەبرد.

کاتێك لە دواتەکسی هاتینەخوارەوە، مودی ڕاوەستا تا پارە بدات بە شۆفێرەکە. لە هەردوو لاوە ئوتومبیل فڕکەفڕکی بوو. من و مەهتاب ویستمان بچینە سەر شۆستەکە، بەڵام جۆگەلەیەکی زۆر پانی پڕ ئاو و پیسی لەنێوان شەقام و شۆستەکەدا بوو، کە نەمانــدەتوانی بازی بەسەردا بدەین. لەبەرئەوە دەستی مەهتابم گرت و چووین بۆ نزیکترین شوێنی پەڕینەوە بەسەر جۆگەلەکەدا.

هەرکە پێم نایە سەر شوێنی پەڕینەوەکە، بینیم جرجێکی گەورە، بە ئەندازەی پشیلەیەك، خەریکە هەڵدەگەڕێت بە پێڵاوە سپییە چەرمییەکەی مەهتابدا.

بە پەلە دەستێکم برد و پاڵێکم نا بە مەهتابەوە بۆ سەر شەقامەکە. جرجەکە ڕایکرد.

لە پشتمەوە مودی هاواریکرد، "ئەوە بۆ وا دەکەیت؟"

"نامەوێت مەهتاب ببێت بەژێر ئوتومبیلەوە،" درۆم لەگەڵدا کرد، نەمویست بە باسکردنی ئەو جرجە، مەهتاب بترسێنم.

بەسەر گردێکدا سەرکەوتین بەرەو ئوتێلی خەیام. لە ڕێگادا بەچرپە مودیم لە ڕاستی ئاگادارکردەوە، بەڵام لەوە دەچوو بۆی گرنگ نەبێت. مشك لە ژیانی ڕۆژانەی تاراندا ئاساییە.

خۆمم ئارامکردەوە و هەوڵمدا، خۆشی لەو ئێوارێیە ببینم. بە پێچەوانەی ڕێکلامەکانیانەوە، هیچ یەك لە ستاف ئوتێلەکە بە ئنگلیزی نەدەدووا، هەروەها دەبوو بە مانتۆ و ڕووسەرییەکەمەوە دانیشم، بەڵام ڤیروسیام لە غەزەبی خوا کرد، بەئەسپایی قۆپچەی مانتۆکەمم کردەوە و خۆشیم لەو نانخواردنە کەموێنەیەی ڕۆبیان و بەتاتەی سوورکراوە بینی.

مودی دڵفراوان بوو، پێیداگرت لەسەرئەوەی پاش نانخواردن قاوە بخۆینەوە، هەرچەند کوپی نزیکەی چوار دۆلاری دەکرد. لە کوپی بچوکی ئسپریسۆدا هێنایان بۆمان و تامی قاوەی خەستی خێرای دەدا. زۆر خۆش نەبوو، بەڵام مودی پێی وانەبوو. هەوڵیدەدا، دڵشادمــبکات. منیش لەلایەن خۆمەوە، هەوڵمــدەدا، بیهێنمە سەر ئەو باوەڕەی، کە خۆشی لێدەبینم.

بەڵام من زیاتر لە هەموو شتێکی تر نیگەران بووم، چونکو دەمزانی، مودی ئەوەی لە باردا بوو، لە پڕێکدا لە هاوسەرێکی بەڕێزی یارمەتیدەرەوە ببێت بە دڕندەیەك. لە کەفوکوڵی خۆشەویستییەکەی دەسڵەمیمەوە.

خەیاڵێك لە مێشکمدا بوو، بەرۆکی بەرنەدەدام. ئایا دەبوو من و مەهتاب لەگەڵ تریش و سۆزانە بڕۆشتینایە؟ نەمدەزانی، نەمدەتوانی بزانم، چی ڕوودەدا. هەموو ئەگەرەکانم لێکدەدایەوە و دەمبینی دروست بڕیارمداوە. ئەو دوو کەسە کارنەکردەیە زیاتر سیمای پلانێکیان لە خەیاڵدابوو، وردەکارییەکان هێشتا ناڕۆشن بوون. ئەگەر هەر خۆم بوومایە، دەکرا لەگەڵیاندا بڕۆشتمایە، بەڵام ئایا ئەو مافەم هەبوو مەهتاب توشی هەوڵێکی وا سامناك بکەم.

هەرجارێك مودی شێتدەبوو لێم، نیگەرانی سەرتاپای دادەگرتم. چونکو لەو باوەڕەدا بووم، مەهتاب دەخەمە سامناکترین هەلومەرجەوە، بەوەی لەگەڵ باوکیدا بژی.

دەنگی تەقینەوەیەکی ترسناك، لە خەوی ناخۆش ڕایچڵەکاندم. لە پەنجەرەکەوە ئاسمانم دەبینی چۆن ڕۆشندەبێتەوە، وەك ئەوەی بەسەر ئاگرەوە بێت. یەك ڕیز تەقینەوەی بۆم لە دەروپشتمان دەبیسترا.

خانووەکە دەلەرییەوە.

"بۆمبارانە!" هاوارمکرد. "بۆمبارانمان دەکەن!"

گوێمان لە دەنگی فڕۆکە بوو بەسەرمانەوە. بروسکەی ڕووناکی زەرد و سپی پرتەپرتیبوو بە ئاسمانەوە و دەنگی تەقینەوە و وێرانکردن بەدوایدا دەهات.

مەهتاب لە ترساندا قیژەی لێبەرزبۆوە. مودی باوەشی پیاکرد و لەسەر جێگاکە خستییە نێوانمانەوە. باوەشمانکرد بە یەکتریدا، بێدەسەڵاتانە چاوەڕوانی چارەنووسی خۆمان بووین.

مودی زەندەقچووانە بەدەنگی بەرز کەوتە ویردوتن، دەنگێکی ترسناك بوو. باوەشەکەی بە مەبەستی پاراستنمان، زیاتر ترساندمی، چونکو هەموو گیانی دەلەرزی. من و مەهتاب بە ئینگلیزی کەوتینە ویردخوێندن، دڵنیابووین، کە ئەمە دوا ساتەکانی ژیانمانە. هەرگیز لە ژیانمدا ئەوەندە نەترسابووم. دەنگی دڵم دەهات و تەقینەوەی گەورەی وێرانکارانە ئازاری گوێچکەی دەدام.

فڕۆکە بە کۆمەڵ دەهاتن و دەڕۆیشتن، هەڵیکیان پێدابن هەناسەیەك بدەین، پێش ئەوەی جارێکی تر بگەڕێنەوە سەرمان، لورەی فڕۆکەکان بەسەرمانەوە قین و تووڕەییان دەڕژاند بەسەر ئەو خەڵکەی ژێرەوە. بروسکەی زەرد و سپی تۆپە فڕۆکەشکێنەکان بۆ ئاسمان بەرزدەبۆوە. هەرجارێك لورەی فڕۆکەکان دەهات، بێدەسەڵاتانە ئازارمان دەکێشا و چاوەڕوانی بروسکە و پاشان ناڵەی تۆقێنەری بۆمبارانمان دەکرد. هەندێك جار بروسکەکان کزتر و گرمەکان دوورتر دەبوون. هەندێك جاری تر بروسکەکان ژوورەکەیان ڕۆشندەکردە،

گرمەکان ماڵەکەیان لەبنەوە دەهێنایە لەرزە، پەنجەرەکان زرەیان لێهەڵدەستا و زریکەی خەڵك دەبیسترا. لە گرمەی بۆمباران، بروسکەی تۆپی فڕۆکەشکێن و دەنگی نزمتری سوتاندنی خانووبەرە، دەمبینی مودی وەك من دەترسێت.

باوەشی بە ئێمەدا قایمتر بوو، ڕق و کینەم دەگەیشتە ئەوەی مودی بکوژم. لەبەر نامەکەی دایکم و خەوەکەیم بیرکەوتەوە، کە مەهتاب لە بومبارانێکدا قاچێکی پەڕیوە.

بۆمبارانێکی تریش تەواوبوو. چاوەڕوانبووین، هەناسەمان لەخۆمان بڕی. چەند خولەك ڕۆیشت و وەردەوردە باوەش بە یەکتریدا خاوبۆوە، بەو هیوایەی ئەم جارەش ڕزگارمان ببێت. چەند خولەکی تر ڕۆیشت، پێش ئەوەی ڕێگا بەخۆمان بدەین ئاهێکمان تێکەڕێت. بەپێی کاژێر هەموو هێرشە ئاسمانییەکە نزیکەی پانزە خولەکی خایەند، بەڵام بۆ ئێمە وەك چەند کاژێر وابوو.

ترس ڕێگای کردەوە بۆ زوخاو ڕشتن. "بینیت چیمان بەسەر دەهێنیت؟" بە مودیدا تەقیمەوە. "ئەمە ئەو شتەیە، کە تۆ بۆ ئێمەت دەوێت؟"

مودی کەوتە دژەهێرش. "نـــــەء،" هاواریکرد. "من ئەمەم بۆ تۆ ناوێت. وڵاتەکەت ئەم کەتنە بە خەڵکەکەی من دەکات. وڵاتەکەی خۆت دەتکوژێت."

پێش ئەوەی ئەم شەڕەدەنوکە هەنگاوێکی تر بنێت، مامل سەروکەلەی لەناو دەرگای نوستنەکەمانەوە دەرکەوت و وتی، "نیگەران مەبە *دایی* جون، تەنیا تەقەی تۆپی فڕۆکەشکێنەکان بوو."

"گوێمان لە دەنگی فڕۆکە بوو،" وتم.

"نەء." بێگومان مامل دەیویست، بمهێنێتە سەر ئەو باوەڕەی، کە ئەمە ڕاهێنانێکی تر بووە، وەك ڕاهێنانەکەی هەفتەی جەنگ. لە داڵانەکەدا تەلەفون دەستی بە لێدانکرد، مامل چوو وەڵامبداتەوە، ئێمەش هەستاین و دوایکەوتین. ئەو شەوە تا بەیانی خەومان لێزڕا. کارەبا نەما. لەڕاستیدا تەواوی شار نوقمی تاریکاییەکی ترسناك بووبوو، تەنیا ڕۆشناییەك کە هەبوو، ئەو ئاگرە تۆقێنەرانە بوو کە لە ئاکامی هێرشە ئاسمانییەکە کەوتبۆوە.

تەلەفونکەر، عەمە بزورگ بوو، مامل و مودی هەردووکیان دڵنیایانکرد، کە هەموو سەلامەتن.

نەسرین مۆمی داگیرساند، چای لێنا و هەوڵیدا ناراممانبکاتەوە. " ترسی ناوێت، هیچ شتێك نییە،" بە متمانەیەکی زۆرەوە وتی. "ئێمە بەرناکەوین." باوەڕی بە ئەڵا قایم بوو، هەروەها لەو باوەڕەدا بوو، ئەگەر خوا ڕەزای لەسەر بێت، بە تۆپێکی هێزی ئاسمانی عێراق پارچەپارچە ببێت، ئەوا چ مردنێك لەوە شکۆدارترە، کە لە جەنگێکی وا پیرۆزدا شەهید ببیت.

"نـــا، هیچ بۆمبارانێك نەبووە،" مامل دڵنیابوو.

"ئەی ئەو تەقینەوانە بۆ ئەوەندە گەورە بوون؟" پرسیارمکرد. "هەموو شتێکی هێنابووە لەرزە."

مامل شانی هەڵتەکاند.

بۆ بەیانییەکەی شار وروژا، ئەو خەڵکە کەوتنە ژماردنی زەرەروزیانی خۆیان، دەگریان و داوای تۆڵەسەندنەوەیان دەکرد. بێگومان هێرشەکان کاری هێزی ئاسمانی عێراق بوو، بەڵام پروپاگەندەی ڕادیۆکان بە شێوەیەکی تر بوون. عێراق لەلایەن ئەمریکاوە پشتیوانی لێدەکرێت. فڕۆکەوانەکان لەلایەن ئەمریکاوە ڕاهێنانیان پێکراوە. هێرشەکە لەلایەن ئەمریکاوە پلانی بۆ دانراوە و هەر لەلایەن ئەوانیشەوە ڕابەریکراوە. بیروباوەڕی گشتی ئەوە بوو، کە سەرکۆمار ڕێگان خۆی لە یەکەم فڕۆکەی هێرشەکەدا بووە. ڕۆژێکی ئالەبار بوو، ئەمریکی بێت و ڕێت کەوتبێتە ئێرانەوە.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەو هەلومەرجە، مودی کەوتە پارێزگاری کردنمان. ئەو ڕۆژە من و مەهتاب نەچووین بۆ قوتابخانە. لە ڕاستیدا لەنزیکی قوتابخانەکە وێرانکارییەکی گەورە ڕوویدابوو. کەسانێکی زۆر گیانیان لەدەستدابوو.

ئەو ڕۆژە درەنگانێک، ئلین و هورموز بە ئوتومبیل ئێمەیان برد بۆ تەماشای شوێنە بۆمباران کراوەکان. ئاوچەیەکی تەواوی گرتبۆوە، سوتاندن ئێجگاری وێرانیکردبوو. هێشتا لە هەندێك شوێنیەوە دووکەڵ بەرزدەبۆوە.

هەموو لەگەڵ ئەوەدا بووین، کە جەنگ ترسناکە. بەڵام بۆچوونی جیاوازمان هەبوو لەسەر هۆکارەکانی. من وەك ئاکامێکی ئاسایی ژێر سایەی حکومەتی شێتگیری توندڕەوە دەمبینییەوە. مودی و هورموز لەسەر ئەم فرکردنە کەوتنە جنێودان بە ئەمریکا. ئلینیش لەگەڵیاندا چووە ڕیزەوە.

مودی هورموزی کێشکرد بۆ باسێك، کە خوازراوی خۆی بوو - دووڕوویی حکومەتی ئەمریکا. بۆئەوەی ئەمریکا تەرازوی هێزەکان لە کەنداوی فارسدا ڕابگرێت، بەپێی قسەی مودی، دەبێت یارمەتی هەردوو لایەنی عێراق و ئێران بدات لە جەنگەکەدا. لەو باوەڕەدا بوو، کە یو.ئێس. نەك تەنیا یارمەتی فڕۆکە بومهاوێژەکانی عێراق دەدات، بەڵکو یارمەتی تۆپە فڕۆکەشکێنەکانی هێزی بەرگری ئێرانیش. بەڵام بەهۆی ئابلۆقەیەکی لەمێژینەی چەکداری ئێرانەوە، ئەمریکا تەنیا دەتوانێت بە نهێنی یارمەتی ئێران بدات. "ئێران دەبێت تەواوی سامانی خۆی لە شەڕدا خەرجبکات،" ڕەخنەی مودی بوو. "بەهۆی ئابلۆقەوە، دەبێت لە ڕێگای وڵاتانی جیهانی سێیەمەوە، بە پارەیەکی زۆر زیاتر، چەك بکڕین."

هەموو ئاواتەخوازبووین، کە ئەمە دوا بومباران بێت. ڕادیۆ مودی دڵنیاکرد لەمە، هەروەها ڕایگەیاند، کە بێگومان سوپای لە شکستنەهاتووی شیعە، تۆڵە لە ئەڵقەلەگوێکانی ئەمریکا دەکاتەوە.

وەك قسەڵۆكی ناو خەڵك، هەموو كەس لە تاراندا دەیزانی، كە بە دەیان - هەتا سەدان - كەس لەم بۆمبارانەدا كوژراون. بەڵام بەپێی هەواڵی ڕەسمی حكومەت، تەواوی كوژراوەكان شەش كەس بوون، هەروەها گاڵتەجارانە بڵاویانكردەوە، هێرشی ئاسمانی عێراق پیشاندەری ئەوەیە، كە ئەڵا پشتیوانی كۆماری ئیسلامی ئێرانە. چونكو یەكێك لە بۆمەكانی عێراق، كە بەبێ هیچ گومانێك لەلایەن ئەڵاوە ڕێنوێنیكراوە، خانوویەكی چەك و تەقەمەنی *مونافقینی*، بزوتنەوەی بەرەنگاری پرۆ - شا[3] و ئەنتی - خومەینی[4]، وێرانكردووە. پشكێنەران لەناو خانووە وێرانەكەدا نەك هەر چەك و تەقەمەنییەكی زۆریان دۆزیوەتەوە، بەڵكو دەزگای دروستكردنی خواردنەوەی قاچاغیش.

ئەمە شتێكی بەڵگە نەویستە و بەهیچ شێوەیەك گومانی تیادا نییە، حكومەت ڕایدەگەیاند، كە ئێران جەنگەكە هەر دەباتەوە و هاوكات هیوای *مونافقینی* شەیتانیش دەكوژێنێتەوە.

لەوەدەچوو شار لە جەنگدا بێت. بنكەی كارەباكان وێرانكرابوون، خەڵك ئاگادارکرابۆوە، كە چەند دەتوانن لە بەكارهێنانی كارەبا كەمبكەنەوە. ئەو شەوە - و باقی شەوەكانی تر تا ئاگاداركردنەوەیەكی تر - ترووسكاییبیان لەناو شاردا نەهێشت، هەم بۆ كەمكردنەوەی خەرجی وزەی كارەبا و هەم وەك هەوڵێك بۆ پارێزگاریكردن لە هێرشی ئاسمانی. ڕووناكی لەسەر شەقامەكان نەما. لەناو ماڵدا بۆمان هەبوو تەنیا گڵۆپی كز داگیرسێنین، ئەویش پاش ئەوەی پەردەی پەنجەرەكانمان دادەدایەوە بۆ ڕێگرتن لە چوونە دەرەوەی ڕووناكی. مودی هەمیشە لایتێكی باریكی بچوكی پێبوو.

ڕۆژانی قسەوباس و پرسیار، شەوانی ترس و نیگەرانی بەدوادا دەهات. بۆ چەند هەفتە هێرشی ئاسمانی بەردەوامبوو، سەرەتا بە چەند شەو جارێك، پاشان بوو بە هەموو شەوێك. هەموو ئێوارێیەك، كە تاریك دادەهات، مەهتاب هاواری ئازاری سكی دەكرد. كاتێكی زۆرمان پێكەوە لە توالێتەكە دەبردەسەر، دەگریاین، دەپاڕاینەوە و لە ترساندا هەڵدەلەرزین. بۆ نوستن، جێگاكەمان جێهێشت و چووین بۆ ژێر مێزە قایمەكەی نانخواردن و دەورەكەیمان بە بەتانی گرت، تا بمانپارێزێت لە هاتنی وردەشوشە لەكاتی بۆمبارانەدا. هەموومان بەدەست بێخەوییەوە دەمانناڵاند. جێگای مشتومڕ نەبوو، هێرشی ئاسمانی ترسناكترین شت بوو، كە دەمانتوانی بیهێنینە پێشچاوی خۆمان.

بۆ ڕۆژی دوایی، پاش قوتابخانە، لە شەقامی شەریعەتی لە تەكسی پرتەقاڵی هاتینە خوارەوە. لەگەڵ مەهتاب چووین بۆ كاری ڕۆژانەی بازاڕ بۆ نانكڕین. ئەو ڕۆژە *باربارى*مان دەویست، كە نانێكی هەڵهاتووی خڕی هێلكەیی نزیك دوو پێ درێژە. كاتێك بە تازەی و گەرمی دەخورێت تەواو بەلەزەتە، زۆر خۆشترێكە لە *لەواش*.

لەسەرەی *نانی*دا، نانەوەخانەدا، ڕاوەستاین بۆ زیاتر لە نیو كاژێر، كە ئاسایی سەرنجمان بۆ *لای* پرۆسەی نانكردنەكە دەچوو. كۆمەڵێك كرێكار بەخێرایی كاریاندەكرد،

گونکیانەگرت و پانیانەکردەوە و بۆ ماوەیەک دایاندەنا بۆ هەڵهاتن. کە ئامادەدەبوو، تەواو درێژیانەکردەوە و پەنجەکێشیان دەکرد، پاشان دەخرایە سەر تەختەیەک بەدەسکێکی درێژەوە و دەخرایە ناو فڕنێکی بازنەی داخبوو، کە تیرەکەی نزیکەی هەشت پێ بوو، وە لەوسەرەوە نانێکی برژاو دەهێنرایە دەرەوە.

کاتێک چاوەڕوانبووین هەویر تەواوبوو، کرێکاری یەکەم لە دەستەکە، ئەو شتانەی پێویستبوو بۆ هەویر دروستکردنی تازە، لە تەشتێکی گەورەدا تێکەڵیکرد. سۆندەیەکی ئاوی خستەسەر و بەلوعەکەی بەردەیەوە. دەیزانی چەند خولەکێک دەبات، کەڵکی لەو هەلە وەرگرت و چوو بۆ توالێت، کە ژوورێکی بچوکی چوارگۆشە بوو لەناو نانەواخانەکەدا. کە دەرگاکەی کردەوە، بۆگەن کاسیکردین، هەروەها لە هاتنەدەرەوەدا پاش یەک دوو خولەک.

ئایا دەستی دەشوا، پێش ئەوەی دەستبکاتەوە بە کار؟ بۆم پرسیاربوو. هیچ دەسشۆرێکم لێوە دیارنەبوو. ڕقم داهات، کە بینیم، گەڕایەوە سەر تەشتی هەویرگرتنەوەکە و بە هەمان ئاو دەستی شت.

فریانەکەوتم زۆر بیریلێبکەمەوە، لەپڕ گوێم لە شاوری وریاکردنەوەی هێرشی ئاسمانی بوو. لە چەند چرکەدا وژەی فڕۆکە گەیشتە سەرمان.

یەکسەر خەیاڵم بۆ ئەوە چوو، چۆن ژیرانە لەگەڵ ئەم ترسە بجوڵێمەوە. ئایا لێرە خۆمان پەنابدەین یان ڕاکەین بەرەوماڵەوە؟ بۆم گرنگ بوو کە بە مودی پیشانبدەم، چۆن دەتوانین ئاگاداری خۆمان بین، لەپێناوی ئەوەی ڕێگەمانبدات خۆمان تەنیا بچینە دەرەوە.

"ڕاکـــــە! مەهتاب" هاوارمکرد. "دەبێـــت خۆمان بگەیەنینە ماڵەوە."

"مـــامی، دەترســـــم!" مەهتاب قیژاندی.

منداڵەکەمم لە باوەشگرت. هات بە خەیاڵمدا، لە شەقامی شەریعەتی دوورکەومەوە و خۆم بکەم بە کۆڵانێکدا. یەکسەر چوومە کۆڵانێکەوە کە بەرەوە ماڵەوە دەچوو، چەند هێزم بە قاچم دەدا، باشتر دەجولا. گۆیمان لە هاژەی فڕۆکە بوو، شریقەی تۆپی فڕۆکەشکێن دەهات، گرمەی تەقینەوەی بۆمباران بەرزدەبۆوە و هاتوهاوار و زریکەی مەرگ دەهاتەگوێ.

وردە ئاسنی تۆپی فڕۆکەشکێن لە دەوری ئێمە، بەناو کۆڵانەکەدا بلاوبۆوە، پارچەی گەورەی کوشندەی تیادا بوو، لەگەڵ ئەوەش هێشتا ئێمە ڕامانەکرد.

مەهتاب توند سەری بە سنگمەوە نابوو، پەنجەکانی لە لەشم گیرکردبوو. "مـــامی، دەترسم! دەترســــم!" بەگریانەوە هاواریدەکرد.

"هیچ نییە، مەترسە،" قیژەم تێکەڵی شاوری وریاکەرەوە بوو. "ویرد بخوێنە، مەهتاب ویرد بخوێنە!"

لەکۆتاییدا گەیشتینە سەر کۆڵانەکەی خۆمان و هەر بەردەوامبووین لەسەر ڕاکردن. مودی تەماشای دەرەوەی دەکرد، بە نیگەرانییەوە چاوەڕوانی ئێمە بوو. کە نزیکبووینەوە،

دەرگای حەوشێی بۆ کردینەوە و ڕایکێشاینە ژوورەوە. لە دالآنی چوونەژوورەوەکەدا، هەموو پێکەوە دانیشتین و پاڵماندا بە دیوارە کۆنکرێتییەکەوە، تا هێرشە ئاسمانییەکە تەواوبوو.

ڕۆژێکیان مەهتاب و ئەمیرم بە عەرەبانەکەی برد بۆ پارك. ڕێگای شوێنی یاریکردنی منداڵان بە بەر مەیدانی ڤالیبۆڵدا دەڕۆیشت، کە یارییەکی گەرمی تیادا دەکرا. نزیکەی بیست لاوێك کۆبووبوونەوە، لەو هەتاوی دەمەو بەهارە ساردەدا یاریانئەکرد.

مەهتاب ماوەیەك بەسەر جۆلانەکەوە بوو، کە گوێم لە دەنگەدەنگێکی زۆر بوو، لە مەیدانی ڤالیبۆڵەکەوە دەهات. بینیم چوار پێنج پیکاپی نیسانی سپی، بەردەمی چوونە ژوورەوەی مەیدانەکەیان گرتووە. *پاسدار!* لەدڵی خۆمدا وتم، دەشێ هاتبن بۆ پشکنینی لاوانی مەیدانەکە.

لە جلوبەرگەکەی خۆم وردبوومەوە. تەواوی قۆپچەکانی *مانتۆ*کەم داخرابوون، *ڕووسەری*یەکەم دروست لەجێگای خۆیدا بوو. بەڵام نەمدەویست توشم ببێت بەتوشی *پاسدار*ەوە، لەبەرئەوە بڕیارمدا، خێرا بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە. مەهتابم بانگکرد.

ئەمیرم بە عەرەبانەکەوە دایە پێش خۆم و مەهتاب لە تەنیشتمەوە دەڕۆیشت. کە نزیکی مەیدانەکە بوومەوە، تێگەیشتم کە پاسدارەکان بەمەبەستی گرتنی لاوەکان هاتوون. بە زەبری لولەی تفەنگ کێشیانکردن بۆ ناو پیکاپەکان. لاوەکان بێدەنگ ملکەچیان بوون. چاودێریمکردن تا هەموویان سواری پیکاپەکان کران و بران.

چی بەسەر ئەو لاوانە دەهێنن؟ جێگای تێڕمانم بوو. نیگەران و تۆقیوو، خۆم گەیاندە ماڵەوە.

ئیسا دەرگای حەوشێی بۆ کردمەوە و چوومە ژوورەوە. بە ئیسا و ڕەزام وت، چیم دیوە و ڕەزا ڕوونکردنەوەیەکی دا. "لەوانەیە لەبەرئەوە بووبێت، کە بە کۆمەڵ بوون،" ڕەزا وتی. " کۆمەڵکردنی بێ مۆڵەت، پێشێلکردنی یاسایە."

"چی بەسەر ئەو لاوانە دەهێنن؟" پرسیارمکرد.

شانی هەڵتەکاند و بەبێ ئەوەی هیچ نیگەرانییەك لە دەنگیدا هەبێت، وتی، "نازانـــم."

مودیش ڕووداوەکەی زۆر ئاسایی وەرگرت و وتی، "دەبێت هەڵەیەکیان کردبێت، بۆیە پاسدار داوێتی بەسەریاندا."

کاتێك بۆ ڕۆژی دوایی، ڕووداوەکەم لە قوتابخانە باسکرد، خانم ئازەر کاردانەوەی جیاواز بوو. "کە کۆمەڵێك لاو دەبینن پێکەوە، دەیانگرن و دەیانبەن بۆ بەرەکانی جەنگ،" بە غەمناکییەوە وتی. "لە قوتابخانەکانیشدا ئەم کارە دەکەن. هەندێك جار لۆری دەبەن بۆ قوتابخانەکانی کوڕان و بە کۆمەڵ قوتابی دەگرن و دەیانکەن بە سەرباز و ئیدی خێزانەکانیان هەرگیز چاویان پێیان ناکەوێتەوە."

چەند ڕقم لە جەنگ دەبۆوە! هەستی ئینسانی نەهێشتبوو. تێنەدەگەیشتم لەوەی، کە چۆن وڵاتێك دەبێت پڕببێت لە خەڵكانێك، ئەوەندە تینوی كوشتنبن، ئەوەندە ئامادەی مردنبن. ئەمە یەكێك بوو لە گەورەترین و - بۆ ئەمریكاییەكان - ناڕۆشنترین جیاوازی كەلتوری، لە نێوان ئەمریكاییە خۆشگوزەرانەكان و خەڵكە بێبەشەكانی ئەم جۆرە كۆمەڵگایانە. ژیان بۆ مامل و نەسرین - هەتا بە ژیانی خۆشیانەوە - نرخێكی وەهای نەبوو. مردن زیاتر ئاسایی بوو بۆیان و یاردەیەكی زۆر سەیر نەبوو. ئینسان دەتوانێت چی بكات، جگە لەوەی پشت بە ئەڵا ببەستێت؟ وە ئەگەر خراپتر ڕوودەدا، ئەوا شتێكە هاتووە و ناگەڕایتەوە و هیچی لەگەڵ ناكرێت. ئەو چاونەترسییەی كە لەبەرامبەر بۆمبارانەكاندا هەبوو، خۆبادان نەبوو. زیاتر كاردنەوەی فەلسەفەیەك بوو، كە خودكوژی تروریستی بەرهەمدەهێنا.

ئەم بیروبۆچوونە بە باشترین شێوە خۆی پیشاندا، كاتێك پاشنیوەڕۆی ڕۆژی هەینییەك، سەردانی ماڵی عەمە بزورگمان كرد، وەك ئاسایی بۆ ئاهەنگ گێرانی سبت و خواپەرستی بێكۆتایی. لە ڕێگەی تەلەفیزیونەوە وتاری نوێژی هەینی لە ناوەڕاستی شارەوە، پەخشدەكرایەوە، بەڵام سەرنجم پێنەدا، تا مودی و مامل كردیان بە هەرا و عەمە بزورگ لە پەرێشانیدا كەوتە نوكەنوكی گریان.

"نوێژی هەینی بۆردومان دەكرێت!" مودی وتی.

پەخشی زیندووی كۆمەڵانێكی نوێژكەری زۆری پیشاندەدا، كە لە مەیدانی گشتیدا تێكترنجابوونە ناو یەكترەوە و لە ترساندا لە هەوڵی هەڵهاتندا بوون. كامێرا ڕووی لە ئاسمان كرد و لە ڕاستیدا فڕۆكەكانی عێراقی پیشاندا. بۆردومانەكە دابووی لە ناوەڕاستی خەڵكەكە و كوشت و برینداێكی زۆری لێكەوتبۆوە.

"بابەحاجی لەوێیە،" مودی بیریخستمەوە. هەمیشە دەچوو بۆ نوێژی هەینی.

پشێوی كەوتبووە ناو شارەوە. ڕاپۆرتەكان لەسەر ژمارەی قوربانییەكان جیاواز بوون، بەڵام ژمارەی هێرشەكان دیار بوو، لەهەر ڕوویەكەوە بە سەركەوتنی عێراق چاویلێدەكرا.

خێزانەكە بە پەرێشانییەوە، چاوەڕوانی هاتنەوەی بابەحاجیان دەكرد. كاتژمێری دوو تا دوو و نیو، كاتی هاتنەوەی بوو. هەرگیز لەوە درەنگتر لە نوێژی هەینی نەدەگەڕایەوە.

عەمە بزورگ نەیهێشت كاتی لەدەست بچێت، حاڵەتی پرسەگرتنی بەخۆیەوە گرت و كەوتە واوەیلا و قژڕنینەوە. عەبای ڕەنگاوڕەنگی داكەنی و كردی بە سپی، لە سەر فەرشەكە دانیشت و بەلاواندنەوە كەوتە خوێندنەوەی قورئان و شین و شەپۆڕ.

"شێت دەبێت،" مودی لەبارەی خوشكەكەیەوە وتی. "هەر چاوەڕوانیمان لەدەست دێت. دەبێت چاوەڕوانبین تا هەواڵی كوشتنمان پێدەگات."

كەسوكار بەنۆبە كەوتنە هاتوچۆ بۆ سەر شەقامەكانی دەورووپشت، بۆئەوەی بزانن، كەی باوەگەورە دەردەكەوێت. چەندەها كاژێری نیگەرانی ڕۆیشت، بێجگە لە گریانی عەمە

بزورگ، ورته له کەسەوه نەدەهات. لەوه دەچوو ئەم پلە تازەیە، وەك بێوەژنی پیاوێکی شەهید، جێگای شانازی بێت.

نزیکی کاتژمێری پێنج بوو، که فریشته به ڕاکردن به هەواڵی تازەوه هاته ماڵەوه. "هـــاتــەوه" هاواریکرد. "بەسەر شەقامەکەدا وا هات."

کەسوکاریش هەموو ڕایانکرد بۆ دەرەوه، بۆ بینینی هاتنەوەی باوەگەورەی خێزانەکە. بەبێ ئەوەی وشەیەك لەدەمی بێتەدەرەوه، به هێواشی هاته ژوورەوه، چاوانی له زەوییەکە بڕیبوو. کەسوکار خۆیان لادا، بۆ تێپەڕبوونی ئەم پیاوه پیرۆزه. خوێن - وردەپارچەی گۆشتی ئینسان - به هەموو جلوبەرگەکەیەوه بوو. بۆ هەموو جێگای سەرسامی بوو، که یەکسەر خۆی کرد به حەمامه شێوه ئەمریکاییەکەدا و دوشێکی کرد.

مودی دوایی قسەی لەگەڵ کرد، که بۆ منی گێڕایەوه، "زۆر بەداخه لەوەی نەکوژراوه. دەیەوێت وەك براکەی شەهید بێت."

مودی وەك خێزانەکەی، ئەو حەزه کوێرانەیەی نەبوو. تەواو تۆقیبوو. کاتێك تاران دەستوپەنجەی نەرمەکرد لەگەڵ ڕاستییەکانی جەنگدا، دەسەڵاتدارانی بەرگری مەدەنی چەند ڕێنوێنیان دەرکرد. لەکاتی هەر هێرشێکی ئاسمانیدا، هەموو دەبێت پەنابەرنه بەر شوێنێکی داخراو له نهۆمی زەویدا. لەبەرئەوه لەناو جێگای نووستنەکەمدا دەماینەوه و چاوەڕوانی شاوری تۆقێنەرانەمان دەکرد، که ئاگادارکرنەوه بوو بۆ چوونەخوارەوه بۆ ژێر پێپلیکانەکان.

لەوێ هەتا لەبەرچاوی ڕەزا و مامل، مودی نەیدەتوانی ترسی خۆی بشارێتەوه. لەترساندا دەگریا. ترس له پەلوپۆی خستبوو. بۆ شاردنەوەی ترسنۆکی خۆی کەوته جنێودان به ئەمریکا، بەڵام لەگەڵ بەردەوامی هێرشه ئاسمانییەکان، لەودەچوو کیسەی پڕ جنێوی بەرەو بەتاڵبوون دەچوو.

جاروبار چاومان بەر چاوی یەکتر دەکەوت، فیکەی یەکتریمان دەخوێندەوه. مودی لێی ڕۆشنبوو، بەرپرسی ئەو هەلومەرجەیه، که تێیکەوتبووین، بەڵام گیریکردبوو نەیدەزانی چی بکات.

تێبینییەکان:

1. سافاك: دەزگای موخابەراتی یان هەواڵگری ڕژێمی شا.
2. کۆنتاکت: contact: جۆرێکه له شوشەی زەڕەبینی، که دەکرێته سەر گلێنەی چاو له جیاتی چاویلکه.
3. پرۆ - شا، pro - shah: لایەنگری شا.
4. ئەنتی - خومەینی، anti - khomeini: دژی خومەینی.

# 11

لە ئێراندا ساڵی یەکجار، هەموو لە یەك کاتدا، دەچنە حەمام.

بە بۆنەی *نەورۆزەوە*، سەری ساڵی تازەی فارسییەوە، دوو هەفتە پێشووە، کە هەموو ژنان لەو ماوەیەدا، هەوڵدەدەن ماڵەکانیان تا ئاستێك پاکبکەنەوە. هەروەها بۆنەیەکی گەورەیە بۆ کۆگا پێڵاوفرۆشەکان، چونکو هەموو لەو پەیوەندەدا پێڵاوی تازە دەکڕن. هەندێك کار لەو دوو هەفتەیەدا پەیدادەبێت، لە کاتێکدا خێزانەکان لە ماڵەوە سەرگەرمی ئامادەکردنی چا و خواردن دەبن و پێشوازی لە کەسوکارەکانیان دەکەن. بەپێی گەورە و بچوکی پلەی کەسوکار، دەرگای ماڵەکانیان بۆ یەکتری دەکەنەوە بۆ ئاهەنگی ڕۆژانە.

ڕۆژی نەورۆز، یەکەم ڕۆژی بەهار، دەکەوێتە بیست و یەکی مارسەوە. ئەو ئێوارەیە ئێمە لەگەڵ ڕەزا و مامل و خێزانەکانیان بەدەوری *سوفرەی هەفت سین*دا، (سفرەی حەوت سین)، دانیشتین، کە ڕازابۆوە بەو خواردنە نمونەیانەی کە ناوەکانیان بە پیتی سین دەستپێدەکات. کۆمەڵێك هێلەکە لەسەر ئاوێنەیەك دادەنرێت و دەبێتە جێگای سەرنج. بەپێی ئەفسانەی فارسی، گۆی زەوی لەسەر شاخی گایەك وەستاوە و لەگەڵ هاتنی ساڵی تازە ئەم بارە لە شاخێکییەوە دەگوێزێتەوە بۆ شاخەکەی تری. ساڵی تازەی فارسی دروست ئەو ساتە دەستپێدەکات، کە هێلکەکانی سەر ئاوێنەکە دەجولێن، بەهۆی جێگۆرکێی گۆی زەوییەوە. لە ئەمریکا خەڵك چاوی لە سی و یەکی کانوونی یەکەمە، وەك سەری ساڵی تازە. ئێمە لە ئێران چاوەڕوانی گەیشتنی ڕۆژمان دەکرد، بگاتە بورجی کاوڕ (نیشانەی یەکەم لە بورجەکان) و جوڵاندنی هێلکەکان.

لەپڕ کارەبا کوژایەوە و شاوری هێرشی ئاسمانی فڕۆکە بەرزبۆوە. کەوتینە پێشبڕکێ بۆ خۆپەنادان لە ڕاڕەوی پشت دەرگای حەوشێ، بە ترسێکی زۆرەوە چاوەڕوانی کارەساتمان دەکرد. دڵنیابووم، لەو نەورۆزەدا هێلکەکانی سەر ئاوێنە جوڵاند.

چەند هێرشە ئاسمانییەکان ترسناك بوون، بەڵام ژیان لە جوڵە نەکەوت و هەڕەشەی هێزی ئاسمانی عێراق، نەیتوانی بەربگرێت بە ئێرانییەکان کە لە ئاهەنگی خۆیان بکەون. بەرنامەی ئاهەنگەکان چۆن دانرابوون، هەروا چوونەپێشەوە و ئێمەش کەوتینە گەڕانی خۆمان، بێگومان لە ماڵی باوەگەورە و دایەگەورەی خێڵەکەوە دەستمانپێکرد. ڕەزا، ئیسا، مریەم، مەهدی، مامل، نەسرین، ئەمیر، مودی، مەهتاب و من تێکترنجاینە ناو ئوتومبیلەکەی ماملەوە و تێمانتەقان بۆ ماڵی عەمە بزورگ بۆ ئەم بۆنە گەورەیە. من هیچ هەوەسێکی ئاهەنگم نەبوو.

هەر پێمان نایە ناو ماڵەکەوە، خوشکە لووت بازەکەی مودی، بە هەڵەداوان بەرەو ڕوومان هات. لە خۆشیاندا ڤیژەیکرد و باوەشی بە مودیدا کرد و تا توانی، تێر ماچیکرد. ئینجا هەڵگەڕایەوە بۆ مەهتاب، بەخۆشییەوە لە باوەشیگرت. دروست پێشنەوەی

فریابکەوێت ماچمبکات، لەخۆوە ڕووسەرییەکەم تۆزێك بەرزکرد، بۆئەوەی لێوی بەر ڕوومەتم نەکەوێت.

عەمە بزورگ دیاری ئامادەکردبوو بۆ ئاهەنگی سەری ساڵ. بۆ مودی مێزێکی جوانی نووسین و دۆلابی کتێب، کە جامی شوشەی هەبوو. بو مەهتاب کراسێکی خوری تەواو بەدەست دووراوی پێدا، کە لە مەکەوە هێنرابوو. عەمە بزورگ بە خۆشییەوە گەڕا و دیاری بەسەر هەمووانیدا دابەشکرد، تەنیا من نەبێت. مودی سەرنجی ئەوەی نەدا، کە نرخیان بۆ من دانەنا، منیش گوێمپێنەدا.

لە بەندیخانە کۆنەکەمدا، گۆشەگیرانە دوانیوەڕۆیەکی ناخۆشم بردەسەر. کەس زەحمەتی نەکێشا، یان نەیوێرا، بە ئنگلیزی قسەم لەگەڵ بکات. مەهتاب لێم دوورنەکەوتەوە، دەترسا بەتەنیا لای عەمە بزورگ بێت.

هەموو ڕۆژێك ئەم ئاهەنگە وڕسکەرانە درێژەیدەبوو. بەیانییەکیان خۆمان ئامادەکرد، سەردانی چەند ماڵ بکەین، کراسێکی خوری قاوەیی و چاکەتێکی درێژم لەبەرکرد، کە زیاتر لە پاڵتۆ دەچوو، هەروەها گۆرەوی ئەستورم لە پێکرد و ڕووسەریم دا بەسەردا. "ئەگەر ئاوا خۆم بگۆڕم، پێویست بە مانتۆ دەکات؟" لە مودیم پرسی.

"نا، بێگومان نا،" مودی وەڵامیدامەوە. "دەبێت زۆر لە نزیکەوە تەماشای کراسەکە بکەیت، ئینجا دەزانی مانتۆ نییە."

مەجید بە ئوتومبیل، ئێمەی گەیاندە چەند ماڵە خزم، کە هەر دەبوو سەردانمان بکردنایە. بەڵام مودی شوێنێکی تریشی بەدەستەوە بوو بۆ دوانیوەڕۆ، لەبەرئەوە هەر سێکمان تەکسییەکمان گرت و چووین بۆ ماڵی ئاغا و خانم حەکیم.

خەریکبوو تاریکدەبوو، کە هەستاین بگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە. دەبوو چەند کۆڵانمان بکردایە، ئینجا دەگەیشتینە سەر شەقامی سەرەکی و تەکسیمان بگرتایە. هاتوچۆی ئوتومبیل گیڤەی دەهات بەلاماندا، بەڵام هەواڵێك لە تەکسی نەبوو.

لەپڕ پیکاپێکی نیسانی سپی شریخەیکرد و لای شۆستەکە وەستا، پەیکانێکی سپیش بەدوایدا. چوار پیاوی ریشهاتوو، بە جلوبەرگی سەوزی زەیتونی یونیفۆرمی پاسدارەوە، لە نیسانەکە هاتنەخوارەوە. دانەیەکیان لە مودی چووەپێشەوە و باقییەکەیان بە تفەنگەوە لەبەرامبەریدا وەستان. هاوکات چوار ژنە پاسدارە بە یونیفۆرمی عەبای ڕەشەوە، لە پەیکانەکە هاتنە خوارەوە بۆ وێزەی من و بە دەموچاومدا تەقینەوە.

دەمزانی، ئەمە سوچی کراسە قاوەییەکەمە. دەبوو مانتۆم لەبەرکردایە.

پاسدارەکان مودیان کێشکرد بەرەو پیکاپەکەیان، بەڵام ئاسایی خۆی نەدەدا بەدەستەوە، لەبەرامبەریاندا بە فارسی کردییە دەنگەدەنگ.

بـیبەن، بـیبەن و لە بەندیخانە توندیبکەن! لەدڵی خۆمدا هاوارمدەکرد. لە بەندیخانە توندیبکەن!

مودی و پاسدارەکان بۆ چەند خولەك گفتوگۆیان بوو، لەکاتێکدا ژنە پاسدارەکان بە قاوقریشك خەریکی پڕکردنی گوێچکەی من بوون بە وشەی فارسی. پاشان چۆن بە خێرایی نیشتنەسەرمان، هەرئاوایی سواری ماشێنەکانیان بوون و لێیاندا ڕۆیشتن.

"چیت پێوتن؟" پرسیارمکرد.

"پێمـوتن، کە تۆ میوانی و ئاگاداری ڕێساکانی ئێرە نییت،" مودی وەڵامیـدامەوە.

"تۆ بە منت وت، دەتوانم ئەمانە لەبەرکەم،" پێموت.

مودی دانی بە هەڵەکەی خۆیدا نا: "نا، من نەمدەزانی وایە. بۆ لەمەودوا، دەبێت عەبا یان مانتۆت لەبەردابێت بۆ ڕێگاوبان." پاشان هەوڵیدا بێتەوە سەرخۆی. "ئێستا تۆ ڕێساکان دەزانیت،" لەپڕێکدا وتی، "باشترێکە جارێکی تر ڕاتنەگرن."

نزیکی کۆتایی هەفتە، نۆبەی خانەخوێیی نەسرین و مامل هات. من و نەسرین کەوتینە ماڵ پاککردنەوە، مودی و مامل بە ئۆتومبیل چوون بۆ بازاڕ و لەوسەرەوە بە بارێك میوەی تازە، شیرینی و چەرەسەوە هاتنەوە. بە گاڵۆن چامان لێنا. چاوەڕوانـبووین بە سەدان میوان ڕوومان تێبکەن.

هاتنی ئلین و هورموز ڕێکەوتبوو لەگەڵ بەرزبوونەوەی بانگی نوێژ لە بڵندگۆی مزگەوتەوە. هەموو ڕۆژێك، ڕۆژی پێنج جار، بانگی نوێژکردن سواری ملی ئەو خەڵکە دەبێت لە تاراندا. گرنگ نییە تۆ لە کوێیت، یان چی دەکەیت، هەرگیز ڕێگەتــپێنادەن، کاتی نوێژکردنت لەبیربچێتەوە. بەپێی سوننەت، لە ماوەی دوو کاژێردا، بۆت هەیە هەرکاتێك نوێژی خۆت بکەیت، بەڵام ئەڵڵا پاداشتێکی گەورەتر دەدا بەو کەسانەی، کە وەك کێبڕ ڕادەپەڕن بۆ نوێژکردن.

"پێویستم بە عەبایەکە،" ئلین بەجوتەپێ هەستایە سەرپێ. نوێژکەرەکانی تر، بە عەمە بزورگیشەوە، دوایکەوتن و کەوتنە خۆئامادەکردن و زۆری نەبرد، چرپەچرپی نوێژکردن بەرزبۆوە لەناو چوار دیواری ژوورەکەدا.

پاشان عەمە بزورگ کەوتە پیاهەڵدانی ئلین. "مــاشاڵا، ماشــاڵا،" بە مودی وت. "ماشاڵا لە گەورەیی خودا. چەند ڕێکوپێك نوێژەکانی دەکات. ئەڵڵا پاداشتی دەداتەوە."

لە گرمەی میوانداری دووردرێژەی ئەو ڕۆژەدا، مودی کەوتە قسەوباس لەگەڵ ئامۆزایەکی نەسرین، کە ئەویش دکتۆر بوو. "بۆچی کارێك ناکەیت؟" دکتۆر ماراشی لێیپرسی.

"باشە، بەڵام ئەو کاغەزەی پێویستە بۆ کار، هێشتا ئامادەنەبووە،" مودی وەڵامیدایەوە.

"با لەگەڵ خەستەخانە قسەبکەم. بەڕاستی پێویستمان بە یەکێکە لە خەستەخانە، کاری بەنجمان بۆ بکات."

"بەڕاستی دەتوانی شتێکم بۆ بکەیت؟" مودی بەخۆشییەوە دەنگی لێبەرزکردەوە.

"بەڕێوەبەری خەستەخانە هاوڕێمە،" دکتۆر ماراشی وەڵامیدایەوە. "با قسەی لەگەڵ بکەم، بزانم چی دەتوانم بکەم."
مودی گەشکە گرتبووی، دەیزانی، چەند گرنگە پایەیەکی هەبێت و لە ناو کاربەدەستاندا جێگا پەنجەی دیاربێت. کارەکە لەوەدەچوو هەلێکی ڕاستەقینە بێت. مودی تەمەڵ بوو، بەڵام کاردکەی کردبوو. هەروەها هەم پێویستی بە پارە بوو، هەم بەو پلە و پایەیە، کە دکتۆر لە ئێراندا هەیبوو.
کە لەم هەواڵەم کۆڵیەوە، زانیم ئەگەری ئەوەی تیادا هەیە، بۆ من باش بێت. تۆزێك نازانیم هەبوو، بەڵام شتێکی وەها نەبوو. وردەوردە مودی تێگەیشت، کە ئەرکێکی سەختە هەموو ساتێك چاوێکی بەسەر منەوە بێت. دەبوو وردەوردە مەیدانم پێبدات، بۆئەوەی گرفتی ژیانی ڕۆژانەی خۆی ئاسانبکات.
دەست بەکاربوونی مودی، بێگومـــان دەست و قاچی منی زیاتر دەکردەوە. هەروەها لەوانەش بوو، شانازییە سیسەوە بووەکەی بگەشێنێتەوە.

ئەورۆز چووە هەفتەی دووەمییەوە، کە وەك "پشوو"یەك ناویانئەبرد. وە لەم پەیوەندەدا بڕیاریاندا، ئەم پشووە لەسەر قەراغی دەریای خەزەر بەرینەسەر، کە دەکەوێتە باکووری تارانەوە و بەشێك لە سنووری نێوان ئێران - ڕوسیا دروستدەکات. براکەی ئیسا لە وەزارەتی بەرنامەڕێژی ئیسلامی ئێران کاریدەکرد، ئەو وەزارەتەی کە دەستیگرتبوو بەسەر تەواوی سامانی شادا. باسی دەوڵەمەندی شای دەکرد و بەڵێنیدا، کە بۆ ئەم پشووە یەکێك لە کۆشکەکانی شامان پێبدات.
ئەگەر تازە هاتبوومایە ئێرانەوە، لەوانەبوو ئەمەم بە شتێك بزانیایە، بە پەلە بچوومایە بۆ بینینی. کـــۆشـــکی شـــا! بەڵام زۆر لەوە بەئاگاتر بووم، کە باوەڕبکەم شتێکی خۆش ببینم لە سایەی کۆماری ئیسلامی ئایەتوڵادا.
خۆشی من لە هەفتەی کۆشکی شا، لەوێوە دەستپێئەدەکرد، کە لەگەڵ بیست و شەش کەس تێکبتڕنجێمە ناو سێ ئۆتومبیلەوە. ئەوەی تروسکایی خۆشی دەدا بە من، ئەو هەلە بوو کە لادێکانی ئێران ببینم. دەمزانی ئێران وڵاتێکی گەورەیە، بەڵام ئاگاداری ئەوە نەبووم، چەند من و مەهتاب دەبێت ڕێگا ببڕین، ئەگەر بمانەوێت لە وڵات بچینە دەرەوە. لەبەرئەوە سەرنجم هەر لەسەر ئەو ناوچانە بوو، کە پیایدا دەڕۆیشتین و زانیاریم کۆدەکردەوە، لەگەڵ ئەوەی ئەشمدەزانی، چەند بە کەڵکم دێت.
بەڵام چەند دەڕۆیشتین، ئەوەندە بێهیواتر دەبووم. بێگومان لادێکان جوان بوون، بەڵام جوانییەکەی لەوەوە سەرچاوەی دەگرت، کە ڕیزە شاخەکانی تا دەهات بەرزتر و سەختر دەبوونەوە لەچاو شاخەکانی ڕۆکیس لە ڕۆژئاوای وڵاتە یەکگرتووەکان. شاخەکان لەهەموو لایەکەوە دەوری تارانیان دابوو، شاردکەیان کردبوو بە تەڵە. لە شوێنی دانیشتنە

تەسکەکەمەوە وا دەردەکەوت، شاخەکان تا دێن بەرزتر و سەختر دەبنەوە. چوومەوە ناوخۆم و نوقمی چەنەحانێی دەروونی خۆم بووم.

بەڵکو لەم هەفتەیدا، هەرچی چۆنێك بێت، هەلێك قوتبێتەوە من و مەهتاب خۆمان رزگاربکەین. بتوانین لە سەر پاپۆڕێك بگەرسێینەوە و لە دەریای خەزەر بپەڕینەوە بۆ ... ڕوسیا.

گرنگ نییـــە! لەگەڵ خۆم کەوتبوومە قسە. هەر لێرە بڕۆین.

هەموو هیواکانم ناکامێکی ترسناکی لێدەرچوو. سەیرمکرد، لەگەڵ تێپەڕبوونی هەر ڕۆژێك زیاتر ڕەشبینتر ، زیاتر گرژتر و ترساوتر دەبم. مودیش گرژبوو، بۆم پرسیاربوو، کە ئەمە ناکامی کاردانەوەی هاتنەخوارەوەی ورەی منە. تەزویەکی سارد هات بە لەشمدا. فشار تا دەهات بەسەرمەوە کەڵەکە دەبوو، هەتا بەسەر مودیشەوە، هەڕەشەی لە تێکدانی پلانەکەم دەکرد، کە وام چنیبوو مودی نارامبکاتەوە، بۆئەوەی چاودێری بەسەر منەوە کەمکاتەوە.

تۆ بڵێی، بەم زوانە شتێکی باش ڕوونەدات، دەترسم شتی خراپتر بە ڕێگاوە بێت.

کە گەیشتینە کۆشکی شا، وەك چاوەڕوانمدەکرد، بینیمان بەتاڵکراوە لە تەواوی ناوماڵ و هەر شتێك، کە بیرهێنەرەوەی کەلتوری ڕۆژئاوا بێت. لە کاتی خۆیدا دەبێت زۆر دلگیر بووبێت، بەڵام ئێستا هەر قاوغەکەی مابۆوە. پاش نانخواردنی ئێوارە، هەر بیست و شەش کەسەکەمان، ئاسایی لاڵوپاڵ لەڕیزی یەکتر لە یەك ژووردا لەسەر فەرشی ژوورەکە لێکەوتین. لەبەرئەوەی پیاوان لە ژوورەکەدا بوون - لە ڕاستیدا ئاغا حەکیم لە تەنیشت مندا بوو - دەبوو تەواوی شەو بە جلوبەرگە یونیفۆرمەکەمانەوە بنوین. بە مانتۆ و ڕووسەری پێچراو بەسەرمەوە، سەخت بوو بتوانم ئاسودە پاڵکەوم.

شەوانی سەرەتای بەهار، هەوای ساردی دەریای بەناو پەنجەرە کراوەکاندا دەهێنایە ژوورەوە. ئەو شەوە تا بەیانی من و مەهتاب لە سەرماندا هەڵلەرزین و ئەم دیو و ئەو دیومان کرد، لە کاتێکدا خزمە ئێرانییەکانمان، وەك منداڵ تا بەیانی لێیخەوتن.

بەیانی کە هەستاین، بینیمان تەواوی ناوچەکە بەدەست بێئاوییەوە دەناڵێنێت. وە بۆ پاراستن لە بەکارهێنانی ئاو، زۆربەی ئەو ڕۆژە ئاو بە بەلوعەدا نەهات، سەرئەنجام یەکەم بەیانی "پشووەکەم" لە حەوشەکە، لەگەڵ ژنەکانی تردا بە سەوزی پاکردن بە ئاوی سەهۆڵاوی تەنیا سەتڵێك، بردەسەر لەکاتێکدا پیاوەکان یان هێشتا هەر نوستبوون یان لە حەوشەکەدا دانیشتبوون و تەماشای ئێمەیان دەکرد. پاشان پیاوان چوون بۆ ئەسپسورای و ژنان بۆیانـەبوو بەشداری لەمەدا بکەن.

پیاسەیەکی درێژمان کرد بە قەراخی جوانی ئەو دەریایدا، کە لە ئێستادا بووبووە جێگای کەستەك و پیسی.

هەفتەکە درێژبۆوە، بێئاسودەیی بووبووە مایەی دڵتەنگی. من و مەهتاب دەمانزانی، هەر دەبێت دانبە خۆماندا بگرین. ماوەیەك بوو بەمە خۆشە بووبووین.

هاتنی بەهار خۆشبینی و خەمۆکی لەگەڵ خۆی هێنا. زۆری نەمابوو بەفری سەرشاخەکان بتوێنەوە. ئایا هاورێکەی ڕەشید، دەتوانێت بە قاچاغی بمانبات بۆ تورکیا؟ هەوا خۆشبوون، هەلی دەستبەکاربوون دەڕەخسێنێت.

لەگەڵ ئەوەشدا، تێپەڕاندنی وەرزێك، پیشاندەری درێژبوونەوەی ماوەی بەندێتیم بوو. بۆ زیاتر لە حەوت مانگ دەچوو، من و مەهتاب کەوتبووینە داوەوە.

که گەڕاینەوە بۆ تاران، مودی ئاگاداربۆوە کە کارەکەی خەستەخانەی وەرگرتووە. مودی گەشکە گرتی، تەواوی ئەو ڕۆژە بەناو ماڵەکەدا پیاسەیکرد، نوکتەی دەکرد، زەردەخەنە و خۆشەویستی دەنواند بۆ مەهتاب و من، کە دەمێك بوو لای من بریقەی نەمابوو.

"لە ڕاستیدا زۆر نەچوون بەلای کاغەزی کارەکەدا،" مودی ئەم نهێنییەی لا درکاندم. "بەڵام لەوە ناچێت، خەستەخانە زۆر گوێپێبدەن و هەرچی چۆنێك بێت، ڕێگەمپێدەدەن کاربکەم. پێویستیان بە دکتۆری پەنجە. هەرکە کاغەزی کارم تەواوبوو، چەند کاژێر کارم کردبێت پارەکەیم پێدەدەن."

هەر لەو ڕۆژەدا، مودی شوروشەوقی دامرکایەوە و وردەوردە نوقمی خەیاڵاتی خۆی بۆوە، دەمزانی بیر لەچی دەکاتەوە. چۆن بچێت بۆ کار و چۆن چاودێری من بکات؟ تەنیا جێمهێشت، ئەمدەویست بچێتە سەر ئەو باوەڕەی، کە من مەیدانم بۆ هاتۆتە پێشەوە بۆ دەستئاوەڵابوون. لە مێشکی خۆیدا وای دانابوو، چارسەرێك دەدۆزێتەوە. کاری خەستەخانەی کاتی زۆری نەدەبرد. هەموو ڕۆژێك نەدەچوو بۆ کار و ئەو ڕۆژەی کاریدەکرد، پاسەوانێکی هەبوو بەسەرمەوە. نەسرین دەیتوانی و دەیکرد ڕاپۆرتی کاتی چوونە دەوەرەوە و هاتنەوەم بدات. هەروەها دەبێت، پاش تەواوبوونی قوتابخانەی مەهتاب یەکسەر بگەڕێمەوە و فریای ئەمیر بکەوم، تا دایکی بتوانێت بچێت بۆ زانکۆ. جیاکارییەك کە لەم نەخشەیەدا بوو، سێ شەممەی وانەی قورئان خوێندن بوو. نەسرین بۆ چاودێری ئەمیر لە ڕۆژانی سێ شەممەدا لە لایەکی ترەوە ڕێکیخستبوو.

وردەوری سوڕانی چەرخی مێشکی مودی دەهاتە گوێم. دەتوانێت متمانەم پێبکات؟ دەبێت هەر بیکات. یان دەبێت کارەکە لەبیرخۆی بەرێتەوە.

"لە سێ شەممەاندا، یەکسەر پاش قورئان خوێندن، دێیتەوە ماڵەوە،" مودی وتی. "لەمە دەکۆڵمەوە."

"باشـــە،" بەڵێنمپێدا.

"چاکـــە،" مودی وتی. جارێکی تر شوروشەوقەکەی گەڕایەوە، کە بینی دەتوانێت دەستبەکار بێت.

تەنیا بۆ بۆنەی دانسقە، هەلم لەم ئازادییە وەرگرت، کاتێك کەوا دەردەکەوت ئەو سەرکێشییە دەهێنێت. مودی ئەوەندە بەدگومان بوو، هەوڵیدەدا، کە زۆر لە هەرچەند خزمانی خۆی بکات، تا من بخەنە ژێرچاودێرییەوە. هەتا لەوانەبوو شوێن دابنێت، کە لێوەی چاودێری هەڵسوکەوتی من بکەن. بۆخۆی چەند جار ئەمەی کردبوو. کاتێك ئیشی نەدەبوو یان لەسەر کار زووتر تەواودەبوو، هەندێك جار دەهات بۆ قوتابخانە بۆ بردنەوەمان بۆ ماڵەوە. زۆرجار سەرسامیدەکردم، کە چاوەڕوانی دەرکەوتنیم نەدەکرد. لەبەرئەوە دورست چاوم لە کاتەکانەوە بوو، مەگەر ئەوەی بۆ شتێك کە زۆر پێویست بوایە.

ڕۆژێکیان لە قوتابخانە، کە کاتی وچانی نێوان وانەکان بوو، مامۆستایەك بە هێواشی خۆی کرد بە ژووری فەرمانبەراندا و لە تەنیشتم لەسەر قەنەفەکە دانیشت. تەنیا بە بینین دەمناسی، بەڵام ژنێك بوو بە سۆزەوە زەدەخەنەی بۆ دەکردم. بە سەر چاکوچۆنیمان لەگەڵ یەکتری کرد. چاوێکی گێڕا بە ژوورەکەدا، تا دڵنیابێت سەرنجی کەسی بۆ لای خۆی ڕانەکێشاوە، ئینجا پاشان لایەکی دەمی خۆیی گرت و بە چرپە وتی، *"ناگو،"* *"پێی نەڵێیت." "ناگو، با خانم ئازر."*

"قسەمکرد، مێردەکەم، تۆ،" هەوڵیدەدا بە ئنگلیزی بدوێت و بەدوای وشەوە ڕاکەڕاکی بوو. "دەیەوێت یارمەتی، تۆ." لەبەرئەوەی لە زمانی فارسیدا ڕاناوی جیا بۆ نێرینە و مێینە نییە، ئێرانییەکان زۆرجار کە ئینگلیز قسەدەکەن ئەم ڕاناوانە تێکەڵدەکەن (لێرانەدا نووسەر مەبەستی، کە مامۆستاکەشە بۆ مێردەکەی ڕاناوی مێینە بەکاردەهێنێت وەرگێڕ). مامۆستاکە سەیرێکی باوەشی خۆیی کرد. بەدزییەوە دەستێکی لە کراسەکەی خۆیەوە برد بۆ ئەوەی من. جارێکی تر چاوی گێڕا، بۆئەوەی بزانێت کەس تەماشامانناکات. پاشان بەخێرای دەستی گرتم و لە قولەمستمدا پارچە کاغەزێکی جێهێشت. پارچە کاغەزەکە ژمارەیەکی تەلەفۆنی لەسەر نووسرابوو.

"تەلەفونــبکە،" مامۆستاکە بەچرپە وتی. "کچێك."

مەهتابم خێرا دایەپێش خۆم بەرەو ماڵەوە و لە ڕێگادا سەکێشیم کرد و خۆم کرد بە دوکانەکەی حەمیددا، بۆئەوەی بزانم، ئەم سەرە پەتە بەرەو کوێم دەبات. کە تەلەفونمکرد، ژنێك بە زمانی ئینگلیزی وەك خانم عەلاوی خۆی ناساند و خۆشحاڵی خۆی دەربڕی، کە پەیوەندیم پێوە کردووە. ڕوونیکردەوە، کە کار بۆ باوکی ئەو مامۆستایە دەکات و ئەو هەلومەرجی منی بۆ خۆی و دایکی باسکردووە.

"لەبەرئەوەی ئینگلیزی دەزانم و لە بەریتانیا خوێندومە، داوای لێکردووم، کە ئەگەر شتێکم لەدەستبێت، یارمەتیتبدەم،" خانم عەلاوی ڕوونیکردەوە. "منیش وتم، هەوڵی خۆم دەدەم."

ئەمەش بەڵگەیەکی تر بوو، کە ئێرانییەکان ناتوانرێت بخرێنە یەك خانەی ڕقلێبوانی توندڕەوی ئەمریکاییەوە. خانم عەلاوی لە هاتنە پێشەوەیدا لەگەڵم زۆر ڕاستگۆ بوو،

لەگەڵ ئەوەی ئەگەری خستنە مەترسی ژیانی خۆشی تیادابوو. بەبێ هیچ گومانێك، تەنیا بە قسەکردنی لەگەڵ من، ئازادی خۆی دەخستە مەترسییەوە.

"چۆن یەکتری ببینین؟" پرسیاریکرد.

"دەبێت چاوەڕوانبم، تا هەلێکم بۆ دەرەخسێت."

"هەرکاتێکت بۆ ڕەخسا، من کاتی نانخواردنی نیوەڕۆم دەخەمە ئەو کاتەوە. دەتوانم بە ئوتومبیل بێم بۆ هەرچی شوێنێك، کە تۆ دەتوانی بمبینیت."

"زۆر چاکــە،" وەڵامـــدایەوە.

شوێنی کاری خانم عەلاوی دووربوو لە ماڵی مامەوە، دووربوو لە قوتابخانەی مەهتابەوە، هەتا لە حوسەینییەی قورئان خوێندنەوە. کاتێك هەردووکمان ئازاد دەبووین و کاتمان دەبوو بۆ یەکتر ناسین، ڕێکخستنی دانیشتنەکەمان لێدەبوو بە گرفت. هۆی ئەم هەوڵەی خانم عەلاویم بۆ پرسیاربوو، بەڵام لە خۆی گومانێکم نەبوو. دڵسۆزی لە قسەکانیدا، یەکسەر متمانەی لا دروستکردم.

ڕۆژەکان بەخاوی دەبوون بە هەفتە، کاتێك بەدوای هەلێکی زۆر باش و بێمەترسیەوە بووم بۆ ڕێکخستنی دانیشتنێك. لەگەڵ ئەوەی مودی دەچوو بۆ کار، بەڵام هەستمدەکرد، لە چەند لاوە زیاتر لەژێر چاودێریدام. هەتا نەسرین زیاتر لە هاوسەرەکەم لەو پەیوەندەدا وریاتر بوو. هەرکاتێك پێم دەنایە ناو دەرگای حەوشێوە، ئەو یەکسەر تەماشای کاتژمێرەکەی دەکرد.

بەڵام سستمی چاودێری مودی، نەیدەتوانی تاسەر کارا بێت. لە شارێکی چواردە ملێونیدا، ئەگەری ئەوە نەبوو، بۆ هەتاهەتایە بتوانێت شوێنپێم هەڵگرێت. ڕۆژێکیان لەگەڵ مەهتاب لە قوتابخانەوە گەیشتینە ماڵەوە، بینیم نەسرین بێئارامانە چاوەڕوانی من دەکات. لە زانکۆوە بانگیانکردبوو بۆ کۆبوونەوەیەکی تایبەت و دەویست ئەمیر لە ماڵەوە بەسەر مندا بەجێبهێڵێت. یەکسەر دەرپەڕییە دەرەوە. مودی لەسەر کار بوو. ڕەزا و ئیسا چووبوون بۆ سەردانی خزمەکانیان.

یەکسەر تەلەفونم بۆ خانم عەلاوی کرد. "ئەم دوانیوەڕۆیە دەتوانم بتبینم. هەرئێستا،" پێم وت.

"هەرئێستا دێم،" وەڵامیدامەوە.

شوێنی پارکەکەم پێوت، کە چەند کۆڵان ئەولا ماڵەکەمانەوە بوو. "بە چیدا بزانم تۆیت؟" پرسیارملێکرد.

"سەرپۆش و پانتۆڵ و قاپوتی ڕەشم لەبەردایە، جلوبەرگی پرسە. لەم دوایانەدا دایکم مردووە."

"بە داخم."

"ئێوە خۆشبن،" پێیوتم.

لەسەر کاغەزێك سەرنجێکم بۆ مودی جێهێشت. مودی کاتی دیاریکراوی کارکردنی نەبوو لە خەستەخانە، پەیوەندی بە بوونی نەشتەرگەرییەوە هەبوو، کە لەپێش نیوەڕواندا پلانی بۆ دادەنرا، بەڵام هەرگیز دڵنیانەبوو لەکاتی هاتنە دەرەوە لە خەستەخانە. لەوانەبوو تا یانزەی شەو نەگەڕێتەوە، یان هەر ساتێك بگاتەماڵەوە.

"منداڵەکان ئۆقرەیان لەبەربڕاوە،" بۆمنووسی. "دەیانــبەم بۆ پارکەکە."

مەهتاب و ئەمیر هەردەم پێیان خۆشبوو، بچن بۆ پارك. متمانەم بە پاراستنی نهێنی مەهتاب هەبوو، ئەمیریش هێشتا منداڵ بوو، لەبەرئەوە نیگەران نەبووم لەگەڵمدا بن. ئەوەی جێگای نیگەرانیم بوو، کاردانەوەی مودی بوو، لەسەر ئەوەی بڕیارمداوە، بەبێ ئەوەی کەسێکم لەگەڵدا بێت، بێ مۆڵەتی ئەو چووم بۆ پارك. هیواداربووم، کە کۆبوونەوەکەمان تەواو بێت و لەپێش ئەوەوە بگەمە ماڵەوە.

منداڵەکان بەخۆشییەوە جۆلانەیانــدەکرد، لەگەڵ منداڵانی تر خەریکی یاریکردن بوون، کاتێك ژنێك بە جلوبەرگی ڕەشەوە لێم نزیکبۆوە. جلوبەرگی ئێرانی جۆرێکە، کە هەڵسەنگاندنی ڕۆخساری کەسێکی نەناس سەختدەکات، بەڵام لەوەدەچوو تەمەنی نزیك پەنجا ساڵ بێت یان تۆزێك کەمتر. لەسەر قەنەفەی پارکەکە لە تەنیشتم دانیشت.

"کاغەزێکم بۆ هاوسەرەکەم جێهێشتووە،" بەخێرایی وتم. "لەوانەیە بێت بۆ ئێرە."

"چاکە،" خانم عەلاوی وەڵامیدامەوە. "ئەگەر هات، من خۆم وا پیشاندەدەم، کە هەندێك لەوانە، منداڵی منن." سەیرێکی ژنێکی کرد، کە لەوبەرەوە لەسەر قەنەفەیەك دانیشتبوو، بۆ چەند ساتێك بە فارسی کەوتنە گفتگۆ. "بەو ژنەم وت، کە ئەگەر هاوسەرەکەت هات، من وا خۆم پیشاندەدەم کە لێرە لەگەڵ ئەو و منداڵەکانیم، نەك لەگەڵ تۆ. وتی باشە."

ئەم نەناسە، بەبێ هیچ بەرهەڵستییەك، ئەم دەورەی قبوولکرد. وردەوردە بۆم دەرکەوت، کە بەڕاستی ئێرانییەکان حەزیان لە پیلانگێڕانە. وا ڕاهاتوون کە بەشێوەی نهێنی هەڵسوکەوت بکەن، لەوانەیە بەهۆی ئەوەوە بێت، کە لەژێر سایەی شا و ئایەتوڵادا ژیانیانکردووە. پلان و دژەپلان نەك هەر لەنێوان خەڵك و دەزگا دەوڵەتییەکاندا بێت، بەڵکو هەتا لە نێو خێزانەکاندا. داوای خانمی عەلاوی، نە مایەی سەرسامی بوو نە زەنگی ترس بۆ ئەو ژنە نەناسە. لە ڕاستیدا لەوانەیە مایەی خۆشی تەواوی ئەو ڕۆژەی بووبێت.

"دەی چی ڕوویداوە؟" خانم عەلاوی پرسی. "بۆچی لێرەیت لە ئێران؟"

چەند توانیم بە کورتی بەسەرهاتی خۆمم بۆ باسکرد، بەڵام شتە سەرەکییەکانم بە وردی ڕوونکردەوە.

"لە گرفتەکەت تێدەگەم،" خانم عەلاوی وتی. "کاتێك لە بەریتانیا دەمخوێند، بیانی بووم. هەمیشە وەك بیانی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکردم، هەرچەند من نەمدەویست بیانی بم. دەمویست لە بەریتانیا بمێنمەوە، بەڵام پێویستم بە هەندێك خەڵك بوو، کە یارمەتیمبدەن، ئەمە بکەم. کەس نەبوو یارمەتیمبدات و دەبوو بگەڕێمەوە بۆ ئێران. کە

ئەمە مایەی داخێکی زۆر بوو بۆ من و دایکم. ئێمە بڕیارمانداوە، ئەگەر شتێکمان لەدەستبێت، یارمەتی خەڵکی بیانی بدەین لە وڵاتەکەماندا. یارمەتیتدەدەم. دەزانم، لەدەستم دێت."

وچانێکی دا و تۆزێك بیریکردەوە، پێشنەوەی دەستپێبکاتەوە.

"دوو هەفتە لەمەوبەر دایکم مرد،" کەوتەوە قسە. "دەزانیت، پێشنەوەی بمرێت باسی تۆمان کرد. پێیــوتم، 'هیچ کەسێك یارمەتی تۆی نەدا، کە بیانی بوو.' بەڵێنی لێوەرگرتم، کە ئەگەر هەلێکم بۆ هاتەپێشەوە، یارمەتی بیانی بدەم. دەیکەم. دەمەوێت ئەو بەڵێنە بەرمەسەر. وە ئومێدەوارم." خانم عەلاوی بە قەراغی سەرپۆشەکەی فرمێسکەکانی سڕی.

"چۆن؟" پرسیارملێکرد. "چۆن دەتوانی یارمەتیمـبدەیت؟"

"برایەکـم هەیە، لە زاهیدان دەژی لەسەر سنووری پاکستان. من ..."

"مامی! مامی! مـــامی!" مەهتاب قسەی پێبڕین، بەرەو ڕووم بەڕاکردن هات. "باوکـــم لێرەیە!"

لە دوورەوە ڕاوەستابوو، لەدەرەوەی پەرژینێکی تەلی کە دەوری پارکەکەی دابوو، بە دەموچاوییەوە دیاربوو، بەگومانێکی زۆرەوە سەیرمەدەکات. بەتوندی ئاماژەی بۆ کردم، بچم بۆ لای.

"بەس، ئارامبــــــن" لەژێر لێوەوە بە خانم عەلاوی و مەهتابم وت. "مەهتاب بەدگومانانە هەڵسوکەوت مەکە، بگەڕێرەوە بۆ سەر جۆلانێی خۆت."

هەستام و بە پیاسە چووم بۆ لای، باش بوو پەرژینەکە لە نێوانماندا بوو.

"چی دەکەیت لێرە؟" کــەوتە بۆڵەکردن.

"ڕۆژێکی خۆشە،" وەڵامەدایەوە. "بەهار بەڕێگەوەیە. ویستم منداڵەکان بهێنم بۆ پارکەکە."

"ئەو ژنە کێیە لەتەنیشتت دانیشتووە؟"

"نازانم. منداڵەکانی لێرە یاریــــدەکەن."

"قسەت لەگەڵدا دەکرد. ئینگلیزی قسەدەکات؟"

دەمزانی مودی ئەوەندە دووربوو، کە نیدەتوانی گوێبیستی قسەکانمان بێت، لەبەرئەوە درۆم لەگەڵدا کرد. "نـــــەء. لەگەڵیدا ڕاهێنان بە زمانە فارسییەکەم دەکەم."

مودی بەگومانەوە چاوێکی گێڕا بەو ناوەدا، بەڵام هەموو ئەوەی دەیبینی، منداڵان بوون لەژێر چاودێری دایکەکانیاندا بە دەنگەدەنگەوە یاریاندەکرد. خانم عەلاوی و ژنە نەناسەکەی تر خۆنواندنانە چووبوون بۆ لای جۆلانەکان بۆ یاریکردن لەگەڵ منداڵەکانیان. هیچ نیشانەیەك لە پیلانگێڕی لەئارادا نەبوو. هاتبوو بزانێت، ئەوەی من لەسەر کاغەزەکە نووسیبووم، دروستە. بەبێئەوەی وشەیەك لە دەمی بێتەدەرەوە، لێیدا ڕۆیشت بۆماڵەوە.

ئارام و لەسەرخۆ گەڕامەوە بۆ لای منداڵەکان، ڕاوەستام و بۆ چەند ساتێك پاڵم بە مەهتاب و ئەمیروە نا لەسەر جۆلانەکان، حەزمدەکرد ئاوڕبدەمەوە و ببینم مودی چاودێریمدەکات، بەڵام لەسەر شانۆگەری خۆم بەردەوامبووم. پاش چەند خولەکێك بە وریاییەوە گەڕامەوە بۆ سەر قەنەفەکە. خانم عەلاوی چەند خولەکی تر چاوەڕوانیکرد، پێشنەوەی بگەڕێتەوە و لەتەنیشتم دانیشێت.

"ڕۆیشـــــت،" پێیوتم.

خانم عەلاوی سەیرێکی ژنە ئەناسەکەی کرد و بە سەرلەقاندن سوپاسیکرد. ژنەکەش بەهەمان شێوە وەڵامیدایەوە، بەبێ ئەوەی بزانێت، ئێمە چ بەزمێکمان لەژێر سەردایە، بەڵام پێیخۆشبوو بەشداری ئەم بەزمە بکات. دەبێت ئەم ژنانە لە ژیانی ڕۆژانەیاندا چ ئازارێك بچێژن؟ بۆم پرسیاربوو.

بەڵام زوو بیروهۆشم چوودەوە سەر گرفتەکانی خۆم.

"براکەت؟" پرسیارمکرد، ئەمدەویست کات لەوە زیاتر لەدەستبدەم.

"لە زاهیدان دەژی، لەسەر سنووری پاکستان. بەنیازم قسەی لەگەڵدا بکەم و داوای لێبکەم، ئەگەر من ئێوە بگەیەنمە زاهیدان، دەتوانێت ئێوە لە وڵات بەرێتە دەرەوە."

"ئینجا دەتوانێت؟"

خانم عەلاوی دەنگی نزمکردەوە و کەوتە چرپەکردن. "هەمیشە دەیکات، خەڵك لە سنوور دەپەڕێنێتەوە."

وردم بەرزبۆوە. کاتێك بیرم لە هەلومەرجی ئەم کۆبوونەوەیە دەکردەوە، بۆم دەرکەوت، کە هەموو ئەمانە شتێکی ڕێکەوت نییە. مامۆستای قوتابخانەکە و هاوسەرەکەی، دەبێت زانیبێتیان، کە خانم عەلاوی کەسێك نییە، تەنیا ئینگلیزی دەزانێت، بەڵکو دەبێت شتێکی لەدەستبێت، یارمەتی من بدات.

بێــگومان بە سنوورەکان ئاشنابوون! من تەنها کەس نەبووم، کە لە ئێراندا کەوتبوومەوە داوەوە. ئەگەر ژیان لێرە ئەوەندە بۆ من سەخت بێت، بێگومان ملیۆنەها خەڵك لە دەوری من، بەدەست هەمان دەردەوە دەناڵێنن. ئەم وڵاتە مێژوویەکی پڕ لە حکومەتی سەرکوتکەری هەبوو، لەبەرئەوە ژیربێژی بوو، دروستبوونی تۆڕێکی وردی پیشەیی خاوەن ڕابوردوو لەبەرچاوبگیرێت، کە کارەکەیان بردنەدەرەوەی خەڵك بێت لە وڵات. سەرئەنجام کەوتمە پەیوەندییەوە لەگەڵ یەکێك لەو کەسە پیشەگەرانە.

"چەندی تێدەچێت؟" پرسیارمکرد.

"نیگەرانی پارە مەبە. من خۆم دەیدەم. بەڵێنم بە دایکم داوە. ئەگەر پێتخۆشە ڕۆژێك لە ڕۆژان بمدەیتەوە، ئەوا چاکە. ئەگەر نـــا، ئەوا بۆم گرنگ نییە."

"کەی دەتوانین بڕۆین؟" بەخۆشییەوە پرسیارملێکرد. "چۆن بگەینە زاهیدان؟"

"بەم زووانە دەڕۆین،" وەڵامیدامەوە. "دەبێت کاغەزت بۆ پەیدابکەم، تا تۆ و کچەکەت بتوانن بە فڕۆکە بگەنە زاهیدان." بە وردییەکی زۆرەوە پلانەکەی بۆ باسکردم و لەسەر

یەك خاڵ زۆر پێیداگرت، كە خێرایی شتێكی سەرەكییە. كە هەموو شتێك ڕۆشنبۆوە، دەبوو بەدوای ڕێگایەكەوە بین كە خۆمان لە مودی ڕزگاربكەین، پێش ئەوەی بە چەند كاژێر ئاگاداری ئەمانی ئێمە بێتەوە. دەبوو بچینە فرۆكەخانە، سواری فرۆكە ببین، بگەینە زاهیدان و پەیوەندییبكەین بە براكەی خانم عەلاوییەوە لەسەر سنوور هەموو ئەمانە بەسەرئەنجام بگات، پێشئەوەی مودی ئەوەندە گومانبكات، پۆلیس ئاگاداربكاتەوە.

ڕۆشنبوو سێ شەممان باشترین ڕۆژ بوو. مودی دەچوو بۆ سەركار، من و مەهتاب تا نیوەڕۆ لە قوتابخانە بووین و پاشان بۆ دوا نیوەڕۆ دەچووین بۆ قورئان خوێندن. دەمانتوانی خۆمان بگەیەنینە زاهیدان، پێش ئەوەی مودی پێیبزانێت، كە ڕۆیشتووین.

ئەم پلانە زۆر ژیرانەتر و پیشەگەرانەتر بوو لەوەی كە تریش و سوزانە پێشنیاریانكردبوو. هێلین و میستەر ڤینكۆپ لە باڵوێزخانە لەسەر ئەوە سووربوون، كە مانەوەم لەناو تاراندا و خۆشاردنەوەم لە مودی، هەتا لەوانەیە لە پۆلیسیش، ئەگەرێكی گەورەی پڕ مەترسی تیادایە. خانم عەلاوییش لەگەڵ ئەوەدا بوو، كە خۆشاردنەوەم لەناو تاراندا هەوڵێكی ژیرانە نییە. كاربەدەستانی فرۆكەخانە یەكەم لایەنە كە ئاگاداردەكرێنەوە لە هەڵهاتنی ژنێكی ئەمریكی و منداڵێك. هەنگاوی سەرەكی ئەوە بوو، كە ئێمە خۆمان لە فرۆكەخانەی تاران و زاهیدان ڕزگاربكەین و بچینە لای قاچاخچییەكان، پێشئەوەی ئاگادارییەكی ڕەسمی لە ئەمانی ئێمە بلاوبكرێتەوە.

"ئەم هەولانە كەی دەكرێت؟" بەخۆشییەوە پرسیارمكرد.

"لەماوەی دوو هەفتەدا،" وەڵامیدامەوە. "لەگەڵ براكەم قسەدەكەم. ئەگەر توانیت، یەك شەممە تەلەفونم بۆ بكە. با بزانین، دەتوانین دووبارە لێرە یەكتری ببینین و بە وردتر باسیبكەین."

سەخت بوو شوروشەوقی خۆم بشارمەوە، كە زۆر پێویستبوو، نەك تەنیا لە مودی، مامل، ئەسرین و دوژمنەكانی ترم، بەڵكو هەتا لە كچەكەی خۆم. مەهتاب وا گەورەبووبوو كە سوپەر ئەكتەر بێت لەكاتی پێویستدا، بەلام ئەمدەوێرا بەم نهێنییە خۆشە باری قورسبكەم. بە نیازبووم، كاتێك كاتی هەڵهاتن دێت، پێیبڵێم، نەك پێش ئەوە.

كە گەڕامەوە لە پاركەكە، مودی سەرگەرمی شتی خۆی بوو. باش بوو، نزیكی من و مێشكی پرجەنجاڵم نەكەوت، كە لەو نۆكەی بۆ نانی ئێوارە بۆم لێدەنا، پرجۆشتر دەكوڵا.

لەو پەڕی بیركردنەوەدمدا بووم، كە لەپڕ ڕاوەستام و بیری قسەكانی هێلین و میستەر ڤینكۆپم كەوتەوە لەسەر قاچاغچی. بەلام لەبارەی ئەو قاچاغچییانەوە قسەیاندەكرد كە تۆیان دەبرد بۆ توركیا! كەوتمە خۆڕازیكردنی خۆم. ئەم خەڵكە تۆ دەبەن بۆ پاكستان.

ئەمانیش هەر قاچاغچین. تۆ بڵێی لاقەم بەكەن! پارەكەم لێبدزن! بمكوژن یان بمدەنەوە دەست پاسدار!

ئایا ئەم بەسەرهاتە ترسناکانە پروپاگەندەی حکومەت خۆی نەبوو بۆ ترساندنی خەڵك؟ یان ڕاستییەکی سامناك بوون؟

خانم عەلاوی ئاسان متمانەی منی بەدەستهێنا. بەڵام براکەیم نەدەناسی یان ئەو سەرکەشانەی، کە ژیانی خۆیان لەو ڕێگایەدا دەخستە مەترسییەوە. تا دەهات بە پەرۆشتر دەبووم بۆ بینینی هێلین لە باڵوێزخانە، بۆ قسەوباس لەسەر ئەم پلانە تازەیە و تاوتوێکردنی ئامۆژگارییەکانی دژی کەوتنەژێر کاریگەری دەستبەجێی خانم عەلاوییەوە.

بۆ ڕۆژی دواییی لە ڕێگای قوتابخانە، من و مەهتاب لاماندایە لای دوکانەکەی حەمید و تەلەفۆمانکرد بۆ هێلین. چەندم توانی لەسەر پەیوەندی تازەم کەوتمە باسکردن، بەڵام دەبوو ئاگام لەخۆم بێت لەسەر تەلەفون قسەدەکەم.

"وەرە بۆ لام،" هێلین وتی. "ئیمڕۆ بۆ ئێمە دەستدەدات، تۆ ببینین. هەروەها چەند نامەت لە خێزانەکەتانەوە بۆ هاتووە. تکاتلێدەکەم ئیمڕۆ وەرە."

"هەوڵدەدەم." وەڵامـدایەوە.

بەڵام چـۆن؟ ڕۆژێکی گونجاو نەبوو. مودی لەسەر کار نەبوو، نەمدەزانی، دێت بۆ قوتابخانە یان نـا.

جارێکی تر خۆم گەیاندەوە تەلەفونەکەی حەمید و تەلەفونم بۆ ئلین کرد لەسەر کار و پێم ڕاگەیاند، کە کاتییەتی پلانەکەمان پیادەبکەین، تا بتوانم بچم بۆ باڵوێزخانەی سویسرا.

هەر ئەو بەیانییە دواتر ئلین تەلەفون بۆ مودی دەکات لە ماڵەوە و داوای لێدەکات، کە ئایا من و مەهتاب بۆ دوانیوەڕۆ دەتوانین لەگەڵی بچین بۆ بازاڕ. دێت بۆ قوتابخانە بەدوامانـدا و لە ماڵیان نانی نیوەڕۆ دەخۆین و دەچین بۆ بازاڕ بۆ کڕینی جلوبەرگی بەهارە.

مودی دەڵێت باشە!

ئلین هەوڵدەدا بەشی دووەمی پلانەکە پیادەبکات. تەلەفون لە نووسینگەی قوتابخانە لێیدا و فەرمانبەرێك تەلەفونەکەی هەڵگرت و دایە دەست خانم شەهێن. بە فارسی کەوتە قسەکردن، چەند جار ناوی "بیتیی" برد، ئینجا زانیم لەگەڵ ئلین قسەدەکات.

ئەمە تاقیکردنەوەیەك بوو بۆ خانم شەهێن، کە بزانم ڕێگەمپێدەدات لە تەلەفوندا قسەبکەم. ڕێگەیـنەدا. دەبوو ئلین تەلەفون بکاتەوە بۆ مودی و ئەو بە تەلەفون بە خانم شەهێن بڵێت، کە مۆڵەتم پێبدات لەسەر تەلەفون قسەبکەم.

سەرئەنجام پێکەوە لەسەر تەلەفون قسەمانـکرد. "باشە،" ئلین وتی، لە پەشۆکاویدا دەنگی دەلەرزی. "من دێم بۆ قوتابخانە، تۆ و مەهتاب هەڵدەگرم."

"زۆر باشە،" وتم. پاشان پێمـوت، "هیچ شتێکی نادروست ڕوویـداوە؟"

"نـــا،" ئلین بە دڵنیاییەوە وتی.

پانزه خولەکێك تێپەڕیبوو و ئلین دووباره تەلەفونی بۆ کردمەوه، "هەر ئێستا تەلەفونم بۆ مودی کرد و پێموت، کە گرفتێکم بۆ هاتۆتەپێشەوە. بۆ ئەم دوانیوەڕۆیه ناتوانم."

"چی ڕوویداوه؟"

"بڕیارەکەمم گۆڕیوه. دەبێت لەبارەی ئەوەوە قسەت لەگەڵدا بکەم."

لە ئلین زویربوو، هەر دەمویست بچم بۆ باڵوێزخانه، بەڵام نەمدەوێرا، بەبێ دڵنیابوون لە پارێزگاری ئلین.

چ هەڵەیەك بووە؟ چــۆن خۆم بگەیەنمە باڵوێزخانه؟

ڕۆژی دواتر هیچ هەلێك نەڕەخسا، چونکو مودی لە سەرکار نەبوو، هەروەها مەزاجیشی تەواو نەبوو. لەگەڵمان هات بۆ قوتابخانە و پێشنەوەی جێمانــبهێڵێت، چەند فەرمانی بۆ دەرکردین. بەتەنیا ناگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە و لە نیوەڕۆدا دێت بە شوێنماندا. بەڵام نیوەڕۆ هات و ڕۆیشت، ئەو هەر دەرنەکەوت. من و مەهتاب گوێڕایەڵانە چاوەڕوانمانکرد. کەوتینە نیگەرانییەوە، من و مەهتاب بەگومانەوە سەیرێکی یەکتریمان کرد. ئایا تاقیمانــدەکەنەوە؟ نەمانــدەزانی چی بکەین.

کاژێرێکی تەواو ڕۆیشت و مودی هەر دەرنەکەوت.

"باشترێکە بڕۆین،" بە مەهتابم وت.

دەترسام شتێك ڕوویدابێت و ئەو هەلومەرجە سەختەی هەمبوو، زیاتر ئاڵۆزیبکات. لەوە زیاتر ڕانەوەستاین و ڕۆیشتین و تەکسییەکی پرتەقاڵیمان ڕاگرت. هەرکە لە شوێنی ئاسایی خۆمان لە شەقامی شەریعەتی هاتینە خوارەوە، خێرا کەوتینە ڕێ بۆ ماڵەوە، لە ڕێگادا لامانــنەدا. لەوانەبوو لەژێر چاودێری مودیدا بین.

بەڵام کە گەیشتینە ماڵەوە، بینیم مودی لە هۆڵەکەیە و دەگری.

"چـــی ڕوویداوه؟" پرسیارمـکرد.

"نیلوفەر،" مودی وتی. "لە بالکۆنەکەی ماڵی خۆیان کەوتۆتەخوارەوە. خێــراکە! با بـــڕۆین."

# 12

نێلوفەری تەمەن نۆزدە مانگ، کچی نەستەران و مورتەزا، کوڕەزای بابەحاجی و عەمە بزورگ بوو. منداڵێکی بچوکی جوان بوو، ئەوەی کە بێناگایانە یەکێك لە کێکەکانی مەهتابی خەسارکرد. هەردەم دڵشاد و دەم بە پێکەنین بوو، هەمیشە دەهات بۆ لای من و مەهتاب.

یەکسەر غەمی هەلومەرجی منداڵەکە دایگرتم، بەلام هاوکات مێشکم لە شوێنێکی تر بوو. ئایا ئەمە فێل نییە؟ مودی پلانێکی دانابێت، بمانبات بۆ شوێنێکی تر؟

چارەیەکی ترم نەبوو، جگە لەوەی دوایبکەوم بۆ دەرەوە، بۆ شەقامی شەریعەتی و بۆ ناو تەکسی. ترسی زیاترم لێنیشت. ئایا ئلین ڕازەکەمی لای مودی نەدرکاندووە؟ ئایا باڵوێزخانە تەلەفونیکردووە؟ ئایا مودی بەنیازە لە شوێنێکدا بمانشارێتەوە، پێشئەوەی فریابکەوین کەسێك ئاگاداربکەینەوە؟

دەبوو دوو جار تەکسی بگۆڕین و کاتێك بە ڕێگاوە بووین، کەوتمە ویردخوێندن، کە مەهتاب ئەو ناوچەیە نەناسێتەوە. ئێمە شەقامێکی ئاشنامان گرتبوو، کە دەچوو بۆ بەشی بەرژەوەندی یو.ئێس. لە باڵوێزخانەی سویسرا.

لە ڕاستیدا ئەو خەستەخانەیەی ئێمە بۆی چووین، هەر لەوبەری شەقامەکەی باڵوێزخانەوە بوو!

مودی خێرا ئێمەی برد بەرەو پرسگەی پێشوازی و پرسیاری ژمارەی ژووری نێلوفەری کرد. ئەوەندە لە زمانە فارسییەکەم دەزانی، تێگەیشتم گرفتێك هەیە و مودی هەوڵدەدات، کەڵك لە پزیشك بوونی خۆی وەرگرێت، تا بازبدات بەسەر ئەو ڕێسا بیرۆکراتییانەی کە یەخەیگرتبوو. بۆ چەند خولەك بەتوڕەییەوە کەوتە بۆڵەبۆڵ، تا لە کۆتاییدا بۆی ڕوونکردمەوە. "ڕێگەی ئێوە نادەن بێنە ژوورەوە، چونکو عەباتان بەسەردا نەداوە."

یەکسەر لە گیری مودی تێگەیشتم، چونکو ئەگەر بچێت بۆ بینینی نێلوفەر، دەبێت ئێمە لەلای پرسگەی پێشوازی بێچاودێری جێبهێڵێت، کە تەنیا شەقامەکە لە نێوان ئێمە و باڵوێزخانەدا بوو! بۆم دەرکەوت، کە ئەمە فێڵ نییە. نێلوفەر ئازاری پێگەیشتووە. بۆ ساتێك گریفتی خۆمم بیرچۆوە. ئازار بە جەرگم گەیشت بۆ ئەو کچە بچکۆلەیە و دایك و باوکی. سەرئەنجام مودی بڕیاریدا، کە ڕەچاوکردنی کەسوکاری لەسەروو ئاسایشی خێزانەکەیەوە دابنێت. "لێرە بمێنەوە!" فەرمانیدا. پاشان خێرا دەرچوو بۆ پرسینەوە لە هەلومەرجی نێلوفەر.

زۆر بەلامەوە سەیربوو، ئەوا بێدەسەڵاتانە دانیشتووم و باڵوێزخانەش لەوبەرەوەیە. ئەوەی نەدەهێنا بۆ چەند خولەکێك قسەکردن لەگەڵ هێلین، مودی لەخۆم شێتبکەم.

چەند ساتێکی نەبرد، مودی هاتەوە. "کەس لێرە نییە،" مودی وتی. "مورتەزا منداڵەکەی بردووە بۆ خەستەخانەیەکی تر. نەستەران گەڕاوەتەوە بۆ ماڵەوە، ئێمەش دەچینەوە بۆ ئەوێ."

بەخێرای ڕۆیشتین، بەلای باڵوێزخانەدا تێپەڕین. زۆرم لەخۆم کرد سەیرینەکەم و بەهێواشی واشم لە مەهتاب کرد، کە وەك من بکات. نەمدەویست مودی بۆنەوە بچێت، کە من شوێنەکەم بینیوە.

ماڵی مورتەزا و نەستەران کۆڵانێك ئەولای باڵوێزخانە بوو. کە گەیشتین، چەند ژن بۆ هاودەردی هاتبوون، هەروەها فریشتەی خوشکەزاکەی مودی هاتبوو، خەریکی چالێنان بوو. نەستەران ناوبەناو دەچووە سەر بالکۆنەکە و دەگەڕایەوە، بۆئەودی تەماشای شەقامەکە بکات، بزانێت هاوسەرەکەی بە چ هەواڵێکی کچەکەیەوە دێتەوە.

هەر لەهەمان بالکۆنی سێ نهۆمییەوە کچە بچکۆلانەکەی، کەوتبووە خواردوە بۆ سەر شەقامە قیرتاوەکە، پاش ئەوەی کە بەسەر پەرژینێکی تەنەکەی نێو مەتریدا سەرکەوتبوو. بالکۆنێکی ئاسایی نمونەیی بوو - هەروەها نمونەی کارەساتێکی جەرگبڕی ئاسایی بوو - لە تاراندا.

دوو کاژێری پڕ نیگەرانی و قسەوباسی دڵنەوایی ڕۆیشت. مەهتاب لێم دوورنەدەکەوتەوە، نیگایەکی غەمناك بە دەموچاوییەوە دیاربوو. هەردووکمان خەیاڵمان لای ئەو منداڵە دڵشاد و جوانە بوو، لەژێر لێوەوە ویردمان دەخوێند، کە خوا چاوی لە نێلۆفەری بچکۆلەوە بێت.

هەوڵمدا دڵنەوایی نەستەران بکەم، دەیزانی دڵسۆزیم لە ناخی دڵمەوەیە. هەستی دایکایەتی لە ناخی دڵمەوە دەهاتە دەرێ.

ڕێکەوت من و مەهتاب دوای نەستەران کەوتین بۆ بالکۆنەکە، کە بۆ ئەوە دەچوو ئاگاداربێت لە هاتنەوەی هاوسەرەکەی. ئەم جارەیان مورتەزا دەرکەوت، لە نێوان هەردوو براکەیدا بوو، کە پاکەتە کلینێکسیان بەدەستەوە بوو. نەستەران لە تاو ئازار زریکەی لێهەڵسا، یەکسەر تێگەیشت چ پەیامێکیان پێیە. پاکەتە کلینێکسەکان بۆ وشککردنەوەی فرمێسکی چاوان بوو.

نەستەران ڕایکرد بۆ دەرگای حەوشێ و پیاوەکانی لەسەر پێپلیکانەکان بینی.

*"موریدا!" "مربووە!"* مورتەزا بە چاوانی پڕ فرمێسکەوە وتی. نەستەران کەوتە سەر زەوییەکە.

زۆری نەبرد ماڵەکە پڕبوو لە کەسوکاری خەمخۆر. وەك سوننەتێك پرسەگەران بە سنگی خۆیاندا دەکێشا و دەگریان.

من، مەهتاب و مودی لەگەڵیاندا دەگریان.

هاودەردیم لەگەڵ نەستەران و مورتەزا ڕاستەقینە بوو، بەڵام کە شەوی دوورودرێژی پڕ خەفەت و گریان تێپەڕی، کەوتمە بیری ئەوەی، ئەم کارەساتە کاریگەری چی دەبێت لەسەر پلانەکەم. ڕۆژی پێنج شەممە بوو، لەگەڵ خانمی عەلاویدا وامان دانابوو، ڕۆژی یەك شەممە لە پارکەکە یەکتری ببینینەوە. ئایا دەکرێت لەو کاتەدا ئامادەبم یان هەر سەرگەرمی ئەم کارەساتە دەبین و هیچی ترمان پێناکرێت؟ دەبوو هەرچی چۆنێك بێت، تەلەفونێکەم بۆ خانمی عەلاوی و هەتا بۆ هێلین لە باڵوێزخانە. هەروەها پەرۆشی ئەوە بووم بزانـــم، چی بەسەر ئلین هاتووە.

بۆ بەیانی ڕۆژی دوایی هەموو جلی ڕەشمان لەبەرکرد بۆ بەشداری کردنی سەرقەبران لەگەڵ خێزان و کەسوکاردا. ئێلۆفەری بچکۆلە ئەو شەوە لەناو فریزەردا دایاننابوو، وە بۆ ڕۆژی دوایی دەبوو بەپێی سوننەت، دایك و باوکی لاشەکەی بشۆن، لە کاتێکدا کە کاسوکار ویردێکی تایبەت دەخوێنن. پاشان لە پارچەیەك قوماشی سپی تایبەتەوە دەیپێچن و دەیبەن بۆ گۆڕستان بۆ ناشتن.

لە ژووری نوستنەکەمان لە ماڵی مامل، کە خۆمان ئامادەدەکرد بۆ ئەو ڕۆژە غەمناکە، بە مودیم وت، "بۆچی من لە ماڵەوە نەمێنمەوە و چاودێری منداڵەکان نەکەم، کاتێك ئێوە هەمووتان دەچن بۆ گۆڕستان؟"

"نـــەء،" مودی وتی. "دەبێت تۆش لەگەڵمان بێیت."

"نامەوێت مەهتاب ئەوە ببینێت. لە ڕاستیدا زۆر باشترە لەماڵەوە بمێنمەوە و چاودێری منداڵەکان بکەم."

"نـــــەء."

بەڵام کە گەیشتینە ماڵی نەستەران و مورتەزا، لەبەرچاوی مودی و کەسوکارەکەی پێشنیارەکەم دووبارەکردەوە، هەموو پێیان باش بوو. مودی یەکسەر نەرمبوو، چونکو نیگەرانی تری زۆر بوو، سەری نەدەپەرژایە سەر من.

نەمدەوێرا بێ مۆڵەتی مودی ماڵەکە جێبهێڵم، بەڵام هەر کە خۆم تەنیا بووم و هیچ گومانێکیشم لە منداڵان نەبوو، یەکسەر دەستم دایە تەلەفون و کەوتمە قسە لەگەڵ هێلین.

"تکاتلێدەکەم وەرە بۆ لام،" هێلین وتی. "پێویستە قسەت لەگەڵ بکەم."

"ناتوانم. نزیکەی شەقامێك لە تۆوە دوورم، بەڵام ناتوانم بێم."

بیرمکردەوە، دەکرێت پاش ئەوەی گەورەکان دەگەڕێنەوە، من منداڵەکان لەگەڵ خۆم بەرمە دەرەوە بۆ پارکێك. من و هێلین پلانێکی نادڵنیامان دانا، کە کاتژمێری سێی پاش نیوەڕۆ لە پارکی نزیك باڵوێزخانە یەکتری ببینین.

نەمتوانی پەیوەندی بە خانم عەلاوییەوە بکەم، کە زۆر ناخۆش بوو. تەلەفونم بۆ ئلین کرد لە نووسینگەکەی، گفتوگۆکەمان تۆقێنەر بوو.

"هەموو شتێك بە مودی دەڵێم،" ئلین وتی. "پێیـــدەڵێم، کە تۆ لە هەوڵی هەڵهاتندایت."

"ئەوەم لەگەڵ مەکە!" لێیپاڕامەوە. "من ئەوەم لەگەڵ تۆ وت، چونکە تۆ ئەمریکاییت. من ئەوەم پێوتی، چونکو تۆ بەڵێنتپێدام، وەك نهێنییەك بیپارێزیت. بەڵێنتپێدام، کە بەهیچ کەسێکی تر نەڵێیت."

"هەموو شتێکم بە هورموز وتووە،" ئلین وتی، بەجۆرێك پەشیمانی لە دەنگیدا دەرکەوت. "بەڕاستی زۆر توڕەبوو لێم. پێیوتم، هەرگیز نزیکی باڵوێزخانە نەکەوم. هەروەها پێیوتم، کە دەبێت بە مودی بڵێم چونکو ئەوە ئەرکێکی ئیسلامیمە. ئەگەر من پێینەڵێم و شتێك لە تۆ و مەهتاب ڕوویدات، ئەوسا من گوناهم دەگات، وەك ئەوە وایە هێتکوژم. هەر دەبێت پێیبڵێم."

ترس هێزی لێبڕیم. مودی لەوانەیە بمکوژێت! بێگومان دەرگام لەسەر دادەخات و مەهتابم لێدووردەخاتەوە. ئەو تۆزە ئازادییەی کە بەدەستم هێنابوو، بۆ هەتاهەتایە لەدەستیدەدام. هەرگیز پاش ئەوە متمانەم پێناکات.

"نا، نا، تکاتلێدەکەم!" کەوتمە هەنسکدان. "تکاتلێدەکەم، پێینەڵێیت."

لەسەر تەلەفون هاوارم لە ئلین کرد. گریام، لێیپاڕامەوە و بەناوی ئەوەی ڕەچەڵەکمان یەکە، دەستبەدامێنیبووم، بەڵام لەسەر قسەی خۆی هەر سووربوو. بە ئەرکی دینی خۆیی دەزانی و دەبوو ئەنجامبدات، یەك لەسەر یەك دەیوتەوە، جیا لەوەی کە منی خۆشدەویست و پەرۆشی خۆشی و شادی من و کچەکەم بوو. دەبێت هەر بە مودی بڵێت.

"ڕێگەمەبدە، خۆم پێیبڵێم،" لە ناچاریدا وام وت. "من خۆم دەتوانم باشتر هەڵسوکەوت بکەم. خۆم دەچمە سەروکاری ئەمە."

"چاکە،" ئلین ڕازیبوو. "ماوەیەکت بۆ دادەنێم. بەڵام ئەگەر پێتنەوت، ئەوا دەبێت خۆم پێیبڵێم."

تەلەفونەکەم دانایەوە، هەستمکرد، پەتی ئیعدامی حکومەتی ئیسلام لە ملم ئاڵاوە. ئێستا دەبێت چی بکەم؟ چەند دەتوانم چاوەڕوانبم؟ تاکەی دەتوانم بەهانە بۆ ئلین بهێنمەوە، کە جارێ ڕاوەستێت؟ ئایا دەبێت بە مودی بڵێم؟ ئەوسا کاردانەوەی چۆن دەبێت؟ دارکاریم دەکات - ئەوە جێگای پرسیارنەبوو - بەڵام توڕەیی چی تری پێدەکات؟ پاش ئەوە چی؟

چەند پەشیمانبوومەوە کە زمانی خۆمم نەگرتووە، ئەو ڕازەم لای ئلین درکاندووە! بەڵام چۆن دەمتوانی پێشبینی گورزی کوشندە بکەم، نەك بەدەستی ئێرانییەك، بەڵکو بەدەستی ژنێکی ئەمریکایی لە شارەکەی خۆمەوە؟

توڕەیی و بێزاری پەنگی دەخواردەوە لەناو گیانمدا. سەیرێکی دەوروپشتی خۆمم کرد، هەمان دیمەنی ناوماڵی پیسوپۆخڵ. نەمدەزانی چی بکەم، لەتاوا کەوتمە کارکردن، لە چێشتخانەکەوە دەستمپێکرد. ناوفەرشی چێشتخانەی ئێرانی وا دروستکراوە کە بتوانیت، گسکی بدەیت و ئاوی پیدابکەیت و پیسییەکەی بە ئاوەکەوە بچێتە ناو کونی ئاوەڕۆکەوە، کە لە ناوەڕاستی ناوفەرشی چێشتخانەکەدا بوو. یەکسەر کەوتمە ئەمە، یەك لەسەر یەك

سەتڵە ناوم پیاداکرد، هەتا ناو ژێر دۆڵابە ئاسنەکانیشی گرتەوە، کە ئاسایی دایکانی ئێرانی لەبەرچاوی ناگرن. کەلەخی گەورەی سیسرکێکی زۆر لە ژێر دۆڵابەکانەوە کەوتنە سەر ناو.

هەوڵمدا بێمەوە سەرخۆم و چێشتخانەکە پاکەمەوە، بەڵام دەنگەدەنگی منداڵانم لە هۆڵەکە پشتگوێخست، کە نزیکەی پانزە منداڵ دەبوون یاریانـدەکرد.

کە تەماشای گەنجینەکەیانم کرد، بڕیارمـدا نانی ئێوارە ئامادەبکەم. نانخواردن یەکەم کاری کۆمەڵایەتی ئەو خەڵکەیە و دەمزانی، بە هەنـدێدەگرن کە نانیان بۆ ئامادەبکرێت، کاتێك ئەدگەڕێنەوە. دەبوو هەر *شتێك* ئامادەبکەم. گۆشتی گایەکی زۆرم دۆزییەوە لە ناو فرێزەرەکەدا، بڕیارمـدا *ئاسکەبابی* دروستبکەم، کە خواردنێکی ئێرانییە و مودی زۆری حەزلێبوو، ئاسایی بە گوشتی مەڕ دروستدەکرا. پیازێکی زۆرم بۆ جنی و کردمە ناو مەنجەڵەوە، لەگەڵ پارچە گۆشتی تەنك و بەهارات، بەتایبەتی کاری. بەسەر ئەوانەشدا پەتاتە، تەماتە و گوێزەرم تێکرد. لەسەر ئاگرێکی هێواش کوڵاندم، بۆنی خۆشی چێشت بەناو ماڵەکەدا بڵاوبۆوە.

لە نیگەرانیـدا دەنگی دڵم دەهات، بەڵام ئەنجامدانی ئەو کارە ئاشنایانە، یارمەتیدام ورە بەرنەدەم. مردنی جەرگبڕانەی نیلوفەر، چەند ڕۆژی بەنرخی بۆ من کڕییەوە. لە ماوەی پرسەکەدا، مودی هیچ پەیوەنـدییەکی بە ئلین و هورمزەوە نەبوو. بۆم دەرکەوت، باشترین شت ئەوەیە، ئەوپەڕی هەوڵبدەم هەلومەرجەکە ڕاگرم، بەهیوای ئەوەی بەڵکو خانم عەلاوی موعجیزەیەك بنێتەوە، پێشئەوەی ناپاکی ئلین فەمیرانێك بنێتەوە.

بیتی خۆت سەرگەرمبکە، فەرمانمدا بەسەرخۆمـدا.

کە خەڵکەکە گەڕانەوە، خەریکی لێنانی نۆك بووم بە شێوەی لوبنانی، کە ئەو جۆرە لێنانەم لا پەسەند بوو. "ناتوانی بەو شێوەیە لێبنێیت. ئێمە بەو شێوەیە نایکەین،" فریشتە وتی، کاتێك بینی نۆك و پیاز تێکەڵدەکەم.

"وازمـلێبێنە، ئەوە شێوەی منە،" وەڵامـدایەوە.

"چاکە، هیـچ کەسێك نایخوات."

فریشتە بە هەڵەدا چوو. چیم لێنابوو، خێڵەکە خواردیان و ستایشیشیانـکردم. بێگومان پێمـخۆشبوو ستایشیانکردم و مودیش ناچاربوو شانازیم پێوە بکات، بەڵام من لەگەڵ زەحمەتەکانی خۆم مەبەستێکی ترم هەبوو. دەمزانی ئەو هەفتەیەی لە پێشمانە پڕیەتی لە ئەرکی پرسەگرتن، کە کاتێکی زۆر لە گەورەکان دەبات، منیش دەمویست جێگای خۆم وەك ژنێکی ماڵەوە، چاودێری منداڵان، چێشتکەر و پاککەرەوە، قایمبکەم. پاش ئەو ژەمە خواردنە، هەموو لەگەڵ ئەوەدا بوون، من ئەو کارانە لە ئەستۆبگرم.

ئەو نیوەڕۆیە نزیکی کاتژمێری سێ، کاتێك پێشنیارمکرد منداڵان بەرمە دەرەوە بۆ پارکێکی نزیك، هەموو پێیانباشبوو. بەڵام بۆ ئەگبەتی من، مەجید دوامانکەوت، کە هەمیشە پێیخۆشبوو لەگەڵ منداڵاندا یاریبکات. هێلینم لە دوورەوە بینی، بەدزییەوە

سەرێکی بۆ لەقاندم. بۆ ماوەیەك بەلایەکی چاو تەماشایکردین، بەڵام نەیوێرا نزیکمان بکەوێتەوە.

ئەو هەفتەیەمان وردەوردە دەبردەسەر. نەمدەتوانی دووبارە تەلەفونەکە بەکاربهێنمەوە، چونکو هەمیشە یەك دووانێك چەند هۆیەکیان دەدۆزییەوە، بۆئەوەی لە ماڵەوە بن لەگەڵ من و منداڵەکان. خۆشحاڵبووم کاتێك مودی پێیوتم، پرسە ڕۆژی هەینی تەواودەبێت، کە پاش ئەوە دەبوو بە ڕۆژی شەممە - ڕۆژێك پێش بینینی خانم عەلاوی - ڕۆژی گەڕانەوەی مەهتاب بۆ قوتابخانە.

مودی مەزاجی لە جێگای خۆیدا نەبوو. کە داخ و خەفەتی نێلوفەر دوورکەوتەوە، بیروهۆشی چەقبۆوە لەسەر گرفتەکانی خۆی. لە نیگایدا دیاربوو، بەرەو ئەوە دەچێت کەللەیی ببێت. ئەمەم لەوەوپیش لێدیبوو، بۆم ترسناك بوو. نەمدەتوانی هاوسەنگی خۆم ڕاگرم و تۆزێکی مابوو ترس لە پەلوپۆم بخات. هەندێك جار دەهاتمە سەر ئەو باوەڕەی، کە ئلین هەموو شتێکی پێوتووە، زۆر جاریش لێکمدەدایەوە، کە مودی ئەوەندە گرفت هەیە، بەسە بۆئەوەی شێت ببێت.

ڕۆژی شەممە کە خۆمان ئامادەدەکرد بۆ قوتابخانە، مودی تەواو باری دەروونی خراپ بوو. نەیدەویست بۆ ساتێك لەچاوی بەدووربین، لەگەڵمان ڕێکەوت بۆ قوتابخانە. کاتێك کە نێمەی بەرەو شەقامەکە دەبرد، ئاگری دەکردەوە و خەریکبوو کونترۆڵی خۆی لەدەستدەدا، پاشان بە ڕەقی پاڵی پێوە ناین بۆ ناو تەکسی. من و مەهتاب بەترسەوە تەماشایەکی یەکتریمان کرد، دەمزانی ئێستا نا تۆزێکی تر دەتەقێتەوە.

لە قوتابخانە مودی لەبەرچاوی مەهتاب پێیوتم، "لێـــرە جێیبهێڵە. بـــا فێرببێت خۆی بمێنێتەوە. بیبە بۆ پۆلەکەی، جێیـــبهێڵە و لەگەڵم وەرەوە بۆ ماڵەوە."

مەهتاب قیژاندی و توند دامێنی پاڵتۆکەی گرتم. تەمەنی پێنج ساڵ بوو، نەیدەزانی چی بکات بەدەست ئەم دوو مەترسییەوە کە بۆی هاتۆتە پێشەوە، لەلایەك باوکی توڕەیە و لەلایەکی تردوە دایکی جێیـدەهێڵێت.

"مەهتاب تۆ دەبێت ئازا بیت،" خێرا وتم. هەوڵمدا بە نەرمی قسەی لەگەڵ بکەم، بەڵام هەستمکرد دەنگم دەلەرزێت. "وەرە با بتبەم بۆ پۆلەکەت. هەموو شتێك باش دەبێت. بۆ نیوەڕۆ دێمەوە بۆ لات." مەهتاب یەکسەر نەرمبوو، بەناو داڵانەکەدا دوامـکەوت. بەڵام هەرئەوەندە لە پۆلەکەی نزیکبۆوە، لە باوکە توڕەکەی دوورکەوتەوە و خەریکبوو جێمدەهێشت، لچی هەڵهێنایەوە و کەوتە نوکەنوك. هەرکە گەیشتینە پۆلەکەی، لە ترساندا بەکوڵ کەوتە گریان، وەك یەکەم ڕۆژ و دووەم ڕۆژی قوتابخانەی، پێشنەوەی دەستبکەم بەمانەوە لەگەڵی.

"مەهتابـ" لێیپاڕامەوە. "دەبێت خۆت ئارامبکەیتەوە. باوکت زۆر توڕەیە."

وشەکانم بوو بەژێر زریکەزریکی مەهتابەوە. بەدەستێکی توند منی گرتبوو، بەدەستەکەی تری پاڵی بە مامۆستاکەیەوە دەنا دوورکەوێتەوە.

"مەهتابە!" هاوارمـلێکرد. "تکات ..."

لەپڕ تەواوی کچانی پۆلەکە لێمانکۆبوونەوە و لە سەرسامی و هەراسانیدا کەوتنە دەنگەدەنگ. هەموویان وەك یەك دەستیان بە سەرپۆشەکەی سەریانەوە گرتبوو، بۆ دڵنیایی لەوەی باش سەریان داپۆشیوە. پیاوێك هاتبوو حەشارگاکەیانەوە!

سەرم بەرزکردەوە مودیم بینی، بەسەرمانەوە تەماشایدەکردین، چاوانی دەرپۆقیبوو، وەك خوێن سووربووبوون. بۆ بەتاڵکردنەوەی داخی دڵی خۆی، دەستی بەرزکردەوە و زرمەی لێهەڵساندین. قین و تووڕەیی لە چاوانیدا پڕیشکیـــــدەدا.

# 13

مودی پەلی مەھتابی گرت و کەوتە تێهەڵدانی. ڕووی وەرگێڕا بەرەو خۆی و بەقایم زللەیەکی لێدا.

"نـــا!" هاوارم لێکرد. "لێینەدەیت!"

مەھتاب لەتاو ئازار و سەرسامی زریکەی لێهەڵسا، بەڵام توانی خۆی لەژێر چنگی باوکی ڕزگاربکات و دەست بە قەراغی پاڵتۆکەی منەوە بگرێتەوە. هەوڵمدا خۆم بخەمە نێوانیانەوە، بەڵام ئەو لە هەر دووکمان بەهێزتر بوو. بۆ چەند جاری تر زرمەی لەو نیشانە بچوکە هەڵساند، بە قۆڵی و پشتیدا کێشا. هەر پیاکێشانێك زریکەی ترسی مەھتابی زۆردەکرد.

پەلی مەھتابم ڕاکێشا، تا لەژێر چنگی دەریبهێنم. بەدەستی چەپی مەھتابی خستەلاوە و کێشای بە دیوارەکەدا. خانم شەهێن و باقی مامۆستاکانی تر هاتن و بازنەیەکی پارێزگاریان بە دەوری مەھتابدا دروستکرد. مەھتاب ویستی بازنەکە بشکێنێت و ڕاکات، بەڵام مامۆستاکان نەیانهێشت.

تووڕەیی مودی یەکسەر نیشانەیەکی تازەی کرد بە مەبەست. بە دەستی ڕاستی، بۆکسێکی کێشا بە لای سەرمدا و هاوسەنگیم تێکچوو بۆ دواوە، خەریکبوو بکەوم.

"هەر دەتکوژم!" بە ئینگلیزی هاواری لێکردم، چاوی لێنەدەتروکاندم. توند مەچەکی گرتم و ڕووی پڕ ڤین و تووڕەی لە من وەرگێڕا بەرەو مامۆستاکان و ڕوو بە خانم شەهێن بەهێواشی و داخلەدڵانە یەك لەسەر یەك دەیوت، "دەیــــکوژم." ویستم بەرگرییەك لەخۆم پیشانبدەم، بەڵام بەهۆی کاریگەری بۆکسەوە، زۆر لەوە وڕتر بووم کە بتوانم لە ژێر دەستی دەربچم. لە ڕوویەکی ترەوە، لە ڕاستیدا خۆشحاڵبووم، کە داری ڕق و ڤینەی لەسەری مندا شکاندەوە. بڕیارمدا لەگەڵی بڕۆم، تا لە مەھتابی دووربخەمەوە. دەی ئەمە باشە، لە دڵی خۆمدا وتم، هەر ئەوەندە لە مەھتاب دووربێت. هەر ئەوەندەی بکەوێتە سەروگوێلاکی من، ئەو لە مەترسیدا نابێت.

لەپڕ مەھتاب خۆی لە بازنەی مامۆستاکان ڕزگارکرد، هات بە هانای منەوە و کەوتە ڕاکێشانی قەراغی پاڵتۆکەم.

"مەھتاب نیگەران مەبە،" بەدەم هەنسکدانەوە وتم. "دەگەڕێمەوە بۆ لات. وازمانلێبێنە. جێمانبهێڵە!"

خانم شەهێن هاتەپێشەوە و مەھتابی بە هەردوو قۆلییەوە لە باوەشگرت. مامۆستاکانی تر چوونە کەنارەوە، ڕێگایان بۆ من و مودی کردەوە تا بڕۆین. ئەو هەموو ژنە پێکەوە، لەبەرامبەر دەستوەشاندنی پیاوێکی تەنیای تووڕەدا، هیچیان لە بارەدا نەبوو. زریکەی مەھتاب لە ترساندا زیاتر دەبوو، کاتێك مودی لە پۆلەکەوە منی ڕادەکێشا بەناو

ڕاڕەوەکەدا بۆ دەرەوە بۆ سەر شەقامەکە. وڕ، ئازار و ترس بووبووم، زەندەقم چووبوو، ئاخۆ مودی چیم لێدەکات. ئایا بەڕاستی دەمکوژێت؟ ئەگەر گیانبەدەربەرم، چی بەسەر مەهتاب دەهێنێت؟ ئایا دووبارە دەیبینمەوە؟

لەدەرەوە لەسەر شەقامەکە هاواریکرد، "*موستەقیم*!" بۆ تەکسییەك کە خەریکبوو نزیکدەبۆوە. "ڕێك بۆ پێشەوە!"

تەکسییەکە بۆمان ڕاوەستا. مودی دەرگای پیشتەوەی کردەوە و بەقایم پاڵی پێوەنام بۆ ناوەوە. چوار پێنج ڕێبوار دانیشتبوون، لەبەرئەوە مودی چووە پێشەوە. کە تەکسییەکە کەوتەوە ڕێ، هەر لەبەرچاوی ئەو ڕێبوارانە، مودی ئاوڕی بۆ داماوە و کەوتە شاتەشات، "ئەوەندە کەسێکی خراپیت، بێزاربووم بەدەستەوە. هەر دەتکوژم! ئیمڕۆ هەر دەتکوژم!"

بۆ چەند خولەك بەم شێوەیە بەردەوامبوو، تا لە کۆتاییدا تورەیم سەرڕێژیکرد بەسەر ترس و فرمێسکڕشتندا، بە کەڵك وەرگرتن بە بوونمان لە ناو تەکسییەکەدا، کەوتمە قسە.

"ئاوا؟" بەترسەوە وەڵامدایەوە. "بەس پێمبڵێ، چۆن دەمکوژیت."

"بە چەقۆیەکی گەورە. پارچەپارچەت دەکەم. لووت و گوێت دەنێرمەوە بۆ کەسوکارت. هەرگیز چاویان بە تۆ ناکەوێتەوە. خۆڵەمێشی ئاڵا ئەمریکا لەگەڵ دارەمەیتەکەت دەنێرمەوە بۆیان."

ترس خراپتر دایگرتمەوە. بۆچی وا تورەیدەکەم؟ ئەو بۆخۆی تورەیە و کەس نازانێت چی لەدەست دەقەومێت. هەڕەشەکانی تەواو ترساندمی. دەمزانی، شێتێتی لە ئاستێکدایە، ئەوەی دەیڵێت لەدەستیدێت.

لەسەر هەڕەشە و هاتوهاوار و سوێندخواردنی خۆی بەردەوامبوو. ئەمدەوێرا ئیتر وەڵامیبدەمەوە. ئاواتەخوازبووم، ڕق و تورەیی بە وشە بداتە دەرەوە تا ئەوەی بە کردەوە.

تەکسییەکە بەڕێوە بوو، بەڵام نەك بەرەو ماڵەوە، بەڵکو بەرەو خەستەخانەکەی مودی. وردەوردە بێدەنگبوو، کەوتە بیری ئەوەی هەنگاوی داهاتوو چی بکات.

کاتێك تەکسییەکە لەناو ترافیکدا گیریکرد، مودی ئاوڕی بۆ دامەوە و هاواریکرد، "بۆ دەرەوە!"

"نامەوێت دابەزم،" یەکسەر وتم.

"دەڵێم بۆ دەرەوە!" هاواریکرد. دەستێکی درێژکرد بۆ دەسکی دەرگاکە و کردییەوە. بە دەستەکەی تریشی پاڵی پێوەنام بۆ دەرەوە، کە هەنگاوم نا، خەریکبوو بکەومە سەر شەقامەکە. سەرسامی گرتمی، کە مودی هەروا لەناو تەکسییەکەدا مایەوە. بەرلەوەی بزانم چی ڕوودەدات، دەرگاکەی دایەوە بە یەکدا و تەکسییەکە بە مودییەوە کەوتەوە ڕێ.

خەڵکێکی زۆر لەو ناوە بوون، ڕاکەڕاکەیان بوو بەدوای کاروباری خۆیانەوە. هەستی تەنیاییەك دایگرتم، کە هەرگیز بەخۆمەوە نەمدیبوو. مەهتاب یەکەم شت بوو هات بە

خەیاڵمدا. ئایا دەگەڕێتەوە بۆ قوتابخانە بۆ هەڵگرتنی، بۆ ئازاردانی، بیبات و دووریخاتەوە لە من؟ نــــا، زانیم، بەرەو خەستەخانە ڕۆیشت.

دەمزانی بۆ نیوەڕۆ دەچێتەوە بۆ قوتابخانە بەدوای مەهتابدا، نەك پێش ئەوە. چەند کاژێرێکم بەدەستەوە بوو تا هەوڵێك بدەم.

تەلەفونێك بدۆزمەوە! لە دڵی خۆمدا وتم. تەلەفون بۆ هێلین بکەم. تەلەفون بۆ پۆلیس بکەم. تەلەفون بۆ هەر کەسێك بکەم بۆ کۆتاییهێنان بەم پشێوییە.

تەلەفونم لە هیچ شوێنێك چنگنەکەوت. فرمێسك ڕووسەرییەکەمی تەڕکرد، بۆ چەند خولەك بەو ناوەدا هاتوچۆمبوو، بەبێ ئەوەی بزانم چی دەکەم، تا بۆم دەرکەوت لە کوێدا لە تەکسییەکە هاتوومەتە خوارەوە. چەند کۆڵانێك لە ماڵی ئلینەوە دووربووم. گوڕمدایە خۆم و ڕامکرد، بە هیوای ئەوەی ئلین لە ماڵەوە بێت، هەروەها هورموز، بەڵام پاڵتۆکەم ڕێگای قاچ هەڵهێنانەوەی زیاتری پێنەدەدام. ئەگەر نەتوانم بە باڵوێزخانەوە پەیوەندیبکەم، دەبوو متمانە بە ئلین و هورموز بکەم! هەر دەبوو متمانە بە یەکێك بکەم!

کاتێك نزیکی ماڵی ئلین کەوتمەوە، ئەو دوکانەم بیرکەوتەوە کە لێوەی تەلەفونیانەدەکرد. هەتمە سەر ئەو باوەڕەی، لەهێش هەموو شتێکدا تەلەفون بۆ باڵوێزخانە بکەم. خێرا بە بەردەمی ماڵی ئلیندا تێپەریم بەرەو دوکانەکە، هەوڵمدا خۆم ئارامکەمەوە تا نەبمە جێگای گومان. خۆم کرد بە دوکانەکەدا، چەند توانیم بە ئارامی بۆم باسکرد، کە من هاوڕێی ئلینم و دەمەوێت تەلەفونبکەم. دوکاندارەکە ڕازیبوو.

هەر ئەوەندە هێلین هاتە سەر خەت، قوڕگم پڕبوو لە گریان، پێم وت "تکاتـلێدەکەم یارمەتیمـبدە. دەبێت یارمەتیمـبدەیت."

"ئارامبەرەوە،" هێلین وتی. "پێمـبڵێ، چی ڕوویداوە."

ئەو بەزمەی بەسەرم هاتبوو، بۆم گێڕایەوە.

"نا، ناتکوژێت،" هێلین دڵنیایکردم. "لەوەوپێشیش هەر ئەمەی وتووە."

"نــا، ئەمە یەکەم جارییەتی بەڵام بەڕاستێتی. هەر ئیمرۆ دەیکات. تکاتـلێدەکەم دەبێت بمـبینیت. وەرە."

"دەتوانی بێیت بۆ باڵوێزخانە؟" هێلین پرسیاریکرد.

لێکمـدایەوە، ئەمدەتوانی ئەو هاتوچۆ درێژە بکەم بۆ باڵوێزخانە و بۆ نیوەڕۆش فریابکەم بگەمە لای مەهتاب لە قوتابخانە. دەبوو لەوێ بم بۆ پاراستنی مەهتاب، سەرەڕای مەترسییەك کە لەسەر خۆم هەبوو. "نــا، ناتوانم بێم بۆ باڵوێزخانە،" وەڵامەدایەوە. دەمزانی، هێلین دنیایەك کاری خەڵکانی بیانی بەسەرەیەوە، هەر یەکەیان بۆخۆی بەسەرهاتێکی ناخۆشی دەردناکی هەیە. کاتی نەبوو، تا ئاستێکی زۆر نەیدەتوانی کار بەجێبهێڵێت. بەڵام ئێستا من پێویستم پێیبوو. "دەبێت بێیت بۆ لام!" گریام.

"دەی باشە، لە کوێ؟"

"لە قوتابخانەی مەهتاب."

"باشە."

خێرا کەوتمە ڕێ بەرەو شەقامی سەرەکی، تا تەکسییەکی پرتەقاڵی بگرم. فرمێسک بە چاوانمدا دەهاتە خوارەوە، وا دەرۆیشتم قۆڵم بەر کەسانێک دەکەوت کە بەلامدا تێدەپەڕین. بە بەردەمی ماڵی ئلیندا ڕۆشتم، ڕێکەوت لەو کاتەدا هورموز لە پەنجەرەی کراوەی نهۆمی دووەمەوە تەماشای دەرەوەی دەکرد. "بیتیی!" بانگیکردم. "بۆ کوێ دەچیت؟"

"بۆ هیچ شوێنێك. من باشم. وازملێبهێنن."

هورموز لە دەنگمدا ترسی بەدیکرد. لە ماڵ هاتە دەرەوە و دوامکەوت، بە ئاسانی لە نیوە ڕێگادا منی گرت. "چی بووە؟" پرسیاری لێکردم.

"بەس وازم لێبێنە،" بەدەم هەنسکدانەوە وتم.

"نـــا. تەنیا جێتناهێڵین. چی ڕوویداوە؟"

"هیچ. دەبێت بڕۆم."

"وەرە ماڵەوە،" هورموز داوایکرد.

"نـــا، ناتوانم. دەبێت بچم بۆ قوتابخانەی مەهتاب."

"وەرە ماڵەوە،" هورموز بەڕێزانە دووبارەیکردەوە. "چی بووە، قسەمان بۆ بکە. پاشان دەتبەین بۆ قوتابخانە."

"نـــا. تەلەفونم بۆ باڵوێزخانە کردووە و هەندێك کەس لەوێوە دێن بۆ بینینم لە قوتابخانە."

هورموز ئەمەی بە سوکایەتی زانی. "بۆچی تەلەفونت بۆ باڵوێزخانە کردووە؟ تۆ هیچ کارێکت بەوانەوە نییە تا تەلەفون بۆ باڵوێزخانە بکەیت. خۆت بەدووربگرە لەوان. ئەوان ناتوانن هیچ یارمەتییەکی تۆ بکەن."

بە هەنسکەهەنسك وەڵامەدایەوە.

"هەڵەیەکی گەورە دەکەیت،" هورموز ئامۆژگاریکردم. "بەڕاستی خۆت توشی گرفت دەکەیت لەگەڵ مودیدا بە تەلەفونکردن بۆ باڵوێزخانە."

"من دەڕۆم،" وتم. "من دەچم بۆ قوتابخانەی مەهتاب."

کە هورموز زانی، لەسەر قسەی خۆم سوورم و هەر دەبێت بچم بۆ لای کچەکەم، لە کۆتاییدا وتی، "ڕێگەمانبدە با بتگەیەنین. من و ئلین بە ئوتومبیل دەتبەین."

"باشە بەڵێ،" وتم. "هەر ئێستا."

قوتابخانە شلۆق بوو. خانم شەهێن وتی، کە مەهتاب لە پۆلەکەیەتی، غەمناکە بەڵام بێدەنگە. پێشنیاریکرد و منیش قبووڵمکرد، کە جارێ وازیلێبهێنین و نەچین بە لایدا. ئلین و هورموز بۆ چەند خولەك لەگەڵ بەڕێوەبەر کەوتنەقسە، لە وردەکاری بەسەرهاتەکەم زیاتر ئاگاداربوونەوە. هورموز دڵتەنگ و نیگەران دیاربوو. حەزینەدەکرد

گوێبیستی کاری شێتانەی مودی بێت، پێی خۆشنەبوو بە ئازارەوە بمبینێت. بەدوای ڕێگایەکەوە بوو کۆتایی بەم قەیرانە بێنێت، بەبێ مەترسییەکی زیاتر.

پاش ماوەیەک خانم ئازەر خێرا هات بۆ لام و پێیوتم، "هەندێک کەس لەدەرەوە چاوەڕوانی تۆ دەکەن."

"کێــــن؟" خانم شەهێن بەگومانەوە پرسیاریکرد.

هورموز شتێکی بە فارسی وت، بەڕێوەبەر ڕەش داگیرسا. نەیدەویست فەرمانبەرانی باڵوێزخانەی سویسرا خۆیان هەڵقورتێنن لەمەدا. سەرەڕای گرژبوونی، بەڵام من بە تەنیا چوومە دەرەوە بۆ گفتگۆ لەگەڵیان.

هێلین و میستەر ڤینکوپ لەدەرەوەی ڤوتابخانە چاوەڕوانم بوون. ڕێنوێنیانکردم بەرەو دەرگای دواوەی ئوتومبیلێک، کە هیچ نیشانەیەکی ماشێنی باڵوێزخانەی پێوە نەبوو. لەناو ئوتومبیلەکەدا، ئەوەی بەسەرم هاتبوو بۆم گێرانەوە.

"دەتبەین بۆ پۆلیس،" میستەر ڤینکوپ وتی.

پۆلیـــــس! زۆرم بیر لەم ڕێگایە کردبۆوە و هەر جارێک تاوتوێمدەکرد، ڕەتمدەکردەوە. پۆلیس، پۆلیسی ئێرانی بێت و بەڕێوەبەری یاسای ئێرانی. هەر بەپێی ئەو یاسانە، مودی فەرمانڕەوای خێزانەکەی بوو. لەوانەبوو لە چەند ڕووەوە یارمەتیدەر بوایە، بەڵام لە ئاکامەکانی دەترسام. دەسەڵاتی ئەوەیان هەبوو "دیپۆرتمکەن، بەبێ کچەکەم زۆرملێبکەن، وڵاتەکە جێبهێڵم. مەهتاب بۆ هەتاهەتایە دەکەوتە داوی ئەم وڵاتە شێت و باوکە ئەقڵ لەدەستچووەکەیەوە. بەڵام لەو کاتەدا وا دەردەکەوت پۆلیس، تەنیا ڕێگا بێت. کە ئەو فەرتەنەیەی بەیانیم دەهێنایەوە بەرچاوی خۆم، زیاتر دەهاتمە سەر ئەو باوەڕەی، کە مودی هەڕەشەکانی پیادەدەکات. ترسم لە مەهتاب نیشتبوو، هەروەها لە خۆشم.

"باشە،" وتم. "دەچم بۆ پۆلیس. بەڵام لەپێشدا دەبێت بچم مەهتاب بهێنم."

گەڕامەوە بۆ ناو ڤوتابخانە، لەوێ هێشتا ئلین و هورموز لە گفتوگۆدا بوون لەگەڵ خانم شەهێن.

"ئێستا دەچم مەهتاب دەبەم،" وتم.

خانم ئازەر ئەمەی منی ڕاگەیاند و وەڵامی خانم شەهێنیشی بۆ وەرگێڕام. کە گوێبیستی قسەکان بوو، کاردانەوەکان سامناک بوون، بەڕێوەبەر نەک هەر توڕەبوو، بەڵکو هەڵوێستی بەتەواوی گۆڕا. بۆ چەند مانگ دەچوو، بە تایبەتی ئەم بەیانییە، لە شەڕ و کێشەمدا لایەنی منی گرتبوو لە بەرامبەر هاوسەرەکەمدا. بەڵام ئێستا بە هێنانی فەرمانبەرانی بەشی بەرژەوەندی یونێس بۆ ڤوتابخانەکەی، تاوانێکم کردووە کە شایەنی لێبوردن نەبوو. بەناو فەرمانبەرانی باڵوێزخانەی سویسرا بوون، بەڵام نوێنەرایەتی ئەمریکایان دەکرد. پیشەکەی خانم شەهێن بیرکردنەوە، فێرکردن و بڵاوکردنەوەی پروپاگەندەی دژی ئەمریکایی بوو. بەهۆی ئەو بیروباوەڕە سیاسییە توندڕەوەوە، ئەو پایەیەی پێدرابوو.

خانم شەهێن وتی، "ئێمە ناتوانین مەهتابت پێبدەین. ئەمە یاسای ئیسلامییە. ئێرە قوتابخانەیەکی ئیسلامییە و ئێمە دەبێت پابەندی یاسا بین، بەپێی یاساش منداڵ منداڵی باوکە. لەم هەلومەرجەدا ئێمە بە هیچ جۆرێك ناتوانین ئەو منداڵە بە تۆ بدەین."

"دەبێت،" قیژاندم. "ئازاری کچەکە دەدات."

خانم شەهێن زیاتر شێتگیربوو. "نـــا،" وتی و ئەمەشی پێزیادکرد، "ئەدەبوو کەسانی باڵوێزخانە بهێنیت بۆ ئێرە."

"دەی باشە، تۆ لەگەڵ من و مەهتاب دێیت بۆ لای پۆلیس؟ کەس هەیە لە قوتابخانەوە بێت لەگەڵمان؟"

"نـــــا،" خانم شەهێن وەڵامیدایەوە. "ئێمە هیچ شتێك نازانین."

"ئەی لەبەرچاوی ئێوە، پێینەوتم دەتکوژم!"

"ئێمە هیچ شتێك نازانین،" بەڕێوەبەر دووبارەیکردەوە.

سەیرێکی دەوری خۆمم کرد، چاوم چووە سەر خانم مەتەوی، کە یەکێك بوو لە قوتابییە زیرەکەکانم لە ئینگلیزیدا. "تۆ دەڵێیت چی؟" پرسیارملێکرد. "بیستت، ئەوەی وت."

"بەڵێ،" وەڵامیدایەوە. "بیستم، ئەوەی وت."

"لەگەڵم دێیت بۆ لای پۆلیس؟"

خانم مەتەوی خێرا سەیرێکی بەڕێوەبەری کرد، کە بەسەر بەرزکردنەوە و زمانگەستنێکی خۆی، ئەمێکی پێوت.

"لە کاتی قوتابخانەدا ناتوانم،" خانم مەتەوی وتی. "بەڵام پاش تەواوبوونی قوتابخانە، دێم لەگەڵت بۆ لای پۆلیس و پێیانـدەڵێم، کە پێیوتویت دەتکوژم."

خانم شەهێن ناوچەوانی گرژکرد لەم بێگوێییە.

بێئومێد لە هەموو شتێك، پەککەوتووی ترس و بێزاری لە یاسای ئیسلامی کە نکولی لەوە دەکات، کچ کچی من بێت. دەست لە ئەژنۆ درێژتر گەڕامەوە بۆ ناو ئوتومبیلەکەی باڵوێزخانە.

"مەهتابم نادەنێ،" دەستمکرد بە گریان. "هەروەها لەگەڵم نایەن بۆ لای پۆلیس."

"بەتەمایت چی بکەیت؟" هێلین پرسیاریکرد.

"نازانـــــم،" وەڵاممدایەوە. وشەی "پۆلیس" و "یاسای ئیسلامی" وڕیـکردبووم. ئەگەر کاریگەری یاسای ئیسلامی ئەمە بوو بەسەر خانم شەهێنەوە، دەبوو چاوەڕوانی چ لایەنگرییەکم بکردایە لە پۆلیس؟ ئینجا ئەوان پیاویش بوون. ئیتر لەوە دڵنیابووم، کە چوونە لای پۆلیس بەواتای لەدەستدانی مەهتاب دێت بەیەکجاری. ئەمدەتوانی ئەو ڕێگایە بگرم، هەتا ئەگەر ژیانیشم بکەوتایەتە مەترسییەوە. ئایا دەمتوانی ئەو چاوەڕوانییەم هەبێت، کە مودی ئارام دەبێتەوە و ئەو هەڕەشەیەی کردویەتی نایباتەسەر، کە تا چەند ڕۆژی تریش بژیم؟ ئایا ڕێگای تر هەبوو بیگرمەبەر؟

هێلین و ڤینکوپ هەوڵیاندا، یارمەتیمبدەن کە ژیرانە بیرکەمەوە. لە ترسی چوونم بۆ لای پۆلیس تێدەگەیشتن. هەروەها ترسیان لە من و لەو کچە پێنج ساڵە بێتاوانەدا هەبوو لەناو ئەو گێژاوە پڕ کێشەدا.

بیرمکردەوە و باسی پەیوەندیم بە خانمی عەلاوییەوە کرد، کە پلانی ئەوەی دانەوە، براکەی من و مەهتاب بە قاچاغی بەرێت بۆ سنووری پاکستان.

"بەم زووانە ئەمە دەکرێت،" پێموتن. "پێشبینیدەکەم، دەبێت ڕاوەستین و ببینین چۆن دەچێتە پێشەوە. لەوانەیە بەم شێوەیە، بتوانین لەم وڵاتە بچینە دەرەوە."

"تۆ شێتی،" هێلین دڵسۆزانە وتی. "بچۆ بۆ لای پۆلیس. لەو ڕێگایەوە دەرچۆ لەم وڵاتە. مەهتاب لێرە جێبهێڵە."

"هـــەرگیز نـــا،" بە ڕەقییەکەوە وتم، بۆ جارێکی تریش هێلین سەرسامیکردمەوە بە بۆچوونی بێهەستانەی. هێلین کەسێکی بەڕێز بوو، مەبەستی نەبوو بریندارمبکات. بیرمەێت، ژنێکی ئێرانی بوو، بە ڕەگەز ئەرمەنی. بۆ خۆی بیروبۆچوونێکی فەلسەفی جیاوازی هەبوو لەگەڵ من. لە لای ئەو باوك خاوەنی منداڵ بوو. ئاسایی نەیدەتوانی لە غەریزەی دایکایەتی من تێبگات.

"نـــەء. ئەگەر ئەوە بکەم، هەرگیز مەهتاب نابینمەوە."

فەرمانبەرانی باڵویزخانە هەناسەیەکی قوڵیان هەڵکێشا. "زۆر باشە،" ڤینکوپ وتی. "لە ئێستادا هیچمان لەوە زیاتر لەدەستنایەت بۆت بکەین. لەوانەیە پێویستبێت لەگەڵ هاوڕێکانت قسەبکەین."

چووم ئلین و هورموزم هێنا.

"دەتوانن یارمەتیـبدەن؟" ڤینکوپ پرسیاریکرد.

"بەڵـــێ،" هورموز وەڵامیدایەوە. "تەنیا جێیناهێڵین. لەگەڵی دەمێنینەوە تا مودی دێت. بیتی و مەهتاب دەبەین بۆ ماڵی خۆمان و دڵنیایاندەکەین کە پارێزراون. لە ماڵی خۆمان دەیانهێڵینەوە تا ئەم کێشەیە تەواودەبێت."

ناوێك کرا بە ئاگردا. هورموز و ئلین، بە شێوەی ئێرانی خۆیان، دەیانویست یارمەتیـبدەن. هێلین و ڤینکوپ هەردووکیان ژمارەی تەلەفونی ماڵەوەی خۆیان پێدام و داوایان لێکردم هەر گرفتێکی تر هاتەپێشەوە دەستبەجێ پەیوەندیان پێوە بکەم، پاشان سواری ئوتومبیلەکەیان بوون و ڕۆیشتن.

لەگەڵ هورموز و ئلین لە ناو ئوتومبیلەکەیان دانیشتین و چاوەڕوانی هاتنی مودیمان کرد. لە گفتوگۆیەکدا هورموز وتی، "ئێمە بڕیارمانداوە، سەرەڕای ئەوەی ئەرکێکی ئیسلامیمانە، کە لە ئێستادا باسی خەڵکانی باڵوێزخانە و پلانەکانت نەکەین بۆ مودی. بەڵام دەبێت بەڵێنمان پێبدەیت کۆتایی بەمە بهێنیت، بەڵێنمان پێبدەیت هیچ هەوڵێکی تر نەدەیت."

"سوپاستاندەکەم،" لەژێر لێوەوە وتم. "بەڵێندەدەم لە ئێراندا بمێنمەوە، ئەگەر بتوانم لەگەڵ مەهتابدا بم. بەڵێندەدەم هەوڵی هەڵهاتن نەدەم."

دەبوو بۆ ئەمە سوێند بە قورئان بخۆم.

کەمێکی مابوو بۆ نیوەڕۆ، تەکسییەك لەبەردەمی قوتابخانەدا ڕاوەستا، مودی دەرکەوت. یەکسەر سەرنجیدا، ئێمە لەناو ئوتومبیلەکەی هورموزدا دانیشتوین.

"بۆچی ئەمانەت کێشکردووە بۆ ئێرە؟" بەسەرمدا نەڕاندی.

"ئەو ئێمەی کێشنەکردووە،" هورموز قسەی پێبڕی. "ئەو نەیدەویست ئێمە بێین، بەڵام ئێمە هەر پێمانداگرت."

"ئەمە ڕاست نییە،" مودی وەڵامیدایەوە. "چووە و ئێوەی هێناوە. ئێوەی کێشاوەتە کێشەی نێوخۆمانەوە."

هورموز لە بەرامبەریدا ڕاوەستایەوە، وەك مامل و ڕەزا نەبوو، کە نەیاندەوێرا قسەی *دایی جون* بشکێنن. گەنجتر، بەهێزتر زۆر بەخۆوەتر بوو، دەیزانی چی دەکات، ئەگەر مودی پێی لە بەرەکەی خۆی درێژتر بکات، وە مودیش ئەوەی دەزانی. بەڵام هورموز ژیرانەتر لێی چووە پێشەوە.

"با بچین مەهتاب بهێنین و بگەڕێینەوە بۆ ماڵی خۆمان و لەوێ لەسەر ئەمە قسەبکەین،" هورموز پێشنیاریکرد.

مودی هەلومەرجەکەی لێکدایەوە، منی بینی لەو ساتەدا پارێزگاریم لێدەکرێت لە لایەن هورموز و ئلینەوە، ملیدا بە پێشنیارەکە.

ئەو دوا نیوەڕۆیەمان لەوێ بردەسەر، مەهتاب لە باوەشمدا خۆی گرمۆڵەکردبوو، بە هەر دوو قۆڵی باوەشی پیاکردبووم، بە ترسەوە گوێیدەگرت، کاتێك مودی شاڵاوی قسەپێوتنی دەستپێکرد. بە هورموز و ئلینی دەوت، کە چ ژنێکی خراپی هەیە، دەبوایە چەند ساڵ لەوەوپێش تەڵاقی بدایە. پێیوتن، من ڕقم لە ئایەتوڵا خومەینییە، کە ئەوە دروست وا بوو، هەروەها سیخوڕی سیناییەیم، کە ئەمە درۆ بوو، بەڵام هەموو ئەمانە پیشاندەری ئەندازەی شێتێتی بوو.

هەستمکرد، بوارێکم بۆ هاتۆتە پێشەوە بچمەوە بە گژیدا. "تەواو تێکچووم بەدەستییەوە،" دەنگم لێبەرزکردەوە. "هۆی مانەوەمان لە ئێران هەر ئەوەیە، کە دکتۆرێکی خراپە." بۆ خۆشم باوەڕم بەو قسەیە نەبوو، مودی کەسێکی بە توانا و دکتۆرێکی باش بوو، مەزاجێکی وام نەبوو دەست بۆ چەکێکی گونجاو بەرم. "ئەوەندە دکتۆرێکی خراپە، کە لە خەستەخانە لە ئەلپینا دەریانکرد،" وتم. "هەر جارە سکاڵانامەیەکیان بۆ دەنووسی، هەر ڕۆژە کەمتەرخەمییەکیان لێدەدۆزییەوە."

قسەی ڕق و ناخۆش بە یەکتری وتن بەردەوامبوو، تا هورموز، بەناوی جگەرە کڕینەوە بۆ ئلین، مودی بردە دەرەوە بۆ پیاسە.

ئلینیش ئەمەی بە هەل زانی بۆ ڕێنوێنیکردنی من. "هیچ شتێکی خراپ مەڵێ" ئامۆژگاریکردم. "لە جێگای خۆت دانیشە و با ئەو هەرچی پێخۆشە، پێتـبڵێت و تۆ هیچ شتێکی خراپ مەڵێ. بەس ڕووخۆشبە لەگەڵی. گرنگ نییە، چی ئەڵێت با بیڵێت."

"بەڵام زۆر شت لەبارەی منەوە دەڵێت، ڕاست نییە."

"بەڕاستی پیاوی نێرانی شێت دەبێت، کاتێك شتێکی خراپی پێبوترێت." ئلین ئاگاداریکردمەوە.

شەڕەدەنوك دەستیپێکردەوە، کاتێك مودی و هورموز گەڕانەوە. ڕقم لە خۆم دەبۆوە، کە هەوڵمدەدا ڕێنوێنییەکانی ئالین لەبەرچاوبگرم. زمانی خۆمم دەگەست و گوێمدەگرت، کە مودی توڕەییەکانی خۆی بەتاڵدەکردەوە. لێم ڕۆشن بوو، قسەکانی لە لایەنی جەستەییەوە ئازارمنادات، ئلین و هورموز بەڵێنیاندابوو لە ماڵی خۆیاندا داڵدەمـبدەن. لەبەرئەوە سەرکزانە دانیشتم، تا مودی ڕق و قینەی بەسەرمدا دابارێنێت.

وا دەردەکەوت ئەمە کارایی هەبێت. وردەوردە مودی ئارامبۆوە، کاتێك پاشنیوەڕۆمان تێپەڕاند، هورموز کەوتە هەوڵی دیبلۆماتیکانەی خۆی بۆ ئەهێشتنی کێشەی نێوانمان. دەیویست ئاشتمانبکاتەوە. دەیویست ئێمە دڵخۆشبکات. دەیزانی، کە ژنومێردایەتی نێوان دوو کەسی جیاواز دەکرێت سەربگرێت. کە هەموو شتێك ڕوو لە باشی بوو، دڵشادبوو. ئلینیش دڵشادبوو، یان هورموز پێی وا بوو.

لە کۆتاییدا مودی وتی، "چاکـــە، دەڕۆینەوە بۆ ماڵەوە."

"نـــا،" هورموز وتی. "دەبێت بمێننەوە، تا هەموو شتێك چارسەردەکرێت."

"نا،" مودی بە توڕەییەوە وتی. "دەگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە. لە ماڵی ئێوە نامێنینەوە."

ترسم لێنیشت، کە هورموز وەڵامیـدایەوە، "چاکە. بەڵام ئێمە حەزمانـدەکرد بمێننەوە."

"دەبێت ئەهێڵی لەگەڵی بڕۆم،" گریام. "تۆ بەڵێنتـدا بە" - تۆزێکی مابوو لە زمانم دەرچێت، بڵێم "بە خەڵکی باڵوێزخانە" - "تۆ بەڵێنتـدا کە پارێزگاریم لێبکەیت. تۆ نابێت لەگەڵ ئەو بمـنێریتەوە بۆ ماڵەوە."

"دەستت بۆ نابات،" هورموز پێیوتم، کاتێك چاوی لە چاوی مودی بڕیبوو. "هەموو ئەوانە قسە بوون." بە سوکە پێکەنینێکەوە ئەمەشی وت.

"دەڕۆین،" مودی دووبارەیـکردەوە.

"باشە،" هورموز ڕازیبوو.

مەهتاب وشکبوو لە باوەشمدا. ئایا لە ژێر ڕەحمەتی پیاوێکی شێتدا جێمانـدەهێڵن، پیاوێك کە سوێندیخواردووە هەر ئیمڕۆ دەمکوژێـــت؟

"دەی وەرن،" مودی بە توڕەییەوە وتی.

کاتێك مودی خۆی ئامادەدەکرد بمانبات، بۆ ساتێك هەلێکم ڕەخساند لەگەڵ ئلین. "تکاتـلێدەکـــەم ئاگات لێمبێت،" بە هەنسکدانەوە وتم. "دەزانـــم، شتێك ڕوودەدا."

له شەقامی شەریعەتی، لەبەردەمی دوکانێکی شەربەتی میوددا، له تەکسییەکی پرتەقاڵی هاتینە خوارەوە. سەرەڕای ئەو هەموو ترس و دڵەڕاوکێیەی ئەو ڕۆژە، مەهتاب سەرنجیـدا، دوکانەکە شلیکی هەیە.

"شـــلیـك!" له خۆشیاندا قیژاندی.

نەمدەزانی له ئێراندا شلیك هەیە. ئەو تووەی کە حەزم لێی بوو.

"بــاوکە، دەتوانین تۆزێك شلیك بکڕین؟" مەهتاب پرسیاریکرد. "تکاتـلێدەکـــەم."

مودی جارێکی تر توڕەبۆوە. "تۆ پێویستت بە شلیك نییە،" مودی وتی. "زۆر گرانــــە."

مەهتاب گریا.

"دەی بـــــۆ ماڵـــەوە!" مودی بە توڕەییيەوە وتی، هەر دووکمانی دایە پێش خۆی بەرەو کۆڵانەکە.

# 14

چەند شەوی تاریکی بێخەوی و غەمناکم لەم هەواردەدا بردەسەر؟ ئەوا شەوێکی تر، لە هەموو شەوەکانی تر خراپتر.

تەواوی ئەو ئێوارێیە مودی منی پشتگوێخست و لەگەڵ مامل و نەسرین بە پچەپچ کەوتە گفتوگۆ. کە نیوەشەو هاتە جێگاوە، هێشتا ترس نەیدەهێشت بخەوم، بەڵام من خۆم کرد بە خەوتوو.

دەرکەوت خەو زوو بردییەوە، بەڵام من هەر بە ترس و ورییاییەوە مامەوە و کاتێك ساتە تاریکەکانی شەوم لێبوو بە ساڵ، ترس تادەهات زیاتر گرمۆڵەی دەکردم. نەمدەتوانی چاوەڕوانی مامل، ڕەزا یان هەرکەسێکی تر بکەم پارێزگاریم لێبکات، لە مودیش تەنیا چاوەڕوانیم، بەرزبوونەوەی پلەی شێتێتی بوو. ترس یەخەی بەرنەدەدام بخەوم، ترسی ئەوەی مودی لەناو گرفتی خۆی هەستێت و دەست بداتە چەقۆیەك، پارچە گوریسێك یان هەتا بە دەستی خۆی، بنیشێتە سەرم بەیەکجاری ترسم ببڕێت. لەوانەیە هەر بە سرنجێکی کوشندە خێرا کۆتایی بە ژیانم بهێنێت.

ساتەکان تەواوبوونیان بۆ نەبوو. گوێم ئەوەندە تیژبووبۆوە، گوێم لە خشەی مار و مێرو بوو، قۆڵم بەهۆی لە باوەشگرتنی کچەکەمەوە لە ژێر ئازاردا بوو، مێشکم لە ویردخوێندن نەدەکەوت، کاتێك بێدەسەڵاتانە لەبەرامبەر تورەیی هاوسەرە شێتەکەمدا، چاوەڕوانی دواساتم دەکرد.

پاش ماوەیەکی لەبننەهاتوو، دەنگی *ئەزان* لە بڵندگۆی مزگەوتەکانی شارەوە بەرزبۆوە و لە چەند خولەکدا دەنگی نوێژی مودی لە ڕیزی مامل و نەسریندا لە هۆڵەکەوە هاتەگوێم. مەهتاب لە ناو جێگادا بێئارام لە جوڵە نەدەکەوت. یەکەم تیشکی کزی بەرەبەیانی سارد، تەنگی بە شەوی سامناك هەڵچنی.

بە ترس و لەرزەوە مەهتاب لەخەو هەڵسا تا بچێت بۆ قوتابخانە، دەستی بە سکییەوە گرتبوو، هاواری ئازاری دەکرد. خۆئامادەکردنی ئەو بەیانییەی قوتابخانەی، چەند جار هاتوچۆی توالێتی تێکەوت.

زانیم، بە ڕاستی دڵم هەواڵی پێدام، هەنگاوی داهاتووی مودی چی دەبێت. دەمتوانی لە چاوانیدا ببینم و لە دەنگیدا ببیستم، کاتێك مەهتابی تاودەدا و بە منی وت، "مــن ئێمڕۆ مەهتاب دەبەم بۆ قوتابخانە. تــۆ لێرە دەمێنیتەوە." لە ماوەی ئەو هەشت مانگەدا، من و مەهتاب لە یەك سەنگەری لەیەکدانەبڕاودا بووین، لە بەرامبەر جەنگی پیرۆزی مودی، کە بمانکات بە خێزانێکی ئێرانی. پێکەوە دەمانتوانی بەرەنگاریببینەوە، بەتاك بێگومان لە تواناماندا نەبوو.

"ئەگەر ئەو تۆ دەبات، دەبێت لەگەڵی برۆیت،" ئەو بەیانییە بە نەرمی و چاوانی پڕ فرمێسکەوە بە مەهتابم وت، کاتێک لە حەمامەکە پێکەوە بووین. "دەبێت باش بیت لەگەڵ باوکت، هەتا ئەگەر لە منت دووربخاتەوە و نەتهێنێتەوە. بە هیچ کەسێک مەڵی، چووین بۆ باڵوێزخانە. هەرگیز بە هیچ کەسێک نەڵێیت، هەوڵماندا‌وە هەڵبێین. هەتا ئەگەر لێشتبدەن، قسەنەکەیت. چونکو ئەگەر بیڵێیت، هەرگیز لێرە ڕزگارمان نابێت. هەگیز نابێت ڕازەکەمان لەدەمت دەرچێت."

"من نامەوێت لە تۆ دووربم،" بەدەم هەنسکدانەوە وتی.

"دەزانم. ئەوە لەسەروو توانای منەوەیە. بەڵام ئەگەر ئەوەی کرد، نابێت نیگەران بیت. ئەوەت لە یادبێت، هەرگیز تۆ تەنیا نیت. هەرکاتێک ترس دایگرتی، ویرد بخوێنە. هەروەها ئەوەشت لە بیربێت، هەرگیز بەبێ تۆ ئەم وڵاتە جێناهێڵم، هـــەرگیـــز. ڕۆژێک دێت، هەردووکمان پێکەوە دەردەچین."

لە کۆتاییدا مەهتاب جلوبەرگی لەبەرکرد و ئامادەی قوتابخانە بوو، هەرچەند درەنگ بوو. مودی ڤاتێکی شینی تۆخی خەتخەتی لەبەرکرد و پەلەی ڕۆشتنی بوو. لە خەستەخانەش دوا دەکەوت. هەموو هەڵسوکەوتی پیشاندەری ئەوە بوو، تەقینەوەیەک بەڕێوەیە و مەهتاب ئەڵقەی ئامانی ڕاکێشا، ئەو ساتەی مودی دەویست پێبنێتە ئەودیو دەرگای حەوشێوە، مەهتاب جارێکی تر کەوتەوە ئاینای و ڕایکرد بۆ تواڵێت بۆ دانیشتن. مودی بە دوایدا ڕایکرد و پەلی ڕاکێشا بەرەو دەرگاکە.

"زۆر ئەخۆشە!" هاوارم لێکرد. "ناتوانی وا لەو منداڵە بکەیت."

"بەڵێ دەتوانـــــم،" نەڕاندی.

"تکاتلێدەکەم، بـــا بێم لەگەڵتان."

"نـــــە!" کێشای بە سەری مەهتاب دا و ئەویش زریکەی لێهەڵسا.

بۆ جارێکی تر سەلامەتی خۆمم لەبیرچۆوە. ناچارانە بۆ پاراستنی مەهتاب لە هەژڤینێکی نەزانراوی چاودڕوانکراو، پەلاماری مودیم دا، دەستم لە قۆڵی چاکەتەکەی گیرکرد، بە نینۆکەکانم شەبەقێک کەوتە چاکەتەکەیەوە.

مەهتابی فڕێدایە لاوە و هاتە وێزدی من. دامی بە زەویدا و کەوتە لێدانم، سەری گرتم و بۆ چەند جار کوتای بە زەوییەکەدا. بە ڤیژدوە مەهتاب ڕایکرد بۆ چێشتخانەکە بە دوای ئەسریندا. مودی بۆ ساتێک ئاوڕی بۆ دایەوە تا بزانێت بۆ کوێ دەچێت، منیش کەڵکم لەو هەلە وەرگرت و پەلامارمدا. چڕنوقم لە دەموچاوی گرت و قژیم ڕاکێشا، بۆ چەند ساتێک لەسەر زەوییەکە زۆرانبازیمان کرد، پێش ئەوەی بە لێدانێکی قایم بە دەموچاومدا بەسەرمدا زاڵبێتەوە.

مەهتاب کەسی لە چێشتخانە نەدۆزییەوە، بەناو هۆڵەکەدا ڕایکرد بۆ ژووری نوستنەکە بەدوای مامل و ئەسریندا.

"تکاتان لێدەکەم فریامکەون! تکاتان لێدەکەم فریامکــــەون!" هـــاوارمکرد. مەهتاب پاڵی بە دەرگای نوستنەکەوە نا، بەڵام داخرابوو. هیچ دەنگێك لەوێوە نەبوو، کەس بەدەنگمانەوە نەهات.

بە کەڵکەبوونی هەشت مانگ ڕفوقینە، توانیم مودی سەرسامبکەم بە پیشاندانی هێزی بەرگریم. شەقم وەشاند، لێمدا، لاچاویم ڕنی، هەوڵمدا بە ئەژنۆ بکێشم بە ناوگەڵیدا. هەرچی چۆنێك بوو، توانیم بەخۆمەوە سەرگەرمیبکەم.

"ڕاکەرە خواردوە بەدوای ئیسادا!" هاوارم لە مەهتاب کرد.

مەهتاب دەگریا و زریکەزریکی بوو، ترسی ژیانی من و خۆیی بوو، نەیدەوێرا تەنیا جێمبهێڵێت لەژێر چنگی پیاوێکی شێتدا، کە بە باوکە ناوی دەبرد. لە دواوە پەلاماریدا و بە مشتە بچوکەکانی نائومێدانە و بێکاریگەرانە کەوتە پیاکێشانی. بە هەر دوو قۆڵی باوەشیکرد بە ناوقەدی باوکیدا، تا بەسەر منەوە لایبات. بەڵام ئەو بە توڕەییەوە پیایکێشا و بە ئاسانی خستییە لاوە.

"بـــڕۆ مەهتـــاب!" دووبارەمکردەوە. "ڕاکــــە بەدوای ئیسادا."

بەناچاری مەهتاب دیارنەما. کاتێك مەهتاب بە پێپلیکانەکاندا ڕایدەکردە خواردوە، من و مودی زرموکوتمان بوو، دڵنیابووم ئەمە دواشەڕە.

مودی خراپ لە قۆڵمی دا و خوێنی لێهێنا. قیژاندم، خۆم لەژێر چنگی ڕزگارکرد و توانیم لە لاوە شەقێکی تێهەڵدەم. بەڵام ئەمە بووە هۆی توڕەیییەکی زیاتر تا ئازار پێگەیاندن. بە هەردوو دەستی بەهێزی، منی بەرزکردەوە و دامی بە زەوییەکەدا. بە پشتدا کەوتم، ئازارێکی بروسکەئاسا تەواوی لەشمی گرتەوە.

ئیتر بە ئاستەم دەمتوانی بجوڵێم. بۆ چەند خولەك بەسەرمەوە وەستا، جنێوی پیسی پێدەدام، شەقی تێهەڵدەدام، لێیدەدام و دانەویەوە شەپازڵەیەکی پیاکێشام. بە قژڕاکێشان بەناو هۆڵەکەدا کێشیکردم. بسکە قژ بەدەستیەوە هات.

ڕاوەستا تا هەناسەیەکی بە بەردابێتەوە. بە گریانەوە لە جێگای خۆمدا کەوتم و نەمدەتوانی بجوڵێم.

لەپڕ پشتی تێکردم و بەرەو پلیکانەکان دەچوو. دەرگا تەختە گەورەکەی دایەوە بە یەکدا و گوێم لێبوو، بۆ دڵنیایی بە دوو شێوە دەرگاکەی قفلکرد. پاشان گوێم لە زریکەی مەهتاب بوو، کە ئەو دەنگە دڵداخورپێنەرە بە دەرگا و پلیکانەی نێوان دوو نهۆمەکە کپکرا، کسپەی بە جەرگم گەیاند. پاشان دەنگ نەما.

چەند خولەکی ویست، تا توانیم زۆر لە خۆم بکەم و دانیشم، زۆرتری ویست تا توانیم هەستمە سەرپێ. بە شەلەشەل چووم بۆ حەمامەکە. زیاتر غەمی مەهتابم بوو تا ئازاری خۆم. لە حەمامەکە، سەرەڕای ئەوەی لەگەڵ هەر جوڵەیەکدا وام هەستدەکرد شیشێکی داخکراو دەکەن بە پشتمدا، توانیم سەرکەومە سەر کورسی توالێتەکە و لەسەر نوکی پێ ڕاوەستم و سەر بنێم بە هەواکێشەکەوە، کە حەمامەکانی هەر دوو نهۆمەکەی پێکەوە

دەبەست، تا بتوانم گوێبیستی شتێك بم لەخوارەوە. لە هەواكێشەكەوە گوێم لە مودی بوو، سوكایەتی پێدەكردم لەلای ئیسا. هەر سوێند و جنێو بوو لەدەمی دەهاتە دەرەوە، ئیساش بە بەڵێ و سەرلەقاندن وەڵامیدەدایەوە. دەنگێك لە مەهتاب نەبوو.

ئەمە بۆ ماوەیەك بەردەوامبوو. لەتاو ئازاری پشتم، دەمویست پڕ بەدەنگ بزریكێنم، كە بەهۆی بەسەر نووكی پێ وەستانەوە زیاتر بووبوو، بەڵام لەو ساتەدا ملمنەدەدا بە ئازاری خۆم. قسەوباس لە ژێرەوە بەرەو كپبوون ڕۆی، تا ئەو ئاستای كە نەمدەتوانی چەند وشە فارسی لێتێبگەم. پاشان لەپڕ گوێم لە مەهتاب بوو، كەوتەوە گریان.

گوێم بۆ ئەم گریانە شلكرد، كاتێك كە لە ژوورەكانی خوارەوە دەجوڵان بۆ ناو ڕاڕەوەكە و بۆ دەرەوە بۆ دەرگا ئاسنەكەی حەوشێ. دەرگاكە درایەوە بە یەكدا، دەنگی سامناكی دەرگای بەندیخانە هاتەوە گوێم.

لەسەر كورسی تواڵێتەكە هاتمە خوارەوە، بۆ ژووری نوستنەكەی مامل و نەسرین ڕامكرد، كلیلەكەیم لەناو كێلونەكەیدا دۆزییەوە و دەرگاكەم پێكردەوە. ژوورەكە بەتاڵ بوو. بەخێرایی چووم بۆ بەر پەنجەرەكە، كە بەسەر بەردەمی پێشەوەی خانووەكەدا دەینواڕی. دەبوو لووت بنێم بە بەربەستەكەوە و ناوچەوان بنێم بە شیشی پەنجەرەكەوە، ئینجا بەئاستەم خوارەوەم دەبینی. مودیم بینی، چاكەتە دڕاوەكەی بێگومان ئیسا بۆ دوریبۆوە، بە دەستێكی قایم قۆڵی مەهتابی گرتبوو، تا بتوانێت كۆنترۆڵیبكات، هەرچەند مەهتاب شەقی دەهاویشت و هەوڵیدەدا خۆی ڕزگاربكات. بە دەستەكەی تری عەرەبانەكەی ئەمیری دەكردەوە، مەهتابی تێفڕێدا و بە قایشی عەرەبانەكە دەست و قاچی مەهتابی شەتكدا.

یەكسەر ئەو مۆتەكەیە دایگرتم، كە ئیتر مەهتاب نابینمەوە. لەوە دڵنیابووم. بە هەڵەداوان چووم بۆ ژووری نوستنەكە، كامێرە سی و پێنج ملیمەكەی مودیم لەسەر ڕەفەكە هێنا و لە كاتی خۆیدا توانیم وێنەیەكیان لێبگرم، كاتێك كە بەرەو شەقامی شەریعەتی بەڕێوەبوون. مەهتاب هێشتا زریكەزریكی بوو، بەڵام مودی گوێیپێنەدەدا.

بە چاوی پڕ فرمێسكەوە چاوم لێنەدەتروكاندن، تا لە چاو ونبوون. ئیتر هەرگیز نایبینمەوە، لە دڵی خۆمدا دەموتەوە.

"باشـــیـــت؟"

ئیسا بوو، لە هەواكێشی حەمامەكەوە هاواریلێدەكردم. دیاربوو گوێی لە دەنگی گریانم بوو، كاتێك خەریكی پاككردنەوەی خوێنی لەشی خۆم بووم.

"بەڵـــێ،" هاوارم بۆ كرد. "بەڵام دەمەوێت قسەت لەگەڵ بكەم، تكاتلێدەكەم." نەماندەتوانی لەو ڕێگایەوە قسەوباس بكەین، دەبوو بقیژێنین بۆئەوەی گوێمان لەیەكتری بێت. "تكاتلێدەكەم، بچۆرە دەرەوە بۆ حەوشەی دواوە، بۆئەوەی بتوانم قسەت لەگەڵ بكەم،" داواملێكرد.

به ئازاری زۆردوه خۆم کێشکرد بۆ باڵکۆنی دواوه و بینیم نیسا له خوارهوه چاوەڕوانمه.

"بۆچی ڕێگەت به مودی دا؟" به هەنسکدانێکی زۆرەوه پرسیارمکرد. "بۆچی پارێزگاریت له مەهتاب نەکرد؟"

"هەر دووکیان له یەك کاتدا هاتن،" نیسا باسیکرد. "لەژێر پلیکانەکەدا خۆی شاردبۆوه. باوکی دۆزییەوه و هێنایه ژووردوه."

مـــــەهتابی نەگبەتم بۆ خۆم گریام. به نیسام وت، "دەبێت یارمەتیمبدەیت، تکاتـــلێدەکەم."

"ڕەزا چووه بۆ کار،" نیسا وتی. له هەڵسوکەوت و چاوانیدا هاودەردییەکی ڕاستەقینه بەدیدەکرا، بەڵام وەك هەر ژنێکی ئێرانی سڵەمینەوەیەکی پەروەردەیی تیادا بوو. چی لەدەستبهاتایه بۆی دەکردم، بەڵام نەیدەوێرا ئەو سنووره بشکێنێت که هاوسەرەکەی یان *دایی جون* بۆی کێشابوو. "بەڕاستی بۆت بەداخم، بەڵام هیچ شتێکمان لەدەستنایەت بۆت بکەین."

"مەهتاب باشه؟ له کوێیـــه؟"

"نازانم بۆ کوێی برد."

هەر دووکمان گوێمان له مەهدی منداڵه بچوکەکەی نیسا بوو، دەنگی گریانی هات. "دەبێت بچمه ژوورەوه،" نیسا وتی.

گەڕامەوه ژوورەوه. تەلەفون بۆ باڵوێزخانه بکەم! له دڵی خۆمدا وتم. بۆچی تا ئێستا بۆم نەکردوون؟ ئەگەر هێلین یان ڤینکوپ لەوێش نەبن، ژمارەی تەلەفونی ماڵەکانیانم هەیه. ڕامکرد بۆ چێشتخانەکه - بەڵام تەلەفونی لێنەبوو.

وردەورده بۆم ڕۆشنبۆوه، که مودی ئەم بەزمەی بەیانی بەپێی بەرنامه کردووه. مامل چووبوو بۆ کوێ؟ نەسرین له کوێ بوو؟ تەلەفونەکه له کوێدا شاردرابۆوه؟ له هەلومەرجێکی زۆر خراپترردا بووم، وەك لەوەی چاوەڕوانمدەکرد. هەوڵمدا ژیرانه بیربکەمەوه و ڕێگایەك بدۆزمەوه، تا شەڕی خۆم بکەم.

بووم به ئاژەڵی له قەفەسکراو، کەتمه پشکنینی دەوروپشتەکەم. هیچ پلانێکم نەبوو، بەڵام دەمزانی دەبێت بەدوای خاڵه لاوازەکانی ئەم داوه تازەیەی مودیدا بگەڕێم. گەڕامەوه بۆ باڵکۆنەکه و لێکمدایەوه، که ئەگەر بازبدەمه خوارەوه بۆ ناو حەوشەکە، چی دەتوانم بکەم، چونکو چواردەوری حەوشەکه به دیوارێکی بەرز دەوردرابوو، ئاسایی ڕێگای دەرچوونم نەبوو، له باخەکەی نیسا و ڕەزادا گیردەکرد.

له لایەکی باڵکۆنەکەوه قەراغێکی باریك هەبوو، که چەند ئینجێك پانایی بوو، دەچووه سەربانی یەك نهۆمی دراوسێکەمان. دەمتوانی له پەنجەری ژووری نوستنەکەمانەوه بێمه سەر ئەم قەراغه و لەوێوه خۆم درێژکەمەوه بۆ سەربانی دراوسێکەمان، هەرچەند ئەگەری کەوتنه خوارەوه هەبوو. بەڵام پاش ئەوه چی؟ ئایا

دەرگای سەربانی دراوسێکەمان کراوە بوو؟ کەس هەبوو یارمەتیمبدات؟ ئایا دراوسێکەمان یارمەتیدەدام یان تەلەفونی بۆ پۆلیس دەکرد؟ وە هەتا ئەگەر خۆم ڕزگاربکەم، ئەی مەهتاب چی؟

چی بکەم و چی نەکەم و ترس مێشکی جەنجالکردم، هاوکات لەشم بە هۆی لێدانی مودییەوە ژانیدەکرد.

هەستی تەنیایی تەواو زاڵبوو بەسەرمدا. دەبوو پەیوەندییەك - هەر پەیوەندییەك - دروستبکەم لەگەڵ دنیای دەرەوەدا. خێرا چووم بۆ ژووری نوستنەکەی مامل و نەسرین، بۆ بەر پەنجەرەکە، کە بەسەر شەقامی بەردەم ماڵەکەدا دەینواڕی. لەدەرەوە هاتوچۆ و ژیانی ئاسایی شەقامەکە بەردەوامبوو، بەبێ ئەوەی هەلومەرجی سەختی من کاریگەرییەکی هەبێت بەسەرییەوە. وا دەردەکەوت، گرنگبێت لەو پیاو و ژنانە نزیکبکەومەوە، کە بەداوی کاروباری خۆیاندا بە بەردەمی ماڵی ئێمەدا تێدەپەڕین.

پێشی پەنجەرەکە ڕیزێك شیش بوو، کە نێوانی شیشەکان نزیکەی چوار ئینج دەبوو. لە نێوان ئەم شیشانە و پەنجەرەکەدا بەربەستێك هەبوو، کە ڕێگری دروستدەکرد دەرەوە ببینم. تەنیا نزیکەی یەك پێیەك پانایی شۆستەکەم لێوە دیاربوو، باقییەکەی دیواری خانووەکە بوو، ڕاستەوخۆ بۆ خوارەوە هیچ شتێکم لێوە دیار نەبوو.

سەیرمکرد، دەتوانم ئەم بەربەستە لابەرم و سەر بنێم بە شیشەکانەوە شۆستەکە ببینم. بەربەستەکە بە چەند برغو بەسترابوو، لەبەرئەوە کەوتمە گەڕان بەدوای دەرنەفیزدا. هیچم نەدۆزییەوە. لەجیاتی ئەوە، دەستم دایە چەقۆیەکی نانخواردن.

بە لابردنی بەربەستەکە و سەرنان بە شیشەکانەوە، خوارەوە دەبنرا. لە خوارەوە هاتوچۆکەرانم دەبینی، بەڵام چیم بەدەستهێنا؟ کەسێك لەو خوارەوە یارمەتی من نادات. بە ناچاری بەربەستەکەم خستەوە جێگای خۆی تا مودی سەرنجینەدات.

کە گەڕامەوە هۆڵەکە، زانیم مودی زیاتر دەتوانێت بەندمبکات. هەموو دەرگاکانی ناوەوە کلیلیان هەبوو. ئەگەر بیویستایە، دەیتوانی لە هۆڵەکەدا بەندمبکات. جارێکی ترش کەوتمەوە گەڕان بە دوا ئامێرێکدا، لە کۆتاییدا لە چێشتخانەکە چەقۆیەکی نوك و دەم تیژم دۆزییەوە. ئەمە و لەگەڵ چەقۆی نانخواردنەکە، کە بۆ برغوکردنەوە بەکارم دەهێنا، لە ژێر وەرتەی هۆڵەکەدا شاردمەوە. بەم ئامێرانە دەمتوانی برغوی دەرگای پێبکەمەوە، ئەگەر مودی منی لە هۆڵەکەدا بەندبکردایە.

بەناو نهۆمەکەدا زیاتر گەڕام، بیرمکەوتەوە کە پەنجەرەیەك لە ناوەوە هەیە، لە دیواری نێوان ژووری دانیشتن و پێپلیکانەکانی نهۆمی دووەمدا. بە پەردە داپۆشرابوو، بە ئاستەم جێگای سەرنج بوو. مودی ئەم ڕێگایەی چوونە دەرەوەی لەبیرچووبوو.

پەنجەرەکە بەری نەگیرابوو، بەدەست پێوەنانێك کرایەوە. سەرم بردە دەرەوە و لە ئەگەرەکانی وردبوومەوە. دەمتوانی بە ئاسانی بچمە دەرەوە بۆ سەر پێپلیکانەکان، بەڵام هێشتا بواری دەرچوونم نەبوو، چونکو دەرگای ئاسنی حەوشەکە هەبوو، کە هەمیشە

داخرابوو. پێپلیکانەکان بە بەردەگای نهۆمی ئێمەدا دەچوو بۆ سەربانی نهۆمەکەمان. دەمتوانی بچمە سەربان و لەوێشەوە بۆ سەربانی ماڵی دراوسێکەمان. بەڵام پاشان چی؟ ئایا هیچ دراوسێیەك دەیوێرا رێگە بە ژنێکی هەڵهاتووی ئەمریکی بدات لە ماڵەکەومیەوە بچێتە دەردوە بۆ سەر شەقامەکە؟ هەتا لەپاش ئەوەش، بێ مەهتاب بووم.

فرمێسك بەسەر گۆنامەوە جۆگەلەی بەست، دەمزانی کۆتایی ژیانمە، دەمزانی مودی هەرکاتێك بییەوێت، دەتوانێت لەناومبەرێت. بەڵام دەبوو ژیانی کەسانێکی تر بپارێزم، دەفتەری ناونیشانەکانم هێنا و پەڕە پەڕە هەڵمدایەوە و ژمارە تەلەفونەکانم کوژانەوە، هەرچەند بە شێوەی پەرلە نووسیبووم. نەمدەویست کەسانێك کە بچوکترین هەوڵی یارمەتی منیان داوە، ژیانیان بکەوێتە مەترسییەوە. هەندێك ژمارەی تەلەفون نەخشی بەستبوو لە هەندێك شوێندا، ئەو پارچە لاپەڕانەم سوتاند و خۆڵەمێشەکەیم کردە توالێتەکەوە.

لە سەر فەرشی ژوورەکە کەوتم، تەواو هیلاك بووبوو بەدەست ئەو شتانەی کە لەو چەند رۆژەدا روویاندابوو. بێناگا لەوەی چەند ماومەتەوە، لەوە دەچوو خەوم لێکەوتبێت، کە لە دەنگی کلیلی ناو دەرگای نهۆمەکەمان خەبەرمبۆوە. پێش ئەوەی فریابکەوم بکەومەخۆ، ئیسا بە سینییەك خواردنەوە هاتە ژوورەوە.

"تکاتلێدەکەم بیخۆ،" پێیوتم.

سینییەکەم لێوەرگرت و سوپاسمکرد و هەوڵمدا قسەوباسی لەگەڵ دامەزرێنم، بەڵام ئیسا ترسنۆك بوو، ورتە لەدەمی نەهاتە دەرەوە. یەکسەر گەڕایەوە بۆ لای دەرگاکە. "بـــــەداخم،" بەخێرایی وتی، پێش ئەوەی جێمبهێڵێت و بە ڕوومدا دەرگاکە داخاتەوە. دەنگی کلیلدانی دەرگاکە لە گوێمدا زرنگایەوە. سینییە خواردنەکەم برد بۆ چێشتخانەکە، بەبێ ئەوەی دەستی بۆ بەرم.

چەند کاژێری بێهیوایی تێپەڕی، تا پاشنیوەڕۆیەکی زوو مودی بە تەنیا گەڕایەوە.

"مەهتاب لە کوێیە؟" قیژاندم.

"پێویستــناکات بزانیت،" بە ڕەقییەك وەڵامیدایەوە. "نیگەرانی مەبە. خۆم چاودێریدەکەم." بە لامدا تێپەڕی و چوو بۆ ژووری نوستنەکە. کە جێگاجرنوقەکانی خۆمم بینی بە تەواوی دەموچاوییەوە، خۆشییەکەم تێکەڕا. بەڵام ئەو خۆشییە زۆر زوو ڕوایەوە، کە بیری جێگا بریندارییە زۆر زیاترەکانی خۆمم کەوتەوە. مەهتاب دەبێت لە کوێ بێت؟

خێرا مودی گەڕایەوە بۆ هۆڵەکە، جلوبەرگی مەهتابی پێبوو، هەروەها بوکەشوشەکەی، کە بۆ ئاهەنگی رۆژی لەدایکبوونی بۆمان کڕیبوو.

"بوکەشوشەکەی دەوێت،" مودی وتی.

"لە کوێیە؟ تکاتلێدەکەم با بیبینم."

پاڵی پێوەنام بۆ لاوە و بێورتە ڕۆیشت و دەرگاکەی بەدوای خۆیدا لە دوولاوە کلیلدا.

پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ، کاتێك کە لە جێگادا کەوتبووم و قاچم درێژکردبوو، تا ئازاری پشتم کەمبێتەوە، گوێم لە دەنگی زەنگی دەرگای نهۆمەکەمان بوو. کەسێك بوو لەبەر دەرگای حەوشێی دەرەوە. ڕامکرد بۆ تەلەفونی دەرگاکە، بۆئەوەی بزانم کێ هاتووە بۆ سەردان. ئلین بوو. "دەرگام لەسەر داخراوە،" پێموت. "چاوەڕوانبە، دێمە بەر پەنجەرەکە، لەوێوە دەتوانیین قسەبکەین."

بەخێرایی بەربەستی پەنجەرەکەم لابرد و سەرم نوساند بە شیشی پەنجەرەکەوە. ئلین لەگەڵ منداڵەکانیدا، مەریەم و عەلی، لەسەر شۆستەکە بوو. "هاتم بزانم لە چیدایت،" وتی. پاشان وتی، "عەلی تینویەتی. دەیەوێت شتێك بخواتەوە."

"ناتوانم هیچت بدەمێ" بە عەلیم وت. "دەرگام لەسەر داخراوە."

بێگومان ئیسا گوێی لەم گفتگۆیە بوو، بە پەرداخێك ئاودوە هات بۆ عەلی.

"دەتوانین چی بکەین؟" ئلین پرسیاریکرد. ئیساش بە پەرۆشبوو بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە.

"بچۆ هورموز بهێنە،" پێشنیارمکرد. "هەوڵبدەن قسە لەگەڵ مودی بکەن."

ئلین پێی باشبوو. لەگەڵ منداڵەکانیدا بەسەر شۆستەکەدا ڕۆیشت و لە ناو قەرەباڵغییەکەدا ونبوو، دوا شت کە بینیم دەمێنی عەبا ڕەشەکەی ئلین بوو، کە بای بەهار دەیهێنا و دەیبرد.

هەر ئەو دوانیوەڕۆیە لەگەڵ ڕەزا قسەمکرد، ئەو لە حەوشەکەی دواوە و منیش لە بالکۆنەکەوە. دەمزانی ئیسا کلیلێکی پێیە، بەڵام ڕەزا ئامادەنەبوو بێتەسەرەوە بۆ نهۆمەکەمان.

"ڕەزا،" هاوارمکرد، "بەڕاستی ئەو میهرەبانییەی تۆ بە هەنددەگرم لەوەتەی هاتومەتە ئێرانەوە. تۆ لە هەموو کەس زیاتر باش بووی بۆ من، بە تایبەتی پاش ئەو ناخۆشییەی کە لە نێوانماندا ڕوویدا لە ئەمریکا."

"سوپاستدەکەم،" وتی. "باشیت؟"

"نۆ، تکاتلێدەکەم یارمەتیمـبدە! لەو باوەڕەدام، تۆ تەنیا کەسیت کە دەتوانیت قسە لەگەڵ مودیدا بکەیت. ئایا دووبارە مەهتاب دەبینمەوە؟"

"نیگەران مەبە. دووبارە دەیبینیتەوە. ئەو کارە ناکات، کە لە تۆی دووربخاتەوە. تۆی خۆشدەوێت. مەهتابی خۆشدەوێت. خۆی بەبێ دایك و باوك گەورەبووە، ئەوە لەگەڵ مەهتابدا ناکات."

"تکاتلێدەکەم قسەی لەگەڵ بکە،" لێیپاڕامەوە.

"ناتوانم قسەی لەگەڵ بکەم. هەرچی بڕیارێك دەدا ... بڕیاری خۆیەتی. ناتوانم پێیبڵێم ئەو شتە بکە."

"تکاتلێدەکەم هەر ئەم شەو هەوڵبدە."

"نـا. ئەم شەو نـا،" ڕەزا وتی. "دەبێت سبەینێ بە کارێك بچم بۆ ڕەشت. کە دوو ڕۆژم پێدەچێت، ئەگەر تا ئەوسا هیچ شتێك نەگۆڕا، ئەوا لەوانەیە بتوانم قسەیەکی لەگەڵ بکەم."

"تکاتلێدەکەم مەڕۆ. تکاتلێدەکەم لێرە بمێنەرەوە. دەترسم. نامەوێت بە تەنیا بم."

"نـــــا. دەبێت بڕۆم."

سەر لە ئێوارێ، ئیسا دەرگاکەی لێکردمەوە و پێیوتم "وەرە خواردەوە."

ئلین و هورموز لەوێ بوون لەگەڵ ڕەزا. کاتێك مەریەم و عەلی لەگەڵ دوو منداڵەکەی ڕەزا و ئیسا یاریاندەکرد، هەموو قسەماندەکرد و بەدوای ڕێگاچارەیەکەوە بووین بۆ ئەم کێشەیە. هەموو ئەم خەڵکە لە ڕابوردوودا یارمەتیدەر و پاڵپشتی مودی بوون لە دژی من. ئەم هەڵوێستەیان لە چەند هۆیەکەوە سەرچاوەیدەگرت، کە پێیان دروست بوو. هەموویان موسڵمانێکی تەواو بوون. دەبوو ڕێز لە ماف مودی بگرن کە بەسەر خێزانەکەیدا دەسەڵاتی خۆی داسەپێنێت. بەڵام هاوڕێی منیش بوون و مەهتابیان خۆشدەویست. هەتا هەموو دەیانزانی، لە کۆماری ئیسلام ئەفرەتلێکراوەدا باوك و مێرد ئەگەری ئەوەیان هەیە لە پەیوەند بە دەسەڵاتی خۆیاندا فاچی لێراکێشن.

هیچ کەسێك نەیدەویست ناوی پۆلیس بهێنێتە ناراوە، من لە هەموویان زیاتر. لەبەردەمی ڕەزا و ئیسادا، نەمدەوێرا لەگەڵ ئلین و هورموز باسی باڵوێزخانە بکەم. هەتا ئەگەر باسیشم بکردایە، دەمزانی ڕەتی هەموو پەیوەندیکردنێکیان دەکردەوە لەگەڵ فەرمانبەرانی سویسرا و ئەمریکا.

ئەمە ئێمەی خستبووە گێژاوەوە. هیچ ڕێگایەکی تر نەبوو جگە لە قسەکردن نەبێت لەگەڵ مودی، هەمووشمان دەمانزانی قسەکردن لەگەڵ مودی کەڵکێکی وەهای نییە. نەك هەر بۆ ئەم جارە، لەوانەیە بۆ داهاتووش.

هەوڵمدا دان بەخۆمدا بگەرم، خەریکبوو لە داخدا دەتەقیمەوە. دارکاریـبکەن! دەرگای لەسەر داخەن! من و مەهتاب بنێرنەوە بۆ ئەمریکا! دەمویست هاواربکەم و پاڵیان پێوەنێم بۆ ڕێگاچارەیەکی دروست، کە کۆتایی بە هەموو ئەم بەسەرهاتە سامناکە بهێنێت. بەڵام دەبوو لەگەڵ هەلومەرجەکەدا هەڵسوکەوتبکەم. دەبوو بەدوای ڕێگاچارەیەکی کاتییەوە بم، کە ئەوان قبووڵیبکەن و لایەنگری لێبکەن. لەوە دەچوو ئەوەش هەر نەبێت.

لە گەرمەی قسەوباسەکەدا، گوێمان لە دەنگی دەرگای حەوشێ بوو، کرایەوە و داخرایەوە. ڕەزا چووە ڕاڕەوەکەوە، بۆئەوەی بزانێت، کێ هاتۆتەوە. مودی لەگەڵ خۆی هێنایە ژوورەوە.

"چۆن هاتیتە دەرەوە؟" داوای ڕوونکردنەوەی کرد. "بۆچی تۆ لێرەیت؟"

"ئیسا کلیلی پێیە." بۆم باسکرد. "ئەو منی هێنایە خواردەوە."

"کلیلەکەم بەرێ!" نەڕاندی. ئیسا سەرگزانە وەڵامی داواکەی دایەوە.

"باشە، *بایی جون*،" ڕەزا بەنەرمییەکەوە وتی، هەوڵیدا مودی ئارامکاتەوە.

"*ئەمانە* لێرە چی دەکەن؟" مودی هاواریکرد و شێتانە پەنجەی بۆ ئلین و هورموز درێژکرد.

"لە هەوڵدان یارمەتیمانبدەن،" وەڵامەدایەوە. "کێشەمان هەیە. پێویستمان بە یارمەتی هەیە."

"ئێمە کێشەمان نییە!" مودی تووڕەبوو. "ئەوە تۆی کێشەت هەیە." ڕووی لە ئلین و هورموز کرد. "بــڕۆن و تەنیا جێمانبهێڵن،" وتی. "ئەمە کاری ئێوە نییە. نامەوێت لەمە زیاتر هیچ شتێکتان لەگەڵ بیتیدا هەبێت."

بۆ ئەگبەتی من ئلین و هورموز یەکسەر هەستان بۆئەوەی بڕۆن. "تکاتانلێدەکەم مەڕۆن،" پاڕامەوە. "دەترسم دووبارە ئازارمبداتەوە. دەمکوژێت. ئەگەر بمکوژێت، کەس پێینازانێت. تکاتانــلێدەکەم مەڕۆن، تەنیا جێمــمەهێڵن."

"دەبێت بڕۆین،" هورموز وتی. "پێیوتین، بڕۆین و بڕیار لە دەستی ئەو دایە."

یەکسەر ڕۆیشتن. مودی من کێشکرد بۆ نهۆمی سەرەوە و خۆشی هاتە ژوورەوە ودەرگاکەی کلیلدا.

"مامل و نەسرین لە کوێن؟" بە نیگەرانییەوە پرسیارمکرد.

"بەهۆی ڕەفتاری خراپی تۆوە، ناتوانن لێرە بمێنەوە،" مودی وتی. "چوون بۆ ماڵی باوکی نەسرین بمێنەوە. بەزۆر لە ماڵی خۆیان کراونەتە دەرەوە." تا دەهات دەنگی بەرزدەبۆوە. "ئەمە کاری ئەوان نییە. کاری هیچ کەسێکی تر نییە. باشترێکە لەبارەی ئەمەوە لەگەڵ هیچ کەسێکدا قسەوباس نەکەیت. لەمەودوا من خۆم هەموو شتێکم. خۆم هەموو بڕیاردکان دەدەم. هەموو شتێك دەخەمەوە جێگای خۆی."

زۆر دەترسام وەڵامیبدەمەوە، بێدەنگ دانیشتم، کاتێك بۆ چەند خولەك وڕێنە و سەرزەنشتیدەکردم. باشبوو نەکەوتەوە لێدانم.

ئەو شەوە پێکەوە بووین، لەسەر یەك جێگا پاڵکەوتین، بەڵام چەند توانیمان بەدوور لەیەکتری و پشتمان لە یەکتری بوو. مودی نوست، بەڵام من لەتاو ئازاری لەشم هەر ئەمدیوا و ئەودیوم دەکرد بۆ تۆزێك ئارامی. نیگەرانی مەهتاب بووم، گریام بۆی، لە خەیاڵی خۆمدا هەوڵمدا قسەی بۆ بکەم. کەمتە ویرد خوێندن.

بۆ بەیانی مودی خۆی ئامادەکرد بۆ ئیش، قاتێکی تری لەبەرکرد، لەجیاتی ئەوەی کە ڕۆژ پێشوو دەڕاندبووم.

کە ڕۆی، بوکەشوشە کەروێشکەکەی مەهتابی لەگەڵ خۆی برد.

"ئەمەی دەوێت،" مودی وتی.

پاشان ڕۆیشت.

# 15

لەپاش ڕۆشتنی مودی زۆر لە جێگادا مامەوە، بەدەنگی بەرز دەگریام، "مەهتاب! مەهتاب! مەهتاب!" هەستمکرد لەشم یەکپارچە بووە بە پەڵەیەکی شینی جێی لێدان. سێبەندەم بریندار بووبوو، لە ئاکامی ئەوەی مودی منی کێشابوو بە زەوییەکەدا. لە ناو جێگادا، لەتاو ئازار خۆم قایم گرمۆڵە کردبوو.

وا بزانم چەندەها کاژێر ڕۆیشتبوو، پێش ئەوەی لە دەنگێکی ئاشنا ئاگاداربمەوە لە حەوشەکەی دواوە. دەنگی جیکەجیکی زنجیرێکی ژەنگاوی بوو بەسەر بۆرییەکی ئاسنەوە. دەنگەکە لە جۆلانەکەی مەریەمەوە دەهات، ئەو شوێنە یارییەی کە مەهتاب لای پەسەندبوو. بەهێواشی لە جێگاکە هەستام و بە شەلەشەل چووم بۆ بالکۆنەکە بۆئەوەی بزانم، کێیە جۆلانەدەکات.

مەریەمی کچەکەی ئیسا بوو، خۆشی لە هەتاوی بەیانیانی مانگی نیسان دەبینی. منی بینی تەماشایدەکەم، بە دەنگە منداڵانە بێتاوانەکەیەوە هاواریلێکردم، "مەهتاب لە کوێیە؟"

لەبەر گریان نەمتوانی وەڵامیبدەمەوە.

لەبەر هۆیەك کە تەنیا خۆم دەمزانم، مەهتابم هێنا بۆ ئێران بۆئەوەی بیپارێزم، بەڵام پێچەوانەکەی دەرچوو. ڕەشبینی گەمارۆی دابووم، لە هەوڵی ئەوەدا بووم ژێری خۆم لەدەستنەدەم. هەرچی چۆنێك بوو، دەبوو هێز بدەمە خۆم و بەپیری ئەم جەنگەوە بچم. ئایا مودی لەسەر ئەوە لە منی دا، کە لە بەرامبەریدا وەستاومەتەوە؟ لە وەڵامەکەی دەترسام.

ئەوەی کە مودی چی لە مەهتاب کردووە، پرسیارێکی هەنوکەیی بوو، بەڵام لەوە قووڵتر و پڕئاڵۆزتر ئەوە بوو، چۆن مودی توانی ئەوە بە مەهتاب بکات؟ بە من بکات؟ ئەو مودییەی ئێستا، ئەو پیاوە نەبوو کە شوومپێکرد.

ئەو شتەی کە هەڵە دەرچوو چی بوو؟ هەم دەمزانی هەم نەمدەزانی. دەمتوانی شوێنپێی هەلومەرجەکە بکەوم. دەمتوانی وێنەی هەڵبەزین و دابەزینی شێتێتی مودی بکێشم، لە ماوەی هەشت ساڵی ڕابوردووی هاوسەرێتیماندا و پەیوەندییبدەمەوە بە سەختییەکانی بەرەوپێشەوە چوونی پیشەکەی و هەتا بە هاوکاتبوونی لەگەڵ هەڵچوون و داچوونی ڕووداوە سیاسییە چاوەڕواننەکراوەکان.

چۆن نەمتوانی بیبینم و بەری پێبگرم؟ پەرۆشی ئاوردانەوە لە ڕابوردوو، ئاوتوێکردن و تێگەیشتن لێی، هەموو گیانمی داگرت.

هەشت ساڵ لەودوپێش، کاتێك مودی خەریکبوو ماوەی سێ ساڵەی ئیقامەی لە نەخۆشخانەی ئێسقانی دیترۆیت دەگەیشتە کۆتایی، لەگەڵ بڕیارێکی گرنگ ڕووبەڕووبووین. کاتی ئەوە هات پێکەوە پلانی ژیانێك دابنێین یان هەر یەکە دوای ژیانی خۆی بکەوێت. پێکەوە پلانمان دانا، پێکەوە سەفەرمانکرد بۆ وەرگرتنی کارێك، کە لە نەخۆشخانەی ئێسقان لە کۆرپوس کریستی ڕاگەیاندرابوو. نەخۆشخانەکە پێویستی بە کاری پزیشکی پەنج هەبوو، بەڵام لەپاڵ ئەم کارەش شتێکی دیکەش هەبوو، پێویستی بە تاوتوێکردن بوو. تاوتوێمانکرد و بینیمان داهاتی ساڵانەی مودی دەبێت بە سەد و پەنجا هەزار دۆلار، پارەیەك کە یەکسەر سەرمەستیکردین.

لە لایەکەوە نەمدەویست لە دایك و باوکم دوورکەومەوە لە مەشیگان، لە لایەکی تریشەوە نەمدەتوانی پشتبکەم لە ژیانێکی تازەی پڕکامەرانی و گەیشتن بە پلەیەکی کۆمەڵایەتی بەرز.

جۆی و بەتایبەتی جۆنی شەش ساڵە، خۆشحاڵبوون بە چوونە ناو ژیانێکی تازەوە.

پێش زەماوەندمان ڕۆژێکیان جۆن پێیوتم، "مامـــی، بەڕاستی نازانم دەتوانم لەگەڵ مودی بژیم یان نا."

"بۆچی؟" پرسیارمکرد.

"زۆر شیرینیم بۆ دەهێنێت. وا بڕوات، ددانەکانم کرمێدەبن."

پێکەنیم، کە زانیم جۆن بە ڕاستییەتی. شیرینی و کاتی خۆشی بۆ ئەو، وەبیرهێنەرەوەی مودی بوو.

لە سەروو هەموو ئەم هۆ ژیربێژییانەوە بۆ شووکردن بە یەکتری، ڕاستییەکی چاوپۆشی لێنەکراو هەبوو، کە من و مودی یەکتریمان خۆشدەویست. نەمدەتوانی بێمە سەر ئەو باوەڕە، وازی لێبهێنم بچێت بۆ کۆرپوس کریستی لە جیهانێکی کرێکارنشینی پیشەسازی مەشیگان، ژیانێکی ناخۆش و یەکنەسەقی هەبێت.

لە شەشی حوزەیرانی هەزار و نۆ سەد و حەفتا و حەوت، بە مەراسیمێکی خۆمانەی بێدەنگ لە مەسجیدی هۆستن شوومان بە یەکتری کرد. پاش وتنەوەی چەند وشەی سادەی فارسی و ئینگلیز، بینیم بووم بە شاژنی شکۆمەند و جێگای پەسەند لە ژیانی مودیدا.

مودی بە گوڵ و دیاری نوقمیدەکردم، بەردەوام بە پیشاندانی خۆشەویستی خۆی سەرسامیدەکردم. پۆستی ڕۆژانە بەدەگمەن کارتێکی جوان یان سەرنجێکی خۆشەویستانەی دەستکردی ئەوی تیادا نەبووبێت، کە وشەکانی لە ڕۆژنامە دەکردەوە و لەسەر کاغەزێك بە کەتیرە دەیلکان بەیەکەوە. بەتایبەتی پێیخۆشبوو، لەبەرچاوی هاوڕێکانمان بە شانوباڵمدا هەڵبدات. جارێکیان لە داوەتێکی نانخواردنی نیوەڕۆدا، یادگارییەکی گەورەی بریسکەداری شینی ڕەنگ ئاڵتونی پێشکەشکردم، کە لەسەری نووسیبووی، "بۆ خۆشەویسترین هاوسەر لە جیهاندا." کاسێتی گۆرانییەکانم تا دەهات زۆرتر دەبوون. بە بۆنەی جۆراوجۆرەوە

کتێببارانی دەکردم، بەسەر هەر دانەیەکیانەوە لێدوانێکی خۆشەویستی خۆیی پێوە بوو. زەحمەتبوو ڕۆژێك تێپەڕێت و سۆزی خۆشەویستی بۆ من بە ڕێگایەکی تازە پیشاننەدا.

هەڵبژاردنی ژیرانەی مودی لە پیشەکەیدا، یەکسەر دەرکەوت. کاری پەنجکردن، یەکێکە لە پیشە پڕداهاتەکانی پزیشکی، بەبێ ئەوەی زەحمەتێکی زۆری تیادابێت. زیاتر سەرپەرشتی ئەو کارەی دەکرد، کە لەلایەن گروپێك سستەری دەبارهاتووی پەنجەوە ئەنجامدەدرا. ئەمەش ڕێگای بۆ دەکردەوە کە هاوکات خەریکی سێ چوار نەخۆش بێت و پارەیەکی زۆر بەدەستبهێنێت. کاری ڕۆژانی سەخت نەبوو. دەبوو بەیانیان زوو بۆ نەشتەرگەری ئامادەبێت، بەڵام زۆر جار لە کاتی نیوەڕۆدا دەگەیشتەماڵەوە. پێویستنەبوو خۆی بە کاژێری کاری نەخۆشخانەوە ببەستێتەوە و کاری ئێمێرجێنسیشی لەگەڵ پزیشکە پەنجەکانی تردا دابەشدەکرد.

لەبەرئەوەی لەنێو توێژی باڵای ئێرانییەکاندا گەورەببووبوو، بۆیە هیچ سەختییەکی نەبوو، دەوری دکتۆرێکی ئەمریکی سەرکەوتوو ببینێت. خانوویەکی گەورەی جوانمان کڕی لە ناوچەیەکی خۆشی کۆرپوس کریستی، کە بووین بە دراوسێی پزیشك، پزیشکی ددان، پارێزەر و باقی پیشەگەرەکانی تر.

مودی کارەکەرێکی بەکرێگرت، بۆئەوەی لە کاری ناوماڵ ڕزگارمبکات و لێهاتووی خۆم بخەمەگەڕ بۆ کاروباری نووسینگە. کاری ڕۆژانم ساناهی ئەنجامدەدا، وەك کاری نوفسەکەی مودی بۆ تۆماری نەخۆش و تێچوونەکانی. ئەو کاتەی بۆم دەمایەوە، تەرخانمکردبوو بۆ ماڵ و خێزانەکەم. بە بوونی کارەکەر، کە کارە ڕۆتینەکانی ناوماڵی دەکرد، خۆم خەریکی ئەو کارانە دەکرد کە مایەی خۆشیم بوون.

پەیوەندییەکی میوانی زۆرمان هەبوو. بەشێکی خۆمان پێمان خۆشبوو، بەشێکی تریشی دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی، کە ئەو پەیوەندییە زۆر گرنگ بوو بۆ پیشەی پزیشکی. پێش ئەوەی بچینە کۆرپوس ستی، کارێکی زۆر بەسەرشانی پزیشکە پەنجەکانەوە بوو. کارێك کە کەوتە سەرشانی مودی، جێگای پێزانین بوو لە لایەن هەموویانەوە. بەڵام بەهۆی ئەوەی ئاسایی پێشبڕکێیەك هەیە لە نێوان پزیشکەکاندا، بە هاتنی مودی ئەم پێشبڕکێیە تاوێکی بەگوڕتری بەخۆیەوە گرت. کارێکی زۆر هەبوو لە پێشمان بیکەین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وا بە پێویستمان زانی، کە ئەم پەیوەندییە کارییە بەهێزبکەین، بۆئەوەی جێگای خۆمان لە هەواری تازەدا خۆشبکەین. پزیشکانی نێو ئەم پەیوەندییە لە هەموو جۆرێکی تیادا بوو، لە پزیشکانی ئەمریکاییەوە تا پزیشکانێکی وەك مودی، کە لە وڵاتانی ترەوە هاتبوون بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان بۆ خوێندن و کارکردن. هەروەها پزیشکی هندی، سعودی، پاکستانی و کۆمەڵێك پەنابەرانی تری تیادا بوو. بەخۆشییەوە زۆر داب و نەریتی و کەلتوری یەکتری فێربووین. لە نێویاندا ناوم بەوە دەرکردبوو، کە خواردنی ئێرانی باش لێدەنێم.

هەروەها خۆبەخشانە کەوتمە یارمەتیدان لە نەخۆشخانە، وە بەو شێوەیە بە هاوسەری پزیشکەکانی تریش ئاشنابووم.
لە ڕووی پەیوەندی کۆمەڵایەتییەوە، بووین بە کەسانێکی ڕیزی پێشەوەی کۆمەڵگەکەمان. ڕێکەوت وابوو، کەوتینە نزیك زانکۆی تەکساسەوە، خوێندنگایەك کە جێگای پەسەندی فوتابییە ئێرانییەکان بوو. زۆر جار لە ماڵەوە میوانداری ئەم فوتابییانەمان دەکرد، وە وەکو ئەندامی ئەنجومەنی ئیسلامی لە خوارووی تەکساس، زۆر ئاهەنگ و مەڕاسیمان ڕێکدەخست، کە هاوکاتبوو لەگەڵ بۆنە ئاین و میللییەکانی ئێراندا.
زۆرم پێخۆشبوو، کە سەرئەنجام مودی توانی هاوکێشەیە بکات لە نێوان ئێستا و ڕابوردوویدا. لە خۆی ڕازیبوو، وەك دکتۆرێکی ئەمریکایی و کەسێکی بەتەمەنی لێزان بۆ گەنجە هاونیشتمانییەکانی.
مودی خۆی دەنواند کە بووە بە ئەمریکی، بە داواکردنی بوون بە هاووڵاتی وڵاتە یەکگرتووەکان. ، پرسیارێکی زۆر لە فۆڕمی داواکردنەکەدا بوو، کە بەشێکی ئەمانە بوو:

*ئایا بڕوات هەیە بە دەستووری بۆ ئێس و فۆڕمی حکومەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی؟*
*ئایا ئامادەی سوێندبخۆیت، بەبێ هیچ دوودڵییەك، وەفاداری وڵاتە یەکگرتووەکان دەبیت؟*
*ئەگەر پێویستبکات، ئایا ئامادەی لە پێناوی وڵاتە یەکگرتووەکاندا چەك هەڵگریت؟*

وەڵامی مودی بۆ ئەم پرسیارانە، بەڵێ بوو.
بەزۆری سەفەرماندەکرد، چەند جار سەردانی کالیفۆرنیا و تەکساسمان کرد. هەر کاتێك و لەهەر کوێیەك سیمینار یان کۆبوونەوەی پزیشکی هەبووایە، من و مودی، جۆی و جۆنمان بۆ شەوان لای دایەن جێدەهێشت و دەچووین. بەهۆی یاسای باجەوە دەمانتوانی لەسەر حسابی ئیش، بچین بۆ باشترین هوتێل و خۆشترین ڕێستوران. بۆ هەر شوێنێك بە ئیش سەفەرمانکردبێت، زەرفێکم بردووە لەگەڵ خۆم، هەرچی پارەیەکەمان خەرجکردبێت، پسولەکەیم خستۆتە ناوی، تا دوایی بتوانم بیکەم بە ڕاپۆرت و پارەکەی وەرگرمەوە.
هەندێك جار لەم گۆڕانە بنەڕەتییەی هەلومەرجی ژیانم ترسم لێدەنیشت، ئەوەکو ببێت بە دێوەزمەیەك بەسەرمەوە. هەرچەند بەناو کارێکم نەبوو، بەڵام لە هەموو کاتێك سەرقاڵتر بووم. سنوورێك بۆ پارەخەرجکردن و خۆشی نەبوو، وەك خۆشەویستێك بووبووم بە[redacted] ئیتر دەمتوانی گلەییــم لە چی هەبێت؟
لەسەرەتاوە بە ئاستەم گرفتێك هەبوو لەنێو ژیانی هاوسەرێتیماندا، بەڵام هەر دووکمان بڕیارماندابوو، پشتگوێیبخەین و لەسەری نەیکەین بە هەرا. لە چەند بۆنەیەکی دەگمەندا، کە کێشەیەك لە نێوانماندا دەقوما، زیاتر دەمانگەڕاندەوە بۆ جیاوازی کەلتوری

نێوانمان. وا دەردەکەوت ئەمانە بۆ مودی سەرنجڕاکێش نەبن، سەرسامیدەکردن تا ئەوەی ببێتە مایەی تووڕەیی. بۆ نموونە، کاتێك لە کۆرپوس کریستی چووین بۆ بانك، بۆ کردنەوەی حسابێکی بانکی، لەناو فۆرمی داواکردنەکەدا تەنیا ناوی خۆیی نووسی.

"ئەمە چییــە؟" پرسیارمـلێکرد. "بۆچــی ناوی منیش لەسەر حسابە بانکییەکە نانووسی؟"

لەوەدەچوو سەرسامــبێت. "ئێمە حساب بانکی بە ناوی ژنەوە نانووسین،" مودی وتی. "ئێرانییەکان ئەوە ناکەن."

"تــۆ لێرە ئێرانی نییت،" ڕەتمـدایەوە. "بڕیارە ئەمریکی بیت."

پاش گفتگۆیەکی کورت مودی نەرمبوو. ئاسایی وای دانابوو، ئەو سامانەی هەمانە ئەو خاوەندێتی.

خویەك کە ئازاریـدەدام، ئەوە بوو منی بە سامانی خۆی دەزانی، وەك حساب بانکییەکە. هەرکاتێك لەنێو خەڵکدا بووبین، دەویست لە تەنیشتی بم. هەمیشە دەستی لە ملمدا بوو یان دەستی دەگرتم، وەك ئەوەی بترسێت لەدەستی هەڵبێم. بە چاوتێوەبوون و پیشاندانی سۆز، مەرایی بۆ دەکردم، بەڵام هەندێك جار قسەی ڕەق و ناخۆشیشی تێدەکەوت.

زیاتر باوەڕپیارە بوو تا هاوڕێی مـامی، لەم بوارەشدا بۆی دەشەلی. سروشتی، وەك باوکێکی ئێرانی بەڕێدەکردەوە، داواکاربوو جۆی و جۆن بێ سێودوو گوێڕایەڵی بکەن. ئەمە بۆ جۆی بەتایبەتی پڕکێشە بوو، چونکو لە تەمەنی یانزە ساڵیدا بوو، سەرەتای خۆسەپاندنی بوو. پێش ئەوەش جۆی خۆی بە پیاوی خێزانەکە دەزانی.

پاشان ڕەزا بوو بە سەرچاوەی گەورەترین کێشەی نێوانمان لەو سەردەمەدا. ڕەزا لە زانکۆی دەوڵەتی واین لە دیترۆیت دەیخوێند و لەو ماوەیەدا، لە خانووە ڤاتییەکەی مودیدا دەژیا. هەر پاش ساڵێك بەسەر زەماوەندی من و موديدا، ڕەزا خوێندنی ماستەری لە ئابووریدا تەواوکرد و مودی فەرمووی لێکرد، لە ماڵی ئێمەدا بژی لە کۆرپوس ستی، تا کار دەدۆزێتەوە.

هەرکاتێك مودی لە ماڵەوە نەبووایە، ڕەزا لێمان دەبوو بە ئاغای ماڵ، هەوڵیدەدا ئاغایەتی بەسەر من و منداڵەکاندا بکات، بە مافی خۆی دەزانی، هەرچیمان پێبڵێت بە قسەیبکەین. بە ماوەیەکی کورت پاش هاتنی، ڕۆژێکیان دەعوەتی چەند ژنی هاوڕێی خۆمم کرد بۆ ماڵەوە بۆ چاخواردنەوە. ڕەزا لە ژوورەکەدا لەگەڵمان دانیشت، بەبێ ئەوەی ورتە لە دەمی بێتەدەرەوە، لەوە دەچوو گوێبیستی گفتگۆکەمان بێت، تا ئەگەر شتێکی بێزێزانەی تیادا دۆزییەوە بۆ مودی بگێڕێتەوە. هەر کە میوانەکان ڕۆیشتن، فەرمانیدا قاپەکان بشۆم.

"کــە کاتم بوو، دەیکەم،" بە ڕەقی وەڵامـدایەوە.

ڕەزا هەوڵیدەدا پێمڕاگەیەنێت، کەی جل بشۆم، چی بدەم بە کوڕەکان بۆ نانی نیوەڕۆ و کەی دەتوانم بچم بۆ سەردانی دراوسێکانمان بۆ قاوەخواردنەوە. هەوڵمدا تێیبگەیەنم، بەڵام ئەو لە قسەی خۆی نەدەکەوت. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوەندەی دەگەڕایەوە بە کاری ناوماڵ هیچ بەشدارییەکی نەدەکرد.

چەند جار لای مودی گلەییمکرد، لەسەر خۆتێهەڵقورتاندنی ڕەزا لە کاروبارمدا. بەڵام مودی لەوێ نەبوو بەچاوی خۆی بیبینێت و ئاموژگاریکردم کە ئارامبم. "تەنیا ماوەیەکی کورتە،" مودی وتی، "تا کارێکی دەستدەکەوێت. خوشکەزامە و دەبێت یارمەتیبدەم."

من و مودی حەزمان لە بازاڕی خانووبەرە بوو، بەدوای سوویەکی باشەوە بووین، دەمانویست هەندێك پارە بخەینەگەڕ و کەڵکی لێوەرگرین. بەو بۆنەیەوە پەیوەندییەکی باشمان لەگەڵ کۆمەڵێك فەرمانبەری لێهاتووی بانکدا هەبوو. داوامانلێکردن بۆ دانی کارێك بە ڕەزا، گفتوگۆیەکی لەگەڵ بکەن.

"وەك ژمێریار کارم پێدەدەن،" ڕەزا گلەییکرد، کاتێك لە گفتگۆکە گەڕایەوە. "وەك ژمێریار لە بانکدا کارناکەم."

"کەسانێکی زۆر بەدوای ئەو کارەوەن،" پێموت، ڤێزمەدەهاتەوە لە هەڵوێستی. "لەو کارەوە بواری بەرزبوونەوە زۆرە."

ڕەزا وەڵامێکی سەرنجڕاکێشی دامەوە - کە تا چەند ساڵ دواتر بە تەواوی تێینەگەیشتم، تا تەواو ئاشنابووم بە خۆپەرستی پیاوی ئێرانی، بە تایبەتی لەنێو خێزانی مودیدا ئاشکرا دیاربوو. ڕەزا وتی: "بە نیازنییم لەم وڵاتە کاربکەم، مەگەر ئەوەی بمکەن بە بەرپرسی کۆمپانیایەك."

ئامادەبوو لەسەر ورگی ئێمە بژی، تا ئەو کاتەی کۆمپانیایەکی ئەمریکی ئەقڵی بڕبکات، خۆی بخاتە ژێر دەستییەوە. ڕۆژانی بە خۆ دانە بەر خۆر لە قەراخ ئاو، قورئانخوێندن، نوێژکردن و کۆنترۆڵی هەڵسوکەوتی من دەبردەسەر. کاتێکیش بەدەست ئەمانەوە هیلاکدەبوو، سەرخەوێکی بۆ دەشکاند.

ئەو چەند هەفتەی مانەوەی، بوو بە چەند مانگ، تا وام لە مودی کرد، هەڵوێستێك بەرامبەر ڕەزا بنوێنێت.

"یان من لەم ماڵەدا دەبم یان ئەو!" مودیم ئاگادارکردەوە.

ئایا بەڕاستم بوو؟ پێدەچوو نا، بەڵام تەواو پشتم بەستبوو بە خۆشەویستی مودی بۆ من و دروستیش بۆی چووبووم.

ڕەزا لەبەرخۆیەوە بە فارسی کەوتە بۆڵەبۆڵ، ڕۆشن بوو قسەی بە من دەوت و پاشان ڕۆیشت بۆ ناو خانووی ڤاتی خۆی - کە مودی کرێکەی دەدا. پاشان بە ماوەیەکی کورت، گەڕایەوە بۆ ئێران و ئیسای ئامۆزای مارەکرد.

لەگەڵ ڕۆیشتنی ڕەزا، چووینەوە دۆخی خۆشی و کامەرانی خۆمانەوە، یان من پێم وابوو. من و مودی جیاوازی خۆمان هەبوو، بەڵام دەمزانی هاوسەرێتی چاوپۆشی پێویستدەکات. ئەو متمانەیەم هەبوو، کە سازان بە ڕۆیشتنی کات دێتە کایەوە.

لەسەر لایەنە باشەکان پێمـدادەگرت. ژیانم لە هەندێك ڕووەوە، چووبووە پێشەوە. هەرچی چۆنێك بوو، ئەو چاوەڕوانیانەی کە هەوڵم بۆ دەدا زیاترم دەستکەوت.

ئاخر چۆن دەبوو بزانم، لە ڕۆژهەڵاتەوە، لە دووری دە هەزار میلەوە، زریانێك بەڕێوەیە هاوسەرێتیم تێکدەشێنێ، لە نێو چواردیواردا بەندمدەکات، پەیوەندیم بە کوڕەکانمەوە دەپچڕێنێت و هەڕەشە نەك هەر لە ژیانی خۆم دەکات، بەڵکو لە کچە لەدایکنەبووەکەشم؟

ساڵ و نیوێك بەسەر زەماوەندماندا تێپەڕیبوو، بە ماوەیەکی کورت پاش سەری ساڵی تازەی 1979، کاتێك مودی رادیۆیەکی گرانی شەپۆل کورتی بە بیستۆکەوە بۆ خۆی کڕی. ئەوەندە بەهێزبوو، ئیزگەی لەو پەڕی دنیاوە وەردەگرت. مودی لەپڕ حەزی چووە سەر گوێگرتن لە رادیۆکانی ئێران.

قوتابیان لە تاراندا ڕژابوونە سەر شەقامەکان بۆ خۆپیشاندان لەدژی حکومەتی شا. لە ڕابوردوودا پێکدادان ڕوویدابوو، بەڵام ئەم جارەیان زۆر گەورەتر و بەرفەراوانتر بوو. لە پاریسەوە ئایەتوڵا خومەینی دوورخراوە، کەوتبووە دەرکردنی بەیاننامەی توند لەدژی شا بەتایبەتی و کاریگەری ڕۆژئاوا لەسەر ئێران بەگشتی.

ئەو هەواڵانەی مودی لە رادیۆکەیەوە دەیبیست، جیاواز بوو لەوەی ئێمە شەو لە تەلەفزیۆندا دەمانبینی. سەرئەنجام مودی کەوتە گومانەوە، سەبارەت بەو هەواڵانەی ئەمریکا بڵاویاندەکاتەوە.

کاتێك شا ئێرانی جێهێشت و ڕۆژ دوایی ئایەتوڵا خومەینی سەرکەوتووانە گەڕایەوە، ڕۆژ بوو بە ڕۆژی مودی. بەبێ ئەوەی من ئاگادارکاتەوە، چەند دەرزەن قوتابی ئێرانی بۆ ئاهەنگگێران هێنایە ماڵەوە. تا نیوەشەو مانەوە، ماڵە ئەمریکاییەکەم پڕبوو لە گفتگۆی گەرمی پڕ شوروشەوق بە زمانی فارسی.

شۆڕش تەنیا لە ئێراندا بەرپانەبوو، بەڵکۆ ماڵەکەی ئێمەشی گرتەوە. مودی بە پەرۆشییەکی وەهاوە کەوتە نوێژکردن، کە هەرگیز لەوەپێش پێمەوە نەدیبوو. کەوتە یارمەتیدانی ماڵی گروپە جیاوەزەکانی شیعە.

بەبێ ئەوەی پرسیار بە من بکات، هەرچی خواردنەوەی کحولی، کە لە ماڵەکەدا هەڵمانگرتبوو بۆ میوانداری، فڕێدایە دەرەوە. هەر ئەمە بەتەنیا، وای لە زۆربەی هاوڕێ ئەمریکییەکانمان کرد لێمان دوورکەونەوە، هەروەها شێوازی گفتگۆکردنی مودی میوانێکی زۆری تەردەکرد، کە لەلای ئێمە دەمیان بۆ خواردنەوە نەبردبوو. مودی لە میدیای ئەمریکا توڕەبوو، بە درۆزن ناوی دەبردن. لە ماوەی ئەو چەند مانگەدا، ماڵەکەمان بوو بە بارەگای

کۆبوونەوەی قوتابیان. گرووپێکیان دروستکرد بە ناوی "گرووپی موسڵمانانی نیگەران" و کەوتنە چالاکی و ئەم ڕاگەیاندنەیان بەناو میدیاکاندا بڵاوکردەوە:

*بەناوی خوای گەورە و میهرەبان*

*لە ئێستای وڵاتە یەکگرتووەکاندا، ئیسلام یەکێك لە نارۆشنترین زاراوەکانی ژیانی ڕۆژانەمان. بۆ ئەمەش چەند هۆیەك هەیە: 1. میدیاکان ڕاستییەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران دەشێوێنن، 2. ڕەتکردنەوەی هەڵسوکەوتی یەکسانیانە لەگەڵ وڵاتە ئیسلامییەکان لەلایەن یۆئێسەوە، 3. ڕەتکردنەوەی ئیسلام و پەیڕەوانی لەلایەن مەسیحییەتەوە.*

*ماسمیدیا کاریگەرییەکی بەرچاوی هەیە لە سەر کۆمەڵگای ئەمریکا. هەواڵەکانی ئێواران، ڕۆژنامە و گۆڤارە هەفتەییەکان بیروبۆچوونی گشتی لە قاڵبدەدەن. ئەم سەرچاوانە لە ئاستێکی بەرزی پروپاگاندەدا، تەنیا ڕاستییەك دەدەنە دەرەوە، کە لە خزمەتی بەرژەوەندی داهاتووی ئەمریکادا بێت. هەر بەو هۆیەوە، زۆر جار ڕووداوە نێودەوڵەتییەکان دەشێوێنرێن.*

*نموونەیەکی هەنوکەیی شێواندنی ڕووداوەکانی نێودەوڵەتی، هەلومەرجی سیاسی کۆماری ئیسلامی ئێرانە. ئەوە خەڵکی ئێرانە شایان ڕوخاندووە و یەکدەست خوازیاری دامەزراندنی کۆماری ئیسلامی بوون. لەو ماوەیەی پێشوودا زۆرمان بیست لەسەر کوردە یاخییەکان لە ئێراندا. ئەگەر کوردەکان بۆ ئۆتۆنۆمی دەجەنگن، ئەی بۆچی سەربازانی ئیسرائیلی، ڕوسی و عێراقی بەشداری لەم جەنگەکەدا دەکەن؟*

*شۆڕشی ئیسلامی لە ئێراندا ئەوەی پیشاندا، کە ئێرانییەکان دژی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکان نەك خەڵکی ئەمریکا. داواتانلێدەکەین بەوردی چاوێك بە ماسمیدیا بخشێنن. پەیوەندیبکەن بە ئێرانییە موسڵمانەکانەوە، ئەگەر دەتانەوێت ئاگاداری هەلومەرجی ئێستا بن.*

*سوپاستاندەکەین*
*گرووپێك لە موسڵمانانی نیگەران*
*کۆرپوس کریستی، تەکساس*

ئەمە زۆر زیاتر لە سەروو توانای منەوە بوو. کەوتمە بەرگریکردن لە وڵاتەکەم و شاتەشاتکردن بەسەر موودیدا. گفتوگۆکەمان بوو بە شەڕەقسە، کە ئاسایی نەبوو لەگەڵ ژیانی بێکێشەماندا.

"پێویستە ئاوێك بەم ئاگرەدا بکەین،" لە ناچاریدا پێشنیارمکرد. "ئاسایی ناتوانین لەگەڵ یەکتر لەسەر سیاسەت قسەوباس بکەین."

موودی ڕازیبوو، بۆ ماوەیەك توانیمان بێقرە پێکەوە هەڵکەین. بەڵام ئیتر من لە جەقی جیهانی ئەودا نەمام. هێما ئەوینە ڕۆژانەییەکانی، بوون بە یادگاری. لەوە دەچوو ژنی

بەسەردا هێنابم، ژنی تازەی بوو بە رادیۆ شەپۆلکورتەکەی و یەك دەرزەن رۆژنامە، گۆڤار و بڵاوکراوە، کە لەپڕ ئابونەی کردن. هەندێك لەمانە بە زمانی فارسی بوون و هەندێکی تریان بە ئینگلیزی. هەندێك جار کە مودیم لێدیارنەدەبوو، چاوێکم دەخشاند بەناویاندا، کە بۆم مایەی سەرسامی و ترس بوو، لەو هێرشە ناژیربێژییە دڕندانانەیە بۆ سەر ئەمریکا.

مودی داوای بوون بە هاووڵاتی یو.ئێس.ی وەرگرتەوە.

لەو کاتانەدا وشەی "جیابوونەوە" کەوتە سەرەتاتکێ لەگەڵم. وشەیەك بوو لێێ دەترسام و قینم لێی بوو. بەو ڕێگایەدا ڕۆیشتبووم، ئارەزووم نەبوو جارێکی تریش تاقیبکەمەوە. جیابوونەوە لە مودی، جیابوونەوە لە ژیانێك بوو، کە بەتەنیا نەمدەتوانی بەدەستیبهێنم، هەروەها نەمدەتوانی دەست لە هاوسەرێتییەك هەڵگرم، کە هێشتا لەو باوەڕەدا بووم لەسەر بناغەی خۆشەویستی دامەزراوە. سەرەڕای هەموو ئەوانە، دەستدانە ئەو ڕێگایە بەتەواوی چووە کەنارەوە، کاتێك زانیم دووگیانم.

شتێکی سەرناسا بوو، مودی هۆشی هاتەوەخۆی. شوروشەوقی لە هەلومەرجی سیاسی ئێرانەوە گەڕایەوە سەر ئەوەی شانازی بەوەوە بکات، کە دەبێت بە باوك. گەڕایەوە سەر خووە خۆشەکەی جارانی و زۆربەی ڕۆژ بە دیارییەوە دەهاتەوە ماڵەوە. هەرئەوەندەی سکم بەرزبۆوە، کەوتە ئەوەی پێشانی هەرکەسێکی بدات کە پێیخۆشبێت. سەدان وێنەی لێگرتم و پێیــدوتم، کە سکپڕی لە هەموو کات جوانتری کردووم.

سێیەم هاوینی هاوسەرێتیمان، بە چاوەڕوانییەکی ئارام بردەسەر بۆ لەدایکبوونی منداڵەکەمان. کاتێك مودی لە نەخۆشخانە کاریدەکرد، من و جۆن پێکەوە لە ماڵەوە بووین. جۆن تەمەنی هەشت ساڵ بوو، گەچکە پیاوێکی لێدەرچووبوو، یارمەتیدەدام بۆ ئامادەکردنی ماڵەکە بۆ هاتنی خوشك یان برا تازەکەی. پێکەوە ژووری نوستنێکمان کرد بە ژووری بەخێوکردن. پێکەوە خۆشیمان دەبینی لە کڕینی جلوبەرگی زەرد و سپی بۆ منداڵە ساوەکە. من و مودی چووین بۆ دەورەی لامێز[1]، لەوێ مودی ئەیشاردەوە، کە کوڕی پێخۆشترە. بۆ من گرنگ نەبوو. ژیانی تازەم لەگەڵ کوڕ یان کچ جیاوازی نەبوو، ئەوەی هەرئێستا لە سکمدا بوو خۆشمــدەویست.

سەرەتای مانگی ئەیلول بوو، سکم هەشت مانگ بوو، کاتێك مودی داوایلێکردم، لە گەڵی بچم بۆ کۆنفرانسێکی پزیشکی لە هۆستن. سەفەرەکە مایەی چەند ڕۆژ دڵخۆشی بوو بۆ هەر دووکمان، پێش ئەوەی بەرەوڕووبین لەگەڵ خۆش و شادی پڕەحمەتی بوون بە دایك و باوك. پزیشکی منداڵبوونەکەم مۆڵەتی پێدام، بەو پێشبینییەی کە هێشتا مانگێکم ماوە بۆ لەدایکبوونی منداڵەکەم.

بەڵام هەر لە یەکەم ئێوارێوە لە هۆستن، لە ژووری هوتێلەکەماندا، هەستم بە ئازارێك کرد لە سێبەندەمدا و نیگەرانیکردم کە کاتی منداڵبوونمە.

"هیچ نییە، باش دەبێت،" مودی دڵنیایکردم.

بۆ ڕۆژی دوایی مودی دەیویست سەردانی ناسا[2] بکات.

"هەستناکەم تەواو باشبم،" وتم

"باشە، کەواتە با بچین بۆ شتکڕین،" پێشنیاریکرد.

پێش شتکڕین، چووین بۆ نانخواردنی نیوەڕ، بەلام لە ڕێستورانەکە نازاری پشتم خراپتربوو، هەستمکرد، تەواو هیلاکم.

"با بچینەوە هوتێلەکە،" وتم، "لەوانەیە ئەگەر تۆزێك وچانبدەم، بتوانم بێم بۆ شتکڕین." کە گەڕاینەوە هوتێلەکە، ئاوم لەبەر دەڕۆیشت و ئازار بە تەواوی دەستیپێکرد.

مودی نەیدەتوانی باوەڕبکات، کە ئیتر کاتێتی.

"تــۆ لای خۆت دکتۆری،" پێمــوت. "ئاوم لەبەر دەڕوات. نازانی ئەوە بە واتای چی دێت؟"

مودی تەلەفونیکرد بۆ دکتۆری منداڵبوونەکەم لە کۆرپوس کریستی و پێیــوت، کە دکتۆر لە هۆستن ئامادەیە ئەرکی کاردەکە بکێشێت و داوادەکات یەکسەر بڕێت بۆ نەخۆشخانە.

شەوقی بەهێز و گەرمی گڵۆپی ژووری منداڵبوونم دێتەوە بیر، هەروەها دێتەوە یادم مودی لە تەنیشتم ڕاوەستابوو، جلێکی تایبەتی لەبەرکردبوو، دەستی گرتبووم و یارمەتیدەدام بۆ منداڵبوون. ژانەکانم لەبیرە، ژانێك کە یاوەریٔ بە دنیاهاتنی ژیانێکە و لەوانەیە ئاگادارکردنەوەیەك بێت بۆ داهاتوو، کـــە چی لەگەڵ خۆی دەهێنێت.

بەلام لە هەموو ئەو شتانەی کە زۆر زیاتر لەبیرمە، ئەو ساتەیە کە دکتۆرەکە ڕایگەیاند، "کچـــــتان بـــوو!"

هاواری خۆشی لە سستەرەکانی دەورم بەرزبۆوە، کاتێك ئەم زیندەودرە تازەیە هاتە دنیاوە. گێژ و خەواڵو پێکەنینم هات لە خۆشی، ئاسودەیی و هیلاکیدا. دکتۆر و سستەرەکان کەوتنە سەروکاری یەکەم خولەکەکانی ژیانی منداڵە ساواکەم و پاشان هێنایانەوە بۆ بینینی دایك و باوکی.

ساوایەکی ڕەنگ پیست کاڵ، بە چاوانی شینی گەشی نیوەکراوەوە، تەماشای ڕووناکی ژووری منداڵبوونەکەی دەکرد. قژی زەردی سووربـاوی لوولی، بە کاسەی سەری تەڕیەوە نوسابوو. دەموچاوی مودییان بچوککردبۆوە و کردبوویان بە دەموچاوی کۆرپەکەم.

"بۆچی قژی زەردە؟" مودی بە نیگەرانیەك کە تەواو لە دەنگیدا ئاشکرا بوو، پرسیاریکرد. "بۆچی چاوەکانی شینە؟"

"ئەوانە من بڕیارم لەسەر نەداوە،" وەڵامـدایەوە، ئەوەندە هیلاکبووم گوێمنەدا بە نیگەرانییەکانی مودی، سەبارەت بە منداڵێکی ڕێکوپێك کە دروستمکردبوو. "کۆپییەکە لە تۆ، ئەگەر ڕەنگی لێدەرکەمیت."

بۆ ساتێك ئەوەندە سەرنجم چوو بۆ لای بەبەکەم، ئاگاداری ئەوە ئەمام ڕەنگی ئاسمان چۆنە یان دکتۆر و سستەرەکان چیم لەگەڵ دەکەن. لە باوەشمگرت و خۆشمویست و بە گوێیدا چرپاندم، "بەنیازم ناوت بنێم مەریەم." ئەوەندەی من بزانم، ئەمە خۆشترین ناوی ئێرانییە و هەروەها وەك ناوێکی ئەمریکی وایە، بەڵام بە پیتی جیاواز دەنووسرێت.

چەند خولەك ڕۆیشت پێش ئەوەی ئاگاداربمەوە، کە مودی ڕۆیشتووە.

چ هەستێکی نامۆی جۆراوجۆر دایگرتم! ڕۆشن بوو، مودی نەیتوانیبوو پرسیارێك بهێنێتە سەر زمانی، کە بێگومان نیگەرانی کردبوو. "بـــۆچی کچـــــت بوو؟" جێهێشتنی من، سزایەك بوو لەبەرامبەر تاوانێك کە کردبووم. پیاوەتی ئیسلامی بریندار‌بوو بەوەی کە یەکەم منداڵی کچ بووە، ئەو شەوە تەنیا جێیهێشتین، لەکاتێکدا پێویستبوو بەسەر سەرمانەوە بێت. ئەوە ئەو جۆرە پیاوەتییە بوو، کە مـــــن نەمدەویست.

ئەو شەوەم بە خەوی پچرپچر تێپەڕاند، جارێك بەهۆی خۆشییەکی لەبنەنەهاتووی زیندەوەرێکی تازە، کە مەمکمی دەمژی و جارێك بەهۆی دڵتەنگی هەڵسوکەوتی منداڵانەی مودی. بۆم پرسیاربوو، ئایا ئەم هەڵچوونە نیگەرانییە، کاتی بوو یان هەروا دەمێنێتەوە. لە ڕاستیدا لەو ساتەدا ئەوەندە توڕەبووم، بۆم گرنگ نەبوو.

بۆ سبەینێ بەیانی زوو تەلەفونیکرد، بەبێ ئەوەی سەبارەت بە ڕۆیشتنی داوای لێبوردن بکات یان هێمایەك بکات بەوەی کە پێخۆشبووە کوڕمان بێت. باسیکرد، کە تەواوی دوێنێ شەو لەو *مەسجید*ەی، کە تیایدا مارەکراین، لە خوا پاڕاوەتەوە.

دوانیوەڕۆیەکی درەنگ گەیشتە نەخۆشخانە، بەخۆشییەوە پێکەنی و کۆمەڵێك کاغەزی پیشاندام، کە بە پێنووسی پەمەیی بە فارسی لەسەر نووسرابوو. ئەمانە دیاری ئەو پیاوانەیە کە لە *مەسجید* بوون.

"ئەو نووسراوانە چی دەڵێن؟" پرسیارمکرد.

"مەهتاب،" بەخۆشییەوە وەڵامیدایەوە.

"مەهتاب؟ بە واتای چی دێت؟"

"ڕووناکی مانگ،" وەڵامیدایەوە. باسیکرد، کە بە تەلەفون لەگەڵ خێزانەکەی لە ئێران قسەیکردووە و چەند ناویان بۆ منداڵەکە پێشنیارکردووە. مودی وتی، ناوی مەهتابم هەڵبژاردووە، چونکو دوێنێ شەو مانگ لە چواردەدا بوو.

من مەریەمم پێشنیارکردبوو، چونکو ناوەکە لەگەڵ ناوی ئەمریکی دەهاتەوە، منداڵەکە ئەمریکییە و لێرە دەمێنێتەوە. بەڵام من بێهێز بووم و کۆمەڵێك هەست و سۆز گێژیکردبووم، هەروەها مودی فۆرمی پێناسەی منداڵەکەی پڕکردەوە و بە مەهتاب مەریەم مەهمودی ناونووسیکردبوو. بە ئاستەم بۆم پرسیاربوو، کە چۆن ملبدەم بە ویستی هاوسەرەکەم.

مەهتاب تەمەنی دوو مانگ بوو، کراسێکی پەمەییم لەبەرکردبوو، لە نێو کەنتۆری پڕجلەکەی بۆم هەڵبژاردبوو. ئەم هەموو جلانە پیاوێك بۆی کڕیبوو، کە ئەوەندە خۆشی لە منداڵەکەی دەبینی، نیگەرانییەکانی سەرەتای زووی لەبیرچۆوە و لە نێو باوکاندا، ئەو لە هەمووان زیاتر، شانازی پێوە دەکرد. بەبەکەم لە باوەشمدا ئارام پاڵکەتبوو، چاوی لە چاوم بڕیبوو. ڕەنگی چاوی لە شینەوە بووبوو بە قاوەییەکی تاریك. لە دیاردەی ژیان وردەبۆوە، کە بە دەورماندا سەدان قوتابی موسڵمان ڕاکەڕاکەیان بوو، ئاهەنگی جەژنی قوربانیان دەگێڕا. چواری تشرینی دووەمی 1979 بوو.

وەك ئەندامێکی چالاکی ڕوو لە گەشەی ئەنجومەنی ئیسلامی خوارووی تەکساس، مودی یەکێك بوو لە ڕێکخەرەکانی پێشەوەی ئەم بۆنەیە، کە لە پارکێکی ناوچەیی بەڕێوەدەبرا. لەپاش منداڵبوون زوو هێزم تێگەڕایەوە و هەر ئەوەندەی ئەم بۆنانە لە سیاسەتەوە دووربونایە، پێمخۆشبوو بەشداری لە ئامادەکردنیاندا بکەم. یارمەتیمدان بڕێکی زۆر لە برنج لێنرێت. لەگەڵ ژنەکانی تر، کە تێکەڵێك بوون لە ئێرانی، میسری، سعودی، سودانی و ئەمریکی، چەندین شلەی جۆراوجۆرم لێنا. خەیار، تەماتە و پیازمان قاشقاشکرد و ئاوی لیمۆمان پیاکرد. پاقلاوە و چەند سەبەتە میوەی جۆراوجۆری تازەمان ئامادەکرد.

هەرچی چۆنێك بوو، لەم بۆنەیدا پیاوان بەشدارییەکی زۆریان کرد لە ئامادەکردنی خواردنەکاندا. ئەم ئاهەنگە بیرەوەری ئەو ڕۆژە بوو کە خوا فەرمانیدا بە ئەبرەهام، کوڕەکەی خۆی، بە ناوی ئیسحاق، قوربانیبکات، بەڵام پاشان پێیدەڵێت، بەرخێك قوربانیبکات لەجیاتی کوڕەکەی. چەند پیاوێك مەڕی زیندوویان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، ڕوویان لە مەککە کرد و پاش خوێندی چەند ویرد، مەڕەکانیان سەربڕی. پاشان بردیان بۆ لای شوێنی ئاگرکردنەوە و کەوتنە گۆشتبرژاندن.

چونکو ئاهەنگەکە لە لایەن موسڵمانانی وڵاتانی تریشەوە بەڕێوەدەبرا، بێجگە لە ئێران، قسەوباسی سیاسی لە ناو چەند کۆمەڵە کەسانی دابڕاو لە یەکتر چەقیبەست، کە بەخۆشییەوە باسی هەوڵی سەرکەوتوانەی ئایەتوڵاکانیان دەکرد لە کۆکردنەوەی هێز لە دەستی خۆیاندا.

خۆم بەدوور ڕاگرت لەم گفتوگۆیانە، لە جیاتی ئەوە تێکەڵی کۆمەڵێکی فەراوانتر بووم لە هاوڕێیانی ژن، کە ئەونەیەکی بچووککراوە بوون لە نەتەوە یەکگرتووەکان. زۆربەیان حەزیان لەم جۆرە بۆنە کەلتورییانەی ڕۆژهەڵات بوو، بەڵام خۆشحاڵبوون بەوەی لە ئەمریکادا دەژین.

پاش ئاهەنگەکە کوڕەکانم لە ماڵەوە جێهێشت، من، مەهتاب و مودی سواری ئوتومبیل بووین بۆ دالاس بۆ بەشداری لە کۆبوونەوەیەکی پزیشکیدا. لە ڕێگادا لە ئوستین لاماندا بۆ سەردانی چەند خزمێك، کە لەوە دەچوو هەر ڕۆژە لە بەرەودا بن، ئەوانیش وڵاتەی خۆیان جێهێشتبوو هاتبوون بۆ ئەمریکا. مودی بە "خوشکەزا" ناوی لێدەبردن، ئەوانیش بە

"*دایی جون*" بانگیاندەکرد. ئەو ئێوارێیە پێکەوە نانمان خوارد و مودی ڕێکەوت لەگەڵیان، کە بۆ سبەینێ بەیانی لە هۆتێلەکە پێکەوە نانی بەیانی بخۆین.

لەبەر هیلاکی ڕۆژی پێشوو، شەو درەنگ نوستین. بۆ بەیانی دردنگ هەستاین و کەوتینە پەلەپەل بۆ خۆئامادەکردن، فریای تەماشاکردنی تەلەفیزیۆن نەکەوتین. کە هاتینە خوارەوە بۆ ڕاڕەوی هوتێلەکە، یەکێك لە "خوشکەزاکان"، کە کوڕێکی گەنج بوو بە ناوی جەمال، بە نائارامییەوە چاوەڕوانی ئێمە دەکرد. "*دایی جون!*" کوڕەکە وتی. "هەواڵەکەت بیست؟ باڵوێزخانەی ئەمریکایان لە تاران گرتووە." پێـــکەنی.

مودی بۆی دەرکەوت، کە هەڵسوڕانی سیاسی یاریکردنە بە ئاگر. لە سەرەتاوە لەو پەڕی دنیاوە لە جێگایەکی گەرم و نەرمەوە، ئەوەندە هەستی بە ئامان دەکرد کە لایەنگری خۆی ڕاگەیەنێت بۆ شۆڕش و خەوی ئایەتوڵا بۆ گۆڕینی ئێران بۆ کۆمارێکی ئیسلامی. وەك دەڵێن، دەنگی دەهۆڵ لە دوور خۆشە.

بەڵام ئێستا قوتابیانی زانکۆ کارێکی شەڕانیان بەرامبەر ئەمریکا کردووە، مودی بۆی دەرکەوت، کە بۆ خۆی بەرەو ڕووە لەگەڵ ئاکامی مەترسیداری ئەم کارە. کاتێکی گونجاو نەبوو، ئێرانی بیت و لە ئەمریکادا بژیت - یان هاوسەر بیت لەگەڵ ئەمریکییەکدا. قوتابییەکی ئێرانی بە دەستی دوو کەسی نەناسراو، تێهەڵدانی خواردبوو لە تەکساس و مودیش نیگەران ئەوە بوو، هەمان شتی بەسەربێت. هەروەها لە ئەگەری گیران یان دیپۆرتکردن دەترسا.

هەندێك خەڵك لە نەخۆشخانە دەستیان کردبوو بەوەی بە "دکتۆر خومەینی" هێماییێبکەن. جارێکیان وتی، کە ئوتومبیلێك هەوڵیداوە لەسەر شەقام بیکات بەژێرەوە. چەند تەلەفونی هەڕەشەمان بۆ هات. "دەستت لێهەڵناگرین،" کەسێك بە زاراوەیەکی باشووری لە سەر تەلەفون وتی. "دەتکوژیـــن." بەڕاستی مودی ترسا، پەیوەندیکرد بە کۆمپانیایەکی پاسەوانییەوە تا چاودێری ماڵەکە و ئێمە بکەن، لە کاتی چوونە دەرەوەماندا.

تۆ بڵێت ئەم شێتێتییە تەواوبێت؟ بۆم جێگای پرسیاربوو. بۆچی پیاوان من کێشدەکەنە ناو ئەم کێشمەکێشە کەرانەیەوە؟ بـــۆچی وازملێناهێنن هەر تەنیا هاوسەر و دایك بم؟

مودی بینی، ناتوانێت خۆی بەدوور ڕاگرێت لەم کێشمەکێشە نێودەوڵەتییە. بۆی زۆر مەحاڵ بوو، لەم نێوەدا بێلایەن بمێنێتەوە. هاوڕێ ئێرانییەکانی هەوڵیاندەدا، وەك هەڵسوڕاوێك بەلای خۆیاندا ڕایکێشن، بۆ ڕێکخستنی خۆپیشاندان و بەکارهێنانی ماڵەکەمان وەك بنکەیەك. هاوڕێ ئەمریکییەکانمان و دراوسێکانمان، هەروەها هاوشانەکانمان لە نەخۆشخانە چاوەڕوانبوون و داوایاندەکرد، مودی وەفاداری خۆی ڕاگەیەنێت بۆ وڵاتێك، کە ژیانێکی خۆشی بۆ دەستەبەرکردووە.

له سەرەتاوە لە گوماندا بوو، نەیدەزانی ڕوو لە کوێ بکات. لە پەیوەندی شەخسی خۆیدا کەیفی دەهات بە ڕووداوەکانی بنبەستی بارمتەکانی تاران، بێپەردە پێیخۆشبوو لەبەرچاوی جیهانیان سوکایەتی بە ئەمریکا بکرێت. لەم پەیوەندەدا ڕقم لێیدەبۆوە و قسەوباسێکی ناخۆشمان پێکەوە هەبوو. هەر ئەیدەبڕییەوە شاڵاویدەکردە سەر ئەمریکا لەسەر گەمارۆی چەک لە دژی ئێران. یەك لەسەر یەك دووپاتیدەکردەوە، کە ئەمە گێچەڵێکی تیادایە وا ئەمریکا لە ڕێگای وڵاتی سێیەمەوە، بە نرخێکی گران، چەك دەنێرێت بۆ ئێران.

شتێکی نامۆ ڕوویدا. مودی پەیوەندییەکی نزیکی بەست لەگەڵ دکتۆر موجەلالی، کە پزیشکێکی ئێرانی نەشتەرگەر بوو. لەبەرئەوەی لە ئێران خوێندنی تەواوکردبوو، مۆڵەتی کارکردنی لە ئەمریکادا نەبوو، بەو هۆیەوە وەك تەکنیککار لە تاقیگەی دەرمانی کاریدەکرد. بەڵام مودی زۆر بەڕێزەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرد، وەك هاوشانێکی خۆی و پێکەوە بەخۆشییەوە لەگەڵ قوتابییانی ئێرانی کاریاندەکرد. لەپڕ مودی پەیوەندی پچڕاند لەگەڵ دکتۆر موجەلالی و تەنانەت قسەشیان نەما، بەڵام مودی ئامادەنەبوو پێمـبڵێت بۆچی.

لە نەخۆشخانە مودی ڕێگایەکی گرتەبەر کە توشی کێشە نەبێت. سەرەڕای ئەوەش ڕێگەیدەدا، قوتابییەکان لە ماڵەکەماندا کۆببنەوە، بەڵام هەوڵیدەدا ئەم کۆبوونەوانە بە نهێنی بمێنەوە و کۆششیدەکرد خۆی لە گفتگۆی سیاسی دووربخاتەوە. دەیوت گوایە پەیوەندی بە "گروپی موسڵمانانی نیگەران"ەوە پچڕاندووە. لە نەخۆشخانە بەیاخیدایەوە بە کارەکەی.

بەڵام ئەم هەوڵانە لە بەڵای دوورنەخستەوە. ئەوەندە لایەنگری سیاسی دیاربوو، بۆ هەرکەسێك بیویستایە نیشانەی لێبگرێتەوە، بە ئاسانی دەیپێکا.

هەلومەرجی پڕ کێشمەکێش ئاکامەکەی دەرکەوت. فەرمانبەرانی پەنج لە نەخۆشخانە، مودییان تاوانبارکرد بەوەی لەکاتی نەشتەرگەریدا گوێ لە رادیۆ شەپۆلکورتەکەی دەگرتێت بە بیستۆك، کە وا چاوەڕواندەکریت تەواوی هۆشی لای کارەکەیەوە بێت. تاوانبارکردنێك بوو، کە لە مودییەوە دوورنەبوو. لە سەرێکی ترەوە دەمزانی هەلومەرجی کارەکەی مودی چۆنە. من و مودی زۆر ڕازیبووین بەو داهاتە بەرزەی کە لەم پیشەیە دەستماندەکەوت، بەڵام دەشمانزانی ئەمە پیشەیەکە زۆر کەس پێشبڕکێی لەسەر دەکات. لەوە دەچوو "هاوشانەکانی" مودی بوارێکیان دۆزیبێتەوە، تەنگی پێهەڵچنن و بەشێکی زیاتر لەم پیشەیە بەرن بۆ خۆیان.

ئەم مشتومڕە دووبەرەکییەکی زۆری نابۆوە لەنێو فەرمانبەرانی نەخۆشخانەکەدا. بێگومان کێشەیەکی زیاتری بەدواوە بوو، بەتایبەتی کە بنبەستی بارمتەکان درێژەیکێشا و هیچ ڕێگاچارەیەکیش بەدینەدەکرا.

کە ساڵی پرکێشە لە کۆتاییەکەی نزیکدەبۆوە، مودی لە ناوەڕاستی هەر دوو بەرە نێودەوڵەتییەکەدا بوو، ئەوەندە جێگاکەی لەق بوو، کە لە هەر دوو لاوە بەر شەپۆلی هێرش دەکەوت.

بۆ کریسمس چووین بۆ مەشیگان بۆ سەردانی دایك و باوکم. شوێنێکی ئاسودە و ئارام بوو لەچاو ئەو فشارە لەڕادەبەدەرەی کۆرپۆس کریستی. پێکەوە پشوویەکی خۆشمان بردەسەر لەگەڵ دایك و باوکم. جۆی، جۆن و مەهتابە بەبە لە ناو دیاریدا نوقمبوون. لەنێو ڕۆژە خۆش و بێکارییەکانی پشووەکەدا، کەڵکەڵەی خۆدەربازکردن لە ژیانی پرکێشەی کۆرپوس کریستی کەوتەسەرمەوە. مودی خۆشی لە مەشیگان دەبینی. ئایا گەڕانەوەمان بۆ ئێرە لەبەرچاو دەگرێت، ئەگەر بوارێکی بۆ کارکردن هەبێت؟ ئایا دەرگای شوێنێك بۆ کار کراوەیە؟ دەمزانی، ئەگەر مودی سەردانی هاوشانە کۆنەکانی بکات، لەوانەیە ئەم بابەتە بکەوێتە بەر باس، بەو هۆیەوە ڕۆژێکیان پێشنیارمکرد، "بۆچی سەردانی هاوڕێ کۆنەکانت ناکەیت لە کارسۆن ستی؟"

بەم پێشنیارە گەشایەوە. لێرە مودی ڕابوردوویەکی سیاسی نەبوو، لەبەرئەوە لە کەشێکی پاکتردا گفتگۆی لەگەڵ هاوڕێکانی دەکرد. سەردانەکە حەزی بە پیشەکەی دەمەزەردکردەوە و بیریخستەوە، بوارێك هەیە کە تیایدا ڕەگەز ناتوانێت دەورێك ببینێت. لەو پەڕی خۆشیدا بوو، کاتێك پێیوتم، کە دکتۆرێك پێیڕاگەیاندووە، "سڵاو! کەسێك دەناسم بەدوای پزیشکی پەنجدا دەگەڕێت."

مودی تەلەفونیکرد بۆ کەسەکە، کە دکتۆری پەنج بوو لە ئەلپێنا و داوای کارەکەی کرد، ئەویش بانگیکرد بۆ دیمانەی کارەکە. کارەکان بە خێرایی چووە پێشەوە. من و مودی منداڵەکانم لە لای کەسوکارم جێهێشت و سواری ئوتومبیل بووین بۆ سەردانی دیمانەکەر، کە سێ کاژێر ڕێگا بوو.

بەفر پڕوشەی دەکرد کاتێك کەوتینە ڕێ، لە ڕێگادا دار و سرودەکان بەرگێکی سپییان پۆشیبوو. دیمەنی جوانی زستان، زاخاوێك بوو بۆ مێشکی پڕ جەنجاڵی سێ ساڵی تەکساسی گەرم و ڕووتەنی. "ئێمە چۆن توانیومانە لەم ناوە دوورکەوینەوە؟" مودی لەبەر خۆیەوە وتی.

لەناو کەشی زستانی پڕ جوانی، نەخۆشخانەی ئەلپێنامان دۆزییەوە. کە کۆمەڵێك خانووی مۆدێرن بوون، بە کۆمەڵێك پارك دەوردرابوون. مراوییە کەنەدایییەکان باڵەفڕێیان بوو بەناو دارەکاندا، بەبێ ئەوەی خۆیان بە دارەکاندا بکێشن. لە دوورەوە کۆمەڵێك گردم لێوە دیاربوو، کە بەرەو ئاسۆ یەکتریان بڕیبوو.

دیمانەکە ئاسان چووە پێشەوە. دیاربوو نەخۆشخانە پێویستی بە دکتۆرێکی پەنجی تر هەبوو. لە کۆتاییدا پزیشکی دیمانەکەر، زەردەخەنەیەکی کرد، دەستی تەوقەی ڕاکێشا و وتی، "کەی دێیت؟"

چەند مانگی پێچوو تا لە کۆرپوس کریستی خۆمان ئامادەکرد. مودی لە هەموو کات زیاتر ئامەزرۆی گواستنەوە بوو، لە گرمەی ئەو هەوا گەرمەی تەکساسدا، مودی هەوافێنککەرەوەی ماڵەکەی دادەگیرساند، بۆئەوەی بتوانێت لە ناو موغمیرییەکەدا ئاگرێک بکاتەوە. ئەم ئاگرکردنەوەیە مەشیگانی بیردەخستەوە. ئەو ئەرکانەی پێویست بوو بۆ گواستنەوە بە مەزاجێکی شادەوە ئەنجاماندا. بۆ جارێکی تریش بووینەوە بە یەک، دەست لەناو دەست بەرەو یەک مەبەست. مودی بۆ جارێکی تر ڕێگای خۆیی هەڵبژاردەوە: لە ئەمریکادا دەژی و کار دەکات. دەبێت - بوو بە ئەمریکی.

ماڵەکەمان لە کۆرپوس کریستی فرۆشت، ئەو موڵکی خانووەی کڕیبوومان، وەک سەرمایەیەک هێشتمانەوە. لە بەهاردا لە ئەلپێنا دامەزراین، لە دووری سێ کاژێر لە دایک و باوکمەوە، لە دووری ملوێنێک میل لە ئێرانەوە.

تێبینییەکان:

1. Lamaze classes، لە زۆربەی وڵاتانی ڕۆژئاوا، دایک و باوک دەتوانن پێش ئەوەی منداڵەکەیان بەدنیابێت، دەورە ببینن تا فێربن چۆن هەڵسوکەوتبکەن لەگەڵ منداڵە تازە لەدایکبووەکەیان.

2. NASA، کورتکراوەی، National Aeronautics and Space Administrationە، کە ڕێکخراوێکی حکومی ئەمریکییە و کار لەسەر بواری گەردوون دەکات.

# 16

ئەلپێنا زۆر دووربوو لەو خانووە دڵتەنگەی، کە تیایدا بەندکرابووم. دایک و باوکمم زۆر لێدووربوون. جۆی و جۆن زۆر لێمدووربوون. هەروەها مەهتابیش!

ئایا لە ماڵی مامل و نەسرینە؟ ئاواتەخوازبووم لەوێ نەبێت. حەزمدەکرد لە ماڵی یەکێک بێت، بیناسێت و پێیخۆشبێت، لە لای کەسێک بێت کە مەهتابی خۆشدەوێت. ئایا لەگەڵ عەمە بزورگە؟ ئەو پرسیارە توڕەیدەکردم. ئـــای، کە چەند گریام بۆ منداڵەکەم!

بە تاقی تەنیا لەناو خانوویەکدا بۆ تەواو ڕۆژ و دەرگا لەسەر داخراو، نیگەرانیکردبووم، نیگەرانی مەهتاب و ترسی تێکچوونی باری دەروونی خۆم بووم. لەو پەڕی بێهیوایی و پەشیمانیدا، پەنام بۆ شتێک برد، کە بە مەهتابم وتبوو. هەرکاتێک هەستت بە تەنیایی کرد، دەستبکە بە ویرد خوێندن. ئیتر هەرگیز بەتەنیا نابیت.

چاوم داخست و کەوتمە هەوڵدان. خوایە گیان، یارمەتیمـبدە! دەستمپێکرد ... بەڵام مێشکی هیلاکم تلیسایەوە، لەپڕ هەستی تاوانباری دایگرتم. ساڵەها بوو دینم پشتگوێخستبوو، ئێستا کە بوومەتە بارمتە لە وڵاتێکی نامۆدا، ئینجا ڕوو لە خوا دەکەم. بۆچی ئیتر گوێم بۆ ڕاگرێت؟

دووبارە کەوتمەوە هەوڵدان. لە ویردی گەڕانەوەی من و مەهتاب بۆ ئەمریکا، دەستمهەڵگرت. تەنیا کەوتمە دوعای بەیەک شادبوونەوەی هەردووکمان. خوایە گیان، یارمەتیمـبدە بە مەهتاب شادبمەوە. بیپارێزە و ئاسوودەی بکە. ڕێگەیبدە با بزانێت، کە تۆ ئەوت خۆشدەوێت و تەنیا جێیـناهێڵیت و منیش ئەوم خۆشدەوێت. یارمەتیمبدە، ڕێگایەک بدۆزمەوە تا بتوانم بیهێنمەوە.

شتێک - کەسێک؟ - پێیـوتم چاو بکەمەوە. ئایا لە ڕاستیدا گوێم لە دەنگێک بوو یان نا؟ چاوم کردەوە، بینیم جانتا دەستییەکەی مودی لە قوژبنێکی ژوورەکەدا بەجێماوە. ئاسایی ڕۆژانە لەگەڵ خۆی دەیبرد، بەڵام ئەو ڕۆژە لە یادیچووبوو یان زیاتر خۆی جێیهێشتبوو. ئارام هەستام و چووم بۆ پشکنینی. نەمدەزانی چی تیادا هەڵگرتووە، بەڵام ئەگەری ئەوەم دانابوو، شتێکی تیادا بێت بەکەڵکی من بێت. ڕێی تێدەچوو، کلیلی دەرگایەکی تیادا بێت؟

جانتاکە بە چەند قفڵی ژمارەدار داخرابوو، مودی خۆی ژمارەی بۆ دانابوون، من بۆ خۆم نەمدەزانی، بە چ ژمارەیەک دەکرێنەوە. "لە سفر - سفر - سفرەوە دەستپێدەکەم" لەبەر خۆمەوە وتم. دەبوو بە شتێکەوە خۆم خەریکبکەم.

جانتاکەم برد بۆ ژووری نوستنەکەی مامل و نەسرین، تا بتوانم لە پەنجەرەی پێشەوە، گوێم لە نزیکبوونەوەی هەر کەسێک بێت کە دەگەڕێتە ماڵەوە. لەسەر ناوفەرشی ژوورەکە دانیشتم و قفڵەکانم لە سەر ژمارەی سفر - سفر - سفر دانا. دەستم بە

دوگمەکاندا نا، نەکرانەوە. ژمارەکانم گۆڕی بۆ سفر - سفر - یەك و دیسانەوە هەوڵمدا، بێئاکام بوو. هۆشیشم هەر بەلای شەقامەکەوە بوو، تا زوو ئاگاداری هاتنەوەی مودی بم، هاوکات لە هەوڵی گۆڕانی سستماتیکی ژمارەکاندا بووم: سفر - سفر - دوو، سفر - سفر - سێ، سفر - سفر - چوار. هەروا بەردەوامبوو، کردنی کارەکە یارمەتیدەر بوو بۆ کاتکوشتن، بەڵام هاوکات خۆشخەیاڵییەکم تێکەڕا.

گەیشتمە یەك - سفر - سفر، هەر بێسەرئەنجام بوو. بەردەوامبووم. هاتمە سەر ئەو باوەڕەی کە هەوڵەکەم سەرناگرێت، دەشێت جانتاکە هیچی وای تیادا نەبێت بەدەردی شتێکی من بخوات. نۆ سەد ژمارە هەبوون تاقیانبکەمەوە و هیچ شتێکی تریش نەبوو، کاتی پێبەرمەسەر.

گەیشتمە یەك - یەك - چوار. هیچ

یەك - یەك - پێنج. هیچ. ئەوە بۆچی برالە؟

یەك - یەك - شەش. هەر هیـــچ. دەبێت بە چی، ئەگەر مودی بە ئەسپایی بگەڕێتەوە و بەدزییەوە بێتە ژوورەوە و ببینێت، خەریکی پشکنینی شتە تایبەتییەکانی ئەوم؟

ژمارەکانم گۆڕی بۆ یەك - یەك - حەوت و نائومێدانە پەنجەم نا بە دوگمەکاندا. قفڵەکان زرمەیان لێهەڵسا و کرانەوە!

جانتاکەم کردەوە و لە خۆشیاندا ئاهێکم لێبەرزبۆوە. تەلەفونەکەی تیادا بوو، تەلەفونێکی نوێباو بە دوگمەی جۆراوجۆرەوە. مامل لە سەردانێکیدا بۆ ئەڵمانیا کڕیبووی. پلاکی تەلەفونکە وەك پلاکی کارەبا وابوو، دوو فیشی هەبوو، دروست بە پلاکی هێڵی تەلەفونی دیوارەکە دەهاتەوە.

ڕامکرد بۆ شوێنی پلاکی هێڵی تەلەفونکە و بەهێواشی پلاکی تەلەفونەکەم پیاداکرد. ئیسا لە خوارەوە، دروست لە ژێرمدا بوو. دەنگی هاتوچۆی خۆی و نوکەنوکی منداڵەکەی دەهاتەگوێم. ئاگاداربووم، تەلەفونی ئێرە شەقوشڕە، هەرجارەی لێرەوە ژمارەی تەلەفونەکەت لێدەدا، لە خوارەوە لە دەزگای تەلەفونەکەدا خرەخرێ دەکرد. ئیسا ئەمەی دەزانی و تێدەگەیشت خەریکی چیم. ئایا دەمتوانی ئەم سەرکێشییە بکەم؟ نــا، تائێستا ئیسا پیشانیـدابوو وەفای بۆ کێیە. ڕازینەبوو بەو شتانەی مودی دەیکرد، بەڵام گوێڕایەڵ بوو. ئەگەر *دایی جون* داوای لێبکردایە، سیخوری بەسەرمەوە دەکرد.

کات ڕۆیشت - بیست خولەك یان نیو کاژێر. لە هۆڵەکەدا ڕاوەستابووم و تەلەفونکە بەدەستمەوە بوو، ئامادەبووم لە پلاکەکەی ببستم، بەڵام ئاکامی سەرکێشییەکەی خۆمم لێکدەدایەوە. دەنگی کرانەوە و داخستنی دەرگای ناوەوەی نهۆمەکەی ئیسا هاتەگوێم، پاشان دەرگای دەرەوە. ڕامکرد بۆ لای پەنجەرەکە و سەرم نا بە پەرژینەکەیەوە، تا فریابکەوم لە کاتی خۆیدا ئیسا و منداڵەکانی ببینم لە دەرەوە. بەدەگمەن ئیسا ماڵەوەی جێدەهێشت، هەتا بۆ چەند خولەکێك. ئەمە وەك وەڵامێك وابوو بۆ ویردەکەم.

یەکسەر تەلەفونەکەم بەست و ژمنگم لێدا بۆ هێلین، بەدرێژی باسی خراپبوونی هەلومەرجی خۆمم بۆ کرد.

"وامەدەزانی لە ماڵی ئلینیت،" هێلین وتی، "لە هەوڵی ئەنجامدانی شتێك دایت."

"نـــا، دەرگای لەسەر داخستووم. مەهتابی لێسەندووم، نازانم لە کوێیە یان هەتا حاڵی باشە خراپە، نازانم."

"دەتوانم چی بکەم بۆ تۆ؟" هێلین پرسیاریکرد.

"نامەوێت هیچ شتێك بکەیت، تـــا مەهتابم دەستدەکەوێتەوە،" بەخێرایی وتم. "نامەوێت شتێك بکەیت، مەهتاب بخەیتە مەترسی ئەوەوە ئیتر نەیبینمەوە."

"بۆچی قسە لەگەڵ میستەر ڤینکۆپ ناکەیت؟" هێلین پێشنیاریکرد. ڤینکۆپی خێرا هێنایە سەر تەلەفونەکە. جارێکی تر لێم دووبارەکردنەوە، کە نامەوێت باڵویزخانە بکەوێتە سەرکێشی بۆ یارمەتیدانی من، تا لەگەڵ مەهتاب یەکتری دەگرینەوە.

"تۆ ژیرانە بیرناکەیتەوە،" ڤینکۆپ ئامۆژگاریکردم. " دێین و تۆ لەوێ دەهێنینە دەرەوە. پۆلیس ئاگاداردەکەینەوە، کە تۆی لە ماڵەوە بەندکردووە."

"نـــــەء!" لە تەلەفونەکەدا قیژاندم. "ئەمە فەرمانی منە. داواتانلێدەکەم هیچ شتێك نەکەن. هەوڵنەدەن پەیوەندی بە منەوە بکەن. هیچ شتێك مەکەن بۆ یارمەتیدانی من. هەرکاتێك بتوانم پەیوەندیتان پێوە دەکەم. بەڵام نازانم کەی دەبێت - بەیانی، شەش مانگی تر، نـــازانم. بەڵام هەوڵی پەیوەندی مەدەن لەگەڵ مندا."

تەلەفونەکەم داخستەوە، کەوتمە تاوتوێکردنی ئەوەی بوێرم تەلەفونێك بکەم بۆ ئلین بۆ شوێنی کاردەکەی. بەڵام دەنگی بادانی کلیلی دەرگای حەوشە هاتەگوێم. ئیسا و منداڵەکانی هاتنەوە. خێرا تەلەفونەکەم لێکردەوە و خستمەوە ناو جانتاکە و گەڕانمەوە بۆ شوێنەکەی خۆی، کە مودی جێیهێشتبوو.

یەکسەر خەیاڵم چوو بۆ لای ئەو وێنەیەی، کە لە مودیم گرت، کاتێك مەهتابی لەگەڵ خۆی دەبرد. لەناو فلیمی کامێرەکەدا وێنەی تریشی تیادا بوو، ئەگەر ڕۆژێك بیانشواتەوە، تێدەگات چیم کردووە و دڵنیاشم توڕەدەبێت. لەناو جانتای کامێرەکەدا بۆ فلیمێکی تازە گەڕام بیخەمە ناوی لە جیاتی کۆنەکە، بەڵام نەمدۆزییەوە.

وێنەکە لەوەدەچوو زۆر گرنگ نەبێت، چونکو تەنیا پشتی مودی تیادا دیاربوو، کە پاڵ بە عەرەبانەکەی مەهتابەوە دەنێت. ئەوەی نەدەهێنا مودی لەسەری توڕەبێت لێم. کامێرەکەم کردەوە و فلیمەکەم دایە بەر ڕووناکییەکە و خستمەوە جێگاکەی خۆی، بەو هیوایەی فلیمەکە سوتابێت، کە بۆ مودی زۆر گرنگ بوو.

پاش دوو ڕۆژی تر بەبێ هیچ ئاگادارییەك، ئیسا بەخۆی و منداڵەکانییەوە، مەریەم و مەهدی، ماڵیان چۆڵکرد. لە پەنجەرەی نهۆمی سەرەوە بینیم، خەریکبوو سواری تەکسی تەلەفونی دەبوو، پەرێشان بوو بەدەست جانتا، دوو منداڵە بێگوێ و عەباکەیەوە.

لەوەدەچوو سەردانی خزمەکانی بکات. ڕەزاش هێشتا لە سەفەری کاروباری خۆی نەگەڕابۆوە. ئیتر ئێستا تەواو تاکوتەنیا بووم.

هەندێك ئێوارێ مودی دەهاتەماڵەوە، هەندێك جاریش نا. بۆخۆشم نەمدەزانی کامیان بە باش بزانم. ڕەقم لێدەبۆوە و لێیدەترسام، بەڵام هاوکات تەنیا ڕێگای پەیوەندی من بوو بە مەهتابەوە. ئەو ئێوارانەی دەهاتە ماڵەوە زەرفە خواردنی پێبوو، بە کورتی و توڕەییەوە وەڵامی پرسیارەکانمی دەدایەوە سەبارەت بە مەهتاب، "مەهتاب باشە."

"بەباشی دەچێت بۆ قوتابخانە؟" پرسیارمکرد.

"ناچێت بۆ قوتابخانە،" بە ڕەقییەوە وەڵامیدایەوە. "بەهۆی کردەوەی تۆوە، ڕێگای پێنادەن لە قوتابخانە بێت. سوچی تۆیە. هەموو شتێکت تێکداوە و ئێستا لەوێ قبووڵیناکەن. گەورەترین گرفت تۆی." بابەتێکی تریشی خستە سەری. "ئەوەندە هاوسەرێکی خراپی، منداڵێکی ترت نابێت. ژنێکی تر دەهێنم، بۆئەوەی کوڕم هەبێت."

لەپڕ کەوتمە بیری ئاییودی[1] یەکەی خۆمەوە. چی دەبێت ئەگەر مودی پێیبزانێت؟ چی ڕوودەدا، ئەگەر ئەوەندە خراپم لێبدات و بکەومە بەردەستی دکتۆرێکی ئێرانی و ئەو شتە بدۆزێتەوە؟ ئەگەر مودی نەمکوژێت، ئەوا لە دەستی حکومەتی ئیسلامی ڕزگارم نابێت.

"دەتدەمە دەست خومەینی و پێیدەڵێم، کە تۆ حەز لە چارەی ناکەیت،" مودی توڕەبوو. "دەتدەمە دەست حکومەت و پێیاندەڵێم، کە تۆ سیخوڕی سیئایئەییت."

ساتەکە ئاسایی بوایە، ئەم قسانەم وەك هەڕەشەیەکی پوچ وەردەگرت. بەڵام بەسەرهاتی خەڵکانێکی ترم بیستبوو، کە چۆن بەپێی شتێکی بچوك یان هەتا بێبەڵگە تاوانبارکراون و پاشان سزادراون یان ئیعدامکراون بەبێ دادگاییەکی ڕەوا. من وەك بەسزمانێك، کەوتبوومە ژێر دەستی پیاوێکی شێت و حکومەتێکی وەك خۆی شێتەوە. دەمزانی مان و نەمانم بەپێی ئارەزووی کاتی مودی و ئایەتوڵاکەیەتی.

بەندکراو لەنێو چواردیوار بە خۆم و ئازارەکانمەوە، نەمدەوێرا قسەوباس دامەزرێنم. هەرچی جارێك لە چاوانی مودیدا دەمبینی کڵپەی ئاگری ڕق و کینە خەریکە پەردەگرت، زمانی خۆمم دەگرت و ئومێدوار دەبووم، کە گوێی لە تەپەتەپی دڵی ترساوی من نەبێت.

زۆربەی توڕەییەکانی لەسەر ئەوە چەقی بەستبوو، کە من موسڵمان نیم.

"بە ئاگری دۆزەخ دەتسوتێنن،" بە ڕوومدا هاواریکرد. "منیش دەچم بۆ بەهەشت. بۆچی هۆشت نایەتەوە بەر خۆت؟"

"نازانم چی دەبێت،" بە هێواشی وەڵامدایەوە و هەوڵمدا ئارامی بکەمەوە. "من دادوەر نیم. تەنیا خوا دادوەرە."

ئەو شەوانە کە مودی دەهاتەوە، لە یەك جێگادا دەنوستین، بەڵام دوور لە یەکتری. چەند جارێك بە مەبەستی دەرهاتن لەو هەلومەرجە، بەناچاری خۆمم لێنزیکدەکردەوە و

سەرم دەخستە سەر شانی، سەردرای ئەوەی کە قیژم دەهاتەوە. بەلام مودی هیچ کەیفێکی نەبوو. بۆلەی لێوە دەهات و پشتی تێدەکردم.

بۆ بەیانی تەنیا جێیدەهێشتم و جانتا دەستییەکەی - بە تەلەفونەکەی ناویشێوە - لەگەڵ خۆی دەبرد.

لە ترس و بێزاریدا، خریکبو لە پێستی خۆم دەهاتمە دەردوە. هێشتا بەدەست لێیانەکەی مودییەوە ئازارم دەکێشا، خەمۆکی و دوودڵی تا دەهات زیاتر دایدەگرتم، بۆ چەندەها کاژێر لەناو جێگادا دەکەوتم، بەبێ ئەوەی بتوانم بنوم یان بەرزبمەوە. کاتی واش هەبوو، بەناو ماڵەکەدا دەگەڕام بەبێ ئەوەی بزانم بەدوای چییەودم. چەند ڕۆژێك بە تەمومژییەکی تەواوە لێمـتێپەڕی، تا ئەو ئاستەی نەمدەزانی یان گرنگیم نەدەدا، کە چ ڕۆژێکە، چ مانگێکە، یان ئەوەی ئایا سبەینێ ڕۆژدەبێتەوە. هەموو هۆشم لەلای کچەکەم بوو.

لە یەکێك لەو ڕۆژە پڕ ئازارانەدا بوو، هۆشم بەلای شتێکدا چوو. دوو پەنجەم خستە ناو لەشی خۆمەوە و کەوتمە گەڕان بە دوای دەزولەیەکی نایلۆنی کە بە ئاییودییەکەمەوە بوو. دۆزیمەوە و بۆ ساتێك دوودڵیم تیادا دروستبوو. لەناو چواردیواری دەرگاداخراوی بێ تەلەفوندا چی دەبێت، ئەگەر خوێنم بەربێت؟ چی دەبێت ئەگەر بەهۆیی خوێنبەربوونەوە بمرم؟

لەو ساتەدا هیچم بۆ گرنگ نەبوو، هەتا ئەگەر ژیانی خۆشم لەدەستبدایە. سەری دەزوولەکەم گرت و ڕامکێشا، هاوارم لێبەرزبۆوە، بەلام ئاییودییەکە نەهات بەدەستمەوە. چەند جاری تر هەوڵمدا، قایمتر ڕامدەکێشا و زیاتر ئازارم پێدەگەیشت. لە کۆتاییدا موکێشێکم لە قوتی ئارایشتەکەم هێنا و سەری دەزوولەکەم پێگرت. بە هێواش و فشارێکی بەردەوامەوە، کە خستمیە گریان، توانیم ڕایبکێشم. لە کۆتاییدا پارچەیەك پلاستیك بە دەوری تەلێکی مسەوە، کەوتە دەستمەوە، کە لەوانەبوو ببێتە سزای ئیعدامم. ئازارێکی زۆرم پێگەیشت. بۆ چەند خولەکێك چاوەڕوانبووم بۆئەوەی بزانم، خوێنم بەرنەبووە.

لە ئاییودییەکە وردبوومەوە، وایەرێکی سپی باریکی حەلەزۆنی بوو، کە نەدەکەیشتە ئینجێك. چی لەمە بکەم؟ لە دڵی خۆمدا وتم. هەروا نەمدەتوانی فڕێیبدەمە ناو زبڵدانەوە و ئەو ئەگەرە زۆر بچوکە بهێڵمەوە، کە مودی بیدۆزێتەوە. وەك دکتۆرێك یەکسەر دەیزانی چییە.

دەکرا فڕێمدایەتە ناو تواڵێتەکەوە و ئاوم پیادا بکردایە؟ دڵنیانەبووم لەوەی تواڵێتەکە ناگیرێت. دەبووە چ بەزمێك، ئەگەر تواڵێت بگیرایە و کەسێکیان بهێنایە بۆ بەردانی و پاشان کەسەکە ئەو شتە نامۆیەی پیشانی مودی بدایە، کە بۆتە هۆی گیرانی تواڵێتەکە؟

ئاییودییەکە نەرم بوو. باشتر بوو پارچەپارچەی بکەم. مەقەستێکم لە قوتوی دوروومانی نەسریندا دۆزییەوە و کەوتمە پارچەپارچە کردنی. چووم چەقۆکەم هێنا و

پێچی پەرژینی پەرنجەرەکەم پێکردەوە. سەیری شۆستەکەی خوارەوەم کرد و چاوەڕوانبووم تا چۆڵبوو. پاشان ئاییودییە پارچەپارچەکراوەکەم فڕێدایە سەر شەقامەکە.

ڕۆژی لەدایکبوونی باوکم پێنجی نیسان بوو. ئەگەر لە ژیاندا مابێت، شەست و پێنج ساڵ پڕدەکاتەوە. ڕۆژی لەدایکبوونی جۆن حەوتی نیسان بوو. پانزە ساڵی پڕدەکردەوە. ئاخۆ دەزانێت هێشتا من زیندووم؟

ئەمدەتوانی دیاریان بدەمێ. ئەمدەتوانی کێکیان بۆ دروستبکەم. ئەمدەتوانی تەلەفۆنیان بۆ بکەم و پیرۆزباییان لێبکەم. ئەمدەتوانی کارتیان بۆ بنێرم. هەتا ئەمدەزانی، بەم بۆنەیەوە کەی ئاهەنگیان بۆ دەگێڕن، چونکو ئەمدەزانی چەندی مانگە.

هەندێك شەو لەناو بالکۆنی ژوورەکەمدا ڕادەوەستام و تەماشای مانگم دەکرد و بیرمدەکردەوە، ئەم جیهانە گەورەیە یەك مانگی هەیە، هەر ئەو مانگەیە، کە جۆی و جۆن، دایك و باوکم تەماشایدەکەن. هەر ئەو مانگەیە، کە مەهتابیش تەماشایدەکات. هەرچی چۆنێك بوو، هەستم بە بوونی پەیوەندییەك دەکرد لە نێوانماندا.

لەپڕ ڕۆژێکیان داچڵەکیم، کاتێك کە بەرێکەوت لە پەرنجەرەی پێشەوەی ژوورەکە سەیری دەرەوەم دەکرد. خانم عەلاوی بوو، لە شۆستەکەی ئەوی بەری شەقامەکەوە، چاوی تێبڕی بووم. بۆ ساتێك وامزانی، خەیاڵی مێشکی هیلاکی خۆمە.

"ئەوە لێرە چی دەکەیت؟" بەسەرسامییەوە پرسیارمکرد.

"هەر چاودێریمکردوی و بۆ چەند کاژێرە چاوەڕوانتدەکەم،" وتی. "دەزانم چیت بەسەرهاتووە."

چۆن منی لێرە دۆزیوەتەوە؟ بۆم جێگای پرسیاربوو. باڵوێزخانە زانیاری پێداوە؟ قوتابخانە؟ بۆم گرنگ نەبوو، بە بینینی هەر ژنێك، کە خۆی دەخاتە مەترسییەوە بۆ ڕزگارکردنی من و مەهتاب لەم وڵاتە، گەشکە دەیگرتم. لەو ساتەدا کە مەهتابم لەگەڵ نەبوو، لە داخاندا ئاهێکم لێبەرزبۆوە.

"دەتوانم چی بکەم؟" خانم عەلاوی پرسیاریکرد.

"هیـــچ،" بە کزییەکەوە وتم.

"دەبێت قسەت لەگەڵ بکەم،" خانم عەلاوی وتی، دەنگی نزمکردەوە، دەیزانی چەند جێگای گومانە ئاوا بەو شێوەیە لە ناو شەقامێکدا ڕاوەستی و بە ئینگلیزی قسەبکەیت بۆ ژنێك لە نهۆمێکی سەرەوە.

"چاوەڕوانبـــە!" پێمـــوت.

بە چەند چرکەیەك پرژینی پەرنجەرەکەم لێکردەوە. ئینجا سەرم نا بە شیشی پەنجەرەکەوە بە دەنگێکی زۆر نزمەوە بەردەوامبووین لەسەر گفتوگۆ نامۆکەمان.

"چەند ڕۆژە چاودێری ئەم خانووە دەکەم،" خانم عەلاوی وتی. باسیکرد کە براکەی بۆ ماوەیەك لەگەڵی بووە، لەناو ئوتومبیلدا دانیشتووە. بەڵام کەسێك بە گومانەوە هاتووە و پرسیاریکردووە، کە ئێمە چی دەکەین لێرانەدا. براکەی خانم عەلاوی وەڵامیداوەتەوە، کە چاودێری کچێك دەکەن لە یەکێك لەو خانووانەدا، چونکو بەتەمایە بچێتە خوازبێنی. وەڵامەکە بەس بووە، بەڵام لەوە دەچوو ئەم ڕێکەوتە براکەی نیگەران کردبێت. بەڵام ئێتر ئێستا خانم عەلازی تەنیا بوو.

"هەموو شتێك ئامادەیە بۆ سەفەرەکەی زاهیدان،" وتی.

"ناتوانم بچم. مەهتابیان لێبردووم."

"مەهتاب دەدۆزمەوە."

ئایا دەیتوانـــــی؟!!! "هیچ شتێك مەکە، کە جێگای گومان بێت."

سەری بۆ لەقاندم. پاشان چۆن سەیرانە دەرکەوت، هەر ئاواش ڕۆیشت. پەرژینەکەم خستەوە جێگای خۆی، چەقۆکەم شاردەوە و چوومەوە حاڵەتی شەکەتی و ماندوویەتی. کەوتمە گومانی ئەوەوە، کە بینینی خانم عەلاوی خەو بێت.

دەبێت خوا لە خێرایی سوڕانەوەی گۆی زەوەی کەمکردبێتەوە. گومانی تیادا نەبوو، ڕۆژ بووبوو بە چل و هەشت کاژێر یان هەتا حەفتا و دوو. لە هەموو ژیانمدا ئەوەندەی ئەو ڕۆژانە تەنیا نەبووم. هەتا دۆزینەوە شتێك کە کاتی پێبەسەر، سەخت بوو.

کەوتمە دانانی پلانێك، کە بتوانم پەیوەندی بە مەهتابەوە بگرم. بەو کەرەستانە لە ماڵەکەدا بوون یان بەوانەی کە مودی لەگەڵ خۆی دەیهێنایە، هەوڵمدا ئەو چێشتەی مەهتاب حەزی لێیەتی، بۆی دروستبکەم و بە باوکیدا بۆی بنێرم. قوبڵی ساوەری زۆر پێخۆش بوو.

بە چەند پارچە قوماشی سپی، جوتێ جزمەم بۆ بوکەکەی دوری. پاشان بیری دوو بلوزی یەخەقەپاتم کەوتەوە، کە بە دەگمەن لەبەریدەکردن، گلەیی لەوە دەکرد کە یەخەکانیان دەنوسێت بە ملیەوە. یەخەکانم لێکردنەوە، تا گلەییەکەی نەمێنێت و بە چەند پارچە سەرەمەقەستی تر، هەندێك جلی بوکی ترم بۆ دوری. بلوزێکی سپی قۆڵدرێژم دۆزییەوە، کە بۆی بچوکبووبۆوە. قۆڵەکانیم بڕی و دامە دامێنی بلوزەکە و بلوزێکی قۆلکورتی گەورەی لێدەرچوو کە بتوانێت لەبەریبکات.

مودی دیارییەکانی بۆ برد. بەڵام کە گەڕایەوە، ئامادەنەبوو هیچ هەواڵێکی مەهتابم بۆ باسبکات، بەڵام جزمەکانی بوکەکەی بۆ هێنامەوە. "وتی ئەمانە لەلای خۆم گلنادەمەوە، چونکو لەوانەیە منداڵان پیسیبکەن،" مودی باسی مەهتابی کرد.

لە ژێرەوە لەم هەواڵە گەشامەوە، ئەمهێشت مودی بزانێت، ئەوەی هەرئێستا ڕوویدا چی بوو. کچە زیرەکە بچکۆلەکەم زانیویەتی، چیم لەژێر سەردایە. بەو شێوەیە پەیامی

خۆی گەیاند، مـــــامی، هێشتا هەم، لەگەڵ منداڵانی تردام. لە ماڵی عەمە بزورگ بەدوورم. سوپاس بۆ دیارییەکانت.

بەڵام دەبێت لە کوێ بێـــت؟

سەردڕای بێزاری و نائومێدی، چی کتێبی مودی هەبوو بە زمانی ئینگلیزی، کەوتمە خوێندنەوەیان. زۆربەی زۆری کتێبەکان لەبارەی ئیسلامەوە بوون، بەڵام گوێمپێنەدا، لە بەرگەوە بۆ بەرگ دەمخوێندنەوە. فەرهەنگێکی وێبستەر[2] یش هەبوو، ئەویشم خوێندەوە. حەزم دەکرد ئینجلێکش هەبوایە.

لەو شەو و ڕۆژە سەختانەدا، تەنیا خوا یاوەرم بوو. بە بەردەوامی لەگەڵی دەدووام. لە ماوەی ئەو ڕۆژانەدا، کە نازانم چەند ڕۆژ بوو، وردەوردە گەڵاڵەی پلانێك کەوتە مێشکمی پڕجەنجاڵمەوە. بێدەسەڵاتانە کەوتبوومە داوەوە، بۆ بەرگری لەخۆم هیچ شتێکم لەدەستنەدەهات، بەهەر نرخێك بوو بەدوای ڕێگایەکەوە بووم، کە لەگەڵ مەهتاب یەکتری بگرینەوە. بەو هۆیەوە ڕووم لە دینەکەی مودی کرد.

بە وردییەوە دەستمکرد بە خوێندەوەی کتێبی ڕێنوێنی چۆنییەتی نوێژکردنی ئیسلامی و کەتمە کارپێکردنی. پێش نوێژکردن دەست، قۆڵ، دەموچاو و پەنجەکانی قاچم شت. پاشان عەبایەکی سپی نوێژم پۆشی. کاتێك کە چۆکدادەدێت بۆ پاڕانەوە لە خوا و دەنوشتێتەوە، نابێت سەرت بە شتێك بکەوێت، کە مرۆڤ دروستیکردووە. ئەمە لە دەرەوەی ماڵ ئاسانە. بەڵام لەنێو ماڵدا دەبێت بەردی نوێژ بەرکاربهێنێت، وە ئەمە لەنێو هەر ماڵێکدا چەند دانەیەك هەیە. لە ڕاستیدا لە قوڕی سووردەوکراوە دروستدەکرێت بە تیرەی دوو سانتیمەترێك. لە هەر گڵێك بێت دروستدەکرێت، بەڵام ئەمان لە قوڕی مەککە دروستیدەکەن.

کتێبی ڕێنوێنییەکەم لەبەردەمی خۆمدا دەکردەوە، عەباکەم دەپۆشی، بۆ پێشەوە دەنوشتامەوە تا ناوچەوانم دەیدا لە بەردی نوێژەکە و ئەمم یەك لەسەر یەك دووبارەدەکردەوە.

پاشان بەیانییەکیان کە مودی لەناو جێگادا بەرزبۆوە، حەپەسا بەوەی دوایکەوتووم بۆ دەستنوێژشتن. بەسەرسامییەوە تەماشایدەکردم، کاتێك عەباکەم پۆشی و لە هۆڵەکەدا لە پشتێوە ڕاوەستام. هەتا شوێنی خۆمم دەزانی - لە تەنیشتی نا، بەڵکو لە پشتێوە. پێکەوە ڕوومان لە مەککە کرد و کەوتینە نوێژکردن.

ئەم هەوڵەم بۆ دوو مەبەست بوو. دەمویست دڵی مودی ڕازیبکەم، هەتا ئەگەر بشزانێت چیم لەژێر سەردایە. دەیزانی کە من لە هەوڵی خۆ شیرینکردنم لەلای، بە مەبەستی بەدەستهێنانەوەی مەهتاب، بەڵام ئایا ئەمە پەیامێکی نەدەگەیاند؟ دابڕاندنی مەهتاب، دواهەوڵی بوو بۆ ڕامکردنی من بۆ ئەو پلانەی کە بۆ ژیانمان چنیبووی. ئایا ئەمە بەڵگەیەك نەبوو بۆئەوەی کە ئەو ڕێگایەی گرتۆیەتی، دەچێتە پێشەوە؟

مەبەستێکی لاوەکی تریشم هەبوو. من لە نوێژە ئیسلامییەکانمدا زۆر ڕاستگۆتر بووم لەوەی، کە مودی چاوەڕوانی دەکرد. لە ناچاریــدا هانام بۆ پــوشێك دەبرد. ئەگەر *الله* هەمان بوونەوەرە گەوەرکە بێت، وەك گودەکەی من، ئەوا چەند لە توانامدا بێت، ئەرکەکانی بەجێدەهێنم. دەمویست *الله* ڕازیبکەم زیاتر لە ڕازیکردنی مودی.

پاش تەواوکردنی نوێژەکەمان، مودی بە ڕەقییەوە وتی، "ئەدەبوو بە زمانی ئینگلیزی نوێژ بخوێنیت."

ئەرکێکی زیاترم کەوتەسەر. تەواوی ڕۆژ بۆ چەند ڕۆژ کەوتمە ڕاهێنانی وشەی عەرەبی، هەوڵمــدەدا خۆم ڕازیبکەم، کە لە ڕاستیدا نەبووم بە ژنێکی ماڵەوەی ئێرانی بە باوەڕ.

ئێلین هات بۆ سەردانم، بە زەنگی تەلەفونی دەرگا، بوونی خۆی بەیانکرد. لە پەنجەرەکەوە کەوتینە گفتوگۆ.

"دەزانم مودی ئێمەی دەرکردووە، بەڵام هاتووم بزانم هێشتا زیندووی،" ئێلین وتی. "هیچ گۆڕانکارییەك ڕوویداوە؟"

"نـــــەء."

"دەزانی مەهتاب لە کوێیە؟"

"نـــــا. ئەی تــۆ؟"

"نـــەء،" ئێلین وتی. پاشان پێشنیارێکی کرد. "لەوانەیە ئاغا حەکیم یارمەتییەکی لەدەستبێت. مودی ڕێزی لێدەگرێت. دەتوانم قسە لەگەڵ ئاغا حەکیم بکەم."

"نـــەء، " بەخێرایی وتم. "چونکو ئەگەر مودی بزانێت لەگەڵ کەسێك قسەمکردووە، هەلومەرجەکەم خراپتر دەبێت. نامەوێت هیچ شتێك بکەم، کە هەلومەرجەکەم لێ سەختتر بکاتەوە. تەنیا دەمەوێت مەهتاب ببینم."

ئێلین ملیـــدا بە قسەکانم، سەرە بە عابا داپۆشراوەکەی لە نائومێدیدا بادا.

" دەتوانی یەك شتم بۆ بکەیت،" وتم. "دەتوانی ئینجیلێکم بۆ بێنی."

"باشە،" ئێلین ڕازیبوو. "بەڵام چۆن بیدەمە دەستت؟"

"پەتێك بە سەبەتەیەکەوە دەبەستم یان شتێك لەو بابەتە."

"باشە."

ئێلین ڕۆیشت، بەڵام هەرگیز بە ئینجیلەوە نەگەڕایەوە. لەوانەیە هەستی بە تاوانباری کردبێت لەو سەردانە نهێنییە، پاش ئەوەی کە بۆ هورموزی باسکردووە.

بەیانییەکی هەتاوی لە بالکۆنەکە وەستابووم، لە خۆم کەوتبوومە گومانەوە، تێکچووم یان نا. ئەمە تاکەی درێژەدەکێشێت؟ هەوڵمدا بزانم، چەند ڕۆژ دەبێت، شەڕەکەمان بووە. مانگێك دەبێت؟ دوو مانگ دەبێت؟ بیرمنەدەهاتەوە. هەوڵمدا هەینییەکان بژمێرم، چونکە

ڕۆژێکی جیاوازە، پڕیەتی لە بانگدان بۆ نوێژی زیاتر. چەند توانیم هەوڵمدا، یەك هەینیم بیرکەوتەوە پاش شەڕەکە. دەکرێت هەفتەیەك بووبێت؟ لە دوو هەفتە کەمتربوو؟ ئایا بەڕاستی هەر مانگی نیسان بوو؟

لە پشت حەوشە کۆنکرێتییەکەوە، لەناو پەنجەرەی ماڵێکدا لە شەقامەکی پشتمانەوە، بینیم ژنێکی دراوسێ ڕاوەستاوە لە من وردەبێتەوە. لەوەوپێش نەمبینیبوو.

"لە کوێوە هاتووی؟" لەپڕ ژنەکە بە ئینگلیزییەکی پچرپچڕ هاواری لێکردم.

سەرسامبووم و ترسام. گومانیشم پەیداکرد. "بـۆچی پرسیاردەکەیت؟" وەڵامدایەوە.

"چونکو دەزانم بیانیت."

بێهیوایی زمانی بەردام و هەر وشە بوو دەهاتە دەرەوە. خۆم خەریکنەکرد بەوەی، ئەم ژنە دۆستە یان دوژمنە. "لەم خانووەدا بەندیانکردووم،" هەروا قسەم دەدایە دەرەوە. "کچەکەمیان لێسەندوم و لەم خانووەدا دەرگایان لەسەر داخستووم. پێویستیم بە یارمەتییە. تکاتلێدەکەم، یارمەتیمـبـدە."

"زۆر بەداخم بۆت،" ژنەکە وەڵامیـدایەوە. "چیم لەدەست بێت، دەیکەم."

چی لەدەستدەهات، بۆم بکات؟ لە ڕاستیدا ژنی ناوماڵی ئێرانی، تۆزێك ئازادی زیاتری هەبوو لە من. پاشان کەڵکەڵەی شتێکم کەوتە سەر. "دەمەوێت نامەیەك بۆ کەسوکارم بنێرم،" وتم.

"چاکە. نامەکەت بنووسە. پاشان دێم بۆ شەقامەکەتان و لەوێوە دەتوانی نامەکەت هەڵدەیتە خوارەوە بۆ من."

خێرا چەند سەرنجم نووسی، هەرچەند دڵنیانەبووم لەوەی لێـتێبگەن. بە پەلە ئەوەندەی توانیم، گۆڕانکارییە پڕ دەردیسەرییەکانی خۆمم بۆ باسکردن و دایك و باوکمم ئاگادارکردەوە، کە وریابن لەم کاتەدا زۆر فشار بۆ باڵوێزخانە یان وەزارەتی دەرەوە نەهێنن، تا ئەو کاتەی مەهتاب دەگەڕێتەوە لام. بۆم نووسین، ئێوەم خۆشدەوێت. بەسەر نامەکەوە دەستمکرد بە گریان.

پەرژینی پەنجەرەکەم لێکردەوە و بە نامەکەوە چاوەڕوانی دەرکەوتنی ژنەکەم کرد لە شەقامەکەدا. هاتوچۆکەرێکی زۆر بەسەر شۆستەکەوە نەبوو، دڵنیانەبووم لەوەی ژنەکە دەناسمەوە، کە وەك هەر ژنێکی تر خۆی داپۆشیوە. چەند ژن تێپەڕین، بەڵام هیچ هێمایەکیان نەکرد.

ژنێکی تر دەرکەوت. مۆنتۆیەکی ڕەش و ڕووسەرییەکی بەسەرەوە بوو، وا دەردەکەوت بەدوای کاری ڕۆژانەی خۆیەوەتی. بەڵام کە دروست گەیشتە ئاستی من، نیگایەکی کرد و بە ئاستەم سەرێکی لەقاند، نامەکەم بەردایەوە و وەك گەڵا کەوتە سەر شۆستەکە. خێرا هاوڕێ تازەکەم هەڵیگرتەوە و خستیە گیرفانییەوە و ڕۆیشت، بەبێ ئەوەی خۆی تێکبدات.

هەرگـــیز نەمبینییەوە. هەرچەندە کاتێکی زۆرم لە باڵکۆنەکەدا دەبردەسەر بەهیوای بینینی. دەبێت وای بۆچووبێت، کە مەترسییەکی گەورەی تیادایە یارمەتییەکی ترم بدات.

وەك ئاردزووم دەکرد، بەشداریکردنم لە نوێژکردندا، تۆزێك مودی نەرمکرد. وەك پاداشتێك، ڕۆژنامەی ڕۆژانەی زمان ئینگلیزی بەناوی *کیهان*، بۆ دەهێنامەوە. ڕاپۆرتەکانی هەر پروپاگەندە پوچەکانی ئێران بوو، بەڵام هیچ نەبێت، شتێك هەبوو بە زمانەکەی خۆم بیخوێنمەوە، باشتر بوو لەو فەرهەنگ و کتێبە دینییانە. هەروەها بۆم دەرکەوت چەندی مانگە. باوەڕم بە خۆم نەدەکرد، کە زانیم تەنیا هەفتە و نیوێکە بەندکراوم. هەتمە سەرئەوەی کە لەوانەیە کیهان درۆبکات، وەك لەبارەی هەموو شتێکی ترەوە درۆدەکات.

هێنانەوەی ڕۆژنامە، بەیانی گۆڕانێکی کوتوپڕ بوو لە هەلومەرجەکەمدا یان دروستتر لە هەڵسوکەوتی مودیدا. نیتر هەموو ئێوارێیەك بە کیهانەوە دەهاتە ماڵەوە و هەندێك جاریش بە خواردنەوە.

"شلیك،" مودی هاواریـکرد، کاتێك دوانیوەڕۆیەکی درەنگ گەڕایەوە. "گـــرانە و بە دەگمەن دەستدەکەوێت."

چ دیارییەکی نامۆ و ناشتکردنەوەیەك بوو! ئەو شەوەی لە ماڵی ئێلین و هورموز گەڕاینەوە، دواشەو کە من و مەهتاب پێکەوە بووین، ئامادەنەبوو بۆ مەهتابی بکڕێت.

نزیکەی ساڵێك دەبوو شلیکم نەخواردبوو. میوەیەکی بچوکە، کە لەوانەیە زۆر ئاودار و بەتام نەبێت، بەڵام لەو ساتەدا شتێکی نایەب بوو. سێ دەنکێکم خستە دەمەوە، پێش ئەوەی زۆر لە خۆم بکەم ڕاوەستم. "ببیـــــە بۆ مەهتاب،"وتم.

"باشە،" وەڵامیدایەوە.

هەندێك ئێوارە مودی تا ڕادەیەك لەگەڵم ڕووخۆش بوو، حەزی بە تۆزێك وتوێژ هەبوو. ئێوارەکانی تر بێدەنگ و تووڕە بوو. لەگەڵ ئەوەی بە بەردەوامی هەواڵی مەهتابم لێدەپرسی، کەچی شتێکی وەهای پێنەدەوتم.

"تاکەی ئێمە دەتوانین وا بین؟" ڕۆژێکیان پرسیارمـلێکرد.

زیاتر بۆڵەی لێوە هات تا وەڵام.

ڕۆژانی ناخۆش تا دەهات زیاتردەبوون.

شەوێکیان لە نیوە شەودا، زەنگی دەرگا لە خەو ڕاپیەڕاندین. مودی هەمیشە لە سەنگەردا بوو بۆ پارێزگاری لە دژی کەسێك کە ئازاریبدات. لە جێگاکە دەرپەڕی و خۆی گەیاندە پەنجەرەی پێشی ماڵەکە. شەکەت و ماندوو خەبەرمـبۆوە، لە ناو جێگاکەوە گوێم گرت، مستەفا بوو، سێیەم کوڕی بابەحاجی و عەمە بزورگ. گوێم لە مودی بوو، بە فارسی وتی هەر ئێستا دێم.

"چی ڕوویداوە؟" پرسیارمکرد، کاتێك مودی گەڕایەوە و دەستی دایە چەند پارچە جل لەبەریبکات.

"مەهتاب نەخۆشە،" وتی. "دەبێت بڕۆم."

دڵم داخورپا. "با بێم لەگەڵتدا" داوامــلێکرد.

"نــەء. تۆ لێرە دەمێنیتەوە."

"تکــات لێدەکەم."

"نــا!"

"تکات لێدەکەم بیهێنەرەماڵەوە."

"نا. بۆ ئەوە ناچم بیهێنمەوە."

کە لە دەرگاکە چووە دەرەوە، لە جێگاکە هەستام ڕامکرد بە دوایدا، ئامادەبووم بە جلی شەوەوە بەناو شەقامەکانی تاراندا ڕاکەم، بەو مەرجەی بگەم بە مەهتاب.

بەڵام مودی پاڵی پێوە نام بۆ دواوە و دەرگاکەی لەسەر داخستم و بە کۆڵێك داخ و خەفەتی تارەوە تەنیا جێیهێشتم. مەهتاب نەخۆش بوو! ئەوەندە نەخۆش بوو لەو نیوە شەوەدا مستەفای ناردبوو بە شوێن مودیدا. ئایا دەبێت بۆ نەخۆشخانە؟ ئایا ئەوەندە نەخۆش بوو؟ چی بووە؟ بەبــــەکەم، بەبــــەکەم، بەبەکەم! دەستمــکرد بەگریان.

لەو شەوە تاریك و ترسێنەر و پڕ گریانە بێکۆتاییەدا، هەوڵمدا لە واتای ئەو زانیاریە تازەیە بگەم سەبارەت بە مەهتاب. بۆچی مستەفا هات؟

دوایی بیرم کەوتەوە، کە مستەفا و مەلەکەی ژنی تەنیا لە دووری چەند کۆڵان لەولا ماڵی ئێمەوە دەژین. شوێنێکی گونجاو و باش بوو بۆ مودی، مەهتاب لەوێ دابنێت. مەهتاب دەیانناسێت و لەگەڵ منداڵەکانیان باش دەگونجێت. هەروەها مەلەکە تۆزێك پاکوتەمیزتر و دۆستانەتر بوو لە باقی ئەندامانی خێزانەکە. ئەگەری ئەوەی کە مەهتاب لەلای مستەفا و مەلەکە بێت، خۆشییەکی پێدام، بەڵام لەچاو ئەو ئازارەی کە لە دڵمدا بوو، دڵشادی نەکردم. کاتێك منداڵ نەخۆش دەکەوێت، لە هەموو شتێك زیاتر پێویستی بە دایکییەتی. هەوڵمــدا، لە خەیاڵی خۆمدا خۆشەویستی خۆمی پێڕاگەیەنم و دڵنیاییــبکەم و دەپاڕامەوە و هیواداربووم، بیبیستێت و بزانێت کە چەند جێگای هەیە لە دڵی مندا.

لەو باوەڕەدا بووم، لە هەفتەکانی ڕابوردوودا لەو پەڕی خراپیدا بووم، ئێستاش بەمە خراپتر بووم. کاژێرە سەخت و درێژبووەکانی شەو، سەنجام بە هەڵاتنی ڕۆژ کۆتاییهات، بەڵام هێشتا هیچ هەواڵێك نەبوو. بەیانیش هەر زۆر زیاتر درێژەی کێشا. لەگەڵ هەر دڵتەنگییەك دەستمدەکرد بە گریان بۆ مەهتاب. "مەهتاب! مەهتاب! مەهتاب!"

نەمدەتوانی نان بخۆم، نەمدەتوانی بنوم.

نەمدەتوانی دەستبەرم بۆ هیچ شتێك.

بەس دەمتوانی مەهتاب بهێنمە بەرچاوی خۆم، کە تەنیا لە نەخۆشخانە کەوتووە.

دوانیودڕۆیەکی درێژ و پڕ ئازار و سەخت تێپەڕی. لەو باوەڕەدا بووم، درێژترین ڕۆژی ژیانی بێبایەخم بووبێت.

لەخۆوە شتێکی نامۆی نائاسایی سەرنجی ڕاکێشام. لە پەنجەرەی ژووری نوستنەکەمانەوە تەماشامکرد، کە دەینواڕی بەسەر حەوشەی دواوەی خانووەکەی پشتمانەوە، ژنێکم بینی. کارەکەری ماڵەکە بوو، ژنێکی بەتەمەن بوو، عەباکەی لە خۆیەوە پێچابوو. بەسەر حەوزی فوارەیەکدا نوشتابۆوە، دەستێکی بە عەباکەیەوە بوو، بە دەستەکەی تر بەو پەڕی هەوڵەوە خەریکی شتنی مەنجەڵ و تاوە بوو. چەند جار بوو ئەم ژنەم بینیبوو، بەڵام قسەم لەگەڵی نەکردبوو.

لەو ساتەدا بڕیارمدا، لەم بەندیخانەیە هەڵبێم، خۆم بگەیەنمە ماڵی مستەفا و مەلەکە و منداڵە نەخۆشەکەم ڕزگاربکەم. ئەوەندە شڵەژابووم نەمدەتوانی بە دروستی بیربکەمەوە، نیگەرانی ئەوە نەبووم، سەرئەنجامی ئەم هەوڵەی من دەبێت بە چی. بە هەر نرخێك بوو، دەبوو کچەکەم ببینم!

پەنجەرەکە نە شیشی پێوە بوو نە پەرژین. کورسییەکم هێنایە لای پەنجەرەکەوە، چوومە سەری، پاشەوپاش چوومە ناو پەنجەرەکەوە و هەر دوو قاچم شۆڕکردەوە تا گەیشتە قەراغێکی یەك دوو ئینج پان، کە بە دیوی دەرەوەی دیوارەکەوە بوو، لەگەڵی درێژدەبۆوە.

لە سەر قەراغەکە ڕاوەستام و دەستم گرت بە پەنجەرەکەوە، تەنیا هەنگاوێك دووربووم لە سەربانی خانووی یەك نهۆمی ماڵەکەوە. ئاوڕمدایەوە و هاوارامکرد، "*خـــانم!*"

ژنە پیرەکە بەرەو من سەری بەرزکردەوە و واقیوڕما.

"*شما ئینگلیزی سوعبتکەم*[4]؟" پرسیارملێکرد. "ئایا بە ئینگلیزی دەدوێیت؟" ئومێدەواربووم، ئەوەندە لە یەکتری تێبگەین کە ڕێگامبدات بچمە سەر سەربانی خانووەکەیان، بچمە خوارەوە و پاشان لە دەرگا حەوشەکەیانەوە بچمە دەرەوە.

لەجیاتی وەڵام، ژنەکە بەهەر دوو دەست عەباکەی گرت و ڕایکردە ژوورەوە.

بەوریاییەوە، سوکوئاسان گەڕامەوە ژوورەوە. هیچ یارمەتیەك نەبوو، هیچ ڕێگایەکی دەرچوونم نەبوو. بەناو ماڵەکەدا کەوتمە هاتوچۆ و تاوتوێکردنی مێشکی پڕجەنجاڵی خۆم. بە دوای شتێکەوە بووم بە ئینگلیزی بیخوێنمەوە، بەناو کتێبەکانی مودیدا گەڕام، بە دوای کتێبێکدا کە لە بەرگەوە بۆ بەرگ نەمخوێندبێتەوە. نامیلکەیەکی چوار لاپەڕەییم دۆزییەوە، کە کەوتبووە پشت کۆمەڵێك کتێبەوە و بە کونجکاوییەوە لێیوردبوومەوە. لەوەوپێش نەمبینیبوو، نامیلکەیەکی ڕێنوێنی بوو بە زمانی ئینگلیزی، سەبارەت بە جۆری نوێژەکانی ئیسلام بۆ مەبەستی جۆراوجۆر.

بۆئەوەی بە شتێکەوە خۆم خەریکبکەم، لەسەر ناوفەرشی ژوورەکە دانیشتم و کەوتمە خوێندنەوە. باسی *نەسر*[5] سەرنجی ڕاکێشام.

نزر بەڵێنە بە *الله*، جۆرێکە لە ڕێکەتن و مامەڵە. ڕەزا و ئیسا نزریان کردبوو، کە ئەگەر خوا بەجۆرێك قاچی شەلی ‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌ «مەهدی چاککاتەوە، ئەوا ڕەزا و ئیسا ساڵانە سینییەك لە نان، پەنیر، سەوزە و خواردنی تر دەبەن بۆ *مەسجید*، لەوێ سوپاسی خوا دەکەن و خواردنەکە بەسەر هەژاراندا دابەشدەکەن.

بانگی نوێژ لە بڵندگۆی مزگەوتەکانەوە بەرزبۆوە. فرمێسك بە ڕوومەتمەوە جۆگەلەی بست، کاتێك دەستنوێژم دەشت و عەباکەم بە خۆمەوە دەپێچا. ئێستا فێربووبووم چۆنی بکەم. بڕیارمـدا نزربکەم.

لە بیرم چووبۆوە کە بیروباوەری دینی ئیسلامی و مەسیحی تێکەڵ دەکەم، بە دەنگی بەرز وتم، "ئەی خوایە، ئەگەر من و مەهتاب بە یەکتری شادبینەوە و بە سەلامەتی بگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە، دەچم بۆ نۆرشەلیم، بۆ ئەو وڵاتە پیرۆزە. ئەمە نزری من بێت. پاشان بە باوەڕێکی تەواو و دەنگی بەرزەوە بە زمانی عەربی کەوتمە خوێندەوەی ئەو ویردە درێژەی لەم پەیوەندەدا بوو. لە دنیا دابڕاو، کەوتمە قسەکردن لەگەڵ خوا.

ئێوارێ هات، تاران نوقمی تاریکی بوو. لەسەر ناوفەرشی هۆڵەکە دانیشتبووم و بە خوێندنەوەوە کاتم دەکوشت، کە لەپڕ کارەبا کوژایەوە. ئەوە یەکەم جار بوو لە چەند هەفتەدا، دەنگی ترسناکی شاوری هێرشی ئاسمانی بێتەگوێم و ئازار بگەیەنێت بە مێشکی پڕچەنجاڵم.

مەهتاب! لە دڵی خۆمدا هاوارمکرد. دەبێت ئێستا مەهتابی هەژار چەند بترسێت. لە بێچارەییدا ڕامکرد بۆ دەرگاکە، بێگومان کە داخرابوو، لە نهۆمی دووەمی خانووەکەدا گیرمکردبوو. لەو پەڕی پەرێشانی و ترسدا بە ناو ماڵەکەدا دەهاتم و دەچووم، بۆم گرنگ نەبوو خۆم بپارێزم. بیری نامەکەی جۆنم کەوتەوە کە نووسیبووی: "تکاتلێدەکەم، ئاگات لە مەهتاب بێت، لەتەنیشت خۆتەوە بیپارێزە." فرمێسکم بۆ کچەکەم هەڵڕشت. بەکوڵترین، ڕەشترین و ئازاراویترین فرمێسك بوو، کە تا ئێستا توانیبێتم هەڵیـڕێژم.

لەدەرەوە دەنگی شاوری هێرشی ئاسمانی دەبیسترا و لەدوورەوە دەنگی تۆپی فڕۆکە شکێنەکان دەهات. وژەی چەند فڕۆکە هات ئینجا تەقینەوە بەدوای تەقینەوە لەدوورەوە دەهات. بەڵام من لە ویردخوێندنی خۆم نەکەوتم بۆ مەهتاب.

لە چەند خولەکدا هێرشە ئاسمانییەکە تەواوبوو، ئەوە کورتترین هێرش بوو کە بەرەو ڕووی بووم. بەڵام بەتەنیا لەناو ماڵی بێڕووناکی و شاری تاریکدا، وەك بینی ئاو دەلەرزیم. کەوتم و دەستمـکرد بە گریان بۆ چارەڕەشی خۆم.

لەوانەیە هەر نیو کاژێرێك ڕۆیشت بێت، کە دەنگی کرانەوەی دەرگای حەوشە هات. زرمەی هەنگاوەکانی مودی دەهات بەسەر پێپلیکەکاندا، کاتێك کە ڕامکرد بۆ هۆڵەکە بۆ بینینی بۆنەوەی هەواڵێکی مەهتاب بزانم. دەرگاکە کرایەوە و مودی ڕاوەستا، لەبەر

ڕۆشنایی کزی لایته دەستییەکەی، تارمایی مودی دیاربوو، کە بە ناستەم لە تارکایییەکەم جیادەکردەوە.

شتێکی هەلگرتبوو، کە لە بەستەیەکی گەوردی قورس دەچوو. زیاتر لێی چوومە پێشەوە بۆئەوەی بزانم چییە.

لەپڕ تێگەیشتم. مەهتـــــاب بووا لە باتانییەکەوە پێچرابوو، بەسەر شانی باوکییەوە بوو، ڕاستبۆوە بەلام دەنگی لێوە نەهات. هیچ دەربڕینێك لە دەموچاویدا بەدینەدەکرا، سەرەڕای تارکی مالەکە، دیاربوو ڕەنگی پەڕیبوو.

تێبینییەکان:

1.IUD:لەولەب

2. Webster Dictionary

3. گود: Gud: وشەیەکی ئینگلیزیە بە واتای خوا دێت.

4. دروستترە بلێت: "شما ئینگلیزی صحبت مکنی؟" - و.

5. نەسر، بە کودری دەبێت بە نزر یان نەدر، بە فارسی دەبێت بە نذ٘ر - و.

# 17

"ئەی سوپاس خوایە. سوپاس بۆ تۆ،" بە دەنگی بەرز لەبەرخۆمەوە وتم. تەنیا بیرم بۆ لای ئەو نزر و نوێژە تایبەتییانە چوو، کە ئەو ڕۆژە کردبووم. خوا وەڵامی نوێژەکانی دامەوە.

لە خۆشیاندا گەشکە گرتبوومی و هاوکاتیش دەترسام. بەبەکەم زۆر غەمگین، تێکشاو و نەخۆش دیاربوو.

باوەشمکرد بە هاوسەرکەم و منداڵەکەمدا. "بەڕاستی تۆم خۆشدەوێت، چونکو مەهتابت بۆ هێناومەتەوە." ئەو وشانەم بە مودی وت، لە کاتێکدا ئەو پەڕی ڕقم لێیدەبۆوە. ئەو سەرچاوەی هەموو داخ و خەفەتێکی من بوو، بەڵام ئەوەندە مەمنونبووم بە بینینی مەهتاب، کە ئەو قسەیەم تاکو ئاستێك بەڕاست بوو.

"پێشبینیمکرد، کە ئەو هێرشە ئاسمانییە هێمایەکە لە خواوە،" مودی وتی. "جیابوونەوەی ئێمە لە یەکتری هیچ شتێك ناگەیەنێت. دەبێت لەو کاتانەدا پێکەوە بین. بەڕاستی نیگەرانی تۆ بووم. ئیتر لە یەکتری جیانابینەوە."

ناوچەوانی مەهتاب تەڕ بوو، بەهۆی عەرقکردنی تاوە. دەستم بۆ ڕاکێشا، مودیش دایمێ. هەستم بە خۆشی کرد، کە باوەشم پیاداکرد.

ورتە لە دەمی ئەهاتە دەرەوە کە بردم بۆ ژووری نوستنەکە، مودیش دوامانکەوت. لەناو جێگاکەدا دامپۆشی، پارچەیەك پەڕۆم لە ئاو هەڵکێشا و هێنام بە ناوچەوانیدا. هۆشی بەلای خۆیەوە بوو، بەڵام گومانیدەکرد، ڕۆشن بوو لە بەردەمی باوکیدا نەیدەوێرا هیچ شتێك بڵێت.

"نانی خواردووە؟" پرسیارم لە مودی کرد.

"بەڵێ" دڵنیاییکردم. بەڵام هیچ شتێك ئەوەی پیشاننەدەدا، ئەوە ڕاست بێت. کز و لاواز دیاربوو.

ئەو شەوە مودی وشیاری ئەوە بوو، تەنیا جێمانەهێڵێت. مەهتاب ئارام و بێدەنگ مایەوە، هەوڵەکەم تۆزێك تاکەی هێنایە خواردوە. هەر سێکمان لە یەك جێگادا نوستین، مەهتاب لە ناوەڕاستدا، خەوی قووڵ نەبوو، لەبەر ئازاری سك و سکچوون ناوبەناو هەڵدەستا. تەواوی شەو لە باوەشمدا بوو، بۆ خۆشم خەوەکەم پچڕپچڕ بوو. زۆر دەترسام لە مودی بپرسم: لەمەودوا چی بکەیـن؟

بۆ بەیانی، کاتێك مودی خۆی ئامادەدەکرد بچێت بۆ کار، بە ڕووخۆشییەکەی دوێنێ شەوەوە نا بە ڕەقیشەوە نا، پێیوتم، "مەهتاب ئامادەبکە."

"تکاتـلێدەکەم مەیبە."

"نـا. جێیناهێڵم لێرە لەگەڵ تۆ."

ئەموێرا لەبەرامبەریدا ڕاوەستمەوە لەو ساتە ناجۆرەدا. مودی تەواو منی خستبووە ژێر چنگی خۆیەوە، نەشمدەتوانی بۆ جارێکی تر خۆم بخەمە مەترسی بەندکردنەوە. مەهتاب هێشتا بێدەنگ بوو، ڕێگایدا باوکی بیبات لەگەڵ خۆی و دایکی جێبهێڵێت، کە وا دڵی شکابوو خەریکبوو دەمرد.

گۆڕانکارییەکی زۆر نامۆ بەسەر هەر سێکماندا هاتبوو. کاتی ویست تا نهێنییەکانی ئەم گۆڕانکارییە ئاڵۆزانە لە هەڵسوکەوتماندا بدۆزمەوە، بەڵام هەستمکرد، کە بوونمان پێکەوە دەچێتە قۆناغێکی تازەوە.

مودی زیاتر چووەوە ناوخۆی، کەمتر بەرەنگاری لە خۆی پیشاندەدا، بۆ هەڵسوکەوتی خۆی دوورتر دەینواڕی. بە ڕووکەش ئارام دیاربوو، کەسایەتی سەقامگیربووبوو. لە چاوانیدا دەمتوانی بەڵگەی قووڵبوونەوەی گریفتەکانی بەدیبکەم. بابەتی پارە مێشکی جەنجاڵکردبوو. "هێشتا نەخۆشخانە پارەی پێنەداوم،" گلەییکرد. "ئەم هەموو ئیشە دەکەم بۆ هیچ."

"ئەو قسەیە بەڕاست نازانم،" پێموت. "کەس باوەڕت پێناکات. ئەو پارانە لە کوێوە دەهێنیت؟"

"ئەو پارەیەی پێیدەژین، لە مامڵی قەرزدەکەم."

هێشتا باوەڕم پێنەدەکرد. وای بۆدەچووم، کە دەیەوێت وا تێبگەم پارەمان نییە، تا بەو هەلومەرجی تیایدا دەژین ڕازیبم.

بەڵام لەبەر هەندێك هۆی ناڕۆشن، وردەوردە توڕەیی مودی ڕووی لە شوێنێکی تر کرد. پاش ماوەیەك هەموو ئێوارانێك مەهتابی بۆ دەهێنامەوە، تەنیا ئەو ئێوارانە نەبێت کە لە نەخۆشخانە ئێشکگر بوو. لەپاش یەك دوو هەفتە لەمە، ناوبەناو ڕێگایدەدا مەهتاب بە ڕۆژ لەلام بمێنێتەوە، کاتێك خۆی دەچوو بۆ کار، بەڵام سنووردارکردنی ئێمەی دووپاتدەکردەوە بە دەنگهاتنی دوو جار کلیلدانی دەرگاکە لەسەرمان.

پاشان ئاسایی بەیانییەکیان ڕۆیشتە دەرەوە، چاوەڕوانی دەنگی کلیلدانی دەرگاکە بووم، بەڵام دەنگ نەهات. بەسەر پێپلیکانەکاندا وردەوردە تەپەتەپی هەنگاوەکانی ئەما کە لە خانووەکە دەچووە دەرەوە. ڕامکرد بۆ پەنجەرەی ژووری نوستنەکە و لەوێوە بینیم، خەریکبوو لە کۆڵانەکە دەردەچوو.

ئایا لە بیریچوو دەرگامان لەسەر دابخات؟ یان ئەمە تاقیکردنەوەیە؟

بڕیارمدا، ئەوەی دووەمیان لەبەرچاوبگرم. من و مەهتاب لە ماڵەوە ماینەوە. پاش چەند کاژێر بە مەزاجێکی زۆر باشترەوە گەڕایەوە. باوەڕم هێنا، کە تاقیکردنەوە بوو. خانووەکەی خستبووە ژێر چاودێرییەوە - یان یەکێکی تری دانەوە - ئێمەش پیشانماندا، کە شایەنی متمانەین.

مودی زیاتر لەگەڵم گەرمبوو، زۆرتر دەدوا لەگەڵم سەبارەت بە هەر سێکمان وەك خێزانێك، هەوڵیدەدا یەکمانبخاتەوە، زیاتر کەوتمە ئەو باوەڕەوە، کە مەهتابی بە تەواوەتی بۆم گەڕانۆتەوە.

مەهتابیش گۆڕابوو. لە سەرەتاوە بە نابەدڵییەوە باسی ئەو ماوەیەی بۆ دەکردم کە لە یەکتریان جیاکردبووینەوە. "زۆر گریایت؟" پرسیارملێکرد. "لە باوکت داواکرد بتگەڕێنێتەوە؟"

"نــا،" هێواش بە ترسەوە وتی. "نەگریــام. داواملێنەکردووە. قسەم لەگەڵ خەڵك نەکردووە. یاریم نەکردووە. هیچ شتێکم نەکردووە."

چەند گفتوگۆی دوورودرێژی ویست تا سڵەمینەوەی نەمێنێت، هەتا بەرامبەر بە من. لە کۆتاییدا بۆمدەرکەوت، کە مەهتاب تووشی لێپرسینەوە بووە، بەتایبەتی لەلایەن مەلەکەوە. پرسیاریلێکردبوو، کە ئایا دایکی لەگەڵ خۆی بردوویەتی بۆ باڵوێزخانە، ئایا دایکی لە هەوڵدایە بۆ بەجێهێشتنی وڵات. بەڵام مەهتاب هەر بە "نا" وەڵامیدابۆوە.

"دایە هەوڵمدا بێمە دەرەوە لە خانووەکە،" وتی، وەك ئەوەی من تووڕەبم لێی، لەسەرئەوەی هەوڵینەداوە هەڵبێت." لە خانووەکەی مەلەکەوە ڕێگاکەم دەزانی. هەندێك جار کە لەگەڵ مەلەکەدا بووم بۆ سەوزەکڕین یان شتی تر، دەمویست لە دەستی هەڵبێم و بگەڕێمەوە بۆماڵەوە بۆ لای تۆ."

چەند مەمنونبووم، کە نەیتوانیبوو هەڵبێت. زۆر ترسناك بوو بیرکردنەوە لەوەی، منداڵێکی وا بەتەنیا بەناو شەقامەکانی تاراندا بهاتایە، بەناو ئەو ترافیکە سامناکە و ئەو شوفێرە کەمتەرخەمانە و ئەو پۆلیسە خراپ و دڵڕەقانە.

بێگومان هەڵنەهاتبوو. هیچ شتێکی نەکردبوو. ئەمە گۆڕانکارییەك بوو لە مەهتابدا. بەدەر لە ویستی خۆی سازابوو، ملیدابوو. ئازار و ترسی ئەوەندە بەسەردەو بووە، کە سەرکێشییەکی وەها نەکات. منداڵێکی غەمبار، نەخۆش، ترسنۆك تێکشاوی لێدەرچووبوو.

ئەم گۆڕانی کەسایەتییە سێیەم کەسیشی گرتەوە - کە من بووم. بەسەربردنی ڕۆژانی دوورودرێژ، لەپشتی دەرگای داخراوی خانووەکەی ماملەوە، هەلی بەخۆدا چوونەوەی بۆ ڕەخساندم. بەشێوەیەکی ژیربێژانە بیروبۆچوونی خۆمم ساغکردەوە، زیاتر ستراتیجییانە لە پێشتر کەوتمە لێکدانەوە و پلاندانان. ئەوە لەلام ڕاستییەکی نەگۆڕبوو، کە هەرگیز لە ئێراندا خۆم لەگەڵ ژیان ناگونجێنم. هەروەها ئەوەشم لەلا چەسپی، کە لەوانەیە هەرگیز نەتوانم متمانە بە مێشکی داغانی مودی بکەم. لەو کاتەدا باشتر و ژیربێژتر بووبوو، کەمتر هەڕەشەیدەکرد، بەڵام نەمدەتوانی متمانەی پێبکەم کە تاسەر وا دەمێنێتەوە. تەنیا دەمتوانی کەڵکی لێوەرگرم بۆ باشترکردنی هەلومەرجی خۆم، تا سەرهەڵدانەوەی بێگومانی گرفتێکی تر.

چۆن دەمتوانی ئەمە بە باشترین شێوە بکەم؟ وردەکارییەکانیم لا ڕۆشن نەبوو، بەڵام بە چەند سەرئەنجامی گشتی گەیشتم. بڕیارمدا تواناییەکانی خۆم دوو بەرابەر بکەم، بۆ دەرچوونی خۆم و مەهتاب لە ئێران و گەڕانەوە بۆ ئەمریکا، بەڵام بە شێوەیەکی تر و بە بەرنامەیەکی وردتردوە. هەروەها بەو سەرئەنجامە گەیشتم، کە دەبێت تەواوی هەوڵەکانی خۆم لە مەهتاب بشارمەوە. لێپرسینەوەی مەلەکە لە مەهتاب، کاریگەری زۆری تێکردم. ئیتر نەمدەتوانی بە زانیاری زۆر باری زیاتر قورستر بکەم و بیخەمە مەترسییەوە. ئیتر نەدەبوو لەسەر گەڕانەوەمان بۆ ئەمریکا لەگەڵی بدوێم. ئەوە بڕیارێك بوو کە تا ئاستێك زۆر ئازاریدەدام. زۆر بە پەرۆشبووم لە ئەگەری بوونی هەر هەواڵێکی خۆش، مەهتابم بێبەشنەکردایە، بەڵام کە دوورتر دەمڕوانی، ئەوە باشترین مامەڵە بوو ئەگەر من ئەوم خۆشدەویست. هەروەها پێویستنەبوو بێهودە هیوای پێبدەم، تا ئەو کاتەی ڕێکدەکەوتین بەرەو ئەمریکا کە هێشتا هەرزێکم لە خەیاڵدا نەبوو، ئەمە چۆن دەبێت - ئینجا ئەوسا پێیبڵێم.

هەلومەرجەکەمان وابوو، لە کاتێکدا مودی بە هۆکاری شێتانەی تایبەتی خۆیەوە لە هەوڵی پشتنەستورکردنی خۆیدا بوو بە سۆزی ئێمە، ئێمەش - هەر یەکەمان بە ڕێگای خۆی - خەریکی سەنگەر قایمکردبووین بە دەوری خۆماندا.

ئاشتییەکی لەرزۆك، پێکەوە بوونێکی نامۆ هاتەکایەوە، کە بە ڕواڵەت ئاسانتر، ئارامتر و کەم مەترسیتر بوو، بەڵام کێسمەکێشێکی قووڵتر لە پەردگرتندا بوو. ژیانی ڕۆژ بە ڕۆژمان باشتر بووبوو، بەڵام لەژێرەوە لە مەیدانی جەنگێکدا بووین کە زۆر دڕندانەتر و نادیارتر بوو لە ڕابوردوو.

مامل و نەسرین هەر نەهاتنەوە، لەلای کەسوکاریان مانەوە، بەڵام ڕەزا و ئیسا گەڕانەوە نهۆمەکەی خۆیان لە خوارەوە. من و ئیسا کەوتینەوە هاوڕێیەتییەکی تێکەڵ بە گومان.

شانزەی *ئوردیبەهەشتی* مانگی فارسی هات، کە ئەو ساڵە ڕێکەوتی شەشی ئایار بوو، ڕۆژی لەدایکبوونی ئیمامی مەهدی، دوانزدەهەمین ئیمام. کە چەند سەدەیەك لەوەوپێش سەریناوەتەوە و شیعەکان لەو باوەڕەدان، لە ڕۆژی قیامەتدا لەگەڵ مەسیحدا دەردەکەوێتەوە. وەك نەریتێك، لەو ڕۆژەدا چیت پێخۆشە دەتوانی داوایلێبکەیت.

ئیسا بۆ ماڵی پیرێژنێك دەعوەتیکردم، کە بۆ ماوەی چل ساڵ نزری کردبوو. نزری ئەم ژنە ئاوابوو، کە لەبەرامبەر چاکبوونەوەی کچەکەیدا لە نەخۆشییەکی کوشندە، ساڵانە ئاهەنگی ڕۆژی لەدایکبوونی ئیمامی مەهدی بگێڕێت.

ئیسا پێیوتم نزیکەی دوو سەد ژن کۆدەبنەوە، منیش هێنامە بەرچاوی خۆم، کە چ ڕۆژێکی دووروودرێژ دەبێت لە گلەیی لە بەختی خۆ و پاڕانەوە، لەبەرئەوە بە ئیسام وت، "نـــا، نامەوێت بێم."

"تکاتلیندەکەم وەرە،" ئیسا وتی. "هەر کەسێك بۆ خۆی ئاواتێکی هەیە و دەیەوێت بێتەدی، دەچێت و پارەیەك دەدەیت بەو ژنە، ئەویش ئایەتێکت بۆ دەخوێنێت و لە خوا دەپارێتەوە بۆت. پێش ئەوەی ساڵەکە تەواوبێت، پێش ئەوەی رۆژی لەدایکبوونێکی تری ئیمامی مەهدی بێتەوە، ئاواتەکەت دێتەدی. بۆچی تۆ هیچ ئاواتێکت نییە، خوازیاربیت بێتەدی؟" ڕاستگۆیانە زەردەخەنەیەکی بۆ کردم. دەیزانی ئاواتم چییە!

"زۆر چاکـــە،" وتم. "ئەگەر مودی ڕێگامبدات."

مایەی سەرسامیم بوو، مودی ڕازیبوو، دەیویست تێکەڵی ئەم بۆنە دینییانە بم.

سەرلەبەیانی ئەو ڕۆژە ماڵەکە پڕبوو لە خەڵك. پیاوان لە نهۆمەکەی ڕەزا کۆبوونەوە، لە کاتێکدا بە دەرزەن ژنان تێکدەترنجانە ناو ئۆتۆمبیلەکانەوە بۆ ئەم بۆنە گەورەیە، نزیکەی کاژێرێك ڕێگا بوو بۆ باشوور بەرەو ماڵی پیرێژن، کە لە نزیکی فڕۆکەخانە بوو.

زۆربەی زۆری ژنانی خێڵەکە لەوێ بوون و ئیسا چاودێری من و مەهتابی دەکرد. تەواوی ڕۆژەکە مایەی واقوڕمانمبوو. چووینە ماڵێکەوە پڕیبوو لە ژن، لەجیاتی عەباڕەش جلی ئاڵاووالایان پێشیبوو، هەندێك کراسی یەخە گەورە و بێقۆڵیان لەبەردا بوو، هەندێکی تر پانتۆڵی تەسك. لەوەدەچوو هەموویان یەکسەر لە سالۆنی ئارایشەوە هاتبن، قژیان چاککرابوو، مکیاجێکی خەستخۆڵ کرابوون. زێروزیو بریقوباقیان بوو. دەنگی موسیقای *بانـدەری*[1] و گرمەی تەپڵ لە چەند بڵندگۆوە بەرزدەبوودوە. چی ژنان لە هۆڵەکەدا بوو، بە سمت بادان و دەست بەسەرەوە، بە شوروشەوقێکی بێوێنەوە سەمایاندەکرد. هەواڵێك لە عەباڕەش و *ڕووسەری* نەبوو.

ئیسا عەباکەی توڕهەڵدا تا کراسە شینە پیرۆزەییە ملکراوە گەورە ئابڕووبەرەکەی پیشانبدات، هەروەها چی ئاڵتونی هەبوو، کردبووی بە خۆیدا.

نەسرین کراسێکی دووپارچەیی شینی ئاسمانی لەبەرکردبوو.

زوهرە و فریشتەش هاتبوون، بەبێ عەمە بزورگی دایکیان. "نەخۆشـــە،" باسیانکرد. کە جۆری ئاهەنگەکەم بینی، تێگەیشتم بۆچی. عەمە بزورك بە شادی قەڵسدەبوو، ئەم جۆرە ئاهەنگانە لە پەلوپۆی دەخست.

پاشان کۆمەڵێك ژن دەستیانکرد بە جۆرێك لە سەمای ڕۆژهەڵاتی، چەند ژنێك کەوتنە گۆرانی وتن و کۆمەڵێکی تر بە کراسی ڕەنگاوڕەنگەوە پیوەستبوون بە ڕیزی سەماکەرانەوە.

یەك لە پاش یەکی ژنەکان لە پیرێژنە قورئانخوێنەکە نزیکدەبوونەوە، کە لە قوژبنێکی هۆڵەکەدا دانیشتبوو، ئارەزووی هەر ژنێکی بە بڵندگۆ ڕادەگەیاند و پاشان دەکەوتە ئایەت خوێندنەوە.

ئاواتی فریشتە ئەوە بوو، کە لە تاقیکردنەوەی قوتابخانەدا نەکەوێت.

زوهرە ئارەزووی مێردی دەکرد.

نەسرین بێئارەزوو بوو.

ئیسا ئاواتەخوازبوو مەهدی پێبگرێت.

ئەم ئاهەنگە پڕ شوروشەوقە ماوەیەك بەردەوامبوو، كە ئیسا پێیوتم، "تۆ هیچ ئاواتێكت نییە؟"

"بەڵێ هەمە، بەڵام نازانم چۆنی بكەم."

ئیسا تۆزێك پارەی خستە دەستمەوە. "هەر بڕۆ بۆ لای ئەو ژنە و ئەو پارەیەی بدەرێ،" ئیسا وتی. "تەنیا لەتەنیشتی دانیشە و ئەو بۆ خۆی ئایەتت بۆ دەخوێنێت. پێویستناكات ئارەزووی دڵی خۆتی پێبڵێیت. بەڵام لەكاتی ئایەت خوێندنەكەدا، دەبێت هۆشت لای ئارەزووەكەی خۆت بێت."

دەستی مەهتابم گرت و لە پیرێژنەكە نزیكبوومەوە. پارەكەم خستە قولەمستێوە، بەبێئەوەی هیچ شتێك بڵێم، لەتەنیشتی دانیشتم.

سەرپۆشێكی ڕەشی شیفۆنی دا بە سەرمدا و لەبەرخۆیەوە دەستیكرد بە ئایەت خوێندن.

چەند كــــــەرم! لەبەرخۆمەوە وتم. ئەمە هەر نابێت بە هیچ. پاشان بیرمكردەوە، بەڵكو هەر شتێكی لێدەربچێت. دەبێت دەست بۆ هەموو شتێك بەرم. ئینجا بیرم لە ئاواتەكەی خۆم كردەوە: ئاواتەخوازم من و مەهتاب بگەڕێینەوە بۆ ئەمریكا.

ئەم ئەریتە تەنیا چەند خولەكی خایەند. كاتێك گەڕامەوە بۆ لای ئیسا، هەستمكرد كە لەوانەیە كێشەم بۆ دروستبێت. چونكو ئەگەری ئەوە هەبوو ئیسا، ئەسرین، زوهرە، فریشتە - یان هەر یەكێك لە "خوشكەزا" لە ژمارەنەهاتووەكان لە ماڵەكەدا، بە مودی بڵێت، كە من ئارەزووم هەیە. ئەویش داوام لێبكات، بزانێت چییە.

بڕیارمدا، هەركە گەیشتمە ماڵەوە بە مودی بڵێم، پێش ئەوەی یەكێكی تر فریابكەوێت.

"ئیمرۆ داوامكردووە ئاواتم بێتەدی،" وتم. "لە ئیمامی مەهدی پاڕامەوە، ئاواتم بهێنێتەدی."

"ئاواتت چییە؟" بەگومانەوە پرسیاریكرد.

"ئاواتم ئەوەیە، كە هەر سێكمان وەك خێزانێك دووبارە شاد و كامەرانببینەوە."

لەو ڕۆژەوەی مودی مەهتابی هێنایە ماڵەوە بۆ شەومانەوە، وردەوردە ژێرچاودێری ئێمەی كەمكردەوە. لەپاش مانگێك بۆ جارێكی تر بووینەوە بە خێزانێكی ئاسایی. ڕێگایدا لە هەفتەیەكدا مەهتاب چەند ڕۆژ لەلای من بمێنێتەوە. هەندێك جار ڕێگایدەداین بەكار بڕۆینە دەرەوە، جاری واش هەبوو دەیخستینە ژێرچاودێرییەوە. ژیانێكی سەیرمان دەبردەسەر، وەك ئەوەی لە دیرێكدا بژین.

خەریكبوو لە پێستی خۆم دەهاتمە دەرەوە، نەمدەزانی چۆن كات بكوژم، هەرچەند تەنیا ئەوە كارێك بوو كە دەمتوانی بیكەم. بەناچاری كەوتمە چاوشاركی لەگەڵ مەهتاب،

وەك ئەوەی كە لەگەڵ مودی دەمكرد. وەك موسڵمانێك نوێژەكانی خۆمم دەكرد و مەهتابیش لاسایی منی دەكردەوە. مودی وردەوردە كڵاوی لە سەری خۆی نا، چونكە دەویست باوەڕبهێنێت. كە ئاشتی ناوماڵی لەوێیو دەرگای حەوشەوەیە. دێوەزمەیەك بەسەر سەرمەوە دەسوڕایەوە و برستی، لێبڕیبووم. ژیانی ئاساییمان وەك خێزانێك دەستپێكردبۆوە، من ئەمدەم دەویست بۆئەوەی خۆم وا پیشانبدەم، كە ژنێكی ملكەچم. دەكەومە چ هەلومەرجێكەوە ئەگەر سكم پڕبێت؟ نەمدەویست باری خۆم ئەوەندەی تر قورستر بكەم بە دروستكردنی منداڵێكی تر بۆ ئەم ناو جیهانە ناوەژووە. نەمدەویست منداڵم لە پیاوێك ببێت كە ڕقم لێیدەبۆوە. سكپڕبوون پەتی ئەو داودی تێیكەوتبووم، زیاتر ئەستورتر دەكرد.

ئۆی حوزەیران ڕۆژی لەدایكبوونم بوو، هەوڵمدا خۆمی تێنەگەیەنم. ئەو شەوە مودی لە نەخۆشخانە ئێشكگر بوو، لەبەرئەوە مودی داوای لە من و مەهتاب كرد لە نهۆمی خوارەوە بمێنینەوە، شوێنێك كە ئیسا دەیتوانی چاوێكی لێمانەوە بێت. هەرچەند هەوڵمدا نەچینە خوارەوە، بەڵام ئەو لە داوای خۆی نەهاتە خوارەوە. ئـــاوا لە شەوی لە دایكبوونمدا دەبوو لە سەر ناوفەرشی ماڵی ئیسا جێگای خۆمان بكەینەوە، گسك لە كەلاكی سیسرك بدەین، كە میزی مەهدی هێنابوونی، جێگای نوستنی خۆمان ڕابخەین و هەوڵبدەین بنوین.

نیوەشەو زەنگی تەلەفون لێیدا. ئیسا وەڵامیدایەوە و یەك لەسەر یەك وشەی "نـــا، نا"ی دووبارەدەكردەوە.

"كەسوكاری منە،" وتم. "دەمەوێت لەگەڵیان بدوێم. ڕۆژی لەدایكبوونمە." بەشێوەیەكی ناشرین تەلەفونەكەم لێسەند و گوێم پێوە نا، كارۆلینی خوشكم بوو. تەواوی هەواڵەكانی باوكمی پێوتم، كە هەلومەرجەكەی گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە. هەروەها باسی جۆیی بۆ كردم، كە لەلای خاوەنكارەكەی پێشووم، لە ئایتیتی هانكوك لە ئلیسا، كاری وەرگرتووە. چاوم پڕبوو لە فرمێسك، گریان قوڕگمی گرت، نەمدەتوانی قسەبكەم. "پێیبڵێ خۆشمدەوێت،" هەر ئەوەم توانی پێیبڵێم. "بە جۆن بڵێ ... هەروەها ... ئەویشم خۆشدەوێت."

بۆ ئێوارەی دوایی، مودی لە ئێشكگری دووروودرێژی لە نەخۆشخانە گەڕایەوە. لەگەڵ خۆی چەپكێك گوڵی مینا و داودی بۆ هێنامەوە، وەك دیاری ڕۆژی لەدایكبوونم. سوپاسمكرد و پاشان دەستبەجێ، پێش ئەوەی ڕەزا یان ئیسا دەمبكەنەوە، باسی تەلەفونەكەی كارۆلینم بۆ كرد. كاردانەوەكەی زیاتر گوێپێنەدان بوو تا ئەوەی توڕەبێت، كە مایەی ئاسودەییم بوو.

ڕۆژێكی هەتاوی مودی ئێمەی بردە دەرەوە، لە چەند كۆڵانی ئەولای ماڵی خۆمانەوە، سەردانی ژن و پیاوێكی بەساڵاچوومان كرد، كە بە جۆرێك خزم بوون. كوڕەكەیان بەناوی مورتەزا، كە هاوتەمەنی مودی بوو، لەگەڵیان دەژیا. چەند ساڵ لەوەوپێش ژنەكەی

لەدەستدابوو، دایك و باوكیشی یارمەتیاندەدا بە بەخێوكردنی كچەكەی، بە ناوی نیلهام، كە چەند ساڵێك لە مەهتاب گەورەتر بوو. كچێكی دڵگیر و جوان بوو، بەڵام غەمبار و تەنیا، بەگشتی لەلایەن باوك و نەنك و باپیرییەوە پشتگوێخرابوو.

ئەوەندەی لە قسەكانی مورتەزا تێگەیشتم، سەرەتای گفتگۆی بەوە دەستپێكرد، كە كەسوكار فشاریان بۆ مودی هێناوە تا ئازادییەكی زیاترم پێبدات. "ئێمە خۆشحاڵین بە بینینی تۆ،" بە منی وت. "لەم دواییانەدا كەس تۆ نەبینیوە. بۆمان جێگای پرسیاربوو، چیت بەسەرهاتووە، دڵمـان لەلات بوو، ئەوەكو شتێك روویدابێت لێت."

"حاڵی باشە،" مودی وتی، نیگەرانی لە دەنگیدا تەواو دیار بوو. "دەتوانی بیبینیت، باشە."

مورتەزا لە وەزارەت كاری كۆنترۆڵی هاتوچۆی تەلێكسی دەكرد لەگەڵ دەرەوەی وڵات. كارێكی گرنگ بوو. دەستكەوتێكی زۆری هەبوو. هەر ئەو رۆژە لەناو گفتگۆكەماندا، مورتەزا ئاماژەی بەوە كرد، كە بەنیازە بۆ پشوو لەگەڵ نیلهام بچێت بۆ سویسرا یان لەوانەیە بۆ بەریتانیا. "زۆر باش دەبوو، ئەگەر بتتوانیایە تۆزێك ئینگلیزی فێری نیلهام بكەیت، پێش ئەوەی برۆین،" روو بە من وتی.

"چاكـــە، پێمخۆشە فێری ئینگلیزی بكەم،" وتــم.

"بۆچوونێكی زۆر باشە،" مودی رەزامەندی خۆی پیشاندا. "بۆچی بەیانیان نیلهام ناهێنی بۆ ماڵمان؟ بیتی دەتوانێت خەریكبێت لەگەڵی، كاتێك من لەسەر كارم."

دوایی بە رێگاوە بۆ ماڵەوە، مودی خۆشحاڵی خۆی دەربڕی. نیلهام منداڵێكی خۆشەویست بوو، لە زۆربەی منداڵەكانی تر بە هەڵسوكەوتتر بوو، مودیش دەویست یارمەتیبدات. هەستی بە نزیكایەتی دەكرد لەگەڵی، چونكو وەك ئەو كە منداڵ بووە، دایكی لەدەستداوە. هەروەها پێیوتم، كە زۆری پێخۆشە شتێكی دۆزیوەتەوە خەریكبم پێوەی. "دەمەوێــت لێرە دڵشادبیت."

"منیش دەمەوێت لێرە دڵخۆشبم،" بە درۆوە وەڵاممدایەوە.

ئینگلیزی فێركردنی نیلهامیش، لەوەدەچوو وەڵامێك بێت بە ویردەكانم. ئیتر مود دەستی هەڵگرت لەوەی بە رۆژ مەهتاب بەرێت بۆ ماڵی مەلەكە. من و نیلهام پێویستمان بە مەهتاب بوو وەك وەرگێرێك و كاتێك لە فێركردنی ئینگلیزی تەواودەبووین، هەر دوو كچەكە پێكەوە بە خۆشییەوە یاریاندەكرد.

رەزا و ئیسا وایان دانابوو، بچن بۆ زیارەت بۆ *مەسجدی* پیرۆز لە *مەشهەد*، ئەو مزگەوتەی كە عەمە بزورگ بۆ چاكبوونەوە زیارەتكردبوو. پێش ئەوەی مەهدی لەدایكبێت، رەزا و ئیسا نزریانكردبوو، كە ئەگەر *ئەڵا* كوڕیان بداتێ، بەڵێنیاندابوو ئەم جۆرە زیارەتانە بكەن. لە راستیدا كوڕێكی ناتەواویان بوو، دڵگەرمییەك بەو بەڵێنەی

دابوویان ئەما، بەڵام هەر دەبوو نزرەکە ئەنجامبدەن. کاتێك دەعوەتی ئێمەیان کرد بچین لەگەڵیان، داوام لە مودی کرد قبووڵیبکات.

ئەوەی یەکسەر هات بە خەیاڵمدا، ئەوە بوو کە سواری فڕۆکە دەبین بۆ مەشهد لەو پەڕی باکووری رۆژئاوای ئێران. لەو دواییانەدا چەند فڕۆکە فڕاندنێکی ناخۆیی روویدابوو، ئەم سواری فڕۆکەبوونە ئەو ئەگەرە بچوکەی دەهێنایە پێشەوە، کە لەناکاو لە بەغداد بنیشینەوە.

هەروەها ئەوەشم لەبەرچاوبوو، کە ئەم سەفەرە لەوانەیە نیگەرانی مودی کەمکاتەوە. بێگومان حەزی ئەوەی من بچم بۆ زیارەت، دڵنیاییەکی دەدا بە مودی، کە وردەوردە بە شێوەی ژیانی ئەو رازیـدەبم.

بەڵام حەزی من هۆیەکی زۆر قووڵتری هەبوو. بەڕاستی دەمویست زیارەتبکەم. ئیسا پێیوتبووم، کە ئەگەر بە رێکوپێکی زیارەتی ئەو گۆڕە بکەم لە مەشهد، سێ ئارەزووم دێتەدی. من هەر دانیەکم هەبوو، بەڵام بە پەرۆشەوە دەمویست باوەڕم بە موعجیزە بێت لە مەشهد. "هەندێك خەڵك، کەسانی نەخۆش و شێت دەهێنن لەگەڵ خۆیان و بە پەتێك دەیانبەستنەوە بە گۆڕەکەوە و چاوەڕوانی موعجیزە دەبن رووبدات،" ئیسا بە پەرۆشەوە پێیوتم. "هەندێك جار روویداوە."

بۆ خۆشم لام رۆشنەبوو، لە دینەکەی مودیدا، باوەڕم بە چی هەیە و بە چی نییە. بەڵام ئەوەم لا روونبوو، کە ناچاری واملێدەکات، لە دەرگای هەموو ماڵێك بدەم.

مودی خێرا رازیبوو بۆ ئەم زیارەتە. ئەویش ئارەزووی هەبوو.

فڕین بۆ مەشهەد ماوەیەکی کورتی برد، کە گەیشتینە ئەوێ مودی هەمووماني چەپاندە ناو تەکسییەکەوە بۆ هوتێلەکەمان. ئەو و رەزا باشترین هوتێلیان لە شارەکەدا گرتبوو. "ئەمـــە چییە؟" مودی بۆڵەی لێوەهات، کاتێك گەیشتینە ژووری ساردی شێداری هوتێلەکە. جێگایەکی نوستنی رەقوتەق چاوەڕوانمانبوو. پارچەیەك پەڕۆی شڕ وەك پەردە بە پەنجەرەکەوە هەڵواسرابوو. گەچی دیواری رەنگ خۆڵەمێشی، هەر هەمووی قڵیشی بردبوو، لەوە دەچوو چەند دەیەیەك بێت بۆیە نەکرابێت. فەرشێکی پیس داخرابوو، کە نەماندەوێرا بێپێڵاو بەسەریدا بڕۆین. لەتاو بۆنی توالێت خەریکبوو هێڵنجبدەین.

ژوورەکەی رەزا و ئیسا بەرامبەرمان بوو، لەوەی ئێمە باشتر نەبوو. پەرۆشی دین و هەڵهاتن لە هوتێلەکە، وایلێکردین دەستبەجێ بچین بۆ *حەرەم*، بۆ گۆڕەکە.

من و ئیسا عەبامان دا بەسەردا، کە بۆ ئەو بۆنەیە قەرزمانکردبوو. ئەم عەبایانە جۆری عەبای عەرەبی بوون، پەتێکی لاستیکی پێوە بوو کە دەتبەست، عەباکەی رێك بەسەرتەوە رادەگرت. بۆ کەسێکی وەك من کە سەروکارم لەگەڵ عەبادا نەبوو، بەکارهێنانی ئەم جۆرەیان زۆر ئاسانتر بوو.

بەپێ چووین بۆ مەسجیدەکە، کە زۆر دوور نەبوو لە هوتێلەکەمانەوە. شەقامەکان پڕبوون لە فرۆشیار، کە بە دەنگی بەرز پێشبڕکێیان بوو بۆ فروشتنی کاڵاکانیان. هەندێك

لەو کاڵایانە تەسبیح و بەردەنوێژ بوون، هەندێکی تریشیان شتی چنراوی جوان و خشڵی شینی تۆخ بوون. قورئان خوێندن لە بڵندگۆوە لە هەموو کونوقوژبنێکەوە دەبیسترا.

مەسجیدەکە گەورەتر بوو لەوانەی تا ئێستا بینیبووم، بە دیکۆرێکی جوان لە گومەز و مونارە ڕازابۆوە. بەناو زیارەتکەراندا، ڕێگای خۆمان کردەوە تا گەیشتینە ناوگەیەك بۆ دەستنوێژشتن. پاشان دوای چاوساغێك کەوتین بەناو حەوشەیەکی گەورەدا و پاشان بەناو هۆڵی جۆراوجۆردا، کە ناوفەرشەکانی بە فەرشی ئێرانی گرانبەها داپۆشرابوون، دیوارەکانی بە ئاوێنەی زۆر گەورەی چوارچێوەی نەخشکراوی زیو و ئاڵتون ڕازێنرابوونەوە. سورەیای گەورە هەڵواسرابوون و تیشکی گڵۆپەکانی لە ئاوێنە گەورەکانەوە پەرچەدەبوونەوە، کە چاوی ئازاردەدا.

کە لە حەرەم نزیکبووینەوە، ژن و پیاویان جیاکردەوە. من و ئیسا، مەریەم و مەهتابمان لەگەڵ خۆمان کێشکرد و هەوڵماندا بە ئەنیشکهاویشتن بەناو قەرەباڵغی نەخۆشی گەشکەگرتوودا ڕێگای خۆمان بکەینەوە، کوششمانکرد بە جۆرێك خۆمان نزیکبکەینەوە، کە دەستمان بە حەرەمەکە بکەوێت تا بتوانین لە خوا بپاڕێینەوە، ئاواتەکانمان بۆ بهێنێتەدی. بەڵام بۆ چەند جار هەوڵەکانمان بێئاکام دەرچوو. لە کۆتاییدا چووینە قوژبنێکەوە و نوێژی خۆمان کرد.

پاش ماوەیەکی تر، ئیسا بڕیاریدا هەوڵێکی تر بداتەوە. من و مەهتابی جێهێشت و مەریەمی لە باوەشگرت و خۆی تێکترنجاندە ناو خەڵکەکەوە. بە ئانیشکهاویشتن و پاڵنان، ئەم جارەیان توانی بگاتە حەرەمەکە، مەریەمی بەسەر خەڵکەکەدا بەرزکردەوە تا دەستی بەر گۆڕەکە بکەوێت.

پاشان مودی لێم کەللەییبوو، لەبەرئەوەی هەمان شتم بۆ مەهتاب نەکردووە. "سبەینێ تۆ مەهتاب لەگەڵ خۆت دەبەیت،" بە ئیسای وت.

سێ ڕۆژ لەم کەفوکوڵە دینییە تێپەڕی. هەرچی چۆنێك بوو، توانیم خۆم بگەیەنمە حەرەمەکە. کاتێك دەستم بەریکەوت، ڕاستگۆیانە لە خوا پاڕامەوە، کە یەك ئاواتم هەیە بۆم بهێنێتەدی - کە ڕێگابدات، من و مەهتاب بە سەلامەتی بگەڕێینەوە بۆ ئەمریکا تا بتوانین باوکم ببینین، پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکات.

زیارەتەکە بە قووڵی کاریتێکردم، زیاتر نزیکی خستمەوە لە هەر کاتێکی تر ڕاستگۆیانە باوەڕ بە دینەکەی مودی بهێنم. لەوانەیە ئەمە ئاکامی بێهیوایی خۆم و کاریگەری ئەو کەشە خولێهێنەرە بووبێت. هۆکەی هەرچی شتێك بووبێت، من باوەڕم هێنا بە کاریگەری حەرەمەکە. لە چوارەمین ڕۆژ و دواڕۆژدا لە مەشهەد، بەو پەڕی باوەڕەوە بڕیارمدا، جارێکی تریش ئەم زیارەتە دووبارەبکەمەوە.

"دەمەوێت بەتەنیا بچم بۆ حەرەمەکە،" بە مودیم وت.

مودی نەیوت، بـــۆ. شوروشەوقم ئاشکرا بوو بۆی. لە ڕاستیدا سوکە زەردەخەنەیەك گرتی، هێمایەك بوو بۆ خۆشی، کە گۆڕانێك بەسەرمدا هاتووە.

بەیانی زوو لە هوتێلەکە چوومە دەرەوە، پێش ئەوەی ئەوان ئامادەبن، بەنیازی ئەنجامدانی دواپارانەوە و بە نیمانترینیان. کە گەیشتمە *مەسجیدە*کە، خۆشحاڵبووم لەوەی کە هێشتا قەرەباڵغ نەبووە. بەئاسانی گەیشتمە *حەرەم*ەکە، چەند ڕیاڵێکم دا بە پیاوێکی مێزەربەسەر تا نوێژم بۆ بکات - بۆ ئەو ئاواتەی کە لە دڵمدا بوو و بۆ چەند خولەکێك لەو پەڕی ڕاماندا لە تەنیشت *حەرەم*ەکە دانیشتم. یەك لەسەر یەك ئارەزووەکەمم بۆ ئەڵا دووبارەدەکردەوە و هەستێکی ئاسودەیی سەیر دایگرتم. هەرچی چۆنێك بوو، زانیم ئەڵا \ گۆد بـــەم زووانە ئاواتەکەم دەهێنێتەدی.

ڕۆژێکیان مودی ئێمەی برد بۆ ماڵی عەمە بزورگ، بەڵام لەوێ بۆی گرنگ نەبوو، خۆی بگۆڕێت و بیجامەی ئوتوکراو لەبەربکات. هەر بە قاتەکەیەوە مایەوە و لە چەند خولەکەدا، قسەوباسێکی گەرمی لەگەڵ خوشکەکەی دامەزراند. شێوەی زمانەکەیان گۆڕی بۆ شوستەری، لەهجەی ناوچەیی خۆیان، تا من و مەهتاب لە ناوەڕۆکی باسەکەیان تێنەگەین، بەڵام لەوە دەچوو بەردەوامی کێشەیەك بێت کە لە ئارادا بوو.

"کارێکم بۆ هاتۆتەپێش دەبێت بڕۆم،" مودی لەپڕ پێیوتم. "تۆ و مەهتاب لێرە دەمێننەوە." پاشان بەخێرایی لەگەڵ مەجید چوونە دەرەوە.

نە حەزمدەکرد بێمە ناو ئەم ماڵەوە، کە بیرەوەرییەکی ناخۆشم تیایدا هەبوو، نە پێشمخۆشبوو تەنیا جێمبهێڵێت لەگەڵ هەر یەك لەوانەی لێرەدا دەژیا. من و مەهتاب چووینە حەوشەکەی داوە بۆ لای ئاوگاکە، بۆنەوەی تۆزێك خۆر بەسەر جلەکانمەوە لێمانبدات، هەروەها بۆنەوەی دووورکەوینەوە لەوانەی لەناو ماڵەکەدا بوون.

بۆ نەگبەتی، عەمە بزورگ دوامانکەوت بۆ دەرەوە.

"*ئـــەزیـــزم!*" بە نەرمی پێیوتم.

"خۆشەویستم!" عەمە بزورگ وا بانگیدەکردم.

بە قۆڵە ڕەقەڵەکانی باوەشی پیاکردم. *"ئەزیزم!"* دووبارەیکردەوە. بە فارسی دەدوا، وشەی سادەی بەکاردەهێنا تا بتوانم تێبگەم یان مەهتاب وەریبگێڕێت.

"*مان خەیلی، خەیلی، خەیلی موتەئەسیفەم، ئەزیزم.*" "من زۆر، زۆر، زۆر بەداخم، خۆشەویستم." هەر دوو دەستی خستە سەر سەری و هاواریکرد، *"ئـــەی خودا!"* "ئەی خوایە!" پاشان وتی، "بچۆ تەلەفونبکە. تەلەفون بۆ خێزانەکەت بکە."

ئەمە فێڵە، وام بە خەیاڵدا هات. "نـــا،" وتم. لە ڕێگای وەرگێڕانی مەهتابەوە پێموت، "ناتوانم، چونکە مودی ڕێگامپێنادات. مۆڵەتم نییە."

"نـــا، تەلەفون بۆ خێزانەکەت بکە،" عەمە بزورگ زۆریدەکرد.

"باوکم شێت دەبێت،" مەهتاب وتی.

عەمە بزورگ بە سەرنجەوە تەماشایکردین. لە چاوانی وردبوومەوە و هەوڵمدا لەژێر عەبا تەنکەکەیەوە، دەموچاوی بخوێنمەوە. چ بەزمێك لە ئارادایە؟ بۆم پرسیاربوو. ئایا

ئەمە داوێك نییە مودی بۆی ناومەتەوە، تا بزانێت گوێڕایەڵی دەكەم یان نا؟ یان شتێك گۆڕاوە، شتێك كە من ئاگاداری نییم؟

عەمە بزورگ بە مەهتابی وت، "باوكت توڕەنابێت، چونكە ئێمە پێینالێین."

هێشتا هەر ڕەتمكردەوە، زیاتر سڵەمیمەوە و سەرم لێتێكچوو. بیری فیلمەكانی كەوتمەوە كە لە ڕابوردوودا لێكردبووم، بەتایبەتی ئەوەی قوم، كاتێك داوایلێكردم دانیشم و پاشان شكاتیلێكردم، كە گوایە ئامادەنەبووم زیارەتەكەم تەواوبكەم بە چوون سەر گۆڕی موسڵمانی پیرۆزی شەهید.

عەمە بزورگ بۆ ماوەیەكی كورت ڕۆیشت، بە كچەكانییەوە، زوهرە و فریشتە، گەڕایەوە و لەگەڵمان بە ئینگلیزی كەوتنە قسە. "بچۆ تەلەفون بۆ خێزانەكەت بكە،" زوهرە وتی. "بەڕاستی بەداخین بۆت، كە نەمتوانیوە لەگەڵیان قسەبكەیت. بۆ هەموویان تەلەفونبكە. چەندت پێخۆشە تەلەفونبكە. ئێمە بە ئەو ناڵێین." وشەی "ئەو،" مودی، بە بێزارییەوە لە دەمی هاتە دەرەوە.

ئەو "ئەو"ەیە منی ڕازیكرد. لەو ساتەدا هەلێك بوو بۆ گفتوگۆ لەگەڵ خێزانەكەم، چەند كورت و خۆش یان ناخۆش بووایە، ئەوەی دەهێنا خۆم بخەمە بەر ئەگەری توڕەیی مودییەوە.

تەلەفونمكرد، بە گریان و داخوخەفت خۆشەویستی خۆمم هەڵڕشت. ئەوانیش گریان، باوكم دنیپیادانا كە ڕۆژ بە ڕۆژ خراپتر دەبێت و ئازاری زۆرتر دەبێت و پزیشكەكان بەنیازی نەشتەرگەری ترن. لەو نیوەشەوەدا جۆی و جۆنم لە ماڵی باوكیان خەبەركردەوە و لەگەڵیان دوام.

عەمە بزورگ لە كاتی تەلەفونەكەدا من و مەهتابی تەنیا جێهێشت، بۆی گرنگ نەبوو بمانخاتە ژێرچاودێرییەوە. پاش ئەوە، داوایلێكردین لە هۆڵەكە دانیشین. لە ڕێگای وەرگێڕانی مەهتاب لەگەڵ زوهرە و فریشتە، قسەوباسمان دامەزراند و چەند ڕازێك ئاشكرابوون.

"من یەكێك بووم لەوانەی كە بە مودیم وت، مەهتابت بۆ بگەڕێنێتەوە،" عەمە بزورگ بانگەشەیكرد. "پێموت، كە نابێت جارێكی تر ئەو جۆرە شتانەت لێدووبارەبكاتەوە. نابێت وا هەڵسوكەوتت لەگەڵ بكات."

ئایا ئەمە مەحاڵ بوو، ئەو ژنەی كە چەند قینەبەرایەتی دەكردم و من ڕقم لێدەبوو، لێمببێت بە هاوپەیمان؟ ئایا ئەوەندە ژیر بوو، تا بتوانێت سەرنجی شێتێتی برا بچوكەكەی بدات و ئەوەندەی پێناخۆشبێت، هەوڵبدات چەند لە توانایدا بێت، من و مەهتاب لە مەترسی بپارێزێت؟ ئەم شتانە زۆر بوون، تا بتوانم بە یەك جار تێیانبگەم. بە وریاییەوە قسەم لەگەڵ دەكرد، بەڵام لەوە دەچوو قبووڵیبكات و لێمتێبگات بۆچی. ئەم ژنە نامۆیە شتێكی لا ڕۆشن بوو. دەیزانی كە من لەودا گۆڕانكارییەك دەبینم. بێگومان نەمدەتوانی

متمانەی پێبکەم و ڕازێکی لا بدرکێنم، ئیتر ڕازەکە هەرچی شتێك بێت. بەڵام ئایا دەمتوانی متمانەی پێبکەم، بۆ ڕامکردنی هەڵسوکەوتی مودی؟

هەر ئەو ڕۆژە خۆم لە دەستی گرفتێکی تر ڕزگارکرد. زۆربەی هەرە زۆری جانتاکانمان هێشتا هەڵگیرابوون لەناو کەنتۆری ئەو ژووری نوستنەی کە هەزار ساڵ لەوەوپێش بەکارمانهێنابوو. هیچ کەس کەڵکی لەو ژوورە وەرنەگرتبوو، کە هێشتا بۆ ئێمەیان دانابوو. هەڵێکم ڕەخساند و چوومە ژوورەکەوە و کەوتمە گەڕان بەناو ئەو دەرمانانەی کە مودی لە ئەمریکاوە هێنابوونی.

حەبی پەمەیی وردم لەناو پاکەتێکی درێژی تەنکی پلاستیکیدا دۆزییەوە. حەبی نۆردێتا[2] بوون. هەرگیز تێنەگەیشتم، مودی چۆن توانیبووی ئەم حەبانە دەربکات بەناو گومرگی کۆماری ئیسلامییەك، کە پێشگیری سکپڕبوونی نایاساییکردووە. پێدەچوو بەرتیلی بە کەسێك دابێت. هەرچی چۆنێك بوو، لەنێو هەموو دەرمانەکاندا چەند پاکەتم دۆزییەوە. ئایا مودی ئەیژماردبوون؟ نەمدەزانی. هاوکێشەیەکم کرد لە نێوانی مەترسی ئاشکرابوون و سکپڕبووندا، سەرئەنجام ئەو سەرکێشییەمکرد و بەشی یەك مانگم برد.

کە پاکەتێکم لەناو جلەکانمدا شاردەوە، بەرگە پلاستیکییەکەی جیکەجیکیدەکرد. لەگەڵ هەر جوڵانەوەیەکمدا جیکەی لێوە دەهات. هەر ئەوەدم لەدەستدەهات ویرد بخوێنم، کەس گوێیلێنەبێت.

کاتێك مودی گەڕایەوە بۆ بردنەوەی من و مەهتاب بۆ ماڵەوە، هیچ کەسێك باسی تەلەفونکردنی منی لەگەڵدا نەکرد. کە خۆمان ئامادەدەکرد بۆ ڕۆیشتن، ترسام لە دەنگهاتنی پاکتە پلاستیکییەکە لە هەر جوڵانەوەیەکمەوە، بەڵام دیاربوو هەر من گوێملێیبوو.

هەرکە گەیشتینە ماڵەوە، حەبەکانم لە ژێر فەرشەکەدا شاردەوە. بۆ ڕۆژی دوایی یەکەم حەبم قوتدا، بەبێ ئەوەی بزانم دروست کاتی خۆیەتی، هیواداربووم کاریگەری خۆی دابنێت.

چەند ئێوارەیەکی ئەبرد، کە بابەحاجی تەلەفونی لەگەڵ مودیدا کرد و پێیڕاگەیاند، دەیەوێت سەردانیبکات. مودی نەیتوانی دەست بە ڕوویەوە بنێت.

خێرا خۆم گەیاندە چێشتخانەکە و چا و خواردنم بۆ ئەم میوانە بەڕێزە ئامادەکرد. ترسم لێنیشتبوو، کە لەوانەیە بابەحاجی هاتبێت بۆ ئاگادارکردنەوەی مودی لە تەلەفونەکە. بەڵام لەپڕ خۆشبینی دایگرتم، کاتێك کە من و مەهتاب لە ژووری نوستنەکەمانەوە گوێبیستی گفتوگۆکەیان بووین.

وەك ئەوەی کە تێیگەیشتین، بابەحاجی بە مودی وت، "ئەمە خانووی ماملە. ئامل لەتاوی تۆ سەری خۆی هەڵگرتووە بۆ ماڵی خەزوری، چونکە نەسرین نایەوێت لە ماڵەکەی خۆیدا، خۆی داپۆشێت کاتێك تۆ لە ماڵەوەی، تۆش بەردەوام لە ماڵەوەیت. بەدەست تۆوە هیلاکبوون. نهۆمەکەی خواردوە، خانووی ڕەزایە و تۆ ئەوێش بەکاردەهێنیت. ئەوانیش

بەدەست تۆوە نازانن ڕوو لە کوێ بکەن. دەبێت دەستبەجێ بگوێزیتەوە. دەبێت لێرە بڕۆیتە دەرەوە."

مودی بەڕێزانە و لەسەرخۆ وەڵامیدایەوە. بێگومان ڕێزی لە "داواکەی" بابەحاجی دەگرت. ئەم پیاوە پیرە سەری دەلەقاند و دەیزانی قسەکانی، کارایی پەیامی ئاسمانی هەیە. پاش ئەوەی مەبەستەکەی ڕۆشنبۆوە، هەستا و ڕۆیشت.

مودی لە تەواوی کەسوکاری خۆی توڕەبوو. لەپڕ بینی، تەنیا مەهتاب و منی بۆ ماوینەتەوە. ئێستا ئیتر هەر هەرسێکمان بووین بە یەك، لەبەرامبەر دنیای ناجۆردا.

مەهتابمان خستە جێگاوە خۆشمان تا نیوەشەو قسەمانکرد.

"من ڕەزام خستە قوتابخانە و پێمگەیاند،" گلەییکرد. "هەرچی پێویستبوو، بۆم دەستەبەرکرد، پارەم پێدا و ئوتومبیلم خستەبەردەست. مامل هات و من پارەی نەشتەرگەرییەکەیم پێدا و هەموو شتێکم بۆ کرد. کەسوکارم هەرچی شتێکیان ویستبووبێت، پێمداون. ئەگەر تەلەفونیان بۆ ئەمریکا کردبێت و چاکەتێکیان ویستبێت، بۆم ناردون. پارەیەکی زۆرم بۆ خەرجکردون، کەچی ئێستا لەبەرچاویناگرن، هەرچیم بۆ کردون لەبیریانچۆتەوە. ئێستاش دەمکەنە دەرەوە."

پاشان کەوتە سەروگێلاکی نەسرین.

"ئەی نەسرین! ئەی کە چەند کەرە  خۆ نابێت هەموو کاتێك خۆی داپۆشێت. بۆچی ناتوانێت وەك ئیسا بێت؟ بێگومان پێیباشە ئێمە لێرە بمێنینەوە، بۆئەوەی تۆ ماڵەکەی بۆ پاکەیتەوە، چێشتی بۆ لێنێیت و دایبی ئەمیر بگۆڕیت. لێرە هەموو شتێکی بۆ دەکەیت. خۆی هیچ شتێك ناکات، بێجگە لە حەمام پێکردنی ئەمیر نەبێت، ئەویش ئەم جەژن بۆ ئەو جەژن. ئەمە چ دایکێك و چ ژنێکە؟ ئیتر ئێستا هاوینە، زانکۆ نییە و پێویستی بە دادە نییە، ئیتر ئێستا 'بۆ دەرەوە!' نە پارەمان هەیە، نە شوێنێکمان هەیە تێیبچین، چۆن ئەو چاوەڕوانییە لە ئێمە دەکەن بگوێزینەوە؟"

ئەمانە وشەگەلێك بوون، بیستنیان مایەی سەرسامی بوو. تا چەند مانگ لەمەوپێش مودی لە بۆچوونی ئیسلامی خۆیەوە، گلەیی لە شلوشێواوی خۆداپۆشینی ئیسا دەکرد و بە شانوباهۆی نەسریندا هەڵیدەدا، وەك نمونەیەکی بێوێنە لە ڕەوشتبەرزی. گۆڕان لە بۆچوونیدا تەکاندەر بوو.

بە وریاییەوە بە چەند سەرنجێك، هاودەردی خۆمم ڕاگەیاند. ئەگەر من بوومایە لەجیاتی نەسرین، بێسێودوو مودیم لە خانووەکە دەکردە دەرەوە، بەڵام هیچ ئاماژەیەکم بەم ڕاستییە نەکرد. نەك هەر ئەوە، بەڵکو لایەنگری تەواوم کرد لە هاوسەرەکەم، وەك ئەوەی کە ئەو چاوەڕوانیبوو. جارێکی تر بوومەوە بە یەکەمین هاندەر و لایەنگرێکی ئاسەر کۆڵنەدەر. چیم لە هەمانە کۆندا هەبوو، دەرمهێنا بۆ ئاسولوسدانی خۆپەسەندییەکەی.

"بەڕاستی ئێمە هیچ پارەیەکمان نییە؟" پرسیارمکرد.

"نـــا، ئەوە ڕاستە، تاکو ئێستا ئەخۆشخانە پارەی پێنەداوم. تاکو ئێستا ئەو کاغەزانەی کە بۆ ڕەسمییەتدان پێویستە، تەواونەبووە."

ئینجا باوەڕم هێنا و بە دەنگی بەرز لێمپرسی، "باشە چۆن بتوانین بگوێزینەوە؟"

"مەجید پێیوتووم، ئەو خانوودی دەیدۆزینەوە، خۆی و مامل کرێکەی دەدەن."

فشارێکی زۆری ویست تا توانیم دڵشادبوونی خۆم بشارمەوە. لە لای من وەك ڕۆژی ڕۆشن وابوو، کە لەم بەندیخانەیەی نەهۆمی سەرەوە دەگوێزینەوە، چونکە مودی بەڵێنی بە بابەحاجی دابوو. ئەوەشم لا ڕوون بوو، کە لە ئێستادا ڕێگای گەڕانەوەمان بۆ ماڵی عەمە بزورگ نییە، چونکە ئەو خوشکەی کە ڕێزی لێدەگرت، تەواو لێیتوڕەبوو. لەڕاستیدا لەو کاتەدا پێکەوە ژیان لەگەڵ هەر یەکێك لە خزمەکان، لە خەیاڵی مودیدا نەبوو، چونکو زۆر لە شکۆییان ڕووشاندبوو.

ئایا دەموێرا ئاواتەخوازبم کە مودی بڕیاربدات، ئیتر کاتێتی بمانگەڕێنێتەوە بۆ ئەمریکا؟

"ئەوان لە تۆ ناگەن،" بەنەرمی پێموت. "زۆرت بۆ کردن، بەڵام با وابێت. گوێمەدەرێ ئێمە پاڵپشتی یەکترین، هەر سێکمان پێکەوەین."

"وایـــــە،" وتی. باوەشیپیاکردم و ماچیکردم. پاش چەند خولەك لە هەڵچوونی هەوەس، توانیم خۆم دابڕم لەوەی چی بە لەشم دەکرێت. لەو ساتەدا لەشم بووبوو بە بەردەبازێك، کە دەبوو لەپێناوی ئازادیدا، پێی پیادابنێم.

بەناو شەقامە پیسەکان و گەڕەکە دڵتەنگەکاندا کەوتینە هەوڵدان بەدوای خانووی کرێدا، بەهێواشی و لەسەرخۆ بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ لەگەڵ دەڵاڵی ئێرانی گەڕاین. هەر خانووی داڕوخاوبوو، بۆ چەند دەیە نە چاکرابوو، نە فڵچەیەکی بۆیاخی بەرکەوتبوو.

کاردانەوەی مودی دڵخۆشکەر بوو، چونکو ئەویش خەریکبوو چاویدەکرایەوە، کە چ هەلومەرجێکی ناپەسەند لە هەموو لایەکەوە دەوریداوین. نزیکەی ساڵێکی برد تا ئەو گەشکەیەی بەرچاوی گرتبوو، بڕەوێتەوە و ببینێت، ئەوەی خەڵکەکەی قبووڵیەتی و بە ئاسایی دەزانێت، لای ئەم قبووڵ نییە و نائاساییە. دەویست ئیتر بەو شێوەیە ژیان نەکات.

هەلومەرجەکە تا دەهات، باری سەرشانی قورسدەکرد. هەرچەند کارێك کە لە ئەخۆشخانە دەیکرد، جێگای ڕێزلێنان بوو، بەڵام هێشتا نایاسایی بوو، نەیدەتوانی کاربەدەستانی دژەئەمریکایی ڕازیبکات دان بە باوەڕنامەکانیدا بهێنن و پارەی پێبدەن، لەبەرئەوە نەیدەتوانی ئەو ئاستە لە بژێو دەستەبەربکات، کە بە شایەنی خێزانەکەی دەزانی.

مودی بینی، خەریکە لە ژێر باری بەدیهێنانی داخوازی پیاوە بەتەمەنەکانی خێزانەکەیدا، پشتی دەچەمێتەوە. هاوڕێیەکی بابەحاجی، دەڵاڵ بوو. خانوویەکی

پیشاندایین، کە چەند کۆڵان ئەولای ماڵی مامەوە بوو. پێمان باش نەبوو، ڕەتمانکردەوە. ئەمە بووە هۆی شەڕە دەنوکی نێوان مودی و بابەحاجی.

"باخچەی نییە،" مودی گلەییکرد. "مەهتاب پێویستی پێیەتی بۆ یاریکردن."

"ئەوە گرنگ نییە،" بابەحاجی وتی. پێویست و حەزی منداڵی لەبەرچاونەدەگرت.

"نە کەلوپەلی تیادایە نە ئامێر،" مودی وتی.

"ئـــەوە هەر گرنگ نییە، تۆ پێویستت بە کەلوپەل نییە."

"ئێمە هیچمان نییە،" مودی ناماژەپێکرد. "نە تەباخمان هەیە، نە یەخچاڵ، نە ئامێری جلشتن. هەتا قاپ و کەوچکمان نییە." کە گوێم بۆ ئەم گفتگۆیانە گرت، بۆم دەرکەوت باشتر لە زمانەکە تێدەگەم. سەرسام و هاوکات خۆشحاڵبووم، کە گوێبیستی بۆچوونەکانی مودی بووم. باخچەی بۆ مەهتاب دەویست و ئامێر بۆ من، ئەو شتانەی دەویست بۆ ئێمە، نەك تەنیا بۆ خۆی.

"ئەوانە هەر هیچ نییە،" بابەحاجی چەندبارەی کردەوە. "تۆ جێگایەك بۆ خۆت بگرە و هەر کەسێك، ئەو شتەی پێویستە، دەتداتێ."

"*تەعاروف*،" مودی وەڵامیدایەوە. وەك ئەوەی بە ڕووی ئەم پیاوە پیرۆزەدا هاواربکات. "ئەمە *تەعاروفە*."

بابەحاجی بە توڕەییەوە هەستا و ڕۆیشت، مودیش نیگەرانبوو ئەوەکو زیادەڕەوی کردبێت. "دەبێت بە زووترین کات جێگایەك بۆ خۆمان بدۆزینەوە،" مودی وتی. "دەبێت جێگایەکی وا گەورە بدوزمەوە، کە بتوانم کلینیکێکی تیادا دانێم و پارەی خۆمم دەستکەوێت." پاش تۆزێك بێدەنگی، بە غەمبارییەوە وتی، "دەبێت ئەو شتانەی هەمانە لە ئەمریکا، بیهێنین بۆ ئێرە."

ڕەزا شافعی یەکێك بوو لە خزمەکانی مودی، پزیشکی بێهۆشی بوو، لە سویسراوە بۆ سەردانێکی کاتی دایك و باوکی هاتبۆوە. لەم پەیوەندەدا ئاهەنگێکی گەورەیان بۆ دەکرد و کە ئێمەش لەناو دەعوەتکراوەکاندا بووین بۆ نانخواردنی ئێوارێ، مودی لە خۆشیاندا گەشکە گرتی. چونکو لە نەخۆشخانە کاریدەکرد و بەنیازبوو کلینیکی تایبەت بە خۆی بکاتەوە، کە بۆ مودی گفتگۆ لەگەڵی واتای هەبوو.

مودی دەیویست دیارییەکی تایبەتی بە ڕەزا شافعی بدات، داوایلێکردم مەهتاب لەگەڵ خۆم بەرم و شتێك کە شایەنی ئەو بێت، بۆی بکرم. ناونیشانی دوکانێکی شیرینی فرۆشی پێدام، کە ناوکە فستقی بە شێوەی وێنە دەرازاندەوە بۆ فرۆشتن. من و مەهتاب لە گرمەی گەرمای نیوەڕۆدا گەیشتینە دوکانەکە، بینیمان بەهۆی نوێژی نیوەڕۆوە داخراوە.

"با بچین لەویانەدا چاوەڕوانبین،" بە مەهتابم وت، ئاماژەم بە سێبەری دارێك کرد لەوبەری شەقامەکەوە. "دنیا زۆر گەرمە."

کاتێك چاوەڕوانماندەکرد، کۆمەڵێك *پاسدارم* لە خوار شەقامەکەوە بینی. پیکاپێکی سپی پڕیبوو لە پاسدار بە جلوبەرگی مەدەنییەوە و لەگەڵ چوار ژنە پاسداری بە عابەوە لە پیکانێکدا بوون. لە خۆوە دەستمبرد بۆ سەرم، بزانم هیچ بسکە قژێك لەژێر رووسەرییەکەمەوە دەرنەکەوتووە. ئەم جارە رێگا بە من ناگرن، لە دڵی خۆمدا وتم.

پاش ماوەیەك لە چاوەڕوانی، هیلاکبووین، ویستمان لە شەقامەکە بپەڕینەوە و بچین بۆ دوکانەکە بزانین گراوەتەوە. هەر پێماننایە ناو شەقامەکەوە پیکانەکە بە خێرایی بەردو رووومان هات، لەپڕ ئیستۆپیگرت، شریخە لێبەرزبۆوە و لەبەردەماندا وەستا. چوار ژنە پاسدارکە هاتنە خوارەوە و چواردەوریاندایین. یەکێکیان دەستیکرد بە قسە.

"تۆ ئێرانی نییت؟" بەگومانەوە بە فارسی پرسیاریکرد.

"نـــا."

"لە کوێوە هاتووی؟"

"لە ئەمریکاوە،" بە فارسی وەڵامەدایەوە.

بە توندی و خێرایی کەوتەقسە، ئاسان نەبوو تێیبگەم و فارسییەکەشم کەڵکی ئەوەی پێوە نەبوو.

"تێتناگەم،" زمانم تەتەڵەیکرد.

ئەمە وای لە ژنە پاسداردکە کرد کەڵلەییبێت. بە توڕەییەوە بە زمانێکی ناڕۆشن قسەیدەکرد، تا سەرئەنجام مەهتاب کەوتە وەرگێڕانی. "دەیەوێت بزانێت، بۆچی تێناگەیت،" مەهتاب روونیکردەوە. "دەڵێت لە سەرەتاوە زۆر باش بە فارسی دوایت."

"پێیبڵێ تەنیا چەند وشەیەك تێدەگەم، لەوە زیاتر نا."

ئەمە بە جۆرێك ژنە پاسدارەکەی نارامکردەوە، بەڵام هەر بەردەوامبوو لەسەر قسەکردن تا مەهتاب وەریگێڕا. "تۆیان وەستاندووە، چونکە گۆرەوییەکانت لە لاقتدا هاتۆتە خوارەوە."

گۆرەوییە ناشرینەکانم هەڵکێشایەوە و ژنە پاسدارەکە لایکردەوە بڕوات، بەڵام پێش ئەوەی دووورکەوێتەوە، دوائاگاداری دا بە مەهتاب، "بە دایکت بڵێ، هەرگیز دووبارە نەیەتەوە سەر شەقام بە گۆرەوی داکشاوەوە."

لە وانەی رەوشت فێربوونەوە چووین بۆ کڕینی دیارییەکە و پاشان لەسەر رێگای گەڕانەوە، مەهتابم ئاگادارکردەوە، کە ئەم رووداوە بۆ باوکی نەگێڕێتەوە. نەمدەویست مودی شتێك ببیستێت، کە وای لێبکات هاتوچۆم سنووورداربکات. مەهتاب تێگەیشت.

ئێواری چووین بۆ ماڵی *عەموو* (ʻمامʼ ناماژەیەکە بە خزمانی باوك) شافعی لە ناوچەی گیشا[3] لە تاران بۆ پێشکەشکردنی دیارییەکەمان بە رەزای کوڕیان. پەنجا شەست کەس لەوێ کۆبووبوونەوە.

شەو درەنگ، پاش ئەوەی هەندێك لە میوانەکان رۆیشتن، ئێمەش خۆمان ئامادەدەکرد بڕۆین، کە لەپڕ دەنگی ترسناکی شاوری هێرشی ئاسمانی هات. کارەبا کوژایەوە. مەهتابم لە

خۆم نزیکخستەوە و لەگەڵ ئەو خەڵکە، کە نزیکەی چل کەس دەبوو، پێکەوە تێکتڕنجاینە ناو چواردیواری ژوورێکەوە.

بە بێدەنگییەکی دژواردەوە ئاسایی چاوەڕوانی دەنگی تۆپە فڕۆکەشکێنەکانمان دەکرد. لە دوورەوە گوێمان لە دەنگی ترسێنەری نزیکبوونەوەی فڕۆکەکان بوو، بەڵام هێشتا هەواڵێك لە دەنگی تۆپی فڕۆکەشکێن نەبوو.

"شتێك هەڵەیە،" یەکێك وتی. "لەوانەیە تەقەمەنیمان تەواوبووبێت."

فڕۆکە هێرشبەرەکان بەسەرماندا شریخەیانکرد، زۆر لێمانەوە نزیك بوون. دەنگی تەقینەوەیەکی گەورە گوێچکەی کەڕکردم و کەوتمە خەیاڵاتێکی ترسناکەوە، جنۆکەیەك بەناو ژوورەکەدا تێپەڕی، نیمەی تەزیو و شکستبار جێهێشت. دیوارەکە زرمەی لەپشتم هەڵسان، من و مەهتابی پاڵنا بۆ پێشەوە. قۆرییە چاکە کەوتە خوارەوە. خڕەی هاتنە خوارەوەی شوشە هات.

پێش ئەوەی فریای خۆمان بکەوین، تەقینەوەیەکی تر ڕوویدا، ئینجا سێیەم. هەموو ماڵەکە لەرزییەوە. گەچی بنمیچ و دیوار لە هەموو لایەکەوە لێبۆوە. گوێم لە قیژە بوو لە تەنیشتمەوە، بەڵام وا دەهاتە گوێم کە لە دوورەوە بێت. لە تاریکیدا چاوەڕوانبووین، بنمیچەکە بەسەرماندا بڕوخێت. مەهتاب کەوتە نوکەنوك. مودی قایم دەستی گرتم.

پەککەوتوانە چاوەڕوانماندەکرد، هەناسەمان لە خۆمان بڕیبوو، خۆمان ڕەقکردبوو.

وردەوردە هاتینەوە سەرخۆمان. چەند خولەك ڕۆیشت ئینجا ئاگاداربووینەوە، کە لورەی فڕۆکە و گەرمەی تەقینەوە بوو بە لورەی ئوتومبیلی فریاکەوتن. لە دەرەوە گوێمان لە هاتوهاواری قوربانیان بوو.

"با بچین بۆ سەربان!" یەکێك وتی و هەموو پێکەوە ڕامانکرد بۆ سەربان. تروسکایی لە شاردا بەدینەدەکرا، بەڵام لە چەند شوێندا کڵپەی ئاگری لەدەستدەرچوو بەرزدەبۆوە. تیشکی لایتی ئەمبولانس، ئاگرکوژێنەوە و پۆلیس شوێنە بۆمبارانکراوەکانی ڕووناکدەکردەوە. تەپوتۆز دنیای گرتبوو، کوشتار و وێرانکاری لە هەموو لایەکەوە دەبینرا. خانووەکانی دەوروپشتمان بەڕیز تەختی زەوییەکە کرابوون. بۆنی باروت و لاشەی سووتاو دەهات. لە شەقامی بەردەم ماڵی خانەخوێکەماندا پیاوان، ژنان و منداڵان پەرکەمانە ڕایاندەکرد، دەیانقیژان و هاواریاندەکرد بەدوای کەسوکاری ونبوویاندا.

ئەو شەوەمان لە ماڵی *عەموو* شافعی بردەسەر، من و مەهتاب سوپاسی خوامان کرد، کە گیانمان بەدەربردووە و ئارەزووی بێئاسۆی خۆمان دووبارەکردەوە کە ئەم وڵاتە جێبهێڵین.

بۆ سبەی بەیانی شەقامەکان داخرابوون، بەڵام ئەمبولانسێك هات بە شوێن مودیدا بۆ نەخۆشخانە. لە کاتێکدا ئەو تەواوی ڕۆژ خەریکی بریندارەکان بوو لە نەخۆشخانە، باقییەکەی ئێمە لە ماڵەکەدا بەندبووبووین. بیرمان لە بێدەنگی تۆپە فڕۆکەشکێنەکان دەکردەوە لە شەوی ڕابوردوودا. هەندێك کەس بۆچوونی ڕەشبینانەیان هەبوو، کە

حکومەت تەقەمەنی تەواوبووە. ئەگەر ئەم ڕاست بوایە، بێگومان دەبوو چاوەڕوانی ئاگربارانی ترمان بکردایەوە.

ئەم قسەلۆکانە بەناو شاردا بڵاوبۆوە، تا نیوەڕۆ تەلەفیزیۆن ڕاگەیاندنێکی بڵاوکردەوە بۆ دامرکاندنەوەی ترس و نیگەرانی خەڵك. ئەوەندەی لە ڕاگەیاندنەکە تێگەیشتم، داوای لە خەڵك دەکرد ئارامبنەوە. هۆی بێدەنگی تۆپە فڕۆکەشکێنەکان، دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە حکومەت هەوڵێکی تری بەدەستەوەیە. بەڵام نەیوت ئەو هەوڵە چییە.

مودی ئەو شەوە گەڕایەوە بۆ ماڵی *عەمەوو* شافعی. ناوچەی گیشا هێشتا داخرابوو، تەنیا بۆ هاتوچۆی ئوتومبیلی فریاکەوتن نەبێت، لەبەرئەوە شەوێکی تریشمان لەوێ بردەسەر. مودی هیلاك و نیگەران بوو، پاش ڕۆژێکی درێژی کاری سەرپەرشتی بێهۆشی لە چەند نەشتەرگەری دەسبەجێدا. چەند هەواڵی ناخۆشی پێبوو سەبارەت بە قوربانیان. تەنیا لە ماڵێکدا، کە ئاهەنگی لەدایکبوونیان هەبووە، هەشت منداڵ گیانیان لەدەستدابوو.

ڕەزا شافعی دەبوو گەڕانەوەکەی بۆ سویسرا دوابخات و لەو ئێوارێیدا پێشنیارێکی بۆ مودی کرد. "تۆ ناتوانی هەروا بیتی و مەهتاب لێرە بهێڵیتەوە،" وتی. "ئێستا ئێرە زۆر مەترسیدارە بۆیان. ڕێگامبدە با بیانبەم بۆ سویسرا. دڵنیاتدەکەم لەگەڵ من دەمێننەوە. ناهێڵم بە هیچ لایەکدا بڕۆن."

ڕەزا شافعی چەند ئاگاداری هەلومەرجەکەی من بوو؟ بۆم جێگای پرسیاربوو. ئایا بەڕاستی بەنیازبوو لە سویسرا ببێت بە پاسەوان بەسەرمانەوە یان زیاتر لە هەوڵی کەمکردنەوە نیگەرانی مودیدا بوو، تا ئێمە بتوانین هەڵبێین؟ بۆم گرنگ نەبوو، چونکە دڵنیابووم دەمانتوانی لە سویسراوە بگەڕێینەوە بۆ ئەمریکا.

بەڵام مودی نەیهێشت ئەم هیوا بچوکە سەربگرێت. "نـــا،" مودی بە مۆنییەوە وتی. "بە هیچ جۆرێك." ئەوەیانی پێباشتر بوو، کە ئێمە بخاتە ئاگری ئەو جەنگەوە.

لە ماڵی *عەمەوو* شافعی دووەم ڕۆژ و پاشان سێیەم ڕۆژمان بردەسەر، پێش ئەوەی کرێکاران بتوانن کوژراو و بریندارەکان لە ناوچەکە بگوێزنەوە. هەر ڕۆژ ڕاپۆرتە هەواڵییەکانی حکومەت سەیرتر دەبوون. ڕاپۆرتەکان ئەوەیان دەدایە دەرەوە، کە هۆی بێدەنگی تۆپە فڕۆکەشکێنەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئێران بووە بە خاوەنی ڕاکێتی ئاسمان - بۆ - ئاسمانی[4] پێشکەوتوو، کە کاریی لە تۆپی فڕۆکەشکێن زیاترە. یەکێك لە ڕاپۆرتەکان وتی، خەڵکی ئێران سەرسامدەبن، کاتێك بۆیاندەردەکەوێت ئەم ڕاکێتە تازانە لە کوێوە هاتوون.

ئەمریکا؟ ڕوسیا؟ فەرەنسا؟ ئیسرائیل؟ هەر کەسێك لەلای خۆیەوە پێشبینییەکی دەکرد، بەڵام مودی بۆچوونێکی دیاریکراوی هەبوو، کە ئەو چەکە تازانە لەلایەن وڵاتە یەکگرتووەکانەوە ئامادەکراوە. بەهۆی گەمارۆی چەك و تەقەمەنییەوە، مودی وتی، لەوانەیە لە ڕێگای وڵاتی سێیەمەوە بە نرخێکی گرانتر بینێرێت بۆ ئێران. هەروەها لەو

باوەڕەدا بوو، کە بازرگانانی تێرنەبووی چەکی ئەمریکا ناتوانن کڕیارێکی وا سەکبەرسی پشتگوێبخەن.

نەمدەزانی یان بۆم گرنگ نەبوو ئەم ڕاکێتانە چۆن دێن، من تەنیا خواخوای ئەوەم بوو، کە نەکەوینە ئەو هەلومەرجەوە، ئەم جۆرە چەکانە بەکاربهێنرێت.

لەو چەند ڕۆژەدا گۆڕانکارییەکی تر هاتە کایەوە، پاش ئەوەی گەڕاینەوە بۆ نهۆمەکەی مامل. حکومەت بەڵێنی تۆڵەسەندنەوەیەکی گەورەی دا لەبەرامبەر بۆمبارانی گیشادا، هەروەها ڕایگەیاند کە بەغداد لە ژێر هێرشێکی گەورە دایە، بە چەکێکی تازەی ڕاکێتی زەوی - بۆ - زەوی[5] کە لە ئێرانەوە دەتەقێنرێت.

هاتنە مەیدانی ئەم چەکە تازەیە، پێشبینییەکی زیاتری لەگەڵ خۆی هێنا، کە کێ ئەم چەکە پێشکەوتووانە دەدات بە ئێران. حکومەت سەرکەوتوانە بانگەشەی ئەوەی دەکرد، کە ئەم چەکە تازانە لە ئێراندا بەرهەمدەهێنرێت. مودی گومانیدەکرد.

ڕۆژێکیان مودی ڕێگای بە من و مەهتاب دا لەگەڵ ئیسا و مەریەم بچین بۆ بازاڕ، بۆ کڕینی جلی هاوینە بۆ کچەکان. بەیانییەکەی بازاڕمانکرد و پاشان تەکسییەکی پرتەقاڵیمان وەستاند بۆ ماڵەوە، هەر چوارمان چووینە کورسی پێشەوە. من لە ناوەڕاستدا بووم، مەهتابم لە باوەشدا بوو. تەکسییەکە کەوتەڕێ، کاتێک شۆفێرەکە گێڕی گۆڕی، دەستی هێنا بە لاقمدا. لەسەرەتاوە وای بۆچووم، کە دەبێت ڕێکەوت بێت، بەڵام بینیم دەستی زیاتر دەبات بۆ سەرەوە و دەست بە ڕانمدا دەهێنێت.

پیاوێکی ناشرینی بۆگەن بوو، بە تیلیچاو تەماشایدەکردم و پێدەکەنی. مەهتاب سەرنجی بەلای مەریەمەوە بوو، ئەمەم بە هەل زانی و لەلاوە بە قایم ئانیشکێکم دا بە شۆفێرەکەدا.

ئەمە زیاتر هانیدا. لەپی دەستی خستە سەر لاقم و گوشی. خێرا دەستی برد بۆ سەرەوە و بەردەوامبوو.

"*متشکریم ئینجاسڕا*" دەنگم لێبەرزکردەوە. "لێرەدا، سوپاستدەکەم!" ئەمە فەرمانێک بوو دەتوت، کاتێک دەگەیشتیتە شوێنی مەبەست.

شۆفێرەکە ئیستۆپێکی خێرای گرت. "هیچ شتێک مەڵێ، بەس بڕۆرە خوارەوە،" بە ئیسام وت. پاڵم بە ئیسا و کچەکانەوە نا بۆ سەر شۆستەکە، خۆشم بەپەلە چوومە خوارەوە.

"چی بوو؟" ئیسا وتی. "نەدەبوو لێرانەدا بێینە خوارەوە."

"دەزانـــم،" وتم. هەموو گیانم دەلەرزی. کچەکانم نارد بۆ تەماشای پێشەنگای دوکانێک و خۆشم ڕووداوەکەم بۆ ئیسا باسکرد.

"بۆ خۆم شتی وەهام بیستووە،" ئیسا وتی. "بەڵام هەرگیز بەسەرم نەهاتووە. لەو باوەڕەدام بەرامبەر ژنانی بیانی ئەوە دەکەن."

که لەم بەزمە ڕزگارمبوو، نیگەرانییەکی ترم بۆ هاتە پێشەوە. "ئیسا" دەست بە دامێنیبووم. "تکاتلێدەکەم بۆ مودی مەگێڕەوە، چونکە ئەگەر پێیبزانێت، ڕێگاناداتم جارێکی تر دوو پێم بچێتە دەرەوە. تکاتلێدەکەم با ڕەزاش نەزانێت."
ئیسا بە وریاییەوە داواکەمی لەبەرچاوگرت و سەری لەقاند.

مودی تا دەهات پەیوەندی لەگەڵ خزمەکانی خراپتر دەبوو، ئەمە وای لێکردم زۆر بیربکەمەوە. هەوڵمدا زیاتر ئەم کابرایە بناسم، تا بتوانم دژەهێرشی خۆم بە شێوەیەکی کاریگەرانە بچنم. بەوردی لە ژیانی کۆڵیمەوە. هەر ئەوەندە توانیبووی لەسەر پێی خۆی ڕاوەستێت، ئێرانی جێهێشتووە بەرەو بەریتانیا. پاش چەند ساڵی تر لەوێوە دەچێت بۆ ئەمریکا. بووە بە مامۆستا، بەڵام دەستی لێهەڵگرتووە و چووە بۆ خوێندنی ئەندازیاری. پاش چەند ساڵ کارکردن لەم مەیدانەدا، چووە بۆ خوێندنی دەرمانی. سێ ساڵ لە کۆرپوس کریستی بووە، دوو ساڵ لە ئەلپێنا و ساڵێکیش لە دیترۆیت، پێش ئەوەی دووبارە ژیانی خۆی تێکبدات بە هێنانی ئێمە بۆ تاران. ئێستا نزیکەی ساڵێکمان تێپەڕاندووە، دووبارە گلۆڵەی ژیانی کەوتۆتەوە لێژی.
نەیدەتوانی جێگا بە خۆی بگرێت. تەنیا بۆ ماوەیەکی کورت دەیتوانی جڵەوی ئارامی ژیانی بەدەستەوە بێت، پاشان لە دەستی بەردەبۆوە. هەمیشە هۆیەکی دەدۆزییەوە، کە بەدووربێت لە خۆی، تا گلەیی لێبکات. بەڵام کە بە ژیانیدا دەچوومەوە، دەمتوانی ببینم کە هەمیشە خۆی یاریدەدەر بووە بۆ گریفتەکانی. شێتانە دەجوڵایەوە و بوارێکی نەدەهێشتەوە بۆ ئارامی خۆی.
گرفتی داواتر چی دەبێت؟ بۆم پرسیاربوو.
لەوەدەچوو ڕێگای دەرچوونی نەبێت. بێگومان ئەوەی پیشاندابوو، کە من تەنیا هاوڕێ و پاڵپشتی ئەوم. ئێمە پێکەوە لەبەرامبەر دنیای بێبەزەیدا بووین.
هەموو ئەمانە هیوایەکی، هەرچەند بچوک، دەهێنایە پێشەوە، کە وا لە مودی بکات، ڕێگایەکی ڕاست بگرێتەبەر، من و مەهتاب بەرێتەوە بۆ ئەمریکا، بەڵام ئەمە پڕ کێشە بوو.
ئێوارێیەکیان زۆر بە وریاییەوە بابەتی گەڕانەوەم بۆ ئەمریکا هێنایە پێشەوە، کەچی ترسی لێنیشت، وەک لەوەی تووڕەبێت. بەسەرهاتێکی گێڕایەوە، کە لەوەدەچوو باوەڕی پێبکات، بەڵام بۆ من مایەی سەرسامی بوو.
"دکتۆر موجەلالییت بیردێت؟" پرسیارلێکردم.
"بێگومان." دکتۆر موجەلالی، بۆ ماوەیەکی کورت، هاوڕێیەکی نزیکی مودی بوو لە کۆرپوس کریستی، پاش داگیرکردنی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە تاران، لەپڕ پەیوەندیان نەما.
"کاری بۆ سینایەنەی دەکرد،" مودی بانگەشیکرد. "داوای لە منیش کرد کاریان بۆ بکەم، بۆ هەڵخراندنی قوتابیانی زانکۆ لە دژی خومەینی. بێگومان ڕەتمکردەوە. بەڵام ئێمە

له ئێستادا هیچ شتێکمان له ئه‌مریکادا نییه. ئه‌گه‌ر بگه‌ڕێمه‌وه بۆ ئه‌مریکا، ده‌مکوژن. سینایه‌ی به‌دوامه‌وه‌یه."

"ئه‌وه ڕاست نییه،" به‌ره‌وڕووییبوومه‌وه. "ئه‌وانه ته‌نیا قسه‌ی خۆتن."

"ئه‌وه ڕاسته!" قیژاندی.

که مه‌زاجی تێکچوو، وازم له قسه‌وباسه‌که هێنا. نه‌مده‌توانی خۆم ڕازیبکه‌م، که ئه‌وه‌نده که‌سێکی گرنگه و ناوی که‌وتۆته "لیستی ڕه‌ش[6]"ی سینایه‌میه‌وه. به‌ڵام له‌وه‌ده‌چوو له خۆی دڵنیابێت و هه‌ر ئه‌و ئه‌نجامگیرییه شێتانه‌یه، ڕێگریده‌کرد له‌به‌رده‌م گه‌ڕانه‌وه‌یدا بۆ ئه‌مریکا.

له کۆتاییدا له‌لایه‌کی تره‌وه، شتێکی تریشم بۆ ده‌رکه‌وت، که له‌وانه‌یه ئه‌مه‌یان گرنگترین هه‌لومه‌رج بووبێت تا مودی ڕێگای گه‌ڕانه‌وه له‌به‌رچاونه‌گرێت. ڕۆژێکیان مودی ڕێگای به من و مه‌هتاب دا بچین بۆ بازاڕ، له ڕێگا لاماندایه لای دوکانی حامیدی جلفرۆش و ته‌له‌فونم کرد بۆ باڵوێزخانه بۆ هێنلین. له‌گه‌ڵی باسی ئه‌گه‌ره‌کانی گه‌ڕانه‌وه‌ی مودیم کرد بۆ ئه‌مریکا.

"نـــا،" وتی. "کارته سه‌وزه‌که‌ی به‌سه‌رچووه."

ته‌نیا ڕێگایه‌ك که بۆی مابۆوه پیایدا بگه‌ڕێته‌وه بۆ ئه‌مریکا، ئه‌وه بوو، که ئه‌گه‌ر من - وه‌ك هاوسه‌ری ئه‌مریکی ئه‌و - مۆڵه‌تی پێبده‌م. به دڵنیاییه‌وه ئه‌وه‌م بۆ ده‌کرد، له‌پێناوی ئه‌وه‌ی من و مه‌هتاب بگه‌ڕێینه‌وه، به‌ڵام ئه‌مه لووتشکاندنێکی گه‌وره بوو بۆ مودی.

ئیتر وای لێهات. مانه‌وه‌ی مودی زۆر درێژدیکێشا. پلانه گه‌وره‌که‌ی به‌سه‌ر خۆیدا ڕووخا. ئێران بوو به ته‌ڵه و ته‌نیا مودی پێوه بووا

تێبینییه‌کان:

1. موسیقای بانده‌ری: جۆرێکه له مۆسیقای سه‌مای فارسی.
2. نۆرێتا: Nordette، حه‌بی پێشگیری سکپڕبوون.
3. Geisha District
4. Air missile - to - air
5. Surface missile - to - surface
6. hit list

# 18

ڕۆژێکیان لە *کیهان*دا ڕاگەیاندنێکی بەکرێدانی خانووم بە کەسانی بیانی، بەرچاوکەوت. "لەوانەیە بە ئینگلیزی بدوێن،" بە مودیم وت. "تەلەفونیان بۆ بکەم؟"

"بەڵــێ،" مودی وەڵامیدایەوە.

ژنێك وەڵامیدایەوە، ئینگلیزییەکی تەواو دەدوا و خۆشحاڵبوو لەوەی، کە خێزانێکی ئەمریکی دوای خانووی بەکرێ دەکەن. کاتێکمان دیاریکرد بۆ یەکتر بینین بۆ دوانیوەڕۆی ڕۆژی دوایی، پاش گەڕانەوەی مودی لە نەخۆشخانە.

لە چەند دوانیوەڕۆدا ئەم ژنە دەڵاڵە چەند خانووی پیشانداین، کە هەموویان پاك، ڕووناك و کەلوپەلی شێوازی ڕۆژئاوایی باشیان تیادابوو. هیچیان بەتەواوی بۆ ئێمە دەستینەدەدا. هەندێکیان زۆر بچوك بوون، هەندێکی تریان زۆر دووربوون لە نەخۆشخانەوە. بەڵام لێمان ڕۆشن بوو، دروست بارەکەیمان دۆزیوەتەوە. خاوەنی ئەم خانووانە کەسانێك بوون، کە لە دەرەوەی وڵات دەژیان، ئەم خانووانەیان بەکرێدەدا و دەیانویست هەروا بە ڕێکوپێکی بمێننەوە. ئاسانترین ڕێگا بۆ ئەم مەبەستە، ئەوە بوو کە بە کەسانی ئێرانی بەکرێنەدەن.

دەمانزانی ئیمڕۆ بێت یان سبەینێ، خانووی خۆمان دەدۆزینەوە، بەڵام کاتی کارکردنی مودی دەستی گرتبووین بۆ گەڕان، بەو هۆیەوە دەڵاڵەکە پێشنیارێکی ژیرانەی کرد. بێئاگا لە هەلومەرجی تایبەتی ئێمە، خۆشباوەڕانە پرسیاریکرد، "چۆنە ئەگەر بیتی بۆ ڕۆژێکی تەواو لەگەڵم بێت؟ بەو شێوەیە دەتوانین چەند شوێن بگەڕێین و ئەگەر خانوویەکی بەدڵبوو، ئەوسا تۆ بێیت بۆ تەماشاکردنی."

سەیرێکی مودیم کرد، بزانم وەڵامی چییە.

"باشــــە،" وتی

پاشان کە خۆمان تەنیا بووین، مەرجەکانی خۆیی دانا. "دەبێت، بێت بە شوێنتدا و بتبات. دەبێت، تەواوی کاتەکە لەگەڵی بێت. ئینجا دوایی دەتهێنێتەوە بۆ ماڵەوە،" فەرمـــانیدا.

"زۆر باشە،" وەڵاممدایەوە. هێواش هێواش کۆتی دەست و قاچم شلبوونەوە.

بۆ ڕۆژی دوایی ئەو خانووە ڕێکوپێکەی ئێمە مەبەستمان بوو، دۆزیمـەوە. خانوویەکی دوونهۆمی گونجاو بوو، کە دوو بەشی بچوکتری سەربەخۆی تیادابوو. خانووەکە دەکەوتە باکووری تارانەوە، تەنیا پانزە خولەکێك بە تەکسی لە نەخۆشخانەوە دووربوو. خانووەکانی ئەم ناوچەیە تازەتر و ڕێکوپێکتر بوون.

خانووەکە لە سەردەمی ڕژێمی شادا دروستکرابوو، ئەوەی زۆر جێگای سەرنج بوو، کەلوپەلێکی ناوماڵی شێوازی ئیتالی تیادا بوو. دانیشتنی قەنەفە و کورسییەکانی خۆش

بوون، تاقمی نانخواردنێکی جوان و نامێری تازەی ناو چێشتخانەی تیادا بوو. هێڵی تەلەفونی بۆ ڕاکێشرابوو، لەبەرئەوە پێویست نەبوو بچینە سەردی بێکۆتایی تەلەفونەوە. بەردەمەکەی باخێکی چیمەن و مەلەوانگەیەکی گەورەی تیادا بوو.

خانووەکە، دوو بەشەکەی دیکەی لەخۆ دەگرت، کە دەڵاڵەکە بە ڤێلاکان ناوی دەبردن، زۆر لەباربوون بۆ دامەزراندنی کلینیك بۆ مودی. ڤێلای لای ڕاست، درێژ دەبۆوە بۆ دواوەی خانووەکە، کە دەتوانرا بکرێت بە شوێنی دانیشتنی خۆمان و لە پێشیشێوە بکرێت بە نووسینەگەی مودی. دەرگایەکی تەختەی گەورە یەکێك لە ڤێلاکانی جیادەکردەوە لە خانووەکە، شوێنێکی گەورەی دەهێشتەوە بۆ ژووری چاوەڕوانی و چارەسەرکردن.

ژووری نوستنی سەرەکی و ژووری مودی لە نهۆمی دووەمدا بوون، لەگەڵ توالێتێکی ڕۆژئاوایی و حەمامێکی مۆدێرن بە دووشەوە. ژووری نوستنی سەرەکی بالکۆنێکی هەبوو، کە بەسەر دواوەی خانووەکەدا دەیڕوانی، بەدوور لە شەقامەکەوە.

ئەو ئێوارێیەی مودی هات بۆ تەماشای خانووەکە، ئەویش وەك من یەکسەر حەزی لێکرد. بەبێ ئەوەی قسەیەك لە من ببیستێت، سەرنجیدا کە شوێنێکی زۆر لەبارە بۆ کلینیك.

منیش لەو باوەڕەدا بووم، کە شوێنێکی زۆر لەبارە بۆ پلانەکەی خۆم. لێرە وەك خانمی ماڵی خۆم و هاوسەری دکتۆر، ئازادیم زۆر زیاتر دەبێت. مودی ئیتر ناتوانێت جوڵانەوەی من بخاتە ژێرچاودێرییەوە یان تەلەفونم لێببڕێت. لەماڵەکەدا هەواڵێك لە سیخور و بە کلیل دەرگاداخستن لەسەم نابێت.

تۆزێك خەمی ئەوەم هەبوو، کە ئێمە بەجۆرێك خەریکە جێدەکەوین. هەروەها نیگەرانی ئەوەش بووم، کە نەمدەتوانی بە مەهتاب بڵێم، ئەم خانووە تازەیە بۆ هەمیشە نییە. مەهتاب بۆ خۆشی لە قسەوباسی گەڕانەوە بۆ ئەمریکا، کەوتبوو. دەمتوانی لە چاوانیدا ئەو هیوایە ببینم، بەڵام نەیدەوێرا باسیبکات، هەتا ئەوی کاتانەش کە تەنیا بوو لەگەڵم.

لە کۆتایی مانگی حوزەیراندا گواستمانەوە، بەهۆی ئەو دەستگرۆییەی مەجید و مامەوە. لەگەڵ ئەوەشدا پارەیەکی چاکیان بەدەستی داینێ بۆ کڕینی پێویستییەکانمان - خاولی، بەتانی، سەرین، تاوە، قابلەمە و خواردن.

هەروەها کەسوکاری تر یارمەتیانــداین، پێیان خۆشبوو جێگیربووین. بە خۆشی ئاشتبوونەوەمان، خانم و ئاغا حەکیم بۆ نانی ئێوارێ دەوەتیانکردین و بە دەوەتەکیان مودییان حەپەسان، کە بۆ من مایەی بووژانەوەی گۆڕانکاری بوو. هەرکە چووینە ناو ماڵەکەوە، مودی لە بینینی دوو میوانی چاوەڕواننەکراو گەشایەوە.

"شەمسێ!" هاواریکرد. "زارێ!"

دوو خوشك بوون، كە لە شوشتەر گەورەبووبوون، دراوسێی ماڵی باوكی مودی بوون. مودی پەیوەندی پێیانەوە نەمابوو كە ئێرانی جێهێشتبوو، بەڵام زۆر خۆشحاڵبوو بە بینینەوەیان. یەكسەر شەمسی نەجەفیم چوو بەدڵدا، هەتا پێش ئەوەی وردەكارییەكانی ژیانی بزانم. شەمسی عەبای بەسەرەوە بوو، بەڵام عەبای وام لەوەو پێش نەبینیبوو. ئەم عەبایە زیاتر پارچەیەك قوماشی شیفۆنی بوو، مەبەستەكەی خۆی نەدەگەیاند. لەژێر عەبا تەنكەكەیەوە دیاربوو تەنورەیەكی ڕەش و بلوزێكی پەمەیی لەبەردایە، هەردوو پارچەكە ڕۆژئاوایی بوون. دۆستانە بە ئینگلیزییەكی بێهەڵە قسەی لەگەڵ دەكردم.

مودی دڵشادبوو بەوەی كە هاوسەرەكەی شەمسی، لە یەكێك لە نەخۆشخانە تایبەتییەكانی تاراندا پزیشكی نەشتەرگەرییە. "لەوانەیە دكتۆر نەجەفی بتوانێت كارێكت بۆ بدۆزێتەوە،" ئاغا حەكیم باری سەرنجی خۆی دا.

كە گفتگۆ درێژەی كێشا، ئەو ڕاستییە خۆشەم بۆ دەركەوت، كە شەمسی و زاری ساڵی دە مانگ لە ئەمریكا دەژین. دكتۆر نەجەفی كاتی كاركردنی لە نێوان دوو وڵاتەكەدا دابەشكردووە، لێرە پارەیەكی باشی لە كارەكەی دەستدەكەوت و باقی شەش مانگی ساڵەكە لە كالیفۆرنیا خەریكی خوێندن، سیمینار و خۆشی بینینبوو لە ئازادی و پاكوتەمیزی. زاری نزیكەی پانزە ساڵ لە شەمسی گەورەتر بوو. بێوەژن بوو، لەگەڵ خوشكەكەیدا دەژیا. ئینگلیزییەكەی وەك شەمسی نەبوو، بەڵام ئەویش لەگەڵم زۆر خۆمانە بوو. هەردوو ژنەكە خۆیان بە ئەمریكی دەزانی.

كە لەسەر فەرشەكە دانیشتبووین و خەركی نانخواردنبووین، سەرنجم بۆ لای گفتگۆی نێوانیان چوو، كە بەشێكی بە فارسی و بەشێكی بە ئینگلیز دەكرا. ئەوەی بیستم، دڵشادیكردم. زاری لە مودی پرسیاری، "خوشكەكەت بیتی پێـچۆنە؟"

"بڵێم چی، هەر یەكەیان كێشەی خۆی هەیە،" مودی وەڵامیدایەوە.

شەمسی سەیرێكی مودی كرد و وتی، "شتێكی ڕەوا نییە، ژنەكەت بەراوردبكەیت لەگەڵ كەسێكی وەك خوشكەكەت. دەزانم چۆنە و هیچ شتێكی نییە، بتوانێت لەگەڵ بیتیدا كۆیانبكاتەوە. بیتی ناتوانێت شتێكی وەهای هەبێت، دڵی ئەو خۆشبكات. كەلتورەكانیان زۆر جیاوازە. دڵنیام بیتی ناتوانێت بەرگەی ئەو بگرێت."

مودی نەك هەر توڕەبوو لە زمانی ڕەقی ئەو ژنە، بەڵكو بەسەر لەقاندن ڕەزایەتی خۆی ڕاگەیاند. "بەڵێ وایە،" وتی. "ناڕەوایـــە."

"بەڕاستی دەبووایە بگەڕانایەتەوە بۆ ماڵەوە بۆ ئەمریكا،" شەمسی وتی. "بۆچی ئەوەندە زۆر ماونەتەوە؟"

مودی شانی هەڵتەكاند.

"هەڵـــە مەكەن،" شەمسی درێژەی بە قسەكانی دا. "سەر لەخۆتان تێكمەدەن. بگـــەڕێنەوە." زاری سەری ڕەزایەتی بۆ دەلەقاند.

مودی دووبارە لەبەرامبەر ئەو سەرنجانەدا، شانی هەڵتەكاند.

دەبێت لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانەدا، هاتوچۆی زیاترمان هەبێت، لە دڵی خۆمدا وتم.
پێش ئەوەی بڕۆین، مودی بەڕێزەوە وتی، "دەبێت بۆ نانی ئێوارە بێن بۆ لامان." هەر ئەو شەوە لەسەر ڕێگای گەڕانەوەمان بۆ ماڵەوە، هەوڵمدا دەوەتەکەی لێبکەم بە ڕاست، بۆئەوەی نەبێت بە *تەعاروف*.

"بەڕاستی بەدڵم بوون،" وتم. "بـــا بەم زووانە دەوەتیانــبکەین."

"چاکـــە،" مودی ڕازیبوو. خۆشی لە خواردنی خۆش و هاوڕێی باش دەبینی. "تەنیا چوار کۆڵان، لەولای ئێمەوەن."

سەرئەنجام بەرپرسێکی نەخۆشخانە مودی ئاگادارکردەوە، کە پارەی پێدەدرێت و پارەکە دەخرێتە ناو حسابی بانکێکەوە، کە هەر لەوبەر نەخۆشخانەکەوەیە. هەرە ئەوەندە بەسە، مودی بچێت بۆ بانکەکە و ژمارەیەکی دیاریکراو بدات و پارەکە وەرگرێت.
مودی چنگ لەسەرشان، یەکڕاست خۆی گەیاندبووە بانکەکە، تا یەکەم دەستکەوتی لە ساڵێکدا لە ئێراندا وەرگرێت. بەڵام فەرمانبەری بانکەکە پێی وتبوو، پارەی وا نەهاتۆتە حسابەوە.

"بەڵێ ناردوومانە،" بەڕێوەبەری نەخۆشخانە مودی دڵنیاکردبوو.

"بەڵێ پارەی وا نەهاتۆتە حسابەوە،" فەرمانبەرەکە لەسەر قسەی خۆی هەر سووربووە.
مودی بۆ چەندجار، لە نێوان ئەم دوو پیاوەدا ئەمبەرە و ئەوبەری دەکات و لەگەڵ هەر ئەمبەرە و ئەوبەرێك زیاتر تووڕەتر دەبێت، تا لە کۆتاییدا سەرچاوەی ئەم گریفتەی بۆ دەردەکەوێت. کـــاغەزبازی. حسابی بانکی لە ئێراندا بەدەست دەکرێت. مودی بە یەکجاری کەللەیی بوو، کە زانی ئەم کاغەزبازییە دە ڕۆژێك هەر دەبات، پێش ئەوەی پارەکە بچێتە حسابەکەوە.
بە تووڕەیی و داخێکی زۆرەوە بەسەرهاتی پارەکەی بۆ باسکردم، قسەیەکی خراپیشی لەگەڵدا وت: "تەنیا یەك شت ئەم وڵاتە خواروخێچە ڕاستدەکاتەوە، ئەویش یەك بومی ئەتۆمییە! لە نەخشە پاکیبکەیتەوە و سەرلەنوێ دروستیبکەیتەوە."
بەڵام کاتێك پارەکە گەیشت، ئەوەندەی تر تووڕەبوو، چونکو زۆر کەمتر بوو لەوەی بەڵێنیان پێدابوو. نەخۆشخانە حسابێکی ئاڵۆزیان بۆ کردبوو. مودی کە خۆی حسابیکرد، بینی دەتوانێت هەمان بڕە پارە وەرگرێت بۆ دوو ڕۆژ کارکردن لە هەفتەیەکدا، لەجیاتی ئەوەی شەش ڕۆژ کاربکات. لەبەرئەوە نەخۆشخانەی ئاگادرکردەوە، کە تەنیا ڕۆژانی سێ شەممە و چوار شەممە کاردەکات. ئەمـــە دەستی ئاوەڵەکرد، تا کلینیکی خۆی دابمەزرێنێت.
پارچەیەك تەختەی هەڵواسی، کە ئەم تێکستە فارسییەی لەسەر نووسرابوو، دکتۆر مەحموودی: *پراکتیك و بڕوانامەی ئەمریکا، کارشناسی چارەسەری ئازار.*

مورتەزا قودسی خوشکەزای مودی پارێزەر بوو، کاتێك هات بۆ ماڵمان و چاوی بە تابلۆکە کەوت، کردی بە هەرا. "ئەوە مەکە،" وتی. "هەڵەیەکی گەورەیە، بەبێ مۆڵەت دەست بەکار بکەیت. دەتگرن."

"بــۆم گرنگ نییە،" مودی وتی. "زۆر دەمێکە چاوەڕوانی مۆڵەتم و هیچیان بۆ نەکردووم. لەوە زیاتر چاوەڕواننابم."

هەتا ئەگەر مودی نیگەرانی ئەوە بووایە، کە ئەگەری هەڵهاتنی من و مەهتابی هەیە لەژێر دەستی، نەیدەتوانی بەپێی ئەو نیگەرانییە کارێکی لەدەست بێت. لەوکاتدا پێویستی بە ئێمە زیاتر بوو، لە هەر کاتێکی تر. ئێمە خێزانی بووین، ئێمە تەنیا کەسانێك بووین کە هەیبوو. لەگەڵ ئەوەی هەر پێشبینییەکی ژێرانە ئەوەی دەگەیاند کە مەحاڵە، بەڵام لەو کاتەدا دەبوو متمانە بە خۆشەویست و ملکەچیمان بکات. وە ئەمە مەیدانی خۆشدەکرد کە کاری خۆم ببەمەپێشەوە.

هەر لە پشت ماڵەکەمانەوە شەقامێکی سەرەکی هەبوو، سێ دوکانداری تیادا بوو، کە دەبوو رۆژانە هاتوچۆیان بکەم. کۆڵانەکەی خۆمانم دەبڕی، لە شەقامێك دەپەڕیمەوە و کۆڵانێکی ترم دەبڕی ئینجا دەگەیشتمە دووکانەکان.

دانەیەکیان "سوپەر" بوو، کە شایەنی بەراوردکردن نەبوو لەگەڵ سوپەرمارکێتی ئەمریکی، بەڵام هێشتا دوکانێك بوو دەتتوانی شتە بنەڕەتییەکانی خۆت لەوێ بکڕیت، ئەگەر لە کاتی خۆیدا فریابکەوتیتایە. هەمیشە شتی گرنگیان هەبوو، وەك نۆك، پەنیر، کەچوپ و داودەرمان. لە رۆژانێکی دیاریکراویشدا شیر و هێلکەیان دەفرۆشت. دوکانی دووەم سەوزەفرۆش بوو، سەوزە و میوەی جۆراوجۆری هەبوو. سێیەم گۆشتفرۆش بوو.

مودی پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ خاوەنی ئەم دوکانانەدا بەست. خۆیان و خێزانەکانیان بۆ چارەسەر دەچوون بۆ لای مودی بەخۆرایی. ئەوانیش لەبەرامبەردا ئێمەیان لە بوونی هەر کاڵایەك، کە لە بازاڕدا دەستکەوتنی زەحمەت بوو، ئاگاداردەکردەوە و باشەکەیان بۆ ئێمە دادەنا.

زۆربەی رۆژ کە دەچووم بۆ لایان، شتێکی وەك رۆژنامە و پەتم بۆ دەبردن، کە ئەوان بەکاریان دەهێنا بۆ پێچانەوەی شتومەك. ئاغا رەزا، خاوەنی "سوپەر"ەکە پێیوتم، "تۆ باشترین ژنی لە ئێراندا. زۆربەی هەرە زۆری ژنانی ئێرانی دەستبڵاون."

هەر سێ دوکاندارەکە بە ناوی "*خانم* دکتۆر"ەوە بانگیانـدەکردم و هەمیشە کوڕێکیان بۆ دەدۆزیمەوە، ئەو شتومەکەی دەمکڕی، بۆی دەبردمە ماڵەوە.

ئەو خەوانەی مودی هەیبوو، دەیویست بیهێنێتەدی، خەوی وەك دکتۆرێکی دەوڵەمەندی دەرچووی ئەمریکا و پیشەگەرێکی شارەزا، کە سەری لە هەموو شتێك دەردەچێت، بەڵام کاتی نەبوو سەرنجی وردەکارییەکانی بدات. کەوتە نوقمکردنی من لە پارەدا.

"شت بکڕە،" وتی. "ماڵەکە چی پێویستە، بۆی بکڕە. کلینیکەکە چی پێویستە، بۆی بکڕە."

ئەمە بۆ من، وەك ژنێکی بیانی لە شارێکی چواردە ملوێنیدا، کە هەندێك جار خەڵکەکەی دوژمنایەتیان دەکردی و هەمیشە نەتدەتوانی پێشبینی بکەیت دۆست دەردەچن یان دوژمن، ئەرکێك بوو دەبوو دەستوپەنجەی لەگەڵ نەرمبکەم. بۆخۆم هیچ ژنێکی نرم نەدەناسی - ئێرانی، ئەمریکی یان هاووڵاتی هەر وڵاتێکی تر - ئاوا بوێرێت لە تاراندا بە بەردەوامی هاتوچۆبکات، بەبێ ئەوەی پیاوێك یان هەر نەبێت ژنێکی پیری لەگەڵ بێت بۆ پارێزگاری.

ڕۆژێکیان مودی داوای لێکردم، بچم بۆ ناوشار بۆ دوکانی باوکی مەلەکە. باوکی ئەو ژنەی کە مودی مەهتابی لا دانابوو، کاتێك کە لە منی دوورخستبۆوە. دەویست خاولی و قوماش بکڕم بۆ دروستکردنی چەرچەف بۆ ماڵەکە، کە ئەوە شتێك بوو تەنها بۆ خۆشگوزەرانی، تا بەوە بچینە ڕیزی توێژی باڵای کۆمەڵگاوە.

"بە پاس برۆ،" مودی پێشنیاریکرد. "هاتوچۆیەکی دووروودرێژە و خۆڕاییە." بەستەیەك بلیتی پێدام، کە حکومەت بێپارە بە فەرمانبەرانی دەدا.

بۆم گرنگنەبوو، چەند ڕیاڵێك بۆ مودی گلبدەمەوە، بەڵام دەمویست فێری بەکارهێنانی هەموو ئامێرێکی گواستنەوە بم، لەبەرئەوە من و مەهتاب ئەوەی ئەو پێیوتین، بە گوێمانکرد. لە پێشدا بەپێ چووین بۆ شەقامی پاسداران، کە شەقامێکی سەرەکی هاتوچۆ بوو. پاشان تەکسیمان گرت بۆ شوێنی وەستانی پاس، نزیکی ماڵی مامل. لەوێ سواری پاس بووین، کە پاسێکی درێژ بوو، زیاتر لە جۆری گرێیهۆند[1] دەچوو وەك لە پاسی ناو شاری ئەمریکا. کورسییەکان و ڕێڕەوی پاسەکە پڕبوون لە خەڵك.

چوون بۆ ناوشار زیاتر لە کاژێرێکی برد. پاسەکە چەند جار لە ڕێگادا وەستا، هەر جارەی دەرزەنێك ڕێبوار دادەبەزین و هاوکات چەند دەرزەنی تر هەوڵیاندەدا سەرکەون. کەس چاودڕوانی سەرەی نەدەکرد، هەموو هاوکات دادەبەزین و سەردەکەوتن، بە ئانیشك هاویشتن و جنێودان ڕێگای خۆیان دەکردەوە.

سەرئەنجام دوکانەکەمان دۆزییەوە و ئەوەی پێویست بوو، کڕیمان. من و مەهتاب بەدەست شت هەڵگرتنەوە تەواو هیلاکبووبووین، بە زەحمەت بە شۆستەی قەرەباڵغدا ڕێگەماندەکرد، تا گەیشتینە شوێنی دەرچوونی پاسەکان، کە چەند دانەی لێڕاوەستابوو. ئەوە ژمارە پاسە کە مودی پێیوتبووم، دەبێت سواریبین، نەمدەدۆزیەوە و ترسم لێنیشت. گرنگ بوو بۆم، ئەم ڕاسپاردەیە بە ڕێکوپێکی ئەنجامبدەم. ئەگەر نەمتوانیایە، مودی وا چاوی لێدەکردم، کە بەتەنیا دەرەقەتی کارێکی وا نایەم. لەوەش خراپتر، لەوانەبوو گومانی پیدابکردایە لەسەر دواکەتنەکەمان و بیکردبایە بە بەزم.

دەبێت ئەو پیاوە ئێرانییە ترسی بە چاوانەمەوە دیبێت، وا پرسیارلێکردم، *"خانم، چی میخواهی؟"* "خانم، چیت پێویستە؟"

"*سەعیدی خانلان،*" وتم. ئەو ناوچەیەی ماڵی مامل بوو، کە لێوەی بە ئاسانی تەکسی پرتەقاڵیمان دەگرت بۆ ماڵەوە. ئاماژەم بۆ پاسێك کرد. "*سەعیدی خانلان؟*"

"نـــا،" بە سەربادانەوە وتی. ئاماژەی بۆ من و مەهتاب کرد دوایبکەوین، بردینی بەرەو پاسێکی بەتاڵ.

"*سەعیدی خانلان،*" وتی.

بە سەرلەقاندن سوپاسمکرد. بەخۆمان و شتومەکەکەمانەوە بە نقەنق سەرکەوتین. کورسییەکان بەتاڵ بوون، بە هەوەسی خۆمان لەسەر دوو کورسی پشت کورسی شۆفێر دانیشتین.

پاسەکە خێرا پڕبوو لە ڕێبوارانی *سەعیدی خەنلان*. مایەی سەرسامیم بوو، ئەو پیاوەی ڕێنوێنیکردین بۆ ئێرە، ئەویش سەرکەوتە سەرەوە بۆ پشت سوکانی پاسەکە. بەڕێکەوت شۆفێری پاسەکە دەرچوو.

بلیتەکانی خۆمانم بۆ ڕاکێشا، بە ئاماژەکردن ڕەتیکردەوە. پەشیمانبوومەوە ئەو جێگایانەمان لە پشتی شۆفێرەکەوە هەڵبژاردووە، چونکو بۆنێکی ناخۆشی لێدەهات. شوفێرەکە کورتە باڵایەکی ڕیشتاشراو بوو، کە ئەو ریش تاشینە تەنیا شتێکی پاك بوو پێوەی. جلوبەرگەکەی بۆگەنی لێدەهات و لەوەدەچوو چەند مانگ بێت نەشۆرابێت.

کە کاتی ڕۆیشتن هات، شۆفێرەکە هاتە ناو ڕاڕەوی پاسەکەوە و دەستیکرد بەکۆکردنەوەی بلیتەکان. من گوێمـپێنەدا. مەهتاب هیلاك و نکەنکی بوو. شتومەکەکانمان هیلاکی کردبووین. هەوڵمانــدەدا لەسەر کورسییەکان جێگایەك بۆ خۆمان خۆشبکەین.

شۆفێرەکە هاتەوە پێشی پاسەکە و دەستی ڕاکێشا. کە بلیتەکانم دایە دەستی، دەستی گرتم و قایم بۆ ماوەیەك گوشی، پێش ئەوەی بەهێواشی دەست بە دەستمدا بهێنێت و بلیتەکان ببات. هەڵەیەك بوو، وای بۆچووم. پیاوانی ئێرانی بەو شێوەیە دەست لە ژنەوە نادەن. ڕووداوەکەم لەبیر خۆم بردەوە، هەر ئەوەم دەویست بە مەهتابەوە بگەمە ماڵەوە.

مەهتاب لە تەواوی ڕێگاکەدا، باوێشکیدەدا و خەو دەیبردەوە و تا لە کۆتاییدا، کە گەیشتینە *سەعلی خانلان،* کۆتایی خەتەکە، مەهتاب تەواو خەویلێکەوتبوو. چۆن دەمتوانی بەو هەموو شتومەکەوە ئەویش هەڵگرم؟ بۆم پرسیاربوو. هەوڵمدا بە سیخورمەلێدان خەبەریکەمەوە.

"هەستە مەهتاب،" بە هێواشی پێموت. "کاتی ڕۆیشتنە."

چاوی نەکردەوە، تەواو نوستبوو.

لەو کاتەدا هەموو ڕێبوارەکان چووبوونەخواردەوە. سەرم بەرزکردەوە بینیم، شۆفێرەکە چاوەڕوانی ئێمە دەکات. زەردەخەنەیەکی کرد و دەستی ڕاکێشا، هێمایکرد، کە دەیەوێت مەهتاب هەڵگرێت و بیباتەخوارەوە لە پاسەکە. بەڕاستی کارێکی باشم لەگەڵ دەکات، لە دڵی خۆمدا وتم. مەهتابی بەرزکردەوە، خەریکبوو زیڕەبکەم کە بینیم، لێوە پیسەکانی نوساند بە ڕوومەتی کچە خەوتووەکەمەوە و ماچیکرد.

سەیرێکی دەوروپشتی خۆمم کرد، لەپڕ ترسم لێنیشت. ناو پاسەکە تاریک بوو، ڕێگای چوونە دەرەوەشم زۆر تەسك بوو. شتومەکەکانم کۆکردەوە و هەستام بڕۆم. بەڵام شۆفێرەکە، کە مەمکابی بە دەستێکییەوە گرتبوو، ڕێگاکەی لێگرتبووم. بەبێ ئەوەی ورتە لەدەمی بێتەدەرەوە، بەسەرمدا نوشتایەوە و خۆی توندکرد لێم.

*"ببەخشە،"* وتم. "ببورە." ڕێگای خۆمم کردەوە و مەمکابم گرت، بۆئەوەی لێیبسەنم. هەوڵمدا بڕۆم، بەڵام باڵێکی درێژکرد تا بەرم پێبگریت. هێشتا بێدەنگ بوو. هێشتا بەو لەشە پیسە ناشرینە بۆگەنەیەوە، خۆی دەنوساند پێمەوە.

ئیتر لەو کاتەدا تەواو ترسم لێنیشت، بیرمدەکردەوە چی بکەم، لەبیری ئەوەدا بوو، ئایا دەتوانم ئەژنۆیەك بکێشم بە ناوگەڵیدا. هەستمکرد لە هۆش خۆم دەچم، بەهۆی هیلاکی و قێزهاتنمەوە. "لەکوێ دەژی؟" بە فارسی پرسیاریکرد. "یارمەتیتدەدەم، دەتگەیەنمە ماڵەوە."

دەستی هێنایە پێشەوە و خستییە سەر مەمکم.

*"ببەخشە،"* تا توانیم هاوارمکرد. لەپڕ هێزم تێگەڕا و ئانیشکێکەم هاویشت و بە بەردەمیدا خۆم خزاند بۆ خوارەوە و مەمکابم لەگەڵ خۆم کێشکرد، کە هێشتا خەبەری نەبووبۆوە.

مەترسی ژیان، لە شارێکدا کە هەژاری دادەکات و پڕیەتی لە پەنابەر، جارێکی تر جەختی لەسەر کرایەوە لەلایەن ئلینەوە لە سەردانێکمدا بۆ لای.

من و ئلین ئاگربەستێکمان ڕاگرتبوو، بێئەوەی قسەی لەسەر بکەین. سەرەڕای هەڕەشەی ناپاکیکردن بەرامبەرم وەك ئەرکێکی ئیسلامی خۆی، ئەو و هورموز چەند لە توانایاندا بوو، لەو کاتە هەرە سەختەکاندا یارمەتیاندام و ئیتر هەرگیز ئەو بابەتیان نەهێنایەوە گۆڕێ، کە لە لای مودی ئاشکرامدەکەن لە هەوڵی هەڵهاتندام. لەگەڵ ئەوەی جیهانبینیمان جیاوازبوو، بەڵام من و ئلین ئەمریکی بووین و هێشتا زۆر شتی وەك یەکمان هەبوو.

ئەو ڕۆژە خەریکبوو دنیا تاریکدەبوو، کە هەستام بڕۆم.

"بەتەنیا ناڕۆیت،" ئلین وتی.

"با، ئەڕۆم، گرفت نییە،" وتم.

"نا، هورموز دەتگەیەنێت."

"نا، نامەوێت زەحمەتی بدەم. هیچ شتێك نییە. تەکسییەك دەگرم."

"من ڕێگات پێنادەم." ئینجا ئلین باسی هۆی سڵەمینەوەی خۆیی بۆ کردم. "هەر دوێنێ کچێکی پانزە ساڵە لەم ناوە کوژراوە. لەم نزیکانە تەرمەکەیان دۆزییەوە. بەیانی زوو کاتژمێری پێنج چووە بۆ گۆشتکڕین بە کۆپین. نەگەڕابۆوە ماڵەوە، ئیتر دایك و باوکی

کەوتبوونە گەڕان بە دوایدا. لەسەر ئەم شەقامە لاشەکەیان دۆزییەوە. لاقەیانکردبوو و ئینجا کوشتبوویان."

ئیگوەمان شۆك گرتمی.

"ئەمە ڕۆژانە ڕوودەدات،" ئلین بۆ ئاگادارکردنەوەی من بەردەوامبوو. "ئەمە ئێستا شەو و ڕۆژی بۆ نییە."

نەمدەزانی باوەڕی پێبکەم یان نا. ئەگەر ئلین ئەم شتانەی دەزانی، بۆ لەوەو پێش بۆمی باسنەکردووە؟ هەرگیز لە هیچ ڕۆژنامەیەکدا نەمبینیبوو لەسەر دزی، لاقە یان کوشتن شتێك بنووسرێت.

"ئەفغانییەکانن ئەم کارانە دەکەن،" ئلین وتی. "ئەفغانییەکی زۆر هەیە، ژنی خۆیانیان نییە و لەبەرئەوە هەر ژنێکیان چنگبکەوێت لاقەیـدەکەن."

هەرلە پاش ئەو ڕووداوە، مەجید سەردانی کردین. ئەوەی ئلین پێیوتبووم، بۆم گێڕایەوە.

"ئا وایە، دروستە،" مەجید وتی. "هەموو ڕۆژێك ڕوودەدا. بەڕاستی پڕمەترسییە، بە تەنیا لەدەرەوە بیت. دەبێت وریایی خۆت بیت."

دوانیوەڕۆیەکیان ئیسا تەلەفونی بۆ کردم، خەریکبوو دەگریا. "بەڕاستی زارەترکی بووم،" وتی. "دایکت هەرئێستا لە ئەمریکاوە تەلەفونیکرد، منیش پێموت، کە ماڵتان گواستۆتەوە. دەویست ژمارەی تەلەفونی تازەت بزانێت. پێموت نازانم، کەچی زۆر خراپ لێم توڕەبوو، بە درۆزن ناوی لێبردم. منیش ئیتر ژمارەی تەلەفونەکەتم پێدا، بەڵام ئێستا دەزانم، کە دەکەومە کێشەوە لەگەڵ *دایجون*."

"نیگەرانی ئەوە مەبە،" وتم. "مودی لە ماڵەوە نییە، لەبەرئەوە هیچ شتێك نابێت. با تەلەفونەکەمان تەواوبکەین، تا دایکم بتوانێت تەلەفونم بۆ بکات."

چەند ساتێکی نەبرد، تەلەفون لێیدا و گوشیم بەرزکردەوە. دایکم بوو، دەنگی خشەخشیدەکرد، کە وتی هەلاو. باوکیشم لەسەر خەت بوو. گریان قورگمی گرت، سەختبوو بۆم قسەبکەم.

"باوکە چۆنی؟" پرسیارمکرد.

"باشم،" وتی. "هەر ئەوەندەی ورە هەبێت، ڕێگای دەرچوون هەیە." دەنگی زوڵاڵ و پڕ شوروشەوقەکەی جارانی بوو.

"ئەی تۆ چۆنی؟" دایکم پرسیاری لێکردم.

"باشترم." باسی خانووە تازەکەمان و زیادبوونی ئازادی خۆمم بۆ کرد. "جۆی و جۆن چۆنن؟" پرسیارمکرد. "زۆریان بیردەکەم!"

"باشن، خریکە دەبن بە پیاو،" دایکم وتی.

جۆی لە ئەیتیتی هانکۆك کاریدەکرد. جۆن لە پۆلی دووی کۆلێژ بوو، لەگەڵ تیپێکدا یاری فوتبۆڵی دەکرد. زۆر پەرۆشی ژیانیان بووم.

"پێیانبڵێن، زۆر دڵم لە لایانە."

"پێیانــدەڵێین."

کاتی تەلەفونکردنمان دانا. چوار شەممە و پێنج شەممە مودی لە نەخۆشخانە بوو، دەیانتوانی لەو کاتانەدا تەلەفونبکەن و ئازادانە قسەبکەین. کە بۆ ئەوان دەبوو کاتژمێری سێی شەو هەستن بۆ تەلەفونکردن، بەڵام ئەوەی دەهێنا. هەفتەی دواتر دایکم وتی، بۆ هەفتەی داهاتوو جۆی و جۆن دەهێنێتە سەر تەلەفون.

بۆ ڕۆژی دوایی، سەردانی ئیسام کرد، بۆ ڕزگارکردنی لە بەزمی ژمارەی تەلەفون. پاشان کە گەڕامە ماڵەوە، بە مودیم وت، کە کەسوکارم تەلەفونیانکرد ئەو کاتەی لە ماڵی ئیسا بووم، داوای ئێمەیان دەکرد و منیش ژمارەی تەلەفونی تازەی خۆمانم پێدان.

"چاکـــە،" مودی وتی. هیچ خۆی تێکنەدا، کە وتم لەگەڵیان قسەمکردووە، لەوە دەچوو ئەم هەلکەوتەی پێخۆش بووبێت.

"وەرە، با چایەك پێکەوە بخۆینەوە،" شەمسی لەسەر تەلەفون پێیوتم.

لە مودی داوای مۆڵەتم کرد. "بێگومـــان،" وتی. دەیتوانی چیتر بڵێت؟ ڕێزی لە شەمسی و زاری دەگرت و ئاشکرابوو نەیدەویست ئەوان بزانن، کە لە ڕابوردوودا هەڵسوکەوتی چەند خراپ بووە لەگەڵم.

چاخواردنەوەی ئەو ڕۆژە زۆر بە تام بوو. من و شەمسی خێرا بووین بە هاوڕێی گیانی بە گیانی، لەو هاوینەدا چەند ڕۆژمان پێکەوە بردەسەر.

ئاسایی شەمسیساڵی دوو مانگی لەو خانووە خۆشەی نزیکی ماڵی ئێمە دەبردەسەر، بەڵام ئەو ساڵە وای دانابوو توزێك زیاتر بمێنێتەوە، چونکو لەگەڵ مێردەکەی خەریکی ماڵفرۆشتن و ناردنی ئەو پارانە بوون بۆ کالیفۆرنیا. شەمسی خۆشی دەبینی لە پاراستنی ئەو پەیوەندییانە بە تارانەوە و حەزیشی بە گەڕانەوە بوو بۆ کالیفۆرنیا، بەڵام هەرچەند بیرمان لە پچراندنی ئەو پەیوەندییە خوشکایەتییە دەکردەوە لە نێوانماندا، هەردووکمان، دڵگران دەکرد.

"نازانم چۆن دەتوانم بگەڕێمەوە بۆ کالیفۆرنیا و بیتی بەجێبهێڵم،" ڕۆژێکیان بە مودی وت. "دەبێت ڕێگا بە بیتی بدەیت لەگەڵم بێت."

نە من و نە مودی نەمانوێرا لەسەر داوای شەمسی قسەبکەین.

شەمسی ئاهێکی تازە بوو لە ژیانمدا، بەڵام بۆ چەند هەفتە نەموێرا متمانەی پێبکەم و بەسەرهاتی خۆمی لا بدرکێنم. دەمزانی دەتوانم چاودڕوانی یارمەتی لێبکەم، بەڵام نیگەرانی ئەوە بووم، نەتوانێت پارێزگاری لەم ڕازە بکات. لەوەو پێش ناپاکیم لەگەڵ کرابوو. لەوانەبوو ڕاکات بۆ لای مودی و سەرزەنشتیبکات، کە بەبێ ئارەزووی خۆم منی

هێشتۆتەوە. ئەم کاردانەوە سروشتییەی شەمسی، مودی دەکرد بەگژ مندا، دروست لە کاتێکدا کە خۆم دەستمکردبوو بە هەنگاوونان بۆ پێشەوە. لەبەرئەوە هەر خۆشیم لە هاوڕێیەتی دەبینی، بەبێ ئەوەی بەسەرهاتی خۆمی بۆ باسبکەم، تا خۆی وردەوردە پێشبینی ڕاستییەکانی ژیانمی کرد. لەوانەیە ئەوە بەشێکی بووبێت کە ئەو لە هەلومەرجەکەم ئاگاداربێتەوە، بەوەی کە داوای مۆڵەتم لە مودی دەکرد بۆ هەر شتێك بمکردایە. بۆ هەر شوێنێك بچومایە، هەر ڕیاڵێکم خەرج بکردایە، لە پێشدا لەگەڵ ئەو ڕێکدەکەوتم.

سەرئەنجام ڕۆژێکیان پاش ئەوەی، کە پێموت چەند نیگەرانی باوکمم لە مەشیگان، پرسیاری لێکردم، "باشە بۆچی ناگەڕێیتەوە و بیبینیت؟"

"نـــــاتوانم."

"بیتـــــی، هەڵەیەکی گەورە دەکەیت، ناچیت بیبینیت." بەسەرهاتی خۆیی بۆ گێڕامەوە. "کاتێك لە شوشتەر دەژیام و باوکم لێرە بوو لە تاران، ڕۆژێکیان هەستێکی ناخۆشم لا دروستبوو. هات بە خەیاڵمدا، دەبێت بڕۆم باوکم ببینم و ئەمەم بە هاوسەرەکەم وت. ئەو وتی، 'نا، ئێستا ناچیت. مانگی داهاتوو بچۆ کە قوتابخانە تەواودەبێت.' شەڕە قسەیەکی زۆر لە نێوانماندا دروستبوو، ئەوە تەنیا جار بوو لە ژیانماندا کێشە بۆ خۆمان بنێینەوە. پێموت، 'ئەگەر ڕێگامنەدەیت بچم باوکم ببینم، جێتدەهێڵم.' ئیتر وتی، 'بڕۆ.'"

کاتێك شەمسی دەگاتە لای باوکی لە تاران، ئاگاداردەبێتەوە کە بڕیارە بۆ ڕۆژی دوایی بچێت بۆ نەخۆشخانە بۆ پشکنینێکی ئاسایی. ئەو شەوە تا درەنگ پێکەوە دەمێننەوە، قسەدەکەن، باسی هەواڵ و بیرەوەری خۆیان دەکەن و بۆ ڕۆژی دوایی لەگەڵ باوکی دەچێت بۆ نەخۆشخانە، هەر ئەو ڕۆژە بەهۆی دڵداخوپاننێکی[2] لەپڕەوە دەمرێت.

"ئەگەر نەچوومایە بۆ بینینی باوکم، کاتێك ئەوە بە خەیاڵمدا هات، هەرگیز لەخۆم خۆشنەدەبووم،" شەمسی پێیوتم. "لەوانەبوو هەر لە هاوسەرەکەم جیاببەمەوە لەسەر ئەوە. بەڵام لەبەر هەندێك هۆ دەبوو بچم باوکم ببینم. تۆش دەبێت بچیت باوکت ببینیت."

"ناتوانم،" وام وت و فرمێسك بە چاومدا هاتەخوارەوە. پاشان بۆم باسکرد، بۆچی.

"ناتوانم باوەڕبکەم، مـــودی وات پێدەکات."

"منی هێناوەتە ئێرە و ئێستا نێوانمان باشە. خۆشحاڵم بە هاوڕێیەتیت، بەڵام ئەگەر بەمە بزانێت، ئاگاداری ئەو شتانە بێت کە من بۆ تۆم باسکردووە، بزانێت کە من زۆر بە پەرۆشی چوونەوەی ماڵەوەم، ئیتر ناهێڵێت هاوڕێیەتیت لەگەڵ بکەم."

"زۆر بەداخـــەم،" شەمسی وتی. "هیچ قسەیەك لە دەمی من نابیستێ."

لەگەڵ بەڵێنەکەی خۆی ڕاستگۆ بوو. لەو ڕۆژە بەدواوە تەواو دیاربوو، شەمسی بۆچوونی گۆڕاوە بەرامبەر بە مودی. سارد بوو، خۆی بەدوور دەگرت و تا ئاستێك توانی

تورِەیی خۆی بشارێتەوە، بەڵام تا ئەو ئاستەی چۆن عەبا شیفۆنییەکەی جلەکانی ژێرەوەی دەشاردەوە.

هەرچی چۆنێك بوو، هاوین تێپەڕی. لە کۆتایی ئابدا هەفتەی جەنگ هات و لەگەڵ خۆیدا بیرەوەرییەکی تاڵی هێنا، کە من مەهتاب بۆ نزیکەی زیاتر لە ساڵێك لە ئێراندا کەوتوینەتە داوەوە. هەموو ئێوارێیەك هاتوهاواری ڕێپێوان بوو لەسەر شەقامەکان. لە دواوەی ڕێپێوانەکاندا لە خۆدان بوو. هەموو یەکناهەنگ بە زنجیر لەخۆیان دەدا، تەنیا دەیانکێشا بە پشتی خۆیاندا  جارێك بەلای ڕاستی شاندا و جارێك بەلای چەپدا. بەردەوام دروشمیان دەدا و حاڵیان لەخۆیان دەهێنا. خوێن بە پشتیاندا دەهاتەخوارەوە. بەڵام هەستیان بە ئازار نەدەکرد.

هەواڵەکانی تەلەفیزیۆن زیاتر لە کاتی ئاسایی پڕدەبوون لە وتاری هەڕەشەئامێز، بەڵام ئەم جارەیان ئاسانتر بوو بۆم، کە زۆر بە هەندی نەگرم، چونکو باش تێگەیشتبووم لە جیاوازی گەورەی نێوان قسە و ڕاستییەکانی ناو ئێران. ئەو وتارە پڕ هەڕەشانە و ئەو دروشمە پڕ هاتوهاوانە، هەمووی *تەعاروف* بوون.

"بەڕاستی دەمەوێت ئاهەنگێکی لەدایکبوونی باش بگێڕم بۆ مەهتاب،" بە مودیم وت.

"چـــاکە، لە خێزانی من هیچ کەس دەوەتـناکەین،" مودی وتی. زیاتر سەرسامبووم کە وتی، "بێزارم لە هەر هەموویان بێن بۆ ئێرە. پیسن و بۆگەنن." چەند مانگ لەمەوپێش ئەگەر ئاهەنگی لەدایکبوونمان هەبوایە و هەموو خێڵەکەی دەوەتنەکرایە، ئەوا بە شتێکی ناجۆر دەهاتە بەرچاوی. "دەوەتی شەمسی و زاری و ئلین و هورموز و مەلیحە و خێزانەکەی دەکەین."

مەلیحە دراوسێمان بوو، لە خانوویەکی بچوکدا دەژیا کە لە لای ژووری نوستنی سەرەکیمانەوە بە خانووەکەمانەوە نوسابوو. ئینگلیز نەدەدوا، بەڵام هەڵسوکەوتی لەگەڵم زۆر دۆستانە بوو. ڕۆژانە قسەمانەدەکرد و یارمەتیدەرێکی گرنگ بوو بۆ باشتر کردنی تێگەیشتنم لە زمانی فارسی.

لیستی میوانەکانی مودی، ئەوەی ئاشکراکرد، کۆمەڵی هاوڕێیانی ئێمە چەند گۆڕاوە و مودی چەند بۆچوونی نەرمبووە بەرامبەر بە ئلین و هورموز. ئەوەشی بۆ دەرکەوت، کە ئەوان ئەوپەڕی هەوڵیاندا بۆ یارمەتیدانی ئێمە لە گرمەی کێشەکانماندا. هەوڵی مودی بۆ نزکبوونەوەی هەرچی زیاتر لە ئلین و هورموز لەو ماوە تا ئاستێك ئارامەی ژیانی پڕکێشەیدا، دانپیانانێکی شەرمنانە بوو بەوەی کە بەشێك لە کێشەکانمان یان هەر هەمووی ئاکامی بەدفڕی خۆی بووە.

ئەم جارەیان مەهتاب دەویست لە ماڵەوە کێکی بۆ دروستبکەم، نەك لە بازاڕ بۆی بکڕم. ئەمەش کارێکی قورس بوو. سەختی دەستکەوتنی کەرەسەی کێك لە تاراندا و ئالەباری دەستگای کونترۆڵی گەرمی فڕنەکە، زۆر لە توانایی ئەنجامدانی کارێکی وای

کەمدەمکردەوە. کێکەکە تروورت و وشك دەرچوو، بەڵام مەهتاب هەرچی چۆنێك بوو، پێیخۆش بوو، بەتایبەتی لەو بوکەشوشەیەکی هەرزانی پلاستیکییەی کە لە ناویدا چەقاندبووم.

ئەو ساڵە ڕۆژی لەدایکبوونی مەهتاب ڕێکەوت بوو لەگەڵ جەژنی *قەدیر*[3]، کە یەکێکە لە بۆنە لەژمارنەهاتووە دینییەکان. هیچ کەس بۆ سەرکار ناچێت، لەبەرئەوە نانمان بۆ نیوەڕۆ دروستکرد، لە جیاتی ئێواری.

بۆ نانخواردن پارچەیەکی گەورەی گۆشتی گای برژاو و لەگەڵ پێویستییەکانیم ئامادەکرد، هەروەها لەگەڵ بەتاتەی شێلراو و نۆکی فرنی، کە ئلین زۆر حەزی لەم جۆرە خواردنانە بوو.

هەموو شتێك ئامادەبوو، میوانەکان گەیشتن، تەنیا ئلین و هورموز نەبێت. لە کاتێکدا چاوەڕوانمانـدەکردن، مەهتاب دیارییەکانی کردەوە. مەلیحە بوکەشوشەی میکی ماوسی بۆ هێنابوو، کە کەسایەتییەکی فلیمی کارتونی پەسندکراوی ئێرانییەکان بوو. شەمسی و زاری دیارییەکی تایبەتیان هێنا، میوەی ئاناناس کە زۆر دەگمەن بوو لە ئێراندا. من و مودی بلوزێکی سوور و پانتۆڵێکی سوورمان کرد بە دیاری. سوور ڕەنگی پەسەندکراوی مەهتاب بوو. دیاری تایبەتیشمان پاسکیلێکی تایوانی بوو، کە نزیکەی چوار سەد و پەنجا دۆلارمان پێدابوو.

چەند توانیمان نانخواردنمان دواخست، تا برسێتی زۆری بۆ هێناین و کەوتینە نانخواردن بەبێ هورموز و ئلین. ئەوان نەگەیشتن تا دوانیوەڕۆیەکی درەنگ، سەرسامبوون کە بینییان نانمان خواردووە.

"تۆ بۆ ئێوارە ئێمەت دەوەتکرد، نەك بۆ نیوەڕۆ،" ئلین بە توڕەییەوە لەگەڵم دوا.

"نـــا، من دڵنیام بە هەڵە پێمنەوتوی،" وتم. "دەبێت بە هەڵە لەیەکتری گەیشتبین."

"هەمیشە دەکەویتە هەڵەوە،" هورموز بە قایم بە ئلینی وت. "هەمیشە لە کاتی خۆیدا ناگەین، چونکە شتەکان تێکەڵدەکەیت." لەبەرچاوی میوانەکان، هورموز بۆ چەند خولەك هەروا بەردەوامبوو لەسەر سەرزەنشتکردن و ئلینش بە عەباکەیەوە ملکەچانە دانیشت.

ئلین بەڵگەیەکی بەهێز بوو بۆ من، کە قاچ نەخەمە ژێر خۆم و لە هەوڵی هەڵهاتن نەکەوم. لەگەڵ ئەوەشدا، هەتا ئەگەر ئەم نمونە ناشرینەش نەبوایە، من هەر سووربووم لەسەر پلانی خۆم، بەڵام ئلین هەستی دەستبەجێیی لا بەهێزکردم. چەند لە ئێراندا زیاتر بمایاتمەوە، ئەوەندە زیاتر مەترسی ئەوە هەبوو، وەك ئەوم لێدەرچێت.

بـــوونمان لە ئێراندا گەیشتبووە ئاستێك گەڕانەوەی نەبوو. لەو کاتەدا ژیانم بەشێوەیەکی بەرچاو ئاسودەتر بووبوو، ئەمەش ترسی لەخۆڕازیبوونی دەبردە سەرەوە. ئایا ئەگەری بەدەستهاتنی دۆخێك لە کامەرانی هەبوو لەگەڵ مودیدا؟ ئایا ئەو دۆخە لە

کامەرانی، ئەوەی دەهێنا من و مەهتاب خۆمان نەخەینە ئەو مەترسییە گەورەیەوە، کە لەکاتی هەڵهاتندا بەرەو ڕوومان دەبێتەوە؟

هەموو شەوێك، کە لەگەڵ مودیدا دەچوومە ناو جێگاوە، دەمزانی وەڵامی ئەو پرسیارانە بێسێوەوو نــــــەءە. ڕقــم لەو پیاوە بوو کە لە تەنیشتێوە دەنوستم، لەوەش زیاتر لێیـدەترسام. لەو کاتەدا ئـــارام بوو، بەڵام ئەمە زۆری نەدەخایەند. توندوتیژی بەرێگاوە بوو، گومانێکم نەبوو. تەنیا ئیمڕۆر و سبەینێ بوو.

بەهۆی ئەوەی دەستم باشتر دەگەیشتە تەلەفون و زووزوو خۆم دەگەیاندە باڵوێزخانە، تواناییەکانی خۆمم خستەگەڕ بۆ دۆزینەوە کەسێك کە یارمەتی لەدەستبێت. بەداخەوە باشترین پەیوەندیم وا دەردەکەوت لەگەڵ گەرمی هاویندا باری کردبێت. تەلەفونی خانم عەلاوی نەمابوو. هەوڵێکی بێهودەم دا بۆ پەیوەندی گرتن بە ڕەشیدەوە، کە هاوڕێکەی خەڵکی بە قاچاغی دەبرد بۆ تورکیا و هەر سووربوو لەسەر ئەوەی، کە منداڵ لەگەڵ خۆی نابات.

دەبوو کەسێکی تر بدۆزمەوە. بــەڵام کــــێ؟ و چــــۆن؟

تێبینییەکان:

.Greyhound .1

.heart attack .2

.Eid e Ghadir .3

# 19

له ناونیشانی سەر پارچە کاغەزێکە وردبوومەوە، کە کەسێك پێیدام.

"بچۆ بۆ ئەم ناونیشانە و داوای بەڕێوەبەر بکە،" کەسەکە ئامۆژگاریکردم و ناڕاستەی شوێنەکەشی بۆ ڕوونکردمەوە. ئاشکراکردنی پێناسی ئەم خێرکارە، وەك دەرکردنی بڕیاری ئیعدامی کەسێك وایە بەدەستی کۆماری ئیسلامی ئێران.

ناونیشانەکە ناونیشانی نووسینگەیەك بوو، دەکەوتە ئەو پەڕی شارەوە. هاتوچۆیەکی دوورودرێژی دەویست بە ناو شەقامی قەرەباڵغدا تا دەگەیشتینە ئەوێ، بەڵام بڕیارمدابوو دەستبەجێ بچم، هەرچەند سەرکێشییەکی پڕمەترسی بوو. مەهتابم لەگەڵ بوو. دوانیوەڕۆیەکی زوو بوو، نەمدەزانی، ئایا دەتوانم ئەم هاتوچۆیە بکەم و بگەمەوە ماڵەوە، پێش ئەوەی مودی لە ئەمخۆشخانە بگەڕێتەوە. خۆ ڕزگارکردن ئۆقرەی لێبڕیبووم. ئەگەر پێویستبوایە، شتێکم دەکڕی هەرچی شتێك بۆ ماڵەکە و دوایی دەمکرد بە بەهانەیەك بۆ دواکەتنمان. مودیش هیچ نەبێت بۆ جارێك، ئەم ڕوونکردنەوەمی بۆ قوتدەچوو.

نەمدەتوانی چاوەڕانـبم، بڕیارمـدا بچـم.

من و مەهتاب تەکسییەکی تەلەفونی گرانمان گرت، کە پارەکەی زیاتربوو لە تەکسی پرتەقاڵی، بۆ کەمکردنەوە کات. هێشتا لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگاکە دوور و هیلاککەر بوو. مەهتاب نەیپرسی بۆ کوێ دەچین، لەوانەیە وای هەستکردبێت، کە شتێك لە گۆڕێدایە و باشترێکە نەزانێت.

سەرئەنجام گەیشتینە ئەو شوێنە، کە ناونیشانەکەی لەسەر کوتە کاغەزەکە نووسرابوو. نووسینگەیەکی گەورە بوو، پڕیبوو لە فەرمانبەران، کە زۆر سەرگەرمی کارکردن بوون، ئاسایی نەبوون لەچاو شوێنەکانی تری تاراندا. پرسگەکەمان دۆزییەوە، فەرمانبەرەکەی بە ئینگلیزی دەدوا و داوای بینینی بەڕێوەبەرم لێکرد.

"بەدەستە چەپدا بڕۆ،" وتی. "پاشان بە پێپلیکانەدا دەچیتە خوارەوە و پاشان دەچیت بۆ کۆتایی ڕاڕەوەکە."

من و مەهتاب بەپێی ڕێنوێنی پرسگەکە، ڕۆیشتین و چووینە نهۆمی ژێرەوە، کە پڕیبوو لە ژووری فەرمانبەران. لە سوچێکدا، شوێنێك ترخانکرابوو بۆ چاوەڕوانی، مۆبیلەی ڕۆژئاوایی تیادانرابوو لەگەڵ گۆڤار و کتێب بۆ خوێندنەوە.

"مەهتاب، بۆ لێرانەدا دانانیشی و چاودڕوانمـبکەیت؟" پێشنیارمکرد.

ڕازیـــــبوو.

"بەڕێوەبەر؟" لە فەرمانبەرێکم پرسی، کە بەلامدا دەڕۆیشت.

"لە کۆتایی ڕاڕەوەکەدایە." ئاماژەی بۆ ژوورێك کرد، کە جیاکرابۆوە لە ژوورەکانی تر و ڕۆشتم بەرەو ڕووی.

له دەرگاکەم دا و کە پیاوێك وەڵامیدامەوە، وەك ئەوەی ڕێنوێنییان کردبووم، وتم، "من بیتی مەهمودیم."

"وەرە ژوورەوە،" پیاوێك بە ئینگلیزییەکی ڕەوانەوە وتی. کە تەوقەی لەگەڵ کردم وتی، "پێشبینیمدەکرد بێیت."

دەرگاکەی لە دوامەوە داخست و فەرمووی لێکردم دانیشم، بە زەردەخەنەیەکی دۆستانەوە پێشوازی لێکردم. پیاوێکی باڵاکورتی باریکەلە بوو، بۆینباخ و قاتێکی ڕێکوپێکی پاکی لەبەردابوو. لەپشت مێزەکەیەوە دانیشت، بەهێواشی کەوتە قسەکردن، هیچ نیگەرانییەکی نەبوو لە ئاسوودەیی دەورووپشتی. کە قسەیدەکرد، بە پێنووسەکەی دەیدا بە مێزەکەدا.

کەسەکە زانیارییەکی گشتی پێدابووم لەبارەی ئەم پیاوەوە. ئەم پیاوە بۆ خۆشی لە هەوڵی ئەوەدابوو، ڕۆژێك لە ڕۆژان لەگەڵ خێزانەکەی لە ئێران هەڵبێت، بەڵام هەلومەرجی ژیانی زۆر ئاڵۆز بوو. بە ڕۆژ خاوەنکارێکی سەرکەوتووبوو، بە ڕووکەش لایەنگری حکومەتی ئایەتوڵا بوو. بەڵام ژیانی شەوی پڕیبوو لە هەڵسوڕانی نهێنی.

چەند ناوی هەبوو، من بە ئاماهل ناوی دەبەم.

"بەڕاستی زۆر بەداخم، کە کەوتوویتەتە ئەو هەلومەرجەوە،" ئاماهل یەکسەر چووە ناو باسەکەوە. "ئەو پەڕی کۆششی خۆم دەکەم، کە بتوانم لێرە ڕزگارتبکەم."

ڕووکراوەیی، هەم مایەی خۆشیم بوو هەم نیگەرانی. بەسەرهاتی منی دەزانی. لەو باوەڕەدابوو، دەتوانێت یارمەتیم بدات. بەڵام ئەو بەستە و باڵۆرەیەم بیستبوو لە تریش و سۆزانە، لە ڕەشید و هاوڕێکەی و لە خانم عەلاوی پڕسەیروسەمەرە.

"تەماشاکە،" پێمـوت، "تائێستا ئەم قسانەم چەند جار بیستووە و من بۆ خۆم کێشەیەکەم هەیە. من بەبێ کچەکەم ئێرە جێناهێڵم. ئەگەر ئەو نەتوانێت بێت لەگەڵم، من ناتوانم بڕۆم. کارێکی ژیرانە نییە، کاتی تۆ بە فیڕۆ بدەم - ئەمە داوای منە."

"بەڕاستی ڕێز لە داواکەت دەگرم،" ئاماهل وتی. "ئەگەر ئەوە داوات بێت، دەی من هەر دووکتان دەردەکەم. ئەگەر ئێوە ئارام بگرن - چونکە نازانم، ئەمە چۆن و کەی ڕێکدەخرێت. تەنیا ئارامبن کاردکە دەچێت پێش."

قسەکانی خۆشییەکی پێدام، کە دەبوایە زۆرم لەخۆم بکردایە تا بتوانم بیشارمەوە. هیوای پێدام، بەڵام زوو دانیپیادانا، کە نازانیت چۆن و کەی دەتوانین هەڵبێین.

"ئەمە ژمارەی تەلەفونەکانم،" وتی و لەسەر کاغەزێك نووسی. "با پیشانتبدەم چۆن دەیکەیت بە پەرلە. ئەمانە ژمارەی تەلەفونی منن، یەکێکیان بۆ نووسینگەیە ئەوتریان بۆ ماڵەوەیە. هەر کاتێك، شەو یان ڕۆژ، دەتوانی تەلەفونم بۆ بکەیت، تکاتلێدەکەم دوودڵ مەبە. هەرکاتێك توانیت، پێمخۆشە تەلەفونم بۆ بکەیت. هەتا هەست مەکە وەڕسمدەکەیت - هەمیشە تەلەفونبکە - چونکە من ئەو سەکێشییە ناکەم، تەلەفونت بۆ

ماڵەوە بۆ بکەم. لەوانەیە هاوسەرکەت بە هەڵە تێبگات. لەوانەیە نەرمیی بکات." ئاماهل پێکەنی.

وردی کاری تێکردم. حەیف ژنی هەبوو، لە دڵی خۆمدا وتم و پاشان خێرا هەستم بە تاوان کرد.

"زۆر چاکە،" وتم و سەرم بۆ لەقاند. ئاماهل هەستێکی خۆشی لا دروستکردم.

"لەسەر تەلەفۆن قسە زۆر ناکەین،" ئاگاداریکردمەوە. "تەنیا دەڵێت، 'چۆنــی' یان شتێك لەو بابەتە. ئەگەر هەر زانیارییەکەم هەبێت، پێتدەڵێم، پێویستە بتبینم، ئینجا ئەوسا تۆ دەبێت بێیت بۆ ئێرە، چونکە لەسەر تەلەفۆن زیاتر لەوە ناتوانین قسەبکەین."

دەبێت کۆسپێك هەبێت، لە دڵی خۆمدا وتم. لەوانەیە پارە بێت. "ئایا بە دایك و باوکم بڵێم، هەندێك پارەت بۆ بنێرن بۆ باڵوێزخانە؟" پرسیارمکرد.

"نـــا، ئێستا نیگەرانی پارە مەبە. من پارەکەی دەدەم. تۆ دەتوانی دوایی بۆمی بگەڕێنیتەوە، کاتێك کە گەیشتینەوە ئەمریکا."

مەهتاب لە تەواوی گەڕانەوەماندا لە ناو تەکسییەکەدا بێدەنگ بوو. ئەمە بۆ من زۆر باش بوو، چونکە سەرم زۆر جەنجاڵ بوو. بە قسەکانی ئاماهلدا دەچوومەوە، هەوڵمدەدا شیانبکەمەوە، ئەگەری سەرکەوتن چەندە. ئایا بەڕاستی ڕێگای دەرچوونم لە ئێراندا دۆزیوەتەوە؟

"دەتوانی پارەکەم بۆ بگەڕێنیتەوە، کاتێك کە گەیشتیتەوە ئەمریکا." بە دڵنیاییەوە ئەو قسەیەی کرد.

بەڵام ئەوەشی وت: "نازانم چۆن و کەی، ئەمە ڕێکدەخرێت."

# 20

هاوین تەواوبوو، بۆ جارێکی تر کاتی قوتابخانە دەستیپێکردەوە. دەبوو وا خۆم پیشانبدەم، کە وەرگرتنی مەهتاب لە پۆلی یەکەمی سەرەتایی، مایەی خۆشیمە، کاتێک کە مودی ئەم باسە دەهێنێتە کایەوە.

مایەی سەرسامیم بوو، تەنانەت مەهتابیش نارەزایەتی دەرنەبڕی. لەڕاستیدا ڕاهاتبوو بەوەی، کە گوایە لە ئێراندا دەژی.

بەیانییەکیان من، مودی و مەهتاب بەپێ چووین بۆ تەماشای قوتابخانەیەک، لە نزیکی ماڵی خۆمان، کە هەر دە خولەکێک دووربوو بە پێ. ئەم بنایە لە بەنیخانە نەدەچوو، وەك ئەوەی *مەدرسەی* زەینەب، ژوورەکانی پەنجەرەی زۆری تیادابوو بۆ هاتنە ژوورەوەی هەتاو. بەڵام لەوەدەچوو ئەمو کەشە، کاریگەرییەکی وەهای نەبووبێت بەسەر بەڕێوەبەرەوە، کە پیرەژنێکی توڕەی عەبابەسەر بوو، بە گومانەوە تەماشایدەکردین.

"دەمانەوێت کچەکەمان لەم قوتابخانەیەدا ناونووسبکەین،" مودی بە فارسی وتی.

"نـــا،" کورت وەڵامیدایەوە. "جێگامان نەماوە." بۆ لە کۆڵکردنەوەی خۆی، ئاڕاستەی کردین بۆ قوتابخانەیەکی تر، کە دیاربوو زۆر دوورتر بوو لەوەی نزیک بە ماڵی خۆمان.

"هاتین بۆ ئێرە، چونکە نزیکە لێمانەوە،" مودی هەوڵیدا ڕازیبکات.

"جێگــــامان نییە!"

من و مەهتاب لامانکردەوە بڕۆین، هەستمکرد مەهتاب خۆشحاڵە، کە ناکەوێتە بەردەست ئەم ژنە جنۆکەیە.

"ئـــاوا،" مودی لەبەرخۆیەوە وتی، "بەڕاستی ئیمڕۆ کاتم نییە، بچم بۆ قوتابخانەکەی تر. تۆزێکی تر دەچم بۆ ژووری نەشتەرگەری."

"بـــۆ،" بەڕێوەبەرەکە وتی. "تۆ دکتۆری؟"

"بەڵــــێ."

"دەی باشە، تۆزێك ڕاوەستن. دانیشن." هەمیشە جێگایان هەبوو بۆ کچی پزیشك. مودی دڵشادبوو لەم نیشانەیەی بەرزی پلەوپایەی.

بەڕێوەبەرەکە لە یاسای خوێندنی قوتابخانەی ئاگاداریکردینەوە. مەهتاب دەبوو دەستێك جلی خۆڵەمێشی هاوبەرگی هەبێت، چاکەت، پانتۆڵ و *مەقنەعە* - سەرپۆشێکە کە بە یەکەوە دەدوورێت، لەجیاتی ئەوەی گرێی لێبدرێت، لەسەرکردنی تۆزێك ئاسانترە لە *ڕووسەری*، بەڵام خراپی هیچیان ناگات بە *عەبا*. لەڕۆژی کۆبوونەوەی دایکان و قوتابیان ئاگاداریکردەوە، کە من و مەهتاب پێکەوە ئامادەبین.

پاش ئەوەی قوتابخانەمان جێهێشت، بە مودیم وت، "چۆن مەهتاب دەتوانێت بە یەك دەست جلی هاوبەرگ بەڕێوەبچێت؟ چاوەڕوانن ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هەمان دەستە جلی لەبەردابێت."

"خەڵك هەروا دەكات،" مودی وتی. "بەڵام تۆ ڕاست دەڵێیت. دەبێت چەند دەستەی هەبێت."

مودی چوو بۆ كار، پارەی بۆ ئێمە جێهێشت بۆ كڕینی جلی هاوبەرگ. ئێمەش چووین بەلای كاری خۆمانەوە، هەتاوی گەرمی سەرەتای مانگی ئەیلول وردەی بەرزكردبووەوە. لێرە لەگەڵ كچەكەمدا ئازادانە دەڕۆم. ئەوە گەورەترین هەنگاو بوو بەرەو پێشەوە نابووم. لەو كاتەی مەهتاب لە قوتابخانە بوو، مودیش لەسەر كار، دەمتوانی بچم بۆ هەر شوێنێك لە تاراندا، كە پێم خۆشبووایە.

چەند ڕۆژ دواتر من و مەهتاب چووین بۆ كۆبوونەوەی ڕێنوێنی دایكان و قوتابیان، مەلیحەی دراوسێشمان برد لەگەڵ خۆمان بۆ وەرگێڕان. تۆزێك ئینگلیزی تێدەگەیشت، بە یارمەتی ئەو و مەهتاب زۆربەی ئەوەی وترا تێیگەیشتم.

كۆبوونەوەكە پێنج كاژێری خایەند، زۆربەی كاتەكە بۆ نوێژكردن و قورئان خوێندن چوو. پاشان بەڕێوەبەرەكە هەوڵێكی بەپەرۆشی دا بۆ كۆكردنەوە پارە لە دایكان. باسیكرد، كە توالێت لە قوتابخانەكەدا نییە و پێویستیان بە پارەیە بۆ دروستكردنی ئەم ئاسانكارییە، پێش ئەوەی قوتابخانە دەستپێبكات.

بۆ مودیم گێڕایەوە، "هەرگیز نا! ئێمە پارەیان پێنادەین بۆ دانانی توالێتی قوتابخانە. ئەگەر دەتوانن بەردەوام *پاسداران* بڕێژننە سەر شەقامەكان بۆ چاوەچاوی ئەوەی، چ ژنێك تاڵە قژێك لە ژێر ڕووسەرییەكەیەوە هاتۆتە دەرەوە یا چ ژنێك گۆرەوییەكانی هاتۆتەخوارەوە، ئەی بۆ ناتوانن تۆزێك لەو پارەیە خەرجی دانانی توالێت بكەن بۆ منداڵان."

هەرچەند لەگەڵ ئەوە نەبوو، كەچی بەدەستی ئاوەڵاوە یارمەتیدان. كە قوتابخانە كرایەوە، كۆمەڵێك كونیان لە عەرزەكەدا دروستكردبوو.

زۆری نەخایەند، ڕۆتینی تازە جێكەوت. مەهتاب بەیانیان زوو دەچوو بۆ قوتابخانە. هەموو كاری من ئەوە بوو، لەگەڵی بچم بۆ جێگای وەستاندنی پاس و بۆ دوانیوەڕۆ لە هەمان شوێندا چاوەڕوانیبكەم.

زۆربەی ڕۆژان مودی لە ماڵەوە دەمایەوە، لە كلینیكەكەی كاریدەكرد. هەر ئەوەندەی ناوی بڵاوبۆوە، نەخۆش سەری تێكرد. بەتایبەتی خەڵك ئەو ئازاركەمكردنەوەیەی بۆ گرنگ بوو، كە مودی لە ڕێگای شێلانەوە[1] دەیكرد، هەرچەند ئەمە كێشەی دەنایەوە لەگەڵ ئەو ژنانەی كە زۆر شەرمن بوون. بۆ نەهێشتنی ئەم كێشەیە، مودی فێریكردم چۆن ئەم

چارەسەرە بکــەم. لە بەینی ئەمە و کاری پێشوازی، تەواوی ڕۆژەکەم دەڕۆیشت و کاتێک بۆ خۆم نەدەمایەوە.

هەر بەهیوای سێ شەممان و چوار شەممان دەژیام، ئەو ڕۆژانەی کە مودی لە نەخۆشخانە کاریدەکرد. تەواوی ئەو ڕۆژانە کاتی خۆم بوو، ئازادانە بە هەوەسی خۆم دەمتوانی تەواوی شار بگەڕێم.

لەو کاتانەدا، لە ڕۆژانی سێ شەممە یان چوار شەممەدا، هێلینم لە باڵوێزخانە بەڕێزکی دەبینی. هەفتانە نامەم دەنارد و نامەم لە دایك و باوکم و منداڵەکانمەوە بەدەستدەگەیشت. لەسەرێکەوە زۆر خۆش بوو بۆم، بەڵام مایەی خەمۆکییەکی زۆریش بوو. زۆرم بیـــــردەکردن! هەروەها نیگەرانی نامەکانی دایکم بووم، کاتێك باسی خراپبوونی نەخۆشییەکەی باوکمی دەکرد. نەیدەزانی، هەتاکو کەی باوکم دەتوانێت بڕیکات. باوکم ڕۆژانە دەپاڕایەوە، کـــە بتوانێت ئێمە بۆ جارێکی تر ببینێتەوە، پێش ئەوەی بمرێت.

ئەگەر بمتوانیایە، ڕۆژانە تەلەفونم بۆ ئاماهل دەکرد. هەر جارە ئاسایی ئەحواڵی دەپرسیم، لە کۆتاییدا دەیوت، "چاوەروانبـــە."

ڕۆژێکیان بۆ هەندێك کار، لەناو بازاڕ بووم. مودی پێی وتبووم، کە کلیلی زیادە بۆ ماڵەکە بدەم بە کردن. دەمزانی دوکانی کلیل دروستکردن هەیە، کە چەند دوکان ئەولای پیزاکەوە بوو. لەسەر ڕێگام بۆ ئەوێ، بە بەردەمی کتێب فرۆشییەکدا ڕۆیشتم، لەوەوپێش نەمبینیبوو، هەر لە خۆمەوە سەرم پیاداکرد. خاوەن دوکانەکە دەیتوانی ئینگلیزی قسەبکات. "هیچ کتێبێکی خواردن دروستکردنتان هەیە؟" پرسیارمکرد.

"بەڵێ، لە نهۆمی خوارەوەدا هەیە."

چوومە خوارەوە، کتێبێکی زۆری دەستی دووی خواردن دروستکردنم دۆزییەوە، لە خۆشیاندا قاچم زەوی نەدەگرت. چەند حەزمدەکرد، هەڵێك بدۆزمەوە و تەماشای ڕێنماکان[2] بکەم! کۆمەڵێك ڕێنما هات بە مێشکمدا و هیواداربووم، کە بتوانم لە بازاڕدا پێکهێنەرەکانیان بدۆزمەوە یان جێگرەکانیان دەستەبەربکـــەم.

بۆ ساتێك لە خۆشی خۆم کەوتم، کە گوێم لە دەنگی کچێکی منداڵ بوو، بە ئینگلیزی دەدوا. "دایـــــە،" وتی، "کتێبی چیرۆکم بۆ دەکڕیت؟"

کە سەرم بەرزکردەوە ژن و منداڵێکم بینی، هەردووکیان مانتۆ و سەرپۆشیان بەسەرەوە بوو. ژنەکە باڵابەرز، قژڕەش و ڕەنگی پێستی برۆنزی کراوە بوو، کە زۆربەی ئێرانییەکان ئەو ڕەنگی پێستەیان هەیە. لە ئەمریکی نەدەچوو، بەڵام خۆم نەگرت هەر پرسیارمکرد، "تـــۆ ئەمریکیت؟"

"بەڵـــــێ،" ئەلیس شەریفی وەڵامیدامەوە.

لەو وڵاتە نامۆیەدا، یەکسەر بووین بە هاوڕێ. ئەلیس مامۆستای ناوەندی بوو لە سان فرانسیسکۆ، شوویکردبوو بە ئەمریکییەکی بە ڕەگەز ئێرانی. هاوسەرەکەی بە ناوی مالیك

تازە دکتۆرای وەرگرتبوو، کاتێك کە باوکی دەمرێت. ئەو و ئەلیس بۆ ماوەیەکی کورت هاتبوونەوە بۆ تاران، لە پەیوەندە بە بابەتی وەرەسەدا. ئەلیس نێرەی پێخۆشنەبوو، بەڵام گرفتێکی کاتی بوو. کچەکەی سامیرا - بە سامی بانگیدەکرد - لە تەمەنی مەهتابدا بوو.

"ئەی هاوار!" وتم، کە تەماشای کاتژمێرەکەمم کرد. "دەبێت بچم چاودێروانی کچەکەم بکەم. لە شوێنی وەستاندنی پاسەکە. دەبێت فریایبکەم." ژمارەی تەلەفونمان لەگەڵ یەکتری گۆڕییەوە.

ئەو ئێوارەیە باسی ئەلیس و مالیکم بۆ مودی کرد. "دەبێت دەوەتیانبکەین،" مودی بەخۆشییەکی ڕاستەقینەوە وتی. "دەبێت بە شەمسی و زاریان ئاشنابکەین."

"بۆ ڕۆژی هەینی چۆنە؟" پێشنیارمکرد.

"چــــاکە،" یەکسەر ڕازیبوو.

دوانیوەڕۆی ڕۆژی هەینی، ئەویش وەك من، بە شوروشەوقەوە چاوەڕوانی هاتنیان بووین. مودی یەکسەر خۆشی هات لە ئەلیس و مالیك. ئەلیس کەسێکی زیرەکی دڵشادی قسەخۆش بوو، هەرگیز پەکی نەدەکەوت بۆ نوکتە. ئەو شەوە کە لە میوانەکانمان وردبوومەوە، بۆم دەرکەوت، لە تەواوی ئەو کەسانەی کە من لە ئێراندا دەمناسین، تەنیا شەمسی و ئەلیس کەسانێك بوون لەوەدەچوو بەڕاستی دڵشادبن. لەوانەیە لەبەرئەوە بووبێت، کە هەردووکیان بەو زووانە دەگەڕانەوە بۆ ئەمریکا.

ئەلیس نوکتەیەکی گێڕایەوە. "جارێکیان پیاوێك خۆی دەکات بە دوکانی تابلۆ فرۆشێکدا و تابلۆی خومەینی دەبینێت. دەیەوێت بیکڕێت و خاوەن دووکانەکە داوای پێنج سەد تومەنی لێدەکات." یەك تومەن دە ڕیاڵە.

"'سێ سەد تومەنت دەدەمێ،' کڕیارەکە دەڵێت.

'نــــا، پێنـج سەد تومەن.'

'سێ سەد و پەنجا.'

'نا، هەر پێنـج سەد.'

'چوار سەد تومەن،' کڕیارەکە دەڵێت. 'ئیتر لەوە زیاتری پێنادەم!'

هەر لەو کاتەدا کڕیارێکی تر دێتە ژوورەوە، چاوی بە تابلۆی عیسا دەکەوێت و لە دوکاندارەکە پرسیاری نرخەکەی دەکات.

'پێنـج سەد تومەن،' دوکاندارەکە دەڵێت.

'چاکە.' کڕیارەکە پێنـج سەد تومەنەکە دەدا و دەڕوات.

دوکاندارەکە ڕوو لە کڕیاری یەکەم دەکات و دەڵێت، 'ئــــاغا، ئەو پیاوەت بینی. هاتە ژوورەوە، ئەو تابلۆیەی دەویست تەماشایکرد و ئەو نرخەی من داوامکرد، پێیدام و لێیدا ڕۆیشت.'

ئینجا کڕیاری یەکەم دەڵێت، "چــــاکە، ئەگەر تۆ بتوانی خومەینیم بۆ لە دار بدەیت و بزمار ڕێژی بکەیت، بەڵێنبێت، من پێنـج سەد تومەن بدەم بە تۆ!'"

هەرچی لە ژوورەکەدا بوو پێکەنی، بە مودیشەوە.

بۆ ڕۆژی دوایی شەمسی تەلەفونی بۆ کردم، "بیتی، ئەو ئەلیسە ژنێکی چاکە. بەڕاستی هاوڕێیەکی باشی لێدەردەچێت بۆ تۆ."

"دروستە،" منیش لەو باوەڕەدا بووم.

"بەڵام ئلین لەبیر خۆتی بەرەوە،" شەمسی وتی. "ئلین مایەی وەڕسییە."

من و ئەلیس بەرێزکی یەکتریمان دەبینی. ئەوەندەی من بزانم ئەلیس تەنیا ژن بوو لە ئێراندا، کە نامێری جلوشککردنەوەی هەبوو. لە کاتی جلشتندا کەرستەی تایبەتی بەکاردەهێنا بۆ نەرمبوونی جلوبەرگەکان پاش وشکبوونەوەیان. ترشیاتی خەرتەلەی[3] هەبوو!

هەروەها پاسپۆرتیشی هەبوو، کە پێی دەگەڕایەوە بۆ ئەمریکا.

"بە هیچ جۆرێك بە شەمسی ئەڵێیت، لە ئێراندا چیت بەسەرهاتووە،" مودی ئاگاداریکردمەوە. "هەروەها بە ئەلیسیش. ئەگەر شتی وا بکەیت، هەرگیز نایانبینیتەوە."

"باشە،" بەڵێنمـپێدا.

هەر بەوەندە ڕازیبوو، پێیخۆشبوو باوەڕ بەوە بهێنێت، کە ئیتر بابەتی گەڕانەوە بۆ ئەمریکا هەرگیز نایەتەوە بەر باس. گرەوی لە من بردبۆوە. هورموز چی بە ئلین کرد، مودیش هەر ئەوەی بە من کرد.

پشتئەستور بە بەڵێنەکەی من، ڕێگایدام هاتوچۆیەکی ئازادانەم هەبێت لەگەڵ شەمسی و ئەلیسدا. لەڕاستیدا دەستی زۆر ئاوەڵا نەبوو، چونکە ئەگەر لە ماڵە تازەکەدا بەندی بکردمایە، نەیدەتوانی بە بەرچاوی هاوڕێکانمانەوە، خۆی وا پیشانبدات کە خێزانێکی بەختەوەرین.

سەرەڕای گۆڕانی پەیوەندی مودی لەگەڵ کەسوکاری، بەڵام دەبوو ئەرکی خزمایەتی خۆی بەجێبهێنێت. ئەیدەویست بابەحاجی و عەمە بزورگ دەوەتبکات بۆ نانی ئێوارە، بەڵام دەبوو ڕێزی خۆی بنوێنێت. دەوەتکردنیان بۆ ماڵمان زۆر کەوتبووە دواوە.

"مەهتاب دەچێت بۆ قوتابخانە و دەبێت کاتژمێری هەشت لەناو جێگادا بێت، لەبەرئەوە کاتژمێری شەش وەرن،" مودی لەسەر تەلەفون بە خوشکەکەی وت. عەمە بزورگ بیری براکەی خستەوە، کە ئەوان هەرگیز پێش کاتژمێری دە نانی ئێوارە ناخۆن.

"بۆم گرنگ نییە،" مودی وتی. "لە شەشدا نان دەخۆن یان هەر مەیەن."

بەناچاری عەمە بزورگ قبووڵیکـــرد.

بۆ کەمکردنەوەی ئەم بارە قورسە، هاوکات خێزانی حەکیمان دەوەتکرد.

بۆ ئەو ئێوارێیە، خواردنێکی تایبەتم دروستکرد. کریپیسی مریشک[4] م ئامادەکرد وەك پێشژەم[5]، جۆری گۆشتەکەی نیشانەیەك بوو بۆ ڕێزلێنان. بازاڕێکی باشم کرد، بۆ یەکەم جار بروسێل سپرۆت[6] م دەستکەوت، لەگەڵ لیك[7] و گوێزەر تێکەڵمــکرد.

بابەحاجی و عەمە بزورگ، مەجید و فریشتەیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، کاتژمێری هەشت گەیشتن ئەك شەش، بەڵام ئەمە شتێکی چاوەڕوانکرابوو، شایەنی ئەوە بوو چاوی لێبپۆشرێت. لەگەڵ خێزانی حەکیمدا هەموومان بەدەوری مێزی نانخواردندا دانیشتین.

خێزانی حەکیم ئەوەندە کراوەبوون، کە لەگەڵ کەشەکەدا خۆیان بگونجێنن، بەڵام بابەحاجی و عەمە بزورگ بۆیان قورس بوو، هەرچەند ئەو پەڕی هەوڵیانــدا باش هەڵسوکەوت بکەن. بابەحاجی لە قاپ، کوچك، چەتاڵ، چەقۆ و باقی شتەکانی تر وردەبۆوە، دڵنیانەبوو لە شێوەی بەکارهێنانیان. دەمتوانی پێشبینیبکەم، کە نازانێت چی لەو دەستەسڕە قوماشییە بکات یان ئەوەی، کە هەر کەسێك پەرداخی خۆی هەبێت بۆ خواردنەوە، بە شتێکی زیادی بزانێت.

عەمە بزورگ بەسەر کورسییەکەیەوە کێچ کەوتبووە کەوڵی، ئۆقرەی لەبەر بڕابوو. لە کۆتاییدا پەتی پچراند، بە خۆی و دەورییە خواردنەکەیەوە، چوو لەسەر فەرشەکە دانیشت و نیشتە سەر بروسێل سپرۆتکە، کە بە "کەلەرمە بچوکەکانی بیتی،" ناوی دەبرد.

چەند ساتێکی نەبرد، خواردن بەناو هەموو ژوورەکەدا بڵاوبۆوە. خواردن دەکەوتە سەر مێزەکە و دەکەوتە خوارەوە بۆ ژێرەوە، کاتێك میوانەکان بەدەست دەستیان دەبرد بۆ خواردنەکە و جاروباریش کەوچکیان بەکاردەهێنا. من، مودی و مەهتاب بە چەتاڵ و چەقۆ ئارام ناخواردنی خۆمان دەخوارد.

نانخواردن تەواوبوو، کاتێك میوانەکان هەستان و چوونە ژووری دانیشتن، مودی لە ژێر لێوەوە پێیوتم، "تەماشای جێگاکەی مەهتاب بکە. دەنکێك برنج چییە لە دەورییەکەی نەکەوتۆتە خوارەوە یان کەوتبێتە سەر فەرشەکە و تەماشای جێگای گەورەکانیش بکە."

ئەمدەویست تەماشابکەم. دەمزانی ئەو شەوە تا درەنگ خەریکی پاککردنەوەی دەنکە برنج و خواردنی تر دەبم بەسەر دار و دیوار و فەرشەوە.

لە ژووری دانیشتن چام هێنا. عەمە بزورك بۆ چەندجار کەوچکەکەی نوقمکرد لە قوتوی شەکرەکەدا و چاکەی لێپڕکرد، هەروا شەکر لە کەوچکەکە دەکەوتە خوارەوە تا دەگەیشتە چاکە.

ئێوارێیەکیان چووین بۆ ماڵی ئیکرام حەکیم، دایکی ئەو "خوشکەزا"یەی مودی، بە ناوی جەمال، کە چەند ساڵ لەمەو پێش، لەسەر نانخواردنی بەیانی لە هوتێلی ئوستین لە تەکساس، بینیمان و هەواڵی داگیرکردنی باڵوێزخانەی ئەمریکای لە تاران، پێداین. کچی براکەی ئیکرام حەکیم لەوێ بوو، زۆر غەمگین دیاربوو. پرسیارمکرد بۆچی، بەسەرهاتەکەیان بە ئینگلیزی بۆ باسکردم.

ئەو بەیانییە زوو ماڵی گسکداوە، کە لە پڕ بڕیاریداوە بچێت بۆ جگەرەکڕین. *مانتۆ* لەبەردەکات و *ڕووسەری* دەدا بەسەریدا و دوو کچەکە تەمەن دە ساڵ و یانزە ساڵەکانی لە ماڵەوە بەتەنیا جێدەهێڵێت. لە ماڵ دەچێتە دەرەوە لە شەقامەکە دەپەڕێتەوە بۆ ئەوبەر. پاش کڕینی جگەرە، لەسەر ڕێگای گەڕانەوەی بەسەر شەقامەکەدا *پاسدار* ڕایدەوەستێنێت. چەند ژنە *پاسدار* دەیبەنە ناو ئوتومبیلەکەیانەوە و لەوێ بە ئەسیتۆن بۆیەی نینۆکی لێدەکەنەوە و سووراوی لێوی دەسڕن. بۆ ماوەیەك پیایدا هەڵدەشاخێن و پاشان پێیدەڵێن، کە بەنیازن بیبەن بۆ بەندیخانە.

لێیانــدەپاڕێتەوە، کە با لە پێشدا منداڵەکانی لە ماڵەوە بهێنێتە دەرەوە.

منداڵەکان پشتگوێدەخەن و ژنەکە بۆ ماوەی دوو کاژێر لەناو ئوتومبیلەکەدا دەهێڵنەوە و ئامۆژگاریدەکەن. لێیانپرسیبوو نوێژ دەکەیت، ژنەکە وتبووی نا. پێیانــوتبوو، پێش ئەوەی ڕێگاتبدەین بڕۆیت، دەبێت بەڵێنبدەیت، کە بە هیچ جۆرێك بۆیەی نینۆك و سووراوی لێو بەکارنەهێنێت. هەروەها داوایان لێکردبوو کە بەڵێنبدات، ئیماندارانە نوێژەکانی بکات. ئەگەر نــــا، ژنە پاسدارەکان ئاگادارییانکردبۆوە، بە خراپی بەندی دەکەن و دەینێرن بۆ دۆزەخ.

"ڕقم لە *پاسدارانە،*" هاودەردی خۆمم پیشاندا.

"هەڕەشەیان لێکردم،" ژنەکە وتی. "ترسناکن." باسیکرد، کاتێك لەسەر شەقامەکانی تاران *پاسداران* یاسای جلوبەرگ دادەسەپێنن، زیاتر مایەی وەڕسکردنن. بەڵام لە هەمان کاتدا دەوری پۆلیسی نهێنی دەبینن، دەگەڕێن بەدوا دوژمنانی کۆماری ئیسلامیدا - یان زیاتر بە دوای کەسێکی بێدەسەڵاتەوەدن، کە بتوانن بیتۆقێنن. هەرکاتێك *پاسداران* ژنێك بگرن و بیانەوێ سزای ئیعدامی بەسەردا بدەن، لەپێشدا لاقەی دەکەن ئەوسا ئیعدامیدەکەن، چونکو لەو باوەڕەدان: "ژن هەرگیز نابێت بە پاکیزەیی بمرێت."

شەو و ڕۆژ خەیاڵم لای پلانی هەڵهاتنەکەم بوو. هیچ شتێکی گرنگ لەم پەیوەندەدا ڕووی نەدابوو، بەڵام ئەو پەڕی هەوڵمــدەدا پەیوەندییەکانم بپارێزم. لە نزیکەوە پەیوەندییم دەگرت بە هێلینەوە لە باڵوێزخانە و نزیکەی هەموو ڕۆژێك تەلەفونم بۆ ئاماهل دەکرد.

هەموو هەڵسوکەوتی ڕۆژانەم، لە ڕاستای ئەو ئامانجەدا خستبووەگەڕ. لەو کاتەدا بەوە گەیشتم چەند دەتوانم هاوسەر و دایکێکی باش و لێهاتووبــم، لەبەر سێ هۆ. یەکەم، بۆئەوەی جێگای ئەو خۆشخەیاڵی ئاساییبوونەوە و کامەرانییە قایمــبکەم، تا ئەگەری هەر گومانێکی مودی بڕەوێنێتەوە. دووەم، بۆئەوەی مەهتاب کەمتر بیر لە هەلومەرجی بەندێتیمان بکەتەوە و هەروەها دڵخۆشی بکەم.

"مامی، ئایا دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ ئەمریکا؟" جاروبار دەیپرسی.

"ئێستا نـــا،" وەڵامەدەدایەوە. " لەوانەیە ڕۆژێك لە ڕۆژان، پاش ماوەیەکی تر، باوکت بۆچوونی خۆی بگۆڕێت و هەموو پێکەوە بگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە."

ئەو خەیاڵە بۆ ئەو، مایەی تۆزێك کەمکردنەوە ئازار بوو، بەڵام بۆ من نـــا.

سێیەم هۆ، بۆ دروستکردنی ماڵێکی "بەختەوەر" ئەوە بوو، باری دەروونی خۆم تێکنەچێت. بە هیچ شێوەیەك نەمدەتوانی بزانم، کاتێك من و مەهتاب دەکەوینە هەڵهاتن، چ مەترسییەك چاوەڕوانمانــدەکات. نەمدەویست زۆر بیر لە ئەگەری ئەو مەترسیانە بکەمەوە. هەندێك جار بیرم لە سۆزانە و تریش دەکردەوە، کە چۆن بە گوێمـنەکردن، من و مەهتاب دەستبەجێ دوایانـبکەوین. ئایا هەڵە نەبووم؟ لە وەڵامی ئەو پرسیارە دڵنیا نەبووم. ئایا هەرگیز دەتوانم ئەو ئازایەتییە لە خۆم پیشانبدەم؟ کاتێك هەڵدێین، ئایا من و مەهتاب دەتوانین ئەو بەربەستانە تێکبشکێنین، کە دێتە سەر ڕێگامان؟ نەمدەتوانی وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەمەوە. باشتر بوو تا ئەو کاتە، خۆم سەرگەرمبکــەم.

بە مەبەستی دڵشادکردنم، مودی پێشنیاریکرد، بچمە ئارایشگایەکی نزیك ماڵی خۆمان. وا دەردەکەوت ئەمە شتێکی زۆر نامۆ بێت لە وڵاتێکدا، کە کەس بۆی نەبێت تەماشای قژ و دەموچاوت بکات، بەڵام هەرچی چۆنێك بوو چووم. ژنەکە داوای لێکردم، بڕۆم بۆ هەڵگرێت لەگەڵ لابردنی هەندێك مووی وەڕسکەری دەموچاو، منیش ڕازیبووم.

لە جیاتی شیلە یان مووکێش، پەتێکی لۆکەیی درێژی باریکی بەکارهێنا. پەتەکەی بە هەردوو دەستی دەهێنا و دەبرد بەسەر دەموچاومدا و مووەکانی دەردەکێشا.

دەمویست لە تاو ئازار هاواربکەم، بەڵام دانم بەخۆمدا گرت. بۆم پرسیاربوو، کە بۆچی ژنان ڕێگادەدەن بەناوی جوانکردنەوە ئەوا ئەشکنجەبدرێن. کە تەواوبوو، دەموچاوم هەر گۆشتە ڕووتەکە بوو، دەسووتا.

ئەو ئێوارێیە پەڵەیەکی سوور لە دەموچاومدا دەرکەوت، خێرا ملم و سنگمی گرتەوە.

"دەبێت پەتەکەی پیس بووبێت،" مودی لەبەرخۆیەوە وتی.

ئێوارێیەکیان کە لە بازاڕ هاتمەوە، بینیم ژووری چاوەڕوانی کلینیك، جمەی دێت لە خەڵکی نەخۆش.

"ئەو دەرگایانە بکەرەوە،" مودی پێیوتم. "با چەند نەخۆش بچنە ژووری دانیشتنەکە."

پێمخۆشـنەبوو، خەڵکانی نەناس بێنە ناو ژووری دانیشتنەکەی خۆمانەوە، بەڵام بە گوێمکرد، دوو تاکدەرگاکەم کردەوە و ئاماژە بەو نەخۆشانە دا، کە بە پێوە ڕاوەستابوون، بێن لەسەر قەنەفە و کورسییەکان دابنیشن.

یەکێك لە کارەکانم وەك پێشوازیکەر، پێشکەشکردنی چا بوو بە نەخۆشەکان. ڕقم لەم ئەرکە دەبۆوە، بەڵام ئەو ئێوارێیە مەزاجم تەواو نەبوو، دەمزانی ژووری دانیشتنەکەمان زۆر نابات پیس دەبێت و ئاسەواری شەکر بە هەموو شوێنێکەوە دەبینرێت.

بەناچاری چام بۆ دانان و کاتێك ویستم سینی چاکە بەرمەوە بۆ چێشتخانە، ژنێك لە نەخۆشەکان پرسی، "تۆ ئەمریکیت؟"

"بەڵێ،" وەڵاممدایەوە. "دەتوانی ئینگلیز قسەبکەیت؟"

"بەڵێ، لە ئەمریکا خوێندوومە."

لە تەنیشتی دانیشتم، مەزاجم باشبوو. "لە کوێ؟" پرسیم.

"مەشیگان."

"ئۆی من لە مەشیگانم. لە کوێ مەشیگان خوێندووتە؟"

"کالامازۆ."

ناوی فریشتە نەوروزی بوو. کچێکی گەنجی جوان بوو، کە هەندێك کەس لە نەخۆشخانە، ناونیشانی مودییان پێدابوو. بەدەست نازاری مل و پشتەوە دەیناڵاند، بەڵام کەس نەیتوانیبوو دەستنیشانی هۆکەی بکات، بەو هیوایە بوو کە چارەسەرکەی مودی یارمەتیبدات.

لە تەواوی نزیك نەو چل و پێنج خولەکەدا، کە چاوەڕوانیدەکرد، قسەمانکرد.

فریشتە بۆ چەند جاری تر گەڕایەوە بۆ چارەسەر و هەر جارە بانگەمدەکردە ژووری دانیشتنەکە، تا بتوانین پێکەوە قسەبکەین. جارێکیان متمانەی پێکردم و وتی، "دەزانم هۆی ئازارەکەم چییە؟"

"دەزانیت؟ چییە؟"

"خەموخەفەت." دەستیکرد بە گریان. بۆی گێڕامەوە، کە ساڵێك لەمەوبەر، ئێوارێیەکیان هاوسەرەکەی چۆتە دەرەوە بۆ کڕینی بەنزین بۆ ئوتومبیلەکەی و ئیتر نەگەڕاوەتەوە. فریشتە و دایك و باوکی بە ترس و لەرزەوە نەخۆشخانەکان گەڕابوون، بەڵام هەروا بێهەواڵ گەڕابوونەوە. "لەپاش بیست و پێنج ڕۆژ پۆلیس تەلەفونیکرد،" فریشتە دەنگی بەرزکردەوە. "وتیان، 'وەرە ئوتومبیلەکەی بەرەوە' بەڵام هیچیان لەبارەی هاوسەرەکەمەوە نەوت."

فریشتە و کچە یەك ساڵەکەی دەگوێزنەوە ماڵی باوکی. چوار مانگی تریش بە ترسێکی زیاترەوە چاوەڕوانیدەکەن، تا پۆلیس ئاگاداریدەکەنەوە، کە هاوسەرەکەی لە بەندیخانەدایە و بۆی هەیە، سەردانیبکات.

"هەروا گرتوویانە و لە بەندیخانەدا تونیدیانکردووە،" فریشتە بەدەم هەنسکدانەوە بۆی باسکردم. "ئێستا زیاتر لە یەك ساڵ دەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ تاوانێکیان نەخستۆتە پاڵی."

"چۆن دەتوانن شتی وا بکەن؟" پرسیارمکرد. "بۆچــــی؟"

"مەستەری لە ئابووریدا هەیە،" فریشتە باسیکرد. "هەروەها منیش. هەردووکمان لە ئەمریکا خوێندوومانە. لایەنێك هەیە لە ناو حکومەتدا، لەم جۆرە کەسانە دەترسن."

فریشته داوایلێکردم، که ئەمە بۆ هیچ کەسێك نەگێڕمەوە. دەترسا لەوەی ئەگەر گلەیی زۆر بکات، ئەویش بگرن.

ئەو ئێوارێیە درەنگانێك، پاش ئەوەی مودی دەرگای کلینیکەکەی داخست، پێیوتم، "خۆشم لە فریشتە دێت. ئەرێ مێردەکەی چ کارەیە؟"

"مەستەری هەیە لە ئابووری،" وەڵاممدایەوە.

"کەی توانیت، یەکسەر وەرە بۆ لام."

هەستێکی دەستبەجێیی لە دەنگی ئاماهلدا هەبوو، کە دڵمی خستە پەلەپەل.

"سێ شەممە یەکەم ڕۆژە کە دەتوانم بێم،" وتم. "ئەو کاتەی کە مودی لە نەخۆشخانەیە."

"لە پێشدا تەلەفونم بۆ بکە، تا چاوەڕوانتبم."

دەبێت چی لە گۆڕێدا بێت؟ زیاتر بە لای هەواڵی خۆشدا شکانمەوە تا گرفت، چونکو ئاماهل وریاییەکی خۆشبینانەی بە قسەکانییەوە دیاربوو.

بۆ ڕۆژی سێ شەممە کەوتمە خۆ، لەگەڵ مودیدا نوێژمکرد و چاوەڕوانبووم، کاتەکە بە هێواشی بڕوات. مەهتاب کاتژمێر حەوت چوو بۆ قوتابخانە، مودی چل و پێنج خولەك لە کاتی خۆی درەنگتر ڕۆیشت. لە پەنجەرەکەوە خستمە ژێرچاودێرییەوە تا چووە ناو تەکسییەکەوە و دیارنەما، پاشان تەلەفونم بۆ ئاماهل کرد و هاتنی خۆمم پێڕاگەیاند. دەرچوومە دەرەوە و خۆم گەیاندە شەقامی سەرەکی، کە تەکسی بەرەو ئەو شوێنە بە وێدا دەڕۆیشت و تەکسییەکەم گرت.

سەرەتای مانگی تشرینی دووەم بوو. بـایەکی توند دەهات، هەواڵی هات و ئەهاتی بەفری پێبوو. ترافیکی بەیانیان قورس بوو، چوونەکەی منیش قورستر دەبوو، بەوەی کە دەبوو چەند جار تەکسی بگۆڕم تا بتوانم بگەمە جێگای مەبەست. تا ئەو کاتەی گەیشتمە ئەوێ و لە دەرگای ژووری ئاماهلم دا، سەرم جەمەی دەهات لە پرسیار.

خێرا وەڵامی دەرگالێدانەکەمی دایەوە و زەردەخەنەیەکی گەورەی بۆ کردم.

"وەرە ژوورەوە،" وتی. "دانیشە. چا دەخۆیتەوە یان قاوە؟"

"قاوە،" وتم. "سوپاس." ئوقرەم لێبڕابوو، کاتێك کە خەریکی هێنانی قاوەکە بوو، بەڵام پێیخۆشبوو ئەمە بۆ ساتێك درێژە بکێشێت.

لە کۆتاییدا قاوەکەی دامێ، لە پشت مێزەکەیەوە دانیشت و وتی، "چاکە، پێمباشە پەیوەندی بە خێزانەکەتەوە بکەیت."

"چی بووە؟"

"پێیانبڵــێ، با دوو دەوری زیاتر دابنێن لەسەر مێز بۆ ئەو مەراسیمەی کە ئێوە پێیـدەڵێن، جەژنی سوپاس."

ئاهێکی ئاسوودەیی لە دەمم هاتە دەردوە. *دەمزانی* ئەم جارە دەبێت. من و مەهتاب دەچینەوە بۆ ئەمریکا! "چۆن؟" پرسیم.

پلانەکەی بۆ باسکردم. من و مەهتاب بە هێڵی هەوایی ئێران دەچین بۆ بەندەر عەباس، لەو پەڕی باشووری ئێران. لەوێوە قاچاخچی بە بەلەمی خێرا لە کەنداوی فارس بۆ ئیماراتی عەرەبی دەمانپەڕێنێتەوە. "لە ئیمارات هەندێك کێشەی کاغەز دێتەپێشەوە،" ئاماهل وتی، "بەڵام ئیتر ئێوە لە دەرەوەی ئێرانن و ناتانگەڕێننەوە. یەکسەر لەوێ دەتوانن پاسپۆرت لە باڵوێزخانە دەربهێنن و بچن بۆ ماڵەوە."

پەڕینەوە بەناو دەریادا بە بەلەمێکی خێرای سەرکراوە، تۆزێك ترسناکبوو بۆم، بەڵام ئەگەر ئەوە بەردەبازی ڕزگاری من و مەهتاب بێت، دەبێت ئەو هەنگاوە بنێین.

"پێویستم بە پارە دەبێت؟"

"نا، من خۆم دەیدەم،" ئاماهل وتی، ئەو بەڵێنەی کاتی خۆی دابووی، دووپاتیکردەوە. "کاتێك گەیشتیتە وڵاتە یەکگرتووەکان، ئەوسا دەتوانی بۆم بنێریت."

"ئەمم بۆ هەلگرە" وتم و بەستەیەکی ئەستورم لە پارەی کاغەز پێدا. "دەمەوێت بۆم هەلگریت. نامەوێت بە ڕێکەوت مودی بیدۆزێتەوە." ئەوەد دۆلای ئەمریکی بوو لەگەڵ ڕیاڵێکی زۆر کە دەیکردە شەش سەد دۆلار، ئەو پارانە بوو کە دەمێك بوو خستبوومە لاوە. ئاماهل ڕازیبوو بۆمی هەلگرێت.

"پێویستت بە پێناسنامەیە،" وتی، "بۆئەوەی بتوانی بچیتە ناو فڕۆکەوە."

"باڵوێزخانە مۆڵەتی ئوتومبیل لێخوڕینەکەمی بۆ هەلگرتووم،" وتم، "هەروەها کارتی بانکی و پێناسنامەکەم."

"مەبەستت پێناسنامەی ئێرانییە؟"

"نا. پێناسنامەی ئەمریکی، کە لەگەڵ خۆم هێناومە. مودی پێناسنامە ئێرانییەکەمی لای خۆی هەلگرتووە."

"هەوڵدەدەین بەپێی پێناسنامە ئەمریکییەکەت بلیتت بۆ ببڕین،" ئاماهل وتی. "بەڵام باشتر دەبوو، ئەگەر پێناسنامە ئێرانییەکەت بەدەستبهێنایە. شتەکانت لە باڵویزخانە وەرگرتوە، بەڵام هەوڵێك بدە، بزانە دەتوانی کاغەزە ئێرانییەکانت بەدەستبهێنیت."

"چاکە. کەی دەڕۆین؟"

"ئێستا کەسێکم لە بەندەر عەباسە، خەریکی ڕێکخستنی ئەو شتانەیە و چاوەڕوانم لە دوو ڕۆژدا بگەڕێتەوە. نیگەران مەبە، تۆ و مەهتاب لە جەژنی سوپاسدا لە ماڵەوە دەبن."

هەر لە نووسینگەی ئاماهلەوە، تەلەفونم بۆ هێلین کرد لە باڵوێزخانە. "پێویستە ئێستا بتبینم،" پێم وت.

کاتی سەردانی باڵویزخانە تەواوبووبوو، بەڵام هێلین وتی، "هەر ئێستا دەچمەخوارەوە و بە پاسەوانەکان دەڵێم، ڕێگاتبدەن بێیتە ژوورەوە."

لە پاش تەلەفونەکە، ئاماھل سەرنجێکی وریاکردنەوەی پێوتم. "بە کەسانی باڵوێزخانە مەڵێ، چی لە گۆڕێدایە."

بەڵام ئەوەندە گەشکەیار بووبووم، کە ھێلین دەموچاومی بینی، یەکسەر ھاواریکرد، "ئەی ھاوار! ئەوە چی ڕوویداوە؟ زۆر خۆشحاڵ دیاریت، زۆر گۆڕاویت."

"دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە،" وتم.

"باوەڕناکـــەم."

"بـــا، دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە و پێویستم بە پێناسنامە و کارتە بانکییەکەمە."

ھێلین بەڕاستی دڵشادبوو. زەردەخەنەیەکی گەورە کەوتە دەموچاوییەوە. بە توندی باوەشیپیاکردم. لە خۆشیاندا چاوی پڕبوو لە فرمێسک. نەیپرسی چۆن یان کەی یان کێ. نە من پێمـدەوت، نە ئەویش لە ڕاستیدا دەویست بزانێت.

ھێلین ئەو کاغەزانە بۆی ھەڵگرتبووم، پێیـدام، مۆڵەتی ئوتومبیل لێخورین، پێناسنامەی ئەمریکی و پاسپۆرتە تازەکان، کە بۆی بەدەستھێنابووین، ھەروەھا کارتی بانکییەکەم. پێکەوە چووین بۆ لای میستەر ڤینکۆپ. ئەویش بۆ من زۆر خۆشحاڵبوو، بەڵام سڵەمینەوەیەکی زۆر ھەبوو. "ئەرکی سەرشانمانە ئاگادارتبکەینەوە، کە ھەوڵی ھەڵھاتن نەدەیت،" وتی. "ژیانی مەھتاب ئەخەیتە مەترسییەوە."

بەڵام نیگای دەموچاوی لەگەڵ ئاگادارکردنەوەکانیدا نەدەھاتەوە. بەڵێ ئەرکی سەرشانی بوو، من ئاگاداربکاتەوە. بەڵام ڕۆشنبوو، خۆشحاڵدەبوو بە سەرکەوتنم.

ئاگادارکردنەوەیەکی تری پێدام، کە زۆر زیرەکانە بوو. "بەڕاستی نیگەرانم بۆت،" وتی. "بە بینینت، ھەموو کەس دەزانێت زۆر خۆشحاڵیت. ھاوسەرەکەت تێدەگات، کە شتێك لە گۆڕێدایە."

"ھەوڵی زۆر دەدەم ئەوە بشارمەوە،" وتم.

سەیرێکی کاتژمێرەکەمم کرد، زانیم دواکەوتووم. مودی تا دوانیوەڕۆیەکی درەنگ نەدەگەڕایەوە، بەڵام دەبوو کاتژمێری یەك و چارەك لە ماڵەوە بم، کاتێك مەھتاب لە قوتابخانە دەگەڕایەوە. لەبەرئەوە داوای لێبوردنم کرد و خێرا چوومە سەر شەقامەکە تا ئەو ڕێگا دووردرێژە ببڕم و خۆم بگەیەنمە ماڵەوە.

نزیکەی کاتژمێر و نیوێکم پێچوو، خێرا خۆم گەیاندە ماڵەوە، بینیم مەھتاب لەبەردەمی دەرگای داخراودا، ڕاوەستاوە و فرمێسك بە چاویدا دێتەخوارەوە.

"وامزانی بەبێ من، چوویت بۆ ئەمریکا!" بەدەم گریانەوە وتی.

چەند بە پەرۆشبووم پێیبڵێم، لەکوێ بووم، چی لە گۆڕێدایە! بەڵام دەبوو لە ھەرکاتێکی تر زیاتر وریاتر بم، نەمدەوێرا ئەو مژدەیەی پێبدەم. کاتەکە نیمڕۆ و سبەینێ بوو. ئەویش وەك من، بۆی قورس دەبوو، ئەو خۆشییە بشارێتەوە.

"ھەرگیز بەبێ تۆ ناگەڕێمەوە بۆ ئەمریکا،" دڵنیامکرد و بردمە ژوورەوە. "مەھتاب بە باوکت نەڵێیت، من لە دوای تۆ گەیشتوومەتە ماڵەوە."

بە سەر لەقاندن وتی، باشە. ترسی نەما، بەخێرایی چوو بۆ یاریکردن. کاتێك هەواڵی تازە وڕیکردبووم، کاغەزدکانم لەناو دۆشەکی بە زنجیر داخراوی سەر قەنەفەی ژووری دانیشتنەکەمان شاردەوە و هەوڵمدا ڕێگایەك بگرمەبەر، کە کەفوکوڵی خۆشییەکەم بنیشێنمەوە.

شتێك هات بە خەیاڵمدا و تەلەفونمکرد بۆ ئەلیس.

"پێمخۆشە بۆ جەژنی سوپاس لە ماڵی ئێمە بن،" پێموت. "پێکەوە نانی ئێوارە دروستدەکەین. شەمسی و زاریش دەوەتدەکەین، هەروەها دەمەوێت بە فریشتەت بناسێنم."

ئەلیس یەکسەر ڕازیبوو.

ئەمە زۆر باشە! لە دڵی خۆمدا وتم. لێرە قەلفرپلێدەکەم و خۆشم وا پیشاندەدەم، کــڕکەوتووم.

مودی دوانیوەڕۆیەکی درەنگ گەڕایەوە، لەگەڵ مەزاجێکی باشی مندا بەرەو ڕووبوو.

"من و ئەلیس نانی جەژنی سوپاس دروستدەکەین!" پێمـڕاگەیاند.

"چاکـــــە!" مودی وەڵامیـدایەوە. حەزی لە قەل بوو بۆ نانی ئێواران.

"دەبێت بچین بۆ بازاڕ بۆ کڕینی قەل."

"ئینجا تۆ و ئەلیس، دەتوانن ئەوە ئەنجامبدەن؟"

"بێگــــومان."

"چاکە،" مودی وتی، دڵشادبوو بەوەی ژنەکەی لە مەزاجێکی وا باشدایە و بیر لە داهاتوو دەکاتەوە.

لەو چەند هەفتەیەی داهاتوودا، کاتێك مەهتاب لە قوتابخانە بوو، مودی سەرگەرمی کاری خۆی بوو، من بە وزە و وردیەکی کچێکی چواردە ساڵەوە، ڕاکەڕاکەمبوو بەسەر شەقامەکانی تارانەوە. لەگەڵ ئەلیسدا بازاڕ نەما سەری پیادانەکەین، بەدوای پێکهێنەرەکانی نانی ئێواردی جەژنی سوپاس.

ئەلیس زۆر سەرسامبوو، لە توانایی من بەسەر ڕێگاوبانی تاراندا. ئەویش حەزیدەکرد بچێتە دەرەوە، بەڵام هەرگیز بەتەنیا نەیدەوێرا بۆ هیچ شوێنێك بچێت. پێیخۆشبوو، کلکی من بگرێت و دوام بکەوێت بەناو بازاڕدا، بەدوای قەلی جەژنی سوپاسدا.

زیاتر لە کاژێرێکی برد، تا گەیشتینە جێگای مەبەست. بەژێر تاقێکی گەورەدا ڕۆیشتین، کە دەروازەی بازاڕەکە بوو، چووینە ناو دنیایەك لە هاتوهاوار و کاڵای جۆراوجۆرەوە. چەندەها کۆمەڵە دوکانی یەك لەدوای یەکمان لەپێش بوو لەمبەر و ئەوبەری ڕێگاکەوە. بە سەدان فرۆشیار، هاوارهاواری فرۆشتنی کاڵاکانیان بوون. هەر یەك لەمانە لە پێشبڕکێی سەرنجڕاکێشانی ئەو خەڵکانە بوون، کە بەبەردەمیاندا تێدەپەڕین. لەو قەرەباڵغییەدا بارهەڵگرەکان بە خۆیان عەرەبانەکانیانەوە بە هاوارهاوار و جنێودان

ڕێگای خۆیان دەکردەوە. ئەففانییەکی زۆری لێبوو، پانتۆڵ دڕاو و چرچ لە ناوقەد هەڵکراو، لە ژێر باری زۆر قورسدا پشتیان چەمابۆوە.

"ڕێگایەك دێتەوە سەر ئەم ڕێگا سەرەکییە، هەموو خواردنێکی تیادا دەستدەکەوێت،" بۆ ئەلیسم باسکرد. "ماسی، مریشك، قەل - هەر خواردنێك لە ناو بازاڕدا ببێت."

لەنێو هەڵاوی عارەقی قەرەباڵغی و هاتوهاواری گوێچکەکونکەردا، ڕێگای خۆمان کردەوە، تا ئەو لاڕێگایەی کە بۆی دەچووین. سەرئەنجام گەیشتینە ئەو دوکانە، کە چەند قەلی بچوکی سەربڕاوی هەبوو، بە سەردا هەڵیواسیبوون، بەڵام هەر ئەوانە دەستدەکەوتن. قەلێکی پێنج کیلۆیم دەویست، بەڵام هەرە قورسەکەیان سێ کیلۆ بوو. "دەتوانین گۆشتی گای برژاو ئامادەبکەین،" ئەلیس پێشنیاریکرد. لەبەرئەوە قەلەکەمان کڕی و کەوتینەوە ڕێ بۆ ماڵەوە.

ماوەیەکی زۆر وەستاین بۆ تەکسی پرتەقاڵی. چەند دانە بەلاماندا تێپەڕین، بەڵام هەموویان پڕبوون، ئەو ڕێگاوبانە قەرەباڵغترین بەشی شار بوو. قورسی قەلەکە ئازاری بە قۆڵم دەگەیاند. لە کۆتاییدا تەکسییەك بۆمان وەستا. کورسییەکانی دواوە پڕبوون، ناچار چووینە پێشەوە. ئەلیس لە پێش منەوە سواربوو.

کە دیمەنی ئەو شارە بێزارکەرە بە بەرچاومدا تێدەپەڕی، نوقمی خەیاڵاتی خۆم بووم. دەزانم، هەرگیز ئەم قەلە بە دەستی من لێنانرێت. لەجیاتی ئەوە، یارمەتی دایکم دەدەم بۆ ئامادەکردنی نانی نێوارە، کە من مەهتاب بۆ هەتاهەتایە سوپاسگوزاردەبین.

"*موتەشکریم ئینجاسرا*" بە دەنگی ئەلیس هەتامەوە سەرخۆم. "ئێرە، تکایە!" بە شوفێرەکەی وت.

"ئەمە ئەو شوێنە نییە کە ..." وتم.

تێگەیشتم چی ڕوویداوە، کاتێك ئەلیس پاڵی پێوەنام بۆ دەرەوە. تەکسییەکە ڕۆیشت. "باوەڕناکەیت ئەو شوفێرە چی پێکردم،" ئەلیس وتی.

"باوەڕدەکەم. لە منیش ڕوویداوە. پێویست ناکات بە هاوسەرەکانمان بڵێین، تووشی چی بووین، ئەگینا ڕێگامانناداەن بە تەنیا بچینە دەرەوە."

ئەلیس بە سەر لەقاندن، ڕەزامەندی خۆی بەیانکرد.

هەرگیز نەمانبیستبوو، ئەم بێڕێزییە لە ژنانی ئێرانی ڕووبدات و بۆمان پرسیاربوو، کە چەقبوونەوەی میدیای ئێرانی لەسەر چەوۆکی ڕاژەی جیابوونەوەی ژن و مێرد، ئاکامەکەی نابێت بەوەی کە پیاوانی ئێرانی ئێمە بە حەشەری بزانن.

تەکسییەکی ترمان ڕاگرت و چووینە کورسییەکانی دواوە.

لە ماڵەوە چەند کاژێرم بە پاککردنەوە ئەم باڵندە لەڕە بردەسەر، هەموو پەڕەکانیم بە مووکێش دەرهێنا، پێش ئەوەی بیخەمە ناو فرێزەرەوە.

چەند جاری تر پێویستبوو بچم بۆ بازاڕ. هەندێك جار ئەلیسم لەگەڵ بوو، کە لە پێش نیوەڕۆدا دەمگەیاندەوە ماڵەوە. هەر لە یەکەم جارەوە پێموت، "ئەگەر مودی

پرسياريكرد، دەڵێت لە پاش بازاڕكردن هاتووم بۆ ماڵی ئێوە بۆ قاوەخواردنەوە و نزيك كاتژمێری يەك چوومەتە دەرەوە." ئەليس سەيری پێهات، بەڵام سەری لەقاند و پرسيارينەكرد. لەو جارەوە وا چاوم لێدەكرد، كە لە "ماڵی ئەليسم" كاتێك چنگ لەسەر شان خۆم دەكردەوە بە ناو شاری قەرەباڵغدا.

زۆر جار لە ماڵی ئەليسەوە دەچووم بۆ دوكانەكەی حەميد و لەوێوە زياتر تەلەفونم دەكرد بۆ ئاماهل. كە پێويستبوو چەند جار لەسەر وردەكاری هەڵهاتنەكەم گفتگۆبكەين. هەر خۆشبين بوو، كە جەژنی سوپاس نزيكدەبۆوە.

بەڵام حەميد رەشبين بوو. كاتێك ئەم نهێنييە خۆشەم بۆ ئەم كۆنە هاوپيلانبازە دركاند، پێيوتم، "نـــا، باوەڕناكەم. تۆ لێرە دەمێنيتەوە تا نيمام مەهدی دەگەڕێتەوە."

بە رۆژ ڕاكەڕاكە لە پەلوپۆی دەخستم، ئێوارانيش لەگەڵ موديدا، دەبوو شانۆگەرييەكی سەير لە خۆم پيشانبدەم، كە لە توانای ئينساندا نەبوو. نەدەبوو مودی بزانێت هيلاكم، تا بوارێك بۆ گومانكردن نەمێنێتەوە. چێشتلێنان، ماڵ پاككردنەوە، چاودێريكردنی مەهتاب - ئەو كارە ئاساييانەی ژيانی ڕۆژانە - دەبوو ئەنجامبدرێن. ئينجا كە شەو دەهات، سەختبوو خەو بچێتە چاوم، هەر بە جەستە لە ماڵەوە بووم، وەكی تر هەموو خەياڵم لە ئەمريكا بوو.

لە بەنداوێكی بە چاونەبينرا و قوڵەوە، هێزم وەردەگرت تا بەرگەبگرم.

ئەليس پشتيوانێكی هەتاسەر بوو، لەگەڵ ئەوەی هيچی نەدەزانی لەبارەی ژيانی نهێنيمەوە. ڕۆژێكيان لە بازاڕ قسە هاتەپێشەوە و وتم، "بەڕاستی حەزدەكەم تەلەفون بۆ خێزانەكەمان بكەم. لە ناخی دڵەوە بيرياندەكەم."

ئەليس دەيزانی، مودی ڕێگانادات لە ماڵەوە تەلەفونبكەم. خۆشی هاوسەرەكەی ڕێگاينەدەدا تەلەفون بۆ كاليفۆرنيا زۆر بكات، چونكە پارەيەكی زۆری تێدەچوو. بەڵام ئەليس پارەی خۆی هەبوو، كە لە وانەوتنەوەی زياتری ئينگليزی دەستی دەكەوت و هەندێك جار بەشێك لەم پارانەی بەكاردەهێنا بۆ تەلەفونكردن بەبێ ئەوەی بە كەسێك بڵێت. "دەبێت بتبەم بۆ *تۆپ خانە*[8]،" ئەليس وتی.

"*تۆپ خانە* چييە؟"

"كۆمپانييای تەلەفونە. لە خوارەوەی شار، نزيكی بازاڕ. يەكسەر دەبێت پارە بدەيت، بەڵام دەتوانيت بۆ ماوەيەكی زۆر لەوێوە تەلەفونبكەيت."

زانيارييەكی باش بوو. لە هەتاو نەمخستە سێبەر، بۆ ڕۆژی دوايی، بەناوی كڕينی كەرەوزەوە بۆ ناوناخنينی قەل بۆ جەژنی سوپاس، من و ئەليس چووين بۆ ناوشار بۆ *تۆپ خانە*. كاتێك ئەليس بۆ خێزانەكەی لە كاليفۆرنيا تەلەفونيدەكرد، من لەگەڵ دايكمدا دەدوام لە بارەی باوكمەوە لە مەشيگان.

"شوێنێکم دۆزیوەتەوە، دەتوانم تەلەفونی لێوە بکەم،" وتم. "باشتریکە لەوەی لە باڵوێزخانەوە تەلەفونتان بۆ بکەم، هەروەها مەترسی کەمترە لەوەی بۆ ماڵەوە تەلەفونم بۆ بکەن. لەمەودوا زیاتر تەلەفونتان بۆ دەکەم."

"هیوادارم بتوانیت،" دایکم وتی.

"دیارم هەیە بۆ نێوە،" پێمڕاگەیاندن. "من و مەهتاب لە جەژنی سوپاسدا لە ماڵەوە دەبین!"

تێبینییەکان:

1. manipulation treatment.

2. ڕێنما (ڕێنمای چۆنییەتی دروستکردن و لێنانی خواردن)، ڕەچەتە: recipe.

3. دڵنیانیم لەوەی ترشیاتی خەرتەلە بە واتای mustard دێت. بەڵام mustardجۆریکە لە خواردن وەك لیتەی ترشیات وایە.

4. کریپیسی مریشك: chicken crepes. ڕانی مریشکە بە شێوەیەکی تایبەت سووردەکرێتەوە.

5. پێشژەم: entree. بەو خواردنانە دەڵێن کە پێش ژەمی سەرەکی دەخورێن.

6. بروسێل سپرۆت: brussels sprout. جۆرێکە لە سەوزە لە شێوەی کەلەرمی بچوك، بە فارسی دەبێت بە کلم فندقی.

7. لیك: leek. جۆرێکە لە پیاز و تامی لە کەوەرەوە نزیکە، بە فارسی دەبێت بە، بیازچە - ترە فرهنگی.

8. موخابەراتی تۆپ خانە: شوێنی تەلەفونی گشتییە لە تاران. تۆپخانە ناوی ناوچەکەیە.

# 21

"قسە مەکە،" ئاماهل وتی. "تەنیا لەویانەدا دانیشە. هیچ شتێك مەڵێ."

چۆنی وت بەقسەمکرد، بەبێ جوڵە لەسەر کورسییەکە مامەوە. ئاماهل ڕۆشت، دەرگای ژوورەکەی کردەوە و چەند وشەیەکی فارسی لەژێر لێوەوە وت.

پیاوێکی ڕەشی باڵابەرزی بەخۆ، هاتە ژوورەوە و لە بەردەممدا خۆی خەریککرد. لە دەموچاوم وردبۆوە، هەوڵیدا نیشانەکانی بخاتە مێشکی خۆیەوە. وا هات بە خەیاڵمدا، *ڕووسەری*یەکەم لابەرم تا هەموو دەموچاوم ببینێت، بەڵام بڕیارمدا لە قسەی ئاماهل دەرنەچم. نەمزانی ئەو پیاوە کێیە، نەشمویست بیرەنجێنم.

بۆ یەك دوو خولەك مایەوە، پاشان بەبێ ئەوەی شتێك بڵێت، ڕۆیشت. ئاماهل لە پشت مێزەکەیەوە دانیشت، هیچ قسەیەکی تری لە بارەی ئەم پیاوەوە نەکرد.

"کەسێکم ناردووە بۆ بەندەر عەباس بۆ ئامادەکردنی بەلەمێکی خێرا،" وتی. "چاوەڕوانی هاتنەوەی دەکەم بۆ تاران. هەروەها لە هەوڵی ئامادەکردنی بلیتی فڕۆکە دام بۆ بەندەر عەباس. لەهەمان سەفەری فڕۆکەدا، کەسانی ترمان دەبێت لەگەڵت، بەڵام تۆ نازانی کێن، لەگەڵت دانانیشن."

ئاماهل گەشبین بوو، بەڵام من جێگام بەخۆم نەدەگرت. شتەکان بە خاوی دەچوونە پێشەوە. کات واتایەکی زۆر نەبوو بۆ ئێرانییەکان، کەم شت بەپێی نەخشە دەچووە پێشەوە. هەرچی چۆنێك بوو، ڕۆژان هات و ڕۆژان چوو. پێماننایە ڕۆژی دوو شەممەی پێش جەژنی سوپاس، ئیتر دەمزانی من و مەهتاب ناتوانین جەژنی سوپاس لە مەشیگان بکەین.

"لەوانەیە بۆ کۆتایی هەفتە بگەنە ئەوێ،" ئاماهل وتی، وەك ئەوەی دڵنەوایی من بکات. "یان کۆتایی هەفتەکەی تر. تا ئێستا هەموو شتێك تەواونەبووە. تا هەموو شتێك تەواونەبێت، ناتوانم هەروا دەستان پێوە بنێم."

"دەبێت بەچی، ئەگەر ئەم شتانە هەر تەواونەبوون؟"

"نیگەران مەبە، پلانی تریشم بەدەستەوەیە. کەسێکم ناردووە بۆ بینینی سەرۆك خێڵێك لە زاهیدان، لەوانەیە بتوانین لە پاکستانەوە دەرتانبکەین. هەروەها لەگەڵ پیاوێك، کە ژنێك و کچێکی هەیە وەك تۆ و مەهتاب، کەوتوومەتە قسەکردن. لە هەوڵی ڕازیکردنیدام تا ئێوە بەرێت، لە جیاتی ژن و کچەکەی خۆی، بە فڕۆکە بۆ توکیۆ یان ترکیا یان هەر شوێنێکی تر. پاشان کە دەگەڕێتەوە، کابرایەك هەیە پارەی دەدەمێ تا پاسپۆرتەکەی بۆ مۆربکات، کە خێزانەکەی لەگەڵی گەڕاونەتەوە."

ئەمەیان پێدەچوو پڕ مەترسی بێت، چونکە نەمدەزانی کە ئایا دەتوانم لە ژنێکی ئێرانی بچم. وێنەی پاسپۆرتی ژن، وەك خۆی عەبای بەسەردەیە بۆ شاردنەوەی دەموچاوی. وە ئەگەر پۆلیسی کۆنترۆڵ هەر پرسیارێکم لێبکات، تێدەکەوم.

"تکاتلێدەکەم خێرابکە،" بە ئاماهلم وت. "کات بە فلازانجی من نییە. زۆر پەرێشانی بینینی باوکمم. دەمەوێت پێش ئەوەی بمرێت لە ئەمریکا بم. زۆر ئارامدەبێتەوە، ئەگەر بزانێت ئێمە بە ڕێگاوەین بۆ ماڵەوە. تکاتلێدەکەم، هەوڵبدە زوو ڕێگایەکەمان بۆ بدۆزەرەوە."

"بەڵێ باشە."

گرتنی جەژنی سوپاس لە ئێراندا ئەزمونێکی تاڵ بوو، بەتایبەتی پاش ئەوەی کە بە کەسوکارم وتبوو، من و مەهتاب لەو کاتەدا لە ماڵەوە دەبین. زۆر باشبوو، کە ئەمەم لای مەهتاب نەدرکاندبوو!

ئەو بەیانی پێنج شەممەیە، بە خەمۆکییەکی قورسەوە لە خەو هەڵسام. دەبێت لەم ڕۆژەدا سوپاسی چی بکەم؟

بۆ بەرزکردنەوەی وردم یان گوزەراندنی ئەو ڕۆژە، نیشتمە سەر ئامادەکردنی نانخواردنی ئێوارە و هەوڵمدا ئەو قەلە سیسە، بکەم بە ژەمێك خواردنی بێوێنە.

مەزاجم ئاهێکی تێکەڕا، بە گەیشتنی هاوڕێکانم لە دوانیوەڕۆدا. مەمنونیان بووم کۆمەڵێك هاوڕێی ڕێکوپێك، کەسانێکی خۆشەویست، کە بە ژیانێکی نوێباو دەگەشانەوە، ئینسانگەلێك دوور لە هەلومەرجی جیاوازی لەدایکبوونیان، زۆر زیاتر ئەمریکایی بوون تا ئێرانی. هەموو پێکەوە لە ماڵی ئێمەدا کۆبووبوونەوە بۆ گێرانی مەڕاسیمێکی بێوێنەی ئەمریکی. شەمسی و زاری، ئەلیس و فریشتە - چەند دڵم پێیان دەکرایەوە، بەڵام زیاتر دڵم بە ماڵەوە دەکرایەوە.

بەڵام پاش نانخواردن خەمۆکی دایگرتمەوە، پاش ئەوەی شیرینیمان خوارد. مودی گەڕایە دواوە بۆ سەر کورسییە تایبەتییەکەی خۆی، هەر دوو دەستی خستە سەر ورگی و کەوتە خۆڕاژاندن و چۆرتلێدان، دەتوت نە بای دیوە و نە باران، وەك ئەوەی هەر ئەو نەبووبێت، لە ماوەی ئەو ساڵ و نیوەدا چ گۆڕانکارییەك لە هەلومەرجی ژیانیدا ڕوویداوە. چەند ڕقـــــم لەو جانەوەرە نوستووە دەبۆوە! چەند پەرێشـــــانی بینینی دایك و باوکم، جۆی و جۆن بـــــووم!

ئاشکرابوو لە سێ شەممەدا، مودی لە نەخۆشخانە کاردەکات، جیمی برام لە ئەمریکاوە تەلەفونی بۆ کردم. بۆی گێڕامەوە، کە چۆن باری دەروونی باوکم بە شێوەیەکی پێشبینینەکراو باشبووە، کاتێك من بەڵێنم پێداوە، کە لە جەژنی سوپاسدا لەگەڵ مەهتاب لە ماڵەوە دەبم.

"سێ ڕۆژ لەسەریەک، لە جێگا هاتە دەرەوە و بە ناو ماڵەکەدا پیاسەیکرد. هەتا چووە دەرەوە بۆ ناو باخەکە."

"ئەی ئێستا چۆنە؟"

"لەبەرئەوە تەلەفونت بۆ دەکەم. کاتێك زانی، بۆ جەژنی سوپاس نەتانتوانی بێنەوە، خەمباری دایگرت و تا دێت خراپترش دەبێت. پێویستی بەوەیە هیوایەکی پێبدرێت. ئایا دەتوانی دووبارە تەلەفونی بۆ بکەیتەوە؟"

"ئاسان نییە،" بۆم باسکرد. "ناتوانم لێرەوە تەلەفونبکەم، چونکو کە لیستی حسابی تەلەفونمان بۆ هاتەوە، مودی پێیدەزانێت. دەبێت بچم بۆ شوێنێك لە خوارەوەی شار، ئەوەش وا ئاسان نییە، بەڵام هەوڵدەدەم."

"ئایا دەتوانن بەم زووانە بگەڕێنەوە؟" پرسیاریکرد.

"خەریکی پلانی خۆمانین، بۆئەوەی پێش کریسمس بگەینە ماڵەوە. بەڵام باشترە، بەڵێن بە باوکم نەدەم، کە لەوێ دەبم."

"چاکە، تا ئەو کاتەی دڵنیادەبیت،" جیم ڕازیبوو.

تەلەفونەکە غەمباریـکردم. هەستمکرد، شکستمخواردووە، کە نەمتوانیوە بەڵێنەکەم بەرەمەسەر. کریســـمس! دەی دەی با لە مەشیـــــگان بم، نــــەك لە ئێـــــران.

کریسمس لە ئێراندا بە ڕەسمی ئامادەی پێناکرێت. ئەرمەنییەکی زۆری دانیشتووی تاران، بەو بۆنەوە ئاهەنگی خۆیان دەگێڕن، بەدوور لە ڕۆژانی پشووی مەسیحی، بەڵام ئەو ساڵە ئاگادارکردنەوەیەکیان دابوون بە تەنگەدا. هەر لە سەرەتای مانگی کانوونی یەکەمەوە، میدیای ئێران چیرۆکێکیان لە لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەکانیاندا چاپکردبوو، کە ڕێنوێنی ئەرمەنییەکانیان دەکرد، کە واز لە ئاهەنگ و شتی وا بهێنن. لە ماوەی جەنگی پڕ ناخۆشی و شیوەنگێراندا جێگایەك بۆ خۆشی و ئاهەنگگێڕان نەمابۆوە، چونکە ئایەتوڵا فەرمووبووی.

مودی گوێینەدا بەم فەرمایشتە. ئەو خەریکی کاروباری کلینیکی خۆی بوو، ئەو حەزەی جارانی نەمابوو بە سیاستکردن لە ئێراندا، بڕیاریدابوو ئاهەنگێکی خۆشی کریسمس بۆ کچەکەی بگێڕێت.

بۆ خۆخەریککردن و دوورخستنەوەی سەرنجی مودی لە هاتوچۆی زیاترم بۆ ناو بازاڕ، سەرمکردە سەر شتکڕینی کریسمس.

"لێرە، مەهتاب بوکەشوشەی زۆری نییە،" بە مودیم وت. "دەمەوێت کریسمسێکی ڕازاوەی بۆ دەستەبەربکەم. بە نیازم شتی زۆری بۆ بکڕم بۆ یاریکردن."

ڕازیبوو، ئیتر نزیکەی هەموو ڕۆژێك شتکڕین بوو، هەندێك جاری هەر خۆم بووم، هەندێك جاری تر پەلی ئەلسیم دەگرت و دەمبرد. لە یەکێك لەو هاتوچۆیانەدا بوو لەگەڵ ئەلیسدا، کە تەواوی پێش نیوەڕۆمان لە بازاڕ بردەسەر و دوایی بە پاس گەڕاینەوە. ئەلیس

نزیکی ماڵی خۆیان هاتەخواردوە، منیش چەند شەقامێك ئەو لاوەتر دادەبەزیم. سەیری کاتژمێرەکەمم کرد، زانیم فریادەکەوم بێمە خواردوە، تەکسییەکی پرتەقاڵی بگرم، لە سوچی شەقامەکەی نزیك گەڕەکی خۆمان دابەزم و مەهتاب لە شوێنی وەستانی پاسەکەی ببینم.

لەپڕ دەنگی شاوری ئاگادارکردنەوە پەیدابوو. شاوری ئاگادارکردنەوە بەشێك بوو، لە دیمەنی شەقامەکانی ئێران، هەتا ئەوەندە لە ژیانی ئەو خەڵکەدا ئاساییبووبۆوە، کە شوفێرەکان بەگشتی گوێیان پێنەدەدا، بەڵام ئەمجارەیان زۆر بەرزتر و پێداگرانەتر بوو لە ئاسایی. جێگای سەرسامیم بوو، شوفێری پاسەکە لە شەقامەکە لایدا تا ماشینەکانی فریاکەوتن تێپەڕن. چەند ئوتومبیلێکی پۆلیس دەرچوون و بە دوایاندا پیکاپێکی گەورەی سەیر هات، کە کرێنێکی گەورەی پێوە بوو.

"بۆم! بۆم!" ڕێبوارەکان هاواریان لێهەڵسا.

دەستەی بۆم بوون. ئەلین ئەم پیکاپەی لەوەوپێش بینیبوو، بۆی باسکردبووم، یەکسەر ناسیمەوە. ڕۆبۆت بوو، دەیتوانی بۆم هەڵگرێتەوە و بیخاتە ناو سنوقێکی تۆکمەوە لە پشتی پیکاپەکە.

نیگەرانــبووم. بۆمەکە لە شوێنێك بوو لەو دەوروبەرەی گەڕەکی خۆمان.

پاسەکە گەیشتە شوێنی خۆی، خێرا هاتمە خواردوە و تەکسییەکی پرتەقالیم گرت بەرەو لای ماڵی خۆمانەوە. زۆری نەبرد گیرمانکرد لە ناو ترافیکی جامکردوودا. شوفێرەکە جنێویــدەدا بە شوفێرەکانی تر، منیش خەمی کاتەکەم بوو. کە تەکسییەکە چەند ناوچەی بڕی، خەریکبوو شێتــدەبووم. نزیکی کاتی هاتنەوەی مەهتاب بوو لە قوتابخانە. زۆر ترسی لێدەنیشت، ئەگەر منی لە شوێنی پاسەکەدا نەبینیایە و زیاتر زەنەقی دەچوو بە هاتوچۆی پۆلیس لە ناوچەکەدا. دەستەی بۆمەکە لەو نزیکانە بوون.

ترافیکیان بە لاڕێدا برد، کە تەکسییە پێچیکردەوە، پاسەکەی مەهتابم بینی لەپێش خۆمانەوە بوو. مەهتاب لە پاسەکە هاتەخواردوە، بەشپرزەییەوە هەر چاوەچاویبوو. سوچی شەقامەکە ئوتومبیلێکی زۆری پۆلیسی لێکۆبووبۆوە و خەڵکێکی کونجکاویش تەماشایاندەکرد.

چەند ڕیاڵێکم کردە دەستی شوفێرەکەوە، بە پەلە هاتمەخواردوە و ڕامکرد بەرەو مەهتاب. جامکردنی ترافیك لەو ناوەدا، نیشانەی نزیکبوونی شوێنی بۆمەکە بوو.

دەست لەناو دەست بەرەو ماڵ ڕامانکرد، کە گەیشتینە سوچی کۆڵانی خۆمان، پیکاپە گەورەکەم لەو سەرەوە بینی ڕاوەستابوو، کەمتر لە سەد مەترێك لە ماڵی ئێمەوە دووربوو.

نەمانتوانی تەماشاینەکەین. هەر لەو ساتەدا ئەو قۆڵە ئاسنییە گەورەیەی ڕۆبۆتەکە، سندوقێکی بەرزدەکردەوە لە ئوتومبیلێکی پەیکانی زەرد، کە لە قەراغی شۆستەکە پارککرابوو. سەرەڕای گەورەیی ڕۆبۆتەکە، کەچی لەگەڵ بومەکەدا بەوریاییەوە دەجووڵایەوە، بەهێواشی هەڵیگرت و خستییە ناو سندوقێکی ئاسنەوە لەپشتی پیکاپەکە.

لە چەند خولەکەدا تاقمی بۆمەکە ڕۆیشتن. پۆلیسەکان دەوروخولی پەیکانە زەردەکەیان دا، بەدوای شتێکدا دەگەڕان کە پیشانیبدات، بۆمەکە لە کاری *منافقین*ە، هێزە نەیاردەکانی حکومەتی خومەینی.

ئەمە بۆ پۆلیس ڕووداوێکی ئاسایی بوو. بەڵام بۆ من وەبیرهێنەرەوەیەکی سامناک بوو، کە ژیانمان لە تاراندا لە چ تالوکەیەك دایە. دەبوو خۆمان لەم دۆزەخە ڕزگاربکەین، زۆر زوو پێش ئەوەی دنیا بەدەورماندا بتەقێتەوە.

بە مودیم وت، زۆربەی زۆری دیارییەکانی کریسمسم لە بازاڕ کڕیوە، بەڵام ئەم قسەیە نیوەی ڕاست بوو. کۆمەڵێك دوکان هەبوون نزیکی ماڵی خۆمان، کە دەمتوانی کۆمەڵێك شتی بەخێرایی لێبکڕم. ئەو کاتەی کە بەو شێوەیە بۆم دەمایەوە، پێیدەچووم بۆ لای ئاماهل و دەگەڕامەوە. هەر ئەوەندە کاتی پێدەچوو، کە ئەو کۆمەڵە شتانەم لە بازاڕدا بکڕیایە.

ڕۆژێکیان بازاڕێکی زۆرم کرد بۆ مەهتاب، بەڵام بردم بۆ ماڵی ئەلیس، لە جیاتی ئەوەی بیبەم بۆ ماڵەوە.

"بێزەحمەت، با ئەم شتانە لە ماڵی ئێوە بێت،" وتم. "وردەوردە لێیان دەبەمە ماڵەوە."

"باشە،" ئەلیس وتی. خۆی بە هاوڕێیەکی نزیکی من دەزانی و هیچ پرسیارێکی لەو بارەوە نەکرد. بەڵام ئەلیس ژنێکی زۆر زیرەك بوو، توانایییەکی لە ڕادەبەدەری هەبوو بۆ پەیبردن بە کەسایەتی کەسەکانی دەوروپشتی. دەیزانی، ئێرانم پێخۆش نییە و بۆ خۆشی حەزی لە چارەی مودی نەدەکرد. بێگومان ئەلیس چالاکییە نهێنییەکانی منی بۆ پرسیاربوو. لەوانەیە وا بۆی چووبێت، کە پەیوەندییەکی نهێنیم هەیە.

لەوانەیە ئەمە تا ئاستێك وا بووبێت. هیچ پەیوەندییەکی فیزیکی لە نێوان من و ئاماهلدا نەبوو. خێزانی خۆیی بۆ گرنگ بوو، منیش هەرگیز هیچ شتێکم نەکرد، ئەم پەیوەندی هاوسەرایەتییە بکەوێتە مەترسییەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا پیاوێکی سەرنجڕاکێش بوو، هەم لە ڕووی فیزیکییەوە و هەم لە ڕووی لێهاتووییەوە، هەروەها لە ناخی دڵییەوە چاودێری من و مەهتاب بوو. بە هۆی ئەوەی هەر دوو لامان بەدوای یەك مەبەستەوە بووین، لە یەکترییەوە نزیك بووین. ئاماهل نەك مودی ئەو پیاوە بوو لە ژیانمدا. بە بەردەوامی بیرملێدەکردەوە. پاش ئەوەی کە بێهیوا بووین بە جەژنی سوپاس، دڵنیایکردم کە من و مەهتاب بۆ کریسمس لە ماڵەوە دەبین.

دەبوو باوەڕی پێبکەم، ئەگینا تێکدەچووم. ڕۆژانی سەرقاڵی بە هێواشی تێدەپەڕین، بەبێ ئەوەی نیشانەیەك لە هەنگاوی گەورە دیاربێت بۆ پلانەکەمان.

ڕۆژێکیان بە ماوەیەکی کەوت، پاش ڕۆیشتنی مەهاب بۆ قوتابخانە و چوونی مودی بۆ نەخۆشخانە، خێرا ڕۆشتم بۆ دوکانەکەی نزیك ماڵی خۆمان. ڕۆژی شیرفرۆشتن بوو، دەمویست ئەو شتانەی دەمەوێت زوو بیانکڕم، پێش ئەوەی تەواوبن. بەڵام کە لە کۆڵانی خۆمانەوە چوومە سەر شەقامی سەرەکی، لەپڕ لە جێگای خۆم وشکبووم.

چەند لۆری *پاسدار* دروست لەبەردەم ئەو دوکانە و دوکانی سەوزە و گۆشتفرۆشەکە پارکیانکردبوو. *پاسدارانی* تریش بە جلوبەرگی سەربازییەوە لەسەر شۆستەکە ڕاوەستابوون، لوولەی چەکەکانیان کردبووە هەر سێ دوکانەکە. لە کاتەدا، پیکاپێکی گەورە هات و لە تەنیشت لۆرییەکانەوە ڕاوەستا.

نەمدەویست توشم ببێت بە توشیانەوە، گەڕامەوە و خێرا ڕۆیشتم. تەکسییەکی پرتەقاڵم ڕاگرت و چەند شەقام ئەولاتر چووم و بازاڕی خۆمم کرد.

کە گەڕامەوە لای سوچی کۆڵانی خۆمانەوە، لە دووردوە بینیم پاسدارەکان شتومەکی دوکانەکان دەهێنن دەرەوە و لە پیکاپە گەورەکەی باردەکەن. خێرا دوورکەوتمەوە بەرەو ماڵەوە.

کە گەیشتمە ماڵەوە، دەربارەی ئەو بەزمەی کە بەسەر ئەو دووکانە هێت لە مەلیحەی دراوسێمان پرسی، مەلیحە لە بێئاگایی خۆی شانی هەڵتەکاند. کە پیاوی خۆڵەکە سەرچاوەی زانیاری هەموو دراوسێکان بەو ناوەدا هات، مەلیحە پرسیارێلێکرد. ئەو زانیاردی هەیبوو، پێیداین کە پاسداران دەستیانگرتووە بەسەر تەواوی شتومەکی هەر سێ دوکانەکەدا.

کونجکاوی و خەمخۆریم بۆ ئەو سێ دوکاندارە، وایلێکردم دوای ئەمە بکەوم، بزانم چییە. کە دڵنیابووم دروست خۆم پێچاوەتەوە، بڕیارمدا بچم بۆ بەردەم دوکانەکان و بزانم چی ڕوویداوە. ئاغا ڕەزا لە دەرەوەی دوکانەکەی ڕاوەستابوو کە نزیکبوومەوە، بە خەمبارییەکی زۆرەوە تەماشامکرد، هەرچی شتومەك لە دوکانەکەیدا بوو تاڵانیانکردبوو.

"شەرم دەویست،" بە فارسی پێموت.

*"نیستش،"* وەڵامیدامەوە. "هیچ شتێکمان نییە." پاشان شانی هەڵتەکاند، ڕاوەستاوی و ئارامی پێوە دیاربوو، لەبەرامبەر ڕاوڕوتی حکومەتی دز و جەردەدا. *"تەمام،"* بەدەم هەناسە هەڵکێشانەوە وتی. "تەواوبوو."

چووم بۆ لای دوکانی سەوزییەکە، بینیم پاسدارانێکی زۆرتر خەریکی بارکردنی سەوزە و میوەن بۆ ناو پیکاپەکانیان. لە دوکانەکەی تەنیشتیشی، خەریکی بارکردنی گۆشت بوون.

بۆ ڕۆژی دوایی، کاتێك مودی لە کار گەڕایەوە، بۆم باسکرد، کە چۆن هەر سێ هاوڕێ دوکانەدارەکانمان بێکاروکاسبی کراون، کەچی وتی، "دەبێت شتی قاچاغیان فرۆشتبێت، ئەگینا شتی وا ڕوونادات."

مودی بۆچوونێکی سەیری دەربڕی. ئەویش وەك هەر کەسێکی تر بەدوای بازاڕی ڕەشەوە بوو، کەچی کەتبووە پارێزگاریکردنی کاری سزادانی حکومەتەکەی لەبەرامبەری دوکاندارانی پێشێلکەردا. لەو باوەڕەدا بوو، کە پاسداران ماڤ خۆیانە ئەو دوکانانە تالآنبکەن.

ئەم ڕووداوە مەهتابی غەمبارکرد، چونکە ئەویش خەریکبوو دەبوو بە هاوڕێ لەگەڵ هەر سێ دوکاندارەکەدا. ئەو شەوە و بۆ چەند شەوی دواتر، دوعای بۆ دەکردن، "خوایە شتێك ڕووبدا تا ئەو خەڵکە دوکانەکانیان بکەنەوە. زۆر باشبوون بۆ ئێمە. خوایە تۆش باشبە لەگەڵیان."

قەسەلۆك بڵاوبۆوە، کە حکومەت ئەو دوکانانە دەکات بە نۆفیس، بەڵام دوکانەکان هەروا بە بەتاڵی مانەوە. ئەو ئێرانییە باشانە بەبێ هیچ هۆیەکی ڕۆشن، هەروا بێکار مابوونەوە. هۆکەی هەرچی شتێك بووبێت، ئەمە ئەوەی نەدەهێنا *پاسداران* ئەو کارە بکەن.

هەفتە دەهات و دەڕۆیشت. ڕۆژانە تەلەفونم بۆ ناماهل دەکرد و هەرکاتێکیش بمتوانیایە لە نۆفیسەکەی سەردانمدەکرد، هەمیشەش وەڵامەکەی یەك شت بوو. هێشتا چاوەڕوانی تەواوبوونی وردەکارییەکانین.

تۆ بڵێیت ئەمانە هەمووی *تەعاروف* بن، هەندێك جار گومانم تێدەکەوت.

"بۆ سەری ساڵی تازە لەماڵەوە دەبن، ئەگەر بۆ کریسمس نەکرا،" ناماهل وتی. "لەسەر هەموو شتێك کاردەکەم، چەند خێرا بتوانم. ڕۆژێك دێت، هەموو شتێك تەواوببێت. ئارامبگرە."

گفتی وەهام زۆر جار بیستبوو، هەر لە یەکەم جارەوە کە هێلینم لە باڵوێزخانە بینی، هەر لە یەکەم دانیشتنەوە کە لەگەڵ ناماهل بووم. ئامۆژگارییەك بوو، کە تا دەهات قبوولکردنی سەختتر دەبوو.

پلانێکی تر هاتەکایەوە لەپاڵ پلانەکانی تردا. ناماهل پەیوەندیکردبوو بە پۆلیسێکی کونترۆڵی فڕۆکەخانەوە، کە ڕازیبووبوو ڕەسمییەتبدات بەو پاسپۆرتە ئەمریکییانەی کە لەڕێگەی باڵوێزخانەی سویسراوە وەرمانگرتبوو. ڕێگامان پێدەدات، سەرکەوینە ناو ئەو فڕۆکەیەوە، کە بەیانی هەموو ڕۆژانێکی سێ شەممە  ئەو ڕۆژانەی مودی لە نەخۆشخانە کاریدەکرد  سەفەری بەرەو تۆکیو هەبوو. ناماهل لە هەوڵی ئەهێشتنی کێشەی ئەخشەی کاتدا بوو. ئەو پۆلیسە بەیانیانی ڕۆژی سێ شەممە، کاتی ئیش ئەو نەبوو، هەوڵیدەدا لەگەڵ یەکێکی تردا ئەو کاتەی لەگەڵ بگۆڕێتەوە. پلانەکە لەوە دەچوو گونجاو بێت، بەڵام لەو باوەڕەدا بووم، پڕ مەترسییە بۆ پۆلیسەکە.

"لەبارەی بەندەر عەباسەوە چی؟" پرسیارمکرد.

"لەسەری کار دەکەین،" ناماهل وتی. "ئارامبگرە."

بێنومێنیم تەواو پێوە دیاربوو. فرمێسك بەسەر ڕوومەتەكانمدا جۆگەلەی بەست.
"هەندێك جار دێمە سەر ئەو باوەڕەی، كە هەرگیز لێرە ڕزگارماننابێت،" وتم.
" نا، وا نییە،" دڵنیایكردم. "ئێمەش ڕزگارماندەبێت."
سەرەڕای ئەوەی متمانەم بە قسەكانی هەبوو، بەڵام هێشتا دەبوو بكەومەوە ڕاكەڕاك بەسەر شەقامەكانی تاراندا، بگەڕێمەوە بۆ لای مێردەكەم.

وام لێهات، لە هەموو شتێكی بچوكی ڕۆژانەی دەوروپشتم، كەللەییدەبووم.
دوانیوەڕۆیەكیان مەهتاب تەماشای بەرنامەی تەلەفیزیۆنی منداڵانی دەكرد، كە بریتیبوو لە یەك دوو فلیمی كارتۆنی پڕ توندوتیژی و بە دوایدا باسێكی پەروەردەیی ئیسلامی هەستیارانە دەهات. پاش ئەمیش بەرنامەی پزیشكی دەهات، ئەم جارەیان شتێكی پیشاندا، كە جێگای سەرنجی من و مەهتاب بوو. چۆنیەتی پرۆسەی لەدایكبوونی منداڵی پیشانددا، كە بۆ جارێكی تریش واقمورما لە نامۆیی كەلتوری ئێرانی. بەرنامەكە تەواو چۆنییەتی لەدایكبوونی منداڵەكەی پیشانددا. دایكێكی موسڵمان بوو، ئەوانەی خەریكبوون دكتۆری پیاو بوون، كامێرەكە تەواوی لەشی ڕووتی ژنەكەی پیشانددا كەچی سەر، دەموچاو و ملی ژنەكە بە عەبا داپۆشرابوو.

"ناچیت شیر و بسكیت بۆ بابەنوئێل دابنێیت؟" لە مەهتابم پرسی.
"باشە بەڕاستی دێت بۆ ماڵی ئێمە؟ ساڵی پێشوو نەهات." من و مەهتاب لەم بارەوە چەند جار گفتوگۆمان كردبوو، لە كۆتاییدا بەو ئەنجامە گەیشت، كە ئێران ئەوەندە دوورە لە جەمسەری باكوورەوە، زەحمەتە بۆ بابەنوئێل ئەم سەفەرە لەبەرخۆی بنێت.
پێموت، لەوانەیە ئەم كریسمسە گوڕێكی زیاتر بداتە خۆی. "نازانم دێت یان نایەت، بەڵام باشترە شتێكی لە دەرەوە بۆ دابنێیت، بەڵكو ڕێی بكەوێتە ئێرە،" پێموت.
مەهتاب بە قسەیكردم. خۆی كرد بە چێشتخانەدا و كەوتە ئامادەكردنی خواردنی بابەنوئێل. پاشان چووە ژوورەكەی و بە وێنەی بابەنوئێل و هاوسەركەیەوە گەڕایەوە، كە ئەلیس پێیدابوو. "لەوانەیە بابەنوئێل پێشیخۆشبێت وێنەی ژنەكەی ببینێت،" مەهتاب وتی و وێنەكەی لەپاڵ بسكیتەكاندا دانا لەسەر سینییەك.
خۆش و شادی ئێوارەی كریسمس، مەهتابی لە چوونە ناو جێگاوە دواخست. لەكۆتاییدا كە خستمە ناو جێگاوە، پێیوتم، "ئــــەگەر گوێت لە تەپەی پێی بابەنوئێل بوو، تكاتلێدەكەم خەبەرمكەرەوە، چونكە دەمەوێت قسەی لەگەڵ بكەم."
"دەتەوێت چی بە بابەنوئێل بڵێیت؟" پرسیارمكرد.
"دەمەوێت سڵاوی خۆمی پیادا بنێرمەوە بۆ دایەگەورە و بابەگەورە و دەمەوێت پێیانڕاگەیەنم، كە من باشم، چونكە ئەگەر بزانن من باشم، كریسمسێكی خۆش دەبەنەسەر."

گریان قورگمی گرت. بابەنوئێل دەیان دیاری هەبوو بۆ مەهتاب، بەڵام نەیدەتوانی ئەو دیارییەی پێبدات، کە لە هەموویان زیاتر لەلای پەسەندتر بوو. ئەگەر بابەنوئێل بیتوانیایە مەهتابی بپێچایەوە و بیخستایە ناو گالیسکەکەیەوە، ئەگەر ئاسکەکانی بەسەر شاخەکاندا سەرکەوتنایە، لە ئێران بچونایەتە دەرەوە، ئۆقیانوسەکەیان ببڕیایە و بڕۆیشتنایەتە سەر سەربانی ماڵێکی بچوك لە بانیستەری مەشیگان! ئەگەر بابەنوئێل بتتوانیایە بە دوکەڵکێشی ئاگردانەکەدا بچوایەتە خوارەوە و دیارییەکەی لە ژێر درەختی کریسمسدا دابنایە، ئەوسا ئەو پەیامە زیندووە بە دایەگەورە و بابەگەورە دەگەیشت!

لەجیاتی ئەوە، دەبوو کریسمسێکی تریش لە ئێراندا بەرینەسەر، کریسمسێکی تریش بەدوور لە جۆی و جۆن، کریسمێکی تریش بەدوور لە دایك و باوکم.

ئەو ئێوارەیە مودی تا درەنگانێ هەر خەریکی نەخۆش بوو، چونکە کریسمس لە ئێراندا واتایەکی نەبوو. پاش ئەوەی تەواوبوو، داواملێکرد، "با بەیانی مەهتاب نەچێت بۆ قوتابخانە و لە ماڵەوە بمێنێتەوە."

"نـــە ء!" یەکسەر وەڵامیدایەوە. "لە ماڵەوە نامێنێتەوە، تەنیا لەبەرئەوەی کریسمسە." بێدەنگەم لێکرد، چونکە لە وەڵامەکەیدا نیشانەیەك لە ئەڕاندن و خۆڕاپسکاندنی پێوە دیاربوو، کە ترساندمی. لەپڕ هەڵسوکەوتی گۆڕا و شەپۆلێك لە شێتێتییەکەی بۆ گەڕایەوە، وە من نەمدەویست لەبەرامبەریدا ڕاوەستمەوە.

"مەهتاب، با بچین بزانین بابەنوئێل دوێنێ شەو هاتووە!"

مەهتابم بەیانی زۆر خەبەرکردەوە تا دیارییەکانی بکاتەوە، پێش ئەوەی بچێت بۆ قوتابخانە. لە جێگاکەی دەرپەڕی، بە پێپلیکانەکاندا هاتەخوارەوە، تریقایەوە کە بینی بابەنوئێل هەموو بسکیت و شیرەکەی تەواوکردووە. پاشان چاوی بە دیارییەکانی کەوت. مودی پێمانەوە پەیوەستبوو، مەزاجی باشتر بوو لە دوێنێ شەو. لە ئەمریکا حەزی لە کریسمس بوو، ئەم بەیانییەش مایەی بیرەوەرییەکی خۆش بوو. زەردەخەنەیەك گرتی، کە مەهتابی بینی لە ناو دیارییەکانیدا، کەوتۆتە هەوای خۆشی خۆیەوە.

"نـــا باوەڕناکەم، بابەنوئێل ئەم هەموو ڕێگایەی لەبەرخۆی نابێت و هاتبێت بۆ ئێران بۆ بینینی مـــــن،" مەهتاب وتی.

مودی چەند فلیمی لە مەهتاب گرت. پاشان لە کاتژمێری حەوتدا، کە مەهتاب چوو بۆ ژوورەکەی تا خۆی ئامادەبکات، فریای پاسەکەی قوتابخانە بکەوێت، مودی هاواریـــلێکرد، "پێویستـــناکات ئیمڕۆ بچیت بۆ قوتابخانە یان ئەگەر دەچیت، درەنگتر بچۆ."

"نـــا، نامەوێت قوتابخانەم لە کیسبچێت،" مەهتاب وتی. ئەم وەڵامەی، وەك ئەوە وابوو، کە شتێکی زۆر ئاسایی بڵێت، ڕۆشنبوو لە لایەن مامۆستا ئیسلامییەکانییەوە وا قایلکرابوو. حەزینەدەکرد درەنگ بگاتە قوتابخانە و دوایی کێشیبکەن بۆ ژووری بەڕێوەبەر و لەوێ پێیـــبڵێن، بەد. "خراپ."

هاورێکانمان دەوەت کرد بۆ نانخواردنی ئێوارەی کریسمس و هەموومان زۆر بەداخ بووین بۆ فریشتە. فریشتە لە داخدا خەریکبوو شێت دەبوو. هاوسەرەکەی پاش یەك ساڵ زیاتر بەندکردن، ئینجا تاوانباریانکردبوو و سزایاندابوو.

هەتا پاش ئەو هەموو شتەی کە لەم وڵاتە بێسەروبەرەدا بیستبووم و بەچاوی خۆم بینبووم، کەچی بۆم سەختبوو باوەڕ بە گوێی خۆم بکەم، کە فریشتە بەدەم هەنسکدانەوە دەیوت، "بەوە تاوانباریانکردووە، کە *بیرکردنەوەی دژی حکومەتە!*" شەش ساڵ سزای بەندکردنیان بۆ بڕیبۆوە.

مودی هاودەردی خۆی دەربڕی، چونکە وەك من فریشتەی لا پەسەندبوو. بەڵام کاتێك دووبەدوو بووین پێیوتم، "دەبێت تاوانێکی زیاتری کردبێت."

لەگەڵی نەبووم، بەڵام بێدەنگەم لێکرد. بۆمدەرکەوت، کە چەند بۆ مودی گرنگە باوەڕی بە ڕەوایی دادی ئێران هەبێت. بێگومان مودی بیروبۆچوونی دژی حکومەتی نایەتوڵای هەبوو. دەبوو گومانبکات لەم بەسەرهاتە، ئەگینا دەبووە مایەی ترسێکی زۆر بۆ خۆی. مودی ئاشکرا، یاسای لەژێر پێ دەنا، بە کردنەوەی کلینیکی پزیشکی بەبێ مۆڵەت. ئەگەر پیاوێك تەنیا بەهۆی بیرکردنەوەی. شەش ساڵ سزای بەندکردنی بدەن، ئایا دەبێت ئەو کەسەی کارێکی تاوانبارانە دەکات، چ سزایەکی قورسی بدەن.

ڕۆژی دوای کریسمس تەواو سەرقاڵبووم، هەتا هەلێکم بۆ نەمایەوە بیر لە داماوی خۆم بکەمەوە. تێکەڵەیەك لە خزمانی مودی، بەبێ ئاگادارکردنەوە، هاتن بۆ سەردانمان بە دنیایەك دیاری خواردن، جلوبەرگ، شتی ناومال، بوکەشوشە بۆ مەهتاب و چەپکە گوڵێکی زۆر. ئەمە تەواو پێچەوانەی ساڵی ڕابوردوو بوو، هەوڵێکی ئاشکرا بوو لە لایەن کەسوکاری مودییەوە بۆ پیشاندانی ڕەزامەندی خۆیان لە من.

تەنیا ئەندامی خێزانی نزیك کە نەهاتبوو، بابەحاجی بوو، بەڵام شورشەوقی ژنەکەی جێگای بەتاڵی ئەوی پڕکردبۆوە. *"ئەزیـزم! ئەزیـزم!"* هەر پێی نایە ئەمدیو دەرگای حەوشەوە دەستیپێکرد. "خۆشەویستم! خۆشەویستم!"

دیاری نەمابوو لە خۆی بارنەکردبێت - بوکەشوشە و تاوە و قابلەمە، گوڵ و گۆرەوی بۆ مەهتاب، کیسە نایلۆنی زەعفەرانی بێخەوشی گران لە شاری مەشهەدەوە، کیلۆیەك تووترك، ڕووسەرییەکی تازە و جوتێ گۆرەوی گران بۆ من، هیچیش بۆ مودی.

عەمە بزورگ ئاسایی لە زمان نەدەکەوت، سەری زمانی و بنی زمانی هەر من بووم. سووربوو لەسەر ئەوەی لە بەرامبەریدا دانیشم و هەرچی وشەیەك لە دەمی دەهێتە دەرەوە یەکسەر وەریگێڕن. هەموو ڕستەیەکی بە *"ئەزیـزم"* دەستیپێدەکرد و بە هیچ شێوەیەك دڵی ئاوی نەدەخواردەوە، کە چۆن بە شانوباهومادا هەڵبدات. من زۆر باش بووم. هەموو کەسێکی باش حەزی لە منە. شتی زۆر باشی لەسەر من بیستبووە. زۆر کاری باشم کردووە. نمونەی هاوسەر، دایك - خوشکێکی باشم!

نقەنق بەم هەموو پیاهەڵدانە قورسەوە چووم بۆ چێشتخانە، نیگەرانی ئەوە بووم، خواردنەکەمان بەشی ئەم گەلە میوانە چاوەڕواننەکراوە نەکات. هەموو ئەوەی هەبوو، پاشماوەی خواردنی دوێنێ ئێوارەی کریسمس بوو. ئەو پەڕی هەوڵمدا ئەمانە بە جۆرێك سەروبنی بکەم. ئەوەی مابوو مریشك، کەمێك لازانیا، کێکی میوە، سەوزەی جۆراوجۆر لەگەڵ سۆسەکانی، پەنیر و شیرینی بوو.

عەمە بزورگ فەرمانیدا، هەر میوانێك دەبێت تامی هەر یەك لەو خواردنە ئەمریکاییە سەیرانە بکات، چونکە بەدەستی پیرۆزی خوشکەکەی ئامادەکراوە.

لای ئێوارە درەنگ، پاش ڕۆیشتنی میوانەکان، ئاغا و خانم حەکیم خۆیان کرد بە ماڵدا. لەبەر ئەوەی مێزەربەسەر بوو، ئاسایی ئەو سەری قسەی دادەمەزراند. لە ئاینەوە دەستیپێکرد.

"دەمەوێت لە بارەی چیرۆکی کریسمسەوە بدوێم،" وتی. قورئانی هێنا و دەستیکرد بە خوێندنەوەی:

*(ئەی پێغەمبەر) لە کتێبی (قورئاندا) باسی بەسەرهاتی مەریەم یادبکە، کاتێ کە کەنارگیریکرد لە کەسوکاری، شوێنی لە ڕۆژهەڵاتی (بیت المقدس) هەڵبژارد (بۆ خواپەرستی) 16. لەنێوان خۆی و ئەواندا پەردەیەکی رایەڵکرد (تا دوور لە خەڵکی بەسۆزەوە خواپەرستی بکات). ئێمەش جوبرئیلی فریشتەمان نارد بۆ لای، وەك بەشەرێکی تەواو (خۆی خستە بەرچاو) 17. (مەریەم) وتی: من پەنا دەگرم بە خوای میهرەبان ئەگەر تۆ کەسێکی بە تەقوا و لە خواترس نەبیت. 18. (جوبرەئیل) وتی: (مەترسە) من نێردراوی پەروەردگاری تۆم، تا منداڵێکی خاوێنت پێ ببەخشم. 19. (مەریەم) وتی: من چۆن منداڵم دەبێت هیچ بەشەرێك توخنم نەکەوتووە و داوێن پیسیش نیم. 20. (جوبرەئیل) وتی: ئەو قسانە ڕاست و دروستن (بەڵام) پەروەردگارت دەفەرموێت: ئەو کارە لای من ئاسانە (کە بەبێ باوك ئەو منداڵە بهێنمە کایەوە)، تا بیکەمە نیشانە و (معجزە)یەك بۆ خەڵکی، هەروەها ڕەحمەتێکی تایبەتیش بێت لەلایەن ئێمەوە، ئیتر ئەو کارە ئەنجامدراوە و بڕیاری لەسەر دراوە. 21. دەستبەجێ (مەریەم) سکی پڕ بوو، (بەغەم و پەژارەوە) بەرەو شوێنێکی دوور ڕۆیشت. 22. ژان گرتی و بردی بۆ لای قەدی دارخورمایەك، (بەدەم ئاهو ناڵەوە) دەیوت: خۆزگە پێش (ئەم بەسەرهاتە) بمردمایە و وەك شتێکی بێ نرخ فەرامۆش بکرامایە. 23. (ئەو منداڵەی کە لە داوێنی بەربۆوە) لەژێرەوە (بانگی کرد و وتی: دایە گیان) خەفەت مەخۆ، ئەوەتە پەروەردگارت بە بەردەمتدا جۆگەلەیەکی جاری کردووە. 24. ئەو دارخورمایەش (کە پاڵت پێوە داوە) کەمێك بیجوڵێنە خورمای گەییوت بەسەردا دەبارێنێت. 25. ئیتر لەو خورمایە بخۆ، لەو ئاوەیش بخۆرەوە، خەمیشت نەبێت، ئەگەر کەسێکت لە خەڵکی بینی و (پرسیاری لێکردی) بە ئیشارەت تێی بگەیەنە کە من بڕیارم داوە و نەزرم کردووە بە ڕۆژوو بم بۆ خوای*

*میهرەبانم، ئەمڕۆ من قسە لەگەڵ کەسدا ناکەم. 12. ئەوسا مەریەم منالی (نازداری) خۆی لە باوەش گرت و بردی بۆ لای خزم و کەسوکاری. (هەموو بەسەرسامییەوە) وتیان: ئەی مەریەم بەراستی کارێکی نالەبار و نابرووبەرت ئەنجامداوە. 28. ئەی خوشکی هاروون (لەبەر تەقوا و خواناسی ئەو نازناوەیان پێدابوو) نە باوکت کەسێکی خراپ و (شەرواڵ پیس بوو) نە دایکت ئافرەتێکی داوێن پیس!! 28. (مەریەمیش هیچی نەگوت) بەڵکو ئاماژەی بۆ رۆڵەی نازداری کرد (تا لەو بپرسن) هەموو (بە سەرسامییەوە) وتیان: چۆن قسە لەگەڵ منداڵی سەبێشکەدا دەکرێت. 29. (ئینجا منداڵی ساوا هاتە گفت و بە دەنگە ناسکەکەی) وتی: من بەندەی خوام، کتێبی (ئینجیلی) پێبەخشیوم، دەمکاتە فرستادەی خۆی. 30. وە منی موبارەك و پیرۆز کردووە لە هەر کوێدا بم، وە ئامۆژگاری کردووم کە نوێژەکانم ئەنجام بدەم و لە زەکاتدانیش درێغی نەکەم هەتا لە ژیاندا هەم. 31. (هەروەها فەرمانی پێ داوم کە) چاك رەفتار بم لەگەڵ دایکمدا، وە نەیکردووم بە کەسێکی زۆردار و بەدرەفتار. 32. سڵاوی پەروەردگارم لەسەربێ ئەو رۆژەی کە لە دایك بووم، وە ئەو رۆژەی کە دەمرم، ئەو رۆژەی کە زیندوو دەکرێمەوە. 33. ئا بەو شێوەیە (کە باسکرا) عیسای کوڕی مەریەم (هاتە دنیاوە) هەر ئەوەشە قسەی راست دەربارەی، کە ئەوانە (واتە جوولەکان) گومان بە دەوریدا دروستدەکەن (وە گاوران، بە کوڕی خوا لە قەڵەمی دەدەن). 34. هەرگیز بۆ خوای گەورە نییە، کەس بکاتە کوڕی خۆی (چونکە پێویستی پێی نییە) پاکی و بێگەردیی شایستەی ئەوە، هەر کاتێك هەر شتێك بڕیار بدات، هەر ئەوەندەی دەوێ کە پێی بڵێ ببە، ئەو شتە، یا ئەو کارە، خێرا پێش دێت، یا رووددات. 35.* [1]

هەرچەند قورئان رۆشن بەیانیدەکات، کە سکپڕبوونی مەریەم سەرناسا بووە، عیسا پەیامبەرێکی گەورە بووە، بەڵام کوڕی خوا نەبووە.

بێگومان لەگەڵ ئەمەدا نەبووم، بەڵام بێدەنگــەم لێکرد.

مودی پێیخۆشبوو، شانازی بەوەوە دەکرد، کە ماڵەکەمان بۆتە جێگای سەرنج لە پشووەکاندا. لەبەرئەوە بۆ ئێوارەی سەری ساڵی تازە، بەبێ مۆڵەتی ئەو، بانگی هاوڕێ نزیکەکانمان کرد. کەچی تورەبوو، کە مایەی سەرسامیم بوو.

"نابێت لێرە بخۆنەوە!" فەرمانیدا.

"باشە، خۆ من دەوەتی خواردنەوەیان ناکەم؟" پرسیارملێکرد.

"لەوانەیە ئەوان شتێك بهێنن لەگەڵ خۆیان."

"پێیانــدەڵێم کاری وا نەکەن. هیچ شتێکی کحولی لە ماڵی مندا نابێت ببێت. ئەمە پڕ مەترسییە."

ئەمە ئەوی بێدەنگکرد، بەڵام لە شتێکی تر ناڕازیبوو. "نامەوێت کەس سەمابکات یان ماچوموچ،" وتی. "هیچ کەسێك ماچناکەیت و تەنیا دەڵێیت، سەری ساڵێکی شاد."

"نا ئەو شتانە ناکەم. تەنیا دەمەوێت لەگەڵ هاورێکانماندا بم."

مودی هەر بۆڵەی لێوە دەهات، دەیزانی تازە درەنگە بانگکردنەکان وەرگرێتەوە. بۆ ئەو دوانیوەڕۆیە تا ئێوارێیەکی درەنگ نەخۆشی ناونووسکردبوو بۆ بینینیان و هێشتا کاریدەکرد کە میوانەکانمان گەیشتن: ئەلیس و شەمسی و هاوسەرەکانیان، هەروەها زاری و فریشتە. نانخواردنمان بۆ زیاتر لە کاژێرێك خستە دواوە و خۆمان بە چا و میوەوە خەریککرد. تەلەفونێك بۆ دکتۆر نەجەف کرا، هاوسەری شەمسی. بانگیانکرد بۆ کردنی نەشتەرگەرییەکی لەناکاو، بەڵام ڕەتیکردەوە. "پێیانبڵێن با کەسێکی تر پەیدابکەن،" وتی، پێیخۆشنەبوو میوانییەکە جێبهێڵێت.

سەرئەنجام کە مودی دەرکەوت، پێیڕاگەیاندین، "نەخۆشخانە بانگیکردوم، کارێکی ناکاو هاتۆتەپێشەوە. دەبێت بڕۆم." بۆ هەمووان جێگای پرسیاربوو، کە بۆچی مودی دەیەوێت، دوورکەوێتەوە لە میوانییەکە. هەر وەك دکتۆر نەجەف، دەیتوانی داوابکات، کەسێکی تر ئەو کارە بکات.

لە چەند خولەکەدا، ئەمبولانس هات بە لایتە ئاگادارکرنەوەکەیەوە. ئەوە خێراترین شێوە بوو، بۆ گەیاندنی دکتۆر بۆ نەخۆشخانە و ئەمە ئەو بانگەشەیەی مودی پشتڕاستدەکردەوە، کە کارێکی لەناکاو هاتۆتە پێشەوە.

بەبێ ئەو دەستمانکرد بە نانخواردنی ئێوارەی سەری ساڵی تازە. هێشتا نانمان دەخوارد، کە کاتژمێری دە و نیوی شەو گەڕایەوە. "وەرە نانمان لەگەڵ بخۆ،" پێموت.

بەڵام تەلەفون لێیدا و مودی ڕایکرد بۆ وەڵامدانەوە.

"نەخۆشێکە،" مودی وتی. "ئازاری پشتی هەیە و هەرئێستا دەیهێنن."

"نا،" بێزاری خۆمم دەربڕی. "پێیانبڵێ، با بەیانی بیهێنن."

"نابێت وا شەو درەنگانێ نەخۆش ببینیت،" شەمسی وتی. "دەبێت کاتی دیاریکراوت هەبێت."

"نا،" مودی وتی. "دەبێت ئیمشەو ببینم." ڕۆیشت بۆ کلینیکەکەی.

"شەوەکەی لێتێکداین،" ئەلیس وتی.

"ئەمە زوو زوو ڕوودەدات،" وتم. "لەگەڵی ڕاهاتووم. بە ڕاستی بە خەیاڵمدا نایەت."

دەمتوانی بڵێم، هەموویان نیگەرانی من بوون، بەڵام لە ڕاستیدا، بەبێ بوونی مودی، زیاتر خۆشیم لەو کۆمەڵە هاورێیە دەبینی.

ئێوارە خوانێکی خۆش بوو، بەڵام میوانەکان دەبوو زوو بگەڕێنەوە بۆماڵەوە. سەری ساڵی تازەی ڕۆژئاوایی لە تاراندا بەبێدەنگی تێپەردەبێت، ڕۆژی دوایی ڕۆژی کاری ئاساییە. لە دوانزە و پێنج خولەکەدا، هەموو میوانەکان خەریکی خۆئامادەکردنبوون بڕۆن، کە مودی لە کلینیکەکەی هاتە ماڵەوە.

"نەدەبوو وا زوو بڕۆن،" وتی، دیاربوو خۆی وا پیشاندەدا کە پێیناخۆشە.

"دەبێت بەیانی زوو هەستین لە خەو،" دکتۆر نەجەف وتی.

ئەو ساتەی هەموویان پێیان نایە ئەودیو دەرگاکەوە و دەرگامان داخست، لەپڕ مودی باوەشپیاکردم و هیواش و خۆشەویستانە ماچیکردم.

"ئەمە بۆچی؟" بە سەرسامییەوە وتم.

"دەی باشە، سەری ساڵی تازەت لێشادبێت."

بەڕاستی سەری ساڵێکی شاد، لە دڵی خۆمدا وتم. هەزار و نۆ سەد هەشتا و شەش. سەری ساڵێکی تریش، من هەر لێرەم.

چەنــــد سەری ساڵی تریش؟

کە ڕۆژانی پشوو تەواوبوو، پەرێشانییەکی زۆر دایگرتم. ئەو ڕۆژە تایبەتییانە ئەوەندە سەرقاڵی کردبووم، فریای سەر خوراندنی خۆم نەدەکەوتم. هەر ڕۆژە بەدوای شتێکەوە بووم. ئەو ڕۆژانەم دەبردەسەر بەهیوای ئەوەی دەچمەوە بۆ ماڵەوە بۆ مەشیگان، نەك لێرە بم. بەڵام کە جەژنی سوپاس هات، پاشان کریسمس، پاشان سەری ساڵ و ئینجا هەر هەموو تەواوبوون، کەچی هیچ شتێکی تازە نەهاتە پێشەوە، تەنیا زستانێکی خۆڵەمێشی نەبێت.

تا دەهات ڕۆژان درێژتر دەبوونەوە و لێم دەبوون بە ساڵان.

"ئارامــــە بگرە،" ئاماهل دەیوت، هەرکاتێك قسەم لەگەڵ دەکرد.

شار بەرگی سپی بەفری پۆشی. شەقامەکان پڕبوون لە قوڕوچڵپاو. هەر بەیانییەك بە غەمێکی قورسترەوە هەڵدەستام و هەر ڕۆژێك لەگەڵ ڕوودانی هەر شتێك، بێهیوایی منی قوڵتر دەکردەوە.

ڕۆژێکیان کاتێك لە قولکەی قەرەباڵغی نزیك ماڵی خۆمان دەپەڕیمەوە، ژنە *پاسدار*ێکم لێقوتبۆوە. جارەکەی ترم لەبیربوو، کاتێك کە چەند وشە فارسی قسەمکرد، پاسدارەکە کەوتە گومانەوە، چونکە تەواوی قسەکانی تێنەگەیشتم. مەهتاب لە قوتابخانە بوو، هیچ کەسێك نەبوو قسەکان وەرگێڕێت. ئەم جارەیان بڕیامدا، هەر فارسی نازانم.

"تێناگەم دەڵێت چی،" بە ئینگلیزی وتم.

کەچی سەرسامیکردم بە ئینگلیزی وەڵامیدامەوە، یەکەم جارم بوو توشی شتی وا بم. بە توڕەییەوە پێیوتم، "کە دەڕۆی بە ڕێگادا، درزێك دەکەوێتە پاڵتۆکەتەوە، ئەژنۆت لە نێوان پاڵتۆ و گۆرەوییەکەتدا دەردەکەوێت، ناکرێت گۆرەوییەکی باشتر لەبەربکەیت."

"لە تۆ وایە من ئەو گۆرەوییانەم پێخۆشە؟" وەڵامەدایەوە. "لە ژیانمدا شتی وام لەبەرنەکردووە. ئەگەر بە حەزی من بوایە، ئێستا لە ئەمریکا دەبووم و پانتۆڵێکم لەبەردەکرد، نەك ئەم گۆرەویانە کە لە جێگای خۆیاندا ڕاناوەستن. بەس پێمبڵێ، تکاتلێدەکەم پێمبڵێ، بۆ کوێ بچم لە ئێراندا، جوتێ گۆرەوی بدۆزمەوە کە دانەکشێنە خوارەوە؟"

ژنەی *پاسدار* دەمی بوو بە تەڵەی تەقیوەوە و بوو بە هاودەردم.

"دەزانـــم خانم، دەزانـــــم،" مهرەبانانە وتی. پاشان لێیدا ڕۆیشت و منی بە سەرسامییەوە جێهێشت. خۆ بە ڕاستی لەگەڵ ژنێکی پاسداری تێگەیشتوو بەرەوڕووبووم.

لەو ساتەدا گیانۆکەم ئازارێکی وا پێگەیشت، کە لەوەوپێش بەخۆمەوە نەمبینیبوو. نـــای چەنـــد پرۆشی گەڕانەوەبووم، گەڕانەوە بۆ کۆمەڵگایەك، کە تیایدا بە هەوەسی خۆم جلوبەرگ بپۆشم، کە تیایدا ئازادانە هەناسەبدەم.

ناوەڕاستی مانگی کانوونی دووەم بوو، کاتژمێری نزیك چواری دوانیوەڕۆ، کە زەنگی تەلەفون لێیدا. لە ژووری چاوەڕوانی کلینیکەکەی مودی بووم، نەخۆش دەوریدابووم، کە تەلەفونەکەم بەرزکردەوە، دەنگی خوشکەکەم بوو، کارۆلین لە ئەمریکاوە. دەگریـــا.

"دکتۆرەکان هەموو خێزانەکەیان بانگکردووە،" وتی. "ڕیخۆڵەی بابە باش کارناکات و بڕیاریانداوە نەشتەرگەری بۆ بکەن. بەبێ ئەم نەشتەرگەرییە ناژی، بەڵام لەو باوەڕەشدا نین، کە ئەوەندە بەهێزبێت بتوانێت بەرگەی نەشتەرگەرییەکە بگرێت. وا بۆی دەچن، کە ئیمڕۆ بمرێت."

ژوورەکە لەبەرچاوم لێڵبوو، کە فرمێسك بە چاومدا هاتەخواردەوە و *ڕووسەرییەکەمی* تەڕکرد. دڵم شکا. لە دووری هەزاران میلەوە باوکم خەریکە دەمرێت و من بە لایەوە نیم دەستی بگەرم، پێیبڵێم خۆشمدەوێیت، باشداری خەم و ئازاری خێزانەکەمان بکەم. کۆمەڵێك پرسیارم لە کارۆلین کرد سەبارەت بە هەلومەرجی باوکم، بەڵام لەتاو ئازاری خۆم، نەمدەتوانی گوێم لە وەڵامەکانی بێت.

لەپڕ سەرم بەرزکردەوە، بینیم مودی لە تەنیشتمەوە ڕاوەستاوە، بە دەموچاویدا دیاربوو نیگەرانە. ئەوەندە گوێی لە گفتگۆکەمان بووبوو تا پێشبینی باقییەکەی بکات.

بە خێرایی وتی، "بڕۆ. بڕۆ باوکت ببینە."

تێبینییەکان:

1. سورەتی مریەم، ئایەتی شانزە تا سی و پێنج.

# 22

قسەکەی مودی تەواو سەرسامیکردم. دەبوو دڵنیابم لەوەی، کە بە هەڵە تێنەگەیشتووم. دەستم خستە سەر دەمی تەلەفونەکە و وتم، "باوکم تەندروستی زۆر خراپە. لەو باوەڕەدان ناگاتە سبەینێ."

"پێیبڵێ، وا بەڕێوەی بۆماڵەوە."

بۆ چەند چرکەیەك خۆشی دایگرتم. بەڵام زۆر زوو گومانم تێکەوت. ئەم گۆڕانە لەپڕە بۆ؟ بۆچی پاش نزیکەی یەك ساڵ و نیو، مودی لەپڕ ڕێگادەدات بە من و مەهتاب بگەڕێینەوە بۆ ئەمریکا؟

کەوتمە خنەخن. "پێویستە لەبارەی ئەمەوە قسەبکەین،" وتم. پاشان گەڕامەوە سەر تەلەفونەکە. "کارۆلین،" قیژانم تا دەنگەم لە دووری هەزاران میلەوە ببیسترێت، "دەمەوێت لەگەڵ باوکم قسەبکەم، پێش ئەوەی ببرێت بۆ نەشتەرگەری."

مودی نارەزایەتی دەرنەبڕی. گوێیدەگرت، کاتێك من و کارۆلین خەریکی ڕێکخستنی ئەو پەیوەندییە بووین. دەبوو دروست سێ کاژێری تر، تەلەفونبکەم بۆ نەخۆشخانەی کارسۆن ستی. خوشکەم باوکمی ئامادەدەکرد بۆ قسەکردن لەگەڵ من، پێش ئەوەی ببرێت بۆ ژووری نەشتەرگەری.

"پێیبڵێ بەنیازی بێیتەوە،" مودی دووبارەیکردەوە.

شپرزە بووبووم، داواکەیم پشتگوێخست.

"هەرئێستا پێیـبڵێ،" مودی وتی.

شتێك لە ئارادایە، لە دڵی خۆمدا وتم. هەڵەیەکی زۆر گەورە.

"هەرئێستا!" مودی دووبارەیکردەوە، نیگای دەموچاوی تەواو هەڕەشانە بوو.

"کارۆلین،" وتم، "مودی دەڵێت، دەتوانم بێمەوە بۆ ماڵەوە."

خوشکەکەم لە سەرسامی و خۆشیدا، هاوارێکی لێبەرزبۆوە.

پاش تەلەفونەکە هیچ هەلێك نەبوو بۆ گفتگۆی زیاتر، چونکە مودی یەکسەر گەڕایەوە ژوورەکەی خۆی و نەخۆشێکی زۆر چاوەڕوانی چارەسەرکردنیان دەکرد. خێرا خۆم گەیاندە ژووری نوستنەکەم، بۆئەوەی بەتەنیا بگریم بۆ باوکم و خۆم ڕزگاربکەم لە گێژاوی نێوان خەفتی باوکم و خۆشی ئەوەی کە مودی وتی، دەگەڕێینەوە بۆ ئەمریکا.

نەمزانی ماوەی چەند گریاوم، پێش ئەوەی لە بوونی شەمسی ئاگاداربم لە ژوورەکەدا. "هەروا تەلەفونم کرد، کەچی مودی بۆی باسکردم، کە هەواڵێکی ناخۆشت لەبارەی باوکتەوە بیستووە،" شەمسی وتی. "من و زاری هاتووین، لە لات بین."

"سوپاستاندەکەم،" وتم و چاوم سڕی. هەستام و باوەشمکرد بە شەمسیدا، جارێکی تر فرمێسك بە چاومدا هاتەخوارەوە.

شەمسی منی بردەخوارەوە بۆ ژووری دانیشتنەکە. زاری لەوێ بوو، بۆ دڵنەوایی من. لە بارەی هەلومەرجی باوکمەوە پرسیاریانکرد و بەسەرهاتی مردنی سەیر و لەناکاوی چەند ساڵ لەوەو پێشی باوکی خۆیان بۆ من باسکرد.

"ئەم بەیانییە قسەم لەگەڵ مودی کرد، پێش ئەوەی ئەو تەلەفونت بۆ بکرێت،" زاری وتی. "زۆر نیگەرانی تۆ بووم بۆ باوکت و بە مودیم وت، دەبێت ڕێگایبدەیت بچێت باوکی ببینێت."

گوێچکەی خۆمم تیژکردەوە. ئایا دەکرێت، ئەمە هۆی گۆڕانی لەپڕی بڕیاری مودی بێت؟

زاری بەردەوامبوو لەسەر گێڕانەوەکەی خۆی. مودی وتبووی، کە ڕێگای من نادات بچمەوە بۆ ئەمریکا چونکو دەزانێت، هەر ئەوەندەی بگەمە ئەوێ ئیتر ناگەڕێمەوە بۆ ئێران.

"ئینجا چۆن دەتوانی ئەمەی لەگەڵ بکەیت؟" زاری بە مودی وتبوو. "تۆ ناتوانی بۆ هەموو ژیانی بیهێڵیتەوە، تەنیا لەبەر ئەوەی تۆ لەو باوەڕەدایت بیتی ناگەڕێتەوە." زاری بە مودی وتبوو، تۆ پیاوێکی *بەدی* "خراپی"، ئەگەر ڕێگایپێنەدەیت بچێت باوکی ببینێت. بێگومان ئەمە هێرشێکی قورس و دڵڕەقانە بوو، بە تایبەتی لە زارییەوە، کە لە مودی گەورەتر بوو، هاوڕێی کۆنی خێزانەکە بوو، شایەنی ڕێزێکی زۆر بوو.

سەرەڕای ئەوەش، مودی لە قسەی خۆی نەهاتبووە خوارەوە، تا زاری لەخۆوە ڕێگاچارەیەکی بۆ ئەم گێژاوەی مودی دۆزیبۆوە. لەو پەڕی دڵساقی خۆیەوە وای بۆچووبوو، کە نیگەرانی مودی چاودێریکردنی مەهتابە کاتێك کە من دەڕۆم، لەبەرئەوە بە مودی وتبوو: "ئەگەر تۆ نیگەرانی چاودێریکردنی مەهتابی، مەهتاب دەتوانێت لە لای من و شەمسی بێت، کاتێك بیتی لێرە نابێت."

لە ماوەی ئەو هەژدە مانگە دۆزەخەی کە تێیکەوتبووم، هەرگیز هەستم بە گورزی وا جەرگبڕ نەکردبوو. زاری مەبەستی خراپ نەبوو، بەڵام تەڵەکەی لە قوڕگمدا قایمکرد. هەرکاتێك من و مودی باسی گەڕانەوەمان کردبێت بۆ ئەمریکا، هەمیشە مەبەست من و *مەهتاب* بووە! مەهتاب وا چاوێلێکردووە، منیش هەروا. نەمدەتوانی بەرەوڕووی ئەم مەترسییە تازەیە بەمەوە.

ئەوەی لە خەیاڵی مندا نەبوو، گەڕانەوە بوو بۆ ئەمریکا بەبێ مەهتاب.

بەڵام ئەی ئەگەر مودی بەزۆر منی بەتەنیـــا ناردەوە؟

"باوەگەورە، ئێمە دێین بۆ بینینی تۆ!" مەهتاب لە تەلەفوندا وتی. وشەکانی شادیهێنەر بوون، بەڵام نیگای دەموچاوی نیشاندەری نیگەرانی بوو. دەمزانی لەو باوەڕەدا نییە، باوکی ئەو ڕێگایەی بۆ بکاتەوە. پەرێشان بوو، بەڵام تەنیا دەیویست خۆشی بە باوەگەورەی بگەیەنێت. باوەگەورەش تەنیا بۆ چەند ساتێك، توانی لەگەڵ تۆبییە

بچکۆلەکەی قسەبکات، چونکو هەر وشەیەك بە زەحمەتێکی زۆرەوە لە دەمی دەهاتە دەرەوە.

"هاتنەوەتان زۆر خۆشحاڵم دەکات" باوکم پێیوتم. "خێرابکـــەن، تا درەنگ نەکەون."

بەبێدەنگی گریام، کاتێك دڵنەوایيمدەکرد، دەمزانی ئەگەری ئەوە هەیە ئەگاتە بەیانی، کە ئیتر هەگیز نایبینمەوە. لە ڕاستیدا ئەگەر بڕۆم تەنیا بۆ پرسەکەی دەبێت.
"ویردت بۆ دەخوێنم، کاتێك لەژێر ئەشتەرگەری دەبیت،" پێموت.

"لە هەر کوێیەك ورە هەبێت، ڕێگای دەرچون هەیە،" باوکم وتی. هەستمکرد هێز لە دەنگیدا گەڕا. پاشان وتی، "با لەگەڵ مودیش قسەبکەم."

"باوەگەورە، دەمانەوێت بێین بۆ بینینت،" مودی وتی. "بەڕاستی زۆرت بیردەکەین."
ئەم قسانەی بە بەرچاوی شەمسی، زاری و منەوە دەکرد. هەموومان دەمانـزانی، درۆدەکات.

زۆری نەبرد تەلەفونەکە تەواوبوو، کاتی بردنی باوکم بوو بۆ ژووری ئەشتەرگەری.
"سوپاس بۆ ئەو قسانەی لەگەڵ باوکم کردت،" بە مودیم وت، وەك هەوڵێك بۆ بەرگرتن بە ئاگری توڕەییەکە، کە لە دەروونیدا خەریکبوو کڵپەی دەسەند.
لەژێر لێوەوە وەڵامیدامەوە. ئەکتەرێکی لێهاتووبوو، کاتێك بیویستایە. دەمزانی خۆی هیچ نیازێکی گەڕانەوەی نییە بۆ ئەمریکا یان ڕێگای مەهتاب بدات بڕوات. بەڵام لەگەڵ من، خەریکی چ یارییەك بوو؟

مودی تا ئێوارەیەکی درەنگ خەریکی ئەخۆش بوو. مەهتاب لەناو جێگادا نوستبوو، هەر ئەم دیواو و ئەودیوی دەکرد، ئۆقرەی نەدەگرت لە نێوان غەمی باوەگەورە و خۆشی چوونەوە بۆ ئەمریکا. کاتێك لە جێگادا کەوتبووم، فرمێسکی چاوم وشکنەدەبۆوە. بە داخ و خەفەتێکی زۆرەوە دەگریام بۆ باوکم، کە ئەگەری ئەوە هەبوو لەو ساتەدا مردبێت. بۆ کۆستکەوتنی دایکم دەگریام، بۆ خوشك و براکەم، بۆ جۆی و جۆن، کە دەبوو بەرەوڕووی مردنی باپیریان ببنەوە، بەبێ ئەوەی من لەوێ بم بۆ دڵنەواییکردنیان. دەگریم بۆ مەهتاب، کە چۆن لەگەڵ گرفتێکی تریش دەستوپەنجە نەرمدەکات؟ گوێی لە باوکی بوو، کە وتی دەچین بۆ ئەمریکا بۆ بینینی باوەگەورە. چۆن من بتوانم - یان هەرکەسێکی تر بتوانێت - بۆ مەهتابی باسبکات، ئەو ناڕوات و ئیتر باپیرێك نییە بیبینێت؟
مودی ئەو شەوە کاتژمێری دە و نیو، هات بۆ ژووری نوستنەکە. لەسەر جێگاکە لەتەنیشتم دانیشت. زۆر دۆستانە بوو، هەوڵیدەدا یارمەتیمبدات، بەدوای ڕێگایەکەوە بوو دڵنەواییمـبکات.
لەو پەڕی بێچارەیمدا، کەوتمە گەڕان بە دوای چارەیەکدا، کە چۆن من و مەهتاب دەرچین لێرە. "وەرە لەگەڵمان،" داوامـلێکرد. "ئەمەوێت بەتەنیا بچم بۆ ئەمریکا.

دەممویت تۆ لەگەڵم بێیت. دەمەویت هەر سێکمان پێکەوە برۆین. بەڕاستی لە کاتێکی وادا، پێویستیم بە تۆیە. ناتوانم بەبێ تۆ لەم هەلومەرجە دەرچم."

"نا، ناتوانم بێم،" وتی. "ئەگەر بێم کارەکەم لەدەستدەدەم لە نەخۆشخانە."

دواهەوڵی خۆمم دا بۆ ڕووداني ئەوەی کە مەحاڵ بوو. هەوڵمدا ئەوەی مەبەستم بوو، ئاسان بیڵێم تا دووبارەکردنەوەی تێنەکەوێت. پێموت، "دەی باشە، هیچ نەبێت مەهتاب لەگەڵ خۆمدا دەبم، باشە؟"

"نا. دەبێت بچێت بۆ قوتابخانە."

"ئەگەر ئەوم لەگەڵ نەبێت، من ناچم،" بۆم ڕوونکردەوە.

بەبێ ئەوەی وشەیەك بڵێ، هەستا و لە ژوورەکە چووە دەرەوە.

"مامل سەفەرەکەت بۆ ڕێکدەخا،" مودی بۆ ڕۆژی دوایی بەیانییەکەی پێیوتم. "دڵشادم بەوەی دەتوانی بچیت خێزانەکەت ببینی. چ ڕۆژێك دەتەوێت برۆیت؟ کەی بەنیازیت بگەڕێیتەوە؟"

"نامەوێت بێ مەهتاب برۆم."

"بـــا،" مودی بە ڕەقییەوە وتی. "با تۆ دەڕۆیت."

"ئەگەر برۆم، تەنیا بۆ دوو ڕۆژ دەڕۆم."

"ئەوە تۆ لەبارەی چییەوە قسەدەکەیت؟" مودی وتی. "من فڕۆکەت بۆ دەگرم بۆ کۆرپوس کریستی."

"بۆچی من بۆ ئەوێ بچم؟"

"بۆ فرۆشتنی خانووەکە. تۆ ناگەڕێیتەوە بۆ ئەمریکا بەبێ فرۆشتنی ئەو خانووە. ئەمە هەروا سەفەرێکی سادە نییە. خۆ ناگەڕێیتەوە بۆ ئەوێ تەنیا بۆ دوو ڕۆژ. تۆ دەچیت بۆ ئەوێ و هەرچیمان هەیە دەیفرۆشیت. بە دۆلارەوە دێیتەوە. ناگەڕێیتەوە تا لە پێشدا دۆلارەکان نەبینم."

ئەمە ئەوە بوو هۆی شێتانەی گۆڕانی لەپڕی بڕیاری مودی، کە ڕێگامبدات بگەڕێمەوە بۆ ئەمریکا. نە غەمی باوکمی بوو، نە دایکم، نە کوڕەکانم، نە باقی خێزانەکەمان. هەتا ئەوەی بۆ گرنگ نەبوو، کە لەوانەیە من لەو سەفەردا خۆشییەك ببینم. تەنیا بەدوای پارەوە بوو. ڕۆشن بوو، دەویست مەهتاب بە بارمتە بگریت، تا گەڕانەوەم بۆ ئێران مسۆگەربکات.

"من ناچم شتی وا بکەم!" بە ڕوویدا هاوارمکرد. "من ناڕۆم. وە ئەگەر برۆم بۆ مەراسیمی ناشتنی باوکم دەچم، لەو بارە دەروونییەدا نابم هەموو شتێك بفرۆشم. تۆ بۆ خۆت دەزانی، چەند شتمان زۆرە لە عەمبارەکە. هەروا ئاسان نییە هەموو شتێك بفرۆشیت. بەتایبەتی لە کاتێکی وادا، چۆن بتوانم هەستم بە کارێکی وەها؟"

"دەزانم ئاسان نییە،" مودیش هاواریکرد بە ڕوومدا. "بۆم گرنگ نییە، چەند لەوێ دەمێنیتەوە. بۆم گرنگ نییە ئەو کارە چەند دەبات. بەڵام ناگەڕێیتەوە تا ئەو کارە بە ئەنجام نەگەیەنی!"

هەرکە مودی چوو بۆ نەخۆشخانە بۆ کار، دەرپەڕیمە دەرەوە و تەکسییەکەم گرت بەرەو شوێنی کاری ئاماهل. بە وردییەوە گوێبیستی گۆڕانکارییەکانی ژیانی پڕ کێشەم بوو. نیمەنی ئازار و نیگەرانی لە دەموچاویدا دەرکەوت.

"لەوانەیە بۆ دوو ڕۆژ بچم   تەنیا بۆ مەڕاسیمی ناشتن   و بگەڕێمەوە،" پێشنیارمکرد. "پاشان من و مەهتاب بەپێی ئەو پلانەی دامانناوە هەڵدێین."

"نە ،، نەڕۆیت،" ڕاوێژی لەگەڵ کردم. "ئەگەر بڕۆیت، هەرگیز دووبارە مەهتاب نابینیتەوە. من لەوە دڵنیام. ڕێگاتنادات دوو پێت بێتەوە بەم وڵاتەدا."

"بەڵام ئەی چی بکەم، بەڵێنمـداوە بە باوکم؟ زۆر جار لەگەڵی بێبەڵێن دەرچووم."

"نەڕۆیـــت."

"دڵنیی چی، ئەگەر بڕۆم و پارە بهێنم؟ دەتوانم پارەی دەرچوونیش لەگەڵ خۆم بهێنم!"

"نـــا، مەڕۆ، باوکت نایەوێت تۆ ببینێت، ئەگەر بزانێت مەهتابت لە ئێراندا جێهێشتووە."

ئاماهل ڕاستی دەوت. منیش دەمزانی، ئەگەر بۆ پێنج خولەك، بەبێ مەهتاب ئێران جێبهێڵم، مودی بۆ هەمیشە لەیەکمان دەکات. سەرەڕای ژیانێکی ئاسودە کە لە تاراندا بۆمانی دەستبەرکردبوو، بەڵام لە ناخی دڵمەوە دەمزانی، حەزدەکات ڕامبدات لەبەردەمی ڕێگای خۆیدا. مەهتابی لە لابوو. لەپێشدا زۆری لێدەکردم، ئەو شتانەی هەمانە بیفرۆشم، ئینجا داوای پارەکەی دەکرد پێش ئەوەی ڕێگای گەڕانەوەم بدات. دڵنیاشبووم، هەرئەوەندەی پارەکەی بەدەست دەگەیشت، تەڵاقیدەدام و بۆ هەمیشە ڕێگای گەڕانەوەی لێدەگرتم. پاشان خوازبێنی ژنێکی ئێرانی دەکرد و ئەرکی گەورەکردنی مەهتابی پێدەسپارد.

گفتگۆم لەگەڵ ئاماهل گەیشتە ئاستێکی تازە. "ناتوانی پەلەبکەیت لە پلانەکەماندا، تا بتوانین هەڵبێین، پێش ئەوەی مودی بەزۆر بمخاتە فڕۆکەوە؟" پرسیارمکرد.

ئاماهل کەوتە جوڵە بەسەر کورسییەکەیەوە. دەیزانی، پلانەکەی زۆر درێژدەکێشاوە و هەلومەرجەکە بە بنبەست گەیشتووە. بەڵام شتێکی سەرئاسای لەدەستنەدەهات.

"ئەوە شتێکی زۆر گرنگە،" پێیوتم، وەك جارەکانی پێشوو، "کە هەموو شتێك ئامادەکرابێت، پێش ئەوەی تۆ و مەهتاب بکەونەڕێ. زۆر پڕ مەترسییە، هەوڵی شاردنەوەی ئێوە بدەین لە تاراندا تا وردەکارییەکان تەواودەبن. تەنیا چەند ڕێگایەکی

سەرەکی هەیە بۆ چوونە دەرەوە لە شار. ئەگەر بکەونە گەڕان بە دوا‌تاندا لە فڕۆکەخانە یان ڕێگا سەرەکییەکانی ماشێن، بە ئاسانی دەتانـدۆزنەوە."

"وایە،" منیش باوەڕم وابوو. "بەڵام دەبێت خێرا بکەوینە خۆمان."

"هەوڵدەدەم،" ئاماهل وتی. "بەڵام زۆر نیگەرانە مەبە."

ئاماهل بۆی باسکردم، کە من پێویستیم بە پاسپۆرتی ئێرانی هەیە. ئەو پاسپۆرتە ئێرانییەی کە پێی هاتبووین بۆ ئێران، بۆ هەر سێکمان بوو. دەبوو وەك خێزان بەکاری بهێنین بۆ سەرفەرکردن، نەمدەتوانی هەر خۆم بەکاری بهێنم، هەروەها پاسپۆرتە ئەمریکییەکەشم، کە لەگەڵ خۆم هێنابووم، مودی لێی شاردبووەوە. پێویستم بە پاسپۆرتی ئێرانی تایبەت بە خۆم هەبوو. "بەهیچ جۆرێك ناتوانێت سەفەرت پێبکات، مەگەر ئەوەی بەخێرایی پاسپۆرتێکت بۆ دەربهێنێت،" ئاماهل بۆی ڕوونکردمەوە. "ئەمەش کاتی دەوێت، ئاسایی یەك ساڵ دەبات. هەتا ئەگەر یەکێك زۆر هەوڵبدات، یان پەیوەندی تایبەتی هەبێت، لەوانەیە شەش هەفتە یان دوو مانگ بخایەنێت. کورتترین ماوە کە من بیستومە، شەش هەفتە بووە. من تا ئەو کاتە ئێوە دەردەکەم، نیگەرانە مەبە."

-

ئەو دوا نیوەڕۆیە، لەگەڵ کارۆلینی خوشکم قسەمکرد. باوکم لەژێر نەشتەرگەرییەکە گیانی بەدەربردبوو. هێشتا زیندوو بوو! کارۆلین بۆی باسکردم، کاتێك کە بەسەر کورسی پێچکەدارەوە بووە بەرەو ژووری نەشتەرگەری، بە هەموو دکتۆر و سستەرەکانی وتووە، کە بیتی و تۆبی بە ڕێگاوەن بۆ ماڵەوە. خوشکەکەم دڵنیابوو لەوەی، کە ئەو هەواڵە هێزێکی وای پێدا کە بتوانێت بەرگەی نەشتەرگەرییەکە بگرێت. بەڵام هێشتا هۆشی نەهاتبۆوە سەرخۆی و دکتۆرەکان لەو باوەڕە دا بوون، هێشتا ئەگەری مردنی هەیە.

ئەو ئێوارێیە مامل و مەجید هاتن بۆ ماڵمان. لەگەڵ مودی دانیشتن لە کلینیکەکە، سەرگەرمی گفتگۆی وردەکاری ئەو سەفەرەی من بوون، کە بڕیارمدابوو نەیکەم. تەنیا بووم لە چێشتخانەکە، کاتێك مەهتاب هاتە ژوورەوە. نیگای دەموچاوی نیشاندەری شتێکی ترسناك بوو، تەواو ترسناك. نەدەگریا، بەڵام تێکەڵەیەك لە توڕەیی قوڵ و ئازار بە چاوانییەوە دیاربوو.

"بەنیازی بڕۆیت و من جێبهێڵیت، وا نییە؟" مەهتاب وتی.

"ئەوە لەبارەی چییەوە قسەدەکەیت؟"

"باوکم پێیـــوتووم، تۆ دەڕۆیت بۆ ئەمریکا بەبێ من." پاشان فرمێسك جۆگەلەی بەست.

بەرەو ڕووی چووم لە باوەشیـبگرم، بەڵام خۆی لادا، چووە دواوە بەرەو دەرگاکە.

"تۆ بەڵێنت پێدابووم، هەرگیز بەبێ من نەڕۆیت،" دەستیکرد بە گریان. "ئێستا دەڕۆیت و من جێدەهێڵیت."

"باوکت چی پێوتی؟"

"باوکم پێیوتووم، کە تۆ بەنیازیت من جێبهێڵێت و هەرگیز نەمــبینیتەوە."

"وەرە،" وتم و دەستیم گرت، هەستمکرد لە توڕەییدا خەریکە خوێن لە لەشمدا نامێنێت. "با بچین لەگەڵ باوکت لەسەر ئەمە قسەبکەین."

دەرگای ژووری کلینیکی مودیم بە قایم کردەوە و بەرەو ڕووی سێ پیاودکە بوومەوە، کە دانیشتبوون، داویان بۆ من دەچنی. "بۆچی بە مەهتابت وتووە، من بەبێ ئەو دەچم بۆ ئەمریکا؟" هاوارمکرد.

مودیش بە ڕوومدا هاواریکرد. "باشە، چ ژیرییەکە ئەوەی لێبشارینەوە. دەبێت لەگەڵ ئەوەدا ڕابێت. با لە ئێستاوە بە ئاسایی وەریبگرێت."

"نا، مــن ناڕۆم."

"با، دەڕۆیت."

"نا، من نا."

بۆ چەند خولەك بە ڕووی یەکتریدا شاتەشاتمان کرد، کەسمان لە قسەی خۆمان نەهاتینە خوارەوە. لەوە دەچوو مامل و مەجید مێش میوانیان نەبێت، لەوەی من دەڵێم چی یان ئەم هەراوبەزمە چ کاریگەرییەکەی بەسەر مەهتابەوە هەیە.

لە کۆتاییدا دەرپەڕیمە دەرەوە و دەستی مەهتابم گرت، چووینە سەرەوە بۆ ژووردی نوستنەکە. باوەشم پیادا کرد و یەك لەسەر یەك بۆم دووپاتکردەوە، "مەهتاب، من بەبێ تۆ ناڕۆم. هەرگیزوهەرگیز جێتــناهێڵم."

مەهتاب دەویست باوەڕم پێبکات، بەڵام بە چاوانیدا دیاربوو نەیدەتوانی. دەیزانی باوکی چ هێزێکی هەیە بەسەر هەر دووکمانەوە.

دووبارە هەوڵمــدایەوە لەگەڵی. "نامەوێت باوکت بزانێت، بەڵام ئەگەر باوکت هەر سووربوو لەسەر ئەوەی من بنێرێتەوە، ئەوا من خۆم نەخۆش دەخەم، ئەوەندە خۆم نەخۆش دەخەم، کە نەتوانم سواری فڕۆکەکە ببم. بەڵێنم پێبدە، ئەمە بە باوکت نەڵێیت."

هێشتا دەمزانی، باوەڕی پێنەکردووم و ئەشمەدەوێرا، جارێ باسی ئاماهلی بۆ بکەم. بەدەم گریانەوە نوست، تەواوی شەو تا بەیانی، چنگی لە بەرۆکم نەکردەوە.

مودی چوو بۆ ئۆفیسی پاسپۆرت، تەواوی ڕۆژ لەوێ بوو، کەللەییبووبوو بەدەست سەردەی درێژ و ڕێگری بیرۆکراتی دامودەزگای دەوڵەتەوە. وەك ئاماهل پێشبینیدەکرد، بەدەستی بەتاڵ گەڕایەوە.

"دەبێت خۆت بچیت،" مودی وتی. "سبەینێ دەچیت و منیش لەگەڵت دێم."

"ئەی مەهتاب چی لێبکەین؟" پرسیارمکرد، بەدوای ڕێگایەکەوە بووم کە خۆم بدزمەوە لەم کارە. " تەواوی ڕۆژەکە خۆت لەوێ بوویت، دەزانیت تەواوی ڕۆژەکەمان دەبات. فریای مەهتاب ناکەوین، کە لە قوتابخانە دێتەوە."

مودی تۆزێك بیریکردەوە. "دەی تۆ بەتەنیا برۆ،" لە کۆتاییدا وتی. "پێتدەڵێم، چی دەکەیت. من بۆ خۆم لەماڵەوە دەمێنمەوە و چاوەڕوانی مەهتاب دەکەم."

ئەو ئێوارێیە لە ژووری کلینیکەکەی ماوەیەوە، خەریکی پڕکردنەوەی فۆرمی وەرگرتنی پاسپۆرتی من بوو، بە وردییەوە هەلومەرجی گیاندانی باوکمی تیادا نووسی. ڕێگا و شوێنی ئۆفیسی پاسپۆرتی پێوتم، هەروەها ناوی ئەو فەرمانبەری کە دەچووم بۆ لای.

وام بە باش زانی بە قسەیبکەم. لە کاتی خۆیدا چوومە ئۆفیسی پاسپۆرت، چونکە دەمزانی مودی کونترۆڵم دەکات. بەڵام دڵنیابووم بە چەند فۆرمی تردوە دەگەڕێمەوە بۆ پڕکردنەوەیان، لەگەڵ چەندەها هۆهێنانەوە کە بۆچی پاسپۆرت وەرگرتن ئەوەندە درێژە دەکێشێت.

گەیشتمە ئۆفیسی پاسپۆرت، کە بینایەیەکی پڕ تێکەوڵێکەی داڵان و دەرگا بوو، سەرەدی پیاو و ژنی جیا لە یەکتری، وەك یەك درێژ، ئەو سەری دیارنەبوو، کە هەموو بەهیوا ئەوە بوون، لەم ئەرکە سەختە ڕزگاریانبێت و مۆڵەتی دەرچوون لە ئێران وەربگرن. ئای کە تینوی ئەگەرێکی وا بووم. کەچی لەو کاتەدا چەند نامۆ و خەماوی بوو، کە خۆم لە وەرگرتنی پاسپۆرت و ڤیزەی چوونە دەرەوە دەدزییەوە.

کەوتمە گەڕان بەدوای ئەو فەرمانبەرەی، کە مودی پێیوتبووم. بە خۆشییەوە سڵاوی لێکردم، چەند وشەی فارسی ناڕۆشنی لەدەم هاتە دەرەوە و بۆ چەند ژوور پێشمکەوت، بە دەسەڵاتی خۆی و نانیشك هاویشتن هەرچی ڕێگری هەبوو نەیهێشت. لەوە دەچوو بە خاوی کارەکەم بچێتە پێشەوە، کە مایەی ناسودەییم بوو.

لەکۆتاییدا منی برد بۆ ژوورێکی گەورە، کە بە سەدان پیاو تێکترنجابوونە ناوییەوە. بە وردییەکی زۆرەوە چاوی گێڕا، تا پیاوێکی گەنجی دۆزییەوە، چوو هێنایی و لەگەڵی کەوتە قسە تا لە منی نزیککردەوە.

"من دەتوانم بە ئینگلیز قسەبکەم،" پیاوە گەنجەکە وتی. "ئێرە بەشی پیاوانە." تەواو دیاربوو کە وایە. "ئەم فەرمانبەرە دەیەوێت، لێرانەدا، لەم سەرەیەدا، چاوەڕوانبکەیت. لەوانەیە پاش یەك دوو کاژێری تر بگەڕێتەوە بۆ لات بزانێت، چیت کردووە."

"باشە، چی دەکەن؟"

پیاوە گەنجەکە پرسیار و وەڵامەکەی وەرگێڕا.

"پاسپۆرتت پێدەدەن."

"هەر ئیمرۆ؟"

"بەڵێ. هەر ئێمڕۆ. ئەگەر لەم سەرەدیەدا ڕاوەستی."

کەوتمە گەڕکردن پێیان. "باشە، بەڵام تازە من ئێمڕۆ هاتووم بۆ ئەم کارە، لەوەوپێش نەهاتووم."

"وایە، بۆت ئەگونجاوە بێیت."

"تەنیا ئەم بەیانییە فۆرمی داواکردنم هێناوە."

"چاکە، ئێمڕۆ هەرچی چۆنێك بێت، پاسپۆرتت پێدەدەن. تەنیا لێرانەدا چاوەڕوانبکە."

هەر دوو پیاوەکە ڕۆیشتن، منیش لە جێگای خۆمدا خەریکبوو شێتدەبووم. ئایا ئەمە دەبێت؟ مودی ئەو هەموو کاتە دووروودرێژە چاوەڕواندەکات بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی کارە پزیشکێکەی. سەرەڕای ئەو هەموو خۆهەڵکێشانە، چ خۆی و چ کەسوکاری نەیانتوانی کارێکی بەرچاو بکەن لەگەڵ دەزگای بیرۆکراتیکی سەدەکانی ناوەڕاست. بەڵام ئایا من و ئاماهل بە هەڵەدا نەچووبووین سەربارەت بە کاریگەری مودی لێرە؟ یان مامل؟ یان مەجید؟ یان بابەحاجی، بەو پەیوەندییانەی کە لەگەڵ کاروباری ناردن - هێناندا هەیبوو؟ یەکەم خزمی مودیم بیرکەوتەوە، زیا حەکیم، ئەوەی کە لە فڕۆکەخانە بینیمان، سوکوئاسان بە ناو پۆلیسی کۆنترۆڵدا هات و ڕۆشت.

ترس لە پەلوپۆی خستم. لە نێو غەڵبەغەڵبی ئەو سەدان پیاوە ئێرانیدا، هەستمدەکرد ڕووتم، هێزم لەبەربڕاوە، ژنێکی تەنیا لەنێو کۆمەڵگایەکی پیاواندا. ئایا بەڕاستی ئەمە ڕوودەدات؟ ئایا مودی لەم پلانە نگریسەیدا سەردەکەوێت؟

چاوەچاوەمبوو بەدوای ڕێگایەکدا و هەڵبێم، بەڵام بێجگە لە شەقامەکانی تاران، شوێنێکی ترم نەبوو. باڵوێزخانە؟ پۆلیس؟ ئاماهل؟ لەو شوێنانە هیچی مەهتابی لێنەبوو. مەهتاب لەماڵەوە بوو، لەژێر دەستی دوژمندا.

هەڵنەهاتم، لە شوێنی خۆمدا مامەوە، وردەوردە لە سەرەکەدا دەچوومە پێشەوە، دەمزانی مودی بە هۆی پەیوەندییەکانییەوە ڕاپۆرتێکی تەواو وەردەگرێت لەسەر هەڵسوکەوتم.

تا دەهات سەرەکە کورتتر دەبۆوە و نیگەرانیم زیاتر دەبوو. چەندەها کاژێر لە سەرەدا ڕاوەستاوم بۆ دەستەوارەیەك نان، بۆ پارچەیەك گۆشت و بۆ کیلۆیەك هێلەکە، کە نیوەی شکابوون. ئەدەبوو ئەم سەرەی پاسپۆرتە زیاتر کات بەرێت؟ ئایا ئەمدەزانی لەگەڵ دەزگایەکی کارادا بەرەوڕووم؟

سەرئەنجام سەرەکە گەیشتە سەر من، کاغەزەکانم دایە دەست فەرمانبەرێکی ڕەزاقورس. ئەویش بە دەوری خۆی پاسپۆرتێکی دایە دەست من. بە پەرێشانییەوە چاوم تێبڕی، ئەمدەزانی پاش ئەوە سەری خۆم بۆ کوێ هەڵگرم.

مێشکم پڕ جەنجاڵ بوو، بەڵام کاتێك لە ئۆفیسەکە هاتمە دەرەوە، ئەوە هات بە خەیاڵمدا، کە لەوانەیە مودی دواکەتنی من لەبەرچاو بگرێت. تۆزێك لە نیوەڕۆ لایدابوو. لەوانەیە نەزانێت کە بە چ خێراییەك ئەو پاسپۆرتە شومەیان پێداوم.

خێرا کەوتمە خۆم، هەوڵمدا خۆم لەم تەڵە تازەیەی بدزمەوە، تەکسییەکەم گرت بەرەو ئۆفیسی ناماهل.

ئەوە یەکەم جارم بوو، بەبێ تەلەفونکردن بچم بۆ لای. دەموچاوی دا بە یەکدا، کە زانی کەوتمەتە چ قەیرانێکەوە.

"ناتوانم بە چاوی خۆم بڕوابکەم،" ناماهل وتی، کاتێك تەماشای پاسپۆرتەکەی دەکرد. "هەرگیز شتی وام نەبیستووە. دەبێت هەندێك پەیوەندی هەبێت، من پێمنەزانیبێت. بۆ خۆم پەیوەندیم هەیە لەوێ، بەڵام ناتوانم شتی وا بکەم."

"ئێستا من چی بکەم؟" پرسیارمکرد.

ناماهل پەڕە بە پەڕەی پاسپۆرتەکەی تەماشاکرد. "ئەمە دەڵێت، تو لە ئەڵمانیا لەدایکبوویت،" ناماهل سەرنجیدا. "ئەمە بۆ؟ تۆ لە کوێ لەدایکبوویت؟"

"لە ئەلما، مەشیگان."

ناماهل تۆزێك بیرکردەوە. "ئەلمان بە فارسی بە واتای ئەلمانیا دێت. ئەمە چاکە. بە مودی بڵێ، کە بەیانی دەبێت پاسپۆرتەکە بەرێتەوە بۆیان و چاکیبکەن. چونکە ئەو پاسپۆرتە ناخوات، ئەگەر چاکنەکرێت. بەو شێوەیە، سبەینێ بەیانی بچۆرەوە بۆ ئۆفیسی پاسپۆرت. بۆیان جێبهێڵە و بڕۆ. بواریان پێمەدە بۆت چاکبکەن. پاشان بە مێردەکەت بڵێ، پاسپۆرتەکیان لای خۆیان هێشتۆتەوە. کات دەبات تا بۆت ڕاستدەکەنەوە."

"چاکـــە."

لە ئۆفسەکەی ناماهل خێرا کەوتمە ڕێ بە ناو شاردا، لە مێشکی خۆمدا ئەگەری جۆراوجۆرم دەهێنایە پێش چاوی خۆم. ئەوەندە سەرگەرمی ئامادەکردنی قسەکانم بووم، لەسەر ئەو هەڵەیەی ناو پاسپۆرتەکە، کە بە پرسیاری مودی ڕاچڵەکیم.

"ئەو لە کوێ بوویت؟"

"لە ئۆفیسی پاسپۆرت."

"بەڵام کاتژمێری یەك تەلەفونیان بۆ کردم و وتیان پاسپۆرتەکەیان داوەتە دەستت." دەنگی بەرزنەبوو، بەڵام بە ڕقەوە قسەکانی دەکرد.

"تەلەفونیانــکرد؟"

"بەڵێ."

"دەی باشە، ببورە لێم ئەگەر دواکەوتووم. ترافێك زۆر خراپ بوو. هەروەها کێشەم بۆ هاتە پێشەوە لە پاس گۆڕیندا."

مودی بە گومانەوە تەماشایکردم. لەوە دەچوو ئامادەبێت پێمبڵێت، درۆدەکەیت، بەڵام من زوو سەرنجیم بە لایەکی تردا برد.

"دەزانی ئەو بێمێشکانە چیان کردووە" وام وت و پاسپۆرتەکەم دایە دەستی. "تەماشاکە. پاش ئەوەی ڕۆژێکی تەواو چاوەڕوانمکرد، کەچی هەڵەیەکیان لە پاسپۆرتەکەمدا کردووە. ئەڵمانیایان لەسەر نووسیوە. دەبێت بۆیان بەرمەوە و چاکی بکەن."

مودی بە وردییەوە سەیری پاسپۆرتەکەی کرد و بینی، کە من ڕاست دەڵێم. پاسپۆرتەکە لەگەڵ کارتی پێناسنامەکەم نەدەهاتەوە.

"سبەینێ،" مودی دەنگی لێوەهات. پاشان هیچی نەوت.

بۆ بەیانی لەگەڵ مودی هەوڵمدا، کە ڕێگامبدات خۆم بەتەنیا پاسپۆرتەکە بەرمەوە. ڕۆژی پێشوو توانیبووم کارەکە ئەنجامبدەم. بەڵام مودی گوێینەدا بە قسەوباسەکەم. هەرچەند بۆ ئەو ڕۆژە نەخۆشی هەبوو، بەڵام ئەوانیشی پشتگوێخست و تەکسیەکی تەلەفونی جۆری خێرای گرت و منی کێشکرد بۆ ناوی. فەرمانیدا بە کابرای شوفێر و زۆری نەبرد گەیشتینە ئۆفیسی پاسپۆرت. هاوڕێکەی خۆی دۆزییەوە و پاسپۆرتەکەی دایە دەستی و پێنج خولەکی نەبرد، پاسپۆرت سەرئاسا بە چاککراوی درایەوە دەستی.

ئیتر بە شێوەیەکی ڕەسمی مۆڵەتی جێهێشتنی ئێران هەبوو.

بە تاقیتەنیـــــا.

مودی لە هێڵی هەوایی سویسرا جێگای بۆ گرتم، کە ڕۆژی پێنج شەممە، ڕێکەوتی سی و یەکی کانوونی دووەم لە تارانەوە فڕینیان هەبوو.

"سەرئەنجام،" ئاماهل وتی. "هەموو شتێك ئامادەکراوە."

بەیانی ڕۆژی سێ شەممە، سێ ڕۆژ پێش فڕینەکەم، بڕیارماندا، من و مەهتاب بۆ ڕۆژی دوایی ماڵەوە جێبهێڵین، کاتێك مودی لە نەخۆشخانە کاردەکات. هەڵهاتنەکەی ئێمە بە دوو ڕۆژ دەکەوتە پێش پلانەکەی ئەودەوە.

ئاماهل وردەکاری پلانەکەی بە درێژی بۆ باسکردم. ئەو هەموو هەوڵە، کە لەگەڵ پلانی فڕین بۆ بەندەر عەباس و چوونە دەرەوە لە وڵات بە بەلەمی خێرا، بە سەرئەنجام نەگەیشت. کە مودی کاری بەو ئاستە گەیاند، ئاماهل بەناچاری دەستی برد بۆ پلانێکی تر، کە بە پلەی دووەم کاری لەسەر کردبوو. من و مەهتاب لە ئۆی بەیانیدا، بە فڕۆکە لە تارانەوە دەچین بۆ زاهیدان، لەوێوە کۆمەڵێك قاچاغچی شارەزا بەناو شاخە بەرزکانی پاکستاندا دەمانبەن بۆ کوێتەی پاکستان و پاشان بۆ کەراچی.

یەکسەر ترسم لێنیشت، چونکو بەو زووانە بەسەرهاتێکی دڵتەزێنم لە *کیهان*دا خوێندبۆوە. بەسەرهاتی ژن و پیاوێك بوو، کە لەلایەن دەستەیەکی خێڵەکییەوە لە کوێتە دەرفێنرێن و دەبرێن بۆ ئەفغانستان، لەوێ بۆ ماوەی هەشت مانگ دەگیرێن، پێش ئەوەی

ئازادکرێن. دەمتوانی بیهێنمە پێش چاوی خۆم، کە لە ژێر باری چ ترس و تۆقاندنێکدا بوون.

بەسەرهاتەکەم بۆ ئاماهل گێڕایەوە.

"ئەوە ڕاستە،" وتی. "ئەو جۆرە شتانە هەموو کاتێك ڕوودەدەن. دیارە ڕێگای دەرچوون لە ئێران، بێ مەترسی گەورە نییە." هەولێدا دڵنیامبکات، کە پەیوەندییەکی دۆستانەی هەیە لەگەڵ سەرۆك خێڵەکانی ئەو ناوچەیە، کە دەسەڵاتیان بەسەر هەر دوو دیوی سنوورەکەدا هەیە. "لە هەموو ئەو ڕێگایانە کە لە ئێران دەچنە دەرەوە،" وتی. "ئەم ڕێگایە کەم مەترسیترینیانە. لەوێ باشترین پەیوەندیم هەیە. بەندەر عەباس و پلانەکانی تر، ئەوەندە خێرا بەدەستەوە نایەن. بەهۆی بەفرەوە تورکیا مەحاڵە. لەو کاتانەی ساڵدا قاچاغچی بەو ناوچانەدا هاتوچۆ ناکەن. بەفر زۆر دەبارێت و دنیا دەیبەستێت. ڕێگای زاهیدان لە هەر ڕوویەکەوە زۆر باشترە لە تورکیا، چونکو لە نزیکی سنووری تورکیا ئێشکگری زۆرتر لێیە. *پاسداران* لەو ناوچەیە ئێشکدەگرن."

دەبوو بڕۆین. ئیتر نەماندەتوانی دڵخۆش بکەین بە قسەکەی ئاماهل، کە دەیوت "ئارامــبگەرە"، بەڵکو دەبوو دوای ئامۆژگارییەکەی باوکم بکەوین، "لە هەر کوێیەك وردت هەبێت، ڕێگای دەرچوونت هەیە."

زەرفێکی پلاستیکی پڕ شتم دا بە ئاماهل. جلی گۆڕینی خۆم و مەهتابی تیادابوو، لەگەڵ چەند شتی تر، کە حەزمنەدەکرد جێیانــبهێڵم. یەکێك لەو شتانە پارچەیەك قوماشی چنراوی گەورە بوو، کە دیمەنی پیاو و ژن و منداڵان بوو لە دەرەوەی ماڵ، خۆشیان لە جوانی سروشتی کەنار ڕووبارێك دەبینی. ڕەنگەکانی پەمەیی، شینی کاڵ و خۆڵەمێش بوون، کە بە شێوەیەکی جوان تێکەڵکرابوون. توانیم قەدیبکەم تا بوو بە پاکەتێکی یەك پێ دووجا. هەروەها دوو بتڵی شوشەی باریکی زەعفەرانی، کە عەمە بزورگ بۆ کریسمس بە دیاری بۆی هێنابووم.

زۆر خەیاڵ هات بە مێشکمدا، کاتێك گفتگۆم لەگەڵ ئاماهلدا دەکرد. هەواڵ لە ئەمریکاوە تاڵ و شیرین بوو. باوکم دەستی لە ژیان بەرنەدابوو، چاوەڕوانی بینینی ئێمەی دەکرد. وردم دابووە خۆم، ئاماهلیش ڕێگای دەرچوونی ئامادەکردبوو. بۆ سبەینێ، بەبێ ئاگاداری مەهتاب خۆی، وای لێدەکەم دوابکەوێت، خۆئامادەکردنی بۆ قوتابخانە زۆرتر درێژە بکێشێت تا دڵنیادەبم فریای پاسی قوتابخانە ناکەوێت. پاشان خۆم دەیبەم بۆ قوتابخانە. هەر ئەوەندەی لە ماڵ هاتینەدەرەوە و لە مودی دووركەوتینە، ئەو مژدەیەی پێدەدەکەم کە بە ڕێگاوەین بۆ ئەمریکا. کە مێردە بێگومانەکەم چوو بۆ نەخۆشخانە بۆ کارکردن، من و مەهتاب پەیوەندی دەکەین بە پیاوانی ئاماهلەوە، کە یارمەتیمان دەدەن بچینە ناو فڕۆکەخانەوە بۆ فڕین بۆ زاهیدان.

شتێکی سەیر بوو، هەر هەمان ڕێگای هەڵهاتن بوو، کە کاتی خۆی لەگەڵ خانمی عەلاوی پلانمان بۆ کێشا. بۆم پرسیاربوو چی بەسەر ئەو ژنە هات. لەوانەیە گیرابێت. لەوانەیە لە ئێران دەرچووبێت. هیوادارم وا بێت.

"ئەمە چەندی تێدەچێت؟" لە ئاماهلم پرسی.

"داوای دوانزە هەزار دۆلار دەکەن." وەڵامی دامەوە. "نیگەرانی ئەوە مەبە. کاتێک دەگەیتە ئەمریکا بۆم بنێرە."

"دەستبەجێ بۆت دەنێرم،" بەڵێنم پێدا. "وە زۆر سوپاستدەکەم."

"شایەنی نییە."

بۆچی ئاماهل ئەم هەموو شتە بۆ من و مەهتاب دەکات، هەتا دوانزە هەزار دۆلار دەخاتە قوڕگی شێرەوە لە پێناوی مندا؟ هەندێک وەڵامی ئەو پرسیارەم لا ڕۆشن بوو، بەڵام هیچ کات بەرەوڕوو ئەم پرسیارەم لە خۆی نەکرد.

ئاماهل دەویست شتێک بیسەلمێنێت بۆ خۆی، بۆ من و بۆ جیهان. بۆ ماوەی هەژدە مانگ کەوتمە داوەوە لە وڵاتێکدا، کە لەوەدەچوو هەر هەموو خەڵکەکەی دڕندەبن بەرامبەر بە من. حەمیدی دوکاندار یەکەم کەس بوو پیشانیدام، کە بە هەڵەدا چووم. خانمی عەلاوی، شەمسی، زاری، فریشتە و چەندها کەسانی تر، هەر هەموو ئەوەیان سەلماند، کە تۆ ناتوانیت بە پێوانەیەکی میللی تەماشای ئینسانەکان بکەیت. هەتا عەمە بزورگ، بە ڕێگای تایبەتی خۆی، نیازی باشی خۆیی بە جۆرێک پیشاندا.

ئینجا نۆبەی ئاماهل هاتبوو. هێزی پاڵپێوەنەری هەم ڕۆشن بوو هەم ئاڵۆز، دەویست یارمەتی دوو قوربانی بێتاوانی شۆڕشی ئیسلامی ئێران بدات. چاوەڕوانی پاداشت نەبوو. خۆشی لە ڕزگاربوونی ئێمەدا دەبینی.

بەڵام، ئایا ئێمە ڕزگارمانـــدەبێت؟

نووسراوەی ناو ڕۆژنامەکە، سەبارەت بە فڕاندنی ئەو ژن و پیاوە ئوسترالییە و قسەکانی میستەر ڤینکۆپ لە سەفارت، مایەی ترس و دڵەڕاوکێیەکی زۆر بوون بۆ من. بۆ یەکەم جار کە ئاماژەم بە ئەگەری قاچاغچی کرد، میستەر ڤینکۆپ ئاگاداریکردمەوە: "پارەکەت لێدەسەنن، دەتبەن بۆ سنوور، لاقەتدەکەن، دەتکوژن یان دەتدەنەوە دەست کاربەدەستان."

بەڵام ئەو ئاگادارکردنەوەیە، دەمێک بوو کاریی نەمابوو. ڕێگاکانی بەردەمم هاواریانـــدەکرد. ڕۆژی هەینی دەمتوانی کچەکەم بۆ هەتاهەتایە جێبهێڵم و سواری فڕۆکە ببم و بەبێ هیچ زەحمەتێک بگەمە ماڵەوە لە ئەمریکا. یان سبەینێ دەستی کچەکەم بگرم و پڕ ترسناکترین سەفەر، کە بتوانم بیهێنمە بەرچاوی خۆم، بگرمەبـــەر.

لە ڕاستیدا هیچ ڕێگایەکی ترم نەبوو.

یان بەسەر شاخەکانی نێوان ئێران و پاکستانەوە لەناودەچووم، یان مەهتابم بە سەلامەت دەگەیاندەوە ئەمریکا.

بای سارد لەرزی ئێهێنابووم. کاتێك لە تەکسیە پرتەقاڵییەکە هاتمە خوارەوە. نوقمی نیگەرانییەکانی خۆم بووبووم، کاتێك چوومە سەر شۆستەکە و هەنگاوم دەنا بەناو بەفرەکەدا بۆ برینی دوا فرسەخی ماڵەوە. کاتی گەڕانەوەی مەهتاب بوو لە قوتابخانە. مودیش، دوایی لە نەخۆشخانە دەگەڕایەوە. بۆ ئەو ئێوارێیە شەمسی، زاری و خێزانی حەکیم دەهاتن بۆ ماڵئاوایی‌کردنی من. وەك هەموو ئاگاداربوون، ڕۆژی هەینی دەچووم بۆ سەردانی باوکە گیانەڵەکەم و لەپاش بە خاکسپاردنی دەگەڕێمەوە. پێویستبوو خۆم ئامادەبکەم، هەرچی هیوا و ترسی دڵمە بیشارمەوە.

خەریکبوو دەگەیشتمە ماڵەوە کە سەرم هەڵبڕی، مودی و مامڵم بینی لە دەرەوەی دەرگای حەوشە ڕاوەستاون، هەر دووکیان تەماشای منیان دەکرد. توڕەیی وای لە مودی کردبوو، کە سەرما و بەفربارینی زۆری لەبیربچێتەوە.

"ئەوە لە کوێ بوویت؟" هاواریکرد.

"چووم بۆ شتکڕین."

"درۆزن! خۆ هیچت پێنییە."

"گەڕام بۆ دیارییەك بۆ دایکم. نەمتوانی هیچ شتێك بدۆزمەوە."

"درۆزن!" دووبارەیکردەوە. "بەدوای شتێکەوە بوویت. بڕۆرە ژوورەوە. لە ماڵەوە دەمێنیتەوە تا ڕۆژی هەینی، کە دەچیت بۆ فڕۆکەخانە."

مامڵ بەدوای کارێکدا چوو. مودی لەناو دەرگاکەدا، پاڵی پێوەنام بۆ ژوورەوە و هەڕەشەکەی دووبارەکردەوە. بۆم نەبوو ماڵ جێبهێڵم. بۆم نەبوو تەلەفون بەکاربهێنم. بۆ سێ ڕۆژی داهاتوو، بەندەکرێم تا دەچمە ناو فڕۆکەکەوە. ئەو ڕۆژە لە نەخۆشخانە مۆڵەتی وەرگرتبوو، هەروەها بۆ سبەینێش، تا لە ماڵەوە بێت بۆ پاسەوانیکردنی من. تەلەفونەکەی لە کلینیکەکەیەوە دادەخست، کاتێك نەخۆشی دەبینی. ئەو دوانیوەڕۆیەم لە حەوشەی داخراوی پێشەوەدا بردەسەر، کە پەنجەری کلینیکی مودی تەواو بەسەریدا دەینواڕی. من و مەهتاب پیاوەبەفرینەمان دروستکرد و ملپێچێکی سوورمان کردە ملی. مەهتاب ئەو ڕەنگەی زۆر لا پەسەندبوو.

جارێکی تر، ماڵم لێکرا بە بەندیخانە و چوارپەلم بەسترا. من و مەهتاب نەماندەتوانی، بۆ سبەی ڕۆژ، پەیوەندی بە پیاوەکانی ئاماهلەوە بکەین، بەڵام هیچ ڕێگایەکم نەبوو پەیوەندی پێوە بکەم و لە دواگۆڕانکارییە ترسناکەکانی خۆم ئاگاداریبکەمەوە.

ئەو ئێوارێیە لەناو سەرما و ترس وەك بینیناو دەلەرزیم. کاتێك خەریکی شت ئامادەکردن بووم بۆ میوانەکان و خۆم خەریکدەکرد، مێشکم ڕاکەڕاکی بوو. هەر دەبوو پەیوەندی بە ئاماهلەوە بکەم. دەبوو ڕێگایەك بدۆزێتەوە، من و مەهتاب لەم ماڵە بەرێتە دەرەوە. دیسانەوە لەرزەکەم بۆ هاتەوە، ئەم جارەیان پێمزانی کە ماڵەکەمان خەریکە سارددەبێتەوە. بیرێك هات بە خەیاڵمدا.

"گەرمی ماڵەکە کوژاوەتەوە،" لە لای مودی دەردەدڵمکرد.

"بزانە دەستگاکەی شکاوە یان نەوتی تیادا نەماوە؟" بۆی پرسیاربوو.

"دەچم لە مەلیحە دەپرسم، بزانم هەڵەکە لە چیدایە،" هەوڵمدا ئەم قسەیە زۆر ئاسایی بیڵێم، کە جێ گومان نەبێت.

"بچۆ."

هەوڵمدا وا دەرنەکەوم کە زۆر بە پەلەم، چووم بۆ ماڵی مەلیحە. بە فارسی داوام لێکرد، کە ڕێگەمبدات تەلەفونێک بکەم. بە سەرلەقاندن، ڕازیبوونی خۆی پیشاندا. دەمزانی، لە تەلەفونەکەم بە زمانی ئینگلیز تێناگات.

یەکسەر ئاماهلم گرت.

"نابێت،" وتم. "ناتوانم بێم. ناتوانم لە ماڵەوە بێمە دەرەوە. ئێمڕۆ کە هاتمەوە، ئەو لە ماڵەوە بوو، ئێستا کەوتۆتە گومانەوە لێم."

ئاماهل لەسەر تەلەفونەکە ئاهێکی قوڵی لێوەهات. "هیچ شتێک ناچێتە پێشەوە،" وتی، "هەر ئێستا قسەم لەگەڵ ئەو خەڵکەکەدا کرد لە زاهیدان. قورسترین بەفربارینیان بە خۆیانەوە دیوە لە ماوەی سەد ساڵدا. بڕینی ئەو شاخانە زۆر مەحاڵە."

"باشە چی بکەین،" دەستمکرد بە گریان.

"بەس نەچیتە ناو فڕۆکەکەوە. ناتوانێت زۆرت لێبکات، بتخاتە ناو فڕۆکەکەوە."

"نەڕۆیت،" شەمسیش ئەو ئێوارنیە پێیوتم، کاتێک بۆ ساتێک هەر خۆمان پێکەوە بووین لە چێشتخانەکە. "سواری ئەو فڕۆکەیە نەبیت. دەزانم چی ڕوودەدات. هەر ئەوەندەی تۆ ڕۆیشتی، مەهتاب دەنێرێتە لای خوشکەکەی و لەگەڵ کەسوکاری بۆ جارێکی تر تێکهەڵدەچێتەوە. مــــەڕۆ."

"بەبێ مەهتاب نامەوێت بڕۆم،" وتــم.

بەڵام هەستمکرد، پەتی مودی لە ملمدا قایمتر دەبێت. ئەو هێزەی بەسەر مندا هەبوو، کە زۆرم لێبکات بۆ ناو فڕۆکەکە. دەیتوانی بە دوورخستنەوە مەهتاب، هەڕەشەم لێبکات. نە بەرگەی ئەو هەڕەشەیەم دەگرت نە دەمتوانی بڕۆم بۆ ئەمریکا و مەهتاب لە دوای خۆم جێبهێڵم. بە هەر بارێکدا، دەبوو دەست لە مەهتابم بشۆم.

ئەو ئێوارنیە نەمتوانی تامی ئەو خواردنە بکەم، کە بەزۆر دەمخستە دەممەوە. بە ئاستەم گوێم لە گفتگۆکان بوو.

"دەڵێی چی؟" لەبەرامبەر داوایەکی خانم حەکیمدا، بە پرسیار وەڵاممدایەوە.

دەویست بۆ ڕۆژی دوایی بچم لەگەڵی بۆ *تەعاونی*. کە بازاڕێکی هەرەوەرزی بوو بۆ ئەندامانی مزگەوتەکەی ئاغا حەکیم. تازە باری نیسکیان بۆ هاتبوو، کە لە بازاڕدا بە زەحمەت دەستدەکەوت. "دەبێت بچین فریابکەوین، پێش ئەوەی تەواوبێت،" خانم حەکیم وتی.

شەمسیش دەویست بێت. یەکسەر ڕازیبووم. بەڵام ئەوەی بە خەیاڵمدا نەدەهات، ئیسك بوو.

ئەو ئێوارێیە دواتر، پاش ئەوەی شەمسی و زاری ڕۆیشتن، مەهتاب چووە ناو جێگاوە و مودی لە کلینیکەکەی دوا نەخۆشەکانی دەبینی، من و ماڵی حەکیم لە ژووری دانیشتنەکە بووین و چامان دەخواردەوە، کە لەپڕ میوانێکی هێزهێنەری نادەوەتکراو هات. مامل بوو.

سڵاوی لە ئاغا و خانم حەکیم کرد، بێڕێزانە داوای چای کرد و ئینجا پاشان دەمی پانکردەوە و زەردەخەنەیەکی کرد، دەستی کرد بە گیرفانیدا و بلیتی فڕۆکەکەی بۆ ڕاوەشاندم.

تورەیی هەژدە مانگی پەنگخواردووم تەقییەوە. کۆنترۆڵم بەسەر خۆمدا نەما. "ئەو بلیتەم بەرێ!" قیژاندم. "دەیدڕێنم."

ئاغا حەکیم یەکسەر دەوری ناوبژیکەری بینی. ئەم مێژەربەسەرە لەسەرخۆیە، کە لە تەواوی کەسوکاری مودی تێگەیشتووتر بوو، یەك لەسەر یەك کەوتە پرسیارکردن لێم. ئینگلیز قسەی نەدەکرد. دەبوو مامل بۆ وەربگێڕێت، بەڵام نەیکرد. بۆ منیش سەخت بوو بە فارسی تێیبگەیەنم، بەڵام بەناچاری کەوتمە هەوڵدان. ئاغا حەکیمم وەك هاوڕێ و پاڵپشتی خۆم چاوەلێدەکرد.

بەسەرهاتی خۆمم بۆ هەڵڕشت. "تۆ نازانی، من لێرە چیم بەسەرهاتووە،" بەدەم هەنسکدانەوە وتم. "منی لێرە بەزۆر هێشتۆتەوە. دەمویست بگەڕێمەوە بۆ ئەمریکا، بەڵام منی بەزۆر گلداوەتەوە."

ئاغا حەکیم بەڕاستی واقیوڕما. چەند پرسیاری تری لێکردم، لەگەڵ هەر وەڵامێکی مندا دەموچاوی دەدا بە یەکدا. هەموو ئەو شتە ناخۆشانەی کە لە ماوەی ئەو ساڵ و نیوەدا بەسەرم هاتبوو، بۆم باسکرد.

ئینجا وڕبوو. "باشە، تۆ بۆچی پێتخۆش نییە، بچیت بۆ ماڵەوە و سەردانی خێزانەکەت بکەیت؟"

"دەمەوێت بچم و لەگەڵ خێزانەکەم بم،" باسمکرد. "بەڵام مودی دەیەوێت لەوێ بمێنمەوە تا هەموو شتومەکەکانمان دەفرۆشم و دۆلارەکانی دەهێنمەوە. باوکم لە گیانداندایە. نامەوێت بچمەوە بۆ ئەمریکا بۆ شتفرۆشتن."

کە مودی کاری لە کلینك تەواوبوو، لە ژووری دانیشتنەکە پێمانەوە پەیوەستبوو، کەوتە بەر لێشاوی پرسیارکردنی ئاغا حەکیم. مودی ئارام بە فارسی وەڵامیدایەوە. خۆی وا پیشاندەدا کە سەرسامە، وەك ئەوەی یەکەم جاری بێت، بیبیستێ کە من نامەوێت سەفەربکەم.

لە کۆتاییدا ئاغا حەکیم پرسیاری کرد، "چاکە، ئەگەر بیتی نەیەوێت ئەو سەفەرە بکات، ئایا هەر دەبێت بڕوات؟"

"نـــا،" مودی وەڵامیدایەوە. "من ئەمەم لەبەر ئەو کردووە، کە بچێت خێزانەکەی ببینێت." مودی ڕوو بە من پرسیاریـکرد، "ئایا دەتەوێت بڕۆیت؟"

"نـــا،" خێرا وتم.

"چاکە. دەی ئینجا کێشە چییە؟ ئەمە بۆ تۆیە، کە بچیت باوکە گیانەڵەکت ببینی. ئەگەر تۆ ناتەوێت بچیت، دەی ئیتر پێویست ناکات بچیت." ئەو قسانە لە دڵسۆزیی، ڕێز و خۆشەویستییەوە بوو بۆ من، وە ئەوەی وترا لەو دانیشتنەدا بۆ ڕێزلێنان لە ئاغا حەکیم بوو. ئیتر بابەتەکە سەری نرایەوە.

لە باقی سەردانەکەدا، مودی بەئارامی خەریکی گفتگۆ بوو لەگەڵ میوانەکان. خانەخوێیەکی بەڕێز بوو، کە خێزانەکە هەستان بڕۆن، مودی بەڕێیکردن تا دەرگاکە و سوپاسی هەموویانی کرد بۆ هاتنیان، سوپاسی ئاغای حەکیم کرد بۆ پەرۆشبوونی. "کاتژمێری دەی بەیانی دێم بۆ لات تا پێکەوە بچین بۆ *تەعاونی*،" بە خانمی حەکیمم وت. بەو هیوایەی لەو هاتوچۆیەدا، هەلێك هەڵکەوێت و پەیوەندی بە ئاماهلەوە بکەم.

کە ماڵی ئاغا حەکیم چوونە دەرەوە، مودی بە هێواشی دەرگاکەی داخست. چاوەڕوانبوو تا ئەوەندە دوورکەوتنەوە کە گوێیان لە هیچ شتێك نەبێت، ئینجا بۆ من گەڕایەوە و پیامدا تەقییەوە. وە بە قایم کێشای بە دەموچاومدا، کە خۆم نەگرتەوە بە پشتدا کەوتم.

"بەزمت نایەوە!" نەڕاندی. "هەموو شتێکت خراپکرد. هەر دەچیتە ئەو فرۆکەیەوە. ئەگەر نەچیت، مەهتابت لێدەسێنم و بۆ هەموو ژیانت، دەرگای ژوورەکەت لەسەر دادەخەم!"

# 23

دەیــتوانی و ئەو کارەشی لەدەستــدەهات.

ئەو شەوە خەو نەچووە چاوم. لە پەرێشانیدا هەر ئەمدیو و ئەودیوم دەکرد، بیرمــدەکردەوە بۆچی مەهتابم هێنا بۆ ئێرە، بێبڕانەوە سەرکۆنەی خۆمم دەکرد.

سەرەتای ئەم گریفتە، نزیکەی چوار ساڵ لەموپێشەوە دەستیپێکرد، لە ئێوارەی حەوتی نیسانی ساڵی هەزار و نۆ سەد و هەشتا و دوودا، کاتێک مودی لە کار لە نەخۆشخانەی گشتی ئەلپێنا هاتە ماڵەوە، تەواو نیگەران و ئاگای لە خۆی نەبوو. لە سەرەتاوە سەرنجمنەدا، چونکو سەرگەرمی ئامادەکردنی ئانخواردنێکی تایبەت بووم بۆ ئەو ئێوارێیە. دوانزەهەمین ساڵی لەدایکبوونی جۆن بوو.

بۆ دوو ساڵ دەچوو، ژیانێکی پڕ کامەرانیمان هەبوو. لە ساڵی هەزار و نۆ سەد و هەشتاوە مودی لە کۆرپۆس کریستییەوە گەڕابۆوە مەشیگان و بڕیاریدابوو، کێشە و گۆڕانکارییە سیاسییەکانی ئێران لە ژیانی خۆی دەربکات. "هەموو کەس دەزانێت من بیانیم،" وتی. "بەڵام نامەوێت، کەس بزانێت ئێرانیم."

وێنەی ئایەتوڵا خومەینییە مۆنەکەمان لە ئەمبارەکەی سەرەوە هەڵگرت. بەڵێنیدابوو، ئیتر لە شوێنی کار باسی هەلومەرجی سیاسی ئێران نەکات، چونکو دەیزانی ژیاننەوەی شوروشەوقی بۆ وڵاتەکەی لە کۆرپوس کریستی، بێجگە لە دروستکردنی کێشە و دەردیسەری بۆ خۆی، هیچ شتێکی تری بەدواوە نەبوو. لە ئەلپێنا لە کارەکەیدا خێرا جێکەوت، وەك پیشەگەرێك هەستایەوە سەر پێی خۆی و وەك ئەمریکییەك ژیانی دەستپێکردەوە.

باری دەرونیم دەستبەجێ باشتر بوو، بە تایبەتی کە ئەو خانووەمان لە سوندە بای ریڤر دەسکەوت. بچوك بوو، لە دەرەوە بەڕوکەش زۆر جێگای سەرنج نەبوو، بەڵام هەر کە پێم نایە ناوی، دڵم پیایدا چوو. خانووەکە ڕووی لە ڕووبارێك بوو. دواوەی خانووەکە پەنجەرەی گەورەی تیادابوو، کە دەینواڕی بەسەر دیمەنی جوانی جۆراوجۆردا. بە ڕیزێك پێپلیکانە دەچووە نهۆمی خوارەوە، کە ژوورێکی فراوانی ڕووناك بوو. لەوێوە دەچووە ناو دەشتاییەکی فراوان، کە تەنیا پێنج مەترێك لە قەراغی ڕووبارەکەوە دووربوو. سەکۆیەکی تەختە درێژدەبۆوە بۆ ناو ڕووبارەکە، کە بۆ ڕاوەماسی و لەنگەرگرتنی بەلەم دەستیدەدا. خانووەکە لە شوێنێکدا بوو، کە ڕووبارەکە پێچی دەکردەوە. تۆزێك خوارتر، پردێکی جوان هەبوو بۆ پەڕینەوە بە سەر ڕووبارەکەدا.

خانووەکە لەناوەوە تەواو کراوە بوو، ژووری نوستنێکی گەورە، دوو حەمام، چێشتخانەیەکی خۆمانەی جوان، دوو جێگا ناگردانی کراوە و ژووری دانیشتنێکی گونجاوی لە خۆ گرتبوو. دانیشتن و نوارین لەو ڕووبارە، مایەی هەستێکی ئاسودەیی و خۆشی بوو.

مودیش وەك من، خانووەکەی پێخۆشبوو. یەکسەر کڕیمان.

ئەلپێنا تەنیا سێ کاژێر دوور بوو لە بانیستەرەوە، بەو هۆیەوە دەمتوانی زووزوو هاتوچۆی کاسوکارم بکەم. من و باوکم کاتێکی خۆشمان دەبردەسەر بە ڕاوە ماسی. لەگەڵ دایکیشم چەندەها کاژێرمان پێکەوە دەبردەسەر بە قسەکردن، چێشتلێنان و شت چنین. بە دوای هەر هەڵێکەوە بووم، کاتێکی زۆرتریان لەگەڵ بەرمەسەر، بە تایبەتی کە نیشانەی پیرێتی تیایاندا دەرکەوتبوو. دایکم بە دەست نەخۆشی پێستەوە[6] نازاریدەکێشا. دڵشادبووم بەوەی، کە دەیتوانی چەند کاتێکی خۆش لەگەڵ کچەزاکەی بەرێتەسەر. مەهتابە بچکۆلە، بەناو ماڵەکەدا دەروژووریـدەکرد و سەرچاوەی خۆشی بوو بۆ دایە و بابە. بابە بە ناوی "تۆبی"یەوە بانگیـدەکرد.

بەناسانی لەنێو کۆمەڵی هاوکارانی پزیشکیدا جێگەمان بۆوە، زۆر جار سەردانمانـدەکردن و دەهاتن بۆ ماڵمان. مودی لە کاردکەی ڕازیبوو، منیش وەك دایك و هاوسەرێك خۆشحاڵ بووم - تا ئەو ئێوارێیەی مودی بە خەمباری و دەموچاوێکی مۆنەوە لە کار گەڕایەوە.

کوڕێکی نەخۆشی تەمەن سێ ساڵە، بەهۆی نەشتەرگەرییەکی سادەوە، لە ژێر دەستیدا مردبوو. وەك تاوانباڵدراوێك، مۆڵەتی ئەو جۆرە کاریان لێسەندبۆوە تا لێکۆڵینەوە لەو بارەوە بە سەرئەنجام دەگەیشت.

بەیانی ڕۆژی دوایی، کارۆلینی خوشکم تەلەفونیکرد. بە چاوی سووری گریان و خەواڵوی کەمخەوییەوە، دەستم دایە تەلەفونەکە. وەك ئەوەی لە خەودا بم، کە کارۆلین وتی: "بابە تووشی شێرپەنجە بووە."

یەکسەر بە ئوتومبیل چووین بۆ نەخۆشخانەی کارسۆن ستی، شوێنێك کە من و مودی بۆ یەکەم جار تیایدا یەکتریمان ناسی. بەنیگەرانییەوە لە ناو ژووری چاوەڕوانیدا هاتوچۆمانـدەکرد، کاتێك نەشتەرگەران ناوسکی باوکمان کردبۆوە و دەیانپشکنی. هەواڵەکان خراپ بوون. نەشتەرگەرەکان *کۆلۆستۆمی*یان بۆ دانا، بەڵام نەیانتوانیبوو، تەواوی ئەو شوێنانەی نەخۆشییەکە گرتبوویەوە، لێیبکەنەوە. نەخۆشییەکەی زۆر بڵاوبووبۆوە. دانیشتنێکمان لەگەڵ کارشناسی چارەسەری کیمیاویدا کرد، بۆی باسکردین، کە تەنیا دەتونێت بۆ ماوەیەك تەمەنی باوکم درێژکاتەوە چەند، نەیدەزانی. بەڵام ئەوە ڕۆشنبوو، کە ئێمە باوکمان لەدەستدەدەین.

پەیمانم بە خۆم دا، کە چەند بتوانم لەگەڵ باوکمدا بم، دەستیبگرم، ئەوەی پێویستبێت لەگەڵی باسیبکەم، تا زۆر درەنگ نەکەوتووە.

ژیانم ژێروژوور بوو. چەند مانگ لەوەو پێش، ژیانێکی زۆر خۆشترمان هەبوو لە هەموو کاتێکی تر. کەچی لەپڕ پیشەی مودی کەوتە مەترسییەوە، ژیانی باوکم کەوتە نیمرۆ و سبەینێوە و ئاسۆی داهاتوومان تروسکایی تیادا بەدینەدەکرا.

خەمۆکی کاریگەری خۆی دانا لە سەرمان، چ وەك تاکەکەس و چ وەك ژن و مێرد.

بۆ چەند هەفتەی داهاتوو، کەوتینە هاتوچۆ لە نێوان ئەلپێنا و کارسۆن ستی. مودی یارمەتی باوکمی دا لەو تەنگەژە دەروونییەی کە تێیکەوتبوو، وەك ئەکامێکی نەشتەرگەرییەکە. لەوە دەچوو تەنیا بە بینینی مودی، باوکم ئازارەکەی کەمبێتەوە. مودی وەك دکتۆرێك ڕێنوێنیدەکرد و زاراوە دەرمانییەکانی بە زمانێکی سادە بۆ ڕۆشندەکردەوە.

کاتێك باوکم کەمێك هەستایەوە سەرخۆی، کە بتوانێت سەفەربکات، مودی داوای لێکرد، بێت بۆ ئەلپێنا بۆ سەردانمان. مودی بۆ چەند کاژێر ڕاوێژی لەگەڵ کرد، کە ڕاستییەکانی نەخۆشیکەی قبووڵبکات و فێریکرد، چۆن لەگەڵ کۆلۆستۆمییەکەی بژی.

لە ڕاستیدا باوکەم تەنیا نەخۆشی مودی بوو. هەرکاتێك ئەم دووانە پێکەوە بوونایە، مودی وەك دکتۆر چاوی لەخۆی دەکرد. بەڵام کاتێك لە ئەلپێنا لەماڵەوە بە بەتاڵی دادەنیشت، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ مۆنتر دەبوو، هەستیدەکرد شکستی خواردووە. کە هەفتەکان تێپەڕی، تەمەڵی و دانیشتن کاری خۆیان کرد.

"کێشەیەکی سیاسییە،" مودی کردبوو بە بنێشتە خۆشەی سەر زمانی، مەبەستی لێکۆڵینەوەکەی نەخۆشخانە بوو.

هەوڵیدا، زانیاری خۆی تازە ڕاگرێت، بەچوونی بۆ سیمینار و کۆنفرانسی دەرمانی، بەڵام وای هەستدەکرد، کڵاو دەنێتە سەر خۆی، بەوەی کە ناتوانێت ئەو زانیارانەی بەدەستی دەهێنێت، بیخاتەگەڕ.

هەردووکمان تەواو لە غەمی پارەدا بووین و لەو باوەڕەدا بووم، بە گەڕانەوەی مودی بۆ سەرکار باری دەروونی باشتر دەبێت. هیچ نەخۆشخانەیەك ڕێگاینەدەدا، وەك دکتۆر کاری بێهۆشی بکات تا ئەو کاتەی لێکۆڵینەوەکە بە سەرئەنجام دەگەیشت، بەڵام هێشتا مۆڵەتی هەبوو، وەك پزیشکی کەمکردنەوەی ئازار کاربکات. هەمیشە لەو باوەڕەدا بووم، کە ئەو جۆرە کارە لە هەموو ڕوویەکەوە زیاتر بۆ ئەو باشە.

"باشترێکە بچیت بۆ دیترۆیت،" پێشنیارمکرد. "بگەڕێردوە بۆ کلینیکی شەقامی فۆرتینس. هەمیشە پێویستیان بە کەسێکە کاریان بۆ بکات." ئەمە ئەو شوێنە بوو، کە لە ماوەی ساڵانی ئیقامەیدا، زۆر شتی تیادا فێربوو، هێشتا لەوێ کۆمەڵێك هاوڕێی مابوو.

"نـــا،" وەڵامیدایەوە. "لێرە دەمێنمەوە و شەڕی خۆم دەکەم."

لە ماوەی چەند ڕۆژدا، بوو بە پیاوێکی خەمبار و توڕە، کە لەسەر سادەترین شت، یان شتێك کە تەنیا لە مێشکی خۆیدا بوو، دەهات بە گژی من و منداڵەکاندا. دەستی لە چوونی سیمینار و کۆنفرانسی دەرمانی هەڵگرت، چونکو پێیخۆشنەبوو تێکەڵی دکتۆرەکانی تر بێت. کاری ڕۆژانی بوو بە دانیشتن لە سەر کورسی و تێڕمان لە ڕووبارەکە و چەندەها

کاژێر تێدەپەڕی بەبێ ئەوەی ورتەی لە دەم بێتە دەرەوە. کاتێك لەمە هیلاکدەبوو، دەنوست. هەندێك جار گوێبیستی ڕادیۆ دەبوو یان کتێبی دەخوێندەوە، بەڵام نەیدەتوانی هۆشی لابیبێت. نەیدەویست لە ماڵ بچێتە دەرەوە و حەزی بە بینینی کەس نەدەکرد.

وەك دکتۆرێك، دەیزانی ئەمانە جۆرێکە لە نیشانەکانی نەخۆشی خەمۆکی. هەروەها منیش وەك ژنی دکتۆرێك دەمزانی، بەڵام ئەو گوێی بۆ کەس نەدەگرت و دەستی نا بە ڕووی هەر هەوڵێکەوە بۆ یارمەتیدانی.

بۆ ماوەیەك هەوڵمدا، دڵنەوییبکەم و بەجۆرێك گریفتەکەی لا سووکبکەم، کە پێم وابوو، وەك هاوسەرێك ئەرکی سەرشانمە. بێگومان کە سەری ئەم هەوڵەم دای لە بەرد، قورساییەکی زۆر کەوتە سەر شانم. هەفتەی چەند جار، خۆم و منداڵەکان دەچووین بۆ بانیستەر بۆ بینینی باوکم، بەڵام مودی ئیتر لەگەڵمان نەدەهات. لە ماڵەوە دەمایەوە و هیچی نەدەکرد.

بۆ چەند هەفتە هەر چاوەڕوانبووم، خۆم دەدزییەوە لە بەرەوڕووبوونەوە، بەو هیوایەی ئاهێکی تێگەڕێ و بێتەوە سەر پێی خۆی. دوودڵیم نەبوو لەوەی، کە ئەمە هەروا زوو کۆتاییــنایەت.

هەفتەکان وردەوردە بوون بە چەند مانگ، ڕۆژ هات و ڕۆژ ڕۆیشت هیچ گۆڕانکارییەك ڕووینەدا. زۆربەی کات لەگەڵ باوکم بووم لە بانیستەر و کەمتر دەکەوتمە ماڵەوە، لە ماڵیشەوە خەمۆك و بێکەیفی مودی تا دەهات زیاتر مایەی وەڕسی بوو. هیچ داهاتێکی مانگانەمان نەبوو، ئەوەی هەشمان بوو بەخێرایی بەرەو تەواوبوون دەچوو.

تا توانیم خۆم لە قسەوباس دزییەوە، تا ڕۆژێکیان تەقیمەوە.

"بچۆ بۆ دیترۆیت و کارێك بدۆزەرەوە!" هاوارمــکرد.

مودی بە چاوی زەقەوە تەماشایکردم. ڕقی دادەهات لە دەنگ بەرزکردنەوەی من، بەڵام بۆم گرنگ نەبوو. دوودڵ بوو، نەیدەزانی چی بکات لەبەرامبەر داوای ژنەکەیدا. "نــــا،" بەهێواشی لەژێر لێوەوە وتی و هەستا و ڕۆیشت.

تەقینەوەکەم زیاتر نوقمیکرد لە خەمۆکی خۆیدا. کەوتەوە چەند باردکردنەوەی هۆی ئەو کێشانەی کە تووشی بووە: "گومان لە من دەکەن چونکە ئێرانیم. ئەگەر ئێرانی نەبوومایە، هەرگیز ئەم بەزمەم بەسەر نەدەهات."

هەندێك لە پزیشکەکانی نەخۆشخانە، هێشتا هەر لە بەرەی مودیدا بوون. ناوبەناو دەهاتن و سەردانیانــدەکرد و لە ژێرەوە ئاگاداری خۆیان دەدا لەسەر خراپبوونی باری دەروونی مودی. یەکێك لەوانە کە ئەزموونێکی زۆری هەبوو لەگەڵ ئەو نەخۆشانەی کە باری دەروونییان تێکدەچوو، زەحمەتی کێشا زوو زوو بێت، تا بتوانێت لەگەڵ مودیدا لەو بارەیەوە پێکەوە قسەوباسیان هەبێت.

"نــا،" مودی وەڵامیدایەوە. "نامەوێت لەبارەی ئەوەوە قسەبکەم." لێیپاڕامەوە بچێت پزیشکێك ببینێت.

"من لەوان زۆر زیاتر دەزانم،" وتی. "یارمەتی من لە دەستی ئەواندا نییە."

هیچ کەسێك لە هاوڕێکانمان یان کەسوکار ئاگاداری ئەوە نەبوون، کە کەسایەتی مودی چەند گۆڕاوە. دەستمان لە هاتوچۆی خەڵك هەڵگرت، بەڵام ئەمە بەهۆی گرفتی ماڵیمانەوە تا ئاستێك ئاسایی بوو. خزمان و دۆستان ژیانی خۆیان هەبوو، گرفتی خۆیانیان هەبوو لەگەڵی بەرەوڕووبن. سەریان نەدەپرژایە سەر ئەوەی، کە خەمۆکی مودی لە چ ئاستێکدایە، ئەگەر من یان مودی باسمانــنەکردایە. ئەوەش کارێك بوو، نە مودی دەیتوانی بیکات نە منیش دەمویست.

لە ئۆفیسی یاسا، کارێکی چەند کاژێری ڕۆژانەم دۆزییەوە. مودی چاوی چووە پشتی سەری، چونکە لەو باوەڕەدا بوو، ژن دەبێت لە ماڵەوە بێت بۆ خزمەتی پیاوەکەی.

سەرنجمدا، ڕۆژ بە ڕۆژ باری دەرونی مودی خراپتر دەبێت، متمانەی بەخۆی لە ژێر گورزدایە بەهۆی لەکەیەکەوە، کە لە نەخۆشخانە بەر پیشەکەی کەوتبوو. هەروەها دەستبەکاربوونی من لە دەرەوەی ماڵ، بە لاوازبوونی خۆیی دەزانی. کەوتـــە کاردانەوە، دەویست باڵادەستی خۆی بە من پیشانبدات، بەوەی کە هەموو نیوەڕۆیەك لە ئۆفیسەکەمەوە بگەڕێمەوە، بۆ ئامادەکردنی نانی نیوەڕۆ بۆی. بەناچاری ملمــدا بەم بێڕێزییە، بۆ دامرکاندنەوەی باری دەرونی مودی لە لایەك، وە لەلایەکی تریشەوە بۆ خۆم بوو، کە ڕووداوەکانی ئەو چەند مانگەی دوایی شپرزە و لەقیکردبووم. پێناسەی خۆمم لەم پەیوەندە هاوسەرێتییەدا لێشێوابوو. بە ڕواڵەت، دەبوو من لەم پەیوەندییەدا بەهێزتر بم، بەڵام بۆ دەبوو چنگ لەسەر شان ڕاکەمەوە ماڵی، بۆ ئامادەکردنی نانی نیوەڕۆی ئەو؟ هیچ وەڵامێکــم نەبوو.

زۆربەی نیوەڕۆان دەمبینی هێشتا بە ڕۆبەکەیەوەیەتی، تەواوی بەیانی بەتاڵ دانیشتووە، مەگەر ئەوەی ناچار بووبێت، شتێك بۆ منداڵەکان بکات. لەپاش ئامادەکردنی خواردن، ڕامدەکردەوە بۆ سەرکار. ئێواری دەمبینی قاپە چوورەکان هێشتا لەسەر مێزەکەیە، دەستی بۆ نەبراوە. مێردەکەشم لە هەوای خۆیدا لەسەر قەنەفەکەی پانبۆتەوە.

ڕۆژێکیان پێموت، ئەگەر نیگەرانی لە من لەسەر ئەوەی کاردەکەم، دەی دەبۆ خۆت بچۆ کارێك بکە.

ئەم ژیانە نامۆیە زیاتر لە ساڵێك درێژەیکێشا، هاوکـــات لە کارەکەمدا پێشڕەویمدەکرد، کەچی ژیانی تایبەتی خۆم تا دەهات بێتامتر دەبوو. لە سەرەتاوە کارەکەم کاتی بوو، پاشان بوو بە کارێکی زۆر زیاتر لە ئاسایی. بێگومان مانگانەکەم بەشی ئەو شێوازە لە ژیانی ئێمە نەدەکرد و کاتێك کە پارەی دەغیلەمان تەواوبوو، جارێکی تر نیازی خۆمم بۆ مودی دووبارەکردەوە و خانووە جوانەکەمان خستە فرۆشەوە.

تابلۆیەکم لەبەردەمی باخەکەی پێشەوەماندا داکوتی، کە ئەم تێکستەی بەسەرەوە بوو، *(ئەم خانووە بۆ فرۆشتنە لەلایەن خاوەنەکەیەوە)*، چاوەڕوانبووم بزانم چی ڕوودەدا، بەو هیوایەی بەخت یاوەرمانبێت و خانووەکە بفرۆشین، بەبێ ئەوەی پارەی دەڵاڵ بدەین.

له ماوەی چەند هەفتەدا، مودی تەنیا باسی ئەوەی دەکرد، کە چەندەها خەڵك ڕاوەستاون و تەماشای خانووەکەیان کردووە، بەڵام کەس پێشنیاری نرخی نەکردووە. گومانم پەیداکرد، کە لەوانەیە مودی هانی ئەو خەڵکەی نەدابێت بۆ کڕینی یان بە دەموچاوێکی وا مۆنەوە لێیان چۆتە پێشەوە، کە یەکسەر دوورکەوتوونەتەوە.

سەرئەنجام ئێوارێیەکیان مودی وتی، کە ژن و مێردێك خانووەکەیان پێباش بووە و بەنیازن بۆ ڕۆژی داویی بگەڕێنەوە بۆ تەماشاکردنی. بڕیارمدا، ئەو کاتەی ئەوان دێن، من خۆم لەوێ بم.

لە کاتێکی دیاریکراودا، لە ئۆفیسەکەوە خێرا گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، بینیم ماڵ هیچی بەسەر هیچەوە نییە. لە خۆمەوە کارێکم بۆ مودی دۆزییەوە و ناردمە دەرەوە و کەوتمە پاککردنەوە ماڵەکە و پێشوازیم لە ژن و مێردەکە کرد.

"خانووەکەمان دەوێت،" پیاوەکەیان وتی، "بەڵام کەی ئێوە دەتوانن بگوێزنەوە؟"

"کەی ئێوە دەتانەوێت بێنە ناوی؟"

"دوو هەفتەی تر."

ئەمە زۆر لەبارە نەبوو بۆمان، بەڵام ئەوان لێمان هاتنە پێشەوە و جیاوازییەك، کە لە نێوان کڕین و فرۆشتنەکەدا بۆمان مایەوە، بەدەستی پێیان داین، کە کردییە زیاتر لە بیست هەزار دۆلار و بە ڕاستی زۆر پێوستمان بەو پارەیە بوو.

"زۆر چاکە،" وتم.

کاتێك مودی گەڕایەوە و بینی هەموو شتێك تەواوبووە، کەللەیبوو. "باشە لەم دوو هەفتەیەدا سەری خۆمان بۆ کوێ هەڵگرین؟" توڕەبوو.

"ئێمە پێویستمان بەو پارەیەیە،" ڕێك پێموت. "لەبەرئەو پارەیە، دەبوو ئەو کارە هەر بکەین."

لەسەر ئەم بابەتە بۆ ماوەیەکی زۆر دەمەقاڵێمانکرد، بەڵام چەند کێشەی تریش هاتە بەر باس. شەڕێکی نابەرابەر بوو، چونکە مودی دەستی تەواو بەتاڵ بوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوە. هەوڵێکی بێهودەی دا، ئەوە بە من قبووڵبکات، کە ئەو وەك خاوەنی خێزانەکە، دەبێت بڕیاردەر بێت، بەڵام هەر دووکمان دەمانزانی، وازی لەو پلەوپایەیە هێناوە.

"تۆ ئێمەت خستە ئەو هەلومەرجەوە،" توڕەبووم لێی. "چاوەڕوانـــنابین تا هەموو شتێکمان لەدەست دەبێتەوە. ئێمە ئەو خانووە دەفرۆشین."

کێشمــکرد بۆ ئیمزای کۆنتراکتی فرۆشتنەکە.

لەو دوو هەفتەیەدا، لە هەموو کاتێك زیاتر سەرقاڵتر بووین. کەوتمە دۆلاب، ڕەفە و کەنتۆر و هەرچی لە ئەلپێنا کۆمانــکردبۆوە خستمە پاکەتەوە، هەرچەند نەمدەزانی بەرەو کوێ دەچین. مودی پەنجەی بەرزنەکردەوە بۆ یارمەتی.

"هەر هیچ نەبێت، کتێبەکانی خۆت کۆکەرەوە،" پێموت. کتێبخانەیەکی تەواوی هەبوو، لە کتێبی پزیشکییەوە تیایدا بوو تا کتێب و نووسراوەی ئیسلامی. بەیانییەکیان چەند سندوقی کارتۆنم پێدا و وتم، "*هەر ئیمرۆ* کتێبەکانت کۆدەکەیتەوە!"

لە کۆتایی ئەو ڕۆژەدا، کاتێك درەنگانێ گەڕامەوە، بینیم مودی تەمەڵانە هەروا دانیشتووە، هێشتا ڕۆبی شەوی لەبەردایە، نە ڕیشی تاشیوە، نە خۆی شتووە. کتێبەکانیش هەروا لە جێگای خۆیانن. بۆ جارێکی تر تەقیمەوە.

"هەر ئیمشەو دەمەوێت خۆت کۆکەیتەوە! سبەینێ سواری ئوتومبیل دەبیت بەرەو دیترۆیت و ناگەڕێیتەوە تا کارێك دەدۆزیتەوە. ئیتر لەوە زیاتر بە بەرەمەوە نەماوە. بۆ یەك خولەکی تر نامەوێت وەها بژیم."

"ناتوانم کار پەیدابکەم،" بۆڵەی لێوە هات.

"هیچ هەوڵێکت نەداوە."

"من ناتوانم کاربکەم، تا ئەخۆشخانە ئەو تاوانپاڵدانەم لەسەر هەڵئەگرێت."

"تۆ پێویستناکات کاری بێهۆشی بکەیت. دەتوانی وەك پزیشکی گشتی کاربکەیت."

پەکیکەوتبوو، بە بەهانەی لاوازەوە بەرگری لە خۆی دەکرد. "چەند ساڵ دەبێت من کاری پزیشکی گشتیم نەکردووە،" چاوبەرێژانە وتی. "نامەوێت کاری پزیشکی گشتی بکەم."

ڕەزای بیرخستمەوە، کە نەیدەویست هیچ کارێك لە ئەمریکادا وەرگرێت، مەگەر ئەوەی بیکەن بە بەڕێوەبەری کومپانیایەك. "زۆر شت هەیە پێم خۆش نییە بیکەم، بەڵام ناچارم دەیکەم،" وتم، لە کاتێکدا خەریکبوو لە پێستی خۆم دەچوومە دەرەوە. "لە چەند ڕووەوە ژیانی منت تێکداوە. من بەم شێوەیە، ناتوانم لەگەڵت بژیم. تۆ تەمەڵیت. لەو هەلومەرجە کەڵك وەردەگریت. ناچیت کارێك بدۆزیتەوە، هەر لە ماڵەوە خۆت دەلێسیتەوە. دەبێت بچیتە دەرەوە و بەدوای کارێکدا بگەڕێیت. هەروا لە ئاسمان بۆت نایەتە خوارەوە. ئێستا دەچیت و ناگەڕێیتەوە تا کارێك دەدۆزیتەوە یان" - وشەکە لە دەمم دەرچوو، پێش ئەوەی بیریلێبکەمەوە چی دەڵێم - "یان من لێت جیادەبمەوە."

گومانی تیادا نەبوو، ئاگادارییەکەمم بەڕاست بوو.

ئەوەی مـــن وتم، مودی کردی. بۆ سبەینێ ئێوارە مودی لە دیترۆیتەوە تەلەفونی بۆ کردم. لە کلینك کارێکی دۆزیبۆوە. لە ڕۆژی دوو شەممەوە، ڕۆژێك پاش *جەژنی گەڕانەوەی عیسا*[2]، دەچووە سەر کار.

بـــۆچی، بۆم پرسیاربوو، ئەم هەموو ماوەیە چاوەڕوانمـکرد؟ و بۆچی زووتر فشاری خۆمم بە گەرنەخست؟

لە کۆتایی هەفتەی جەژنی هەزار و نۆ سەد و هەشتا و سێدا، لە بارێکی تەواو شێواودا بووین. بڕیاربوو لە *هەینی باش*[5] دا ماڵەکە چۆڵبکەین، لە ڕۆژی دوو شەممەدا مودی یەکەم ڕۆژی کاری بوو، لە ڕۆژی چوار شەممەدا هیچ شوێنێکمان نەدۆزیبۆوە تێیـبچین.

هەلومەرجێکی ترسناك بوو، بەڵام لەسەرێکی تریشەوە باش بوو، هەرچی چۆنێك بوو خەریکی *شتێك* بووین.

لەو شوێنەی کارمـدەکرد، پارێزەرێك کە یاریدەدەری بەرپرسی بانکێکی ناوچەیی بوو، لەو گیرگرفتەی تێی کەوتووبووین، ئاگاربۆوە و بۆ ماوەیەکی کاتی ڕێگاچارەیەکی بۆ دۆزینەوە. پارێزەرەکە تازە خانوویەکی بە ڕەهن وەرگرتبوو، ئامادەبوو مانگ بە مانگ بەکرێی بدات بە ئێمە. هەر ئەو نیوەڕۆیە، کۆنتراکتی کرێمان ئیمزاکرد و بۆ ڕۆژی هەینی بە پەلە شتومەکەکانمان گواستەوە ئاوی.

لە کۆتایی هەفتەدا، مودی هات و هێزی دایە خۆی، ئاوماڵی لەگەڵ دامەزراندم. لە ڕۆژی یەك شەممەدا ماچێکی ماڵئاوایی لێکردم، پێش ئەوەی ڕێگای پێنج کاژێری دیترۆیت بگرێتەبەر. ئەوە یەکەم جار بوو، لەماوەی چەند مانگدا ماچمبکات، ئەوەندەم پێخۆشبوو، سەرسامیکردم. مودی زۆر دڵی بەم کارە یەکجۆرەی خۆشنەبوو، بەڵام دەمبینی کە باری دەرونی زۆر باشتر بووە. هەروەها بۆ متمانە بەخۆ بوون زۆر گرنگ بوو، کە ئاوا ئاسان کاری دەستکەوتووە. موچەکەی باش بوو، نزیکەی نەوەد هەزار دۆلاری وەردەگرت لە ساڵێکدا، هەرچەند شایەنی بەراوردکردن نەبوو لەگەڵ موچەی پێشوویدا لە نەخۆشخانە.

زۆری نەبرد، کەوتینەوە سەر ڕەوالی خۆشی ساڵانی پێش شووکردنمان بە یەکتری. ڕۆژانی هەفتە هەر کەس سەرگەرمی کاری خۆی بوو، کۆتایی هەفتەکان لە نێوان ئەلپێنا و دیترۆیتدا هاتوچۆمانـدەکرد.

وردەوردە باری دەرونی مودی چووەوە جێگای خۆی. "پێکەوە کاتێکی خۆش دەبەینەسەر!" لە سەردانێکمدا مودی پێیوتم. هەمیشە پەرۆشی بینینی ئێمە بوو. مەهتاب هەر کە دەیبینی، خۆی فڕێدەدایە باوەشییەوە، خۆشحاڵ بوو بەوەی باوکی ئاسایی بۆتەوە.

بەهار، هاوین و پاییز تێپەڕین. هەرچەند مودی دیترۆیتی پێخۆش نەبوو، بەڵام ئەو تەسکی و سنوورداربوونەی نەدەبینی لە کەشی شارێکی گەورەی پڕ دانیشتواندا، وەك ئەوەی لە شارێکی بچوکدا هەبوو. هاتە سەر ئەو باوەڕەی، کە داهاتووی لە شوێنێکی وەهادا دەبێت، جیا لەوەی چ جۆرە کارێك دەکات.

بۆ خۆشم، جارێکی تر هەستم بە ئازادی کردەوە. ڕۆژانی هەفتە، خۆم هەموو بڕیارێکم دەدا و لە کۆتایی هەفتەدا دەکەوتمەوە عەشقبازی. لەوەدەچوو ئەمە ڕەوالێك بێت بۆ لەکارنەکەوتنی ئەم هاوسەرێتییە.

بۆ ماوەیــــەك، کەوتمـــە هەوای خۆمەوە.

مانگی مارتی هەزار و نۆ سەد هەشتا و چوار بوو، لە تارانەوە تەلەفونـکرا. دەنگی پیاوێك بوو، بە ئینگلیزییەکی پچڕپچڕ قسەیدەکرد و وەك محەمەد عەلی قودسی، خۆشکەزای مودی، خۆی ناساند. بەهۆی شووکردن و ژنهێناوە، کەسوکاری مودی زۆر تێکەڵی یەکتر بووبوون، خوشکەزا بوون زۆر شتی دەگرتەوە. وا دەردەکەوەت، بە سەدان ئێرانی خوشکەزای مودی بن.

ئەحواڵی من و مەھتابی پرسی و ھەوڵیدا، چەند قسەیەکی ئاسایی بکات. کاتێك لە مودی پرسی، ژمارەی تەلەفونەکەیم وەرگرت و پێموت، کە دەبێت پەیوەندی بە مودییەوە بکەم.

پەیامەکەم گەیاند بە دیترۆیت و لە ئێوارەدا، مودی تەلەفونی بۆ کردم. مامل بوو، چوارەمین کوڕی عەمە بزروگی خۆشکی. مودی باسیکرد، کە ھەردەم مامل لاواز بووە، بەڵام لەو مانگانەی دواییدا زیاتر لاوازتر بووە. دکتۆرەکان دەستنیشانی قورحەی گەدەیان کردووە و نەشتەرگەریان بۆ کردووە، بەڵام ھێشتا ھەر لاوازتر دەبێت. بەناچاری لەو پەیوەندەدا چووە بۆ سویسرا. دکتۆرەکانی سویسرا پیانوتووە، کە ئەو نەشتەرگەرییەی لە ئێران کردوویەتی، زۆر خراپ بۆیان کردووە و دەبێت دووبارە نەشتەرگری بکرێتەوە، بۆ دروستکردنەوەی دیواری گەدەی. تەلەفونی بۆ خاڵەکەی کردووە بۆ ئەمریکا تا ڕاوێژی پێبکات، لەکوێ ئەم نەشتەرگەرییە بکات.

"پێمـنەوتووە، چی بکات،" مودی وتی. "تۆ دەڵێی چی؟"

"بیھێنە بۆ ئێرە،" پێشنیارمـکرد. "دەتوانین یارمەتیـبدەین، بە دۆزینەوەی نەخۆشخانەیەك، کە ئەم کارەی بۆ بکرێت."

مودی خۆشحاڵ بوو لە وەڵامی من. "بەڵام،" مودی وتی. "سەختە لە ئێرانەوە بتوانێت پارە دەربکات."

"باشە بۆچی تۆ پارەی نەشتەرگەرییەکەی نادەیت؟" پرسیارملێکرد. "ئەو چاوەڕوانییەم لە تۆ ھەیە، ئەو کارە بۆ خێزانەکەت بکەیت، ئەگەر پێویستبێت."

"زۆر چاکــەا"

ھەوڵەکە درا و لە چەند ڕۆژدا، مامل بە فڕۆکە ھات بۆ ئەمریکا. سەفەرەکەی وا ڕێکخرا، کە سەرەتایی مانگی نیسان، ڕۆژی ھەینی بگاتە ئەمریکا. پلانی مودی وابوو، کە لە فڕۆکەخانە مامل دەبینێت و یەکسەر دەیھێنێت بۆ ئەلپینا بۆ کۆتایی ھەفتە، تا مامل بتوانێت ئێمە ببینێت.

بێجگە لە خەباتگێڕانی دەمبەھەمراش، کە لە کۆرپوس کریستی ماڵەکەمانیان داگیرکرد، زۆربەی ئەو ئێرانیانەی دەمناسین کەسانێکی ڕووناکبیر و بەڕێز بوون. گومانی تیادا نەبوو، کە بە جۆرێك بۆچوونی دواکەوتوانەیان ھەبوو بەرامبەر بە ژن، بەڵام ئەمە زیاتر خۆی دەبینییەوە لە ھەڵسوکەوتێکی دواکەوتوانە، کە زیاتر بە شانوباھۆ ھەڵدان و خۆشیرینکردنی دەگرتەوە. بڕیارمــدا، خانەخوێیەکی میھرەبانبم لەگەڵ خوشکەزاکەی مودی. بۆ ئێوارە خواردنێکی ئێرانیم دورستکرد، کاتێك کە من و منداڵەکان چاوەڕوانی ھاتنیانمان دەکرد.

بەداخەوە، ھەر پێی نایە ئەم دیو دەرگاوە، دڵم لێی کرمێبوو. بەژنوباڵای بچوك، وەك زۆربەی پیاوانی ئێرانی، کەچی - یان لەوانەیە لەبەر ئەوە  بێشەرمانە لووتی لە ئاسمان توندکردبوو. ڕیش و سمێڵێکی ناڕێکوپێك، کە لەوەدەچوو دەستی بە خۆیدا نەھێنابێت.

چاوانێکی بچوك و قوڵ، وا تەماشایدەکرد وەك ئەوەی من نەبم. هەڵسوکەوتی لەوەدەچوو بڵێت: تۆ کێیت؟ من لە تۆ باشترم!

لەوەش زیاتر، کاریگەری بەسەر مودییەوە، جێگای نیگەرانیم بوو. هەر لە سەرەتاوە قسەی ئەوە بوو: "دەبێت بێن بۆ تاران و سەردانمانبکەن. هەموو چاوەڕوانی بینینی ئێوە و مەهتاب دەکەن." ئەو داوایەم پێخۆش نەبوو. یەکەم ئێوارە، ئەم جووتە پیاوە بەخۆشییەوە بۆ چەندەها کاژێر بە فارسی گفتگۆیانکرد. لەوانەیە ئەمە تا ئاستێك ئاسایی بێت، چونکو باس و هەواڵی خێزانی زۆرە، کە پێکەوە باسیبکەن، بەڵام نیگەرانی ئەوە بووم، مودی ئەو دەوڵەتەی مامل بەڕاست وەرگرێت. فارسی قسەکردن کۆتاییینەبوو، منیان تەنیا جێهێشتبوو، لەگەڵ ئەوەی ئینگلیزییەکەی مامل خراپ نەبوو.

زوو کەوتمە ژماردنی کاژێرەکان بۆ کۆتایی هەفتە، بەهیوای هاتنی ئێوارێیەکی ئارام و بێدەنگی ڕۆژی یەك شەممە، کە مودی و مامل دەکەوتنەوە ڕێ بەرەو دیترۆیت. بەڵام پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە، مودی پێیوتم، "با مامل لێرە لەگەڵ تۆ بمێنێتەوە، بۆئەوەی من لە هەوڵی ڕێکخستنی نەشتەرگەرییەکەیدا بم."

"نـا،" وتم. "خوشکەزای تۆیە. بۆ لای تۆ هاتووە."

ئارام ئاماژەی بەوە کرد، کە دەبێت لە کلینیکەکەی کاربکات، هەروەها مامل پێویستی بە چاودێرییە و لە خواردندا پارێزی هەیە. دەتوانم بۆ چەند ڕۆژ مۆڵەت وەرگرم و لە ماڵەوە بمێنمەوە، تا مامل دەچێتە نەخۆشخانە.

بواری بۆ نەهێشتمەوە، قسەی تیادا بکەم. لە ناخی دڵەوە دەمزانی، مودی قسەی خۆی بەسەرمدا دادەسەپێنێت. بەڵام ملمدا بە داواکەی، چونکە وای بۆچووم، کە ئەمە تەنها بۆ چەند ڕۆژێك دەبێت.

بڕیارمدا، بە باشی تێیپەڕێنم. بەزەییم بە مامڵدا دەهاتەوە، هێڵی هەوایی ئەمریکا باوڵەکەی ونکردبوو. ئەنیا کوردجیانی هاوڕێم، کە ژنێکی ئەرمەنی بەرگدروو بوو، لەگەڵم هات، پێکەوە چەند پارچە جلمان بۆ مامل کڕی. ئەنیا زۆر دەستکاری جلەکانی کرد، تا بە بەژنی بچوکی نائاسایی مامل بخواتەوە.

مامل جلەکانی وەرگرت، بەبێ ئەوەی سوپاسی کەس بکات، لە ژوورەکەی خۆی داینا و پانتۆڵە جینە شینەکەی و کراسە بۆگەنەکەی نەگۆڕی.

کاتێك باوڵەکەی مامل دۆزرایەوە و بە دەستی گەیشت، پڕی بوو لە دیاری بۆ ئێمە. هەرچەند ئەگەری ئەوەی دانابوو، کە بۆ چەند مانگ لە ئەمریکا دەمێنێتەوە، بەڵام وا دیاربوو، کە بەنیازە هەموو ڕۆژێك هەر ئەو جلانەی لەبەردابێت.

"دەتەوێت، من جلەکانت بۆ بشۆم؟" پرسیارمـلێکرد.

"نـا،" بێخەیاڵ شانی هەڵتەکاند.

کۆتایی هەفتەی دواتر مودی هاتەوە، باوەڕپێنەکراوانە لەو دەچوو بۆنی ئەو بۆگەنە نەکات، تا من ئاگادارمکردەوە. "برۆ جلەکانت داکەنە، با بیتی بۆت بشوا" مودی بە مامل فەرمانیدا، "و دوشێك بگرە."

خوشکەزاکەی بە مۆنییەوە قبوولێکرد. دوشگرتن ڕووداوێکی دەگمەن بوو لە ژیانیدا، وەك ئەرکێك چاوی لێدەکرد، وەك لەوەی نوێکردنەوەی شەوق و ورە بێت.

مامل تەمەڵ بوو، بە ئەرك بوو، میوانێکی ڕەزاقورس بوو بۆ ئەو دوو هەفتەیە، تا بە ئوتومبیل بردم بۆ نەخۆشخانەی کارسۆن ستی بۆ نەشتەرگەری. کاتەکەم لەگەڵ کەسوکارم بردەسەر و پاشان گەڕامەوە بۆ ئەلپێنا،ماملم لە مێشکی خۆم دەرکرد.

پاشان مودی بۆی باسکردم، کە مامل ڕەنجاوە لەسەر ئەوەی من دووبارە مۆڵەتم لە کار وەرنەگرتووە، چاودێریکەرێکی شەوم بۆ منداڵەکانم دانەناوە و دیسانەوە ئەو چوار کاژێرە ڕێگای کارسۆن ستیم نەگرتۆوتەوە، تا لەکاتی نەشتەرگەرییەکەیدا ئامادەبم.

مامل بۆ دە ڕۆژ لە نەخۆشخانە مایەوە تا چاکبۆوە. پاشان مودی خۆشکەزاکەی لە کارسۆن ستیەوە هێنایەوە بۆ ئەلپێنا و بەسەر مندا جێیهێشت.

"ئـــا، نامەوێت ئەرکی چاودێریی لە ئەستۆبگرم،" پێموت. "چی بکەم، ئەگەر شتێکی لێبەسەر بێت؟ تۆ دکتۆری. تۆ چاودێریـــبکە."

مودی گوێی بە قسەکانم نەدا. ماملی بەسەر مندا جێهێشت و گەڕایەوە بۆ دیترۆیت.

ڕقم لە خۆم دەبۆوە دەوری هاوسەرێکی سەرکزی گوێڕایەڵ ببینم، کەچی خۆم کرد بە کارەکەرێکی سستەر بۆ مامل، ڕۆژانە پێنج ژەم خواردنم ئامادەدەکرد، کە لەو پەیوەندەدا بۆیان دانابوو. من چەند بێزاربووم لە ئامادەکردنی خواردن بۆی، ئەویش ئەوەندە ناڕازی بوو لە خواردنەکانی من. لەوە دەچوو ڕێگایەکی ترم بەدەستەوە نەبێت، تەنیا کات بەسەربردن نەبێت، تا مامل ئەوەندە چاکدەبێتەوە بگەڕێتەوە بۆ ئێران.

مودی وای دانابوو، کە مەهتاب یەکسەر خۆشی لە مامل دێت. هەوڵیدا زۆری بۆ بهێنێت، لە خوشکەزاکەی خۆی نزیکیکاتەوە، بەڵام مەهتاب وەك من، لەم پیاوە پیسوپۆخڵە دەسڵەمییەوە.

"واز لە منداڵەکە بهێنە،" بە مودیم وت. "مەهتاب ئەوە نییە، زۆری لێبکەیت، بیکەیت بە هاوڕێی. ئەو هەر وایە. دەزانیت. سەرمەکەرە سەری و خۆی بە کەیفی خۆی دەگونجێت."

مودی گوێینەدەگرت. هەتا بۆ چەند جارێك، زرمەی لێهەڵساند لەسەر ئەوەی شەرمیدەکرد لە مامل.

کاتێك مودی لە دیترۆیت بوو لە ڕۆژانی هەفتەدا، هەموو شەوێك تەلەفونی لەگەڵ مامدا دەکرد. هەندێك جار بە چەند کاژێر پێکەوە بە فارسی دەدوان و زوو ئاگاداربوومەوە، کە مودی مامل بەکاردەهێنیت بۆ کۆنترۆڵی من، بزانێت چی دەکەم. بۆ نمونە، شەوێکیان مامل لەپڕ تەلەفونەکەی دانا و پێیوتم، کە مودی دەیەوێت قسەم لەگەڵدا

بکات. مێردەکەم تورەبوو، لەسەر ئەوەی، کە بۆچی ڕێگامداوە بە مەهتاب تەماشای بەرنامەیەکی تەلەفیزیۆنی بکات، کە ئەو بەدڵی نییە؟

ئەو کۆتایی هەفتە خۆشانە، بوو بە شتێك لە ڕابوردوو. مودی دەهاتەوە بۆ ئەلپێنا بۆئەوەی شەممە و یەك شەممە لەگەڵ مامل دانیشێت و لەسەر شتی خێزانی نێوان خۆیان قسەبکەن، دیسانەوە شوروشەوقی بۆ ئایەتوڵا خومەینی و ڕق و بێزاری لە ڕەوشت و نەریتی ڕۆژئاوا - بەتایبەتی ئەمریکا - گەشایەوە.

دەبووایە چیم بکردایە؟ هەموو کۆتایی هەفتەیەك، مێردە ئەمریکاییبووەکەم بۆ ماوەی بیست و پێنج ساڵ زیاتر و زیاتر کەسایەتییە ئێرانییەکەی سەری هەڵدەدایەوە. تا مامل لەوناوە ببوایە، خۆشەویستیم بۆ مێردەکەم لەژێر پرسیاردا بوو. من بە مودییەکی ئەمریکی شوومکردبوو، مودی ئێرانی کەسێکی ناحەز و نامۆ بوو. چی تر، مودی و مامل بەردەوام کەوتبوونە سەر باسی بردنی من و مەهتاب بۆ سەردانی خێزانەکەیان لە تاران.

لە کۆتایی هەفتەکاندا، سەریان دەنا بەیەکترییەوە و دەکەوتنە گفتگۆیەکی بێکۆتایی تەواو بێگانە بە من. هەرچەند بە فارسی دەدوان، بەڵام هەرکە من دەچوومە ژوورەکەوە، دەنگیان نزمدەکردەوە.

"کـــەی دەڕوات؟" نائومێدانە ڕۆژێکیان پرسیارمکرد.

"ناتوانێت، تا دکتۆر ڕێگایــپێنەدات." مودی وەڵامیدایەوە.

دوو ڕووداو هەلومەرجەکەی بە بنبەست گەیاند. بانك کرێارێکی بۆ ئەو خانووەی ئێمە بەکرێمان گرتبوو، دۆزییەوە و دەبوو ئێمە بگوێزینەوە. ئەمەش نزیکی هەمان کات بوو، کە کارەکەمم لە ئۆفیسی یاسا لەدەستــدا. ئیتر بۆ هەمووان ڕۆشن بوو، کە من دەبێت بکەومە خۆم.

مودی دەیزانی، چۆن بکەومە خـــۆم. ڕایگەیاند، کە ئیتر کاتی خۆیەتی دیسانەوە وەك خێزانی تەواو کات پێکەوە بژین.

نەمدەویست، مل بەمە بدەم و زۆر دڵنیاش نەبووم لەوەی واز لە سەربەخۆیی خۆم بهێنم. بەڵام دەمزانی، کە مامل ئەوەندەی نەماوە، بگەڕێتەوە بۆ ئێران و بە هیواش بووم، کە من و مودی بتوانین ئەو شێوە ژیانە خۆش و ئارامەی پێشوومان دروستبکەینەوە. هەرچەند جیابوونەوە نەهاتبووە بەر باس، بەڵام تەنیا ڕێگایەك کە دەمبینیەوە بۆ خۆم، ئەوە بوو. ڕۆشنبوو، مودی لە سەر قسەی خۆی سووربوو، لەبەرئەوە منیش لەگەڵی ڕازیبووم، بچم بۆ دیترۆیت. بەڵکو ئەوەی خراپترە تێیــپەڕێنین، لە دڵی خۆمدا وتم، ئومێدەوار بووم و دەیپارامەوە. هەوڵمــدا بەڕاستی هەوڵمــدا کە هاوسەرێتییەکامان بینابکەمەوە.

لەداهاتووی خۆم دڵنیانەبووم، لە سکپڕبوون دەترسام. بۆ ئەو مەبەستە، هەوڵێکم دا بۆ سووککردنی باری سەر شانم. هەفتەیەك پێش ئەوەی بگوێزمەوە بۆ دیترۆیت، چووم بۆ لای دکتۆر و *حەلەزۆنێکی پێشگیری*[3] بۆ دانام.

مودی تا ئەو کاتە، لە خانوویەکی نهۆمی بچوکدا دەژیا، دەبوو بۆ هەموومان خانوویەکی تر بدۆزینەوە. وا بۆی چووم کە دەیکڕین، بەڵام مودی سووربوو لەسەر ئەوەی خانوویەك بەکرێبگەرین، تا زەوییەکی لەبار دەدۆزینەوە و ئەو خانووەی خەوی پێوە دەبینین، بەدەستی خۆمان بینایبکەین. شتەکان زۆر خێرا دەچوونە پێشەوە، کە سەریان لێشێواندبووم. مودی تەواو دەسەڵاتی پەیداکردبۆوە بەسەرمدا. پێش ئەوەی بزانم چی ڕوودەدا، خانوویەکمان لە ساوسفیلد بەکرێگرت و چووینە ناوی - من، مودی، جۆی، جۆن، مەهتاب ... و مامل.

مەهتابم لە قوتابخانەیەکی باشی مۆنتێسۆری لە نزیك بیرمنکهام ناونووسکرد، بیرۆکەی دامەزراندنی ئەم قوتابخانەیە لە لایەن ژنێکەوە بوو، کە لە ئەوروپاوە هێنابووی.

مودی ئوتومبیلێکی تازەی بۆ کڕیم و نزیکەی هەموو ڕۆژێك، mامڵم پێدەبرد بۆ تەماشای دیترۆیت یان بۆ بازاڕ بۆ کڕینی کەلوپەل، بەو پارەیەی کە مودی دڵفراوانانە پێیدابوو. هەڵسوکەوتی مامل هەر وەکو خۆی، نادۆستانە و بێڕێزانە بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وا بۆی دەچوو، کە من خۆشی دەبینم لە بوونی. لە ڕاستیدا ئاواتم بەو ڕۆژە دەخوازی، کە دەگەڕایەوە بۆ ئێران.

مامل تا ناوەڕاستی مانگی تەمموز مایەوە. چەند ڕۆژی گەڕانەوەی نزیکدەبۆوە، ئەو زیاتر پێیدادەگرت، لەسەر ئەوەی ئێمە - مودی، مەهتاب و من - سەردانی خێزانەکە بکەین لە تاران. بۆ ئەگبەتی مودی ڕازیبوو، ڕایگەیاند کە لە مانگی ئابدا دەچین بۆ دوو هەفتە پشوو. جۆی و جۆن لەو ماوەیەدا لەلای باوکیان دەمێننەوە.

لەپڕ گفتگۆی نهێنی شەو درەنگنانی مودی و مامل، شێوازێکی ترسناکی بەخۆیەوە گرت. ئەو چەند ڕۆژەی پێش گەڕانەوەی مامل، مودی کەڵکی لەهەر ساتێك وەردەگرت بۆئەوەی لەگەڵی بێت. ئایا لە هەوڵی پلانی شتێکدا بوون؟

جارێکیان لە ترساندا پەتم پچڕاند و بەرەو ڕوویان بوومەوە. "خەریکی چین؟" پرسیارمکرد. "پلان دادەنێن، مەهتاب بفڕێن و بیبەن بۆ تاران؟"

"قسەی پڕوپوچ مەکە،" مودی وتی. "شێت بووی. پێویستت بە دکتۆری دەروونی هەیە."

"ئەوەندە شێت نیم، بچم بۆ ئێران. من و منداڵەکان لێرە دەمێنینەوە."

"تۆ و مەهتاب لەگەڵ من دێن،" مودی وتی. "لەوە زیاتر هیچ ڕێگایەکی ترت پێنادەم."

بێگومان ڕێگای ترم هەبوو. خراپەکەیان بوو، بەڵام لە مێشکمدا خەریکبوو گەڵاڵەدەبوو. هێشتا تروسکاییەم دەبینی، کە دەتوانم هاوسەرێتیمان بیناکەمەوە، بەتایبەتی بە ڕۆشتنی مامل. ئەمدەویست خۆم و منداڵەکانم بخەمە هەلومەرجی سەختی جیابوونەوەوە. بەڵام نەشمدەویست بچم بۆ ئێران.

مودی شێوەی قسەکردنی خۆیی گۆڕی، کەوتە گفتگۆ لەگەڵم. "باشە بۆچی ناتەوێت بێی لەگەڵم؟"

"چونکە دەزانم، ئەگەر بێم لەگەڵت، لەوێ بڕیاردەدەیت، بمێنمەوە و ئەوسا ئیتر ناتوانم بگەڕێمەوە."

"ئەمە ئەوەیە، کە تۆ لێیـدەترسی،" مودی دۆستانە وتی. "هەرگیز ئەوەت لەگەڵ ناکەم. من تۆم خۆشدەوێت." لەپڕ شتێك بە خەیاڵیدا هاتە. "ئا دەی ئەو قورئانەم بۆ بێنە."

چووم کتێبی قورئانەکەم لە کتێبخانەکەمان دەرهێنا و دامە دەست هاوسەرەکەم.

لەپی دەستی خستە سەر قورئانەکە و وتی: "بەم قورئانە سوێنددەخۆم، کە هەگیز زۆرت لێناکەم لە ئێراندا بمێنیتەوە. بەم قورئانە سوێنددەخۆم، کە هەگیز زۆرت لێناکەم، بەبێ ویستی خۆت لە شوێنێکدا بمێنیتەوە."

مامیلیش قسەی خۆیی کرد. "ئـــەوە شتێکە هەرگیز ڕوونادات،" دڵنیایـکردم. "خێزانەکەمان ڕێگای شتی وەها نادات. بەڵێنتپێدەدەم، ئەمە ڕوونەدا. بەڵێنتپێدەدەم، هەتا ئەگەر کێشەیەکی تریش بێتە پێشەوە، خێزانەکەمان چارەسەری بکات."

یەکسەر ئاهێکم تێگەڕا. "باشە،" وتـــم. "دەڕۆین."

مودی بلیتی فڕۆکەی کڕی. یەکی مانگی ئاب زۆر خێراتر نزیکدەبۆوە، وەك لەوەی کە من خوازیاری بووم. سەرەڕای سوێندی گەورەی هاوسەرەکەم بە قورئان، گومانم تادەهات تاوی دەسەند. ئەویش تادەهات شوروشەوقی زیاتر دەبوو. بە چەندەها کاژێر دادەنیشت و ئەو نووسراوە ئێرانییانەی دەیخوێندنەوە، کە بەدەستی هێنابوو. بەخۆشییەوە باسی خێزانەکەی دەکرد - بەتایبەتی عەمە بزورگ. دەستیکردەوە بە نوێژەکانی. جارێکی تر بە بەرچاوی خۆمەوە، لە ئەمریکییەوە بوو بە ئێرانی.

بە دزییەوە چووم بۆ بینینی پارێزەرێك. "دەبێت بڕۆم یان لێی جیابمەوە،" باسمکرد. "نامەوێت بچم بۆ ئێران، دەترسم. ئەگەر بچم بۆ ئەوێ، ئیتر ڕێگامپێنادات بگەڕێمەوە."

لە ڕێگاکان کۆڵینەوە و لە کاتی باسکردندا، ترسێکی تر قوتبۆوە. ڕێگای جیابوونەوەش مەترسیدار بوو هەتا ئەگەری ئەوە هەبوو، زیاتر لە سەفەرکردنەکەش. ئەگەر داوای جیابوونەوەم بکردایە، ئەگەر لە مودی جیابووبوومایەتەوە، لە ژیانی مودی دەچوومە دەرەوە. ئەوسا ئەیدەتوانی من بەرێت بۆ ئێران، بەڵام ئەی مەهتاب چی؟ ئەگەر لەگەڵ خۆی بیبات بۆ ئێران و لەوێ بڕیاربدات بمێنێتەوە، بۆ هەتاهەتایە مەهتابـم لەدەستدەدا.

"ئایا مودی ماڤی سەردانکردنی هەیە؟" پرسیارمکرد. "ئایا ئێمە ناتوانین، داوەرێك ڕازیبکەین لە بوونی مەترسییەك و بەو پێیە، مودی لە مەهتاب دووربخەینەوە؟"

یاسای ئەمریکی ڕێگای سزا نادات پێش ڕوودانی تاوان، پارێزەرەکە ئاماژەپێکرد. "ئەو هیچ تاوانێکی نەکردووە. هیچ شتێکت بەدەستەوە نییە، ڕێگای سەردانی لێبگریت لەگەڵ مەهتابدا بچێت."

"بەڕاستی من بۆ خۆم پێم باش نییە، سەردانی ئێران بکەیت." پارێزەرەکە درێژە بە قسەکانی دا. "بەڵام من ناتوانم هیچ هەڵەیەك لەمەدا ببینم. لەوانەیە مودی بۆ ماوەیەکی زۆر لەژێر فشاردا بێت و توشی خەمۆکی بووبێت، کە ئەگەر بچێت بۆ سەردانی خێزانەکەی، لەوانەیە بە تەواوەتی بگۆڕێت. بگەڕێتەوە و بە توانایییەکی تازە دەستپێبکاتەوە. لە ڕاستیدا بەباشی دەزانم بۆ ئەو، کە ئەو سەفەرە بکات."

قسەوباسەکە بێئارامتری کردم لە پێشوو. لە ناخی دڵەوە دەمزانی، کە ئەگەر داوای جیابوونەوە بکەم، مودی کچەکەم دەخاتە ژیانێکی پڕ دەردیسەرییەوە لە ئێراندا. ڕێگایەکەم بۆ نەمایەوە، بێجگە لە شێروخەت کردنی ئەوەی کە ئایا ئەوەی لە مێشکی پڕ جەنجاڵی مودی دایە، پیلانێکی خەیاڵییە یان ڕاستەقینە، ئایا جیاوازییە کۆمەڵایەتییەکان، مودی ڕازیناکات بگەڕێتەوە بۆ ئەمریکا. لەو کاتەدا، تەنیا دەمتوانی ئەوە بهێنمە بەرچاوی خۆم، کە دەبێت ژیان لە تاراندا چەند پڕ دەردیسەری بێت، بەڵام هەموو قورساییەکم خستبووە سەر ئەوەی کە ئەو دوو هەفتەیە بەس دەبێت بۆ مودی.

هۆی ڕاستەقینەی بردنی مەهتاب لەگەڵ خۆم بۆ ئێران ئەمە بوو: من ناچاربووم ئەگەر بچوومایە، بەڵام مەهتاب ناچاربوو ئەگەر من نەچوومایە.

ئەو ڕۆژە گەیشت. من و مەهتاب کەلوپەلێکی کەممان خستە ناو جانتاکانمانەوە، جێگامان هێشتەوە بۆ ئەو دیاریانەی بڕیاربوو ببەین بۆ ئێران. بەڵام مودی چەند جانتای هەبوو، یەکێك لەوانە پڕببوو لە دەرمان، کە وەك خۆی دەیوت، دیبەخشێت بە بەرپرسانی پزیشکی ناوچەیی. لە دواساتدا، مەهتاب بڕیاریـــدا کەرویشکەکەی بهێنێت.

یەکی ئابی هەزار و نۆ سەد و هەشتا و چوار یەکەم فڕینمان بۆ نیویۆرك بوو، پاشان بۆ لەندەن. لەوێ دوانزە کاژێر وەستانمان هەبوو، کە ئەوەندە ماوە هەبوو، تۆزێك بگەڕێین. دوو بوکەشوشەی بەریتانیم کڕی بۆ مەهتاب. کە کاتی فڕین نزیکدەبۆوە، ترسم زیاتر دەبوو لە چوونە ناو فڕۆکەیەکی ترەوە.

کاتێك چاوەڕوانبووین لە فڕۆکەخانەی هێسرۆ، بە ماوەیەکی کورت، پێش فڕینمان بۆ قبروس و تاران، مودی تووشی بوو بە تووشی دکتۆرێکی ئێرانییەوە، کە ئەویش دەگەڕایەوە، پاش سەردانی لە ئەمریکا، لەگەڵی قسەوباسی دامەزراند.

"هیچ کێشەیەك هەیە، لە چوونە ناو ئێرانەوە؟" بە نیگەرانییەوە پرسیارمکرد.

"نـــا،" دڵنیاییکردم.

پزیشکە ئێرانییەکە چەند زانیاری پێداین، کە چۆن خۆمان لە کێشەی گومرگ ڕزگاربکەین. ئێرانییەکان، پزیشکەکە وتی، گومرگێکی زۆر دەخەنە سەر ئەو کاڵایانەی کە لە ئەمریکا دروستکراون و دەبرێنە ناو وڵاتەوە.

"ئەگەر پێیانــبڵێن، ئێوە بەنیازن لەوێ بمێننەوە و دەست بەکار بکەن، لەوانەیە گومرگێکی کەمترتان لێبسێنن،" پێشنیاریکرد.

پێم خۆشنەبوو شتی وەها ببیستم، هەتا ئەگەر تەنیا لەبەر پارەش بێت.

"بەڵام ئێمە نا -"

"دەزانم،" قسەکەی پێبڕیم.

"بەنیازنین لە ئێران بمێنینەوە" درێژەم بە قسەکە دا. "تەنیا بۆ دوو هەفتە دەمێنینەوە و یەکسەر دەگەڕێینەوە."

"بەڵێ،" وتی. پاشان لەگەڵ مودی بە فارسی دەستیان بە گفتگۆکرد.

لە ترساندا گیانم دەلەرزی، کاتێک چووینە ناو فڕۆکەکەوە. دەمویست بقیژێنم، ڕابکەم و بە پێپلیکانەکاندا ڕاکەمە خوارەوە، بەڵام لەشم گوێڕایەڵی دڵم نەبوو. دەست بە دەستی مەهتابەوە، چووینە ناو فڕۆکەکەوە، جێگاکانی خۆمان دۆزییەوە و پشتێنمان لێبەست.

لە ماوەی تەواوی فڕینەکەماندا بەرەو قبروس، هەر خەیاڵم لای ئەو گرفتە بوو کە تێیکەوتبووم. کاتێک کە تایەی فڕۆکەکە کەوتە سەر ڕێگای نیشتنەوەی فڕۆکەخانەی قبروس، زانیم نیتر ئەمە دواهەلـــــە، دەستی مەهتاب بگرم، لە فڕۆکەکە ڕاکەم و یەکسەر فڕۆکەیەکی تر بگرم بەرەو ماڵەوە. بەڕاستی بیرم لەم دوارێگایە دەکردەوە، بەڵام دەنگی پارێزەرەکە لە گوێمدا زرنگایەوە کە دەیوت: "ئەو هیچ تاوانێکی نەکردووە. هیچ شتێکت بەدەستەوە نییە، ڕێگای سەردانی لێبگریت لەگەڵ مەهتابدا بچێت."

هەرچی چۆنێک بوو، لە فڕۆکەکە نەهاتمە خوارەوە. کاتێک کە ڕاوەستابووین، یاوەرانی فڕۆکەکە بە بڵنگۆ ڕایانگەیاند، کە پشوومان لە فڕۆکەخانەی قبروس بۆ ماوەیەکی کورت دەبێت. ڕێبوارانی بەرەو تاران لەناو فڕۆکەکەدا دەمێننەوە.

تەنیا چەند خولەکی برد. فڕۆکەکە چووە سەر ڕێگای هەستان و تاوی دایە خۆی. لووتی فڕۆکەکە بەرزبۆوە، تایەکانی ڕێگاکەی جێهێشت. هەستم بە هێزی فڕۆکەکە کرد، کە چۆن دەمانبات بۆ ناو ئاسمان.

مەهتاب لە تەنیشتمەوە کەوتە باوێشکدان، هیلاکبوو بەدەست سەفەری دوورودرێژەوە. مودی کتێبێکی فارسی دەخوێندەوە.

ترس لەجێگای خۆم ڕەقیکردبووم، دەمم گۆیــنەدەکرد، دەمـزانی بەرەو کوێ دەچم، بەڵام لێم ڕۆشننەبوو، چارەنووسم بەرەو کوێ دەچێت.

تێبینییەکان:

.colostomy .1

.Easter .2

# 24

بەیانی ڕۆژی چوار شەممە، بیست و نۆی مانگی کانوونی دووەمی هەزار و نۆ سەد هەشتا و شەش، دنیا سارد و ڕەنگ خۆڵەمێشی بوو، وەك دەروونی من. لە ئاوێنەدا دەموچاوی سووری ئاوساوی خۆمم بینی، کە ئاکامی فرمێسکڕشتنی زۆری شەو بوو. مودی مەهتابی ڕوانەی قوتابخانە کرد و پاشان بە منی وت، کە دەچین بۆ ئۆفیسی هێڵی هەوایی سویسرا، بۆئەوەی پاسپۆرتەکەمیان بدەمێ، کە لە لایەن دەمایەوە تا ڕۆژی هەینی دەچووومە ناو فڕۆکەکەوە.

"لەگەڵ شەمسی و خانم حەکیم دەبێت بچم بۆ *تەعاونی*،" بیری مودیم خستەوە. نەیدەتوانی ئەو بەڵێنە پشتگوێبخات، کە بە ژنی مێزدربەسەرکەم دابوو.

"لە پێشدا دەچین بۆ هێڵی هەوایی سویسرا،" وتی.

چوونەکە ماوەیەکی زۆری برد، چونکو ئۆفیسەکە دوور بوو، لەو پەڕی شار. کاتێك کە لەناو تەکسیدا هەڵتەکهەڵتەکمان بوو بەسەر شەقامەکانەوە، من هەر خەیاڵم لای هاتوچۆکەی تەعاونی بوو. ئایا مودی ڕێگامانـدەدا، هەر سێ ژنەکە تەنیا پێکەوە بڕۆین؟ ئایا دەتوانم دەستم بە تەلەفونێك بگات؟

بۆ ئەگبەتی، مودی بۆ ماڵی شەمسی دوامکەوت.

"چی بووە؟" شەمسی پرسیاریکرد، هەرکە دەموچاومی بینی.

وەڵامــــــــەدایەوە.

"پێمــبڵێ، چی ڕوویداوە،" داوایــکرد.

مودی بە سەرمانەوە ڕاوەستابوو.

"نامەوێت بچم بۆ ئەمریکا،" دەستمکرد بە گریان. "مودی دەڵێت، دەبێت بچم ئەو کارە بکەم. دەبێت هەموو شتێك بفرۆشم. منیش نامەوێت بڕۆم."

شەمسی ڕووی لە مودی کرد. "تۆ ناتوانی، لە کاتێکی وادا بەزۆر کارێکی وەهای پێبسپێریت. ڕێگایـبدە، بەس بۆ چەند ڕۆژێك بچێت و باوکی ببینێت."

"نـــــا،" مودی نەڕاندی. "لەڕاستیدا باوکی هەر نەخۆش نییە. ئەمە فێڵە. ئەمە دروستکراوە."

"با ڕاستە!" گریام. "باوکم بەڕاستی نەخۆشە. خۆت ئەوە دەزانیت."

لەبەر چاوی شەمسی و زاری، من و مودی بە ڕەوی یەکتریدا تەقینەوە.

"کەوتوویتەتە تەڵەی خۆتەوە!" مودی هاواریکرد. "ئەمە فێڵێك بوو، بۆ بردنەوەی تۆ بۆ ئەمریکا. دەبێت ئێستا بڕۆیت. دەچیت و ئەو پارەیەم بۆ دەنێریتەوە بۆ ئێرە."

"نـــــا!" هاوارمــکرد.

مودی قۆڵی گرتم و ڕایکێشام بەرەو دەرگاکە. "ئێمە دەڕۆین،" مودی هاواریــکرد.

"*ئا بزورگ،*" "*ئاغای گەورە،*" شەمسی وتی. "ئارامبەرەوە. پێویستە لەسەر ئەمە قسەبکەین."

"ئێمە دەڕۆین!" مودی دووبارەیکردەوە.

کاتێك کە بە قایم ڕایدەکێشام بۆ دەرەوە، ئاوڕمدایەوە و هاوارم لە شەمسی و زاری کرد، "تکاتانلێدەکەم بە هانامەوە وەرن. لێمبپرسنەوە. ئازارمان پێدەگەیەنێت."

مودی دەرگاکەی دایەوە بە یەکدا.

قایم قۆڵی گرتبووم، بەسەر شۆستە بەستووەکاندا ڕایدەکێشام بەرەو ماڵی خێزانی حەکیم. نزیکەی پانزە خولەکێك دەبوو بەپێ. لە تەواوی ڕێگاکەدا، هاواریدەکرد و سوێندیدەخوارد، هەرچی وشەی ناشرین هەبوو، یەك لەسەر یەك پێیدەدام. ئەو جنێوانە ئەوەندە برینداری نەکرد وەك لەوەی کە وتی، "هەرگیز ئەو مەهتابە نابینیتەوە!"

کاتێك نزیکی ماڵی حەکیم بووینەوە، مودی وتی، "ئێستا ئیتر ورتەت لە دەم نەیەتە دەرەوە. فرمێسك نەڕێژی لەبەرچاوی خانم حەکیم. نابێت بزانێت کێشەیەك لە نێوانماندا هەیە."

مودی فەرمووی چایخواردنەوەی خانم حەکیمی ڕەتکردەوە و وتی، "با بچین بۆ *تەعاونی*."

هەر سێکمان چووین بۆ ئەنباری مەسجید، مودی بۆ ساتێك قۆڵی بەرنەدام. نیسکێکی زۆرمان کڕی و گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە.

لە پاش نیوەڕۆ، مودی سەرگەرمی کاربوو لە کلینیکەکەی. هیچی لەگەڵ نەوتم، تەنیا منی خستبووە ژێرچاودێری خۆیەوە و لەوەدەچوو، ئەمە هەروا بەردەوامبێت تا دەمخاتە ناو فڕۆکەکەوە.

مەهتاب کە لە قوتابخانە گەڕایەوە، پاش ئەوەی دڵنیابوو کە باوکی خەریکی کاری خۆیەتی، منی بردە سووچێکی چێشتخانەکەوە. لە پڕ وتی، "مامـــــی، تکاتـلێدەکەم هەر ئیمڕۆ بمبەرەوە بۆ ئەمریکا." ئەوە یەکەم جاری بوو لەو چەند مانگدا، شتێکی وەهای بە دەمدا بێت. ئەویش دەیزانی، کە خەریکە کارلەکار دەترازێت.

باوەشم پیادا کرد. فرمێسك بە چاوانماندا خوڕەیـکرد و تێکەڵی یەکتر بوون. "مـــــەهتاب، ئێستا ئێمە ناتوانین بڕۆین،" وتم. "بەڵام نیگەران مـــەبە. جێتـناهێڵم لە تاران. مـــــن بەبێ تۆ، ناگەڕێمەوە بۆ ئەمریکا."

بەڵام چۆن، ئەم بەڵێنە بەرەمسەر؟ ئایا مودی دەیتوانی، بە شەق و هاتوهاوار بمخاتە ناو فڕۆکەکەوە؟ بەڵـــێ، ئەگەری ئەوە هەبوو، دەمزانی، هیچ کەسێك ئەوەی بە خەیاڵدا نایەت بەری پێبگرێت. هەروەها دەیتوانی، دەرمانی هێوەرکردنەوەم پێبدات و بمنێرێتە ناو فڕۆکەکەوە، بەبێ ئەوەی ئاگام لەخۆم بێت. هەموو شتێکی لەدەست دەهات.

فریشتە دوانیوەڕۆیەکی درەنگ هات بۆ ماڵئاواییـکردنم. زانی، تەواو غەمبارم. چەند لە توانایدا بوو، هەوڵیدا دڵنەواییمـبکات. شـــانۆگەرییەکـــەم لەگەڵ ئەو، هاوڕێکانی ترم و

مومی تەواوبوو. ئیتر نەمدەتوانی خۆم وا پیشانبدەم، کە ژنێکی موسڵمانـــی دڵشادم. ئەوەی کردم، بوو بە چی؟

مودی دەرکەوت، داوای چای کرد. لە فریشتەی پرسی دەربارەی هاوسەرەکەی و ئەمە وایکرد، فرمێسك بە چاویدا بێتە خواردوە.

ئـــایا گوێم لە ئەمبولانس بوو، یان گوێم دەزرنگایەوە؟ ئایا ئەوە پرتەپرتی لایتەکانیەتی بەسەر دیواری ماڵەکەمانەوە، یان من خـــەودەبینم؟ دەنگی شاور نەبوو. ئەمبولانس گەیشتە بەردەم دەرگای ئێمە. لە ئاسمان ئەمە هاتە خواردوە.

کـــاری ناکاو بوو! مودی دەبوو، بڕوات بۆ نەخۆشخانە.

چاوی تێبڕیـــــم. دەریایەك لە ڕق، بێزاری و پرسیار، بەبێدەنگی لە نێوانماندا هاتوچۆیکرد. چۆن دەتوانێت، بچێت بۆ نەخۆشخانە و بێ پاسەوان من جێبهێڵێت؟ دەتـــوانم چی بکەم؟ بـــۆ کوێ ڕابکەم؟ بۆ ساتێك دوودڵبوو، گەڕیـــکرد لە نێوان گومانێکی زۆری لە من و ئەرکی پزیشکایەتی خۆی.

نەیدەتوانی وەڵامی کارە لەناکاوەکە نەداتەوە و نەشیـــدەتوانی دەستبەرداری پاسەوانیکردنی من بێت.

دروست فریشتە هەستیـــکرد، چی لە گۆڕێدایـــە. "من لەگەڵ بیتی دەمێنمەوە تا تۆ دەگەڕێیتەوە،" بە مودی وت.

بەبێ ورتـــــە، مودی پڕیـــدایە جانتا پزیشکییەکەی و دەرچوو بۆ دەرەوە بۆ لای ئەمبولانسەکە.

ڕۆیشـــــت. کەی دەگەڕێتەوە، بۆم ڕۆشن نەبوو. پێنج کاژێر یان نیو کاژێر - پەیوەندی بەوەوە بوو، کارە ناکاوەکە چییە.

مێشکم لەو تەمەڵییە ڕاپەڕاندم. ئەمە ئەو هەلەیە، کە بە دوایەوە ڕاکەڕاکمـــە، لە دڵی خۆمدا وتم. دەست بەکار بـــە! تـــا کارێك لە گۆڕێدا مـــاوە!

فریشتە هاوڕێیەکی باش بوو، خۆشەویست بوو، تەواو جێگای متمانە بوو. دەمتوانی ژیانی خۆمی بخەمە دەستییەوە. بەڵام ئەو هیچ شتێکی نەدەزانی لەبارەی ئاماهلەوە، هیچ شتێکی نەدەزانی لە بارەی پیلانێکەوە کە لە ژێر سەرمدا بوو. لە پێناوی خۆیدا تێکەڵی ئەم بەزمەم نەکرد. هاوسەرەکەی لە بەندیخانەدا بوو، لەسەرئەوەی بەدژی حکومەت بیری دەکردەوە، وە ئەمە ئەوی خستبووە هەلومەرجێکی سەختەوە. نەدەبوو منیش زیاتر بیخەمە مەترسییەوە.

هێشتم تەنیا چەند خولەك بڕوا. کەوتمە قومار بەو کاتە، کە نەمدەزانی کەی تەواودەبێت. کۆششمکرد دەنگم ئاسایی بنوێنێت، کاتێك بە فریشتەم وت، "دەبێت بچمە دەرەوە بۆ گوڵکڕین، بۆئەوەی بەدەستی بەتاڵ نەچم بۆ نانخواردنی ئێواری."

بۆ ئەو ئێوارێیە، مەلیحەی دراوسێمان دەوتیکردبووین بۆ نانخواردنی ماڵئاواییکردنی من. بەهانەکە لە شوێنی خۆیدا بوو، بردنی گوڵ هەڵسوکەوتێکی گونجاو بوو.

"چاکـــه، به ئوتومبیل دەچین،" فریشته وتی.

ئەمەش باش بوو. دەمانتوانی له کۆلانەکەی خۆمان و دەروودراوسێکانمان خێراتر دوورکەوینەوە، وەك لەوەی بەپێ برۆین. بەو پەڕی خێراییەوە کەوتمە خۆم، بەبێ ئەوەی وا دەرکەوم کە پەلەمە، مەهتابم گۆڕی و خۆمان گەیاندە ئوتومبیلەکەی فریشتە.

له چەند شەقام ئەو لاتر، فریشته لەبەردەمی دوکانی گوڵفرۆشێکدا ئوتومبیلەکەی ڕاگرت و کە ویستی دەرگاکەی لای خۆ بکاتەوە بۆ هاتنە خوارەوە، پێمـوت، "هەر لێرانەدا جێمانــبهێڵە. پێویستم بە هەوای پاك هەیە. من و مەهتاب بە پیاسە دەگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە."

ئەمە قسەیەکی پوچ بوو، هیچ کەسێك لەم سەهۆڵبەندان و بەفرەدا پێویستی بە پیاسە نەبوو.

"تکاتلێدەکەم با بتانـگەیەنمەوە،" فریشە پێیــداگرت.

"نـــەء. بەڕاستی پێویستم بە هەوای پاکە. دەمەوێت پیاسەبکەم." لام بۆ کردەوە و هەر له ناو ئوتومبیلەکەدا، باوەشم پیادا کرد. "جێمانــبهێڵـــــه،" لێم دووبارەکردەوە. "تۆ دەرۆیت. سوپاسـتـدەکەم بۆ هەموو شتێك."

چاوی پڕبوو له فرمێسك، کاتێك وتی، "چـــــاکه."

من و مەهتاب له ئوتومبیلەکە هاتینە خوارەوە و تەماشامانکرد، تا فریشته بە خۆی و ئوتومبیلەکەیەوە لە چاومان ونبوو.

بای سارد دەیدا بە دەموچاومدا، بەڵام بە خۆمم نەدەزانی، تا دوایی هەستمپێکرد. مەهتاب هیچ پرسیارێکی نەکرد.

دوو تەکسی جیاوازمان گۆڕی، بۆئەوەی لە ناوچەکە دوورکەوینەوە و کەس شوێنپێمان هەڵنەگرێت. سەرنجام له تەکسی هاتینە خوارەوە و پێمان نایە شەقامێکی پڕ بەفرەوە و تەلەفونێکی پاردمان دۆزییەوە. بە پەنجەی لەرزۆکەوە ژمارەی تایبەتی ئاماهلم لێدا. یەکسەر وەڵامیـــدایەوە. "ئیتر ئەمە دواهەلـە، کە بەدەستمەوە ماوە،" وتم. "دەبێت هەرئێستا دەرچم."

"پێویستم بە کاتی زیاترە،" ئاماهل وتی. "هەموو شتێك ئامادەنەکراوە."

"نـــەء. دەبێت هەرئێستا بکەوینە خۆمان. ئەگەر ئێستا نەڕۆم، ئیتر بۆ هەتاهەتایە مەهتاب لەدەستدەدەم."

"چاکـــه. وەرن." ناونیشانی خانوویەکی نهۆمی پێدام، نزیکی ئۆفیسەکەی خۆی و ئاگاداریکردمەوە، کە کەس دوامانەکەوێت.

تەلەفونکەم دانایەوە و لام لە مەهتاب کردەوە، تا لەو هەواڵە خۆشە بێبەشینەکەم. "مـــــەهتاب،" پێموت. "دەچین بۆ ئەمریکا."

سەرسامیکردم، دەستیکرد بە گریان.

"ئەوە چییە؟" پرسیارمکرد. "هەر ئەم نیوەڕۆیە، تۆ بە منت ئەوت، کە حەزدەکەیت بتبەمەوە بۆ ئەمریکا."

"بـــا،" بەددەم هەنسکدانەوە وتی، "دەمەوێت بچم بۆ ئەمریکا، بەڵام هەرئێستا نا. دەمەوێت بگەڕێمەوە ماڵەوە و کەروێشکەکەم بهێنم."

هەوڵمـدا خۆم ئارامکەمەوە. "گوێبگـرە،" وتم، "ئێمە ئەو کەروێشکەمان لە ئەمریکا کڕیوە، وا نییە؟" سەری لەقاند. "دەتوانین دانەیەکی تازەتر بکڕین لە ئەمریکا. ئایا دەتەوێت بێیت بۆ ئەمریکا یان دەتەوێت بگەڕێیتەوە بۆ لای باوکت؟"

مەهتاب فرمێسکەکانی وشککردەوە. لە چاوانی کچە شەش ساڵەکەمدا بینیم، هەستی بڕیاردان لە گەشەکردن دایە و هەر لەو کاتەدا بۆم دەرکەوت، کە مودی سەرکەوتوونەبووە لە ملکەچکردنی مەهتابدا بە کوتك. وردی چەمابۆوە، بەڵام نەشکابوو. منداڵێکی ئێرانی گوێڕایەڵ نەبوو: کچە بە ورە ئەمریکاییەکەم بوو.

"دەمەوێت بچم بۆ ئەمریکا،" کچەکەم بڕیـــاریـدا.

"دەی کە وایە خێرابکـــە،" وتــم. "دەبێت تەکسییەك بگرین."

# 25

"بیتییـی؟" کچێکی گەنج پرسیاریکرد، کاتێك کە بە ئاستەم دەرگای خانووە نهۆمییەکەی لێکردبوومەوە.

"بەڵێ."

خۆی لادا، تا بچینە ژوورەوە. زیاتر لە یەك کاژێری برد، تا توانیمان خۆمان بگەیەنین بەناو باوبۆران و چەند جار گۆڕینی تەکسی پرتەقاڵی بە ناو شەقامەکانی تاراندا. ئەمە ئەوەندە بەس بوو، تا ئاماهل بکەوێتە خۆی بۆ ئەم دەرچوونە لەپڕەمان. "ئاماهل پێیوتووم، خواردنتان بۆ بێنم، ئەگەر برسیتانە،" کچەکە وتی.

نە من و نە مەهتاب، حەزێکمان بۆ خواردن نەبوو. ئەوەندە سەرمان پڕچەنجاڵ بوو، ئاگامان لە سکی خۆمان نەمابوو. بەڵام دەمزانی، دەبێت کەڵك لە هەر هەلێك وەرگرین، تا لەشی خۆمانی پێبەهێزبکەین، بۆ بەرەو ڕووبوونەوە لەگەڵ زستانی سارد و ڕۆژان و شەوانی پڕمەترسی نادیار کە لە پێشمان بوون.

"بەڵێ، بێزەحمەت،" وتم.

کچەکە *ڕووسەریی*ەکی ڕەشی دا بە سەریدا، دەموچاوە جوانەکەی پێشاردەوە. لەوانەیە قوتابی زانکۆ بێت، لە دڵی خۆمدا وتم. چەندی لەبارەی ئێمەوە دەزانی؟ پەیوەندی چی بوو بە ئاماهلەوە؟

"زۆرم پێناچێت، دەگەڕێمەوە،"وتی.

ئێمەی جێهێشت لە ژینگەی تازەدا. یەکسەر چووم، پەردەی پەنجەرەکانم دایایەوە.

خانوویەکی نهۆمی بچوك بوو، تا ئاستێك پاکنەکرابۆوە، بەڵام کەم مەترسیتر بوو لە شەقامەکە. ژووری دانیشتنەکەی، قەنەفەیەکی کۆنی زەمبەلك شکاوی تیادابوو. سیسەمی نوستنی نەبوو، چەند دۆشەك لەسەر زەوییەکە ڕاخرابوو.

لە چاوانی مەهتابدا دەمبینی، چ ترسێك دایگرتووم. ئایا مودی تا ئێستا هاتۆتەوە؟ تەلەفونی بۆ پۆلیس کردووە؟

بێجگە لە ترس، چی تر لە چاوانی مەهتابدا بەدیدەکرا، خۆشی، ورە، هیــوا؟ سەرئەنجام ئێمە خەریکی *شتێك* بووین. بە باش یان بە خراپ، مانگەکانی دووردرێژی گۆشەنشینیمان تێپەڕاند.

مێشکم پڕبووبوو لە پرسیار. چی دەبێت، ئەگەر ئێمە نەتوانین زوو لە تاران بچینە دەرەوە؟ بۆ چەند شەو لێرە گیردەکەین؟ زۆر کەس بە ئێمەیان وتووە، هەڵهاتنێکی سەرکەوتوانە ئەوەیە، کە بە خولەك پلانەکەی بۆ دابنرێت. ئێمە ئەم یاسایەمان پێشێلکردووە.

وەك پێیوتووبووم، تەلەفونمکرد بۆ ئاماهل، تا لە گەیشتنی خۆمان ئاگاداریبکەمەوە.

"هەلاو." دەنگە ئاشناکەی هاتەگوێم.

"گەیشتـــین،" وتم.

"بیتیبی!" هاواریکرد. "زۆر خۆشحاڵم، توانیت خۆت بگەیەنیتە خانووە نهۆمییەکە. نیگەران مەبە. باش دەبن. ئێمە ئاگاداریتان دەکەین. پەیوەندیم بە خەڵکەوە کردووە و تا بەیانی خەریکدەبم، تا دەگەین بە شتێك. هیچ شتێك تەواونەبووە، بەڵام لەسەر شتێك کاردەکەم."

"تکاتلێدەکەم خێراکـــە."

"باشە نیگەران مەبە. هەموو شتێك دەچێتە پێشەوە." پاشان وتی، "کچەکە خواردنتان بۆ دەهێنێت، پاشان دەبێت جێتانبهێڵێت. من بەیانی زوو دێم، نانی بەیانیتان بۆ دەهێنم. تەنیا لە ناودوە بمێننەوە. لە ماڵەکە مەچنە دەرەوە و مەچنە بەردەم پەنجەرەکان. هەرچی شتێکت ویست، تەلەفونم بۆ بکە. شەو هەر کاتێك پێویستبوو، تەلەفونم بۆ بکە."

"چاکە."

"بیر لە شتێك دەکەمەوە و دەمەوێت، لەلای خۆت بینوسیت،" وتی. تەلەفونەکەم دانا و لەناو جانتاکەمدا، پارچەیەك کاغەز و پێنوسێکم دەرهێنا. "بۆئەوەی بتوانین لە تاران دەرتانکەین، دەبێت هەندێك کات لە مێردەکەت بکڕین،" ئاماهل وتی.

"دەمەوێت تۆ تەلەفونی بۆ بکەیت. بیهێنیتە سەر ئەو باوەڕەی، کە بوارێك هەیە بۆ گەڕانەوە بۆ لای."

"تەلەفون بۆ مودی شتێکە، کە بەڕاستی نامەوێت بیکەم،" ناڕەزایەتی خۆمم دەربڕی.

"دەزانم، بەڵام پێویستە." بە وردی پێیوتم، چی بڵێم لەگەڵ مودی، منیش لەلای خۆمەوە یاداشتمکرد.

پاش تەلەفونەکەم لەگەڵ ئاماهل، کچەکە بە پیزاوە گەڕایەوە - تۆزێك دۆشاوی تەماتە و توێژاڵێك گۆشت بەسەر لەواشێکی وشکەوە - لەگەڵ دوو کۆلا. سوپاسمانکرد و پاشان خێرا ڕۆیشت، کاردەکەی تەواوبووبوو.

"من هیچ شتێك ناخۆم،" مەهتاب وتی، کاتێك بە بێزارییەوە تەماشای پیزاکەی دەکرد. منیش دەمم بۆ نەبرد. لەو ساتەدا، لەسەر هۆرمۆنی لەشی خۆمان دەژییاین.

تەماشای ئەو سەرنجانەم کرد کە یاداشتمکردبوون، جارێکی تر نوسیمەوە، لێیوردبوومەوە و ئەوەی پێویستبوو بیڵێم، لە مێشکی خۆمدا، چەند باردم کردەوە. سەیرمکرد، دەمەوێت تەلەفونەکە دوابخەم. بە نابەدڵییەوە تەلەفونەکەم هەڵگرت و ژمارەی ماڵەکەی خۆمانم لێدا.

لە یەکەم زەنگدا، مودی تەلەفونەکەی هەڵگرت.

"منــــم،" وتم.

"ئەوە لە کوێیت؟" بە تووڕەییەوە وتی.

"له ماڵی هاوڕێیەکمم."

"کـــام هاوڕێ؟"

"پێتناڵێـــم."

"هەر ئێستا دێیتەوە،" فەرمانیدەرکرد.

مودی کەسێکی توڕە بوو، بەڵام گوێمپێنەدا و دوای ڕێنوێنییەکانی ئاماهل کەوتم.

"شتێك هەیە دەبێت قسەی لەسەر بکەین،"وتـــم. "من پێمخۆشە، ئەم کێشەیە لە کۆڵ خۆمانی بکەینەوە، ئەگەر تۆ پێتباشبێت."

"بەڵێ، پێمباشە." دەنگی زیاتر بەرەو ئارامی و پێشبینانە دەچوو. "وەرە ماڵەوە، با پێکەوە لەسەر بدوێین،" پێشنیاریکرد.

"نامەوێت هیچ کەسێکی تر بزانێت، چی ڕوویداوە،" وتم. "نامەوێت لەبارەی ئەمەوە لەگەڵ مامل یان مەجید قسەبکەیت، لەگەڵ خوشکەکەت یان هەر کەسێکی تر. ئەگەر دەمانەوێت چارەسەری ئەمە بکەین، ئەوە ئیتر کێشەی خۆمانە و دەبێت خۆمان پێکەوە لەسەر بدوێین. لەو چەند ڕۆژەی دواییدا، مامل گەڕایەوە ناو ژیانت و هەموو شتێکی لێتێکداین. هیچ گفتوگۆیەکمان نابێت، ئەگەر لەسەر ئەمە ڕازینەبیت."

مودی کەیفی نەدەهات، لە دەنگی زوڵاڵی من.

"تەنیا تۆ وەرە ماڵەوە، ئێمە قسەی لەسەر دەکەین،" داواکەی دووبارەکردەوە.

"دەزانم ئەگەر بێمەوە، مامل لەبەر دەرگا چاودێرواندەکات، بۆئەوەی مەهتاب بەرێت و تۆش دەمخەیتە چواردیوارەوە و دەرگام لەسەر دادەخەیت، هەر وەك ئەوەی كە خۆت وتت."

مودی دەستوپای خۆی ونکرد، نەیدەزانی، بە چ زمانێك لەگەڵـــم بدوێت. زمانی ئاشتبوونەوەی گرتەبەر. "نـــا، نا، شتی وەها هەر ڕوونادات. هەموو کاتی نەخۆشەکانم ڕەتکردۆتەوە بۆ سبەینێ. وەرە ماڵەوە، پێکەوە نانێکی ئێوارە دەخۆین و پاشان هەتا ڕۆژدەبێتەوە قسەدەکەین."

"بۆ ڕۆژی هەینی، من دوو پێم ناچێتە ئەو فرۆکەیەوە."

"من بەڵێنی وات پێنادەم."

"باش گوێبگرە. ئێستا پێتدەڵێم، من لە ڕۆژی هەینیدا ناچمە ناو ئەو فرۆکەیەوە." بینیم دەنگم بەرزدەکەمەوە. ئاگاداربە، لە دڵی خۆمدا وتم. بڕیاربوو، مامەڵەی کاتکڕینی لەگەڵ بکەیت، نەك چەنەحانی.

مودی لەو سەری هێڵی تەلەفونەکەوە هاواریدەکرد، "من ناتوانم بەڵێنی وا بە تۆ بدەم! هەر ئێستا دێیتە ماڵەوە! ئیو کاژێرت پێدەدەم خۆت بگەیەنیتە ماڵەوە، ئەگینا ئەوەی پێویستبێت دەیکەم."

دەمزانی مەبەستی ئەوەیە، تەلەفون بۆ پۆلیس دەکات، منیش کەوتمە یاریکردن بەو کارتەی کە ئاماهل پێیدابووم.

"ئینجا ئێستا گوێم بۆ بگرە،" پێموت، "بەبێ مۆڵەت، تۆ خەریکی کاری پزیشکیت. ئەگەر هەر کێشەیەکەم بۆ بنێیتەوە، من لەلای حکومەت ئاشکراتدەکەم."

یەکسەر دەنگی مودی نەرمبوو. "نـــا، تکاتلێدەکەم ئەوە نەکەیت،" پاڕایەوە. "ئێمە پێویستمان بە پارەیە. لەپێناوی خۆماندا ئەو کارە دەکەم. دەستبەدامێنت ئەو کارە نەکەیت. تەنیا وەرە ماڵەوە."

"با بزانم، بیرێکی لێدەکەمەوە." ئەمەم وت و تەلەفونەکەم داخست.

پێشبینیمنەدەکرد، هەنگاوی دواتر مودی چی دەکات، بەڵام لێمڕۆشنبوو، کە هێشتا تەلەفونینەکردووە بۆ پۆلیس و لە خۆشم دڵنیابووم، کە هەڕەشەکەم بەری پێدەگرێت ئەو کارە نەکات هیچ نەبێت لەو شەوەدا.

سەرنجم بۆ لای مەهتاب چوو، کە بە واقوڕمانەوە گوێی لە تەواوی گفتگۆکەمان بوو. کەوتینە باسی گەڕانەوە بۆ ئەمریکا. "ئایا لە خۆت دڵنیایت، دەتەوێت بگەڕێیتەوە بۆ ئەمریکا؟" پرسیارملێکرد. "دەزانیت، ئەگەر ئەوە بکەیت، ئیتر هەرگیز باوکت نابینیتەوە."

"بەڵێ،" وتی، "ئەمە ئەو شتەیە، کە من دەمەوێت. دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ ئەمریکا." ئاستی تێگەیشتنی بۆ جارێکی تر سەرسامیکردم. ئازایەتی و پەیگیری لە دەنگیدا، منیشی بەهێزکرد. ڕێـگای گەڕانەوەمان لەسەر خۆمان داخست.

بۆ چەند کاژێری تر، بەخۆشییەوە باسی ئەمریکا و بیرەوەرییەکانیمان کرد. زۆر قوڵ ڕۆیشتبووین، بۆ چەند جار لە قسەکردن کەوتین، بەهۆی تەلەفونی ئاماهلەوە بۆ ئەحواڵپرسی و ئاگادارکردنەوەمان بە شێوەیەکی ناڕۆشن، لە پلانەکەی کە چۆن دەچێتە پێشەوە.

دواتەلەفونی کاتژمێری دوانزە و نیوی شەو بوو. "ئیتر ئیمشەو تەلەفونت بۆ ناکەم،" ئاماهل وتی. لەبەرئەوەی چەند ڕۆژی سەختتان لەبەرە، بەڕاستی دەبێت باش بخەون. ئێستا بڕۆن بنون، بەیانی قسەت لەگەڵ دەکەم."

من و مەهتاب چووینە سەر قەنەفەکە، هەوڵماندا، پاڕاینەوە و ئەمدیو ئەودیومان کرد بنوین، بەڵام لەسەر ئەو جێگا ناخۆشە نوستن ئاسان نەبوو. خەو زۆری بۆ مەهتاب هێنا، بەڵام خەو نەچووە چاوم تا ڕووناکی بەرەبەیان ژوورەکەی ڕووناککردەوە، کاتێک کە ئاماهل تەلەنونیکرد بۆ ئاگادارکردنەوەمان لە هاتنی خۆی.

نزیک کاتژمێری حەوتی بەیانی هات، جانتایەکی سەیرانی پڕکردبوو لە نان، پەنیر، تەماتە، خەیار، هێلکە و شیر. دەفتەری وێنە و پێنوسی ڕەنگاوڕەنگ بۆ مەهتاب لەگەڵ ئەو زەرفە نایلۆنەی، کە ڕۆژی سێ شەممە لە ئۆفیسەکەی پێمدابوو، جلی زیادە و هەندێک شتی تری تیادابوو. هەروەها جانتایەکی چەرمی پشتی چاك، وەك دیاری پێیدام - دیاری ماڵئاوایی.

"تەواوی شەو هەر خەریکبووم، لەگەڵ کەسانی جیاواز قسەمکرد،" وتی. "پلانەکەمان وایلێهات، کە بە تورکیادا هەڵبێین."

تورکیــــــا! ڕاچڵەکیم. فڕین بۆ بەندەر عەباس و پەڕینەوە بە بەلەمی خێرا بە کەنداوی فارسدا - فڕین بۆ زاهیدان و چوونە ناو پاکستانەوە لەگەڵ قاچاغچیدا، فڕین بۆ توکیۆ بە پاسپۆرتی خەڵکی ترەوە - ئامانە ڕێگایەك بوون، کاریان لەسەر کرا. تورکیا هەمیشە دوارێـگای ئاماهل بوو. پێیدەوتم، هەڵهاتن لە ڕێـگای تورکیاوە، نەك تەنیا پێویستی بەو پەڕی هێزی فیزیکی هەیە، بەڵکو پڕ مەترسیترینیانە، بەهۆی دەستتێوەردانی خەڵکەوە.

"ئیتر ئێستا ئەو بوارە لە دەستچوو، کە بتوانن لە ڕێـگای فڕۆکەخانەوە هەڵبێین،" باسیکرد. "دەبێت بە ئوتومبیل لە تارانەوە دەرچن بەرەو سنووری تورکیا، کە ڕێـگایەکی دوورودرێژە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش نزیکترینیانە." کەسێکی بۆ دانابووین، بە ئوتومبیل بمانبات بۆ تەبریز، لە ناوچەی باکووری ڕۆژئاوای ئێران و ئینجا بەرەو ڕۆژئاوا، کە لەوێوە قاچاغچی بە ئەمبولانس لە سنووری تورکیا دەمانپەڕێننەوە. "سی هەزار دۆلای ئەمریکی داوادەکەن،" ئاماهل وتی. "ئەوە زۆر زۆرە. هەوڵدەدەم پێیان بهێنمە خوارەوە. تا ئێستا هاتوونمتە خوارەوە بۆ پانزە هەزار، بەڵام هێشتا هەر زۆرە."

"پانزە هەزار باشە، ڕازیبە،" وتم. لە ڕاستیدا نەمدەزانی، چەند پارەم لە حساب بانکییەکەمدا هەیە لە ماڵەوە، بەڵام بۆم گرنگ نەبوو. دەمزانی، هەرچی چۆنێك بێت، ئەو پارەیە ئامادەدەکەم.

ئاماهل سەری بادەدا. "ئەو پارەیە زۆر زۆرە،" وتی.

لەپڕ هەستمکرد، کە ئێمە لەبارەی پارەی ئاماهلەوە قسەدەکەین، نەك پارەی من. ئاماهل پارەیەکی دەدا، گرنتی وەرگرتنەوەی نەبوو، چونکە ڕۆشننەبوو، ئایا من دەتوانم بگەمەوە ئەمریکا، یان من ئەو پارەیەی بۆ دەنێرمەوە.

"هەوڵدەدەم زیاتر پێیان بهێنمە خوارەوە،" وتی. "ئیمڕۆ کارم زۆرە. ئەگەر پێویستت بە هەر شتێك بوو، تەلەفونم بۆ نۆفیسەکە بۆ بکە."

من و مەهتاب پێکەوە، ڕۆژێکی پڕ تەنگەژەمان بردەسەر بە دانیشتن و ویردخوێندن. ناوبەناو دەفتەری وێنە و پێنوسەکانی دەهێنا، بەڵام نەیدەتوانی زۆر هۆشی بەلایەوە بێت. بەسەر فەرشی دڕاوی ئێرانیدا کەوتمە هاتوچۆ، ئەدریانالینم بەرزدەبۆوە، مەزاجێکی تێکەڵم لە گەشکەی شادی و ترس هەبوو. ئایا کەسێکی خۆپەرست نەبووم؟ ئایا کچەکەم دەخەمە مەترسییەوە؟ هەتا ئەگەر خراپیش بووبێت، ئایا باشتر نەبوو لێرە گەورەبێت - لەگەڵ من یان بەبێ من - وەك لەوەی هەر گەورەنەبێت؟

ئەماهل نزیکی نیوەڕۆ گەڕایەوە بۆ لامان و ئاگاداریکردینەوە، کە توانیویەتی پارەکە بکات بە دوانزە هەزار دۆلار.

"ڕازیبە،" وتم. "بۆم گرنگ نییە، چەندی تێدەچێت."

"لەو باوەڕەدام، ناتوانم لەوە زیاتر پێیان بهێنمە خوارەوە."

"ڕازیبە،" لێمدووبارەکردەوە.

"چاکە،" وتی. پاشان هەوڵیدا دڵنیامبکات. "ئەو خەڵکە گێچەڵت بۆ دروستناکەن. بەڵێنت پێدەدەم. خەڵکانێکی باشن. دەیاناسم کێن. ئەگەر هەستمبکردایە، کێشەتان بۆ دەنێنەوە، ئێوەم نەدەدایە دەستیانەوە. ئەمە یەکەم ڕێگای من نەبوو، بەڵام دەبێت چەند دەتوانین خێرابکەین. باش ئاگاداریتان لێدەکەن."

شەوی پێنج شەممە لەسەر هەینی، شەوێکی تری بێکۆتایی و بێخەوی بوو. سەر قەنەفەکە ئەوەندە ناخۆش بوو، کە ئەو شەوە لەسەر دۆشەکە تەنکەکانی سەر زەوییەکە پاڵکەوتین. مەهتاب لە بێوەیی مندالی خۆیەوە خەویلێکەوت، بەڵام من نەمدەتوانی جێگا بەخۆم بگرم تا کچەکەمم دەگەیاندەوە ئەمریکا - یا دەگەیشتین یان لەو ڕێگایەدا دەمردین.

سپێدەی ڕۆژی هەینی، ئاماهل بە خۆی و خواردنێکی زۆرترەوە هات ‌ ژەمێك مریشکی پێچراو لەناو ڕۆژنامەدا و خواردنێکی بێوێنەی خۆش بۆ مەهتاب ‌ دەفتەری وێنەکێشانی زیاتر، پەتویەك، مانتۆیەك بۆ مەهتاب، عەبایەکی ڕەش بۆ من و کیسەیەك بنێشتی ئەڵمانی. کاتێك مەهتاب سەرگەرمی ئەم شتە کەموێنە خۆشانە بوو، ئاماهل باسی هەلومەرجەکەی بۆ دەکردم. "تەواوی کاتم تەرخانکردووە بۆ پلانەکە،" وتی. "زۆر سەختە، چونکە زۆربەی ئەو خەڵکە تەلەفونیان نییە."

"کەی دەردەچین؟" خێرا پرسیارمکرد.

"هێشتا نازانم،" وتـــی. "دەمەوێت ئەم دوانیوەڕۆیە تەلەفون بۆ مێردەکەت بکەیتەوە، بەڵام لێرەوە نا. دەگەڕێمەوە بۆ لات و لەگەڵ مەهتاب دەمێنمەوە، تا تۆ بتوانیت بچیتە دەرەوە و تەلەفونبکەیت. هەموو ئەو شتانەی پێویستە بیڵێیت، دەینوسین."

من و مەهتاب متمانەی تەواومان بە ئاماهل هەبوو. بێجگە لەو لەگەڵ هیچ کەسێکی تر نەدەمایەوە، کاتێك دەچووومە دەرەوە. بەڵام بۆ خۆی لە هەموو ئەو پیلانگێرییەی کە لە دوورەپشتی لە کایەدا بوو، تێدەگەیشت. بە سەرلەقاندن ڕازیبوونی خۆی پیشاندا، بۆ داواکەی ئاماهل و بەدەم بنێشتجووینەوە، زەردەخەنەیەکی بۆ کردین.

ئەو دوانیوەڕۆیە، خانووە نهۆمییە بێمەترسییەکەی ئاماهلم جێهێشت بۆ سەر شەقامە پڕمەترسییە بەستۆکانی تاران. بۆ یەکەم جار لە ماوەی ئەو ساڵ و نیوەدا، خۆشحاڵبووم بەوەی کە عەبام داوە بەسەردا، خۆمم لە ژێریدا شاردۆتەوە. ڕەشەبای سارد شەڕی لەگەڵ دەکردم، کاتێك بەڕێوەبووم بەرەو تەلەفونێکی پارە لەسەر کۆڵانێکی دووری بێمەترسیدا. پەنجەکانم دەلەرزین، کاتێك تەلەفونەکەم گرت بەدەستمەوە و ژمارەکانم لێدەدا. ئەو سەرنجانەی نوسیبووم، لە جانتاکەم دەرمهێنا.

مەجید وەڵامی تەلەفونەکەی دایەوە.

"ئەوە لە کوێیت؟" پرسیاریکرد. "لە کوێیت؟"

پرسیارەکەم پشتگوێخست و دوای پرسیاری خۆم کەوتم. "مودی لە کوێیە؟ دەمەوێت قسەی لەگەڵدا بکەم."

"چاکە، بەڵام لە ماڵەوە نییە. چووە بۆ فرۆکەخانە."

"کەی دەگەڕێتەوە؟"

"نزیکەی سێ کاژێری تر ..."

"دەمەوێت لەبارەی ئەو کێشەیەوە لەگەڵی بدوێم."

"باشە، ئەویش دەیەوێت لەگەڵ تۆ بدوێت. تکاتلێدەکەم وەرەوە."

"باشە، سبەینێ من و مەهتاب لەگەڵ پارێزەرەکەم دێینەوە و قسەدەکەین، بەڵام نامەوێت هیچ کەسێکی تر لەوێ بێت. پێیبڵێ، لە نێوان کاتژمێری یانزە بۆ دوانزە یان شەش بۆ هەشتی ئێوارە دەتوانین بێین. تەنیا ئەو کاتانە پارێزەرەکەم دەتوانێت بێت،" درۆم لەگەڵ کرد.

"لە نێوان یانزە بۆ دوانزە وەرە،" مەجید وتی. "مودی هەموو کاتی ئەخۆشەکانی بۆ سبەینێ ڕەتکردۆتەوە. بەڵام پارێزەر مەهێنە لەگەڵ خۆت."

"نـــا، بەبێ پارێزەرەکەم نایەم."

"مەهتاب بهێنە و خۆت تەنیا وەرە،" مەجید لەسەر قسەی خۆی سووربوو. "ئەمە چارەسەردەکەین. منیش لێرە دەبـم."

"باوەڕناکەم،" وتم. "پێشتر لێیدام و دەرگای لەسەر داخستم، نە تۆ نە هیچ یەکێك لە خێزانەکەتان، پەنجەیەکتان بەرزنەکردەوە بۆ پارێزگاری لە من."

"نیگەران مەبە. لێرە دەبم،" مەجید دووبارەیکردەوە. پێمخۆشبوو بۆ قەشمەری پێکردنیش بێت، تۆزێك بە خزمێکی مودی پێبکەنم. "ئەوە شتێك نییە باوەڕی پێبکەم،" منگەمنگم بۆ کرد. "زۆرم لەو بەزمە لێتانبیستووە. تۆ تەنیا ئەو پەیامەم بۆ بگەیەنە و هیچی تر."

گفتوگۆکە وای لێکردم، لە ترساندا بکەومە لەرزین. دەمزانی، بۆ مودی چووە بۆ فرۆکەخانە. چووە بۆ وەرگرتنەوەی پاسپۆرتەکەم، لە نوسینەگەی هێڵی هەوایی سویسرا. خێرا چووە وەریگرێتەوە، ئەوەکو من لەپێش ئەوەوە بچم و وەریبگرم.

لەگەڵ ئەوەی لەناو عەباکەمدا خۆم شاردبۆوە، بەڵام هەستمدەکرد، ڕووتم کاتێك بەسەر شەقامەکانی تارانەوە بووم بەرەو خانووە نهۆمییەکە. پۆلیسی تفەنگبەدەستی ئامادە، بە هەموو شوێنێکەوە بوون. لە خۆم دڵنیابووم، کە هەموو کەس بەدوای مندا دەگەڕێت.

هاتمە سەر ئەو باوەڕەی، کە هەڵهاتن چەند پڕ مەترسییە، بەڵام هەر دەبێت بەرەو ڕوویبین. هەتا ئەگەر دڕندەیی و ترسناکی ئەو قاچاغچیانەی باکووری ڕۆژئاوای ئێران لە ئارادا بێت، هێشتا هەر ئەدەگمیشت بە دڕندەیی ئەو هەڕەشانەی مێردەکەم. تا ئێستا ڕووتکرابوومەوە، فڕێنرابووم و لاقەکرابووم، دڵنیاشبووم مودی لە دەستی دەهات بمکوژێت.

که گەیشتمەوە خانووە نهۆمییەکە، ئاماهل وتی، "ئەم ئێوارێیە دەردەچن." نەخشەیەکی دەرهێنا و ئەو ڕێـگایانەی پیشاندام، کە بە ئوتومبیل دەیگرینەبەر بەرەو تەبرێز، ڕێـگایەکی دوورودرێژ بوو، پاشان زیاتر بەرەو ناوچە شاخاوییەکان، کە لە ژێر کۆنترۆڵی چەکدارە کوردەکان و گەشتی پاسداراندا بوو. چەکدارە کوردەکان چۆن دوژمنایەتی حکومەتی شایان کردبوو، هەرئاوا دوژمنایەتی حکومەتی ئایەتوڵایان دەکرد. "لەبارەی منەوە، هیچ شتێك مەڵێ. پێیانمەڵێ تۆ ئەمریکیت. بە کەس مەڵێ ئیازت چییە."

کاری قاچاغچییەکان ئەوە بوو، لە تارانەوە بمانبەن بۆ سنوور، بە ئەمبولانسی خاچی سوور لە سنوور بمانپەڕێنەوە و لە کۆتاییدا بمانگەیەنن بە شاری وان، لە ناوچەی شاخاوی ڕۆژهەڵاتی تورکیا. ئیتر لەوێوە، کارەکە دەکەوتە سەرشانی خۆمان. هێشتا دەبێت ئاگاداری خۆمان بین، ئاماهل ئاگاداریکردینەوە. لە خاڵی پشکنینی سنوورەوە ئەدەپەڕینەوە، لەبەرئەوە پاسپۆرتەکانمان مۆری چوونەناوەوەی لێنەدەدرا. ئەگەر لە لایەن کاربەدەستانی تورکیاوە بگیراینایە، گومانیاندەکرد لەو پێناسنامانەی پێمان بوو، بۆ ماوەیەك دەستبەسەریان دەکردین هەتا ئەگەری ئەوەش هەبوو لە یەکتریمان جیاکەنەوە بەڵام نەیاندەگەڕاینەوە بۆ ئێران.

لە وان دەچینە فڕۆکەوە یان پاسەوە بەرەو ئانکارا، پایتەختی تورکیا، لەوێشەوە یەکسەر بۆ باڵوێزخانەی یو ئێس. تەنیا لەوێ ترسمان نەدەما.

ئاماهل پارەیەکی ئاسنی زۆری پێدام. "بە هەر تەلەفونێکی پارە گەیشتی، تەلەفونم بۆ بکە،" وتی. "بەڵام وریای قسەکانت بـــە." بۆ ساتێك لە بنمیچەکە وردبۆوە.

"ئەسفەهان،" وتی، ناوی شارێکی ئێرانە. "ئەوە ناوی ئانکارا دەبێت. هەرکە گەیشتیتە ئەنکارا، پێمبڵێ لە ئەسفەهانم."

دەمویست ئاماهل زیاتر لەگەڵم بمێنێتەوە، قسەمان بۆ بکات، لێمان دوورنەکەوێتەوە. چەند زیاتر دەمایەوە، ئەوەندە هەستم بە ئارامی دەکرد. بەڵام ڕۆیشت بۆ تەواوکردنی پێویستییەکانی هەڵهاتنمان لە ڕۆژی هەینی موسڵمانانندا.

ئایا ئەمە دواهەینیم دەبێت لە تاران؟ پاڕامەوە، کە وا دەرچێت.

ئیتر کاتی ئەوە هات، چـی بەرم لەگەڵ خۆم؟ تەماشای قوماشە وێنە چنراوەکەم کرد، کە ڕۆژی سێ شەممە دابوومە دەست ئاماهل لە ئۆفیسەکەی. ئەرێ ئەوە من چیمـــە؟ لە دڵی خۆمدا وتم. تۆ پێویستت بەوە نییە، پێویستت بە هیچ شتێك نییە. تەنیا خۆت بگەیەنە ماڵەوە، ئەوە هەموو شتێکە. ئەو قوماشە چنراوە و زەعفەرانەکەم جێهێشت.

ئاڵتونەکانم پێویستبوو، دەمتوانی لە ڕێـگا بیانگۆڕمەوە بە پارە و کاتژمێرەکەشم دەمویست بۆ ئاگاداربوونەوە لە کات، لەبەرئەوە ئەو شتە وردانەم خستە ناو جانتاکەمەوە، لەگەڵ بلوزێك بۆ مەهتاب و جلی ژێرەوە بۆ خۆم. مەهتابیش هەندێك شیرینی، بسکیت و چەند دانەیەك لە دەفتەری وێنەکانی خستە ناو جانتای قوتابخانەکەیەوە.

ئامادەی ڕۆیشتنبووین. تەنیا چاوەڕوانی هێمایەك بووین.

ئاماهل نزیك کاتژمێری شەشی ئێوارە تەلەفونیکرد و وتی، "کاتژمێری حەوت دەردەچن."

یەك کـــاژێر. پاش ئەو هەموو ڕۆژ و هەفتە و مانگانە - تەنیا یەك کاژێرمان ماوە. لەوەو پێش بێئومید بووبووم. جارێکی تر مێشکم نوقمی بیرکردنەوەی خۆی بوو. خوایە ئەوە من چی دەکەم؟ لەگەڵمان بە. هەرچی شتێکمان بەسەر دێت، چاودێری کچەکەم بکە.

لە کاتژمێری حەوت و دە خولەکدا، ئاماهل لەگەڵ دوو پیاودا هاتنە ماڵەوە، کە لەوەوپێش نەمبینیبوون.

زۆر لەوە گەنجتر بوون وەك لەوەی چاوەڕوانمدەکردن، لەوە دەچوون لەسەرتای سییەکانیاندا بن. یەکێکیان چەند وشە ئینگلیز دوا، پانتۆڵێکی جین، بلوزێکی قۆڵکورت و چاکەتێکی مۆتۆرسیکلی لەبەردابوو. بیری فۆنزی خستمەوە لە "ڕۆژانی خۆشیدا." ئەوی تریان پیاوێکی ڕیشداربوو بە جلوبەرگێکی وەرزشییەوە. دۆستانە بوون لەگەڵمان.

کاتی خنەخننەبوو. یارمەتی مەهتابم دا، مانتۆکەی لەبەربکات، منیش مانتۆکەی خۆمم لەبەرکرد و عەباکەم پۆشی و بە ئاستەم دەموچاوم هێشتەوە دیاربێت. دووبارە خۆشحاڵبووم بەوەی، لە پشت عەباڕەشەوە خۆم دەشارمەوە.

سەیرێکی ئاماهلم کرد، لەپڕ هەر دووکمان هەستێك دایگرتین. هەستی ماڵئاوایی بوو.

"لە خۆت دڵنیایت، ئەمە ئەوەیە کە دەتەوێت بکەیت؟" ئاماهل پرسیاریکرد.

"بەڵێ،" وەڵامەدایەوە. "دەمەوێت دەرچم."

فرمێسك لە چاوانیدا قەتیس مابوو، کاتێك وتی، "بەڕاستی هەر دووکتانم خۆشدەوێت،" پاشان ڕووی لە مەهتاب کرد، "دایکێکی تایبەتیت هەیە، تکاتلێدەکەم ئاگادارییە."

"ئاگاریـــــــدەبم،" مەهتـــــاب ڕاشکاوانە وتی.

"هەموو ئەو شتانەی تۆ بۆ ئێمەت کرد، مایەی پێزانینە،" وتم. "هەرئەوەندە بە سەلامەتی بگەینەوە ئەمریکا، ئەو دوانزە هەزار دۆلارەی کە داوتە بە قاچاغچی، بۆتدەنێرمەوە."

"چاکە،" وتی.

"بەڵام تۆ زۆر زیاترت لەوە بۆ ئێمە کردووە،" وتم. "شتێکی زیاترت بۆ دەنێرم." ئاماهل تەماشایەکی کچەکەمی کرد، کە ترس بە دەموچاوییەوە هاواریدەکرد.

"تەنیا شتێك کە دەمەوێت، زەردەخەنەیەکی سەر لێوانی مەهتابە،" وتی. پاشان قەراغی عەباکەمی بەسەر دەموچاومەوە لابرد و بە هێواشی ماچێکی ڕوومەتمی کرد.

"ئێستا ئیتر بڕۆن!" فەرمانیدا.

من و مەهتاب لە ماڵەکە چووینە دەردوە لەگەڵ ئەو پیاوەی، کە فۆنزی بیرخستمەوە. دوودمیان لەگەڵ ئاماهل مایەوە.

فۆنزی پێشمانکەوت بۆ ئوتومبیلێکی ئاسایی، کە لە قەراغی شەقامی بەردەمی ماڵەکە پارککرابوو. چوومە ناوی و مەهتابیشم خستە باوەشمەوە. کەوتینەڕێ بەناو تاریکی ئێواردی ڕۆژی هەینی و شەقامی ناناشنا، بۆ بەرەو ڕووبوونەوە لەگەڵ ڕێــگای هاتــونەهـــات. ئەمە خۆیەتی، لە دڵی خۆمدا وتم، بە چاك یان بە خراپ ئەمە خۆیەتی. تەنیا ڕێــگای دەرچوونە، ئەگەر لە چارەمان نوسرابێت. ئەگەر ئەمە نەبێت، دەبێت شتێکی تر چاوەڕوانمانبێت. بەڵام کاتێك کە بەناو ماشێنی پڕهۆڕن، شوفێری دەمبەجنێو و پیادەڕەوانی مۆن و غەمباردا گوڕمان بەستبۆوە، زانیم ئەم ژیانە لە چارەی ئێمە نەنوسراوە.

شاور و هۆڕن چواردەوری لێگرتبووم. ئەوە کەشێکی ئاسایی بوو، بەڵام لە مێشکی مندا، هەمووی ڕووی لە ئێمە بوو. عەباکەم زیاتر لە خۆمەوە پێچا و تەنیا چاوی چەپم هێشتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەستمدەکرد، دیارم و جێــگای گومانم.

نزیکەی نیو کاژێر، لەسەر شەقامی سەرەکی بە ڕاستای ماڵی خۆماندا بەرەو کۆتایی باکوور ڕۆیشتین، بەڵام نەك بە نزیکی ماڵی خۆماندا. لەپڕ فۆنزی ستۆپێکی قایمی گرت و پێچیکردەوە بۆ ناو کۆڵانێکی بچوك و وەستا.

*"بیـــا، زود باش!"* "وەرە، خێراکـــە!" فەرمانیدا.

هاتینە خوارەوە، بۆ سەر شۆستەی ڕێــگاکە و هێمای بۆ کردین بۆ کورسی دواوەی ئوتومبیلێکی تر. کاتی ئەوە نەبوو، هیچ پرسیارێك بکەیت. چەند کەسی تر بە دواماندا هاتنە ناو ئوتومبیلەکەوە و کەوتینەوە ڕێ. فۆنزیمان جێهێشت.

یەکسەر کەوتمە ڕوانین لە هاوسەفەرەکانم. من و مەهتاب لە پشتی شوفێری تازەوە دانیشتبووین، کە تەمەنی لە سییەکانیدا بوو. لە تەنیشت شوفێرەکەوە، کوڕێکی نزیك دوانزە ساڵە دانیشتبوو، لە کورسی پێشەوەی سەرپەڕ، پیاوێکی بەتەمەنتر لە شوفێرکە. لەلای ڕاستی ئێمەوە، لەناوەڕاستدا کچێك لە تەمەنی مەهتابدا، قاپوتێکی ئەستوری لەبەردابوو، لە تەنیشتێەوە ژنێك دانیشتبوو. هەموو بە فارسی دەدوان، ئەوەندە بە خێرایی قسەیاندەکرد کە نەمدەتوانی تێیانبگەم. بەڵام لە شێوەی گفتوگۆکەیاندا، بۆیچووم کە هەموو سەر بە یەك خێزانین.

لەپڕ تێگەیشتم، کە ئێمەش ئەندامی هەمان خێزانین. ئەوانە ڕووپۆشی ئێمەن. ئەم خەڵکانە کێن؟ چەند لەبارەی ئێمەوە دەزانن؟ ئایا ئەوانیش هەڵدێن؟

ڕوومان لە ڕۆژئاوا کرد، بە شەقامی پێچاوپێچدا، خۆمان گەیاندە سەر ڕێــگای خێرا، کە لە شار دەچووە دەرەوە. لە قەراغی شار ڕاوەستاین بۆ خاڵی پشکنینی پۆلیس. یەکێکیان لێمانهاتە پێشەوە و لولەی تفەنگەکەی تێکردین و تەماشایەکی ناو ئوتومبیلەکەی کرد. بەڵام تەنیا خێزانێکی ئاسایی ئێرانی حەوت کەسی بینی، کە لە شەودا دەچنە دەرەوەی شار. هێمای بۆ کردین، بڕۆین.

جارێکی تر چووینەوە سەر ڕێـگای خێرا، کە ڕێـگایەکی نوێباوی چەند لاینی بوو، شوفێرەکە پێینا بە بەنزیندا و خێرایی ئوتومبیلەکەی گەیاندە سەد و سی کیلۆمەتر لە کاژێرێکدا. ژنەکەی تەنیشتم هەوڵیدا، بە تێکەڵەیەك لە فارسی و ئینگلیزی، سەری قسەم لەگەڵ دامەزرێنێت. ئاگادارییەکەی ئاماهلم بیرکەوتەوە، کە پێیوتبووم هیچ شتێك بە کەس نەڵێم. بڕیاربوو ئەم ژنە نەزانێت، ئێمە ئەمریکین، بەڵام ڕۆشنبوو دەیزانی. خۆم وا پیشاندا، کە تێناگەم. چەندیش دەمتوانی خۆم دەکرد بە نوستوو، تا دوورکەومەوە لە هەر هەوڵێکی ژنەکە بۆ گفتوگۆ دامەزراندن. مەهتاب تەواو ئارام دانیشتبوو لە باوەشمدا.

لە قسەوباسی ئاماهلەوە دەمزانی، لە تارانەوە بۆ تەبرێز نزیکەی پێنج سەد کیلۆمەترە، پاش ئەوە سەد و پەنجا کیلۆمەترە بۆ سنوور. هاوسەفەرەکانم وردەوردە بێدەنگبوون و ئینجا خەویانلێکەوت. نوستنم بە ئاوات دەخوازی، بەڵام بەلامدا نەدەهات.

بە چاوی چەپم لە ڕێـگاکەم دەنواڕی. هەر خولەکی کاتژمێر دەڕۆیشت و کۆتایی نەبوو. زانیم لەو خێراییەدا بە هەر خولەکێك دوو کیلۆمەتر لە سنوور نزیکدەکەوینەوە.

بەلای تابلۆی ترافیکدا تێدەپەڕین، کە ناوی سەیرسەیری شاری لەسەر نوسرابوون: قەزوین، تاکیستان، زیاباد.

لە نیوەشەودا، لە ناوچەیەکی لادێنشینی نێوان زیاباد و زنجاندا، شوفێرەکەمان خێرایی ئوتومبیلەکەی کەمکردەوە. بینیم دەچێتە ناو پارکی بەنزینخانەیەکەوە و بە ڕێـگایەکی لاتەنیشتدا، چوو بەرەو چاخانەیەك. بانگیانکردم بێمە خوارەوە، بەڵام نەمویست خۆم توشی مەترسی ئاشکرابوون بکەم. دەترسام پۆلیس بەدوامدا کەوتبێتە گەڕان. هێمایەکم بۆ مەهتاب کرد، کە لە باوەشمدا نوستووە، تا تێیانبگەیەنم، کە ئێمە لەناو ئوتومبیلەکەدا دەمێنینەوە.

خێزانەکە چوون بۆ چاخانەکە و دانیشتن، ماوەی دانیشتنەکەیان لە من بوو بە ساڵ. ئوتومبیلێکی زۆر لەو ناوە پارککرابوون. لە شوشەی پەنجەرەی چاخانەکەوە، دیاربوو خەڵکانێکی زۆر وچانیاندەدا و چایان دەخواردەوە. خۆزگەم بە مەهتاب دەخوازی، کە نوستووە، کاتەکەی زۆر بە خێرایی لێدەڕۆیشت. ئەگەر بمتوانیایە، حەزمدەکرد چاو دابخەم، بنوم و لە ئەمریکا بەخەبەربهاتمایەوە!

لە کۆتاییدا، یەکێك لە پیاوەکان گەڕایەوە بۆ لام. "*نەسکافە*،" لە ژێر لێوەوە وتی، کوپێك نەسکافەی پێدام، دیارییەکی سەیر بوو. بەدەگمەمن قاوە دەستدەکەوت لە تاران، کەچی لێرە، لە چاخانەیەکی بچوك لە ناوچەیەکی دووردەستی لادێنشیندا، بووم بە خاوەن کوپێك نەسکافەی گەرم. نەسکافەیەکی خەست و تاڵ بوو، بەڵام لەو باوەڕەدا بووم، هێمای ڕێزێکی زۆری ئەو پیاوە بوو بۆ من. لەژێر لێوەوە، سوپاسمکرد و کەوتمە قوملێدان. مەهتاب جوڵەی لێوە نەدەهات.

زۆری نەبرد، هەموو گەڕانەوە ناو ئوتومبیلەکە و جارێکی تر، گوڕماندایەوە خۆ بەرەو سنوور، بەدوور لە تاران. ڕێــگای دوو لاینەکە تەسکبۆوە بۆ ڕێــگایەکی باریکی دوو ساید، کە مارپێچانە دەچووە ناوچە شاخاوییەکانەوە.

زۆری نەبرد، پروشەی بەفر کەوتەسەر جامی ئوتومبیلەکە، شوفێرەکە فلچەی جامەکە و ناوەکەی داگیرساند. تا دەهات، باوبۆران قورستر و توندتر دەبوو. کە زیاتر هاتینە سەرەوە، ڕێــگا تەواو سەهۆڵی و خلیسك بوو، بەڵام شوفێرەکە لە خێرایی خۆی نەکەوت. ئەگەر شانسمان هەبێت، لەدەست *پاسدار* ڕزگارمان ببێت، بێگومان لەدەست کارەساتی ئەم شوفێرە ڕزگارمان نابێت، لە دڵی خۆمدا وتم. چەند جارێك خزاین، کەچی شوفێرەکە سوکانی لەدەستدەرنەچوو. زۆر لێهاتوو بوو، بەڵام ئەگەر ڕێکەوتایە و لەپڕ ستۆپمیبگرتایە، دەرچوونمان مەحاڵ بوو.

هیلاکی ترسی لەبیربردمەوە. خەو زۆری بۆ هێنام و لەگەڵ هەر تەکانێکی ئوتومبیلەکەدا، سەرم بەرزدەکردەوە.

سەرئەنجام لە ناو سروشتی سەهۆڵبەندانی ناناشنادا، ڕۆژ هەڵهات. شاخ دەوری دابووین، بەفرێکی زۆر باریبوو. لە دوورەوە لوتکەی شاخەکان زیاتر لە ئاسمان توندبووبوون، کە زۆر ترسناك دیاربوون. هێشتا هەر بەسەر ڕێــگای سەهۆڵییەوە بووین.

ژنەکە کە بینی لە خەو هەستاوم، دووبارە ویستی سەری باسم لەگەڵ بکاتەوە. شتێکی وت، سەبارەت بەوەی کە دەیەوێت بێت بۆ ئەمریکا. "ئێران زۆر خراپە،" لەژێر لێوەوە وتی، "ناتوانین ڤیزە وەرگرین."

مەهتاب سەیرێکیکردم، خۆی کێشایەوە و باوێشکیدا. "خۆت وا پیشانبدە، کە هیچ تێناگەیت،" چرپاندم بە گوێیدا. "وەریمــەگێڕە." سەری بۆ لەقاندم.

نزیکی تەبرێز بووینەوە و شوفێرەکە لە خێرایی کەمکردەوە، کاتێك نزیکی خاڵی پشکنین بووینەوە. دڵم خەریکبوو ڕاوەستێت، کاتێك کۆمەڵێك سەربازم لە پێش خۆمانەوە بینی، هەڕەمەکی هەندێك ئوتومبیلیان ڕادەگرت و بە هەندێکی تریان دەوت بڕۆ. ئوتومبیلەکەی ئێمە بەر هەڕەمەکییەکە کەوت. ئەفسەرێکی پاسداری گەنجی ناشیرین، لە پەنجەری ئوتومبیلەکەوە سەری هێنایە ژوورەوە و کەوتە قسە لەگەڵ شوفێرەکەمان. هەناسەم لە خۆم بڕی، چونکە من و مەهتاب بێجگە لە پاسپۆرتی ئەمریکی، هیچی ترمان پێنەبوو. ئایا ناومان کەوتۆتە لیستەوە و بە دوامانــدا دەگەڕێن؟ پاسدارەکە بەکورتی لەگەڵ شوفێرەکە ڕانییەوە و پاشان هێمای بۆ کردین بڕۆین، بەبێ ئەوەی داوای هیچ شتێك بکات. هاوسەفەرەکانم هەموو ئاهێکیان کێشا.

چووینە ناو تەبرێزەوە. شارێك بوو بچوکتر لە تاران، پاکتر و تازەتر. لەوانەیە بەو هۆیە بووبێت، کە تازە بەفر باریبوو یان لەوانەیە ئەوە بووبێت، کە لەم شارەدا هەستم بە ئازادییەکی زۆرتر دەکرد. تەبرێز یەکێك بوو لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی کۆماری ئیسلامی ئێران، بەڵام لە چەقی هەڵسوڕانی شۆڕشگێڕانە خرابوو. پاسدار و یەکە

سەربازییەکان بە هەموو لایەکدا گەشتیانلێدەدا، بەڵام خێرا ئەو هەستەم لا دروستبوو، کە خەڵکی تەبریز زیاتر سەربەخۆی خۆیانن، وەك لە تارانییەکان. وەکو تاران بەڵام لە پێوانەیەکی بچوکتردا، تەبریز تێکەڵەیەکی نەگونجاو بوو، لە بینایاتی بەرزی نوێباو، لەپاڵ خانووی بچوکی کۆنی داڕوخاو. ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا تێکەڵبووبوون، هێشتا ڕۆشننەبوو، چ شێوازێکی ژیان دەستبالایە.

شوفێرەکە چووە ناو شەقامە لاوەکییەکانەوە و لەپڕ وەستا. بە چەند ڕستەی کورت، ژنەکە فەرمانیدا بە کوڕە بچوکەکە، لە ئوتومبیلەکە بچێتە خوارەوە. لە گفتوگۆکەیان بە فارسی ئەوەندە تێگەیشتم، کە کوڕەکە دەچێت بۆ سەردانی پوری. ئامۆژگارییانکرد، کە قسەنەکات لەبارەی ئێمەوە یان ئێمە خەریکی چین. کوڕەکە چووە ناو کۆڵانێکی بچوکەوە و پاش چەند خولەك گەڕایەوە. پورەکەی لە ماڵەوە نەبوو، کوڕەکە وتی. ژنەکە لە ئوتومبیلەکە دابەزی و پەلی کوڕەکەی گرت و ڕۆیشتن. نەمزانی، بۆ ئەمە نیگەرانیکردم. دوای تێگەیشتم، کە هەرچەند ژنەکە ناناشنابوو بۆم، بەڵام بەبوونی لەناو ئوتومبیلەکەدا هەستم بە ئارامی دەکرد. لەگەڵ ئەوەی پیاوەکان میهرەبان بوون، بەڵام نەمدەویست تەنیابم لەگەڵیان. دەمویست ژنێکم لەگەڵ بێت.

تا دەهات مەهتاب بێئارامی زیاتر دەبوو. "هەستناکەم باش بم،" گلەییکرد. دەستم لە ناوچەوانی دا، تای هەبوو. وتی، دڵم تێکەڵدێت. خۆم خزاند بۆ ئەو سەری کورسییەکە و لە کاتی خۆیدا دەرگاکەم کردەوە، مەهتاب ئوشتایەوە و دەستیکرد بە ڕشانەوە بۆ سەر شەقامەکە. هەستی بە گرژیش دەکرد. بە نیگەرانییەوە چاوەڕوانماندەکرد، پێش ئەوەی ژنەکە بەتەنیا بگەڕێتەوە.

پورەکە لە ماڵەوە بوو، ژنەکە وتی، بەڵام گوێی لە دەنگی دەرگای کوڕەکە نەبووە. ناهێکم تێگەڕا، کە ژنەکە هاتە ناو ئوتومبیلەکەوە. دیسانەوە کەوتینەوەڕێ.

هەر یەك یان دوو خولەکی برد، چووینە چەقی دووڕیانێکی قەرەباڵغەوە. لەوەدەچوو مەیدانی شار بێت. شوفێرەکەمان دروست لە بەردەمی پۆلیسێکی ترافیکدا ڕاوەستا.

"*زوبباش! زوبباش!*" "خێراکە! خێراکە!" ژنەکە وتی، کاتێك کە پیاوێك لەسەر شۆستەکە، دەرگای ئوتومبیلێکی کردەوە و هێمای بۆ کردین، بچینە ناوی. چووینە ناو ئوتومبیلەکەوە، کە دروست لە پشتمانەوە ڕاوەستابوو، لە کاتێکدا پۆلیسی ترافیکەکە، خەریکی دەمەقاڵی خۆی بوو لەگەڵ شوفێری یەکەماندا، هاواریلێدەکرد، کە بۆی نییە لێرانەدا ڕاوەستێت. ئەگەر ئەمە بەپێی پلانێك بووبێت، ئەوا شانۆگەرییەك بوو لە لوتکەدا. پێش ئەوەی هیچ کەسێك بزانێت، چی لە ئارادایە، من و مەهتاب لە ئوتومبیلی دووەمدا جێگیربووین. مێردەکە، ژنەکە و کچەکە لە پاش ئێمەوە سواربوون و کەوتینەوەڕێ، شوفێرەکەی پێشوومان جێهێشت، حەنەحەپەشی خۆی بکات لەگەڵ پۆلیسەکەدا. وە ئەوە لە ئێراندا شتێکی ئاسایی بوو.

ژنەکە هێمایەکی بۆ شوفێرە تازەکە کرد، کە پیاوێکی بەساڵاچووبوو لە تەمەنی شەستەکانیدا. "لەگەڵ ئەو پیاوە مەدوێ،" بەچرپە وتی. "با نەزانێت، ئێوە ئەمریکین."

شوفێرەکە میهرەبان دیار بوو، بەڵام لەوەدەچوو، ئاگاداری ئەوە نەبێت، کە داشی دامەیەکە لە درامایەکی نێودەوڵەتیدا. لەوانەیە هەر ئەوەندەی پێوترابێت، کە ئاسایی ئێمە لە خاڵی ئەلفەوە بگەیەنێتە خاڵی با. لەوانەیە خۆشی نەیەوێت، لەوە زیاتر بزانێت.

بەناو تەبریزدا ڕۆیشتین بۆ شارێکی تر. شوفێرەکە بەناو شەقامەکاندا ئێمەی برد، لەوە دەچوو هەر لە بازنەیەکدا بخولێینەوە. هەرچی دەوروپشتمان بوو، کاریگەری جەنگی پێوە دیار بوو. دەمانبینی، تەواوی گەڕەکێك بە بۆم وێرانکراوە. تەواوی دیوارەکان بە فیشەك بێژنگ ئاژنکراوە. گەشتی سەربازان لە هەموو شوێنێکدا دەبینران. پاش ماوەیەك، لاماندایە شەقامێکی لاوەکی و لە پشت پیکاپێکی شینەوە وەستاین، کە دوو پیاوی تیادا بوو. پیاوێکیان لە کورسی ڕێبواردا، هاتە خوارەوە و بەرەو ئوتومبیلەکەی ئێمە هات و کەوتە قسە لەگەڵ شوفێرەکەمان بە زمانێکی جیاواز، کە وای بۆچووم زمانی تورکی بێت. پیاوەکە گەڕایەوە ناو پیکاپەکە و خێرا ڕۆیشتن. ئوتومبیلەکەمان دوایکەوت، بەڵام ئەوەندەی نەبرد، لە ترافیکدا لێمانونبوو. بۆ ماوەیەك بەناو شاردا خولمانخوارد. بۆم پرسیاربوو، بۆ ئەوەندە زۆرمان پێدەچێت؟ بـــا خێرا دەرچین. ڕۆژی شەممە بوو، ئەو ڕۆژە بڕیاربوو، من و پارێزەرەکەم بچین بۆ لای مودی. دەبێت چەند چاوەڕوانمانــبکات، تا تێدەگات، کڵاومان ناوەتە سەری؟ کــەی تووڕەیی بەو ئاستە دەگات، تا پۆلیسمان لێئاگاداربکاتەوە؟ ئــایا ئێستا کردوویەتی؟ نەمدەتوانی بزانم.

بیرم لە ئاماهل دەکردەوە. لەسەر داوای.خۆی، هێشتا نەمتوانیبوو تەلەفۆنی بۆ بکەم. دەبێت ئێستا نیگەرانبووبێت.

ئەی جۆی و جۆن چی، ئەی دایك و باوکم چی لەو دوورەوە، لە مەشیگان؟ ئایا مودی تەلەفۆنیان بۆ دەکات؟ ئایا ئەوان تەلەفۆندەکەن، بۆئەوەی هەواڵی باوکمم پێبگەیەنن؟ مودی دەبێت چیان پێبڵێت؟ سەرەڕای باوکم، ئایا لەپڕ نیگەرانی ژیانی من و مەهتاب، بڕستیان لێدەبڕێت؟ ئایا لە ماوەیەکی نزیکدا، سێ پرسەیان بەسەر یەکەوە دەبێت؟

خێــــراکە با دەرچین! دەمویست پڕبەدەنگ هاواربـــکەم.

سەرئەنجام، لە شار دەرچووین و ڕێــگای خێرامان گرت بەرەو ڕۆژئاوا. چەندەها کاژێر بە بێدەنگی تێپەڕی، تەنیا جارێك نەبێت. *"ئـــاکز!"* شوفێرەکە دەنگی لێوەهات. ئاوڕێکیدایەوە و تەماشایەکی مەهتاب کرد. *"ئـــاکز!"* "وامەکە!"

"ئەوە تۆ شەق لە کورسییەکەی هەڵدەدەیت،" بە مەهتابم وت. قاچیم ڕاکێشا و خستمە ژێر خۆیەوە.

هەر بەردەوامبووین. لە دوانیوەڕۆدا، لاماندایە خانوویەکی بەتاڵی قەراغ ڕێــگا. پیکاپێك لە دوامانەوە گەیشتە سەرمان - هەمان پیکاپ بوو، کە لەناو شار بینیبوومان. دەبێت بەدوامانەوە بووبێت. بە من و مەهتابیان وت، دابەزین و سواری پیکاپەکە ببین.

هەرکە ئەوەمان کرد، ئوتومبیلەکە دەرچوو، ئێمەیان بەتەنیا جێهێشت لەگەڵ شوفێرێکی تازە و پیاوێکی ناناشنا.

شوفێرەکە زیاتر لە هیندی ئەمریکی دەچوو تا ئێرانی. قژە ڕەشە خەڵوزییەکەی، بە شێوەیەکی ڕێکوپێك چاککرابوو، ڕوومەتێکی ئێسقانی بەرزی پێوەبوو، کە بە دەموچاوییەوە زۆر دیاربوو. مۆن تەماشاکردنی دەیترساندم.

پیاوەکەی تر باڵابەرز و باریکەڵە بوو، لە نێوان من و شوفێرەکەدا دانیشتبوو، لەوەدەچوو زیاتر دۆستانە بێت. بە جۆرێك هەڵسوکەوتیدەکرد، وەك ئەوەی بەرپرس بێت. کاتێك پیکاپەکە لە ماڵە چۆڵەکە گەڕایە دواوە بۆ سەر ڕێـگاکە، زەردەخەنەیەکی کرد و بە فارسی وتی، "من ناوم موحسینە." تەنیا بۆ دووری چەند سەد مەترێك بەردەوامبووین، پاشان لاماندایە سەر لاڕێیەك بەرەو دێیەکی بچوك، کە کۆمەڵێك خانووچکەی پرشوبڵاو بوو. لەگەڵ ئەوەی هەوا زۆر سارد بوو، منداڵانی پێپەتی و جلوبەرگ شڕ بەناوەدا رایاندەکرد. لەبەردەمی ماڵێکدا وەستاین و شوفێرەکە ڕۆیشتەخوارەوە بەرەو دیواری بلۆکی ماڵەکە و خۆی بەرزکردەوە، تا بتوانێت تەماشابکات. ڕێـگا کراوە بوو، هێمای بۆ ئێمە کرد بێین. موحسین خۆی خزاندە پشتی سوکانەوە و بە هێواشی لێخوڕی بۆ پێشەوە. کە دەرگا ئاسنەکە کرایەوە، بە پیکاپەکەوە چووینە ژوورەوە. یەکسەر لە پاش ئێمەوە دەرگاکە داخرا و کلیلدرا.

"*زوبباش! زوبباش!*" موحسین وت.

من و مەهتاب هاتینە خوارەوە بۆ ناو حەوشەیەکی قوڕاوی، کە پڕیبوو لە مریشك و مەڕ. دوای موحسین کەوتین بۆ ژوورەوە، بۆ ناو بینایەکی کۆنکرێتی تەویلەئاسا، لە ناوەڕاستی حەوشەکەدا. هەندێك لە ئاژەڵەکان دوامانکەوتن بۆ ژوورەوە. دیواری کۆنکرێتی ژوورەکە، پیشاندەری ساردییەکی زیاتری ناو ماڵەکە بوو، بەدەر لە ویستی خۆمان، کەوتینە لەرزین. هەڵمی هەناسەی خۆمم دەبینی، کاتێك بەچرپە کەوتمە قسە لەگەڵ مەهتاب. "مەهتاب دەبێت، خۆت شەرمن بنوێنیت. هیچ قسەیەك وەرمەگێڕە، تا خۆم پێتدەڵێم. خۆت وا پیشانمەدە کە تێدەگەیت. خۆت وا دەرخە، کە هیلاکی و دەتەوێت بخەویت. نابێت ئەم خەڵکە، هیچ شتێك لەبارەی ئێمەوە بزانن."

باوەشمکرد بە مەهتابدا، تا هەر دووکمان گەرمانبێتەوە. کەوتمە تەماشاکردنی ناو ژوورەکە، پارچە قوماشی درێژی ڕەنگی لەملا و ئەولا داخرابوون، وەك بەرگە دۆشك دوورابوون، بەڵام دۆشەکی تیادا نەبوو. لە سوچێکدا بەتانی هەڵدرابۆوە. پیاوەکان تەباخێکی نەوتیان هێنایە ژوورەوە، دایانگیرسان و پارچە قوماشەکانیان بە دەوریدا داخست و هێمایان بۆ ئێمە کرد، دانیشین. کاتێك کاریاندەکرد، یەکێکیان خەریکی تەباخەکە بوو، تۆزێك نەوتی لێرژایە سەر قوماشەکە. نیگەرانی ئەوە بووم، ئەوەکو گڕبگرێت.

چەند توانیمان، نزیکی تەباخەکە دانیشتین و بەتانییە ساردە شێدارەکانمان دا بە خۆماندا. گەرمای تەباخەکە، لەچاو ساردی ژوورەکەدا هیچ نەبوو. بۆنی گازی تەباخەکە ژوورەکەی پڕکرد. بۆم ڕۆشننەبوو، بەتانییەکان سەرمامان پێدەگەیەنێت یان گەرما.

چاوەڕوانبووین، بزانین چی تر ڕوودەدا.

"دوایی دێمەوە بۆ لاتان،" موحسین بەڵێنیدا. پاشان لەگەڵ پیاوەکەی تر ڕۆیشتن.

زۆری نەبرد، ژنێك هاتە ژوورەوە، جلوبەرگی کوردی پۆشیبوو، تەواو جیاوازبوو لەو جلوبەرگە بێڕەنگانەی ژنانی تاران. چین لەسەر چین کراسی ڕەنگاوڕەنگی درێژ تا سەر زەوییەکەی لەبەرکردبوو، ناوقەدی قایم بەستبوو تا سمتی بە تەواوەتی دەرکەوێت. منداڵێکی تەمەن نزیك یەکساڵەی لە کۆڵکردبوو، سەرێکی گەورە و دەموچاوێکی پانی وەك شوفێرە مۆنەکەمانی پێوە بوو، کە وای بۆی چووم، کوڕی بێت.

ژنەکە لە جوڵە نەدەکەوت، خەریکی کاری جۆراوجۆر بوو. دانیشت و بۆ چەند خولەکێك کەوتە سەوزی پاککردن و پاشان چووە دەرەوە. لە دەرگای کراوەی ژوورەکەوە تەماشامکرد، بە سەتڵی ناوەوە کەوتە ناوپژێنی تەواوی حەوشەکە. ئینجا گەڕایەوە و کەوتە کۆکردنەوەی کلیم و بەتانی ناوو ژوورەکە و قەدکردنیان و لەسەر یەك هەڵچنینیان لە سوچێکدا، پاشان دەستیکرد بە گسکدانی زەوییە ڕووتەکە، بە گسکێك کە خۆی دروستیکردبوو، لە بابۆڵێك پووشی وشکی پێکەوە بەستراو بە پەتێك. کاتێك خەریکی کار بوو، کۆمەڵێك مریشك خۆیان کرد بە ژوورەکەدا، ژنەکە بە گسکەکەی کشەیلێکردن بۆ دەرەوە، پاشان بەردەوامبووەوە لەسەر کاری خۆی.

چاوەڕوانی چی دەکەین؟ بۆم پرسیاربوو. ئایا بەڕاستی موحسین و پیاوەکە دەگەڕێنەوە بۆ لامان؟ ئەم ژنە چی دەزانێت لەبارەی ئێمەوە؟ چۆن بیرمان لێدەکاتەوە؟ هیچ کاردانەوەیەکی نەبوو، خەریکی کاری خۆی بوو، وەك ئەوەی ئێمە لە ژوورەکەدا نەبین.

بۆ ماوەیەکی کورت، ئێمەی جێهێشت و پاشان بە نان، پەنیر و چاوە گەڕایەوە. لەگەڵ ئەوەی برسیمان بوو، بەڵام پەنیرەکە ئەوەندە بۆنی ناخۆش بوو، نە من و نە مەهتاب نەمانتوانی دەمی بۆ بەرین. کەوتینە قومڵێدانی چاکە و چەند توانیمان نانی ڕەقمان خوارد.

ئێوارە داهات، بێجوڵەیی و بێدەنگییەکی نائومێدانەی لەگەڵ خۆی هێنا. چەند بەدەست ترسەوە دەلەرزین، ئەوەندەش بەدەست سەرماوە. دەمانزانی، هەلومەرجەکەمان زۆر لەقە، لە شوێنێکی نادیاری قەراخ شارستانیدا گیرساوینەتەوە، کە ژیان تیایدا لە باشترین هەلومەرجیدا سەرەتاییە. ئەگەر ئەم خەڵکە شتێکیان بە خەیاڵدا بهاتایە و بە هەر شێوەیەك بکەوتنایەتە دەستدرێژیمان، ئێمە تەواو دەستمان بەسترابوو. لە ژێر بەزەیی ئەواندا بووین.

چەند کاژێر چاوەڕوانبووین، تا موحسین گەڕایەوە. بە بینینی ناهێکم تێگەڕا. شتێك لە هەڵسوکەوتیدا بوو، کە مایەی نارامی بوو. تێگەیشتم، کە ئەمە یاردەیەکی سروشتییە، لەو پەڕی بێدەسەڵاتیمدا هۆگری یەکێك بم، کە چاوەڕوانی ئەوەی لێبکەم، پارێزگاریمان بکات. مایەی ترس و غەمباری بوو، ناماهلمان جێهێشت. لەسەرەتاوە سڵەمیمەوە لە ژنی ناو ئوتومبیلەکە، پاشان وای لێهات متمانەی پێبکەم. ئینجا سەرەی موحسین هاتبوو. ژیانم ژیانی من و مەهتاب - کەوتبووە دەستییەوە. دەمویست لەگەڵ ئەو، هەست بە نارامی بکەم. هەر دەبوو بە بوونی ئەو، هەست بە نارامی بکەم.

"جانتاکانتان چی تیادایە؟" پرسیاریکرد.

منیش چی لەناو جانتاکاندا بوو - دەفتەری وێنەکێشانەکانی مەهتاب، چەند پارچە جلی زیادە، خشل و ئاڵتون، پارە و ئەو پارە ئاسنانەی کە ناماهل پێیدابووم - هەڵمڕشتە سەر زەوییە ساردەکە.

*"بدە بە مەن"* موحسین وتی. "بییەرە دەستم."

ئایا دەکرێت دزیش بێت؟ بۆم جێگای پرسیاربوو. هەر لەوێدا ڕووتماندەکاتەوە؟ ئەگەری قسەوباس نەبوو. بەڵام هەرچی چونێك بوو، توانیم تێیبگەیەنم کە "بۆ ماوەیەك" کاتژمێردەکەمم دەوێت. باقی شتەکانی ترم، بێدەنگ خستە بەر دەستی.

موحسین لەیەکتری جیاکردنەوە و کردی بە دوو کۆمەڵ. "سبەینێ،" بە فارسی وتی، "چەندت بۆ دەکرێت، جلوبەرگ لەبەربکە. باقییەکەی جێبهێڵە." پەنجەی هێنا بە دوو ملوانەکە و بازنە زیوەکانمدا، پاشان خستینیە ناو گیرفانییەوە.

بۆ دڵخۆشکردنی، میکیاجەکەمم دەرهێنا و ئەویشم دایە دەستی. "ئەمە بدە بە ژنەکەت،" وتم. ئایا ژنی هەبوو؟

کۆمەڵێکیان پارە، پاسپۆرتەکانمان و ملوانەکە ئاڵتونییەکەم بوو. "ئیمشەو با ئەمانەت لەلا بێت،" موحسین وتی. "بەڵام سبەینێ، پێشئەوەی بکەوینەڕێ، دەبێت بیدەیتەوە دەستم."

" بەڵێ باشە،" یەکسەر ڕازیبووم.

تەماشای کتێبەکانی قوتابخانەی مەهتابی کرد، کە لەگەڵ خۆی هێنابوونی، بە فارسی نوسرابوون. کاتێك خستییە گیرفانی ناو پاڵتۆکەیەوە، مەهتاب چاوی پڕبوو لە فرمێسك. "ئەوانەم دەوێت،" وتی.

"بۆت دەگەڕێنمەوە،" موحسین وتی. ئەم پیاوە ساتبەسات سەیرتر دەبوو. هەڵسوکەوتی دڵسۆزانە بوو، بەڵام قسەکردن و جوڵانەوەی هیچ بوارێکی بۆ ئێمە نەدەهێشتەوە. بە هەستێکی باوکایەتییەوە زەردەخەنەی بۆ دەکردین. "سبەینێ دێمەوە بۆ لاتان،" وتی. پاشان بەو شەوە تاریك و ساردە ڕۆیشت.

ژنەکە گەڕایەوە و یەکسەر کەوتە ئامادەکردنی ئێمە بۆ نوستن. ئەو باتانییانەی کە لە سوچێکی ژوورەکەدا قەدیکرابوون، بوون بە دۆشەکی نوستن بۆ ئێمە، ژنەکە خۆی و مێردە مۆنەکەی لەگەڵ منداڵەکەیان.

شەو درەنگ بوو، من و مەهتاب لەسەر باتانییەك، چەند توانیمان نزیکی تەباخەکە، پاڵکەوتین و باوەشمانکرد بە یەکتریدا تا گەرمانبێتەوە. لە کۆتاییدا مەهتاب خەویلێکەوت، خەونێکی بێئارام.

هیلاك و ماندوو، لەرزی سەرما و برسێتی، بە دنیایەك نیگەرانییەوە توند کچەکەمم لە باوەشگرت. ترسی ئەوەم بوو، تەباخەکە گڕبگرێت و بەتانییەکەمان بسووتێنێت. نیگەرانی ئەوەی، مودی بە جۆرێك ئێمەی دۆزیبێتەوە و دوامانکەوتبێت. لە پۆلیس، سەرباز و پاسدار زارەترەکی بووبووم. غەمی سبەینێ و پەڕینەوەی سنوور، لە کەللەی دابووم. چۆن دەپەڕینەوە؟ ئایا لە ئەمبولانسی خاچی سووردا، خۆمان نەخۆش پیشانەدەین یان برینـدار؟

پەرێشانی باوکم بووم. دایــکم. جۆی و جــۆن.

هەرچی چۆنێك بوو، نیگەرانی برستی لێبڕیم و منی خستە باوێشکدان و نیوە لە هۆشخۆچوون، بەڵام تا بەیانی زووزوو دەهاتمەوە هۆشخۆ.

بەیانی زۆر زوو ژنەکە لە خەو هەڵسا و چا، نان و پەنیری بۆن ناخۆشی نەخوراوی زۆرتری بۆ هێناین. کاتێك خەریکی نان قرتاندن و قومڵێدانی چا بووین، ژنەکە بە شتێکی سەرسامکەردوە گەڕایەوە - لە سینییەکدا گوڵەبەڕۆژی بۆ هێناین. مەهتاب بە بینینی گەشایەوە. ئەوەندەی برسی بوو، دڵنیابووم هەمووی دەخوات. بەڵام بە وردییەوە لەسەر سینییەکە، کردی بە دوو بەشەوە.

"مــــامی، ئیمڕۆ نابێت هەموو بخۆین،" وتی. "دەبێت بەشێکی بپارێزین." هێمای بۆ بەشە بچوکەکەیان کرد. "مامی، ئێمڕۆ ئەمەیان دەخۆین و ئەوی تریان بۆ سبەینێ هەڵدەگرین."

سەرمسوڕما لە پلانی بەشبەشکردنی گوڵەبەڕۆژە. ئەویش پەرۆشی چارەنوسی نادیارمان بوو.

ژنەکە بە تەباخی بچوکی کۆنباو و حەوشەوە، خۆی سەرگەرمی کار کرد. مریشکێکی بۆ کوڵاندن خستە سەر ئاگر، بێگومان هەر خۆی، یەکێك لە مریشکەکانی حەوشەی سەربڕیبوو و پاکیکردبوو. برسییەتی هەراسانی کردبووین.

کاتێك مریشکەکە کوڵاو و بۆنە خۆشەکەی بەناو ژوورەکەدا بڵاوبۆوە، ژنەکە بە سەوزییەوە گەڕایەوە. بەهیوای ژەمێك نانخواردنی گەرم، لەگەڵ ژنەکە دانشتم و کەوتمە سەوزی پاککردن.

مریشك ئامادەبوو، قاپ لەسەر زەوییەکە دانرا بۆ نانخواردن، کاتێك کە موحسین خۆی کرد بە ژووردا.

*"زوبباش! زوبباش!"* هاواریـلێکردین.

ژنەکە هەستا و ڕایکردە دەرەوە و لە ساتێکدا، بە باوەشێك جلوبەرگەوە گەڕایەوە. نیشتە سەرم، بە جلوبەرگی کوردی کەوتە گۆڕینی من. چوار پارچە جل بوو، یەکەمیان کراسێکی درێژ تا قاچ و فەقیانەدار بوو، کە بە مەچەکەوە دەبەستران، دووانی درێژی ترم بەسەردا لەبەرکرد. ئەوەی بەسەر هەموویانەوە لەبەردەکرا، جلێکی قورسی نەرم بوو، بە پارچە قوماشی پرتەقاڵی، شین و پەمەیی دوورابوو. پاش لەبەرکردنی دواجل، پشتێنێکی بە دەوری کەمەرمدا گرێـدا.

پاشان بە قوماشێکی درێژ، سەری بە تەواوەتی بۆ بەستم و کۆتایی قوماشەکە بە لایەکی سەرمدا هاتە خوارەوە. بووم بە ژنێکی کورد.

مەهتاب هەر بە مانتۆکەی خۆیەوە مایەوە.

موحسین پێیوتم، کە لە بەشێك لە ڕێـگاکەدا سواری ئەسپ دەبم.

"پانتۆڵم لە پێدا نییە،" موحسینم ئاگادارکردەوە.

بۆ ماوەیەکی کورت ڕۆیشت و بە پانتۆڵێکی باریکی پیاوانەوە گەڕایەوە. لە قاچم کرد و هەوڵمدا لەژێر کراسەکانەوە هەڵیکێشم بۆ سەرەوە، بەناستەم سمتمی تیادا جێگادەبۆوە، ئیتر زنجیرداخستن مەحاڵ بوو، بەڵام دەمزانی کەڵکی دەبێت بۆم. پاشان موحسین دوو جووت گۆرەوی ئەستوری خوری دا بە من و مەهتاب. گۆرەویمان لەبەرکرد و ئینجا جزمەکانمان.

ئیتر ئامادەی ڕۆیشتن بووین.

موحسین داوای پاسپۆرتەکان، پارە، ملوانەکە ئاڵتونییەکەمی کرد - هەموو ئەو شتانەی کە بە دەردی دەخوارد، بێجگە لە کاتژمێرەکەم. ئیتر کاتی ئەوەمان نەبوو، خۆمان نیگەرانی شتی پڕوپوچ بکەین، لەبەرامبەر ئەوەی ژیانمان بەرەو ڕووی چ هەلومەرجێك دەبێتەوە.

*"زوبباش! زوبباش!"* موحسین دووبارەیکردەوە.

دوای موحسین کەوتین بۆ دەرەوە. ژەمە خواردنەکەمان بێدەستکاری هەروا جێهێشت و سواری پیکاپە شینەکە بووینەوە، هەر وەکو جاری پێشوو، پیاوەکەی تر پیکاپەکەی لێدەخوری. لە حەوشەکە گەڕایە دواوە و دێکەمان جێهێشت و کەوتینەوە سەر هەمان لاڕێ، کە پیدا هاتبووین و پاشان بۆ سەر ڕێـگاکە. "نیگەران مەبە، نیگەران مەبە،" موحسین دووبارەیکردەوە. چەند توانی بە زمانی فارسی پلانەکەی بۆ باسکردم، جاروبار دەستەواژەی کوردی یان ترکی دەکەوتە قسەکانییەوە. وتی، ماوەیەك بەم پیکاپە دەڕۆین، پاشان دەیگۆڕین بە پیکاپێکی تر و لە کۆتاییدا سواری ئوتومبیلێکی سوور دەبین.

وردەکاری پلانەکە ڕۆشن نەبوو. هیواداربووم، زۆر لەوە ڕێکوپێکتر بێت، وەك لەوەی موحسین بتوانێت باسیبکات.

هێشتا له موحسین دڵم ناوی نەدەخواردەوە. هەڵسوکەوتی باش نەدەهاته بەرچاو. گەوهەر و پاردەکەمی لەلا بوو. پاسپۆرتەکانم بۆ گرنگ نەبوو، بەبێ ڤیزە بەکەڵك نەدەهاتن. ئەگەر خۆمان بگەیانایەته باڵویزخانەی یو.ئێن. له ئەنکارا، دەمزانی یەکسەر پاسپۆرتی تازەمان بۆ دەردەهێنن. بەڵام لەبارەی پاردەکەمەوه چی؟ گەوهەرەکەم؟ نیگەرانی نرخی ئەوانه نەبووم، مەبەستی موحسین پەرێشانیکردبووم.

له سەرێکی ترەوه، دڵسۆز و پەرۆشی کاردەکەی بوو. هەر وەکو پێشوو، بەهۆی ئـــەوەوە، کارێکم له دەستدەهات، تەنیا هیوای دەرچوونم بوو، حەزێکی بەهێز له ناخمدا بوو، که وەك چاوساغ و پارێزەری خۆم چاویلێبکەم. ئایا تا کۆتایی سەفەرەکه، لەگەڵمان دەمێنێتەوە؟

"هەرگیز لەگەڵ هیچ کەسێك سنوورم نەبڕیوە،" به فارسی وتی. "بەڵام تۆ خوشکی منی. لەگەڵت دێـــم، له سنوور دەتـــپەڕێنمەوە."

لەپڕ هەستم به باشییەکی سەیر کرد.

پاش ماوەیەك ڕۆیشتن، ماشێنێکی بارهەڵگر بەرەو ڕوومان هات. هەر دوو شوفێرەکە، که گەیشتن یه یەکتری، ستۆپێکی لەپڕیان گرت.

موحسین وتی، *"زودباشرا"*

من و مەهتاب چووینه خوارەوە، ناوڕمدایەوە بۆ موحسین، بێت لەگەڵماندا.

"ئەمانه بده بەو پیاوە، که لەناو ماشێنەکەدایە،" فەرمانییپێدام و پاسپۆرتەکانی دایه دەستم. پاشان شوفێره مۆنەکه پێی نا به بەنزیندا و به موحسینەوه بۆی دەرچوو. پیکاپه شینەکه ڕۆی، موحسینیشی تیادا بوو.

هەرئاوا، خۆ نەهات لەگەڵمان، له دڵی خۆمدا وتم. هەرگیز چاومان پێیناکەوێتەوە. ماشێنەکەی تر پێچیکردەوه و له بەردەمماندا وەستا، ئێمەش خێرا سواربووین. ساتێکی نەبرد، شوفێرەکه به ڕێـگای پێچاوپێچدا بەسەر شاخەدا سەرکەوت.

ئەم ماشێنه بارهەڵگره له جۆرێك جێب دەچوو، سەرەکەی کراوه بوو. دوو پیاو لەگەڵماندا دانیشتبوون، پاسپۆرتەکانم دایه دەست ئەوەی ناوەڕاستیان. به جۆرێك سڵەمینەوه وەریگرت، وەك ئەوەی ئاگر بێت. هیچ کەسێك نایەوێت به پاسپۆرتی ئەمریکییەوه بگیرێت.

ماوەیەکی زۆری نەبرد، ماشێنەکەیان وەستاند و هێمایان بۆ کردین، بچینه دواوه دانیشین، سەرەکەی کراوه بوو، با تەواو دەیگرتەوە. نەمتوانی پێشبینیبکەم، بۆ دەبێت بچینه دواوە، بەڵام به قسەمکردن.

خێرا یەکسەر کەوتینەوه ڕێ به خێراییەکی شێتانە.

شەوی ڕابوردوو له خانووه تەویلەئاساکەدا، لەو باوەڕەدا بووم، که هەرگیز توشی سەرمای وا نابمەوە. بەڵام وا دەرنەچوو. من و مەهتاب له پشتی ماشێنەکەدا، باوەشمان به یەکتریدا کرد، بای سارد وەك چەقۆ له گیانمان دەچەقی، بەڵام مەهتاب ورتەی لێوه نەهات.

به ڕێـگا پێچاوپێچەکەدا هەر بەردەوام سەردەکەوتین.

تاکەی دەتوانین بەرگەبگرین؟ بۆم پرسیاربوو.

پاشان لە ڕێـگاکە لاماندا بۆ سەر زەوییەکی بەردەڵانی، کە لەوەدەچوو ئەمە هەر ڕێـگا نەبێت. پاش چەند کیلۆمەترێك ڕاوەستا و داوایان لێکردین، بگەڕێینەوە پێشەوە.

بەردەوامبووین، ئەو ماشێنە چوارویلییە بە ناو زەوییەکەدا بەزۆر ڕێـگایدەکرد. جاروبار بەلای خانووی بچوك و ڕانە مەڕی لەڕدا تێدەپەڕین.

لەپڕ پیاوەکەی تەنیشتم هێمایەکی کرد بۆ لوتکەی شاخێك. سەرم هەڵبڕی و لە دوورەوە، لادیمەنی پیاوێکی تەنیام بینی بە لوتکەکەوە، تفەنگێکی بەسەر شانەوە بوو - جێـگای دیدەوانی بوو. پیاوەکە سەری بادا و لە ژێر لێوەوە شتێکی وت. لەسەر ڕۆیشتنی خۆمان بەردەوامبووین و پیاوەکە چەند شوێنی دیدەوانی تری بەسەر شاخەکانەوە پیشاندام.

لەپڕ تەقەیەکی قایمی تفەنگ، بێدەنگی ئەو دەشت و دەرە ڕووتەنییەی شکاند. تەقەی دووەم یەکسەر بە دوایدا هات، لەناو شاخەکاندا دەنگیدایەوە.

شوفێرەکە خێرا ماشێنەکەی وەستاند. هەر دوو پیاوەکە لە ترساندا ڕەنگیان زەردبوو، ئەمە منی زۆر ترساند. مەهتاب هەوڵیدا، لە باوەشمدا خۆی بشارێتەوە. بە گرژییەکی زۆرەوە چاوەڕوانبووین، بەبێ ئەوەی ورتە لە دەمان بێتەدەرەوە، کاتێك کە سەربازێکی تفەنگبەدەست بە ڕاکردن بەرەو ڕوومان دەهات. جلی خاکی سەربازی لەبەردابوو، پشتێنی بەسەردا بەستبوو. لەپڕ هەستمکرد پاسپۆرتەکانم لە دەست دایە. نەمدەزانی چی بکەم، یەکسەر هەر دووکیانم خستە ناو یەکێك لە جزمەکانمەوە و چاوەڕوانبووم، مەهتابم زیاتر نوساند بە خۆمەوە.

"تەماشایمەکە،" بەچرپە پێموت. "هیچ شتێك مەڵێ."

سەربازەکە بە ترسەوە، لە ماشێنەکە نزیکبۆوە و لولەی تفەنگەکەی ڕووی لە شوفێرەکە بوو. لە ترساندا خەریکبوو دڵم ڕاوەستێت.

سەربازەکە ڕێك لولەی تفەنگەکەی کردە دەموچاوی شوفێرەکە و شتێکی وت بە زمانێك، کە زۆر بۆم بێگانە بوو. هەر دووکیان دەنگیان بەرزکردەوە. دەنگی سەربازەکە زۆر قیناوی و خراپ بوو. مەهتاب دەستی گوشیم. نەمدەوێرا هەناسەبدەم.

سەرئەنجام، وەك ئەوەی ئەم شەڕە قسەیە ساڵێکی خایەنـدبێت، سەربازەکە گەڕایە دواوە. شوفێرەکەمان سەیرێکی هاوەڵەکەی کرد و ئاهێکی سەرفەرازی کێشا. شوفێرەکە چی بە سەربازەکە وت، وا ڕازیکرد، تێنەگەیشتم.

لەسەر ڕێـگای خۆمان کەوتینەوە ڕێ، تا گەیشتینە ڕێـگای هاتوچۆی ئاسایی. ماشێنی سەربازی بەلاماندا هاتوچۆیبوو. لە پێشمانەوە خاڵی پشکنین دیاربوو، بەلام پێش ئەوەی بیگەینێ، شوفێرەکەمان لایدایە ڕێـگاکە و هێما بۆ ئێمە کرد، بڕۆینە خوارەوە. پیاوەکەی

تەنیشتم دابەزی و ئەویش هێمای بۆ کردین دوایبکەوین. ڕۆشن بوو، پێویستبوو بە دەوری خاڵی پشکنینەکەدا دەرچین.

بەناو گێلگەیەکی کراوەی قەدپاڵی شاخێك، کە زەوییەکەی بەفر، سەهۆڵ و قوڕی بەستوو دایپۆشیبوو، من و مەهتاب دوای پیاوەکە کەوتین. لە شوێنی دیدەوانەکانەوە تەواو دیاربووین، بوارێك نەبوو بۆ خۆشاردنەوە. هەستمدەکرد لە مەیدانی تەقەدام و بۆ نیشانەنانەوە لەبارم. بۆ چەند خولەك بەو گێڵگەیەدا ڕۆیشتین، تا چووینە سەر ڕێـگایەکی تر، کە ترافیکێکی زۆرتری بەسەردەوە بوو بە هەر دوو لادا.

وای بۆچووبووم، کە ماشێنەکە دێتەوە و هەڵماندەگرێت، یان ئەو ئوتومبیلە سوورە دێت، کە موحسین ئاماژەیپێکردبوو. بەڵام لە جیاتی ئەوەی چاوەڕوانی بکەین، ڕێپیشاندەرەکەمان بە قەراغی ڕێـگاکەدا کەوتەڕێ. بە سەرما، پەرێشانی و سەرلێشێواوی خۆمانەوە دوایکەوتین.

ترسناکانە هەمان ئاڕاستەی ترافیکەکەمان گرت، بەسەر گردا سەردەکەوتین و دەهاتینە خوارەوە، بە یەك خێرایی دەڕۆیشتین، هێواشکردنەوەی تیادا نەبوو، کاتێك ئەو ماشێنە گەورە سەربازییانە بە گرموهوڕ بە لاماندا تێدەپەڕین. هەندێك جار دەکەوتین بەسەر قوڕی بەستوودا، بەڵام هەر بەردەوامدەبووین. مەهتاب بە ڕێکوپێکی دەڕۆیشت، ورتەی لە خۆی بڕیبوو.

بەو شێوەیە نزیکەی کاژێرێك ڕۆیشتین، لە ناو دۆڵی گردێکی قوڵدا، ڕێپیشاندەرەکەمان شوێنێکی تەختی بۆ دۆزینەوە لەسەر بەفرەکە و هێمای بۆ کردین دانیشین و وچانبدەین. بە چەند وشە فارسی و هێماکردن تێیگەیاندین، کە ئێمە لێرانەدا جێدەهێڵێت و خۆشی دەڕوات و دەگەڕێتەوە بۆ لامان. پاشان بەخێرایی ڕۆیشت. من و مەهتاب لەناو بەفرەکەدا دانیشتین، تاك و تەنیا بەجێماو لە جیهانی خۆماندا، تەماشای پیاوەکەمان دەکرد، تا لە شاخی پڕ بەفر و سەهۆڵدا لە چاومان ونبوو.

باشە ئەو پیاوە بۆ بگەڕێتەوە؟ بۆم پرسیاربوو. بەڕاستی ئێرە شوێنێکی غەمبارە. ئەم پیاوانە پێشەکی پارەی خۆیان لە ئاماهل وەرگرتووە. هەر تۆزێك لەمەوپێش تەقەیان لێکردین و بەرنەکەوتین. بەڕاستی ئەو پیاوە، بۆ ئەزییەتی خۆی بدات و بگەڕێتەوە بۆ لامان؟

نازانم چەند چاوەڕوانی، گومانکردن، نیگەرانی و ویردخوێندمان درێژەیکێشا.

دەترسام، یەکێك بێت و بیبەوێت، بزانێت چی دەکەین، یان هەتا بە نیازی یارمەتی بێت بۆ لامان. چی پێبڵێم؟

لەپڕ ماشێنە سەربەتاڵەکە بەرەو ڕوومان هات، ئەو شوفێرە لێبدەخوری کە بە قسە خۆی لە کێشەی سەربازەکە ڕزگارکرد، سەیریکردین و بەلاماندا تێپەڕی، بەبێ ئەوەی هێمایەك بدات، وەك ئەوەی نەمانناسێتەوە.

ئەو پیاوە ناگەڕێتەوە، لەبەرخۆمەوە دووبارەمدەکردەوە. تاکەی لێرانەدا دانیشین و چاوەڕوانیبکەین؟ بۆ کوێ بچین؟ بەڵام چی؟ خۆمان بەرەو ڕۆژئاوا بکەوینەڕێ؟ دایك و کچێکی تەنیا، دەتوانن شاخەکان ببڕنن و بچنە ناو تورکیاوە؟ یان بگەڕێینەوە بۆ خاڵی پشکنینەکە و خۆمان بەدەستەوەبدەین، دەست لە ئاواتەکانمان و هەتا لە ژیانیشمان هەڵگرین؟ یان ئاسایی کە شەو هات لە باوەشی یەکتردا، لە قەراغی ڕێـگاکەدا، لە سەرماندا ڕەقدەبینەوە؟

ئەو پیاوە ناگەڕێتــــەوە.

بیری ئەو بەسەرهاتەم کەوتەوە، کە ماوەیەکی زۆر لەوەوپێش هێلین بۆی گێڕامەوە، کەچۆن دایك و کچێك هەروا بەجێیانهێشتوون، دروست وەك ئەمەی ئێمە. کچەکە مردووە و دایکەکە نیوەمردوو دەرچووە، بەڵام تەواو ددانەکانی لەدەستداوە.

ئەندێشەی ئەو ژنە تێکشاوە، مێشکمی بەرنەدەدا.

ئەوەندە ترس و سەرما پەکی خستبووم، سەرنجی ئوتومبیلە سوورەکەم نەدا، کە لێماننزیکدەبۆوە. لە قەراغی ڕێـگاکە لایدابوو، پێش ئەوەی سەر هەڵبڕم و ببینم.

پیاوەکە هاتەوە بۆ لامان! خێرا هێمای بۆ کردین، سواربین و فەرمانیدا بە شوفێرەکە، لێخوڕێت.

پاش پانزە خولەکێك لاماندایە خانوویەك لەسەر ڕێـگاکە. خانوویەکی چوارگۆشەی سەربان پانی کۆنکرێتی بوو. ڕێـگای ئوتومبیل بە دەوری خانووەکەدا پێچیدەکردەوە و لە دواوە چووینە حەوشەکەوە، کە بەرەو ڕووبووین لەگەڵ وەڕینی سەگێکی گەورەی گەڕ و کۆمەڵێك منداڵی جلشڕی پێپەتی، کە بەناو بەفرەکەدا ڕاکەڕاکەیان بوو.

جلی شۆراو بە هەموو لایەکەوە هەڵواسرابوون بۆ وشکبوونەوە، سەرما کردبوونی بە پەیکەری جۆراوجۆر.

ژنان و منداڵان لێمانکۆبوونەوە بۆ تەماشاکردنمان. ژنەکان مۆن و ناشرین و لوتزل بوون. جلە کوردییەکانیان ئەوەندەی باڵایان پانیانکردبوونەوە، ئەمەش لەوەوە سەرچاوەی دەگرت، کە کراسەکانی بەریان زۆر پانتر لەوەی من دووراببوون. دەستیان خستبووە سەر سمتیان و بە گومانەوە تەماشای ئێمەیان دەکرد.

"*زوبباشرا*" 'ئەو پیاوەی هاتەوە بۆ لامان' وتی. پێشمانکەوت بۆ دواوەی خانووەکە، کە ڕووی لە ڕێـگاکە بوو، لەوێوە چووینە ناو ڕاڕەوێکی بچوکەوە. چەند ژنێك هێمایان بۆ کردین، جزمەکانمان لەویانەدا داکەنین. هیلاکی و ترس کاری تێکردبووم. هەموو ئەو شتانە، وەك شانۆگەرییەکی خەیاڵاوی دەهاتە بەرچاوم.

ژنان و منداڵان هەروا بەسەرمانەوە ڕاوەستابوون و تەماشایاندەکردین، کاتێك جزمە قوڕاوییە بەستۆکانمان دادەکەن.

ئێمەیان برد بۆ ژوورێکی کەم کەلوپەلی ساردی گەورە. ژنێك هێمای بۆ کردین، دانیشین.

لەسەر زەوییە گڵە ڕەقەکە، دانیشتین و بێورتە و بە ترسەوە سەیری ژنەکانمان دەکرد، ئەوانیش تەماشای ئێمەیان دەکرد، بە شێوەیەك كە پێم وانەبوو دۆستانە بێت. دیوارە بەدەست سپیکارکراوە شێدارەکانی ژوورەکە، تەنیا دوو پەنجەرەی بچوکی بە شیشی ئاسنەوە تیادا بوو، لەگەڵ وێنەی پیاوێکی کوردی ڕوومەت دەرپۆقیوو، بە کڵاوێکی شێوەی ڕوسی لە سەریدا.

ژنێك کەوتە ئامادەکردنی چا. یەکێکی تریان چەند پارچە نانی ڕەقی ساردی پێداین. سێهەمیان باتانی بۆ هێناین. باتانییەکانمان لە خۆمانەوە پێچا، بەڵام هەر لە لەرزینی سەرما نەدەکەوتین.

ئەم ژنانە لە بارەی ئێمەوە چۆن بیردەکەنەوە؟ لە دڵی خۆمدا لێکمدەدایەوە. بەم زمانە کوردییە نامۆیە بە من، چی دەڵێن بە یەکتری؟ ئایا دەزانن ئێمە ئەمریکین؟ ئایا کوردەکانیش دژی ئەمریکان؟ یان یەکین، دژی دوژمنی هاوبەشی شیعە؟

'ئەو پیاوەی هاتەوە بۆ لامان' لەتەنیشت ئێمە دانیشت، بێ ئەوەی شتێك بڵێت. نەمدەزانی، چاوەڕوانی چی دەکەین.

پاش تۆزێك ژنێك هاتە ژوورەوە، کراسێکی وا فشی لەبەردابوو، کە هەرگیز شتی وام نەدیبوو. کوڕێکی تەمەن نزیك دوانزە ساڵی لەگەڵدا بوو. ژنەکە لە ئێمە هاتە پێشەوە، بەتوندی شتێکی بە کوڕەکە وت و هێمای بۆ کرد، کە لە تەنیشت مەهتاب دانیشێت. کوڕەکە بەقسەیکرد و سەری بەرزکردەوە و بە شەرمنییەوە تەماشای ژنەکەی دەکرد. ژنەکە، کە وای بۆچووم دایکی بێت، وەك پاسەوان بەسەرمانەوە ڕاوەستا.

تا دەهات، زیاتر دەترسام. دەبێت چیمان بەسەربهێنن؟ ئەم دیمەنە ئەوەندە نامۆ بوو، خەریکبوو زەندەقم بچێت. لەم دوورە وڵاتە گیرمانکردبوو، تەواو بێدەسەڵات کەوتبووینە ژێر دەستی خەڵکانێك، کە خۆیان لە وڵاتی خۆیاندا یاخی بوون. بەبێدەنگی هاواری یارمەتیم دەکرد. ئایا شتی وا دەبێت؟ چۆن ژنێکی ئەمریکی خۆی دەخاتە بنبەستێکی ئاوارە، لە هەلومەرجێکی وا سەختدا؟

زانیـــم چۆن، هاتەوە بیرم. مـــودی! لەنێو درزی دیوارەکانەوە دەرکەوت، پێمانپێدەکەنی، ئەو ئاگرە لە چاوانیدا دیاربوو، کاتێك کە لە منی دەدا، کاتێك کە زرمەی لە مەهتاب هەڵدەستاند، وەك ئەو ئاگرەی کە لەناو تەباخەکەدا شوقیدەدایە دەرەوە. دەنگەدەنگی خەڵکانی دەوروپشتم، تا دەهات بەرزدەبۆوە و تێکەڵی هاتوهاوار و نەڕەی مودی دەبوو.

مـــــــــودی!

مودی زۆری لە من کرد ڕاکـــەم. دەبوو مەهتاب بەرم لەگەڵ خۆم. بەڵام ئەی ئەگەر شتێکی بەسەر بێت ...

ئایا ئەو خەڵکە، لە هەوڵی چنینی پیلانێکدا بوون؟ ئایا پلانی ئەوەیان دادەنا، مەهتاب بەرن؟ ئەو کوڕ و دایکە زەبەلاحە کێن؟ ئایا بەنیازبوون، مەهتاب لەو کوڕە مارەبکەن؟ ئەو

ساڵ و نیوەی ڕۆیشت، منی هێنایە سەر ئەو باوەڕەی، کە چاوەڕوانی ڕوودانی هەموو شتێك بکەم لەو وڵاتە نامۆیەدا.

ئەمـــە ئەوە ناهێنێت! بەبێدەنگی هاوارمکرد. ئەگەر کچەکەم بفرۆشن یان ئەگەر هەر مامەڵەیەکی پێوە بکەن، ڕێسەکەمان دەبێتەوە بە خوری. لەو ساتەدا حەزمدەکرد، بۆ هەموو ژیانم لە ئێراندا بمامایەوە. چـــۆن مەهتابم خستە مەترسییەکی وەها گەورەوە؟

هەوڵمدا خۆم ئارامبکەمەوە، خۆم بێنمە سەر ئەو باوەڕەی، کە ئەم ترسانە لە هیلاکی و گرژییەوە سەرچاوەدەگرێت.

"مـــامی، حەزم لەم شوێنە نییە،" مەهتاب بە چرپە وتی. "مامی، دەمەوێت لێرە بڕۆم."

ئەمە زیاتر ترساندمی. مەهتابیش وەك من، هەستی بە نامۆیی هەلومەرجەکەی دەکرد.

ناوبەناو کوڕەکە دەویست لە مەهتاب دوورکەوێتەوە، بەڵام ژنەکە - دایکی؟ - چاوی تێدەبڕی، تا لە شوێنی خۆی نەجوڵێت. لەولای منەوە 'ئەو پیاوەی هاتەوە بۆ لامان' لە شوێنی خۆی، هەروا بەبێدەنگ دانیشتبوو.

بۆ نزیکەی نیو کاژێر هەروا دانیشتبووین، کە پیاوێك هاتە ژوورەوە، دەرکەوتنی مایەی دەستبەکاربوونی ژنەکان بوو. یەکسەر نان و چایان بۆ هێنا. بە دەوروپشتیدا دەهاتن و هەرکە پیاڵەچاکەی بەتاڵدەبوو، بۆیان پڕدەکردەوە. لەسەر زەوییەکە دانیشت، گرنگی بە ئێمە نەدا، کە لە ژوورەکەدا بووین. لە کیسەکەیدا پەڕە سیغاری دەرهێنا و کەوتە پێچانەوەی جگەرە، بەڵام لە جیاتی توتن شتێکی سپی دەپێچایەوە. حەشیش بوو، هیرۆین بوو؟ سەرم لەو شتانە دەرنەدەچوو، بەڵام دەمزانی، ئەو شتەی دەیکردە ناو پەڕە سیغارەکەوە، توتن نەبوو.

لەپڕ پیاوەکەم ناسییەوە! ئەو ئەو پیاوە بوو، کە وێنەکەی بە دیوارەکەوە هەڵواسرابوو. دیاربوو، ئاغای ماڵەکە بوو. ئایا ئەو ژنانە هەمووی ژنی ئەو بوون؟ بۆم جێگای پرسیار بوو. ئایا کۆمەڵگایەکی پیاوسالارم جێهێشتووە بۆ کۆمەڵگایەکی تر، کە تیادا پیاو دەسەڵاتی تەواوی هەیە؟

"مامی، کـــەی دەڕۆین؟" مەهتاب بە چرپە وتی. "ئێرم پێخۆش نییە."

تەماشایەکی کاتژمێرەکەمم کرد. ئێوارە خەریکبوو دادەهات. "نازانم بە دیار چییەوە دانیشتووین،" بە مەهتابم وت. "هەر ئامادەبـــــە."

وردەوردە ژوورەکە تاریکبوو. کەسێك مۆمێکی هێنا و تۆزێك دەوروپشتمان ڕۆشنبۆوە، تیشکی مۆمەکە شێوازێکی تری دا بە دیمەنی ناو ژوورەکە، کە خەیاڵاوی بنوێنێت. گیزەگیزی ئاگری تەباخەکە، لایلایەیەك بوو بۆ ئارامکردنەوەی ئێمە.

بەو شێوەیە چوار کاژێرێك ماینەوە، ئێمە بە سڵەمینەوەوە سەیری پیاوەکان و ژنەکانمان دەکرد، ئەوانیش بە هەمان شێوە تەماشای ئێمەیان دەکرد.

سەرئەنجام، باری گرژی بە وەڕینی سەگ شکێنرا، کە ئاگادارکردنەوەیەك بوو بۆ هاتنی کەسێك. هەموو لە ژوورەکەدا هەستانە سەرپێ، ئامادە بۆ هەر پێشهاتێك.

لە چەند خولەکدا، پیاوێك خۆی کرد بە ژووردا. تەمەنی نزیك شەست ساڵ دەبوو، بەڵام ئەوە تەنیا پێشبینی من بوو. لە هەلومەرجێکی وا سەختی ژیاندا، پێستی ئینسان زووتر پیردەبێت. جلی خاکی لەبەردابوو، کە زیاتر لە جلی سەربازی دەچوو، بە سەریدا قەمسەڵەیەکی بەڵکبەڵکی لەبەردابوو لەگەڵ کڵاوێکی خوری لەسەر کردبوو. ئاغای ماڵەکە شتێکی لەبارەی ئێمەوە وت، وەك ئەوەی بمانناسێنێت.

*"سەلام"* پیاوە پیرەکە لەژێر لێوەوە وتی، یان شتێکی وەك ئەوە. لەناو ژوورەکەدا ئۆقرەی لێبڕابوو، جاروبار تۆزێك بە تاباخەکە دەستی گەرمدەکردەوە و تۆزێك بۆ ئەوانی تر دەدووا. هەموو گیانی وزە بوو، ئامادەی هەموو پێشهاتێك بوو.

یەکێك لە ژنەکان جلی گۆڕینی بۆ هێنام و هێمای بۆ کردم، ئەو جلە کوردییانەی لەبەرمدایە، دایکەنم تا جلەکانی خۆم. پاشان یارمەتیدام ئەو جلانە لەبەربکەم، کە تۆزێك جیاواز بوو لەوانەی پێشوو. کراسەکان کەمێك پانتر بوون، تایبەتبوون بە نەریتی ئەو ناوچەیە. ژنەکە جللەبەرکردنمی تەواوکرد و لە ناوقەددا بەستمی، وا شەتەکی دام، کە جوڵاندنەوەم ئاسان نەبوو.

کە من خەریکی جلگۆڕین بووم، پیاوە پیرەکە هاستایە سەرپێ، جێگای بە خۆی نەدەگرت و پەلەی ڕۆیشتن بوو. هەرکە ئامادەبووم، هێمای بۆ من و مەهتاب کرد، دوای کەوین بۆ ڕاڕەوە بچوکەکە، بۆ لای جزمەکانمان. شتێکی وت و ژنێك مۆمەکەی کوژانەوە، تەنیا تیشکی تەباخەکە لەناو ژوورەکەدا دیاربوو. دەرگاکەی تەواو کردەوە، بۆئەوەی ڕاڕەوەکە تۆزێك ڕووناکبێتەوە تا دەستمان بە جزمەکانمان بگات. خێرا و بەبێدەنگ دەرگاکەی داخستەوە.

مەهتاب نەیدەتوانی بەئاسانی جزمەکانی لەپێکات، منیش نەمدەتوانی بنوشتێمەوە و یارمەتیبدام. خێراکـــە! خێراکە! پیاوە پیرەکە هێمای بۆ کردین.

لە کۆتاییدا ئامادەبووین. مەهتاب ئازایانە دەستی گرتم. نەماندەزانی بۆ کوێ دەچین، بەڵام خۆشحاڵبووین لەوەی، ئەو شوێنە جێدەهێڵین. لەوانەیە ئەو پیاوە پیرە، بمانبات بۆ ئەمبولانسی خاچی سوور، لە دڵی خۆمدا وتم. بێدەنگ دوای کەوتین بۆ دەرەوە بۆ ناو شەوی سەهۆڵبەندان. 'ئەو پیاوەی هاتەوە بۆ لامان' دوامانکەوت بۆ دەرەوە، لەپشت خۆیەوە دەرگاکەی یەکسەر داخست. بەبێدەنگ، خێرا دەورماندایەوە بە خانووەکەدا بۆ ئەو حەوشەیەی، کە ئوتومبیلە سوورەکەی تیادا پارککرابوو.

سەگەکە خراپ لێمانوەڕی، لەناو دێکەدا دەنگیدایەوە و ڕەشەبا دووراودوور لەگەڵ خۆی بردی. سەگەکە بەرەو ڕوومان ڕایکرد و ویستی لوتی بنێت پێمانەوە. ئێمە لە ترساندا، خۆمان لێدوورخستەوە.

حیلەی ئەسپ هاتەگوێـــــم.

ئەستێرەکان بێرسکوهوڕیانبوو، ئاسمانی بە ڕەنگێکی خۆڵەمێشی سپی ڕوونککربۆوە، بەڵام نەمدەزانی، بۆ زەوییەکەی ڕۆشننەدەکردەوە. بەئاستەم، پیاوە پیرە ڕێپیشاندەرەکەمان لەپێش خۆمەوە دەبینی.

کە گەیشتینە لای ئاسپە ئامادەکراوەکە، ئاغای خانەخوێ بۆ ماوەی چوار کاژێری ڕابوردوو، ئەوەندە لێم نزیکبۆوە، کە تارمایی دەموچاوی لەو تۆزە ڕۆشناییەدا ببینم. بە هێماکردن ماڵئاوایی لێکردم، منیش هەوڵمدا، سوپاسی خۆمی بۆ بەیانبکەم.

پیاوە پیرەکە هێمای بۆ کردم، سواری ئەسپەکە ببم. 'ئەو پیاوەی هاتەوە بۆ لامان' هەر دوو دەستی بۆ ڕاگرتم تا پێیەکمی لەسەر دانێم و بە یارمەتی پیاوە پیرەکە، سەرکەوتمە سەر پشتی ئەسپەکە.

ئەسپەکە زینی لێنەبەسترابوو - تەنیا باتانییەك بەسەر پشتێوە بوو، کە هەوڵمدا لەژێر خۆمدا چاکیبکەم. 'ئەو پیاوەی هاتەوە بۆ لامان' مەهتابی بەرزکردەوە بۆ سەر پشتی ئەسپەکە و لە پێشم داینا. ڕەشەبای سارد، بەو هەموو چینە جلانەدا دەچووە لەشمەوە. "هەوڵبدە سەر دانەوێنە،" بە مەهتابم وت. "هەوا زۆر ساردە." بۆ پارێزگاریکردنی، باوەشم پیاداکرد و خۆمم نوشتانەوە بۆ پێشەوە، تا پشتملی ئەسپەکە بگرم. ئەسپەکە ئاژەڵێکی بچوك بوو، وەك ئەسپی ئەمریکی نەبوو، لە کەرێك گەورەتر بوو.

پیاوە پیرەکە بەپەلە بە دەرگای حەوشەکەدا دەرچوو، لە تاریکاییەکەدا ونبوو. 'ئەو پیاوەی هاتەوە بۆ لامان' لغاوی ئەسپەکەی گرت و شوێنی پیاوە پیرەکە کەوت.

چەند ساڵ بوو سواری ئەسپ نەبووبووم، بەبێ زین هەرگیز نا. باتانییەکە بەسەر پشتی ئەسپەکەوە لە ژێرمدا دەخزا، چەند جار خەریکبوو، بکەوینە خوارەوە بۆ سەر زەوییە بەستووەکە. بە هەموو هێزمەوە، کە لە لەشی ماندوومدا مابوو، ملی ئەسپەکەم دەگرت. مەهتاب بەدەر لە ویستی خۆی، لەناو باوەشمدا لەسەرماندا وەك بینی ئاو دەلەرزی.

بەناو کێڵگە ڕووتەکاندا بەکاوەخۆ کەوتینەڕێ، ئاوبەناو پیاوە پیرەکە دەگەڕایەوە، بۆئەوەی بەچرپە ئاگادارمانبکاتەوە. بێگومان دەنگی شکاندنی سەهۆڵ لەژێر سمی ئەسپەکەدا، پڕمەترسی بوو. لەو ناوچە شاخاوییەدا، هەر دەنگێك وەك تەقەی تفەنگ، دەنگی دەدایەوە و پاسدارانێك، کە لەو ناوچەیدا بێوەستان خەریکی گەشتلێدانبوون، ئاگاداردەبوونەوە. دەنگ لێوە هاتن، مەترسی بۆ دروستدەکردین.

وردەوردە سەردەکەوتین بەسەر گردا، کە بەرەو شاخی بەرز دەیبردین. ئیتر زەوی تەخت نەما. ئەسپەکە لە ڕۆیشتن دەسڵەمییەوە و بەدوای شوێنێکەوە بوو، تا قاچی تیادانێت، بەڵام پشوودرێژانە بە بارەکەی خۆیەوە ملی ڕێـگای گرتبوو. ئاشکرا بوو، کە ئەمە یەکەم سەفەری نەبوو.

کاتێک گەیشتینە لوتەکەی گردێکی بەرز، چاوەڕواننەکراوانە ئەسپەکە خلیسکا و ئێمەش بەسەر ئەسپەکەوە خزاین. خۆمان پێنەگیرایەوە. هەرچەند لە کاتی کەوتنە خوارەوەدا بووین، بەڵام توند مەهتابم بە سنگمەوە نا، تا ئازاری پێنەگات. خراپ کەوتینە خوارەوە بۆ سەر سەهۆڵ و بەفرەکە. 'ئەو پیاوەی هاتەوە بۆ لامان' خێرا یارمەتیداین تا هەستینەوە سەرپێ و بەفرەکەی لە جلەکانمان تەکاند. دەموچاوی مەهتاب بە ڕەشەبا ساردەکە دەکزایەوە، لەشی ژانیدەکرد، برسی و تەواو هیلاک بوو، لەگەڵ هەموو ئەوانە بێدەنگ و بەهێز مایەوە، ئەوەندە بەهێز بوو، کە نەگریا.

سواری ئەسپەکە بووینەوە و ئەمجارە هەوڵمدا، پشتملی ئەسپەکە قایمتر بگرم. لە گردەکە هاتینە خوارەوە بەرەو شوێنێکی زۆر تاریک.

ئەمە هێشتا نەگەیشتووین بە شاخە بەرزە سەختەکان، لە دڵی خۆمدا وتم. ئەگەر وابێت، من چۆن دەتوانم لەم سەفەرە پڕزەحمەتەدا گیانبەدەربەرم؟ هەتا ناتوانم، خۆم بەسەر ئەسپەکەوە ڕاگرم. ئاوا بڕوات، جێمدەهێڵن.

شەو تا دەهات، زیاتر ساردتر و تاریکتر دەبوو. ئەستێرەکان باریانکرد و نەمان. ڕەشەبا و بەفر قایمتر کەوتە کوتاندنی دەموچاومان.

سەردەکەوتین و دەهاتینە خوارەوە، تا گرد بوو بە شاخ و شاخیش تا دەهات، دژوارتر دەبوو.

سەرکەوتن کەمتر سەختتر بوو، چونکو ڕەشەبا کەمتر دەیگرتینەوە. لە هەورازدا ئەسپەکە خێراتر دەڕۆیشت، تەنیا جاروبار نەبێت، بەسەر سەهۆڵەکەدا دەخزی، یان دەوەن بەملا و ئەولایدا دەخشا.

هەرچی چۆنێک بوو، سەربەرەوخوارکە سەختتر بوو. هەر جارێک دەگەیشتینە لوتکەی شاخێک، ڕەشەبا لەو پەڕی هێزیدا دەیدا بە دەموچاوماندا. بەفر وەک چەقۆ پێستی قاشدەکردین. لەم لوتکانەدا بەفرێکی زۆر باریبوو، بە زەحمەتێکی زۆرترەوە دەمانتوانی بیبڕین و هەندێک جار تیادا نقومدەبووین.

باڵم کەوتە ئازار. هەستمنەدەکرد، پەنجەی قاچم ماوە. دەمویست بگریەم، وازملێبهێنن با لە ئەسپەکە بکەومە خوارەوە و لەناو بەفرەکەدا بمرم. دەترسام لە سەرماندا ڕەقبینەوە. دڵنیابووم، کە لەو شەوە سەختەدا، پەنجەی قاچمان لەدەستدەدەین. مەهتابی نەگبەت، نەیدەتوانی لە لەرزین بکەوێت.

زۆرم لە خۆم دەکرد، کە بتوانم هۆشم لای خۆم بێت، بەسەر ئەسپەکەوە خۆم ڕاگرم. بە هیچ جۆرێک نەمدەتوانی بزانم، تاکـــەی و تا کـــوێ دەبێت بەم شێوەیە گیانبکێشین.

نەمدەتوانی بزانم کات کەیە. هەتا ئەگەر بمتوانیایە، لەو تاریکاییەدا کاتژمێرەکەشم ببینم، نەمدەتوانی بۆ ساتێک، دەست لە ئەسپەکە بەردەم. لە کات و شوێن دابڕابووم. لە سەهۆڵبەندانی تاریکونوتەکدا بۆ هەتاهەتایە بێسەروشوێنبووین.

لەبڕ دەنگەدەنگ لە پێشمانەوە هاتەگوێم. یەکسەر دڵم داخورپا. لە خۆم دڵنیابووم، کە پاسدارە. پاش ئەو هەموو ئازارکێشانە، دەکرێت ئێستا بکەوینە داوی پاسدارەوە؟

بەڵام مێش میوانی 'ئەو پیاوەی هاتەوە بۆ لامان' نەبوو، هەروا بەردەوامبووین و چەند خولەکێکی برد، تا گەیشتین بە ڕانە مەڕێك. چەند سەیر بوو، لە شوێنێکی وادا ئەو ئاژەڵانە ببینیت! چۆن دەیانتوانی، بەرگەی کەشێکی وەها بگرن؟ دەبێت گۆشتی زۆریان پێوە بێت، لە دڵی خۆمدا وتم. ئیرەییم بە پێستە خوریدارەکەیان دەبرد.

کاتێك نزیکبووینەوە، بینیم پیاوە پیرەکە، کە لە پێشمانەوە دەڕۆیشت بۆ پشکنین، گفتوگۆیەتی لەگەڵ شوانی مەڕەکان، کە جلەکانی بەری تەواو ڕەش بوو. هەموو ئەوەی دەمبینی، هێڵی دەردەوەی دەموچاوی بوو لەگەڵ گۆچانەکەی.

شوانەکە بەهێواشی چاکوچۆنی لەگەڵ 'ئەو پیاوەی هاتەوە بۆ لامان' کرد. لغاوی ئەسپەکەمانی لێوەرگرت، ئاسایی ئەسپەکەی بەدوای خۆیدا کێشکرد، مەڕەکانی جێهێشت و بە یارمەتی گۆچانەکەی ملی ڕێــگای گرت. ئاوڕمدایەوە بۆ 'ئەو پیاوەی هاتەوە بۆ لامان'، بەڵام دیارنەما، بەبێ ئەوەی ماڵئاوایی لە یەکتری بکەین.

لغاوی ئەسپەکەمان کەوتە دەست شوانەکە، پیاوە پیرەکە زیاتر پێشمانکەوت بۆ پشکنین و ئێمەش بە دوایدا.

بەسەر شاخێکدا سەرکەوتین و هاتینە خوارەوە. یەکێکی تریش. توانیمان خۆمان بەسەر ئەسپەکەوە ڕاگرین. بەڵام هەستمدەکرد، باڵەکانم لە لەشم کراوەتەوە یان پێوەی ڕەقبۆتەوە. هەستم بە بوونیان نەدەکرد. ئـــــا ئەلەمە ئەدرناچین، لەبەرخۆمەوە گریام. پاش ئەو هەموو چەرمەسەرییە، لەمە دەناچین. مەهتاب لە باوەشمدا دەلەرزی، لەرزین تەنیا نیشانەیەك بوو بۆ ئەوەی، کە هێشتا زیندووە.

بە ڕێکەوت لە شوێنێکدا، سەرم بەرزکردەوە و تەماشامکرد. لەپێش ئێمەوە، لە لوتکەی شاخێکی بەرزی سەختدا، دیمەنێکی جنۆکەئاسام بینی. بەهۆی ئەوەی پشتی بە ئاسمانێکی سپی پڕ باوبۆرانەوە بوو، لادیمەنێکی سەیرم لێوە دیاربوو. کۆمەڵێك ئەسپ بوو لەگەڵ سوارەکانیان، دەنگەدەنگیان دەهات. "پاسدارن،" لە دڵی خۆمدا وتم.

لە هەموو ئەو دەربیسەریانەی کە بەسەرمانهاتبوو، لە هەموو ئەو مەترسیانەی کە لە ڕێــگاماندا بوو، پاسدار خراپترینیان بوو، ئەمدەتوانی بیهێنمە بەرچاوی خۆم، کە چیمان بەسەر دەهێنن. بەسەرهاتی زۆرم لە بارەی پاسدارەوە بیستبوو - هەر هەموویان ترسناك بوون. گومانی تیادا نەبوو، هەر ژنێکیان بەردەست بکەوتایە، لاقەیاندەکرد - پێش کوشتنی هەر کچێك، لاقەیاندەکرد ئینجا دەیانکوشت. تەزوو بە گیانمدا دەهات، کە وتە ترسناکەکەی خۆیانم بیردەکەوتەوە: "هیـــــچ کچێك نابێت، بە پاکیزەیی بچێتە ژێر خاکەوە."

ئەوەندە لە ترساندا کەوتمە لەرزین، وامدەزانی بەسەر ئەسپەکەوە هەڵبەزودابەزمە. هێشتا لەگەڵ ئەوەشدا ڕانەوەستاین.

پاش ماوەیەك، جارێکی تر دەنگەدەنگەکە هاتەوە گوێم، ئەم جارەیان بەرزتر بوو، دەرکەوت گفتوگۆکردن بوو. نیتر لە خۆم دڵنیابووم، کە کەوتینە دەست پاسدار! قایمتر مەهتابم گرت، تا بیپارێزم. فرمێسکی ئازار و نائومێدی، بەسەر ڕوومەتمەوە بەستی.

شوانەکە سڵەمییەوە و ئەسپەکەی وەستاند.

گــــــوێقوڵاغبووین.

ڕەشەبا دەنگەدەنگەکەی زیاتر هێنا. کۆمەڵێك پیاو بوون لە پێشمانەوە، وا دەردەکەوت، بۆیان گرنگ نەبێت، خۆیان حەشاربدەن. بەڵام شێوەی گفتوگۆکە لە قرەقرەوە نزیك بوو.

چاوەڕوانی پیاوە پەردکەمان کرد، بەڵام دەرنەکەوت، چەند خولەکەی تری گرژی تێپەڕی.

سەرئەنجام، لەوەدەچوو شوانەکە هاتبێتە سەر ئەو باوەڕەی، کە مەترسییەك لە ئارادا نییە و دەتوانێت بڕوات.

کە نزیکتر بووینەوە، ئەسپەکەمان لە دەنگی بوونی ئەسپی تر، گوێکانی قوتکردەوە. چووینە ناو کۆمەڵی چوار پیاوەوە، کە ڕاوەستابوون و ئاسایی گفتوگۆیان بوو، وەك ئەوەی لە هاتنە دەرەوەیەکی ڕۆتینی خۆیاندا بــن.

"*سەلام،*" یەکێك لە پیاوەکان پێیوتم. هەرچەند باوبۆران بوو، بەڵام دەنگی بۆم ئاشنا بوو، چەند ساتێکی ویست تا لە دەموچاوی وردبوومەوە. مـوحسیــن بوو! هـــــەر لەسەر بەڵێنەکەی خۆی مابوو. "هەرگیز لە ژیانمدا، لەگەڵ کەس لە سنوور نەپەڕیومەتەوە،" ئەم سەرکردە قاچاغچییە وتی. "بەڵام ئیمشەو لەبەر تۆ، سنوور دەبەزێنم. ئێستا لە ئەسپەکە وەرە خوارەوە."

لە پێشدا مەهتابم دایە دەستی، پاشان خۆم خزاندە خوارەوە، بینیم قاچم وەك باڵم پەکیکەوتووە. بەناستەم دەمتوانی، لەسەر پێی خۆم ڕاوەستم.

موحسین باسی گۆڕانی پلانەکەی بۆ کردم. ئەو دوانیوەڕۆیە، کە ماشێنە بارهەڵگرەکەمان بەر تەقە درا و سەربازێك ڕێـگای لێگرتین، تەنیا بە زیرەکی شوفێرەکە لە گیران ڕزگارمان بووە، کە توانیبووی درۆیەك هەڵبەستێ، کە بۆچی ڕێگامان کەوتۆتە ئەو ناوچە سنوورییەوە. ئەو ڕووداوە، بووبووە هۆی سڵەمینەوەی هەموو ئەوانەی کە بەشداربوون لە پلانەکەدا.

موحسینیش هاتبووە سەر ئەو باوەڕەی، کە پەڕینەوە بە ئەمبولانس زۆر پڕمەترسییە و لە لێپرسینەوەیەکی تر ڕزگارماننابێت. بەو هۆیەوە بووە، کە بەناو شاخوداخدا، بەدوور لە ڕێـگا، هەر بە سواری ئەسپ لە سنوور دەپەڕینەوە.

"با مەهتاب لەگەڵ پیاوێك سواری ئەسپێکی تر بێت،" موحسین بە فارسی وتی.

"نــــــا، من ناچم،" مەهتاب لەپڕ دەستیکرد بە گریان.

لەپاش پێنج ڕۆژ ڕاکردن، لەپاش کاژێرەهای لە ژمارەنەهاتووی برسییەتی، ئازار و سەرلێشێواندن، ئیتر لەوە زیاتر بەرگەمینەدەگرت. فرمێسک تکتک بە چاویدا هاتە خوارەوە و لەسەر ملپێچەکەی بەستی. ئەوە یەکەم جاری بوو، لە ناچاریدا دەستبکات بە گریان، لەو ساتەوەی کە بڕیاریدا، بچێت بۆ ئەمریکا بەبێ کەروێشکەکەی. کچە بچکۆلە نازاکەم بەرگەی هەموو ئەوانەی گرت، بەبێ ئەوەی تا ئێستا گلەییەك بکات، تا هەرەشی جیاکردنەوەی منی لێکرا. "مـــامی، دەمەوێت لەگەڵ تۆ بڕۆم،" بەدەم گریانەوە وتی.

"شش‌ش،" پێموت. "ئەم هەموو ڕێـگایە هاتووین. ئێستا هاتووینەتە سەر سنوورەکە. ئەگەر تەنیا تۆزێکی تر بڕۆین، لە سنوور دەپەڕینەوە و پاشان دەتوانین بچین بۆ ئەمریکا. ئەگەر وا نەبێت، دەچینەوە بۆ لای باوکت. تکاتلێدەکەم لەبەر من، هەوڵبدە ئەوە بکە."

"من نامەوێت، بەتەنیا سواری ئەسپ بم." بەدەم هەنسکدانەوە وتی.

"پیاوێکت لەگەڵ دەبێت."

"من دەمەوێت لەگەڵ تۆ سواری ئەسپ بم."

"نـــا، دەبێت بچیت. ئەوان دەزانن چی باشە. تکاتلێدەکەم بچۆ. متمانەیان پێبکـــە."

مەهتاب چووە قوڵایی خۆیەوە، تا سەرچاوەیەك بدۆزێتەوە، هێزی خۆیی تیا هەڵهێنجێت. فرمێسکەکانی سڕی و ئازایەتی تیادا بووژایەوە. ئەوەی موحسین پێیوت، دەیکرد، بەڵام پێش ئەوە، دەبوو شتێکی تر بکات. "مامی، دەبێت بچم بۆ توالێت،" وتی. لەسەر ئەو شاخە، لە تاریکایی شەو و باوبۆراندا، لە نێو کۆمەڵێك پیاوی نەناسدا، مەهتاب دانیشت.

"مەهتاب،" پێموت. "بەڕاستی زۆر بەداخم بۆ ئەمە. ئەمدەزانی، ئەمە ئەوەندە سەخت دەبێت. نەمدەزانی، ئەمەم لەدەست دێت یان نا."

لەگەڵ ئەوەی هیلاك بوو، برسێتی دەکێشا و لەشی بە بای تەزێنەری زستان کوترابوو، سنگی دەرپەڕاند و هێزی دایە خۆی. "دەتوانم سواری ئەسپێکی تر بم،" بە متمانەوە وتی. "من سەرسەختم. دەتوانم هەموو شتێك بکەم، بۆئەوەی بچم بۆ ئەمریکا." پاشان وتەکەی تەواوکرد، "ڤینم لە باوکمە، کە ئەمەی بەسەر ئێمە هێنـــا."

ڕێـگایدا، بەرزیبکەنەوە بۆ باوەشی پیاوێك، بەسەر ئەسپێکەوە. موحسین یارمەتیدام، سواری ئەسپێکی تر ببم و لغاوەکەی بە پیاوێکی تر دا. هەموو پیاوەکان بەپێ دەڕۆیشتن و من و مەهتابیان دەبرد و دوو ئەسپی تریشیان وەك یەدك پێبوو. کەوتینەوەڕێ. ئاوڕمدایەوە بۆ مەهتاب بزانم چۆنە، گوێم لە دەنگی سمی ئەسپەکەی بوو، بەڵام ئەسپەکەم نەدەبینی. هەروەها مەهتابیشم نەدەبینی.

بەهێزبە بـــەبەکەم، بەهێزبە، بەبێدەنگی بە کچەکەمم وت و لە خۆمم دووبارەکردەوە.

شەوێکی ترسناك بوو، تا دەهات درێژتر دەبۆوە، شاخەکان زۆر دژوارتر بوون لەوانەی پێشوو. سەرکەوە و وەرە خوارەوە. بۆم پرسیاربوو، کـــەی دەگەینە سنوور؟ ئایا گەیشتووین؟

ڕووم لەو پیاوە کرد، کە لغاوی ئەسپەکەمی بە دەستەوە بوو. "تورکیـــا؟ تورکیا؟" بە چرپە پێموت و هێمام بۆ زەوییەکە کرد.

"ئێـــــران، ئێران،" وەڵامیدامەوە.

گەیشتین بە شاخێك، کە ئەوەندە هەوراز بوو، ئەسپەکان نەیاندەتوانی بە بارەکانیانەوە سەرکەون. دەبوو لە ئەسپەکان بێنە خوارەوە و هەوڵبدەین، بە پێ بەسەر شاخی سەهۆڵبەستودا سەرکەوین. لاقەکانم ئەوەندە بێهێز بووبوون، نەمدەتوانی لەسەر پێی خۆم ڕاوەستم. قاچم لە کراسە درێژەکانم گیرا و بە جزمەکانەوە خلیسکام. یەکێك لە پیاوەکان خێرا فریاکەوت، منی گرتەوە، پێش ئەوەی بکەوم. منی ڕاگرت و پاشان باڵمی گرت و یارمەتیدام سەرکەوم. لە دوامەوە، یەکێك لە پیاوەکان مەهتابی لە کۆڵـگرتبوو. ئەو پەری هەوڵمدا بڕۆم، بەڵام بوومە هۆی خاوکردنەوەی هەموو کۆمەڵەکە بەهۆی کەوتن، خلیسکاند و قاچگیرانم لە کراسە درێژەکانم.

کاتێك گەیشتینە لوتکەی شاخەکە، بە مێشکی هیلاکم لێکمدایەوە، کە لەوانەیە ئەم شاخە هەرە بەرزە، سنوور بێت.

"تورکیا؟ تورکیا؟" لەو پیاوەم پرسیاری کە قۆڵی گرتبووم.

"ئێران، ئێران،" وەڵامیدایەوە.

بۆ چوونە خوارەوە، سواری ئەسپەکان بووینەوە. زۆری نەبرد، لەناو بەفرێکدا چەقین. هەر دوو دەستی ئەسپەکە چووە خوارەوە و قاچم کەوتە سەر بەفرەکە. پیاوەکان پڕیاندایە ئەسپەکە و ڕایانکێشا، تا کەوتەوە سەرپێی خۆی، دووبارە دەستمانکردەوە بە ڕۆیشتن.

کە گەیشتینە بنی شاخەکە، بەرەوڕووبووین لەگەڵ دەربەندێك، کە کەلێنێکی گەورە بوو ، ئەم شاخە و شاخەکەی بەرامبەری لەیەکتر جیادەکردەوە.

ڕێپیشاندەرەکەم لای لێکردمەوە و سەری هێنایە پێشەوە، تا دەموچاوی ببینم، ئینجا پەنجەیەکی خستە سەر لێوی. هەناسەم لە خۆم بڕی.

هەموو پیاوەکان بۆ چەند خولەکێك بێدەنگ ڕاوەستان. لە شاخەکاندا بەهۆی زەوی دەوروپشتەوە، ئێمە کەسمان دیارنەبووین. بەڵام لە دەربەندەکەدا سەکۆیەکی بەرزی تەخت دەبینرا، کە بەفر دایپۆشیبوو، بەهۆی ڕووناکی ئاسمانەوە ڕۆشنبووبۆوە. هەر کەسێك پیابڕۆشتایە، سێبەرەکەی بەسەر بەفرە سافە سپییەکەوە تەواو بەرچاو دەبوو.

دووبارە ڕێپیشاندەرەکەم هێمای بۆ کردم، بێدەنگبم.

سەرئەنجام، یەکێك لە پیاوەکان بە وریاییەوە کەوتەڕێ. تارمایی لەشیم دەبینی کە سەرکەوتە سەر سەکۆکە و ڕۆیشت. پاشان لە چاو ونبوو.

پاش چەند خولەکێك گەڕایەوە و بە گوێی موحسیندا چرپاندی، کە ئەویش بە دەوری خۆی پەیامەکەی بە ڕێپیشاندەرەکەم گەیاند. پاشان لەگەڵ من کەوتە قسە، کە بە ئاستەم دەمبیست.

"دەبێت یەکەیەکە بتانبەین،" بە فارسی بۆی باسکردم. "ڕێـگای دەوری دەربەندەکە زۆر باریکە، زۆر پڕمەترسییە. لە پێشدا تۆ دەبەین، پاشان کچەکەت."

موحسین ڕێـگاینەدا دەم بکەمەوە و لە پێشمانەوە دەرچوو. ڕێپیشاندەرەکەم لغاوی ئەسپەکەمی گرت و بە خێرایی و بێدەنگ، ڕێك دوای موحسین کەوت و مەهتابمان جێهێشت. ئومێدەواربووم، کە ئاگای لە ڕۆیشتنی من نەبێت.

چووینە سەر ڕێـگا سەکۆییەکە، بە پەلە ئەو دوورەییەی، کە تیادا دەردەکەوتین، بێورتە تێمانپەڕاند. زۆری نەبرد، گەیشتینە ڕاڕەوێك لە دامێنی شاخەکەدا، کە بە ئاستەم ئەسپەکەی پیادا دەڕۆیشت. تولەڕێیەکی سوهۆڵبەستوومان گرت بۆ خوارەوەی دەربەندەکە و پاشان بۆ سەر ڕێـگایەکی سەهۆڵی. ئەم پیاوانە بە کارەکەیان شارەزا بوون. بە دە خولەکێك لە دەربەندەکە پەڕینەوە.

ڕێپیشاندەرەکەم لەگەڵم مایەوە، کاتێك کە موحسین گەڕایەوە بۆ هێنانی مەهتاب. بە ترس و لەرزەوە بەسەر ئەسپەکەمەوە، چاوەڕوانی هاتنی مەهتابم دەکرد.

چاوم هەوڵیدەدا، ئەو تاریکاییە ببڕێت. بە قـــوربانتانبم خێراکەن، لە دڵی خۆمدا هاوارمدەکرد. دەترسام مەهتاب بزانێت، من ڕۆیشتووم و ئەو شێت بێت.

پاشان هات، لە باوەشی یەکێك لە پیاوەکاندا بوو، هەڵدەلەرزی، بەڵام وریا و بێدەنگ بوو.

ئینجا ڕێپیشانـدەرەکەم سەنجی ڕاکێشام. هێمای بۆ زەوییەکە کرد.

"تورکیـــــا! تورکیا!" بەچرپە وتی.

"ئۆخەیی!" ئاهێکم لێبەرزبۆوە. "زۆر سوپاس!"

سەرەڕای ساردییەکی لە ڕادەبەدەر، لەپڕ بۆ ساتێك هەستم بە گەرماییەکی خۆش کرد. ئێمە لە تورکیـــاین! لە دەرەوەی ئێـــران!

بەڵام جارێ دووربووین لە ڕزگارییەوە. ئەگەر پاسەوانانی سنووری تورکیا، ئێمەیان ببینیایە، وەك سنووربەزێنەرانێك، ئاسایی بەر تەقەیان دەداین. ئەگەر لەمەدا گیانمان بەدەربببردایە، ئەوا دەیانگرتین و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکردین. بەڵام ئەمزانی - ئاماهیلش دڵنیایکردبووم - کە پۆلیسی تورکیا، هەرگیز ئێمە ناگەڕێنێتەوە بۆ ئێران.

لەپڕ شتێکی نیگەرانکەر هات بە خەیاڵمدا. کاتێك کە لە کۆتایی دەربەندەکەدا، بۆ ماوەی بیست خولەکێك چاوەڕوانی مەهتاب بووم بیپەڕێتەوە، من گەیشتبوومە تورکیا، ئەو هێشتا لە ئێراندا بوو. زۆر باش بوو، لەو کاتەدا کە ئەمە ڕوویدا، ئاگادارنەبووم تا مەترسییەکە تێپەڕی.

هەستمكرد، سەرما گلۆڵەی كردووم. هێشتا بەسەر شاخەوە بووین، لەژێر بەزمیی باوبۆراندا. پەڕینەوەی هێڵێكی خەیاڵی سەر نەخشە، هیچ گەرماییەكی پێنەبەخشیم، كە وەك هەوا پێویستیم پێیبوو. چ نرخێك دەبێت بدەم، لە پێناوی ئازادیدا؟ هاتمە سەر ئەو باوەڕەی، كە هەندێك لە پەنجەكانی قاچم لەدەستدەدەم. ئومێدەواربووم، مەهتاب زۆر لە من باشتر بێت.

شاخێكی تریشمان هاتە پێش، ئەوەندە هەوراز بوو، سەركەوتن بە سواری ئەسپ مەحاڵ بوو. ئەم جارەیان كە خزام، ڕێپیشاندەرەكەم فریانەكەوت بمگرێتەوە، خراپ كەوتمە ناو بەفرەكەوە. ئەو و موحسین یارمەتیاندام، هەستامەوە سەر پێی خۆم و بە هەوڵی ئەوان كەوتمەوە ڕێ. ترس ئۆقرەی لێبڕیبووم. هەتا كەی ئەم ترسە بەردەوامدەبێت؟ بۆم پرسیاربوو. دڵنیابووم، ئێستا نا تۆزێكی تر دەڕوخێم.

ناوبەناو هەستمدەكرد، هۆشم لای خۆم نامێنێت. هەموو هۆشم لای ئەوە بوو، كە چۆن بەسەر ئەم شاخەی دێتەوە سەركەوم. ئینجا خۆمم دەبینیەوە، لە بەرەوخوارکەدا بەسەر ئەسپەكەوەم و هەوڵمدەدا بە جۆرێك وچانبدەم. پاشان دەمبینی بەسەر پێوەم و دووبارە لە هەوڵی ڕۆیشتندام، بەرەو لوتكەی شاخێكی تر.

"چەند شاخی ترمان ماوە؟" لە موحسینم پرسی.

*"نزیك،"* موحسین وەڵامیدایەوە. "نزیكین."

هەوڵمدا، دڵ بەو تۆزە زانیارییە خۆشكەم، بەڵام بۆ تۆزێك گەرمی و وچان خەریكبوو شێتدەبووم. ئایا شوێنێك هەبوو، پەنای بۆ بەرین و ئاهێكم تێگەرێت؟

سەرم بەرزكردەوە، تروسكایی كەوتبووە لوتكەی شاخەكەوە. ئایا ئەم شاخەیان بەرزتر و هەورازتر بوو، لە تەواوی ئەوانەی پیایدا هاتبووین، یان ئەوە لێكدانەوەی مێشكی هیلاكی من بوو؟

"ئەمەی لە پێشمانەوە، دواهەمین شاخە،" موحسین بەچرپە پێیوتم.

ئەم جارەیان كە لە ئەسپەكە كەوتمە خوارەوە، قاچم تەواو پەكیكەوتبوو. چەند لە بەفرەكەدا هەوڵمدا، بێمە سەر پێی خۆم نەمتوانی، هەتا بە یارمەتی دوو پیاوەكەشەوە. هەستم نەدەكرد هەتا قاچەكانم بە لەشمەوە ماوە یان نا. سەرەڕای ئەوەی كە چەند سارد بوو، بەڵام هەستمدەكرد، دەسووتێـــم.

*"دە دەقیقە،"* ڕێپیشاندەرەكەم هێمای بۆپێشەوە بۆ كردم و وتی. "دە خولەك."

"تكاتلێدەكـــەم،" پاڕامەوە لێی. "ڕێــگامبدە با وچانێك بدەم."

بەڵام ڕێــگای پێنـــــەدام.

لەسەر پێی خۆم ڕایوەستاندم و بۆ پێشەوە كێشیكردم. بەڵام قاچێكم لەسەر سەهۆڵەكە وا خراپ خلیسكا، لە دەستی ڕێپیشاندەرەكەشم ترازام بۆ دواوە و كەوتمە خوارەوە، بۆ ماوەی چەند مەترێك تلمدا، تا بێدەسەڵاتانە لە جوڵە كەوتم.

ڕێپیشاندەرەكەم گەیشتە سەرم.

"ئیتر ناتوانـــم،" بە نرکەنرك وتم.

رێپیشاندەرەکە بە ورتە داوای یارمەتیکرد و موحسین هات.

"مەهتاب،" بەچرپە وتم. "مەهتاب لە کوێیە؟"

"زۆر باشە. بە باوەشی پیاوەکانەوەیە."

موحسین و پیاوەکەی تر ڕاستیانکردمەوە. هەردووکیان دەستیاندایە باڵم و لە بەفرەکە بەرزیانـکردمەوە. بێورتە منیان ڕاکێشا بەسەر هەورازەکەدا. لە دوای خۆمەوە، قاچە پککەوتووەکانم دوو هێڵیان بەسەر بەفرەکەوە دروستکرد.

هەرچەند بارێکی قورس بووم، بەڵام پیاوەکان بە ئاسانی منیان بردەسەرەوە، هەتا هەناسەبڕکێیان پێنەکەوت.

چەند جارێك ڕاوەستان و هەوڵیاندا، بکەومەوە سەر پێی خۆم. هەموو جارێك یەکسەر ئەژنۆم دەنوشتایەوە و دەبوو خێرا بمگرن، بۆئەوەی نەکەوم.

"تکاتانلێدەکەم،" دەستمکرد بە گریان. "با وچانێك بدەم!"

بێچارەیی لە دەنگمدا، زەنگێکی ترسناك بوو لە گوێی موحسیندا. یارمەتیدام، ڕێك پاڵکەوم لەسەر بەفرەکە و دەستە تەزیوەکەی خستە سەر بڕۆم، تا بزانێت تام هەیە. دیمەنی دەموچاوی - ئەوەی دەمتوانی ببینم - نیشانەیەك بوو، لە هاودەردی و پەرێشانی.

"ناتوانم بڕۆم،" بەدەم هەنسکدانەوە وتم. هاتبوومە سەر ئەو باوەڕەی، کە ئیمشەو دەمرم. ئەمدەکێشا، بەڵام مەهتابم لە ئێران هێنابووە دەرەوە. ڕزگاریی ئەو، هەر ئیمڕۆ و سبەێنێ بوو.

منیش هەر ئەوەندەم بەس بوو.

"جێمبهێڵـــە،" بە موحسین وت. "لەگەڵ مەهتاب برۆ. سبەینێ وەرەوە بە شوێن مندا."

"نــــا!" موحسین بە قایم نەڕاندی.

نەڕەکەی موحسین ئەوەندە قایم بوو، هەتا ئەگەر زللەیەکی لێبدامایە، هەر ئەوەندە شەرمم لە خۆم دەکرد. باشە دەی چۆن بتوانم بڕۆم؟ سەرکۆنەی خۆمم کرد. دەمێك بوو چاوەڕوانی ئەم ڕۆژەم دەکرد، دەبێت هەر بڕۆم.

"باشە،" لەژێر لێوەوە وتم.

بەڵام هێزم تیادا نەمابوو، نەمدەتوانی بجوڵێـــم.

لەجیاتی من، پیاوەکان هێزیاندایە خۆیان و کەوتنە جوڵە. جارێکی تر، خستمیانەوە سەر پێی خۆم و بە سەر هاورازەکەدا کێشیانکردم. لە هەندێك شوێندا، قاچی پیاوەکان بە بەفرەکەدا دەچووە خوارەوە بۆ سەر ئەژنۆیان. لە خۆیان دڵنیابوون، لەگەڵ ئەوەی زووزوو دەکەوتن، بەڵام دەستیان هەڵنەدەگرت. هەر جارێك دەکەوتن، بەبێ ئەوەی ورتە لە دەمیان بێتە دەرەوە، هەڵدەستانەوە و باڵیان دەگرتم و ڕایاندەکێشام.

دنیام لەبەرچاو ونبوو. لەوەدەچوو هۆشم لای خۆم نەمابێت.

وەك ئەوەی چەند ساڵێك تێپەریبێت، بەناستەم گوێم لە دەنگێك بوو، "مـــــامـــــــی!" مەهتاب بوو، لە تەنیشتم ڕاوەستابوو. گەیشتبووینە سەر لوتکەی شاخەکە.

"ئیستا ئیتر دەتوانیت، باقی ڕێـگاکە سواری ئەسپ بیت،" موحسین وتی.

موحسین دەستێکی خستە ژێر سمتم و دەستکەی تری خستە ژێر قاچم، پیاوەکەی تریش هەمان شتی کرد. پێکەوە لەشی تەزیوی ڕەقبووەوەی منیان بەرزکردەوە، لە دواوە خستمیانە سەر پشتی ئەسپەکە.

هەرچی چۆنێك بوو، بەسەر ئەسپەکەوە مامەوە، تا لە شاخەکە هاتینە خوارەوە. دنیا تاریك بوو، بەڵام دەمزانی، دەبێت بەرەبەیان نزیکبووبێتەوە. بەناستەم دەموچاوی موحسینم دەبینی، کاتێك کە لە تەنیشتم ڕاوەستا و پەنجەی بۆ شوێنێکی زۆر دوور ڕاکێشا، تا تروسکاییەکەم بینی. "ئێمـــە بۆ ئەو شوێنە دەچین،" وتـی. هیچ نەبێت، لە پەناگایەك نزیکبووینەوە. ئەو پەڕی هەوڵمدا، لە دوا فرسەخی شەوێکی درێژی لەباسنەهاتوو، خۆم بەسەر کورتانی ئەسپەکەوە ڕاگرم.

بۆ زیاتر لە دە خولەکێکمان پێچوو، کە دەنگی وەڕینی سەگ هاتەگوێم، کە گەیشتنی ئێمەی ڕادەگەیاند. زۆری نەبرد، نزیکبووینەوە لە خانوویەك، کە شاخ لە هەموو لایەکەوە دەوریدابوو. کـۆمەڵێك پیاو هاتبوونە دەرەوە بۆ پێشی حەوشەکە، دیاربوو چاوەڕوانی هاتنی ئێمەیان دەکرد. کە زیاتر نزیکبووینەوە، بینیم خانوویەکە هەر بە ئەندازەی کوخێك دەبێت، زیاتر شوێنێك بوو بۆ وچانی قاچاغچییەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیا.

پیاوەکانی بەردەم خانووەکە، بە زەردەخەنەوە پێشوازیان لە کۆمەڵەکەی ئێمە کرد و بە شادییەوە قسەوباسیان دامەزراند. موحسین و پیاوەکانی تریان کێشکرد و پیرۆزباییان لێکردن، بە بۆنەی سەرکەوتنیان لە کارەکەیاندا. ئەو پیاوەی کە بەسەر ئەسپێکەوە لەگەڵ مەهتاب بوو، هاتە خوارەوە و مەهتابی بەهێواشی داگرت و ڕۆیشت و پەیوەستبوو بەو سوکە ئاهەنگەوە. بەبێ یارمەتی ئەمدەتوانی قاچ هەڵبهێنمەوە بەسەر ئەسپەکەدا، دەستم بەردا و خۆم خزانـدە خوارەوە، بەڵام کەوتمە خوارەوە بۆ سەر زەوییە کۆنکرێتە ڕەقەکە. جوڵەم لێبڕابوو. مەهتاب ڕایکرد بۆ یارمەتیدانم، بەڵام پیاوەکان - هەتا بە موحسینیشەوە - لەو دەچوو ئێمەیان لەبیرچووبێتەوە. هەندێکیان ئەسپەکانیان برد و هەندێکی تریان لە سەرماندا چوونە ژوورەوە.

بەو تۆزە هێزەی پێمابوو، خۆم خستەوە سەردەم و هەوڵمدا، بە هەر دوو باڵم، قاچە پککەوتووەکانم بەدوای خۆمدا ڕاکێشم. مەهتاب هەوڵیدا، ڕامکێشێت. هەر دوو ئەنیشکەم بەسەر کۆنکرێتە ڕەقە ساردەکەدا دەخشا. چاوم لە ڕێڕەوی دەرگاکە بڕیبوو.

هەرچی چۆنێك بوو، خۆم لە دەرگاکە نزیککردەوە. ئینجا موحسین، سەرنجی دۆخی نالەبارمی دا. ئەو و پیاوێکی تر منیان ڕاکێشایە ناو خانووە بچکۆلەکەوە. لەتاو ئازار

هاوارم لێهەڵسا، کاتێك موحسین جزمەکانی لە قاچە بەستووەکانمی داکەنی. پیاوەکان من و مەهتابیان هەڵگرت بۆ ناو ژوورەکە، بۆ بەردەمی موغەیرییە گەرمەکە.

چەند خولەکی برد، تا توانیم ماسولکەیەك بجوڵێنم. تەواو نارام کەوتم، هەوڵمدا خۆم گەرمبکەمەوە.

گەرماییەکە دەرمانێکی کاریگەری هێواش بوو، وردەوردە گیانی بەبەرداکردمەوە. توانیـــــم زەردەخەنەیەك بۆ مەهتاب بـــکەم. خۆمان دەربازکرد! ئێمـــە لە تورکیاین!

کە تەواو هاتمەوە سەرخۆ، لە دەوروپشتم وردبوومەوە، بۆ جارێکی تر ترس دایگرتمەوە. ماڵەکە پڕیبوو لە پیاو. بێجگە لە من و مەهتاب، ئەوەی لە دەوری موغەیرییەکە کۆبووبۆوە، هەموویان پیاو بوون. ڕاست بوو لە تورکیا بووین، بەڵام لەژێر بەزەیی دەستەیەك لە قاچاغچییانی یاسانەناسدا بووین. دەکرێت ئەم پیاوانە، ئەم ڕێـگا دوورودرێژە ئێمەیان هێنابێت، بۆئەوەی توشی مەترسیمان بکەن؟ ئایا موحسین ئەوەی لەدەستدێت؟

لەوانەیە یەکێك لە پیاوەکان، ئەم ترسەی لە دەموچاومدا بەدیکردبێت، کە وا چای بۆ من و مەهتاب هێنا. وەك شێوەی ئێرانی، چەند کڵۆ شەکرم خستە دەممەوە و قومم لە چاکە دا. ئاسایی حەزم لە شەکر نەبوو بیکەمە ناو چاوە، بەڵام پێویستیم بە وزە بوو. مەهتابیشم هاندا، بە چاکەیەوە شەکری زۆر بخوات.

ئاهێکمان تێگەڕا.

نزیکەی کاژێرێکم پێچوو، تا هەستمکرد، دەتوانم بە ڕێـگادا بڕۆم. بە زەحمەت هەنگاوم دەنا.

کە موحسین ئەمەی بینی، هێمای بۆ من و مەهتاب کرد، دوایکەوین بۆ دەرەوە. دیسانەوە بەرەوڕووبووین لەگەڵ هەوای ساردی بەرەبەیان، موحسین ئێمەی بە دەوری خانووەکەدا برد بۆ حەوشەی دواوە، کە لەوێ خانوویەکی بچوکی تیادا بوو.

خۆمان کرد بە ژوورێکدا پڕیبوو لە ژن و منداڵ، هەندێکیان گفتوگۆیان بوو، هەندێکی تریان باتانییان بە خۆیاندا دابوو، لە شیرینەخەودا بوون.

هەرکە گەیشتین، ژنێك بە پەرۆشەوە پێشوازیلێکردین، چەند کراسی کوردی بەسەریکەوە لەبەردابوو. موحسین بە فارسی وتی، "ئەمە خوشکمە."

موحسین داری تری خستە ناو موغەیریی ژوورەکەوە. "بەیانی دەتانبەین بۆ وان،" وتی. پاشان جێیهێشتین و گەڕایەوە بۆ لای پیاوەکان.

وان، دواشوێنی قاچاغچییەکان بوو، کە بمانگەیەنن. پاش ئەوەی دەگەیشتینە ئەوێ، ئیتر بەرپرسایەتی دەکەوتە ئەستۆی خۆمان، کە سەفەرەکە تەواوبکەین.

خوشکەکەی موحسین جێگایەکی بۆ کردینەوە لە تەنیشت دیوارەکە و بەدوور لە موغەیرییەکە و باتانی ئەستوری زۆری پێداداین.

ماڵەکە سارد و شێدار بوو. من و مەهتاب لەژێر بەتانییەکانەوە باوەشمان بەیەکتریدا کرد.

"ئێمە لە تورکیاین. ئێمە لە تورکیاین." وەك خەرەك بۆ مەهتابم دەوتەوە. "دەتـــوانی باوەڕبکەیت؟"

قایم خۆی پێوە نوساندم، تا چووە قوڵایی خەوەوە. زۆر جوان بوو لە باوەشمدا و هەوڵمدا لەو نوستنە ئارامەی خۆشی ببینم. مێشکم هێشتا وزەوزی لێوەدەهات. هەموو گیانم ژانیدەکرد. برسێتی وشکیکردبوومەوە. ئەو چەند کاژێرە، خەوێکی پچڕپچڕم هەبوو. زۆربەی کاتەکەم بە ویردخوێندنەوە بردەسەر، کە بێکێشە بگەینە ماڵەوە.

تەواو مت و لە نیوەهۆشدا بووم، کە موحسین کاتژمێری هەشتی بەیانی هات بە شوێنماندا. وا دەردەکەوت، تەنیا بەو چەند کاژێر نوستنە هاتبێتەوە سەرخۆی. مەهتاب بە خاوەخاو لە خەوهەڵسا، تا بیریکەوتەوە کە لەناو تورکیادایە. پاشان خۆی گورجکردەوە و ئامادەی ڕۆیشتنبوو.

بە جۆرێك هاتبوومەوە سەرخۆم. لە تورکیادا بووین. مەهتابم لەگەڵ بوو. وام هەستدەکرد، هەموو لەشم دارکاریکراوە، بەڵام هەست گەڕابۆوە بۆ پەنجەکانی دەست و قاچم. منیش ئامادەی ڕۆیشتنبووم. موحسین ئێمەی برد بۆ لای ماشێنێکی بارهەڵگر، کە تا ئاستێك تازە و تایەکانی زنجیری لێبەسترابوون. یەکێك لە قاچاغچییەکان چووە پشتی سوکانەوە و ئێمەش سواربووین.

بە ڕێـگایەکی پێچاوپێچی باریکی قەدپاڵی شاخێکدا کەوتینەڕێ، کە هیچ پەرژینێکی نەبوو، بۆ بەرگری لە کەوتنە خوارەوە. بەڵام شوفێرەکە لێهاتوو بوو، هەروەها تایە زنجیرکراوەکانی ماشێنەکە، باش ڕێـگاکەی دەگرت. چووینە خوارەوە زیاتر و زیاتر بۆ ناو تورکیا، بەدوور لە ئێران.

لە چەند خولەکێکدا لاماندایە خانوویەکی جوتیاری، کە لە قەدپاڵی شاخێکدا بیناکرابوو، هێمامان بۆ کرا، بچینە ژوورەوە، کە لەوێ بۆ نانخواردنی بەیانی، نان، چا و پەنیری سوێرخوێی زۆریان بۆ ئامادەکردبووین. لەگەڵ ئەوەی برسیم بوو، کەمێکم بۆ خورا. بەڵام هەرچی چۆنێك بوو، چەند توانیم، شەکرم کردە پیاڵە چاکەمەوە و خواردمەوە.

ژنێك پەرداخێك شیری بزنی گەرمی بۆ مەهتاب هێنا. مەهتاب تامیکرد، بەڵام چاکەی پێباشتر بوو.

ژنێکی قەڵەوی گەورەی ددانکەوتوو، کە ژیانی سەختی شاخ چرچیکردبوو، دەرکەوت. لەوەدەچوو، تەمەنی نزیك هەشتا ساڵ بێت.جلی کوردی تایبەت بە تورکیای بۆ من و مەهتاب هێنا و لەبەریکردین.

بۆ ماوەیەك هەروا بێکار دانیشتین، خەریکبوو ئۆقرەم لێدەبڕا. لە یەکێکم پرسی، چاوەڕوانی چی دەکەین، لە وەڵامدا وتی، موحسین چووە بۆ "شار" بۆ هێنانی ئوتومبیل.

هەروەها تێگەیشتم، کە ئەو ژنە قەڵەوە، کە یارمەتی لەبەرکردنی جلی داین، دایکی موحسینە. ژنەکەشی هەر لێرە بوو. ئەمەش وەڵامی پرسیارێك بوو. موحسین تورك بوو، نەك ئێرانی. بەڵام لە ڕاستیدا هیچیان نەبوو. ئەو کورد بوو، دانیشتوانی بە سەرومری ئەو سنوورەی کە دوێنێ بڕیبوومان.

بە گەیشتنی موحسین، جموجۆڵ کەوتە ماڵەکەوە. بەستەیەك کە لە ڕۆژنامەوە پێچرابوو، دایە دەستم و ئێمەی برد بەرەو ئوتومبیلێك. خێرا بەستەکەم خستە ناو جانتاکەمەوە و ئاوڕم لە دایکی دایەوە و سوپاسمکرد بۆ میواندارێتییەکەی، بەڵام بۆ سەرسامی من، پێشمانکەوت بۆ کورسی دواوەی ئوتومبیلەکە و هێمای بۆ ئێمەش کرد، لە تەنیشتی دانیشین.

شوفێرەکە سوار بوو، کوڕێکی منداڵ لە کورسییەکەی تەنیشتیەوە دانیشت. وەك خێزانێکی نمونەیی کوردی تورکیا، کەوتینەڕێ بەناو لادێ شاخاوییەکاندا. قەبارەی گەورەیی دایکی موحسین، مەهتابی لە تەنیشت خۆیەوە شاردبۆوە. لەوانەیە ئەوە بە مەبەست بووبێت. دایکی موحسین کەیفیدەکرد، لە خێرایی دڵداخورپێنەری ئوتومبیلەکەمان بەو شاخەوە بۆ خوارەوە، بە خۆشییەوە جەگەرەی تیژی تورکی بەبادەکرد.

لە بنی شاخێکدا شوفێرەکەمان هێواشیکردەوە. بەربەستی پشکنین لە پێشمانەوە دەرکەوت. گـــرژبووم. سەربازێکی تورك تەماشایەکی ناو ئوتومبیلەکەی کرد، چەند قسەیەکی لەگەڵ شوفێرەکە کرد و تەماشای پێناسنامەکەی کرد، بەڵام لە ئێمەی نەپرسی. دایکی موحسین پڕ بە سییەکانی دووکەڵی کرد بە چڕوچاویدا. سەربازەکە هێمای بۆ کردین بڕۆین.

کەوتینەوە ڕێ، چووینە سەر ڕێـگایەکی پانی قیرتاو بەسەر دەشتێکی بەرزەوە. نزیکەی هەر بیست خولەکێك، لەبەردەمی خاڵێکی پشکنیندا دەوەستاین. هەموو جارێك ترس دایدەگرتم، بەڵام بەئاسانی تێماندەپەڕاند. دایکی موحسین باش ئێمەی گۆڕیبوو.

جارێکیان لاماندایە قەراغ ڕێـگاکە، کە ڕێـگایەکی بچوکی لێدەبۆوە، بۆ دێیەکی دووری بچوکی چەند ماڵی. کوڕە منداڵەکە هاتە خوارەوە و ملی ئەو ڕێـگایەی گرت.

کەوتینەوەڕێ بەرەو وان.

بیرمکەوتەوە، خۆ من نە ماڵئاواییم لە موحسین کرد نە سوپاس، کاتێك کە لە ماڵە جوتیارییەکە لە یەکتری جیابووینەوە و کەوتینەوە ڕێ. هەستم بە قەرزارباریدەکرد.

پاشان هاتەوە خەیاڵم، کە بەستەیەکی بە من داوە و بەبێ ئەوەی تەماشایبکەم، خستوومەتە ناو جانتاکەمەوە. بەستەکەم دەرهێنا و ڕۆژنامەکەم لێکردەوە، بینیم پاسپۆرتەکان، پارە و گەوهەرەکانی تیادایە. لەگەڵ هەموو دۆلارە ئەمریکییەکان و ریاڵە ئێرانییەکان، کە کرابوو، بە چەند سەفتەی ئەستوری لیرەی تورکی. موحسین هەموو شتێکی بۆگەڕانبوومەوە ئەدیا ملوانەکە ئالتونییەکەم نەبێت. کۆتاییەکی سەرنجڕاکێش

بوو، بۆ یەکتر بینینێکی کورتی نامۆی دوو ئینسان. پارە و گەوهەر، ئیتر بۆ من دەورێکی نەمابوو. لەوانەیە موحسین وای دانابێت، کە ملوانکەیەکی ئاڵتونی پاداشتێکی گونجاو بێت بۆ ئەو هەوڵانەی داوێتی. بەڵام موحسین ژیانی منی - بە مەهتابیشەوە - سەرلەنوێ نوسییەوە.

جارێکی تریش لە قەراغی ڕێگاکە ڕاوەستاین، کە ڕێگایەکی لێدەبۆوە بۆ دێیەك. دایکی موحسین بە جگەرەکەی جگەرەیەکی تری داگیرساند و فومێکی لێدا و لە ئوتومبیلەکە چووە خوارەوە. بەبێ ماڵئاوایی، ئەویش لێیدا ڕۆیشت.

ئیتر تەنیا ئێمە ماینەوە لەگەڵ شوفێرەکە بەرەو وان.

پاشان شوفێرەکە، لە ناوچەیەکی چۆڵی سەر ڕێگاکەمان، لایدایە قەراغ و هێمای بۆ کردین، ئەو کراسانەی کە بەسەر جلەکانماندا لەبەرمانکردووە، دایانکەنین. جلە کوردییەکانمان داکەنی و بەس جلە ئەمرکییەکانمان لەبەردا مایەوە. بووین بە گەشتیارانێکی ئەمریکی، بەڵام پاسپۆرتەکانمان مۆری هاتنە ژوورەوەی پێوە نەبوو.

کە کەوتینەوە ڕێ، بینیم دێکان تا دێن، گەورەتر و زۆرتر دەبن. زۆری نەبرد لە وان نزیکبووینەوە.

"فرۆکەخانە،" هەوڵمدا لە شوفێرەکەی بگەیەنم. مەهتاب دروست وشە فارسییەکەی پێوت، کابرا گەشایەوە کە تێگەیشت، دەڵێم چی. لەبەردەمی نوسینگەیەکدا، کە پەنجەرەکانی پۆستەری سەفەری پێوە بوو، ڕاوەستا و هێمای بۆ ئێمە کرد، کە لە ناو ئوتومبیلەکەدا بمێنینەوە، کاتێك خۆی چووە خوارەوە. پاش چەند خولەکێك گەڕایەوە و بەهۆی وەرگێڕانی مەهتابەوە، تێیگەیاندم، کە پاش دوو ڕۆژی تر فڕۆکەیان هەیە بۆ ئەنکارا.

ئەوە بۆ ئێمە زۆر دووربوو. دەبوو زوو خۆمان بگەیەنینە ئانکارا، پێش ئەوەی بەر لێپرسینەوەی پۆلیس بکەوین.

"پــــاس؟" پرسیارملێکرد.

شوفێرەکە تێنەگەیشت.

"ئۆتۆبوس؟"

"ئـــــا،" شوفێرەکە ناهێکی لێبەرزبۆوە، کە تێگەیشت. بە خۆشییەوە سواری ئوتومبیلەکەی بووەوە و شریخەی لە شەقامەکانی وان هەڵدەساند تا گەیشتینە وێستگەی پاس. دووبارە هێمای بۆ کردین لەناو ئوتومبیلەکەدا بمێنینەوە. چووە ژوورەوە و پاش چەند خولەکێك گەڕایەوە و وتی، "لیــــرە؟"

سەفتەیەك پارەم لە جانتاکەم دەرهێنا و دامەدەستی. چەند پارچەیەکی لێهەڵبژارد و ڕۆیشت. زۆری نەبرد گەڕایەوە، زەردەخەنەیەکی بۆ کردین و بلیتەکانی ئانکارای ڕاوەشاند. بە فارسی کەوتە قسەکردن لەگەڵ مەهتاب.

"دەڵێت پاسەکە کاتژمێری چوار دەڕوات،" مەهتاب وتی. بۆ سبەینێ نیوەڕۆ ئینجا دەگەیشتینە ئانکارا.

سەیرێکی کاتژمێرەکەمم کرد، کاتژمێری یەك بوو. ئەمدەویست ئەو سێ کاژێرە لە وێستگەی پاسەکە بەسەربەرم، هەروەها ویستم وچانێك بەخۆم بدەم، مادەم ئەوەند لە ڕزگارییەوە نزیکبووینەتەوە. ئەو وشەیەی کە دەمزانی لە مێشکی مەهتابدا دەخولێتەوە، دەرمبڕی.

*"غەزا"* پەنجەم خستە ناو دەممەوە و وتم. "خواردن." لەو کاتەوەی، کە ماڵە پەناگاکەمان جێهێشتبوو لە تاران، تەنیا نانی وشك و گوڵەبەڕۆژەمان خواردبوو، چاشمان کردبوو بەسەریدا.

شوفێرەکە سەیرێکی ئەو ناوەی کرد و هێمای بۆ کردین دوایبکەوین. بردینی بەرەو ڕێستورانێکی نزیك و پێشمانکەوت بۆ ژوورەوە. پاشان، کاتێك کە دانیشتین، هەر دوو دەستی دا بە یەکدا و وتی *"تەمام، تەمام."* "کاری من تەواو."

ئەو پەڕی سوپاسمانکرد بۆ کارێك، کە لەگەڵمان کردبووی. خەریکبوو بگری، کاتێك جێیهێشتین.

لە وڵاتێکی نامۆ، لە پێڕستێکی نامۆ خواردنێکی نامۆمان هەڵبژارد، من و مەهتاب دڵنیانەبووین، چی دێتە بەردەمان. سەرسامبووین، کە خواردنێکی خۆشی وەك مریشکی برژاو و برنجیان بۆ دانایین. زۆر بەتام بوو.

بەسەر خواردنەکەوە زۆر ماینەوە، تا هەموویمان تەواوکرد، کاتمان دەبردەسەر و بە خۆشییەوە لەبارەی ئەمریکاوە قسەماندەکرد. بۆ خۆم پەرێشانی باوکم بووم. تێربوووبووم، بەڵام تەواو برسی هەواڵی خێزانەکەمان بووم.

مەهتاب لەپڕ تریقایەوە. "ئــۆی!" وتی. "ئەوە پیاوەکەیە، کە یامەتیدایین."

سەرم هەڵبڕی، بینیم شوفێرەکەمان بەرەوڕووی ئێمە دێت. دانیشت و داوای خواردن و چای کرد بۆ خۆی.

دیاربوو هەستیکردبوو، هەڵەی کردووە، کەوا ئێمەی جێهێشتووە، پێش ئەوەی بە سەلامەتی بچینە ناو پاسەکەوە.

لە کۆتاییدا هەر سێکمان پێکەوە چووین بۆ وێستگەی پاسەکە. لەوێ شوفێرەکەمان پیاوێکی تورکی دۆزییەوە، ڕەنگە بەڕێوەبەری وێستگەکە بووبێت، لەگەڵی لەبارەی ئێمەوە دووا. پیاوەکە بە گەرمییەوە بەخێرهاتنیکردین. بۆ جارێکی تر شوفێرەکەمان وتی. *"تەمام، تەمام."* بۆ جارێکی تر فرمێسك لە چاویدا قەتیسما. ڕۆیشت و ئێمەی لەلای پیاوەکە جێهێشت.

پیاوەکە فەرمووی دانیشتنی لێکردین، لە نزیکی موغەیرییەکەوە. کوڕێکی نزیك تەمەن دە ساڵ، چای بۆ هێنایین. دانیشتین و چاوەڕوانی کاتی دەرچوونی پاسەکەمان کرد.

کە کاتژمێری چوار نزیکبۆوە، پیاوە تورکەکە هات بۆ لامان.

"پاسپۆرت؟" داوایلێکردم.

دڵم داخورپا. هەروا تەماشامکرد، خۆم وا پیشاندا کە تێناگەم.

"پاسپۆرت؟" دووبارەیکردەوە.

جانتاکەمم کردەوە و بە نابەدڵانە پاسپۆرتەکانم بەرزکردەوە، بیدەمەدەستی. کەچی سەری بەخێرایی لەقاند و لەپی دەستی بەرزکردەوە، بۆئەوەی بموەستێنێت. کە چوو بۆ لای ڕێبوارەکانی تر، پێناسنامەکانیانی دەپشکنی، هەوڵمدا لە هەڵسوکەوتی ئەم پیاوە تێبگەم لەگەڵ ئێمە. دیاربوو کاری ئەوە بوو، لە پێناسنامەی هەموو ڕێبوارەکان وردبێتەوە. زانی پاسپۆرتمان پێیە، بەڵام نەیویست لەوە زیاتر بزانێت. شوفێرەکەمان چی پێوتووە؟ بۆم جێگای پرسیاربوو.

هێشتا ئێمە ڕاکەڕاکەمان بوو لەناو جیهانی پەیوەندیە نهێنییەکاندا، جیهانی سنوور و پێناسنامە، جیهانی بەچرپە قسەکردن و بەسەرلەقاندن تێگەیشتن.

پەیامێك بە بڵندگۆوە درا و من تەنها وشەی "ئانکارا"کەی لێتێگەیشتم، لەبەرئەوە هەستاین و دوای ڕێبوارەکانی تر کەوتین، بۆ ناو پاسێکی نوێباوی نێوانشاران، کە زۆر لە گرنیهۆند دەچوو.

دوو کورسیمان لە دواوەی پاسەکە، لە ڕیزی چەپەوە هەڵبژارد و دانیشتین. کۆمەڵێك ڕێبوار جێگای خۆیان گرت، کۆمەڵێکی تریش خەریکبوون سەردەکەوتنە سەرەوە و زۆری نەبرد پاسەکە پڕبوو. مۆتۆری پاسەکە کەوتەکار و پاسەکە گەرمبوو.

سەفەرێکی بیست کاژێری پاس بۆ ئانکارا، تەنیا ماوەی نێوان ئێمە و ڕزگاری بوو.

لە چەند خولەکدا کەوتینە دەرەوەی شار و ڕێگای پێچاوپێچی شاخاوی سەهۆڵبەستوومان گرت. جاروبار پاسەکەمان لە شوێنە پێچاوپێچەکانی نێو ڕێگاکەدا، کە هیچ پەرژینێکی پارێزگاری نەبوو، دەخزا و خەریکبوو دەکەوتە خوارەوە. ئەی هاوار، لە دڵی خۆمدا وتم، ئێمە ئەم هەموو ڕێگایە هاتووین، بۆئەوەی لەم بەرزاییانەوە بکەوینە خوارەوە.

ئینجا هەستم بە هیلاکی دەکرد. هەموو لەشم ژانیدەکرد، کەلەپوری پەڕینەوەی سنوور تازە دەردەکەوت و نەیدەهێشت بنوم. هەرچی چۆنێك بوو، ناوبەناو ئاگام لە خۆم نەدەما. هێشتا وریای خۆم بووم و دەترسام، بەڵام خەوم بە ڕۆژی دواییەوە دەبینی.

لە نیوەشەوی تارکونوتەکدا، لە تەکانێکی قایمی پاسەکە بە ئاگاهاتمەوە. شۆفێرەکە لەپڕ قاچی لە برێك قایمکردبوو، پاسەکە بۆ ماوەیەك خزا تا گیرسایەوە. باوبۆرانێکی زۆر بوو. چەند پاس لەبەردەماندا ڕاوەستابوون. لە پێشمانەوە، لە کەوانەی ڕێگاکەدا بەفرێکی زۆر کۆبووبۆوە. پاسێك یا دووان ویستبوویان پیابڕۆن، بەڵام چەقیبوون و ڕێگاکەیان گرتبوو.

چەند خانوویەکی وەك هوتێل یان ڕێستورانم لێوە دیاربوو. هەندێك لە ڕێبوارەکان، کە بینیان چاوەڕوانی زۆر درێژدەدەکێشێت، چوونە خواردوە بەرەو ئەو چەند دامەزراوە بۆ وچاندان.

مەهتاب لە تەنیشتمەوە قوڵ خەوتبوو، بەچاوی خەواڵوودوە، دیمەنی زستانم لە پەنجەرەکەوە لێدیاربوو. دیسانەوە خەو دایگرتمەوە.

لەو کاژێرانەدا ناوبەناو بە ناگادەهاتمەوە. جارێکیان لە سەرماندا بە تەواوی خەبەرمبۆوە، پاسەکە گەرماکەی گوژانبۆوە، بەڵام ئەوەندە هیلاك بووم نەجوڵام. زوو خەوم لێکەوتەوە.

نزیکی تاریکوڕوون بوو، کە ئەم جارەیان خەبەرم بۆوە لە گرمەگرمی بەفرپاکەرەوە، ڕێگاکەی پێشمانەوەی پاکدەکردەوە. مەهتاب لە تەنیشتمەوە دەلەرزی، بەڵام هێشتا نووستبوو.

سەرئەنجام پاش شەش کاژێر دواکەوتن، پاسەکەمان کەوتەوەڕێ.

مەهتاب کەوتە جوڵەجوڵ. بەخەبەربۆوە و چاوی خۆی هەڵگلۆفت و بۆ ساتێك لە پەنجەرەکەوە تەماشای دەرەوەی کرد، پێش ئەوەی بیریبکەوێتەوە ئێمە لە کوێین. وەك هەر منداڵێك لە کاتی سەفەردا، ئەو پرسیارەی هات بە خەیاڵدا: "مـــــــامی، کەی دەگەین؟"

بۆم باسکرد، کە چەند دواکەوتووین. "درەنگ دەگەینە ئەوێ،" ئاگادارمکردەوە.

پاسەکەمان بەناو باوبۆراندا بۆ چەند کاژێر بەو پەڕی خێراییەوە ڕۆیشت. بۆئەوەی نەچەقێت. زۆر ترسام، کە بینیم شوفێرەکە هەوڵەدا زیاتر گوڕبداتە خۆی. لەهەر کەوانەیەکی ڕێگا شاخاوییە بەستۆکەکەدا، دڵنیابووم دەکەوینە خوارەوە. لەوەدەچوو مەحاڵ بێت، پاسەکە لە ڕێگای خۆ دەرنەچێت. چەند ناژیرانەیە بەم شێوەیە لەناوبچیت؟

دوانیوەڕۆیەکی درەنگ پاسەکەمان وەستا و کارەساتمان بەچاوی خۆمان بینی. جموجۆڵێکی زۆر هەبوو لە پێشمانەوە، کە پاسەکەمان وردەوردە چووە پێشەوە، بینیمان چ ڕووداوێکی ترسناك ڕوویداوە. بەلایەنی کەمەوە نیو دەرزن پاس لە هەوڵی ئەوەدا بوون، بە کەوانەی ڕێگایەکی بەستووی باریکدا بڕۆن. ڕێبوارانی بریندار دەمبەهاوار، هەروا لەسەر بەفرەکە کەوتبوون. ئەوانەی کە بێئازار دەرچووبوون، خەریکی یارمەتیدانی ئازارپێگەیشتووەکان بوون. سکم تێکچوو.

شوفێرەکەمان دەبوو بۆ ماوەیەك ڕاوەستێ، تا بتوانێت بە مەیدانی ڕووداوەکەدا دەوربداتەوە و دەرچێت. هەوڵمدا تەماشاینەکەم. بەڵام خۆم پێڕانەگیرا.

باوەڕنەکراوانە، هەرکە لە ڕووداوەکە دوورکەوتینەوە، شوفێرەکەمان دیسانەوە قاچی لە بەنزین توندکرد. ئەی هاوار، هەر بە سەلامەتی بگەینە ئانکارا، لە دڵی خۆمدا وتم.

جارێکی تر تاریکیکردەوە - پێماننایە شەوی دووەمەوە، کە بڕیاربوو سەفەرەکەمان بیست کاژێری پێبچێت. پرسیارەکەی مەهتابم لە خۆم کرد: کـــەی دەگەین؟

بێئارام و نیگەران خەو دەهات و دەڕۆیشت. خۆم دەجوڵاند لەشم ژانیدەکرد، نەدەجوڵام هەر ژانیدەکرد. هەرچی ماسولکە بە گیانمەوە بوو زریکەزریکیبوو. لە کورسییەکەمدا هەر ئەمدیوا و ئەودیوم دەکرد، جێگام بەخۆم نەدەگرت.

سەرئەنجام، کاژێری دووی شەو گەیشتینە تێرمینالی پاسی ئانکارا، لە ناوەڕاستی شارێکی گەورەی نوێباودا.

سەفەرێکی بیست کاژێری پاس لە وانەوە، بوو بە سی و دوو کاژێری پڕ ئێشوئازار و ناخۆشی، بەڵام ئەمیش تەواو بوو.

ڕێکەوتی چوار شەممەی پێنجی شبات بوو، یەك هەفتە پاش ئەوەی، کە لەپڕ و لە ناچاریدا لەژێر چنگی مودی هەڵهاتین. زۆر چاکە، لە دڵی خۆمدا وتم.

کە هاتینە خوارەوە لە پاسەکە بۆ ناو تێرمینالی قەرەباڵغ، پیاوێك بە وشەیەکی جیهانی هاواریدەکرد، "تەکسی!" یەکسەر لەگەڵی ڕۆیشتین، تا لە چاوی پۆلیس بە دووربین.

"شیراتۆن. هوتێل شیراتۆن،" وتم، بەڵام نەمدەزانی، ئایا ئوتێلی وا هەیە لە ئانکارا یان نا.

"نـــا. هوتێل حەیات."

*"نا. خوب هوتێل،"* وتم. "هوتێلێکی باش." لەوەدەچوو، لە وشە فارسی تێبگات و یەکسەر لێیخوڕی بۆ ناوچەیەکی پڕ دامودەزگای دەوڵەتی. کە بەناو شەقامەکاندا دەڕۆیشتین، بۆ ساتێك تەکسییەکەی هێواشکردەوە و هێمای بۆ بینایەتێکی تاریك کرد، کە بەو شەوە داخرابوو. "ئەمریکا،" شوفێرەکە وتی.

باڵوێزخانەیە! بەیانی هەر ئەوەندەی کرایەوە، خۆمانی دەگەیەنینێ.

شوفێرەکە چەند شەقامی تری کرد و پاشان پاشەوپاش گەڕایەوە بۆ ناو شەقامێکی پانی بە درەخت ڕازاوە و ئینجا لە بەردەمی بینایەیەکی بە ڕووکەش جواندا وەستا، کە تابلۆیەکی پێوە بوو، بە ئینگلیز لەسەری نوسرابوو، هوتێل ئانکارا.

هێمای بۆ کردین، چاوەڕوانبین و خۆی ڕۆیشتە ژوورەوە و بە فەرمانبەری پێشوازییەوە گەڕایەوە، کە ئینگلیز دەدوا.

"بەڵێ، بۆ ئێمشەو ژوورمان هەیە،" وتی. "پاسپۆرتان پێیە؟"

"بەڵێ."

"فـــەرموون."

پارەیەکی باشم دا بە شوفێرەکە. من و مەهتاب دوای فەرمانبەرەکە کەوتین، بۆ ناو داڵانێکی ڕازاوە. لەوێ خۆمان تۆمارکرد، ناونیشانی دایك و باوکمم دا لە بانیستەری مەشیگان.

"بێزەحمەت، پاسپۆرتەکانتانم دەوێت،" فەرمانبەرەکە وتی.

"بەڵێ باشە." بەناو جانتاکەمدا گەڕام بۆ پاسپۆرتەکان و بڕیارمدا، ئەو فێڵەی ئاماهل فێریکردبووم، بیخەمەگەڕ. کە پاسپۆرتەکانم دایە دەستی، سەد و پەنجا دۆلاری ئەمریکیم خستە دەستییەوە. "ئەمە پارەی ژوورەکە،" وتم.

فەرمانبەرەکە زیاتر سەرنجی بۆ لای پارەکە چوو، تا پاسپۆرتەکان. زەردەخەنەیەکی کرد و پاشان شاگردێك جانتاکانی بۆ هەڵـگرتین و خۆشی لەگەڵمان هات بۆ جوانترین ژووری هوتێل لە جیهاندا. ژوورەکە دوو سیسەمی تیادا بوو لەگەڵ کورسییەکی پاڵدانەوە و تەلەفیزیۆنێك، هەروەها حەمامێکی گەورەی نوێباو بە ژووری خۆگۆڕینی جیاوە.

هەرکە فەرمانبەرەکە و شاگردەکە چوونە دەرەوە، من و مەهتاب باوەشمانکرد بە یەکتریدا، خەریکبوو باڵبگرین.

"باوەڕدەکەیت؟" پرسیارمکرد. "ئێمە دەتوانین ددانمان بشۆین و حەمامبکەین ... و بنوین."

مەهتاب بەپەلە خۆی گەیاندە حەمامەکە، ئامادەبوو خۆی بشوات و هەرچی ئێران هەیە، بۆ هەتاهەتایە لە خۆیی بکاتەوە.

لەپڕ بەقایم لە دەرگا درا.

دەمزانی گێچەڵی پاسپۆرتە. "کێـــیە؟" پرسیارمکرد.

"فەرمانبەری پێشوازی،" دەنگێك هات.

دەرگاکەم کردەوە و بینیم، پاسپۆرتەکانمانی بەدەستەوەیە. "ئەم پاسپۆرتانەت لە کوێ دەستکەوتووە؟" بەگومانەوە پرسیاریکرد. "ڤیزەی بەسەرەوە نییە، مۆری هاتنە ناو تورکیای پێوە نییە."

"ئەی ئەو شتێك نییە،" خێـــرا وەڵاممدایەوە."کێشەیەك هەیە، بەڵام من خۆم بەیانی چارەسەریدەکەم. بەیانی دەچم بۆ باڵوێزخانە."

"نا. تۆ ناتوانیت لێرە بمێنیتەوە. هەڵەیەك لەم پاسپۆرتاندا هەیە. دەبێت تەلەفون بۆ پۆلیس بکەم."

هەر [illegible]ان نا، پاش ئەودی ئەو هەموو هەراوبەزمەی بەسەرمان هات.

"تکاتلی[illegible]ـاڕامەوە لێی. "کچەکەم لە حەمامەکەیە. هیلاکین. برسی و سەرمامانە. بەڵ[illegible]ئیمشەو ڕێـگامانبدە، بمێنینەوە و بەیانی یەکەم شت دەچم بۆ باڵویزخانە."

"نـــا. دەبێت تەلەفون بۆ پۆلیس بکەم،" دووبارەیکردەوە. "دەبێت لەم ژوورە بچنە دەرەوە."

هەڵسوکەوتی بەڕێزانە بوو، بەڵام لەسەر قسەی خۆی سووربوو. چەند بەزەیی بە ئێمەدا دەهاتەوە، بەڵام ئامادەنەبوو پیشەکەی خۆی بخاتە مەترسییەوە. چاوەڕوانبوو، تا

ئەو شتە کەمانەی پێمان بوو، کۆیکەینەوە و بیخەینە ناو جانتاکەمەوە. پاشان ئێمەی برد بۆ دالانەکە.

تەنیا بۆ دوو خولەك لە ئارامیدا بووین، بە غەمبارییەوە لە دڵی خۆمدا وتم.

لە کاتی چوونە خواردەوەماندا، دووبارە هەوڵم لەگەڵ دایەوە. "پارەی زۆرترت پێدەدەم،" پێشنیارمکرد. "تکاتلێدەکەم، ڕێگامانبدە، با ئیمشەو لێرە بمێنینەوە."

"نا. ئێمە دەبێت ڕاپۆرت بدەین، لەسەر ئەو بیانیانەی کە لێرە دەمێننەوە. ناتوانین ڕێگاتانبدەین بمێننەوە."

"ئەی ناتوانین تا بەیانی لە دالانەکەدا بمێنینەوە؟ تکاتلێدەکەم، زۆرم لێمەکە منداڵەکەم ببمە سەر شەقام بەم شەوە ساردە." شتێك هات بە خەیاڵمدا. "دەتوانی تەلەفون بۆ باڵۆیزخانەکە بکەیت؟" پرسیارملێکرد. "لەوانەیە قسە لەگەڵ یەکێکدا بکەم، کە بتوانێت بۆ ئیمشەو ئەم کێشەیەم بۆ چارەبکات."

فەرمانبەرەکە یارمەتیدەر بوو، تا ئەو ئاستەی ڕێسا ڕێگاییپێدەدا. بۆ چەند ساتێك لەگەڵ کەسێك دوا و پاشان تەلەفونەکەی دایە دەستم. بینیم لەگەڵ سەربازێکی مارینی پاسەوانی ئەمریکی ڕووبەڕووم.

"خانم، کێشەکە چییە؟" بەگومانەوە پرسیاریکرد.

"ڕێگامان پێنادەن لێرە بمێنینەوە، چونکە پاسپۆرتەکانمان مۆری پێوە نییە. پێویستمان بە شوێنێکە لێیبمێنینەوە. بێزەحمەت دەتوانین بێن بۆ لاتان؟"

"نـــا" خێرا وتی. "نا ناتوانن بێن بۆ ئێرە."

"چی بکەین؟" بێئومێدانە پرسیارمکرد.

دەنگە سەربازییەکەی ڕەقتر بوو. "چۆن هاتنە ناو تورکیاوە، بەبێ ئەوەی پاسپۆرتەکانتان مۆرنەکرێت؟"

"نامەوێت ئەوە بۆ تۆ باسبکەم لەسەر تەلەفون. خۆت تێبگە."

"چۆن هاتیتە ناو تورکیاوە؟" پرسیارەکەی دووبارەکردەوە.

"بە ئەسپ."

سەربازەکە دایە قاقای پێکەنین، گاڵتەی لێدەهات. "خانم تەماشاکە، کاتژمێری سێی بەیانییە،" وتـــی. "کاتی ئەوەم نییە، لەسەر ئەو شتانە لەگەڵ تۆ قسەبکەم. تۆ هیچ کێشەیەکت لەگەڵ باڵۆیزخانە نییە. کێشەی تۆ لەلای پۆلیسە. بچۆ بۆ لای پۆلیس."

"تۆ بۆت نییە، ئەوە لەگەڵ من بکەیت!" هاوارمکرد. "بۆ یەك هەفتەیە لە پۆلیس دووردەکەومەوە، تۆش ئێستا پێمدەڵێت بچم بۆ لای پۆلیس؟ دەبێت یارمەتیم بدەیت."

"نا. ئێمە دەبێت هیچ شتێك بۆ تۆ نەکەین."

لە داخدا خەریکبوو شێتدەبووم، جیهانی بیرۆکراتی لێمبووبوو بە بەڵا، کە ئەم چەند هەنگاوە بنێم بەرەو ڕزگاری. تەلەفونەکەم دانایەوە و بە فارمانبەرەکەم وت، لێرەدا

چاوەڕواندەبین تا بەیانی یەکێك لە باڵوێزخانە دەبینین. جارێکی تریش داواملێکردەوە، کە ڕێـگامان پێبدات لە داڵانەکەدا بمێنینەوە.

"ناتوانم ڕێـگاتان پێبدەم بمێننەوە،" وتی. وتەکەی ڕاشکاو بوو، بەڵام نەرمییەکی پێوە دیاربوو. لەوانەیە خۆشی کچی هەبێت. هەڵسوکەوتی هیوایەکی پێدام، هەوڵی تەکتیکێکی تر بدەم.

"دەتوانی پەیوەندییەکەم بۆ سازبکەی لەگەڵ ئەمریکا؟" داواملێکرد.

"بەڵـــێ."

کاتێك کە خەریکی پەیوەندی دامەزراندنبووین لەگەڵ بانیستەری مەشیگان، فەرمانبەرەکە داوای لە شاگردەکە کرد، شتمان بۆ بێنێت. زۆری نەبرد، بە قۆرییەك چا و پیاڵە و دەستەسڕەوە گەڕایەوە. بە دیار چاوە دانیشتین، کاتمان دەبردەسەر بەهیوای ئەوەی، بەو شەوە تاریکە نەگەڕێینەوە بەر سەرما.

لە ئانکارا چوار شەممە بوو، بەڵام هێشتا لە مەشیگان سێ شەممە بوو، کە لە پێشدا لەگەڵ دایکم قسەمکرد.

"من و مەهتاب لە تورکیاین!" وتم

"ئـــۆخەی!" دایکم هاواریکرد. بە فرمێسکی ئاسودەییەوە بۆی باسکردم، کە دوێنێ شەو کارۆلینی خوشکم تەلەفونیکردووە بۆم لە تاران و مودی بە توڕەییەوە پێیڕاگەیاندووە، کە ئێمە ڕۆیشتووین و نازانێت بۆ کوێ چووین. زۆر نیگەرانی ئێمە بووە.

پرسیارێکم کرد، کە لە وەڵامەکەی دەترسام. "باوکـــم چۆنە؟"

"هێشتا ئازاردەکێشێت،" دایکم وتی. "لەگەڵ ئەوەشدا لە نەخۆشخانە نییە. ئێستا لێرەیە. تەلەفونەکەی بۆ دەبەم بۆ جێـگاکەی."

"بیتی!!!" باوکم هاواریکرد لە تەلەفونەکەدا. "زۆر خۆشحاڵم لەوەی دەرچوون. تا دەگرێت خێرا وەرنەوە. من ... هەوڵدەدەم بمێنمەوە،" وتی دەنگی بەرەو کزبوون چوو.

"بابـــە، من باوەڕم بە ورەی تۆ هەیە. *لە هەر کوێیەك ورە هەبێت، ڕێـگای دەرچوون هەیە."*

کە دایکم تەلەفونەکەی لێوەرگرتەوە، داواملێکرد پەیوەندیبکات بەو ئەفسەرەی وەزارەتی دەرەوە، کە ئاگاداری کێشەکەمان بوو، تا پەیوەندی بکات بە یەکێکەوە لە واشنتۆن، بۆئەوەی ئەوانیش پەیوەندیبکەن بە ئانکاراوە، تا لە هەلومەرجەکەی ئێمە ئاگاداربنەوە.

"هەرکە گەیشتینە باڵوێزخانە، تەلەفونت بۆ دەکەم،" وتم.

پاش تەلەفونەکە فرمێسکەکانم وشککردەوە و چوومە شەڕی کێشە هەنوکەییەکەم. "باشە، من دەبێت چی بکەم؟" لە فەرمانبەرەکەم پرسی. "من ناتوانم بەم نیوەشەوە بچمە سەر شەقام."

"تەکسی بگرە و هوتێل بە هوتێل بگەڕێ،" وتی. "لەوانەیە هوتێلێك بدۆزیتەوە، کە ئێوە بگرێتەخۆی. پاسپۆرتەکانت پیشانەدە، ئەگەر داوایاننەکرد." پاسپۆرت و سەد و پەنجا دۆلاردکەی پێدایینەوە و تەکسی بۆ بانگکردین.

ئاشکرا بوو تەلەفونی بۆ پۆلیس نەدەکرد. تەنیا دەویست ئەم کێشەیە لە کۆڵ خۆی بکاتەوە. کاتێك کە تەکسییەکە هات، بە شوفێردکەی وت، "بیانبە بۆ هوتێلی دیامەن."

لەوێ فەرمانبەری پێشوازی زیاتر هاوەردی لە خۆی پیشاندا. کاتێك کە پێموت، بەیانی کێشەی پاسپۆرت چارەدەکەم، پرسی، "کێشەتان لەگەڵ پۆلیس هەیە؟"

"نـــا،" وەڵامەدایەوە.

"چاکە،" وتی. پاشان داوای لێکردم بە ناوێکی ترەوە خۆم تۆماربکەم. بە ناوی کچێنی خۆمەوە، بیتی لۆفەر، خۆمم تۆمارکرد

هەرکە ژووردکەمان وەرگرت، من و مەهتاب حەمامێکی گەرمان بۆ کرد. ددانمان شت و چووینە ناو جێگاوە. زۆری نەبرد خەو بردینیەوە.

بۆ بەیانی تەلەفونم بۆ ئاماهل کرد.

"بیتییی!" لە خۆشیاندا هاواریکرد. "ئەوە لە کوێیت؟"

"ئەسفەهـــــان!" بەخۆشییەوە وتم.

ئاماهل زیاتر هاواری لێبەرزبۆوە، کە هێنام بۆ ناوی ئانکارا کرد. "باشیت؟ هەموو شتێك باش چووە پێشەوە؟ ئایا لەگەڵتان باشبوون؟"

"بەڵـــێ،" دڵنیامکرد. "زۆر سوپاس. زۆر سوپاستان دەکەم."

من و مەهتاب نیشتینە سەر نانی بەیانی، کە بریتی بوو لە هێلکە و پەتاتەی سووردەوەکراو بە کەچوپەوە. شەربەتی پرتەقاڵ و قاوەیەکی تەواوی ئەمریکیمان خواردەوە.

پاشان تەکسیمان گرت بۆ باڵوێزخانەی ئەمریکا. کە پارەی تەکسییەکەم دەدا، مەهتاب هاواریکرد، "مامـــــی، تەماشاکە! تەماشاکە!" هێمای بۆ ئاڵای ئەمریکا کرد، کە با دەیشەکانەوە.

لە ژووری پێشوازی، ناوی خۆمان دا بە فەرمانبەرێك، کە لە پشت شوشەیەکی گولەنەبڕەوە دانیشتبوو. پاسپۆرتەکانیشمان دایە دەستی.

لە چەند خولەکمدا، پیاوێك لە پشت فەرمانبەردکەوە دەرکەوت. خۆی وەك یاریدەدەری باڵوێز، تۆم مورق ناساند. تازە لە واشنتۆنەوە ئاگاداریان کردبۆوە.

"زۆر بەداخین، کە دوێنی شەو وا هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کردووی،" وتی. "بەڵێنت پێدەدەم، ئەو پاسەوانە بۆ ساڵێکی تر موچەکەی بەرزناکرێتەوە! بەنیاز نیت، بۆ چەند ڕۆژێك لە تورکیا بمێنیتەوە و تۆزێك بگەڕێیت؟"

"نـــــا،" هاوارم لێهەڵسا. "دەمەوێت لەگەڵ یەکەم فڕۆکە بڕۆم."

"زۆر چاکە،" ڕازیبوو. "پاسپۆرتەکانتان بۆ چاکدەکەین و ئەم دوانیوەڕۆیە ڕێدەکەون بەرەو ماڵەوە."

کە چاوەڕوانماندەکرد، مەهتاب چەند پێنوسی ڕەنگاوڕەنگی دۆزییەوە - یان یەکێك پێیدا. دانیشت و کەوتە وێنەکێشان لەسەر کاغەزی نامە، کە لە هوتێلەکەوە هێنابووی. مێشکم زۆر پڕ چەنجاڵ بوو، ئاگام لە خۆم نەبوو، تا مەهتاب لە وێنەکێشانبووەوە و پیشانیدام.

لەسەرەوەی وێنەکە، ڕۆژێکی کێشابوو بە تیشکە زەردەکانییەوە. لەژێر ئەوەوە چوار ڕیزە شاخی قاوەیی. لە خوار ئەوەوە، بەلەمێکی سەوڵی، کە وەبیرهێنەرەوەی دیمەنی ماڵەکەمان بوو لە ئەلپێنا. لە لایەکی وێنەکەوە فڕۆکەیەك بوو، یان باڵندەیەك. خانوویەکی کوردی نمونەیی بە ڕەنگی ڕەش، وەك ئەوانەی کە لە ڕێـگادا بینیبوومان. دیوارەکانی جێگا فیشەك بوون، لە ناوەڕاستدا ئاڵایەکی سوور، سپی و شین، کە با دەیشەکانەوە. لە ژێر ئاڵاکەدا مەهتاب بە پێنوسێکی ڕەش وشەیەکی نوسیبوو. هەرچەند بە ڕۆشنی نوسیبووی، بەڵام لەبەر فرمێسك، کە بەدەر لە ویستی خۆم دەهاتە خوارەوە، بەئاستەم بۆم دەخوێنرایەوە. بە دەستوخەتێکی منداڵانە نوسیبووی: ئەمریکا.

# لە پەڕاوێزدا

من و مەهتاب لە حەوتی شباتی هەزار و نۆ سەد و هەشتا و شەشدا، گەیشتینەوە مەڵەوە لە مەشیگان، لەگەڵ ڕزگارییەکی پڕ خۆشی و ناخۆشی بەرەوڕووبووین. بینینی جۆی و جۆن، دایکم و باوکم مایەی خۆشییەکی لەڕادەبەدەر بوو. هاتنەوەمان یارمەتی باوکمی دا، تۆزێك هێزی تێگەڕێت و بۆ ماوەیەك بە خۆشی و شادی ئێمەوە بژی، تا لە سێی ئابی هەزار و نۆ سەد و هەشتا و شەشدا دوو ساڵ پاش ئەو ڕۆژەی، کە من و مەهتاب گەیشتینە تاران لەبەرامبەر نەخۆشییەکەیدا ملیدا و بۆ یەکجاریماڵئاوایلێکردین. هەمووومان تەواو پەرێشانی باوکمان بووین.

دایکم هەوڵیدا، بەبێ باوکم خۆی لەگەڵ ژیان بگونجێنێت، زۆر جار دەگریا و زۆر جار سوپاسگوزار بوو، کە کچەکەی و کچەزاکەی لە دۆزەخ گەڕاونەتەوە، بەڵام نیگەرانی داهاتوو بوو.

جۆی و جۆن پێشبڕکێیانبوو یارمەتیمانبدەن، خۆمان لەگەڵ ژیان ڕێکخەینەوە. کوڕی باش بوون، ئیتر لەوە دەرچووبوون کوڕ بن. بە هەڵپەیەکی گەنجانەوە لە خزمەتی ئێمەدا بوون.

هیچ هەواڵێکی هاوڕێکانم، شەمسی، زاری، ئەلیس و فریشتە، نەبوو. هیچ یەك لەمانە، ئاگاداری پلانی هەڵهاتنی من نەبوون و هیوادارم بەهۆی منەوە، توشی گریفت و ناخۆشی نەهاتبێتن. هیچ هەوڵێك نادەم پەیوەندیان پێوە بکەم، تا نەکەونە مەترسییەوە.

هێشتا هێلین بالسەناین لە بەشی بەرژەوەندی یو. ئێس لە باڵوێزخانەی سویسرا لە تاران کاردەکات. کاری خۆی دەکات لەگەڵ ئەو کەسانەی، کە کەوتوونەتە هەلومەرجێکی وەك منەوە.

نامەیەکی کوڕ[illegible]نازد بۆ حەمید، خاوەن دوکانی جلوبەرگی پیاوانە لە تاران، کە تەلەفونەکەی ڕێگای پەیوەندی من بوو بە هێلین، ئاماهل و کەسانی ترەوە. لە ڕێگای کەسی سێهەمەوە، وەڵامی نامەکەمم بۆ هاتەوە، کە بەرواری دووی تەمموزی هەزار و نۆ سەد و هەشتا و شەشی بەسەرەوە بوو. لە بەشێکی نامەکەیدا دەڵێت:

*خوشکی خۆشەویست و ئازام بیتی*

*نازانم بە چ زمانێك. باسی هەستی خۆمت بۆ بکەم، کاتێك نامەکەتم وەرگرت؟ لە پشتی مێزەکەمەوە دانیشتم و هەستم بە خۆشییەکی زۆر کرد. کە ماوەیەکی دوورودرێژ بوو لێیبێبەشبووم. تەلەفونم بۆ هاوسەرەکەم کرد و لە هەلومەرجی تۆ ئاگادارمکردەوە. ئەویش زۆری پێخۆش بوو. مایەی دڵشادی بوو بۆ هەموومان، کە بیستمان لە ماڵەوەی و*

*لەوێ خەریکی کاری خۆتیت. وەك خۆت دەزانیت، زۆر خۆشم دێت لە تۆ و هاورێ جوانە بچکۆلەکەت م. هەرگیز ئێوە لە یاننا‌کــــەم.*

*دوکانەکەم بۆ نزیکەی پەنجا رۆژێك دەبێت داخراوە، لەسەرئەوەی تی - شێرتم فرۆشتووە، پیتی ئینگلیزی بەسەرەوە بووە، لەبەرئەوە ئێستا بێکارین. هەلومەرجەکە رۆژ لەدوای رۆژ خراپتر دەبێت. لەو باوەرەدام، ئێستا ئیتر تەواو دڵشاددبیت.*

*تکاتلێیەکەم، سەلامی من بە م. بگەیەنە لەگەڵ ئەو پەری رێزماندا بۆ دایك و باوکت.*

*ئیتر خۆشیت*

*حەمید*

بانکێك کە لە هەلومەرجەکەی من ئاگاداربۆوە، قەرزێکی پێدام، تا پارەکەی ئاماهل یەکسەر بگەرێنمەوە. لە کۆتایی هەزار و نۆ سەد هەشتا و شەشدا، ئاماهل پلانێکی بۆ خۆی دانابوو، کە هەڵبێت، بەڵام سەری نەگرتبوو، بەهۆی هاتنەکایەی کێشەی پڕ هەراوبەزمی ناردنی چەك بۆ ئێران لەلایەن ئەمریکاوە. کە ئەم کێشەیە بووبووە هۆی وریاکردنەوەی دامودەزگای ئاسایشی ئێران. تا کاتی نوسینی نامەکەی بۆ من، هێشتا هەڵنەهاتبوو.

هەراوبەزمی ناردنی چەك و تەقەمەنی ئەمریکا بۆ ئێران، مایەی سەرسامییەکی زۆری من و ئەو کەسانە بوو، کە ئەو چەند ساڵە لە ئێراندا ژیابووین. کەچی لێرە زانیارییەکی گشتی ناو خەڵك بوو، کە ئەمریکا یارمەتی هەر دوو لایەنی جەنگی درێژبۆوەی عێراق و ئێران دەدا.

راهاتنەوە لەگەڵ ژیانی ئەمریکا بۆ مەهتاب سەخت بوو، بەڵام بەهۆی تەمەن منداڵبوونیەوە، توانی سەرکەوێت بەسەر ئەم رێگرییەدا. لە وانەکانیدا لە قوتابخانە بە پلەیەکی باش دەرچوو، وە جارێکی تر بووەوە بە منداڵە دڵشاد و تیشکی رۆژە راستەقینەکە. هەندێك جار بیری باوکی دەکرد - بەڵام نەك ئەو پیاوە شێتە، کە ئێمەی لە ئێران بە بارمتە گرتبوو، بەڵکو ئەو باوکەی کە رۆژێك لە رۆژان هەر دووکمانی خۆشدەویست. هەروەها بیری کەروێشکەکەی دەکرد. چووین زۆر گەراین لە دوکانەکانی بوکەشوشەفرۆش، بەڵام نمونەی وەك ئەومان دەستنەکەوتەوە.

پاش گەرانەوەم بۆ ئەمریکا، *تیریسا هۆبگود*م بینی لە وەزارەتی دەرەوە، کە لەسەر ئەو جۆرە کێشانە کاریدەکرد و بۆ ماوەی ئەو هەژدە مانگە پڕ دەردیسەرییەی من، یارمەتی خێزانەکەمانی دابوو. هاوبۆچوون بوو لەگەڵم، کە بەسەرهاتی خۆم بنوسمەوە، بۆ وریاکردنەوەی کەسانی تر. ئەو بەشەی کە تیریسا کاری تیادا دەکرد، ئاگایان لە هەموو ئەو جۆرە کێشانە هەبوو، کە ژنان و منداڵانی ئەمریکی لە ئێران و وڵاتانی تری ئیسلامیدا، بەدەر لە ویستی خۆیان بە بارمتە گیراون. ئەو بەشە زیاتر لە یەك هەزار کێشەیان لەو جۆرە لەبەردەستدا بوو.

من و مەهتاب ئەو ڕاستییەمان لا ڕۆشنە، کە لەوانەیە هەرگیز نەتوانین لە شەڕی مودی لەوی پەڕی جیهانەوە بەدووربین. تۆڵەی مودی دەکرێت لەلایەن کەسێکەوە، یان یەکێك لە گەلەخوشکەزا لە ژمارەنەهاتووەکانیەوە بەسەرماندا هاربکات. مودی دەزانێت، بە جۆرێك دەتوانێت مەهتاب هەڵفریوێنێت و بیباتەوە بۆ ئێران، لەم پەیوەندەدا یاسا و دامودەزگای تەواوی کۆماری ئیسلامی ئێران لە خزمەتیدایە.

بـــەڵام ئەوەی کە لەوانەیە مودی پێینەزانێت، کارایی تۆڵەی منە لەبەرامبەر ئەودا. ئێستا لە ئەمریکا و ئێراندا، هاوڕێی کەسانێکی بەهێزم، کە ڕێگاپێنادەن ئەم ئاواتەی بێتەدی. من ناتوانم، ئەو هەوڵە قورس و قایمانەی کە کردوومانە بۆ پاراستنی خۆمان، ئاشکرایبکەم. بەڵام ئەوەندە بەسە کە بڵێم، من و مەهتاب بە ناوێکی ترەوە، لە ناوچەیەکی نەزانراو - شوێنێك لە ئەمریکا - دەژین.

هیچ هەواڵێکم لە مودی نییە، تەنیا ئەو زانیاریانە نەبێت، کە لە نامەیەکدا بە بەرواری چواردەی تەمموزی هەزار و نۆ سەد و هەشتا و شەشدا لەلایەن ئیلینەوە، لە ڕێگای دایکمەوە، بە دەستمگەیشت. ئیلین نوسیویەتی:

***خۆشەویستم بیتی***

*هیوادارم، ئەم نامەیە بە خۆش و شادی ببینیت. لە ڕاستیدا چاوەڕوانمدەکرد، تۆ نامەم بۆ بنوسیت و زووتر لە ئێستا ئاگادارمکەیتەوە، چی ڕوویـــدا. هەرچی چۆنێك بێت، من وەکو هاوڕێیەکی نزیك چاوتلێدەکەم.*

*چەند جارێك پاش ڕۆیشتنی تۆ، سەردانی مێردەکەتمان کرد، هەتا یارمەتیمدا، بەدوای تۆدا منیش تەلەفونبکەم. زۆر نیگەرانـــت بووم. دەزانیـــت، پێشبینی خراپترین شتم دەکرد. هێشتا پڕبەدڵ حـــەزدەکەم بزانـــم، چیـــت بەسەرهات.*

*بۆ چەند مانگ دەچێـــت، دکتۆر مەهموودیمان نەبینیوە. جارێکیان چووین لە دەرگامـــان دا، بەڵام لە ماڵەوە نەبوو. تەواوی زستان و هەتا پاش سەری ساڵی تازەی ئێرانی سەردانمانکرد. هەر جارێك کە دەچـــووین، ئەو پیاوەبەفـــرینەی، کە تۆ و مەهتاب دروستانکردبوو، بچوك و بچوکتـــــر دەبـــۆوە، تا ڕۆژێکیان ملپێچەکەی مایەوە لەسەر زەوییەکە. پیاوەبەفریـــنەکـە تـــوایەوە و چـــوو بە ئاسمانـــدا، وەك ئەوەی لاســـایی تـــۆی کردبێتـــــەوە ...*

"بۆ هەموو ژیانت لێرە دەمێنیتەوە. تێدەگەیت؟ ئێــران جێناهێڵیت. دوو پێت لەم وڵاتە ناچێتە دەرەوە، تــا ئەو ڕۆژەی دەمریت."

بێتی مەحموودی و مێردەکەی، دکتۆر سەید بزورگ مەحموودی (مودی)، لەگەڵ کچە چوار ساڵەکەیان، مەهتاب، لە ئەمریکاوە دەچن بۆ ئێران بۆ سەردانی کەسوکاری مودی. خەوشی هەلومەرجی ژیان، بەسوک ئەماشاکردنی ژنان و ڕق و کینە بەرامبەر خەڵکانی ڕۆژئاوایی، بێتی دەتۆقێنێ و هەر لە ڕۆژەکانی سەرەتاوە دەکەوێتە ژماردنی ئەو کاژێرانە، کە کەی دەگەڕێنەوە بۆ ئەمریکا. بەڵام مودی و زۆربەی کەسوکارە دڵڕەقەکەی پلانێکی تریان لە خەیاڵدا دەبێت. دایک و کچە دەبن بە میوانی بەندیخانەی کەلتوری نامۆ و بارمتەی دەستی پیاوێک، کە هەر ڕۆژە زیاتر زۆردارتر و شەڕانێتر دەبێت.

بێتی دەکەوێتە هەوڵی دۆزینەوەی ڕێگای گەڕانەوە. توڕی چاودێری مودی دەبەزێنێ و بە نهێنی پەیوەندی دەبەستێت بە لایەنگرانی بەرهەڵستکاری ڕژێمی خومەینییەوە. بەڵام هەموو ڕێگاچارەکان ئەوەی تیادا دەبێت، کــە بێتی دەست لە کچەکەی هەڵگرێت بۆ هەتاهەتایە ...

سەرئەنجــام بێتی پیاوێک دەدۆزێتەوە، کە پلانی ڕێگای هەڵهاتنی لە ئێران بۆ دادەنێت. ڕێگایەکی هاتوونەهات، کە بەدەگمەن ژنان و منداڵان تیدا دەردەچن...

لەزنجیرە بڵاوکراوەکانی
یەکێتی ژنانی کوردستان